# کتێبی

# " الفتح الرباني
# و
# الفيض الرحماني "

## بە کوردی


شێخ عبدالقادر گەیلانی

(ڕەحمەتی خوای لێ بێ)

وەرگێڕانی

ماموستا عبدالكريم فتاح



چاپی یەکەم ١٤٣٨ ك - ٢٠١٧ ز

بسم الله الرحمن الرحيم

بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

* ئەم کتێبە تەنها لە پێناو ئەوەدا کراوەتە (Pdf)، تاوەکوو خوێنەران و سوودلێوەرگرانی زیاتربن، وە ئاسانکارییێکیش بێت بۆ ئەوانەی ناتوانن کتێب بکڕن یا کتێب هەڵگرنین و، تەنها بە (pdf) مەیلی خوێندنەوەیان هەیە. نەک بۆ ئەوەی کڕیارانی کەم بن، یا هەر بابەتێکی نەخوازراوی تری لەم شێوەیە.

لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزو سوپاس و ستایش بۆ وەرگێڕی بەتوانای گەلەکەمان:م. عبدالکریم فتاح.

"ئومێدەوارین: پارێزگاری لە کتێبەکە بکەن و گرنگی بەخوێندنەوەی بدەن. وە (بیورن لە هەڵەو کەم و کورپیەکانمان).










**ناوی کتێب:** کتێبی (الفتح الرباني والفيض الرحماني) بەکوردی.

**لەبەر هەمەکانی:** شێخ عبدالقادری گەیلانی.

**وەرگێڕانی:** مامۆستا عبدالكريم فتاح.

**نەخشەسازی ناوەوە:** احمد خالد

**تایپ:** وەرگێڕ.

**نۆرەو ساڵی چاپ:** یەکەم ٢٠١٧ زایینی.

**تیراژ:** (١٠٠٠) دانە.

**نرخ:** (١٢٠٠٠) دینار

**چاپخانە:**

**بەسەرپەرشتی:** نەهرۆ محمود

Nuri.haqeeqat@gmail.com



﴿ إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ﴿١﴾ لِّيَغْفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٢﴾ ﴾

**الفتح: ١ – ٢**



# پێشەکی وەرگێڕ

## بسم الله الرحمن الرحيم

کتێبی "الفتح الرباني والفيض الرحماني" کۆمەڵێك قسە و ئامۆژگاری شیرینی شێخی گەیلانییە، لەلایەن موریدانی شێخی گەیلانییەوە نووسراوەتەوە کە لە مەجلیسەکەیدا ئامادەبوون، گرنگی ئەم کتێبە لەو جێگەدایە لە زمانی زانایەکی عاریفەوە قسەکان دەکرێن و لێوانلێوە بە گەرمی و گەشی و دڵسۆزی، کتێبەکە کۆمەڵێك ئامۆژگارییە بە دەوری یەکتاپەرستی و راستکردنەوەی ئەخلاق و پەروەردەی دڵ و دەروونـدا دەسوڕێتەوە، ئەزموونی عاریفێکی مەزنە و بە موریدانی خۆی دەگەیەنێت.

**بۆ وەرگێڕانی ئەم کتێبە شانم لەسەر سێ سەرچاوە داداوە:**

**یەکەمیان:** "الفتح الرباني والفيض الرحماني" لمنشورات الجمل، كولونيا (ألمانيا)-بغداد ٢٠٠٧

**دووەمیان:** "الفتح الرباني والفيض الرحماني"، دەستنووسێکی ئەلەکترۆنییە کە هەمان نوسخەی یەکەمی ئاماژەبۆکراوە.

**سێیەمیان:** "الفتح الرباني والفيض الرحماني"-تقديم وتقريظ الدكتور ماجد عرسان الكيلاني، إعتنى به الدكتور علي أبو الخير، تەخریجی فەرموودەکانم لەسەر ئەم کتێبە وەرگرتووە و ئەو فەرموودانەش تەخریج نەکراون بۆخۆم هەوڵمداوە لە سەرچاوەکانی فەرموودەدا بیاندۆزمەوە و سەرچاوەیان بۆ دیاری بکەم.

جیاوازی لە هەندێ شوێنی ئەم سێ سەرچاوەیەدا بوونی هەیە، لەو شـوێنانەی ماناکـان ئـاڵۆزبوون هەوڵمـداوە دوای بـەراورد پێکردنـی هەرسـێ تێکسـتەکە و تێڕامان لە یەك بە یەکی وشەکانی و دانەدەمیەکی لەگەڵ پاش و پێشی ئەو بەشە لە تێکستەکە شیاوترین و گونجاوترین مانا هەڵبگۆزم و وەرگێڕانی بۆ بکەم.

لەم کتێبەدا ئەوانەی کەوانەیان نیـە بـۆ تـەخریجی ئـەو فەرموودانەیـە کـە لـە کتێبی نـاوبراو وەرمگرتـووە، ئـەم جـۆرە لـە کەوانـەش () بـۆ پـەراوێزی وەرگێـڕ بەکارهێنراوە.

داوامە لە خودا ئەم وەرگێڕانەم لێ قبـووڵ بکـات و بیکـات بـە توێشـوویەکی رۆحی بۆ خوێنەرانی زمانی کوردی شیرین.

✍

وەرگێڕ

شەوی هەینی ١ لەسەر ٢ی/١٢/٢٠١٦

سلێمانی



## بسم الله الرحمن الرحيم

- گەورەمان عبدالقادری گەیلانی(١٠٧٧-١١٦٦ز، ٤٧٠-٥٦٠ک) لە هەرێمی گەیلانی ئێران لەدایک بووە.
- لە بەغداد کۆچیدوایی کردووە و هەر لەوێش نێژراوە.
- دامەزرێنەری تەریقەتی قادرییە و یەکێکە لە سۆفییە مەزنەکان، لە بەغداد گۆشەیەکی بۆ کرایەوە.
- هەمیشە ئامۆژگاری خەڵکانی دەکرد بە خۆشەویستی غەریبان و خۆ دوورخستنەوە لە دونیا و زیادەڕەوی.
- لە دانراوەکانی "الفتح الرباني والفيض الرحماني"، هەروەها"الغنية لطالبي طريق الحق".
- ڕەچەڵەکی دەچێتەوە سەر حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالب(خودایان لێ رازی بێت).

# مەجلیسی یەکەم

## بەرهەڵستی نەکردنی خودا

بسم الله الرحمن الرحيم

گەورەمان "محيي الدين أبو محمد عبدالقادر(رضي الله عنه)" بەیانی رۆژی یەکشەمە لە ٣/شەوال/٥٤٥ھ فەرمووی:

### بەرهەڵستی نەکردنی خودا

بەرهەڵستی کردنی خودا(عزوجل) لە باری دابەزینی قەدەرەکاندا مردنی ئاییندارییە، مردنی یەکتاپەرستییە، مردنی تەوەکول و ئیخلاصە، دڵی باوەڕدار "بۆچی و چۆن" ناناسێت، بەڵکو دەڵێت: بەڵێ، هەموو نەفس سەرپێچیکەر و بەرپەرێکارە، هەر کەس دەیەوێت ئەم نەفسە چاك بکات با لەگەڵی بکۆشێت تا لە شەڕی سەلامەت بێت، هەموو نەفس شەڕە لە شەڕدا، کاتێك دژی کۆشا و نەفسی ئارامبوویەوە هەموو نەفس دەبێت بە خێر لەناو خێردا، لە هەموو ئەرك و عیبادەتەکاندا لەگەڵی تەبا دەبێت، هەر بەو جۆرە لە وازهێنانی لە هەموو یاخیبوونەوەکان، لەو بارەدا پێی دەوترێت:

﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ ﴿٢٨﴾ ﴾ الفجر: ٢٧- ٢٨

ئەخۆشی و ئافەتی لێدەبێتەوە و شەڕەکەی لێ دووردەکەوێتەوەو خۆی نابەستێتەوە بە شتێك لە دروستکراوەکانەوە و رەچەڵەکەکەی بۆ سەر ئیبراهیم(علیه السلام) بەڕاست دەردەچێت، ئەو(علیه السلام) لە نەفسی خۆی هاتبووە دەرەوە و بەبێ ئارەزوو مابوویەوە، بە دڵێکی ئارامەوە لە ژیاندا جاری دەبوو، چەندین جۆر لە

دروستکراوەکان خۆیان بۆ خستەڕوو بۆ ئەوەی یارمەتی و کۆمەکی بدەن، بەڵام ئەو دەیفەرموو کۆمەکی و یارمەتی ئێوەم ناوێت، زانستی ئەو(سبحانه وتعالى) بە حاڵم بێنیازم دەکات لە دوعا و داوا، کاتێك خۆڕادەستکردن و تەوەکولەکەی ڕاست و دروستبوون بە ئاگر وترا:

﴿ قُلْنَا يَٰنَارُ كُونِى بَرْدًا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ ﴾الأنبياء:٦٩،

کۆمەکی خودایی(عزوجل) بۆ کەسی ئارامگر لە دونیادا بێ حسابە و نیعمەت و بەخششەکانی لە دوارۆژدا هەر بەو جۆرەیە، خودا(سبحانه وتعالى) دەفەرموێت:

﴿ إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿١٠﴾ ﴾ الزمر: ١٠

شتێك لەلای خودا -لەوانەی شاندەدەنە ژێری لە پێناوی ئەودا- شاراوە نییە، ساتێك لەگەڵی ئارام بگرن چەندین ساڵ لوتف و نیعمەتی ئەو دەبینن، ئازایەتی بریتییە لە ساتێك لە ئارامگرتن﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٣﴾ ﴾ البقرة: ١٥٣، بە سەرخستن و گەیشتن بە ئامانجەکانیان.

لەگەڵی ئارام بن و لێی بەئاگا بن و بێئاگایی لە ئەو داگیرتان نەکات، بەئاگاهاتنەوە هەڵمەگرن بۆ دوای مردن، چونکە ئەو کات بەئاگاهاتنەوە سوودێك بە ئێوە ناگەیەنێت، بەر لە گەیشتن بە خودا بەئاگابێنەوە، بەئاگابێنەوە بەر لەوەی بەئاگاتان بهێننەوە و پەشیمانی ڕووتان لێ بکات لە کاتێکدا پەشیمانی سوودێك بە ئێوە ناگەیەنێت، دڵی خۆتان چاك بکەن، چونکە گەر دڵتان چاك بکەن هەموو حاڵ و بارتان چاك دەبێت، بۆ ئەو مەبەستەیە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((دەزانن لە جەستەدا پارچە گۆشتێك هەیە گەر هاتە ڕاستە هەموو جەستە دێتە ڕاستە، گەر تێکچوون ڕووی لێکرد هەموو جەستە تێکدەچێت، دەزانن ئەو پارچە گۆشتە بریتییە لە دڵ-ألا وَإِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، ألا وَهِيَ الْقَلْبُ))[1].

---

[1] رواه البخاري في الصحيح.

چاکبوونی دڵ بە تەقوا و تەوەکول لەسەر خودا(عزوجل) و یەکتاپەرستی بۆی و ئیخلاص لە کاروکردەوەکاندایە، تێکچوونی دڵیش لە نەبوونی ئەوانەدایە، دڵ باڵندەیەکە لە قەفەسێکی دروستکراودا، هەروەك دوڕێك لە سندووقێکدا، وەك زێڕ و پارەیەك لە گەنجینەیەکدا دانراوە، گرنگی لە باڵندەکەدایە نەك لە قەفەسەکەدا، لە دوڕەکەدایە نەك لە سندووقەکە، لە ماڵەکەدایە نەك لە گەنجینەکەدا.

خودایە، ئەندامەکانمان بە گوێڕایەڵی خۆتەوە خەریك بکە، دڵمان بە مەعریفەتی خۆتەوە، بەدرێژایی ژیان شەوان و ڕۆژان بە گوێڕایەڵی خۆتەوە سەرقاڵمان بکە، خودایە بانگەیەنە بەوانەی پێش ئێمە کەوتن لە صاڵحان، ئەوەی کردت بە ڕۆزی ئەوان بیکە بە ڕۆزی ئێمەش، خودایە وەك چۆن بۆ ئەوان بوویت بۆ ئێمەش ببە، ئامین.

خەڵکینە، بۆ خودا بن وەك چۆن صاڵحان بۆ خودا بوون، تا خودا بۆ ئێوەش ببێت وەك چۆن بۆ ئەوان بوو، گەر دەتانەوێ حەق(عزوجل) بۆ ئێوە ببێت خۆتان سەرقاڵی گوێڕایەڵی خودا بکەن و ئارامبگرن لەگەڵی، ڕازیبن بە کردارەکانی لە خۆتان و لە خەڵکانی تردا، خەڵکانی سەر ئەم ڕێگە لە دونیا زوهدیان کرد و بەشی خۆیان لە دونیا بە دەستی تەقوا و وەرعەوە دەست بۆ برد، پاشان گەڕان بەدوای دواڕۆژدا و کاری دواڕۆژیان ئەنجامدا، لە نەفسی خۆیان یاخیبوون و گوێڕایەڵی پەروەردگاریان(عزوجل) کرد و ئامۆژگاری نەفسی خۆیان کرد و پاشان ئامۆژگاری نەفسی خەڵکانی تریان کرد.

**ئەی گەنج**، یەکەمجار ئامۆژگاری نەفسی خۆت بکە پاشان ئامۆژگاری نەفسی کەسانی تر بکە، ئاگات لە نەفسی تایبەت بە خۆت بێت، تا شتێك لە نەفسدا مابێت پێویست بێت چاکی بکەی مەچۆ بۆ چاککردنی نەفسی کەسانی تر، هاوار بە حاڵت، تۆ لە کوێ دەزانیت کەسانی تر چاك بکەیت؟ تۆ کوێریت، چۆن ڕێنموونی کەسانی تر دەکەیت؟ تەنها کەسی چاوساغ ڕێنموونی خەڵکانی تر دەکات، تەنها پەسەندکراو دەتوانێت لە دەریای بێپەیدا قوتاریان بکات، تەنها کەسێك دەتوانێت خەڵکی بۆ لای خودا بگێڕێتەوە خودای ناسیبێت، بەڵام کەسێك خودا ناناسێت چۆن دەتوانێت ڕێنموونی خەڵکی بکات بۆ لای ئەو؟ دەبێ لە کاروبارەکانی خودادا(عزوجل) قسەت

نەمێنێ، خۆشتبوێت و کار بۆ ئەو بکەی نەك بۆ کەسانی تر، لە ئەو بترسی نەك لە شتانی تر، ئەمانە بە دڵ دێنەدی نەك بە زمان هەڵسوڕان، ئەمە لە پەنهانـدا دەکرێت نەك لە ئاشکرادا، گەر یەکتاپەرستی لە بەردەم دەرگـا بێـت و هاوەڵـدانان لـە ژوورەوە بێت ئەوە لە خودی خۆیدا دووڕووییـە، تـۆ زۆر دامـاو و لێقـەوماویی، زمانـت تـەقوا نیشان دەدات و دڵت پڕە لە خراپە! زمانت شوکر نیشان دەدات و دڵت پشتی لە خـودا کردووە، خودا(عزوجل) دەفەرموێت: ((ئەی رۆڵەی ئادەم، خێـرم بـۆ تـۆ دادەبـەزێت و شەڕت بۆ من سەردەکەوێت))[1].

**هاوار بە حاڵت**، بانگەشەی ئەوە دەکەی بەندەی خودای بەڵام گوێڕایەڵی کەسانی تر دەکەی جگە لە ئەو، گەر لە ڕاستەقینەدا خۆت بە بەندەی ئەو بکردبایە دوژمنایـەتی و دۆستایەتیت لەپێناوی ئەو دەبوو، باوەڕداری خاوەن یەقین گوێڕایەڵی نەفس و شەیتان و ئارەزووی خۆی ناکات، شەیتان ناناسێت تا گوێڕایەڵی لێ بکات، باکێکی بـە دونیـا نییە تا خۆی بۆ زەلیل بکات، بەڵکو دونیا سوك و ڕسوا دەکات و کار بۆ دوارۆژ ئەنجام دەدات، گەر دونیـای بـۆ بەدەسـت هـات وازی لـێ دەهێنێـت و پەیوەسـت دەبێـت بـە مەولای خۆیەوە، عیبادەتەکانی لە هەموو کاتەکانـدا لـەپێناوی ئەودایـە، گـوێی لـەم ئایەتە پیرۆزە گرتووە کە دەفەرموێت:

﴿ وَمَآ أُمِرُوٓا۟ إِلَّا لِيَعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ ﴾ البينة: ٥

واز لە هاوەڵدانان بهێنە بە بەشداری کردنی خەڵکی لە عیبادەتەکاندا، حەق(سبحانە وتعالى) بە تاکوتەنها شکۆمەند بکـە، ئـەو دروسـتکەری هـەموو شـتەکانە، ئـەی ئـەو کەسـەی شتێك لە خەڵکانی تر جگە لە خودا داوا دەکەی تۆ کەسێکی ژیـر و هۆشمەنـد نیت، ئایا شتێك بوونی هەیە لە گەنجینەی خودادا(عزوجل) بوونی نەبێت:

﴿ وَإِن مِّن شَىْءٍ إِلَّا عِندَنَا خَزَآئِنُهُۥ ﴾
الحجر: ٢١

[1] رواه الرافعي في إخبار قزوين.

ئەی گەنج، لەژێر پلوسکی قەدەردا سەرینێوە و ئارامگرتن بخە ژێر سەرت و تەبایی لەگەڵ خودا بدە بەسەر خۆتدا و بە چاوەڕوانی دەرووبەکەوە بەندایەتی بکە، گەر تۆ بەم جۆرە بیت ئەوا "المقدر-ئەندازەگیر" فەزڵ و منەت و چاکەی خۆی بەسەر تۆدا دادەبارێنێ، بە جۆرێك زمانی داوا و خۆزگەی تۆ نەیگاتێ.

خەڵکینە، لەگەڵ قەدەر تەبا بن و لە تەبایی لەگەڵ قەدەردا روو لە عبدالقادری موجتەهید بکەن، تەبایم لەگەڵ قەدەردا بۆ لای "القادر" پێشی خستم.

خەڵکینە، وەرن با بۆ خودا و قەدەر و کارەکانی ملکەچ بین، سەری ئاشکرا و پەنهانمان لەبەردەمی دانەوێنین، لەگەڵ قەدەر تەبابین و لە قافڵەی قەدەردا هەنگاو هەڵبگرین، چونکە قەدەر پەیامهێنی مەلیکە و لە پێناو ئەودا رێزی لێدەگرین، گەر ئەو کارەمان لەگەڵ قەدەر(پەیامهێن) ئەنجامدا بە هاوەڵی خۆی دەمانبات بۆ لای "القادر"، پاشان: ﴿ هُنَالِكَ ٱلْوَلَٰيَةُ لِلَّهِ ٱلْحَقِّ ﴾الكهف: ٤٤

خواردنەوەی رەوانت لە دەریای زانستی ئەو بۆ بەدەست دێت، خواردن لەسەر خوانی فەزڵی خودا و هۆگربوون بە هۆگری ئەو و نوقمبوون لەناو رەحمەتی، ئەم کەسانە کەسانێکی دەگمەنن لە هەر هەزار هەزار(ملیۆنێك) کەسی هۆز و عەشرەت و گەلان تەنها یەك کەسە.

ئەی گەنج، ئاگات لە تەقوا و سنوورەکانی شەرع بێت، ئاگات لە سەرپێچی نەفسی خۆت و ئارەزوو و شەیتان و هاوەڵی خراپ بێت، باوەڕدار لە کۆشان دژ بەوانە خودە لەسەری داناگرێت و شمشێرەکەی ناخاتەوە کێلان و زین لەسەر پشتی ئەسپەکەی داناگرێت، خەوتنی زاڵبوونی خەوە بەسەر چاویدا، خواردنیان لە برسێتیدایە، قسەکردنیان بۆ زۆر پێویستییە، کەڕولاڵی بووە بە ئادابیان، بەڵکو قەدەری پەروەردگار و کرداری خودا ئەوان دەهێنێتە قسە، خودا لە دونیادا زمانیان بەگەڕ دەخات وەك چۆن لە دوارۆژدا ئەندامەکانیان دەهێنێتە قسە، خودا(عزوجل) دەیانهێنێتە قسە وەك چۆن هەموو قسەکەرێك دەهێنێتە قسە، دەیانهێنێتە قسە وەك چۆن بێگیان دەهێنێتە قسە، هۆکارەکانی قسەکردنیان بۆ فەراهەم دەکات و دێنە قسەکردن، گەر خودا ئەوانی

بۆ کارێك بوێت ئەوانی بۆ ئامادە دەکات، ئەو(سبحانە وتعالی) دەیـەوێت بـە ترسان و مژدەدان پەیامی خۆی بە خەلکی بگەیەنێت تاکو بەلگەیان لەسەر راستبکاتەوە، بۆیە پێغەمبەرانی(علیهم السلام) هێنایە قسە، کاتێك پێغەمبەرانی(علیهم السلام) بۆ لای خۆی بردەوە زانایانی کارکەری لە جێگەی ئەوان راستکردەوە، ئەوانی هێنایە قسـە بۆ ئەوەی لە جێگەی پێغەمبەران(علیهم السـلام) خـەلکی چاك بکـەن، پێغەمبـەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((زانایان میراتگری پێغەمبەرانن))[1].

خەلکینە، شوکری خودا(عزوجل) بکەن بۆ نیعمەتـەکانی و لـە ئـەوەوە تەماشایان بکەن، ئەو(سبحانە وتعالی) دەفەرموێت:

﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ اللَّهِ ﴾النحل: ٥٣

کوا شوکر لە ئێوەوە بۆ خودا ئەی ئەوانەی لە نیعمەتەکانی خودادا رۆچوون؟! ئـەی ئەوانەی نیعمەتـەکانی خودا لـە خـەلکانی تـرەوە دەبیـنن، تاوێـك نیعمەتـەکانی لە خەلکانی ترەوە دەبینن و جارێکیش بە کەمیان تەماشا دەکەن و چاوەڕوانی شـتانێکن بەشی ئێوە نین و تاوێکیش بەهۆی ئەو نیعمەتانەوە لە خودا یاخی دەبن.

ئـەی گـەنج، لـە تەنهاییـدا پێویستت بـە وەرعێکـە لـە یـاخیبوون و هەلـەکاری دەرتبهێنێت، ئاتاجی بە چاودێرییەك تەماشاکردنی خودا بـۆت بـەبیر بهێنێتـەوە، تـۆ ئاتاجێکی ناچاری بۆ ئـەوەی لـە تـەنهایی و پەنهانـدا ئەمانـەت لەگـەل بێـت، پاشـان ئاتاجی بە جەنگان دژ بە ئارەزوو و شـەیتان، مـالوێرانی زۆرینـەی خـەلك لـە هەلـە و تێکەوتنەوەیە، مالوێرانی زاهیدان لە حەزەکانەوەیە، و مـالوێرانی ئەبدالیش[2] لەگـەل بیر و ختوورەی تەنهاییدایە، مالوێرانی صادیقانیش لە سـەرنجەکاندایە، پارێزگـاری لە دلیان سەرقال و خەریکی کردوون، چونکە ئەوان لەبەر دەرگانەی مەلیکدا نووسـتوون، ئەوان لە مەقامی بانگەوازدا راوەستاون، خـەلکی بـۆ ناسـینی حـەق(عزوجل) بـانگ دەکەن، بەردەوام دلان بۆ لای خودا بانگ دەکەن، دەلێن: ئەی دلان و ئەی رۆحان، ئەی

---

[1] حدیث حسن، رواه ابو داود والترمذي وابن ماجة وابن حبان.

[2] جێگرەوەی پێغەمبەران یان ئەو دۆستانەی خودا هەرکات یەکێکیان دەمرێت دانەیەك لە جێگەیان دادەنرێت.

ئینس و ئەی جن، ئەی موریدانی بەردەستی مەلیك، وەرن بۆ بەردەرگای مەلیك، بە هاتنە پێشەوەی دڵتان گوێی لێبگرن، بە پێشکەوتنی تەقوا و یەکتاپەرستیتان گوێی لێ بگرن، هەر بەو جۆرە بە مەعریفە و وەرعی باڵا و زوهد لە دونیا و دوارۆژ گوێی لێ بگرن، جگە لە مەولا(عزوجل) کارێکی تریان نییە، هەوڵ و لێبڕانیان چاککردنی خەلکییە، هەوڵ و لێبڕانیان ئاسمان و زەوی، لە عەرشەوە بۆ فەرش داگیر دەکات.

**ئەی گەنج**، واز لە نەفس و ئارەزوو بهێنە، ببە بە زەوییەکی تەخت لەبەردەم خەلکیدا، ببە بە خۆڵی بەردەستیان، خودا(عزوجل) دەفەرموێت: ﴿يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَمُخْرِجُ الْمَيِّتِ مِنَ الْحَيِّ﴾ الأنعام: ٩٥، ئیبراهیمی(علیه السلام) لە دایك و باوکێکی مردووی بێباوەڕ دەرهێنا، باوەڕدار زیندووە، بێباوەڕ مردووە، یەکتاپەرست زیندوە و هاوەڵدانەر مردووە، بۆ ئەو مەبەستەیە خودا(سبحانه وتعالی) لە هەندێ لە فەرموودەکانیدا فەرموویەتی: ((یەکەمین کەسێك لە دروستکراوەکانم مردبێت بریتییە لە ئیبلیس))[1] واتە لێم یاخی بوو و بەو یاخیبوونەش مرد، ئەم سەردەمە سەردەمی کۆتاهاتنی دونیایە، بازاڕی دووڕوویی دەرکەوتووە، بازاڕی درۆ گەرم بووە، لەگەڵ دووڕووە درۆزنە فریودەرەکاندا دامەنیشن، هاوار بە حاڵت، نەفست دووڕوو و بێباوەڕ و خراپەکار و هاوەڵدانەرە، ئەی چۆن لەگەڵی دادەنیشیت؟ سەرپێچی لێ بکە و لەگەڵی تەبا مەبە، کۆتوبەندی بکە و بەرەڵای مەکە، بەندی بکە و ئەوەندەی مافی ئەوە پێی بدە، بە تێکۆشان قەلاچۆی بکە، سواری ئەسپی ئارەزوو ببە و مەهێڵە ئەو سواری تۆ ببێت، هاوەڵی سروشتی خۆت مەکە، چونکە منداڵێکی بچووکە و ژیری و فامی نییە، چۆن لە منداڵێکی بچووکەوە فێردەبیت و شتی لێ وەردەگریت، شەیتانیش دوژمنی تۆ و باوکە گەورەت ئادەمە(علیه السلام)، چۆن دەبێ لەگەڵ شەیتان ئارامیت بۆ بێت و قسەی وەربگریت لە کاتێکدا لە نێوان تۆ و ئەودا دوژمنایەتییەکی کۆنی خوێنڕشتن هەیە؟! لە ئەو دڵنیا مەبە، ئەو دایك و باوکی تۆی کوشتووە، گەر بەسەر تۆدا دەستی بڕوات هەروەك دایك و باوکت تۆش دەکوژێت، تەقوا بکە بە چەکی خۆت و کۆمەکی وەرگرتن

---

[1] لم اجده.

لە خودا(عزوجل) بکە بە سەربازی خۆت، ئەم چەك و سەربازانەیە شەیتان دەبەزێنن و تێکوپێکی دەشکێنن و سوپاکەی وێران دەکەن، چۆن ناتوانی بیبەزێنێت لە کاتێکدا حق(سبحانه وتعالى) لەگەڵ تۆدایە؟

ئەی گەنج، دونیا و دوارۆژ کۆبکەرەوە و لە یەك شوێن دایانبنێ، و لەگەڵ مەولای خۆت تەنهابکەوە، لە دڵدا لە دونیا و دوارۆژ رووتببەرەوە، کاتێك روو لە خودا بکە لە هەرچی شتە لەخوار خوداوە رووتببیتەوە، دروستکراوەکان لە بەدیهێنەر(سبحانه وتعالى) کۆتوبەندت نەکەن، هۆکارەکان وەلا بنێ و خۆت لە ئەربابەکان دابڕنە، گەر بە لوتکەی دامەزران گەیشتیت دونیا بۆ نەفس و دوارۆژ بۆ دڵ و مەولا(عزوجل) بۆ پەنهانت دابنێ.

ئەی گەنج، لەگەڵ نەفس مەبە، لەگەڵ ئارەزوو مەبە، لەگەڵ دونیا مەبە، لەگەڵ دوارۆژ مەبە، تەنها شوێنپێی حق هەڵبگرە، بەدڵنیایی دەگەیت بەو گەنجینەی هەرگیز کۆتایی پێ نایەت، لەو بارەدا لە حقەوە(عزوجل) هیدایەتت بۆ رەوانە دەکرێت و بۆ هەتاهەتایە گومڕا و سەرلێشێواو نابیت، لە گوناهەکانت تەوبە بکە و بۆ لای مەولای خۆیت(عزوجل) لێیان رابکە، گەر تەوبەت کرد با ئاشکرا و پەنهانت تەوبە بکەن، تەوبەکردن وەرگەڕانی دەوڵەتێکە، بە تەوبەی تەواو پۆشاکی پاخیبوون لەبەر خۆت دابڕنە، حەیا لە خودا بکە بە حەقیقەت نەك بە مەجاز، ئەمەش بریتییە لە کار و کردەوەکانی دڵ لەدوای پاکێتی ئەندامەکان بە کردەوە شەرعییەکان، قاڵب کرداری خۆی هەیە و دڵیش(قلب) کرداری خۆی هەیە، کاتێك دڵ لە هۆکارەکان و پەیوەستبوون بە دروستکراوان دێتە دەرەوە سواری دەریای تەوەکول و ناسینی خودا(عزوجل) و زانست بە ئەو بووە، وازیهێناوە لە هۆ و هەوڵی بەدەستهێنانی هۆ، گەر چووە ناو ئەو دەریایە ئەوکات دەڵێت:

﴿الَّذِي خَلَقَنِي فَهُوَ يَهْدِينِ ﴿٧٨﴾﴾ الشعراء: ٧٨

لە کەناراوێکەوە بۆ کەناراوێکی تر هیدایەتی دەدات، لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، تا لەسەر شەقامی راست و دروست رادەوەستێت، هەتا زیاتر یادی خودا بکات شەقامەکەی زۆرتر جیلوە دەکات و شتە نامۆکانی زیاتر لێ دووردەکەوێتەوە، دڵی ئەو

کەسەی بەدوای خودادا(عزوجل) دەگەڕێت مەودایەکی زۆر دەبڕێت و هەموو شتێك دەخاتە پشتی خۆیەوە، گەر لە یەکێك لە قۆناغەکاندا ترسی تیاچوونی هەبوو ئیمانەکەی دەردەکەوێت و هانیدەدات و ئاگری ترس و نامۆبوون خامۆش دەکات و لە جێگەی ئەوە نووری هۆگربوون و دڵخۆشی و نزیکی جێگەی دەگرێتەوە.

ئەی گەنج، گەر نەخۆشی رووی لێکردی ئەوا بە دەستی ئارامگرتن پێشوازی لێ بکە و ئارامبگرە تا دەواکەی دێت، گەر دەوات بۆ هات بە دەستی شوکر پێشوازی لێ بکە، گەر لەسەر ئەم حاڵە بووی ئەوا لە زیندەگییەکی خێرادای، ترسان لە ئاگر جگەری باوەڕدارانی لەت لەت کردووە، رەنگی زەرد هەڵگەڕاندوون و دڵی پڕ لە دڵتەنگی کردوون، گەر ئەم ترسە زاڵ بوو بەسەریاندا خودا(عزوجل) ئاوی رەحمەت و لوتفی خۆی بەسەریاندا دادەبارێنێت، و دەرگای دوارۆژیان بۆ دەکاتەوە و ئەمن و ئاسایشی ئەوێ دەبینن، کاتێك سوکناییان بۆ هات و دڵنیابوونەوە و کەمێك دڵخۆشی و ئاسوودەیی رووی لێکردن دەروازەی جەلال بە روویاندا دەکاتەوە و دڵ و نهێنییان پارچە پارچە دەکات و ترسێکی توندتر لەوەی یەکەم دایاندەگرێتەوە، کاتێك ئەم ترسەش گەیشتە لوتکە دەروازەی جەمالیان بە روودا واڵا دەبێت و سوکناییان بۆ دێت و دڵنیایی روویان لێ دەکات و بەئاگا دێنەوە و پلە و پایەی بەرز بەدەست دەهێنن، ئەمانە چەند ئاست و پلە و پایەکی یەك لەدوای یەکن.

ئەی گەنج، با هەوڵ و خۆزگەت خواردن و خواردنەوە و پۆشاك و هاوسەریکردن نەبێت، هەر بەو جۆرە هەوڵ و خۆزگەت مەکە بە شوێنی نیشتەجێبوون و کۆکردنەوەی ماڵ و سامان، هەموو ئەمانە بریتین لە هەوڵ و خۆزگەی نەفس و سروشتی مرۆڤ، هەوڵ و خۆزگەی دڵ و پەنهانت لە کوێیە کە داوای حەق(عزوجل) دەکەن؟ هەوڵ و خۆزگەت ئەوەیە کە داگیرت دەکات، با پەروەردگارت و ئەوەی لەلای ئەوە بێت بە هەوڵ و خۆزگەت، دونیا هاوتایەکی هەیە کە بریتییە لە دوارۆژ، دروستکراوەکان جێگرەوەیەکیان هەیە کە بریتییە لە بەدیهێنەر(سبحانە وتعالى)، هەر شتێك لەم دونیا کەموکورتەدا وازلێبهێنی بریتییەکی و چاکتر و باشتر لە جێگەی ئەوە لەم دونیایەدا بەدەست دەهێنێت، وا دابنێ تەنها ئەمڕۆ لە تەمەنت ماوە، خۆت بۆ دوارۆژ ئامادە

بكە، بۆ هاتنی فریشتەی ڕۆحكێشان، دونیا بۆ خوداناسان ئامادە بووە و دوارۆژیش ئاوەدانكەرەوەیە بۆیان، كاتێك غیرەت لە خوداوە(عزوجل) دێت ئەوان لە دونیا دادەبڕێت، سەرهەڵدان(تكوین) لە جێگەی دوارۆژ ڕاستدەبێتەوە ئەوكات نە ئاتاجن بە دونیا نە بە دوارۆژ، ئەی درۆزن، تۆ لە بوونی نیعمەتدا خودات خۆشدەوێت، كاتێك بەلا دێت هەڵدێیت وەك ئەوەی ڕۆژێك لە ڕۆژان خودا خۆشەویستت نەبووبێت، بەندەی ڕاستەقینە لە كاتی تاقیكردنەوەدا دەردەكەوێت، گەر بەلا و ناخۆشی لە خوداوە داباری و تۆ دامەزراو بوویت ئەوا تۆ خودات خۆشدەوێت، گەر گۆڕانت بەسەردا هات درۆ دەردەكەوێ و بانگەشەكە هەڵدەوەشێتەوە و دەڕوات.

پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ((ئەی پێغەمبەری خودا، من تۆم خۆشدەوێت، فەرمووی: پۆشاكێك لە هەژاری بۆ خۆت ئامادە بكە))[1] پیاوێكی تر هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ((من خودام(عزوجل) خۆشدەوێت، فەرمووی: لە بەلا پۆشاكێك بۆ خۆت دروست بكە))[2].

خۆشەویستی خودا و پێغەمبەر(ﷺ) هاوتا و هاوملی هەژاری و بەلا و ناخۆشین، بۆ ئەو مەبەستەیە یەكێك لە صالحان دەڵێت: بەلای بە وەلائەوە گرێداوە بۆ ئەوەی كەس بانگەشە نەكات، گەر بەو جۆرە نەبوایە هەموو كەسێك بانگەشەی خۆشەویستی خودای(عزوجل) دەكرد، دامەزران لەسەر بەلا و هەژاری كردووە بە بەڵگەی ئاگاهی لەسەر ئەو خۆشەویستییە:

﴿ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾ ﴾ البقرة: ٢٠١



[1] رواه الحاكم والترمذي والبيهقي بلفظ آخر.

[2] لم أجده بهذا اللفظ.

# مەجلیسی دووەم

## هەژاری

لە ٥/شەوال/٥٤٥هـ شێخ عبدالقادر(خودا لێی رازی بێت) لە قوتابخانەکەی فەرموویی:

بە بزربوون و کەنارگیریت لە خودا فریوت خواردووە، لەو گومڕایی و سەرلێشێوان و بێئاگاییەی خۆت بگەڕێوە بەر لەوەی لێتبدرێت و سوك و رسوا ببیت و مار و دووپشکی بەڵا و ناخۆشییەکان بەسەر تۆدا داببارێن، هێشتا تام و چێژی بەڵات نەکردوە بۆیە سەیر نییە فریو بخۆی و گومڕا ببیت، بە کۆکردنەوەی ئەوەی تۆی لەناودای دڵخۆش مەبە ئەوە شتێکی تیاچووە و بەم نزیکانە تیادەچێت، خودا(عزوجل) دەفەرموێت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُوا۟ بِمَآ أُوتُوٓا۟ أَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ﴿٤٤﴾﴾ الأنعام: ٤٤

بە ئارامگرتن دەتوانی ئەوەی لە لای خودایە بەدەستی بهێنیت، بۆیە خودا فەرمانی بە ئارامگرتن کردووە، هەژاری و ئارامگرتن تەنها لە باوەڕداردا کۆدەبنەوە، خۆشەویستان تاقیدەکرێنەوە و ئارام دەگرن و ئیلهامی خێر دەکرێن لەسەر بەڵاکانیان، ئارام دەگرن لەسەر ئەوەی لە پەروەردگاریانەوە(عزوجل) لەسەریان نوێدەبێتەوە، گەر ئارامگرتن نەبوایە منتان لەناو خۆتاندا نەدەبینییەوە، کراوم بە تۆڕێك و باڵندەکانم پێ راو دەکرێن، ئەم شەو بۆ ئەو شەو چاوم دەکەنەوە و لاقەکانم بەرەڵا دەکەن، لە رۆژیشدا هەردوو چاوم دادەخەن و لاقەکانم بە تۆڕەکە دەبەستنەوە، ئەوەش لەپێناو بەرژەوەندی ئێوەدا، بەڵام ئێوە نازانن، گەر فەرمانی خودا(عزوجل) نەبێت ئایا کەسی ژیر و هۆشمەند لەم شارەدا نیشتەجێ دەبێت و مامەڵە لەگەڵ خەڵکی ئەم شارەدا دەکات لە کاتێکدا ریا و دووڕوویی و ستەم و زۆری شوبهە و حەرام تیایدا پەرەی

سەندووە و نیعمەتەکانی خودا سەندووە، کوفر بە نیعمەتەکانی حەق(عزوجل) تەشەنەی سەندووە و نیعمەتەکانی خودا لە گوناه و خراپە و تاواندا بەکاردەهێنرێن، کەسی دەستەوسان لە ماڵەوە و خۆپارێز لە دوکانەکەیدا و زەندیق لە شەرابخواردنەوەدا و صدیق لەسەر کورسییەکەی زۆربووە، گەر بڕیاری خودا نەبوایە ئەوەی لە ماڵەکانتاندا گوزەر دەکات باسم دەکرد، بەڵام باغەیەکم هەیە ئاتاجە بە بینا، منداڵم هەیە ئاتاجن بە پەروەردە، گەر هەندێك لەوەی لامە پەردەی لەسەر لادەم دەبێتە هۆی دابڕانی من لە ئێوە، لەم حاڵەتەی من تێیکەوتووم ئاتاجم بە هێزی پێغەمبەران(علیهم السلام)، ئاتاجم بە ئارامگرتنی ئەوانەی پێش من کەوتوون لە ئادەمەوە(علیه السلام) تا ئەم سەردەمە، ئاتاجم بە هێزێکی رەبانی، خودایە داوای لوتف و کۆمەك و رازیبوونت لێدەکەم.. آمین.

ئەی گەنج، بۆ مانەوەی دونیا و خۆشی وەرگرتن لە دونیا دروستنەکراوی، ئەوەی تۆی تێدای و خودا(عزوجل) پێی رازی نییە بیگۆڕە، لە گوێڕایەڵی خودا بە وتنی: ((لا إله إلا الله محمد رسول الله)) قەناعەتت کردووە، ئەمە سوودێك بە تۆ ناگەیەنێت گەر شتێکی تری نەخەیە سەر، ئیمان بریتییە لە گوفتار و کردار، ئەمەش لە تۆ قبووڵ ناکرێت و سوودێکت پێ ناگەیەنێت گەر گوناه و یاخیبوون و هەڵە و تێکەوتن و سەرپێچی لە حەق(عزوجل) ئەنجام بدەیت، لەسەر ئەمانە سوور و بەردەوام بیت و واز لە نوێژ و رۆژوو و صەدەقە و کاری چاکە بهێنی، ئەو دوو شایەتییە چ سوودێك بە تۆ دەگەیەنێت، گەر بڵێیت: "لا إله إلا الله" تەنها بانگەشەت کردووە، پێت دەوترێت: ئەی خاوەن گوفتار، ئایا بەڵگەیەکت لەسەر ئەو وتنە بەدەستەوەیە، بەڵگەکەت چییە؟ بەڵگەکە ئەنجامدانی فەرمانەکان و دوورکەوتنەوەیە لە نەهیلێکراوەکان، و ئارامگرتن لەسەر بەلا و ناخۆشییەکان و خۆڕادەست کردن بە قەدەر، ئەمانە بریتین لە بەڵگەی ئەو بانگەشەیە، گەر ئەم کارانەشت ئەنجامدا تەنها بە ئیخلاص بۆ خودا(عزوجل) لێت وەردەگیرێت، قسە بەبێ کردار و کردار بەبێ ئیخلاص و تەبایی لەگەڵ سوننەت وەرناگیرێت، بە شتێك لە ماڵ و سامانتان دڵنەوایی هەژاران بکەن، دەست بەڕووی ئەوانەوە مەنێن لێتان داوا دەکەن و دەتوانن پێیان ببەخشن با شتێکی کەم یان زۆریش بێت، لەگەڵ حەق(عزوجل) تەبا بن لە خۆشویستنی بەخشیندا، شوکری خودا بکەن

ئیوەی شایستە کردووە و دەسەڵاتی بەخشینی پێداون، هاوار بە حاڵت، گەر هەژار هەدیەی خودا(عزوجل) بێت و تۆش بتوانی پێی ببەخشیت چۆن هەدیە بۆ سەر خاوەن هەدیە دەگێڕیتەوە؟![1]. لەلای من گوێدەگریت و دەگریت، بەڵام کاتێك هەژارێك رووت لێ دەکات دڵت رەق دەبێت، ئەوەش بەڵگەی ئەوەیە گریان و گوێگرتنەکەت بۆ خودا(عزوجل) نەبووە، یەکەمجار گوێگرتن لەلای من بە نهێنی(سر)ە، پاشان بە دڵ و ئەوجا بە ئەندامەکان، هەموو ئەمانەش لە خێردا، گەر هاتی بۆ لای من وەرە، بەڵام زانست و کردار و زمان و رەچەڵەك و پلە و پایەی خۆت وەلا بنێ، هاورێ لەگەڵ لەبیرچوونەوەی ماڵ و سامان و خانەوادەکەت، لەبەردەم مندا بە دڵێکی رووت لە هەرچی شتە جگە لە خودا(سبحانه وتعالى) رابوەستە بۆئەوەی بە نزیکی لە خۆی و فەزڵ و منەتی خۆی پۆشتەی بکاتەوە، گەر بەم جۆرە هاتی بۆ لای من وەك باڵندەیەکت لێ دێت بە سکی برسییەوە دەردەچێت و بە سکی پڕەوە دەگەڕێتەوە، نووری دڵ لە نووری حەقەوەیە(عزوجل) بۆ ئەو مەبەستەیە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:

((لە فیراسەتی باوەڕدار بترسە، ئەو بە نووری خودا(عزوجل) دەڕوانێت))[2].

ئەی مرۆی لادەر، لە باوەڕدار بترسە و مەچۆ ژوورەوە بۆ لای، لە کاتێکدا بەهۆی پیسی گوناه و یاخیبوونەوە خۆت پیس کردووە، ئەو بە نووری خودا(عزوجل) ئەوەی تۆ تێیکەوتووی دەبینێت، هاوەڵدانان و دووڕوویەکەت دەبینێت، کردەوە خراپەکەت لەژێر پۆشاکەکەتەوە تەماشا دەکات، رسوایی و شەرمەزاریت هەست پێ دەکات، هەر کەس کەسێکی سەرفراز نەبینێت سەرفراز نابێت تۆ ئارەزووبازی و ئارەزووبازییەکەت لەگەڵ ئارەزووبازاندایە.

(کەسێك پرسی ئەم کوڕییە تاکو کەی؟):-

ئەویش پێی وت: تا دەگەی بە پزیشکێك و لەبەر دەرگانەیدا دەمێنیتەوە و گومانی باشی پێ دەبەی و ئەو تۆمەتانە دەسڕییەوە بەرانبەری کەوتۆتە ناو دڵتەوە،

[1] رواه الترمذي وقال حديث غريب والطبراني بإسناد حسن.

[2] رواه الترمذي وقال حديث حسن غريب والطبراني بإسناد حسن.

منداڵەکانت دەهێنی و خۆت دەخەیە بەر دەرگای ماڵەکەی، ئارام دەگریت لەسەر تاڵاوی دەواکانی، لەو بارەدا کوێری چاوەکانت نامێنێت، بۆ خودا زەلیل و گەردنکەچ بە و پێویستییەکانت ببە بۆ لای ئەو، نەفسی خۆت بە هیچ مەزانە و وەك کەسێکی موفلیس تەماشای بکە.

دەرگای دروستکراوەکان دابخە و ئەو دەرگایەی لە نێوان تۆ و ئەودایە ئاوەڵا بکە، دان بە گوناهەکانی خۆتدا بنێ و بۆ کەموکورتییەکانت داوای لێبوردن بکە، یەقینت هەبێت هیچ کەسێك نییە زیان و قازانج بە تۆ بگەیەنێت، هیچ کەسێك نییە بە تۆ ببەخشێ و لێتبگرێتەوە جگە لە خودا(عزوجل)، لەو بارەدا کوێری چاوەکانت نامێنێت و بینین و بەصیرەتت بەگەڕ دەکەون.

**ئەی گەنج**، زبری پۆشاك و خواردنت گرنگییەکی نییە، گرنگی لە زوهدی دڵی تۆدایە؛ یەکەمین شتێك کەسی صادق بەسەر ناوەوەیدا دەیپۆشێت بریتییە لە خوری، پاشان ئەم پۆشاکە روو لە دەرەوەی دەکات، یەکەمجار نهێنی و پەنهانی پۆشاك دەپۆشێت، ئەوجا دڵی و پاشان نەفسی و لە کۆتاییدا ئەندامەکانی لاشەی، کاتێك هەموو بوونی زبری پۆشی دەستی سۆز و بەزەیی و رەحمەت و مننەت رووی لێ دەکات و هەموو شتێکی بۆ دەگۆڕێت، پۆشاکی رەشی لەبەردەکاتەوە و دەیگۆڕێتەوە بۆ پۆشاکی دڵخۆشی، ناخۆشییەکانی بۆ دەکات بە خۆشی، بێزراو و ناپەسەندەکانی بۆ دەکات بە پەسەند، ترسی بە ئاسایش بۆ ئاڵوگۆڕ دەکات و دووری بۆ دەگۆڕێت بە نزیکی و هەژاری بە دەوڵەمەندی.

**ئەی گەنج**، بە دەستی زوهدەوە دەست بۆ بەشەکانت(بەشە دونیاییەکان) ببە نەك بە دەستی حەزەوە، ئەو کەسەی دەخوات و دەگری وەك ئەو کەسە نییە دەخوات و شەڕی ئەو بەشانە دەپارێزرێت، گەر لەسەر دەستی پزیشکێك بخۆیت باشترە بۆت وەك لەوەی بەتەنها و بۆ خۆت بخۆیت بەبێ زانینی بنەڕەت و ریشەکەی(واتە ئەسڵ)، چەندە دڵی ئێوە رەق بووە! ئەمانەت لە نێوان ئێوەدا هەڵگیراوە، بەزەیی لە نێوان ئێوەدا

نەماوە، حوکمەکانی شەرع ئەمانەت بوون لـەلای ئێـوە، وازتـان لێهێنـان و ناپاکیتـان لێکردن، هاوار بـە حاڵـت، گـەر پابەنـد نـەبیت بـە ئەمانەتـەوە لـە کـەمترین مـاوەدا چاوەکانت پڕ دەبن لە ئاو و کۆتوبەند دەکرێتە دەست و لاقەکانتـەوە و خودا(سـبحانە وتعالی) دەرگای رەحمـەتی خـۆی بـە رووی تـۆدا دادەخـات، دڵڕەقـی بەرانبـەر بـە تـۆ هەڵدەداتە ناو دڵی مەردوومانەوە و رێگریـیان لێ دەکات بە تۆ ببەخشن.

سەرتان لەگەڵ پەروەردگار(عزوجل) پارێزگاری لێ بکەن، خۆتـان بپـارێزن لـە ئـەو، چونکە گرتنی ئەو توند و ئازاربەخشـە، لـە ئاسـایش و عافییـەت و خۆشـگوزەرانی و رەفاهییـەت ئێـوە دەردەهێنێـت، لـە ئـەو بترسـن ئـەو خـودای ئاسمـان و زەوییـە، نیعمەتـەکانی بـە شـوکر بپـارێزن و فەرمانـەکان و نەهییـەکانی بـە گوێڕایـەڵی و ملکەچبوون وەربگرن، بە ئارامگرتن رووبەڕووی ناخۆشی و بە شوکر رووبەڕووی خۆشی ببنەوە، ئەوانەی پێش ئێوە کەوتن لە پێغەمبەران و صالحان بەم جۆرە بـوون، لەسـەر نیعمەت شوکریان دەکرد و لەسەر بەلا و ناخۆشـی ئارامیـان دەگـرت، لەسـەر سفرەی پـاخیبوون لـە خـودا هەسـتن و لـە خـوانی گوێڕایـەڵی ئەو(سـبحانە وتعـالی) بخـۆن، سنوورەکانی خودا بپارێزن، گەر خۆشی رووی لێکردن شوکری بکەن، کاتێـک ناخۆشـی رووی لێکردن لە گوناهەکانتان تەوبە بکەن، دادگـایی نەفسـی خۆتـان بکـەن، چـونکە پـەروەردگار لـە بەنـدەکانی سـتەم ناکـات، بـیر لـە مـردن و دوای مـردن بکەنـەوە، بیربکەنەوە لە پەروەردگار و دادگایی پەروەردگار و تەماشاکردنی بۆ ئێوە.

**بەئاگابێن**، ئەم خەوە تاکو کەی، ئەم نەزانی و دوودڵییە لـە پووچیـدا تـاکو کـەی، هەتا کەی هـاودەمی کردنـی نـەفس و ئـارەزوو و عـادەتی خـراپ؟ بۆچـی خۆتـان بـە عیبادەتی پەروەردگار(عزوجل) و شوێنکەوتنی شەرع ناڕازێننەوە؟ عیبادەت وازهێنانە لە عادەتی خراپ، بۆ بە ئادابی قورئان و کەلامی پێغەمبەرایەتی ئەدەب وەرناگرن؟

**ئەی گەنج**، لەگەڵ کوێری و نەزانی و لەگەڵ بێئاگایی و خەوتن تێکـەڵ بـە خـەڵکی مەبە، بە بەصیرەت و زانسـت و ئاگاهی تێکەڵ بە خەڵکی ببە، گەر شتێکی پەسـەندت لەوان بینی و سوودی پێدەگەیاندی شوێنی بکەوە، گـەر شـتێکی ناپەسـەندت بـینی و

زیانی پێ دەگەیاندی لێی دووریکەوە و بیدەرەوە بە رووی‌یاندا، ئێوە لە بێئاگاییەکی تەواودان لە پەروەردگار(عزوجل)، بۆ ئەو بەئاگابێن، پابەندبن بە مزگەوت و زۆری صەلەوات لەسەر پێغەمبەر(ﷺ)، چونکە ئەو فەرموویەتی: ((گەر لە ئاسمانەوە ئاگرێت دابەزێت تەنها ئەهلی مزگەوتی لێ قوتار دەبێت))[1].

گەر لە نوێژەکاندا تەمبەڵی بکەن پەیوەندیتان لەگەڵ خودا(عزوجل) دەپچرێت، بۆ ئەو مەبەستەیە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((نزیکترین کاتی بەندە لە پەروەردگارییەوە ئەو کاتەیە لە سوژدەدایە))[2].

**هاوار بە حاڵت**، چەندە تەئویل دەکەی! بە روخسەت کار دەکەی، کەسی تەئویلکەر غەدرکەرە، خۆزگە رێگەی عەزیمەتمان دەگرتە بەر و لەسەر کۆدەنگی کۆدەبووینەوە و لە کاروکردەوەکانماندا ئیخلاصمان ئەنجام دەدا، ئەو کات لە سزای حەق(عزوجل) رزگارمان دەبوو، ئەی دەبێ حاڵمان چۆن بێت کاتێك تەئویل دەکەین و رێگەی روخسەت دەگرینە بەر؟ عەزیمەت و ئەهلی عەزیمەت نەمان و رۆیشتن، ئەم سەردەمە سەردەمی روخسەتە نەك سەردەمی عەزیمەت، ئەم سەردەمە سەردەمی ریا و دووڕوویی و وەرگرتنی ماڵ و ساماڵی خەڵکییە بەبێ هیچ رەوایەتییەك، ئەوانە زۆرن نوێژ دەکەن و بەرۆژوو دەبن و حەج دەکەن و زەکات دەدەن و کاری چاکە لەپێناوی خەڵکیدا نەك لە پێناوی خودادا ئەنجام دەدەن، زۆربەی ئەم جیهانە بووە بە "خەڵك لەناو خەڵکدا" بەبێ خودا، هەمووتان دڵتان مردووە و نەفس و ئارەزووتان زیندوو و بەدوای دونیادا عەوداڵن، بین بەو کەسەی دڵی زیندووە بە دەرچوون لە خەڵکی و هەستان لەگەڵ حەق(عزوجل) لە رووی ماناوە، چونکە وێنە و رووالەت لەم مەقامەدا بەهەند وەرناگیرێت، زیندەگی دڵ هەستان و خۆرازاندنەوەیە بە فەرمانی خودا(عزوجل) و کۆتاهێنان بەو شتانەی نەهی لێکردوون و ئارامگرتن لەگەڵی لەسەر بەلا و بڕیار و قەدەرەکانی.

---

[1] لم أجده بهذا اللفظ، إنما روى ابن عدي والديلمي في مسند الفردوس كما في "الجامع الصغير" پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: "گەر خودا بیەنا و نەخۆشییەکی بۆ گەل و هۆزێك ویست تەماشای ئەهلی مزگەوت دەکات و لێیان لادەدات".

[2] رواه مسلم.

ئەی گەنج، لە بڕیارە بڕاوەکانیدا خۆت رادەست بکە لەدوای ئەوە لەگەڵ ئەو(سبحانه وتعالى) راستبەرەوە، کارەکە پێویستی بە بناغە و پاشان بینا هەیە، لە شەوان و رۆژان و هەموو کاتەکاندا لەسەر ئەوە بەردەوام بە، هاوار بە حاڵت، بیر لە کاری خۆت بکەرەوە، بیر لە کاروباری دڵ بکەرەوە، گەر چاکەیەکت لە خۆدا بینی شوکری خودای(سبحانه وتعالى) لەسەر بکە، گەر خرایەکی خۆت بینی تەوبەی لێ بکە، بەو بیرکردنەوەیە ئاییننەکەت زیندوو دەبێتەوە و شەیتانەکەت دەمرێت، بۆ ئەو مەبەستەیە وتراوە: ساتێك بیرکردنەوە لە زیندووکردنەوەی شەوێك باشترە، ئەی ئومەتی محەمەد(ﷺ) شوکری خودا بکەن، بە کەمێك لە کار و کردەوەی چاك لە ئێوەوە- بەراورد بەوانەی پێشوو- رازی بووە، ئێوە دواییینەکانن و لە رۆژی دوایيدا پێشینەکانن، ساغان و چاکانی ئێوە هاوتایان نییە، ئێوە ئەمیران و ئومەتەکانی پێشوو رەعییەتن، هەتا تۆ لە خانەی نەفس و ئارەزوو و سروشتی خۆدا بیت تەندروست نابیت، هەتا لەگەڵ خەڵکی ململانێت هەبێت لەوەی لەژێر دەستیاندایە و بە ریا و دووڕوویی لێیان وەربگریت ساغ و تەندروست نابیت، هەتا حەزی دونیات هەبێ تۆ ساغ و تەندروست نیت، هەتا بە خەڵکییەوە کۆتوبەند بیت ساغ و تەندروست نیت، خودایە، ساغی و تەندروستیمان پێ ببەخشە.

﴿ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ (٢٠١) ﴾ البقرة: ٢٠١



## مەجلیسی سێیەم

# خۆزگەنەخواستن بۆ دەوڵەمەندی

بەیانی رۆژی هەینی، ٨/شەوال/٥٤٥هـ لە قوتابخانەکەی، شێخ عبدالقادر(خودا لێی رازی بێت) فەرموی:

**ئەی هەژار**، ئاوات مەخوازە بۆ دەوڵەمەندی لەوانەیە هۆی تیاچوونی تۆ بێت، تۆ ئەی نەخۆش، ئاوات مەخوازە بۆ لەشساغی و تەندروستی لەوانەیە هۆی تیاچوونت بێت، کەسێکی ئاقڵ بە، بەروبوومت بپارێزە کارەکانت پەسەند و شوکرکراو دەبن، بەو برەی لەلای تۆیە قەناعەت بکە و زیاتر لەوە داوا مەکە، هەر شتێك کە پەروەردگار بە هۆی داوای تۆوە پێتدەدا دەبێتە لێڵی و بێزاری، من بۆ خۆم ئەمەم ئەزموون کردووە، مەگەر بەندەکە لە دڵەوە فەرمانی پێ کرابێت بە داواکردن، کاتێك فەرمانی پێکرا بە داوا بەرەکەت دەکەوێتە ناو ئەوەی داوای کردووە و پیسییەکانی لێ جیادەکرێنەوە، با زۆربەی داواکانت داوای عەفو و عافییەت و سەلامەتی هەمیشەیی بن لە دین و دونیا و دوارۆژدا، تەنها بەمە قەناعەت بکە.

هەڵبژاردنت نەبێت بەسەر هەڵبژاردنی خودادا بۆ تۆ، زۆرداری بەکارمەهێنە، چونکە ئەو(سبحانە وتعالی) پشتت دەشکێنێ، بە گەنجێتی و هێز و ماڵ و سامانت زۆرداری بەسەر خودا و خەڵکیدا مەکە، چونکە خودا(سبحانە وتعالی) لە تۆ دێتە دەست و ویرانت دەکات، خودا دەتگرێت هەروەك چۆن ئەوانەی پێش تۆی گرت، گرتنی خودا توند و ئازاربەخشە، هاوار بە حاڵت، زمانت موسڵمانە و دڵت بەو جۆرە نییە، گوفتارت موسڵمانە و رەفتارت بەو جۆرە نییە، تۆ لە ئاشکرادا موسڵمانی و لە تەنهاییدا بەو جۆرە نیت، ئازانی گەر نوێژت کرد و بەڕۆژوو بووی و هەموو کارە

خێرەکانت ئەنجامدا گەر بەو کارانە مەبەستت ڕووی پاکی خودا(عزوجل) نەبێت ئەوا تۆ دەبیتە کەسێکی دووڕووی دوور لە خودا(عزوجل)، هەر ئێستا تەوبە بکە و بۆ لای خودا(عزوجل) بگەڕێوە، تەوبە بکە لە هەرچی کردار و گوفتار و مەبەستە نزمەکانە، پیاوانی ئەم ڕێگە ڕووپامایی لە کاروکردەوەکانیاندا بوونی نییە، ئەوان سەرفرازان و خاوەن یەقینان و یەکتاپەرستان و موخلیصان و ئارامگرانن لەسەر بەڵاکانی خودا و ناخۆشییەکانی، ئەوان شوکرکەرانی نیعمەتەکانی خودان، بە زمان و دڵ و پەنهانیان یادی خودا دەکەن، کاتێك لە خەڵکەوە ئازاریان پێ دەگات خەندە دەکەن بەڕوویاندا، موڵکی دونیا لە ئەوان کەنارگیرە، هەموو ئەوانەی لەسەر زەوین لەلایان مردوو و دەستەوسان و نەخۆش و هەژارن، بەهەشت لەلای ئەوان وەك وێرانە وایە، ئاگر لەلای ئەوان کوژاوەتەوە، نە زەوی و نە ئاسمان و نە ئەوانەی لە زەوی ئاسماندا نیشتەجێ بوون، هەموو ئاراستەکانیان یەکدەگرن و دەبن بە یەك ئاراستە، کاتی خۆی لەگەڵ دونیا و ئەهلی دونیا بوون دواتر لەگەڵ دوارۆژ و ئەهلی دوارۆژ بوون، پاشان لەگەڵ پەروەردگاری دونیا و دوارۆژ بوون، بە خودا و خۆشەویستانی خودا گەیشتن، بە دڵیان لەگەڵ بەرەو خودا هەنگاویان هەڵگرت تا بە خودا گەیشتن و هاودڵیان بەر لە ڕێگا هەڵبژارد، دەرگایەکیان لەنێوان خۆیان و خودادا کردەوە، خودا یادی ئەوان دەکات و ئەوانیش بەردەوام یادی خودا دەکەن تا یادی خودا گوناهەکانی لە گەردن کردنەوە، لەگەڵ خەڵکی بزر و دابڕاون و بوون و ئامادەبوونیان بە خوداوەیە، گوێیان لەم ئایەتە بوو کە دەفەرموێت:

﴿ فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ وَاشْكُرُوا لِي وَلَا تَكْفُرُونِ ﴿١٥٢﴾ ﴾ البقرة: ١٥٢

بۆیە پابەندبوون بە یادی خوداوە بۆ ئەوەی ئەویش یادیان بکات، گوێیان لەم فەرموودەی خودا گرت کە هەندێ کەس باسیان کردووە: ((من هاودەمی ئەو کەسەم یادم دەکات))[1] بۆیە کۆچیان لە مەجلیسی خەڵکی کرد تاکو بێن بە هاودەمی خودا.

---

[1] رواه البيهقي في "الشعب".

**خەلکینە**، هەوەسبازی نیشان مەدەن، ئێوە بۆ خۆتان هەوەسن، ئەم زانستە بەبێ کردار سوود بە ئێوە ناگەیەنێت، ئێوە ئاتاجن بەم رەشییە لەسەر سپێتی کار بکەن و ئەوەش حوکمی خودایە(عزوجل)، رۆژ لەدوای رۆژ و ساڵ لەدوای ساڵ کاری پێ دەکەن تا بەروبوومەکەی دەکەوێتە دەستتان.

**ئەی گەنج**، زانستەکەت بانگت لێ دەکات و پێت دەڵێت من بەلگە و شایەتم لەسەرت گەر کارم پێ نەکەی، بەلگە و شایەتم بۆت گەر کارم پێ بکەی، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموویەتی: ((زانست بانگ لە کردار دەکات، ئەگەر وەڵامی دایەوە باشە، ئەگەر نە، کۆچ دەکات))[1].

بەرەکەتی زانست کۆچ دەکات و بەلا و ناخۆشییەکەی دەمێنێتەوە، شفاعەتکردنی لای مەولا(سبحانه وتعالى) بۆ تۆ نامێنێت، و لە کاتی پێویستییەکانی تۆدا نایەت بۆ لات، کۆچ دەکات، چونکە وەك توێکلێك دەمێنێتەوە، کرۆکی زانست بریتییە لە کردار، شوێنکەوتنی تۆ بۆ پێغەمبەر(ﷺ) راست و دروست دەرناچێت تا کار نەکەیت بەوەی فەرموویەتی، گەر کار بکەی بەوەی فەرمانی پێکردووی دڵ و پەنهانت پێشوازی لێ دەکات و دەیانبات بۆ لای پەروەردگار(عزوجل)، زانستەکەت بانگت لێ دەکات بەلام گوێی بۆ ناگری، چونکە خاوەنی دڵ نیت، بە گوێی دڵ و پەنهانت گوێی بۆ بگرە و ببیستە، قسەکەی وەربگرە چونکە سوودت پێ دەگەیەنێت، زانست بە کردار لە زانای دابەزێنەری زانست نزیکت دەکاتەوە، گەر بەم حوکمە کارت کرد -کە بریتییە لە زانستی یەکەم- سەرچاوەی زانستی دووەمت بۆ هەڵدەقوڵێت، ئەو کات دەبیت بە خاوەنی دوو سەرچاوەی جارییوو، دڵت لە حوکم و زانستی ئاشکرا و زانستی پەنهانەوە ترسی بۆ پەیدا دەبێت، ئەو کات پاککردنەوەی ئەو زانستەت لەسەر پێویست دەبێت، بە زانست وەسێت بۆ برایان و موریدان بکە، زەکاتی زانست بریتییە لە بلاوەپێکردن و بانگەوازی خەلکی بۆ لای حەق(عزوجل).

---

[1] لم أجد له أصلا ولعله رواه بالمعنى وهذا اللفظ هو من قول إبراهيم بن أدهم.

ئـەی گـەنج، خـودا(سـبحانه وتعـالى) دەفـەرموێت: ﴿إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ۝١٠﴾ الزمر: ١٠

بە کەسابەتی خۆت بخۆ نەك بە ئاییندکەت، کەسابەت بکە و بخۆ و دڵنەوایی کەسانی تریشی پێ بکە، کەسابەتی باوەڕداران ژەمی صادیقانە، لا بەلای کار و پیشەدا دەکەنەوە لەپێناو هەژاران و گەداياندا، ئاواتی گەیاندنی رەحمەت بە خەڵکی دەخوازن، بەو کارەشیان داوای رەزامەندی پەروەردگاریان(عزوجل) و خۆشەویستی ئەو بۆیان دەکەن، گوێیان لە فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بووە کە دەفەرموێت: ((خەڵکی خێزانی خودان(عزوجل) خۆشەویسترین کەس لەناو خەڵکیدا لەلای خودا(عزوجل) بەسوودترینیانە بۆ خێزانەکەی))[1].

دۆستانی خودا بەراورد بە خەڵکی کەڕ و لاڵ و کوێرن، گەر دڵیان لە حەق(عزوجل) نزیکبوویەوە لە هیچ کەسێکی تر جگە لە ئەو(سبحانه وتعالى) نابیستن، و هیچ کەسێکی تر جگە لە ئەو نابینن، ئەوان لە نێوان سیفەتی جەلال و جەمالدان و چەپ و راست ناکەن، پێشەوە دەبینن و دواوەیان بۆ نییە، ئینس و جن و فریشتە و جۆرەکانی تری دروستکراو خزمەتی ئەوان دەکەن، حوکم و زانست خزمەتی ئەوان دەکات، فەزڵ خۆراکیان پێ دەبەخشێ و هۆگربوون پاراویان دەکات، لە خۆراکی فەزڵی ئەو دەخۆن و لە خواردنەوەی هۆگربوونی ئەو پاراو دەبن، سەرقاڵی بە خۆیانەوە لە بیستنی قسەی خەڵکی بێئاگای کردوون، ئەوان لە دۆڵێکن و خەڵکی لە دۆڵێکی تر، بە فەرمانی خودا فەرمان بە خەڵکی دەکەن، بە نەهی کردنی خودا نەهی لە خەڵکی دەکەن وەك جێگرەوەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، ئەوان میراتگری راستەقینەن، کاری گەورەیان گێڕانەوەی خەڵکە بۆ دەرگای حەق(عزوجل)، بەڵگەی خودا لەسەر ئەوان راستدەکەنەوە، شتەکان لە شوێنی خۆیان دادەنێن و فەزڵ بە هەموو خاوەن فەزڵێك دەبەخشن، مافی کەس داگیر ناکەن، مافی تێر و تەواو بە نەفس و سروشتی خۆیان

---

[1] رواه الطبراني في "الكبير والأوسط" ورواه أبو نعيم في "الحلية" والبيهقي في "الشعب".

نابەخشن، لەبەر خودا(عزوجل) شتەکان و خەلکیان خۆشدەوێت و لەبەر خودا(عزوجل) رقیان لە هەموو ئەوانە دەبێت، هەموو بوونیان بۆ ئەوە(سبحانه وتعالى) و بەشی کەسی تر لە ئەواندا نییە، هەر کەس ئەمەی بۆ تێروتەواو بوو هاوەڵێکردنی بۆ خودا بۆ تێر و تەواوبووە و رزگاربوون و سەرفرازی بەدەستهێناوە، مرۆڤ و جین و فریشتە و زەوی و ئاسمان ئەویان خۆشدەوێت.

ئەی دووڕوو، ئەی بەندەی خەلکی و هۆکارەکان و لەبیرکەری خودا(سبحانه وتعالى) دەتەوێ ئەم پلەیە بەدەستبهێنیت لەگەڵ ئەوەی تۆ تێیکەوتووی، تۆ رێز و عیززەتت نییە، سەرەتا موسڵمان ببە و پاشان تەوبە بکە و پاشان فێرببە و کار بکە و ئیخلاص ئەنجام بدە، ئەگینا هیدایەت بەدەست ناهێنیت، هاوار بە حاڵت، لە نێوان من و تۆدا دوژمنایەتی نییە جگە لەوەی من حەق دەڵێم و لەپێناو دینی خودادا(عزوجل) بۆ تۆ ناچەمێمەوە، من لەسەر رەقی و زبری قسەی گەورەپیاوان پەروەردە کراوم، لەسەر زبری و ناخۆشی ژیان و هەژاری راهاتووم، گەر قسەیەك لە منەوە بۆ تۆ دەرکەوت لە خوداوەیە، وەریبگرە، چونکە خودایە ئەو قسەی بۆ تۆ بە من کردووە، گەر هاتی بۆ لام خۆت لە هەموو شتەکان، لە نەفس و شارەزووت رووتبکەرەوە، گەر بەصیرەتت ببوایە منیشت بە دارنراو لە شتەکان و نەفس و شارەزوو دەبینی، بەڵام ئافەتی تۆ تێگەیشتنی نادروستی تۆیە، ئەی مورید خۆت بۆ هاوەڵێکردنی من و سوودبینین لە من یەکلابکەرەوە، حاڵی من دروستکراو و دونیا و دوارۆژی تێدا نییە، هەرکەس لەسەر دەستی من تەوبە دەکات هاوەڵێم دەکات و گومانی باشم پێ دەبات و ئەوەی دەیڵێم کاری پێ دەکات، دەبێ ئەو کەسە بەم جۆرە بێت گەر خودا(عزوجل) بیەوێت، خودا بە کەلامی خۆی و گفتوگۆی خۆی پێغەمبەران و ئەولیا پەروەردە دەکات، گفتوگۆی خودا بریتییە لە ئیلهام بۆ سەر دڵی ئەولیا، چونکە وەسێتداری پێغەمبەران و خەلیفە و خزمەتکاری ئەوانن، خودا(عزوجل) فەرموودەی خۆی راگەیاند، لەگەڵ موسا(عليه السلام) قسەی کرد، خودا قسەی لەگەڵ کرد نەك دروستکراوێك قسەی لەگەڵ کردبێت، زانای پەنهانەکان قسەی لەگەڵ کرد، بە قسەیەك لەگەڵی دوا

موسا(عليه السلام) لێی حاڵی بوو و بەبێ ناوەند گەیشتە ئەقڵی، هەر بەو جۆرە لەگەڵ پێغەمبەرمان محەمەد(ﷺ) بەبێ ناوەند قسەی لەگەڵ کرد[1]، ئەم قورئانە پەتی توندوتۆڵی خودایە، ئەو پەتەیە لە نێوان ئێوە و پەروەردگاری ئێوەدایە(جل وعلا)، جیبریل(علیە السلام) لە ئاسمانەوە و لەلای خوداوە(عزوجل) دایبەزاندووە، دایبەزاندووە بۆ سەر پێغەمبەر(ﷺ) وەك چۆن گەیاندی و هەواڵی پێدا، داننەنان بەمەدا و ملپێچی لێی دروست نییە، خودایە هەموان هیدایەت بدە و تەوبە لە هەموان قبووڵ بفەرموو و رەحم بە هەموان بکە.

**لە ئەمیری موسڵمانانەوە**(المعتصم باللە)-**رەحمەتی خودای لێ بێت- دەگێڕنەوە لە کاتی ئامادەبوونی مردندا وتوویەتی:** "سوێند بە خودا، من تەوبەم کردووە و گەڕاومەتەوە بۆ لای خودا(عزوجل) لەوەی بەرانبەر ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ئەنجامم دا لەگەڵ ئەوەی شتێك لە کاروباری ئەو پیاوەم نەگرتبووە دەست و کەسانی تر لەدەستیان گرتبوو".

**ئەی گەدای هەژار**، خۆت بەدووربگرە لە شتێك سوودت پێ ناگەیەنێت، واز لە دەمارگیری مەزهەب بهێنە و بە شتێکەوە خەریك بە لە دونیا و دوارۆژدا سوودت پێ بگەیەنێت، بەم نزیکانە هەواڵی خۆت دەبینیت و بیر لە قسەکانی من دەکەیەوە، لە داهاتوودا دەبینی چۆن شمشێر ئاراستەی سەرت دەکرێت و خودە بە سەرتەوە نییە و چۆن برین دەکاتە سەرت، دڵت لە خەم و پەژارەی دونیا خاڵی بکەرەوە چونکە بەم نزیکانە کۆچ لە دونیا دەکەی، بەدوای خۆشگوزەرانیدا مەگەڕێ لەوەی بەدەستت هێناوە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((ژیان ژیانی دوارۆژە))[2].

هیوا و ئاواتەکانت کورتبکەرەوە زوهد لە دونیا رووت لێ دەکات، چونکە زوهد- هەموو زوهد- بریتییە لە هیوا و ئاواتی کورت، لە هاوەڵانی خراپ کۆچ بکە، و

---

[1] (مەبەستی شەوی میعراجە).

[2] رواە البخاري.

خۆشەویستی نێوان خۆت و ئەوان ببڕە و بیگۆڕە بە پەتی پەیوەندی نێوان خۆت و صالحان، کۆچ لە کەسی نزیکت بکە گەر لە هاوەڵانی خراپ بوو، نێواخۆشی لەگەڵ کەسانی دوور دروست بکە گەر لە هاوەڵانی باش بوون، خۆشەویستی بە هەر کەس بدەی خزمایەتی لە نێوان تۆ و ئەودا سەریهەڵداوە، بۆیە تەماشا بکە بزانە خۆشەویستی بە کێ دەدەی.

**بە یەکێك وترا: خزمایەتی چییە؟** وتی: خۆشەویستییە، واز بهێنە لە هەوڵدان بۆ ئەوەی بەشی تۆیە و ئەوەی بەشی تۆ نییە، چونکە هەوڵدان بۆ ئەو شتەی بەشی تۆیە خۆماندووکردنە و هەوڵدان بۆ ئەو شتەی بەشی تۆ نییە شەرمەزاری و رسوایییە، بۆ ئەو مەبەستە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((سزای خودا(سبحانە وتعالی) بۆ بەندەیەك هەوڵدانییەتی بۆ شتێك بۆ ئەو دانەنراوە))[1].

**ئەی گەنج**، بەڵگە بە دروستکراوەکانی خودا لەسەر خودا(سبحانە وتعالی) بهێنەرەوە، بیر لە بەدیهێنراو بکەرەوە بە بەدیهێنەر دەگەی، کەسی باوەڕداری خاوەن یەقینی عاریف دوو چاوی ئاشکرا و دوو چاوی ناوەوەی هەیە، بە دوو چاوی ئاشکرا ئەوەی خودا(عزوجل) دروستی کردووە لەناو ئاسمانەکاندا دەبنێت، پاشان پەردە لەسەر دڵی لادەدات و بەبێ چوواندن(تشبیە) و چۆناندن(تکییف) ئەو دەبینێت، ئەو کات دەبێ بە کەسێکی نزیکی خۆشەویست، خۆشەویستیش هیچی لێ ناشارڕێتەوە، پەردە لەسەر دڵێك لادەدرێت لەوەی لە پشتەوەیە خۆی دارنیبێت، هەر بەو جۆرە لە نەفس و سروشت و ئارەزوو و شەیتان رووت بوویێتەوە، کلیلی گەنجینەکانی زەوی دەدرێتە دەستی و بەرد و زێڕ لەلای یەکسان دەبن، کەسێکی ژیر بە و لەوەی دەیڵێم تێڕابێنە و تێبگە، چونکە من بە کرژکی قسان قسە دەکەم، بە جەوهەر و ناوەوەی ماناکان وەك ئامۆژگاری بۆ تۆ دەیخەمەروو.

**ئەی گەنج**، سکاڵا مەکە لە دروستکەر لەلای دروستکراو، بەڵکو سکاڵات بۆ لای ئەو(عزوجل) بێت، چونکە ئەوە قەدەرەکان دیاری دەکات نەك کەسانی تر، لە

[1] لم اجد له اصلا.

گەنجینەکانی کاری چاکە پاراستنی نهێنی و باس نەکردنی ناخۆشییەکان و نەخۆشییەکان و صەدەقەکردنە، بە دەستی راستت خێر بکە و هەوڵبدە دەستی چەپت پێی نەزانێت، خۆت لە دەریای دونیا بپارێزە، چونکە خەڵکێکی زۆری نوقم کردووە، دانە دانەیەك لە خەڵکی قوتاریان بووە، دونیا دەریایەکی قووڵە و هەموان نغرۆ دەکات، بەڵام خودا(عزوجل) هەندێ لە بەندەکانی قوتار دەکات، وەك چۆن لە رۆژی دواییدا باوەڕداران لە ئاگر رزگار دەکات، چونکە دەبێ هەموان بەسەریدا بپەڕێنەوە، ئەو کات ئەوانەی خودا بیەوێت رزگاریان دەکات، خودا(سبحانه وتعالى) دەفەرموێت:

﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴿٧١﴾ ﴾ مريم: ٧١

خودا بە ئاگر دەفەرموێت: ﴿ كُونِي بَرْدًا وَسَلَامًا ﴾ الأنبياء: ٦٩، تا بەندە باوەڕدارەکانم-ئەوانەی ئیخلاصیان بۆ من بوو، حەز و ئارەزوویان بۆ لای من بوو، لە کەسانی تر زوهدیان کرد بوو- بەسەر تۆدا گوزەر بکەن، ئەو(سبحانه وتعالى) فەرمان بە ئاگر دەکات وەك چۆن فرمانی بە ئاگرەکەی نەمروود کرد کە بۆ ئیبراهیم(عليه السلام) نێڵەدرابوو تاکو بیسووتێنێت، خودا(عزوجل) دەفەرموێت: ئەی دەریای دونیا ئەی ئاو ئەو بەندە مورادە خۆشەویستە نوقم مەکە، ئەو کات بەندەکە رزگاری دەبێت لە دەریای دونیا و لەسەر نهێنی هەنگاو هەڵدەگرێت وەك چۆن موسا و هۆزەکەی لەو دەریایە رزگار کرد، خودا فەزڵی خۆی بە هەر کەسێك دەبەخشێت کە بیەوێت:

﴿ وَاللَّهُ يَرْزُقُ مَن يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٢١٢﴾ ﴾ البقرة: ٢١٢

هەموو خێر و بەخشین و گرتنەوەیەك بەدەستی خودایە، دەوڵەمەندی و هەژاری بەدەستی خودایە، عیززەت و زەلیلی بەدەستی خودایە، هیچ شتێك لەمانە بە دەستی کەسێکی تر نییە، ئاقڵ کەسێکە دەرگای خودا بەرنادات و پشت لە دەرگای کەسانی تر دەکات، ئەی بابای تەگبیرکەر دەبینم خەڵکی رازی دەکەی و خودا تووڕە دەکەی، دوارۆژی خۆت بە ئاوەدانکردنەوەی دونیاکەت وێران دەکەی، بەم نزیکانە ئەو کەسە(خودا) تۆ دەگرێت کە گرتنێکی توند و ئازاربەخشە، گرتنەکەی چەندین رەنگ و

رووی هەیە، بە لادانت لە دەسەڵات دەتگرێت، بە نەخۆشی و زەلیلی و هەژاری دەتگرێت، بە زاڵکردنی دژواری و خەم و پەژارە بەسەر تۆدا دەتگرێت، بە زاڵکردنی زمانی خەڵکی و دەسەڵاتیان بەسەر تۆدا دەتگرێت، هەموو دروستکراوەکانی بەسەر تۆدا زاڵ دەکات، بەئاگا وەرەوە ئەی خەوتووی بێئاگا، خودایە بە تۆوە و بۆ تۆ بەئاگامان بهێنە. ئامین.

**ئەی گەنج**، لەدەستبردنت بۆ دونیا وەك ئەو کەسە مەبە بە شەو دار کۆدەکاتەوە، نازانێت چی دەکەوێتە بەر دەست، من لە هەڵسوکەوتەکانتدا وەك کۆکەرەوەی دار لە شەودا تۆم دێتە پێش چاو، شەوێکی تاریکی بێ مانگەشەو و رووناکی، ئەو لە دەشتێکی پڕ لە دڕکوداڵ و مێرووی زیانبەخشدایە، نزیکە یەکێك لەوانە ببێتە هۆی تیاچوونی تۆ، بە ڕۆژدا دار کۆبکەرەوە، چونکە تیشکی خۆر ڕێگرە لەوەی دەست بۆ شتی زیانبەخش ببەی، لە هەڵسوکەوتەکانتدا لەگەڵ خۆری یەکتاپەرستی و شەرع و تەقوا بە، چونکە ئەو خۆرە ڕێگریت لێ دەکات لە بەربوونەوە بۆ ناو داو و تۆڕی ئارەزوو و نەفس و شەیتان و هاوەڵدانان بە هۆی خەڵکەوە، هەر بەو جۆرە ڕێگریت لێ دەکات لە پەلەکردن لە ڕۆیشتندا.

**هاوار بە حاڵت**، پەلە مەکە، چونکە ئەو کەسەی پەلە دەکات هەڵە دەکات یان خەریکە هەڵە بکات، هەر کەس ئارام و لەسەرخۆ بێت بەدەستی دەهێنێت یان خەریکە بەدەستی بهێنێت، پەلەکردن لە شەیتانەوەیە و لەسەرخۆییش لە ڕەحمانەوە، ئەوەی هەڵتدەنێت بۆ پەلەکردن هەڵپەکردنە بۆ کۆکردنەوەی دونیا، قەناعەتت هەبێت، چونکە قەناعەت گەنجینەیەکە کۆتایی پێ نایەت، چۆن داوای شتێك دەکەی کە بەشی تۆ نییە و هەرگیز ناکەوێتە بەر دەستت، نەفسی خۆت بگرەوە و ڕازی بە بەوەی پێتدراوە و لە هەرچی شتی ترە زوهد بکە، بەوەوە پابەند بە تا دەبیت بە عاریف و زانا بە خودا(عزوجل)، ئەو کات لە هەرچی شتە بێنیاز دەبیت، دڵت واڵا دەکەن و نهێنییت پاکدەکەنەوە، و پەروەردگارت(عزوجل) فێرت دەکات، ئەو کات دونیا لەسەرت ئاسان دەبێت و دوارۆژیش لەبەر دوو چاوی دڵت، هەرچی شتی ترە جگە لە

خودا لەبەر چاوی نهێنی و پەنهانت دەکەوێت، هیچ شتێك جگە لە خودا(سبحانه وتعالی) لەبەر چاوت مەزن نابێت، ئەوکات لەلای هەموو دروستکراوەکانی خودا مەزن دەبیت.

ئەی گەنج، گەر دەتەوێ دەرگایەکی داخراو لەبەر دەمت بوونی نەبێت لە خودا(عزوجل) بترسە، چونکە ئەوە کلیلی هەموو دەرگاکانە، خودا(سبحانه وتعالی) دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا ۝ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ﴾ الطلاق: ٢ - ٣

لە نەفسی خۆتدا بەرهەڵستی حەق(سبحانه وتعالی) مەکە، هەر بەو جۆرە لە خانەوادە و ماڵ و سامان و خەڵکی سەردەمی خۆت، تۆ شەرم ناکەی فەرمان بەسەر خودادا دەکەی بۆ ئەوەی دۆخەکەت بگۆڕێت و ئاڵوگۆڕی پێ بکات، بۆ تۆ لەو داناتر و زاناتر و بەرەحمتری؟ تۆ و هەموو خەڵکی بەندەی ئەون، ئەو(سبحانه وتعالی) کارهەڵسوڕێنەری تۆ و ئەوانە، گەر دەتەوێ لە دونیا و دوارۆژدا هاوەڵی بکەی لەگەڵی ئارام و بێدەنگ و کەڕولاڵ بە، ئەولیای خودا لەبەردەستیدا خاوەن ئەدەبن، جوولەیەك ناکەن و هەنگاوێك هەڵناگرن مۆڵەتێکی راشکاوانەی ئەو بۆ دڵیانی لەسەر نەبێت، لە شتە موباحەکان ناخۆن و پۆشاکێك ناپۆشن و هاوسەرگیری ناکەن و لە هەموو هۆکارەکانیاندا هەڵسوکەوت ناکەن هەتا مۆڵەتێکی راشکاو بۆ دڵیان لەلا نەبێت، ئەوان لەگەڵ خودادا(عزوجل) راستبوونەتەوە، لەگەڵ ئەو کەسەی دڵەکان و چاوەکان وەردەگێڕێت راستبوونەتەوە، ئارام ناگرن لەگەڵ پەروەردگاریان(عزوجل) تا لە دونیادا بە دڵ بە خودا دەگەن و لە دوارۆژیشدا بە جەستە بە خزمەتی دەگەن.

خودایە لە دونیا و دوارۆژدا لیقای خۆتمان پێ ببەخشە، بە نزیکی لە خۆت و بینینی خۆت تام و چێژمان پێ ببەخشە، بمانگێڕە لەو کەسانەی بە تۆ رازی دەبن و لە هەموو خەڵکی بێنیاز دەبن:

﴿رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ ۝﴾

البقرة: ٢٠١

# مەجلیسی چواردەم

## تەوبەکردن

سەرلەبەیانی ڕۆژی یەکشەممە، لە "الرباط"، ١٠/شەوال/٥٤٥ﻫ، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ): ((گەر کەسێك دەرگایەك لە خێری بۆ کرایەوە با سوودی لێ ببینێت، چونکە ئەو نازانێت کەی بە ڕوویدا دادەخرێت))[1].

**خەلکینە**، سوود لە دەروازەی ژیان ببینن و بەدەستی بهێنن تا دەرگاکە کراوەیە، چونکە بەم نزیکانە دەرگاکە بە ڕووتاندا دادەخرێت، کاری خێر بەدەست بهێنن تا توانای ئەنجامدانیتان بۆ هەیە، دەرگای تەوبە بەدەستبهێنن و لێیەوە بچنە ژوورەوە تا دەرگاکە بە ڕوودا والآیە، دەرگای دوعا بەدەست بهێنن، چونکە بۆتان کراوەتەوە، دەرگای پێشبڕکێی برا صالحەکانتان بەدەست بهێنن، چونکە بۆتان والآبووە.

**خەلکینە**، ئەوەی وێرانتان کرد بینای بکەنەوە، ئەوەی پیستان کرد بیشۆن و پاکی بکەنەوەن ئەوەی تێکتاندا چاکی بکەنەوە، ئەوەی لێڵتان کرد ڕۆشنی بکەنەوە، ئەوەی بردووتانە بیگێڕنەوە، بگەڕێنەوە بۆ لای مەولاتان(عزوجل) هەر ئەوە ئێوەی هێلاوەتەوە و بۆ لای خۆی ئێوە دەگێڕێتەوە.

**ئەی گەنج**، لێرە تەنها خودا(سبحانه وتعالى) بوونی هەیە، گەر لەگەڵ دروستکەری(الخالق) تۆ بەندەی ئەوی، گەر لەگەڵ خەلکیت ئەوا تۆ بەندەی ئەوانی، هیچ قسەیەکت بۆ نییە تا چۆڵەوانی دەشت و سارای دڵی خۆت نەبڕیت، لە نهێنی و پەنهانی خۆتدا لە هەموان جیاببیەوە، نابینی کەسێك دارای حەق(عزوجل) بکات و هەوڵی بۆ ئەو بێت لە هەرچی شتە جیادەبێتەوە، یەقینی لا دروست بووە، هەرچی شتە

---

[1] حدیث مرسل رواه ابن المبارك في الزهد والقضاعي في مسند الشهاب وابن حجر في الإصابة.

لە دروستکراوەکان پەردەیە لە نێوان ئەو و خودادا(عزوجل)، لەگەڵ هەر شتێك بوەستێت بەو شتە پەردە لە نێوان ئەو و خودا(سبحانه وتعالى) سەرهەڵدەدات.

**ئەی گەنج**، تەمبەڵی مەکە، چونکە هەمیشە تەمبەڵی بێبەشبوون و پەشیمانی لە گەردندایە، کار و کردەوەکانت پاك و جوان بکە خودا لە دونیا و دوارۆژدا پاك و جوانت دەکات.

**ئەبو محەمەدی عەجەمی(خودا ڕەحمی پێ بکات)** دەیوت: خودایە، بانگە بە چاك، ئەو دەیویست بڵێت: خودایە باش و چاکمان بکە، بەڵام زمانی بۆی نەدەهات، هەر کەس تامی کردبێت ناسیویەتی، ڕەوشتی جوان لەگەڵ خەڵکی و تەبایی لەگەڵیان لە سنووری شەرع و ڕازیبوونی خودادا باش و فەرمانە، بەڵام گەر ئەوە لە شکاندنی سنوورێك لە سنوورەکانی خودادا بێت و ڕازی بوونی ئەوی لەسەر نەبێت نە باش و بەفەڕ و نە ڕێزێکیان بۆ هەیە، قبووڵ بوونی کار و کردەوە باشەکان یاخود ڕەدکردنەوەیان کۆمەڵێك نیشانەن لەلای ئەهلی سەفا و هەڵبژێراوان.

**ئەی گەنج**، تۆوی دوعا دابەزرێنە و بگەڕێرەوە بۆ ڕازیبوون، بە زمان دوعا مەکە و دڵت پشتی هەڵکردبێت، لە ڕۆژی دواییدا مرۆڤ بیردەکاتەوە چی لە دونیادا ئەنجاداوە لە خێر و لە شەڕ، ئەوکات لەوێ پەشیمانی بەدەردت ناخوات، هەر بەو جۆرە یاد و بیرکردنەوە بەدەردت ناخوات، گەورەیی لە بیرکردنەوەی ئەمڕۆدایە بەر لە مردن، بیری کێڵان و تۆو وەشاندن لە کاتی دروێنەدا سوودێك ناگەیەنێت.

**لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموویەتی:** ((دونیا کێڵگەی دوارۆژە، هەر کەس خێرێك بچێنێت خۆشییەك دەدورێتەوە، هەر کەس شەڕێك بچێنێت پەشیمانییەك دەدوورێتەوە)) [1].

گەر مردن ڕووی لێکردی ئەوکات بەئاگا دێیت و بەئاگاهاتنەوە سوود و قازانجت پێ ناگەیەنێت، خودایە لە خەوی بێئاگایان لە تۆ بەئاگامان بهێنە.. ئامین.

---

[1] ذکره الغزالي في الإحياء وقال مخرجه الحافظ العراقي: لم أجده بهذا اللفظ، معناه صحيح مقتبس من قوله تعالى: ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الْآخِرَةِ نَزِدْ لَهُ فِي حَرْثِهِ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الدُّنْيَا نُؤْتِهِ مِنْهَا وَمَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ ﴾ الشورى: ٢٠.

ئەی گەنج، هاوەڵی کردن لەگەڵ بەدکاران دەتخاتە نـاو گومـانی خـراپ بـە چـاکان، لـەژێر سـێبەری کتێبەکـەی خودا(عزوجـل) و سـوننەتی پێغەمبـەردا(ﷺ) هـەنگاو هەڵبگرە سەرکەوتن بەدەست دەهێنیت.

ئەی خەڵکینە، بە باشی حەیا و شەرم لە خودا بکەن، بێئاگا مەبن سەردەمەکەتان گوزەر دەکات، خۆتان سەرقاڵ کردووە بە کۆکردنەوەی ئەوەی نایخۆن و ئاوات بۆ شتێك دەخوازن پێیناگەن و کۆشك و تەلارێك بینـا دەکـەن تیایـدا نیشـتەجێ نـابن، هـەموو ئەمانە دەبنە پەردە لە گەیشتن بە مەقامی پەروەردگارت(عزوجل)، یـادی خـودا دڵـی عاریفان داگیر دەکات و ئابڵۆقەی دەدات و یادی هەرچی یادکراوە لەبیردەباتەوە، گـەر ئەمەی بۆ تەواو بوو ئەوا بەهەشت دەبێتـە مـاوا، بەهەشـتی دەرکـەوتوو و بەهەشـتی مەوعود(بەڵێنـدراو)، بەهەشـتی دەرکـەوتوو لـە دونیـادا بریتییـە لـە رازیبـوون بـە بڕیارەکانی خودا(عزوجل) و نزیکـی دڵ لـە ئـەوەوە و موناجـات لەگـەڵی و بـۆ ئـەو هەڵگرتنی پەردە لە نێواندا، خاوەنی ئەم دڵە لە تەنهاییدا و لە هەموو حاڵ و بارێکدا لەگەڵ حەق(عزوجل) دەبێت بەبێ چۆناندن و چوواندن(**تکییف و تشبیه**).

﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ١١﴾ الشوری: ١١

بەهەشتی بەڵێندراویش ئەو بەهەشتەیە خودا بەڵێنی بە بـاوەڕداران داوە، هـەروەها بەڵێنی تەماشاکردنی رووی جوان و پڕ لە بەخشندەیی خۆی(سبحانه وتعالی) بەبێ بـوونی پەردەیەك، گومانی تێدا نییە هـەموو خێرێـك لـەلای خودایـە و هـەموو شـەڕێك لای کەسانی ترە جگە لە خودا، خێر لە رووکردن لە خودایە و هەموو شەڕێك لە پشتکردنە لێی، هەر کارێك کە پاداشتت دەوێ لەسەری کارەکە بۆ خۆتە، هەر کارێکیش بۆ خودا ئەنجامی دەدەی ئەو کارە بۆ ئەوە، گەر کارت کرد و داوای بریتی(پاداشت)ت کرد ئەوا پاداشـتەکەت بـە شـتێکی دروسـتکراوە، بـەڵام گـەر تـەنها بـۆ رووی پـاك و جـوانی تەماشـاکردنی ئـەو(سـبحانه وتعـالی)، پاشـان بەگشـتی داوای پاداشـت مەکـە لەسـەر کاروکردەوەکانت، دونیا چییە و دوارۆژ چییە بەراورد بە خودا(عزوجل)؟! داوای خاوەن

نیعمەت بکە نەك داوای نیعمەت، داوای جیران بکە بەر لە خانووەکە، ئەو(سبحانە وتعالى) بەر لە هەموو شتێك هەبووە و ئەو هەموو شتێکی بەدیهێناوە، لەدوای هەموو شتەکان هەر ئەو(سبحانە وتعالى) دەمێنێتەوە، بیر لە مردن بکەرەوە و لەسەر ناخۆشییەکان ئارام بگرە و لە هەموو بارەکاندا تەوەکولت بە خودا بێت، گەر ئەم سێ خەسڵەتەت بۆ تەواو بوو فریشتەیەك یادی مردنت بۆ دەهێنێت تاکو زوهدەکەت راست و دروست دەبێت، بە ئارامگرتن ئەوەی تۆ دەتەوێ لە پەروەردگارت(عزوجل) بەدەستی دەهێنیت، بە تەوەکولیش هەموو شتەکان لە دڵت دەردەچن و بە پەروەردگارەوە پەیوەست دەبیت، و دونیا و دوارۆژ و هەموو شتێك جگە لە مەولا(عزوجل) لە تۆ کەنار دەگرن، لە هەموو لایەکەوە ئاسوودەیی رووت لێ دەکات، هەر بەو جۆرە چاودێریکردن و پاسەوانی و پارێزگاری لە هەموو لایەکەوە رووت لێ دەکات، مەولا(عزوجل) لە شەش ئاراستەکەوە تۆ دەپارێزێت و دەرگاکانی ئەو شەش ئاراستەت لێ دادەخات و دەبیت بە یەکێك لەوانەی خودا(عزوجل) دەربارەیان دەفەرموێت:

﴿ إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ ﴾ الحجر: ٤٢

چۆن شەیتان دەسەڵاتی دەبێت بەسەر یەکتاپەرستانی موخلیصاندا کە لە کاروکردەوەکانیاندا ریا ئەنجام نادەن، قسە لە کۆتاییەوەیە نەك لە سەرەتاوە، سەرەتا هەمووی کەڕ و لاڵییە و کۆتایی سەفەر هەمووی قسەکردنە، کەسی موخلیص مولکەکەی لە دڵیدایە و دەسەڵاتەکەی لە نهێنی و پەنهانیدایە، رووالەت بەهەند وەرناگیرێت، دەگمەنن ئەو کەسانەی مولکی دەرەوە(ئاشکرا) و مولکی ناوەوەیان کۆکردبێتەوە[1]، هەمیشە بە حاڵی خۆتەوە شاراوە بە، بەو جۆرە بمێنەرەوە تا کامڵ دەبیت و دڵت دەگاتە پەروەردگار(عزوجل)، کاتێك کامڵ بوویت و دڵت بە خودا گەیشت ئەو کات گوێ مەدە بەوەی چۆن بڕدەکەیەوە، چونکە حاڵی خۆتت بەدەست هێناوە و لە مەقامی خۆتدا دامەزراوی و پاسەوانەکان پارێزگاریت لێ دەکەن و چاویان لەسەرتە، و خەڵکی لەلات دەبن بە دیوار و دار و درەخت، و حەمد و زەمی ئەوان و

[1] (لەو کەسانەی مولکی دەرەوە و مولکی ناوەوەیان کۆکردبووەوە یوسف و داود و سولەیمان(علیهم السلام)).

رووتێکردن و پشتتێکردنیان لەلات یەکسان دەبێت، تۆ دەبیت بە رووخێنەر و بیناکەرەوەیان، بە مۆڵەتی پەروەردگاریان کاریان لەسەر دەکەی، کردنەوە و بەستنەوەت پێ دەدرێت و واژووکردن دەدرێتە دەستی دڵت، و نیشانەش دەدرێتە دەستی نهێنی و پەنهانت، تا ئەمە بەدەست نەیەت قسەکردن نییە، ئەگینا ئاقڵ بە و هەوەسبازی مەکە، تۆ کوێریت، داوای کەسێك بکە رێنموویت بکات، تۆ نەزانی داوای کەسێك بکە فێرت بکات، گەر بۆ چاڵێك بەربوویەوە دەست بە ئەوەوە بگرە و قسە و فەرمایشتەکانی قبووڵ بکە، ئەو بکە بە بەڵگەی رۆیشتنی سەر راستە شەقام، کاتێك بە کۆتایی راستە شەقام گەیشتیت لەوێ دابنیشە تا ناسینی تەوات بە رێگەکە بۆ دروست دەبێت، ئەو کات هەمور سەرلێشێواوێك پەنات بۆ دەبات و دەبیت بە ژەمە خۆراکی هەژاران و گەدایان، لە جوامێری کەسێك ئەوەیە پارێزگاری لە نهێنی خودا(عزوجل) بکات و بە رەوشتی جوان لەگەڵ خەڵکیدا رەفتار بکات، تۆ لە کوێی داواکردنی حەقدای، لە کوێی رازیبوون بە ئەو و بێنیازبوونی لە هەرچی شتی ترە جگە لە ئەو؟ گوێت لەم ئایەتە پیرۆزە نەبووە کە دەفەرموێت:

﴿مِنكُم مَّن يُرِيدُ الدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ الْآخِرَةَ﴾ آل عمران: ١٥٢،

لە جێگەیەکی تر دەفەرموێت:

﴿يُرِيدُونَ وَجْهَهُ﴾ الكهف: ٢٨

گەر بەختت باش بێت دەستی غیرەت دەگاتە تۆ و لە دەستی هەرچی شتی ترە جگە لە خودا رزگارت دەکات و دەتبات بۆ بەر دەرگای حەق(عزوجل)، بۆیە:

﴿هُنَالِكَ الْوَلَايَةُ لِلَّهِ الْحَقِّ﴾ الكهف: ٤٤

گەر ئەمەت بۆ تەواو بوو دونیا و دوارۆژ رووت لێ دەکات وەك دوو خزمەتکار بەبێ زیان و ماندووبوون، لە دەرگای حەق(عزوجل) بدە و لەو شوێنەدا بمێنەرەوە، چونکە گەر لەو شوێنەدا بمێنییەوە خایلە و ختوورەکانت بۆ رۆشن دەبنەوە، خایلەی نەفس و خایلەی ئارەزوو و خایلەی دڵ و خایلەی شەیتان و خایلەی فریشتە لەلات رۆشن دەبنەوە، پێت دەوترێت ئەمە خایلەی حەقە و ئەمەش خایلەی باتڵە، هەریەکەیان بە

نیشانەیەك دەناسییەوە، گەر گەیشتییە ئەم مەقامە لە حەقەوە خایلەیەکت بۆ دێت فێری ئەدەبت دەکات و دامەزراوت دەکات و راستت دەکاتەوە و داتدەنیشێنێت و دەتبزوێنێ و لە جوولەت دەخات و فەرمانت پێ دەکات و نەهیت لێ دەکات.

**ئەی خەڵکینە**، داوای زیاد و کەمی مەکەن، داوای پێشکەوتن و دواکەوتن مەکەن، قەدەر ئابلۆقەی هەریەك لە ئێوەی داوە، هەریەکەتان نووسراوێك و بەروارێکی تایبەت بە خۆی هەیە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((خودا لە دروستکردن و رۆزی و ئەجەل بوویەوە، قەڵەم بەوەی بوو وشکبوویەوە))[1].

بە بڕیاری پێشینە خودا لە هەرچی شتە تەواوبووە، بەڵام حوکم دێت و بە فەرمان پێکردن و نەهیلێکردن و پابەندکردن دایدەپۆشێت، بۆ هیچ کەسێك حەڵاڵ نییە بەڵگە بە حوکم بهێنێتەوە بەوەی پێشکەوتووە، بەڵکو دەفەرموێت:

﴿ لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾ الأنبياء: ٢٣

**ئەی خەڵکینە**، بەم ئاشکرایە کار بکەن، کار بەم رەشییە بکەن لەسەر سپیتی تا هەڵتان بنێت بۆ کارکردن بە ناوەوەی ئەم کارە، گەر بەم ئاشکرایە کارت کرد هەنگاوت پێ هەڵدەگرێت بۆ تێگەیشتن لە ناوەوە(پەنهان)، یەکەم جار نهێنی و پەنهانت لەمە تێدەگات و پاشان دڵت بەسەر نەفسدا دەیخوێنێتەوە، و نەفسیش بۆ سەر زمانی دەگوێزێتەوە و زمانیش دەیگوێزێتەوە بۆ سەر خەڵکی، لەپێناوی بەرژەوەندی و سوود و قازانجیاندا ئەوەیان بۆ دەگوێزرێتەوە، پیرۆزت بێت گەر لەگەڵ حەق(عزوجل) تەبا بیت و خۆشت بوێت، هاوار بە حاڵت، بانگەشەی خۆشەویستی خودا دەکەی، ئازانی چەندین مەرجی هەیە؟ لە مەرجەکانی خۆشەویستی: تەباییە لەگەڵ ئەو(سبحانه وتعالی) لە خۆت و کەسانی تردا، هەروەها لە مەرجەکانی ئەوەیە لەلای کەسانی تر جگە لە خودا سوکنایی و ئارامیت نەبێت، هۆگریت بە ئەوەوە بێت و وەحشەت لەگەڵ ئەو رووت لێ نەکات، کاتێك خۆشەویستی خودا لە دڵی کەسێکدا نیشتەجێ دەبێت

[1] لم أعثر عليه بهذا اللفظ، إنما روى ابن مسعود عن النبي فقال: "لە رۆڵەی ئادەمدا چوار شت کۆتایی پێهاتووە: دروستکردن و رەوشت و ئەجەل و رۆزی" أخرجه الطبراني في الأوسط وفي مجمع الزوائد.

هۆگری پێوە پەیدا دەکات و رق هەڵدەگرێت لە هەر شتێك سەرقاڵی بکات لە ئەو، تەوبە بکە لە بانگەشە درۆینەکەت ئەوە شتێکە بە بانگەشە و ئاواتخواستن و درۆ و دوورِوویی و زۆرلەخۆکردن بەدەست نایەت، تەوبە بکە و لەسەر تەوبەکەت دامەزراو بە، گەورەیی لە تەوبەکەدا نییە، گەورەیی لە دامەزراندایە لەسەر تەوبەکردن، ئازایەتی لە نەماماناشتنندا نییە ئازایەتی لە پەروەردەکردن و بەروبوومیدایە.

**هەروەها شێخ(خودای لێ رازی بێت) دەفەرموێت: لە ناخۆشی و خۆشیدا پابەندبن** بە تەبایی لەگەڵ حەق(عزوجل)، هەروەها لە هەژاری و دەوڵەمەندی و گرانی و هەرزانی و نەخۆشی و لەشساغی و خێر و شەڕ و پێدان و گرتنەوەدا بەهەمان شێوە بن، دەوای ئێوە تەنها خۆ رادەستکردنە بە حەق(عزوجل)، گەر بە شتێك بڕیاری لەسەر ئێوە دا وەحشەت رووتان لێ نەکات، لەو بڕیارەدا لەگەڵ خودا مامەڵانێ مەکەن و لەلای کەسانی تر سکاڵای لەدەست مەکەن، چونکە ئەوە بەڵای زیاترتان بۆ رەوانە دەکات، بەڵکو بێدەنگ بن و ئارام بن و خامۆش بن، لەبەردەستی خودادا دامەزراو بن و وردبینەوە و بزانن چی لەناو ئێوە دەکات و چی بە ئێوە دەکات، بە گۆڕان و ئاڵوگۆڕی دڵخۆش بن، گەر ئێوە لەگەڵی بەم جۆرە بوون گومانی تێدا نییە وەحشەتتان دەگۆڕێت بە هۆگری و یەکتاپەرستی و دڵخۆشی بە ئەو(سبحانه وتعالى).

خودایە لە پەنای خۆت و لەگەڵ خۆت دامان بنێ.



﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾﴾

البقرة: ٢٠١

✿ ✿ ✿

# مەجلیسی پێنجەم

## هۆی خۆشەویستی خودا بۆ بەندەکەی

لە رۆژی سێشەممە ١٢/شەوال/ ٥٤٥هـ لە قوتابخانە، شێخ عبدالقادر(خودا لێی رازی بێت) فەرموری:

ئەی گەنج، بەندایەتی کردنی حەق(عزوجل) لە کوێیە؟ راستەقینەی بەندایەتی جێبەجێ بکە و لە هەرچی کاروباردایە بەشی پێویست بەدەست بهێنە: تۆ بەندەیەکی هەڵهاتووی لە مەولای خۆت(عزوجل)، بگەڕێرەوە بۆ لای و زەلیلی بۆ نیشان بدە و تەوازوعی بۆ بنوێنە، هەموو ئەمانە بە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی و خۆگرتنەوە لە نەهیلێکراوەکانی و ئارامگرتن و تەبایی لەسەر بڕیارە بڕاوەکانی، گەر ئەمەت بۆ بەدەستهات بەندایەتییەکەت بۆ سەروەرەکەت کامڵ و تەواو دەبێت و بەشی تەواو لە ئەوەوە روو لە تۆ دەکات، خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُۥ ﴾ الزمر: ٣٦

گەر بەندایەتیت بۆ ئەو راست و دروست بێت خۆشی دەویت و خۆشەویستی خۆی لە دڵی تۆدا بەهێز دەکات و هۆگریت پێ دەبەخشێت و تۆ لە خۆی نزیک دەکاتەوە بەبێ ماندووبوون و هاوەڵی کەسی ترت بۆ داوا ناکات، ئەوکات لە هەموو بار و حاڵێکدا لێی رازی دەبیت، گەر هەموو زەویت -بەو فراوانییەی کە هەیەتی- لێ بەرتەسک بکاتەوە و هەموو دەرگاکانت -بە بەرینی خۆیان- لێ دابخات لێی توورە و نارەحەت نابیت و لە دەرگای کەسێکی تر نزیک نابیتەوە، و لە خۆراکی کەسێکی تر ناخۆیت، حاڵت وەک حاڵی موسای(علیه السلام) لێ دێت کاتێک خودا(عزوجل) دەربارەی دەفەرموێت:

﴿ وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَرَاضِعَ ﴾ القصص: ١٢

پەروەردگارمان(عزوجل) شاهیدی هەموو شتێکە و لە هەموو شتێکدا ئامادەیە، و لەسەر هەموو شتێك چاودێرە و لە هەموو شتێك نزیکە و ئێوە ناتوانن لە ئەو بێنیاز بن، لەدوای ناسین ملپێچی چ مانایەکی هەیە؟!

**هاوار بە حاڵت**، خودا(عزوجل) دەناسی کەچی دەگەڕێیەوە و سەرپێچی لێ دەکەی، لە ئەو پاشگەز مەبەرەوە چونکە لە هەموو خێرێك بێبەشت دەکات، لەگەڵی ئارام بگرە و لە ئەو ئارام مەگرە، ئەوەت زانیوە هەر کەس ئارام بگرێت دەبێتە کەسێکی خاوەن توانا، ئەم ئەقڵە چییە؟! ئەم پەلەکردنە چییە! خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱصْبِرُوا۟ وَصَابِرُوا۟ وَرَابِطُوا۟ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ۝٢٠٠﴾ آل عمران: ٢٠٠

لەسەر ئارامگرتن لە قورئاندا ئایەتی زۆر هاتوون و ئاماژە دەکەن بۆ بوونی خێر و نیعمەت و پاداشتی باش و بەخشین و ئاسوودەیی دونیا و دوارۆژ لە ئارامگرتندا، ئارام بگرن خێری دونیا و دوارۆژ بەدەست دەهێنن، سەردانی گۆڕستان بکەن و بچن بۆ لای صالحان و کاری چاکە ئەنجام بدەن حاڵ و بارتان دێتە راستە، لەوانە مەبن گەر ئامۆژگاری بکرێن ئامۆژگاری وەرناگرن و گەر قسەیان بۆ بکرێت نابیستن، **رۆیشتن و لەدەستچوونی ئایینی ئێوە بەهۆی چوار شتەوەیە:**

**یەکەم:** کار بەوە ناکەن دەیزانن.

**دووەم:** کار بەوە دەکەن کە نایزانن.

**سێیەم:** ئەوەی نایزانن فێری نابن، بۆیە بە نەزانی دەمێننەوە.

**چوارەم:** رێگری دەکەن لەوەی خەڵکی نایزانن فێری ببن.

ئەی خەڵکینە، ئێوە کاتێك لە مەجلیسی زیکردا ئامادە دەبن بۆ سەیرکردن ئامادە دەبن نەك بۆ دەرمانی دەردەکانتان، پێدەکەنن و گاڵتە و یاری دەکەن، ئێوە سەرکەشی دەکەن، ئێوە تەنها بەسەر(بە زەین) لەگەڵ خودان(عزوجل)، لەم کارەتان تەوبە بکەن و خۆتان بە دوژمنانی خودا(عزوجل) مەچوێنن و لەوەی دەیبیستن سوودمەند بن.

ئەی گەنج، دەقت بە عادەتەوە گرتووە و خۆت كۆتوبەند كردووە، خۆتت كۆتوبەند كردووە بەوەی لە خودا تەنها داوای بەشی خۆت دەكەی و لەسەر هۆیەكان دەوەستی و سەبەبكارت لەبیرچووەتەوە و تەوەكولی پێ نابەستیت، جارێكی تر بە كارەكاندا بچۆرەوە و ئیخلاصیان تێدا ئەنجام بدە، خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾ الذاريات: ٥٦

بۆ هەوەسبازی دروستی نەكردوون، بۆ گاڵتە و گەپ دروستی نەكردوون، بۆ خواردن و خواردنەوە و خەو و هاوسەرگیری‌كردن دروستی نەكردوون، ئەی بێئاگایان لە بێئاگایتان بەئاگا بێن، دڵت یەك هەنگاو بەرەو لای ئەو هەڵبگرێت خۆشەویستی ئەو چەندین هەنگاو بەرەو لای تۆ دێت، ئەو بۆ لیقای خۆشەویستان لەوان بەشەوقترە:

﴿ يَرْزُقُ مَن يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٢١٢﴾ ﴾ البقرة: ٢١٢

گەر خودا بەندەیەكی بۆ كارێك بوێت ئەوی بۆ ئامادە دەكات، ئەمە شتێكە پەیوەندی بە ماناوەیە نەك بە رووالەت و وێنەوە، گەر ئەوانەی باسم كرد بۆ بەندە تەواو و كامڵ بوو زوهدی لە دونیا و دوارۆژ و هەر شتێكی تر جگە لە مەولا(عزوجل) بۆ دێتە راستە، تەندروستی و مولك و دەسەڵات رووی لێ دەكەن، هەموو ئەوانە رووی لێ دەكەن و گەردیلەیەكی دەكەن بە شاخێك، دڵۆپێكی بە دەریایەك و رۆشنایی ئەستێرەیەكی بە رۆشنایی مانگ و رۆشنایی مانگی بە رۆشنایی خۆر، كەمی دەكەن بە زۆر و سڕانەوە و نەبوونی دەكەن بە بوون و فەنای دەكەن بە بەقا و هەژان و لەرزۆكی بە دامەزران، درەختەكەی باڵا دەبێت و بەرەو عەرش بەرز دەبێتەوە و رەگ و ریشەی بە زەویدا رۆدەچێت، پەلوپۆكانی لە دونیا و دوارۆژدا دەمێننەوە، ئەم پەلوپۆیانە چین؟ حیكمەت و زانست، دونیا لەلای وەك ئەلقەیەكی پەنجەی لێ دێت، دونیا ئەو ناكات بە كۆیلەی خۆی، و دوارۆژیش ئەو كۆتوبەند ناكات، نە مولك و نە خزمەتكاران ناتوانن ئەو بكەنە كۆیلەی خۆیان، هیچ شتێك ناتوانێت پەردەی بۆ دروست بكات و هیچ كەسێك ناتوانێت ئەو داگیر بكات و بۆ خۆی ببات، لێڵی ناتوانێت ئەو لێڵ بكات، گەر ئەمەی بۆ تێر و تەواو بوو شیاوە بۆ ئەو بەندەیە لەگەڵ

خەلکی بوەستێت و دەستیان بگرێت و لە دەریای دونیا رزگاریان بکات، گەر حەق(سبحانه وتعالى) خێری بۆ بەندەیەك ویست دەیکاتە رێنیشاندەر و پزیشك و ئەدەبدادەر و پەروەردەکەر و زمانحاڵ و رێگەنیشاندەریان، ئەو دەکات بە پێبەخشەر و چرا و خۆریان، گەر خودا ئەوەی بۆ بەندەکەی بوێت ئامادەی دەکات و بەو جۆرە دەبێت، ئەگەر نە، پەردەیەکی بەسەردا دەهێنێت بۆ ئەوەی کەس نەیناسێت و بزری دەکات لە خەلکی، خودا(سبحانه وتعالى) دانە دانەیەکی ئەم جۆرە کەسانە دەگێرێتەوە بۆ لای خەلکی لەگەڵ پارێزگاری و تەندروستی تەواو بۆیان، بۆ بەرژەوەندی خەلکی و هیدایەتیان سەرکەوتوویان دەکات، کەسی زاهید لە دونیا بە دوارۆژ تاقیدەکرێتەوە، کەسی زاهید لە دونیا و دوارۆژ بە پەروەردگاری دونیا و دوارۆژ تاقیدەکرێتەوە.

ئەوەندە بێئاگابوون دەڵێی نامرن، وەك ئەوەی رۆژی دوایی حەشر نەکرێن و لەبەر دەستی خودادا(سبحانه وتعالى) دادگایی نەکرێن، و بەسەر پردی سیراتدا گوزەر نەکەن، ئەمانە سیفەتەکانی ئێوەن کەچی بانگەشەی ئیسلام و ئیمان دەکەن، ئەم قورئان و زانستە بەڵگەن لەسەرتان گەر کاریان پێ نەکەن، گەر لەلای زانایان ئامادەبوون و کارتان نەکرد بەوەی پێتان دەڵێن ئەوا ئامادەبوونەکەتان لەلای ئەوان دەبێتە بەڵگەی گوناه لەسەرتان، وەك ئەوە وایە بە پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتبن و لێتان قبوول نەکردبێت، لە رۆژی دواییدا هەموو خەلکی ترس لە گەورەیی و شکۆمەندی و مەزنی و دادپەروەری خودا(عزوجل) دایان دەگرێتەوە، مەلیکەکانی دونیا دەڕۆن و مولکەکانیان بەجێدەهێڵن، لە رۆژی دواییدا هەموان بۆ لای خودا دەگەڕێنەوە، لەو رۆژەدا مولك و دەسەلاتی خەلکی سەر ئەم رێگەیە دەردەکەوێت، عیززەت و دەوڵەمەندی ئەوان لەو رۆژەدا دەردەکەوێت، رێزلێگرتنیان لە ئەمڕۆدا لەلایەن حەقەوە(عزوجل) ئەوەیە کردوونی بە کەسانێك بەندەکان و وڵاتان بە ئیمان گەرم دەکەنەوە، دەیانکات بە کۆڵەکەی زەوی و مانەوەی زەوی بە هۆی ئەوانەوە، ئەوان بریتین لە پێشەوا و ئەمیرەکانی خەلکی، ئەوان نوێنەری حەقن(سبحانه وتعالى)، ئەوان لە رووی ماناوە بەمانە گەیشتوون نەك لەڕووی رووالەتەوە، ئەمڕۆ بە مانا و سبەینێ بە وێنە و رووالەت، هانی نەیاران و بەربەرێکارانی بێباوەڕان دەدەن بۆ ئەوەی کاتێك بەوان دەگەن دامەزراو بن، هانی صالحان دەدەن بۆ

ئەوەی کاتێك لەگەڵ نەفس و ئارەزوو و شەیتان و هاوەڵی خراپ-کە شەیتانی مرۆڤن-دەجەنگن دەمەزراو بن و نەبەزێن، هانی تایبەتمەندان دەدەن بۆ زوهد لە دونیا و دواڕۆژ و هەرچی شتی ترە جگە لە خودا(عزوجل).

**ئەی گەنج**، بەئاگا بێ بەرلەوەی بەئاگابێنیت و هیچت پێ نەکرێت، ببە بە خاوەنی ئایین و تێکەڵی ئەهلی دین بکە، چونکە ئەوانە مرۆڤی ڕاستەقینەن، ژیرترین مرۆڤ ئەو مرۆڤەیە گوێڕایەڵی خودا(عزوجل) دەکات، نەزانترین مرۆڤ ئەو کەسەیە لە خودا یاخی دەبێت.

**پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:** ((تربت يداك))[1] واتە هەژار کەوتی، "أترب"ش بۆ کاتێکە کەسەکە بێنیاز ببێت، گەر تێکەڵ بە ئەهلی دین بوویت و خۆشتویستن دەستت بێنیاز دەبێت و دڵت لە دووڕووی و ئەهلی دووڕوویی و ریاکاران هەڵدێت، هیچ کارێك بۆ تۆ نانوسرێت گەر مەبەستت پێی ڕووی پاکی خودا نەبووبێت، ڕوواڵەت و وێنەی کارەکەت لێ قبووڵ ناکرێت بەڵکو مانای کارەکەت لێ قبووڵ دەکرێت، گەر لە کارەکەتدا سەرپێچیت کرد لە نەفس و ئارەزوو و شەیتان و دونیا لێت قبووڵ دەکات، کار ئەنجام بدە و ئیخلاصت هەبێت و تەماشای کارەکانت مەکە، بەگشتی تەنها ئەوەت لێ قبووڵ دەکرێت بۆ ڕووی ئەو ئەنجامت دابێت نەك لەپێناوی ڕووی خەڵکیدا.

**هاوار بە حاڵت**، کار بۆ خەڵکی دەکەی و دەتەوێت خودا(عزوجل) لێت قبووڵ بکات، ئەمە هەوەسبازییە لە تۆوە، وازبێنە لە چڵێسی و زیادەڕەوی و دڵخۆشی، دڵخۆشی کەم بکەرەوە و دڵتەنگیت زیاد بکە لە خانەی دڵتەنگی و بەندیخانەی دونیادا.

پێغەمبەری ئێمە(ﷺ) هەمیشە لە بیرکردنەوەدا بوو، دڵخۆشی زۆر کەم و دڵتەنگی زۆر بوو، کەم پێدەکەنی، مەگەر تەنها خەندەیەکی شیرین بۆ سەر ڕوخساری ئەوەش بۆ دڵخۆشکردنی کەسانی تر[2]، لە دڵیدا حوزن و سەرقاڵییەك هەبوو، گەر هاوەڵان و کاروباری دونیا نەبوایە لە ماڵەکەی نەدەهاتە دەرەوە و لەگەڵ کەس دانەدەنیشت.

---

[1] رودت على لسان الرسول(ﷺ) في أكثر من حديث، ومعناها على الدعاء: "خێرت دەستگیر نەبێت"، البخاري ومسلم وغيرهما.

[2] رواه البيهقي في السنن ومسلم بنحوه وأحمد.

ئەی گەنج، گەر تەنهاییەکەت لەگەڵ خودادا ڕاست بێت نهێنی و پەنهات سەرسام دەبێت و دڵت خاوێن و پاڵفتە دەبێت، ئەو کات وردبوونەوەت دەبێتە پەندوەرگرتن و دڵت پڕ لە بیرکردنەوە و ڕۆح و مانات بە حەق(عزوجل) دەگات، بیرکردنەوە لە دونیا سزا و پەردەیە، بیرکردنەوە لە دوارۆژ زانست و زیندەگی دڵە، هەر کەس بیرکردنەوەی پێ ببەخشرێت زانستی بە حاڵی دونیا و دوارۆژ بۆ دروست دەبێت.

هاوار بە حاڵت، دڵت لە دونیادا بزر کردووە لە کاتێکدا خودا بەشی تۆی بڕیوەتەوە، لەلای خۆی کاتە دیاریکراوەکانی بۆ بەشەکانت دیاریکردووە، هەموو ڕۆژێك ڕۆزییەکی نوێت بۆ نوێ دەبێتەوە، داوای بکەی یان داوای نەکەی، پەلامار و هەڵپەت لەلای خودا و خەڵکی ڕسوا و شەرمەزارت دەکات، بە کەمکردنی باوەڕ داوای ڕۆزی دەکەی و بە زیادبوونی باوەڕ لە داواکردن دەوەستی و بە کەماڵ و تەواوی باوەڕیش بە ئارامی سەردەنێیە سەر سەرین.

ئەی گەنج، کاری گرنگ بە کاری بێ ئەرزش و کەم بایەخ تێکەڵ مەکە، تۆ هێشتا دڵت لە خەڵکی بەرنەداوە ئیتر چۆن لەگەڵ خودادا کۆدەبێتەوە لە کاتێکدا تۆ بە سەبەب(هۆ) هاوەڵت بۆ خودا داناوە؟! چۆن دڵت لەگەڵ سەبەبکار(هۆکار) کۆدەبێتەوە گەر تۆ بەم جۆرە بیت؟

چۆن ئاشکرا(ڕواڵەت) و پەنهان(ناوەوە) کۆدەبنەوە، ئەوەی دەیژنەوی و ئەوەی نایژنەوی، ئەوەی لای خەڵکە و ئەوەی لای خودایە، چەند نەزانە ئەو کەسەی سەبەبکار لەبیر دەکات و بیر لە سەبەب(هۆ) دەکاتەوە، لەگەڵ دووەم(هۆ) دەوەستێت و یەکەم(هۆکار) وازلێدەهێنێت، ئەوەی دەمێنێتەوە لەیادی دەکات و بە فانی دڵخۆش دەبێت!

ئەی گەنج، هاوەڵی نەزانان دەکەی و لە نەزانینەکەی ئەوانت بۆ دەگوێزرێتەوە، هاوەڵی کەسی کەمژە هاوەڵیکردنی دۆڕانە و پەشیمانی لەدوایە، هاوەڵی باوەڕدارانی خاوەن یەقینی زانای کارکەر بە زانستەکەیان بکە، چەندە حاڵی باوەڕداران-لە هەموو هەڵسوکەوتێکدا- جوان و ناوازەیە، چەندە بەهێزن لە تێکۆشان و زاڵبوون بەسەر نەفس

و ئارەزووەدا! بۆ ئەو مەبەستەیە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((کرانەوەی باوەڕدار لە ڕوخساریدایە و دڵتەنگییەکەی لەناو دڵیدا))[1].

ئەمە لە بەهێزی ئەوەوەیە، دەتوانێت لەناو خەڵکیدا خۆشی و سروور بخاتە سەر ڕوخساری و حوزنەکەی بشارێتەوە لە نێوان خۆی و خودا(عزوجل)، خەم و پەژارەی ئەو هەمیشەییە، زۆر بیردەکاتەوە، زۆر دەگری و کەم پێدەکەنێت، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((پشوو و ئاسوودەیی بۆ باوەڕدار تەنها ئەو کاتەیە بە لیقای پەروەردگاری(عزوجل) دەگات))[2].

**باوەڕدار** بە ڕووخۆشییەکەی حوزنی خۆی دەشارێتەوە، دەرەوە و ئاشکرای بۆ کەسایەت دەبزوێت و ئاوەوەی بۆ لای پەروەردگار(عزوجل) سوکنایی هەیە، ڕواڵەتی بۆ خانەوادەکەی و ئاوەوەی بۆ پەروەردگاری(عزوجل)، نهێنی خۆی بۆ خانەوادە و منداڵ و جاریە و جیرانی باس ناکات، هەر بەو جۆرە لای هیچ کەسێك لە دروستکراوەکانی پەروەردگار(عزوجل) باسی لێوە ناکات، گوێی لە فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بووە کە دەفەرموێت: ((کۆمەکی کاروبارەکانتان بکەن بە شاردنەوەیان))[3].

بەردەوام ئەوەی لەلایەتی دەیشارێتەوە، گەر زاڵبوونێك هات بەسەریدا یان وشەیەك لە دەمی دەرچوو زوو فریا دەکەوێت و گوزارشتەکەی خۆی دەگۆڕێت، و ئەوەی لێی دەرکەوتووە دایدەپۆشێت و داوای لێبوردن دەکات بۆ ئەوەی لێیوەشایەوە.

**ئەی گەنج،** من بکە بە ئاوێنەی خۆت، من بکە بە ئاوێنەی نهێنی و پەنهان و دڵت، من بکە بە ئاوێنەی کارەکانت، لێم نزیك ببەرەوە لە نەفسی خۆتدا شتگەلێك دەبینی کە هەرگیز نەتبینیوە لە سەردەمی دووری تۆ لە من، گەر پێویستییەکت بۆ دینت هەیە ئەوا وەرە بۆ لام، من لەپێناو ئایینی خودادا مەرامیت بۆ ناکەم، زمانتیژییەکم هەیە بۆ ئایینی خودا دەگەڕێتەوە، بە دەستێکی زبر پەروەردە کراوم،

---

[1] لم أجد له أصلا، إنما جاء في "صفة الصفوة" نسبة هذا القول إلى محمد بن علي الترمذي.

[2] رواه ابن أبي عاصم في "الزهد".

[3] أخرجه ابن حبان في "روضة العقلاء" والسهمي في "تاريخ جرجان".

نەك بە دەستێکی بخۆری دوورِوو، دونیاکەت لە ماڵەوە بەجێبهێڵە و لە مـن نزیـك ببەرەوە، لەلام بوەستە و قسەکانم ببیستە، کار بە قسەکانم بکە بەر لەوەی بەم نزیکانە بمریت، ترس و لەرزت لە خودا بێت و لەناو ئەو بازنەدا بمێنەرەوە، گەر ترست لە خودا نەبێت ئەوا لە دونیا و دوارِۆژدا ئاسایشت نابێت، ترسان لە خودا لە خودی خۆیدا زانستە، بۆ ئەو مەبەستە خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُاْ﴾ فاطر: ٢٨

تەنها زانایانی کارکەر بە زانستەکەیان ترس و لەرزی راستەقینەیان لە خودا هەیە، ئەو زانایانەی فێردەبن و کاردەکەن، و لەسەر کار و کردەوەکانیان پاداشت لە خودا داوا ناکەن، بەڵکو تەنها رووی پاکی خودا و نزیکی لە خودا داوا دەکەن، خۆشەویستی خودایان دەوێت، دەیانەوێت لە دووری و دابرِان لە خودا رزگاریان ببێت، دەیانەوێت دەرگایەك بە روویاندا دانەخرێت لە دونیادا یان لە دوارِۆژدا، حەزیان نە لە دونیایە نە لە دوارِۆژ و نە لە هیچ شتێکی تر جگە لەو دوانە، دونیا بۆ دەستەیەکە و دوارِۆژیش بۆ دەستەیەك، حەقیش(عزوجل) بۆ دەستەیەکە کە بریتین لە باوەرِدارانی خاوەن یەقین، عاریفانی خواویستی خۆپارێزی خاوەن خوشوع بۆ خودا و دڵتەنگ و دڵشکاو لە پێناوی ئەودا، دەستەیەکن لە پەنهاندا لە خودا دەترسن لە کاتێك ئەو(سبحانه وتعالى) لەبەر چاوی ئاشکرایاندا بزر و نادیارە، و لەبەر چاوی دڵیاندا ئامادە و ئاشکرایە، چۆن لێی ناترسن لە کاتێکدا ئەو هەر رۆژێك لە شانوشکۆیەکدایە، شتەکان دەگۆرِێت و ئاڵوگۆرِیان پێ دەکات، ئەمە سەر دەخات و ئەوە رسوا و شەرمەزار دەکات، ئەمە زیندوو دەکاتەوە و ئەوە دەمرێنێت، ئەمە قبووڵ دەکات و ئەوە رەد دەکاتەوە، ئەمە نزیك دەخاتەوە و ئەوە دوور دەخاتەوە:

﴿لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ۝٢٣﴾ الأنبياء: ٢٣

خودایە نزیکمان بکەرەوە لە خۆت و دوورمانمەخەرەوە،،

﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ۝٢٠١﴾

البقرة: ٢٠١

# مەجلیسی شەشەم

## ئامۆژگاری باوەڕدار بۆ براکەی

ڕۆژی هەینی لە مەدرەسەکەی نیوەی شەوالی ساڵی ٥٤٥ھ شێخ عبدالقادر(خودا لێی ڕازی بێت) فەرمووی:

دڵی کەسانی سەر ئەم ڕێگە پاك و خاوێن و بێگەردە و خەڵکی لەبیرچووەتەوە و خودای(عزوجل) لەیادە، دونیا و دواڕۆژی لەبیرکردووە، ئەوەی لای ئێوەیە لەبیریکردووە و کەوتووەتە یادی ئەوەی لای خودایە، پەردە هەیە لە نێوان ئێوە و ئەوان و هەموو ئەوەی تیایدا دەژین، ئێوە بە دونیا سەرقاڵبوون و دواڕۆژتان لەبیرکردووە، حەیا و شەرمتان لە پەروەردگارتان وازلێهێناوە و بە بێشەرمییەوە بۆ لای دەگەڕێنەوە، ئامۆژگاری برا باوەڕدارەکەت وەربگرە و سەرپێچی لێ مەکە، چونکە ئەو شتێك بۆ تۆ دەبینێت تۆ بۆ خۆتی نابینی، بۆ ئەو مەبەستەیە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((باوەڕدار ئاوێنەی باوەڕدارە))[1].

کەسی باوەڕدار لە ئامۆژگارییەکەیدا بۆ برا باوەڕدارەکەی ڕاستگۆیە و کۆمەڵێك شتی بۆ ڕۆشن دەکاتەوە کە لە ئەوەوە ئاشکرا نین، چاکە و خراپەی بۆ جیادەکاتەوە، ئەرکەکان و مافەکانی پێ دەناسێنێت، پاکێتی بۆ ئەو خودایەی ئامۆژگاری خەڵکی خستە دڵمەوە و کردی بە گەورەترین هەوڵ و خەمم، من ئامۆژگاریکەرم و لەسەر ئەوە پاداشتێکم ناوێت، دواڕۆژم لەلای پەروەردگار(عزوجل) بەدەست دەهێنم، من داواکەری دونیا و دواڕۆژ و شتانی تر جگە لەو دوانە نیم، تەنها حەقم(عزوجل) گەرەکە، تەنها دروستکەرێکی تاکوتەنهای دێرین دەپەرستم، خۆشحاڵیم بە سەرفرازی ئێوەوەیە، و خەم و پەژارەم بە تیاچوونی ئێوەوە، کاتێك ڕووی موریدێکی صادق دەبینم لەسەر

---

[1] إسناده حسن، اخرجه ابو داود والبخاري في "الأدب المفرد".

دەستم سەرکەوتنی بەدەست هێناوە تیژ و پاراو دەبم و پۆشتە دەبمەوە و دڵخۆش دەبم و دەپرسم: چۆن ئەوە لەسەر دەستی من بەرهەم هاتووە؟!

**ئەی گەنج**، مەبەستی من تۆیە نەك خۆم، گەر بگۆڕێیت تۆ دەگۆڕێی نەك من، من پەڕیومەتەوە، لەپێناو خۆتدا منت خۆشدەوێت، دەستم پێوە بگرە بۆ ئەوەی بە پەلە بپەڕییەوە.

**ئەی خەڵکینە**، لوتبەرزی بەسەر خودا و دروستکراوەکانی خودادا وازلێبهێنن، سنووری خۆتان بزانن و لە نەفسی خۆتاندا خۆڵی داکراو بن، سەرەتاکەتان نوتفەیەکی سووکی بۆگەنە و کۆتاییەکەتان لاکێکی هەڵدراوە بۆ ناو گۆڕ، لەوانە مەبە هەڵپە دەبیات بەڕێوە و ئارەزوو راوی کردووە، ئارەزوو هەڵیدەنێت بۆ دەرگای سوڵتانەکان بۆ داواکردنی شتێك کە بەشی ئەو نییە یان داوای شتێکیان لێ دەکات خودا بۆ ئەوی داناوە و بەشی ئەو نییە، بەڵام بە زەلیل و رسوایی بووە بە بەشی ئەو، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((توندترین سزاکانی خودا بۆ بەندەکەی داواکردنی شتێکە کە بەشی ئەو نییە))[1].

**هاوار بە حاڵت**، ئەی نەزان بە قەدەر و خاوەن قەدەر، وا گومان دەبەی رۆڵەکانی دونیا دەتوانن شتێك بە تۆ ببەخشن کە بەشی تۆ نییە و بۆت نەبڕاوەتەوە، بەڵام ئەمە وەسوەسەی شەیتانە کە لە دڵ و سەری تۆدا خۆی دامەزراندووە، تۆ بەندەی راستەقینەی خودا نیت، بەڵکو تۆ بەندەی نەفس و ئارەزوو و شەیتان و سروشت و درهەم و دیناری، تێبکۆشە بۆ ئەوەی سەرفرازێك ببینی تاکو بە رێگەیەك تۆش سەرفرازی بەدەست بهێنی.

**لە یەکێك لە گەورە پیاوانەوە(رەحمەتی خودایان لێ بێت) دەڵێت**: هەرکەس سەرفرازێك نەبینێ سەرفرازی بەدەست ناهێنێت، تۆ سەرفرازێك دەبینی، بەڵام بە دوو چاوی سەرت تەماشای دەکەی نەك بە دوو چاوی دڵ و نهێنیت، باوەڕەکەت باوەڕێکە بۆ تۆ نییە، بۆیە گومانی تێدا نییە بەصیرەتێکت نییە کەسانی تری پێ ببینی،

---

[1] لم أجد له أصلا، وقريب منه روى أحمد في مسنده

خودا(عزوجـــــل) دەفـــــەرموێت: ﴿فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَٰكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ ﴿٤٦﴾﴾ الحج: ٤٦

کەسـی هەڵپەکـەر بـۆ وەرگـرتنی دونیـا لـە دەسـتی خـەڵکی دینەکـەی بـە هـەنجیر دەفرۆشێت، ئەوەی دەمێنێتەوە دەفرۆشێت بۆ ئەوەی نامێنێتەوە، گومانی تێدا نییە نە ئەمە و نە ئەوە بەدەست ناهێنێت، لەبەر ئـەوەی باوەڕەکـەت ناتـەواوە بـڕۆ بـە لای چاککردنی گوزەرانی خۆتەوە بۆ ئەوەی ئاتاج نـەبیت بـە خـەڵکی و ئاینەکـەتیان پـێ بیەخشی و بەو هۆیەوە ماڵەکەیان بخۆیت، کاتێك باوەڕەکەت بەهێز و کامڵ بـوو ئـەوا تـەوەکول بـە خودا(عزوجـل) ببەسـتە و لـە هۆیـەکان وەرە دەرەوە و ئەربابـەکان وازلێبهێنە، و بە دڵت لە هەرچی شتە کۆچ بکە، دڵت لە وڵات و خانەوادە و دوکـان و خـزم و ناسـراوانت دەربکـە، ئـەوی لەبەردەسـتدایە رادەسـتی خانـەوادە و برایـان و هاودەمانی بکە، ئەوکات وەك ئەوە وایە فریشتەی رۆحکێشان رۆحـی کێشـابیت، وەك ئەوەی هەڵۆی مەرگ تۆی فڕاندبێت، وەك ئەوەی زەوی شەقی بردبێت و تۆی هەڵلوشی بێت، وەك ئەوەی شەپۆلە پێشینەکانی قەدەر تۆی بـۆ نـاو دەریـای زانسـت بردبێت و لەوێ نوقم بوو بیت، هەر کەس گەیشتە ئەم مەقامـە هۆیـەکان زیـانی پـێ ناگەیـەنن، چونکە هۆیەکان لەسەر رووالەتی ئەون نەك لەسەر ناوەوەی، هۆیەکان بۆ کەسـانی تـر دەبن بە هۆ نەك بۆ ئەو.

خەڵکینـە، گـەر نـەتانتوانی لەسـەر ئـەم حاڵـە بـن لـە دەرچـوون لـە هۆیـەکان و پەیوەستبوون پێیانەوە لە دڵدا لە هەموو روویەکەوە ئـەوکات لـە روویەکـەوە جیـا لـە روویەکی تر هەوڵی بۆ بدەن، گەر نەتانتوانی هەمووی بەدەست بهێنن ئـەوا هەنـدێکی بەدەست بهێنن، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((چەند دەتوانن لە خەم و پەژارەی دونیا بەکۆلا ببنەوە))[1].

ئەی گەنج، گەر توانیت لە خەم و پەژارەی دونیا یەکلاببیەوە ئـەوا ئـەنجامی بـدە، ئەگینا دڵت هانبدە بۆ لای حەق(عزوجل)، دەستبگرە بە پەتی رەحمەتی خوداوە تا خەم

[1] رواه الطبراني في "الكبير والأوسط".



Scanned by CamScanner

و پەژارەی دونیا لە دڵت دەردەچێت، ئەو(سبحانه وتعالى) بەسەر هەموو شتێکدا زاڵ و بەتوانایە، بە هەمووو شتێك زانایە، هەموو شتێکی بەدەستە، دەرگاکەی بەرمەدە و داوای لێ بکە دڵت لە هەرچی شتە پاکبکاتەوە، و بە ئیمان و ناسینی خۆی و زانست بە ئەو و بێنیازبوون لە خەلکی بە ئەو دڵت پڕ بکات، داوای لێ بکە یەقینت پێ ببەخشێت و هزگری بە خۆیەوە بخاتە ناو دڵتەوە و ئەندامەکانت بە کاری چاکەوە سەرقاڵ بکات، هەموو ئەوانە لە خودا داوا بکە نەك لە کەسانی تر، بۆ دروستکراوێکی وەك خۆت زەلیل مەبە، بەڵکو بۆ خودا زەلیلی بنوێنە نەك بۆ کەسانی تر، مامەڵەی تۆ لەگەڵ خودایە و بۆ ئەوە نەك بۆ کەسانی تر.

**ئەی گەنج، فیقهی زمان بەبێ کاری دڵ تەنها یەك هەنگاو لە حەق نزیکت ناکاتەوە**، ڕۆیشتن ڕۆیشتنی دڵە و نزیکی نزیکی نهێنی و پەنهانە، کار کاری ماناکانە لەگەڵ پارێزگاری لە سنوورەکانی شەرع بە ئەندامەکانت و تەوازوع لەپێناوی خودا(عزوجل) بۆ بەندەکانی، هەر کەس کێش و سەنگ بە نەفسی خۆی بدات هیچ کێش و سەنگێکی نییە، هەر کەس کارەکانی بۆ خەلکی دەربخات هیچ کارێکی بۆ نامێنێتەوە، کاروکردەوەکان لە ئاشکرادا دەبن، تەنها فەرزەکان-کە هەر دەبێت وابن و ئاشکرا بن- لە ئاشکرادا ئەنجام دەدرێن، لە بناغە و بنچینەی دامەزراندا کەمتەرخەمیت کردووە، بۆیە ئەو بینایەی لەسەری دروستت کردووە سوودێکت پێ ناگەیەنێت، گەر بیناکەت گۆڕی و بنچینە و بناغەکەت توندوتۆڵ کرد دەتوانی سوود لە بیناکە ببینی، بنچینە و بناغەی کاروکردەوەکان یەکتاپەرستی و ئیخلاصە، هەر کەس یەکتاپەرستی و ئیخلاصی نەبێت کاروکردەوەی بۆ نامێنێتەوە، بنچینە و بناغەی کارەکانت بە یەکتاپەرستی و ئیخلاص دابمەزرێنە، پاشان کارەکان-بە هەوڵ و هێزی خودا نەك بە هەوڵ و هێزی خۆت- بینا بکە، دەستی یەکتاپەرستی بیناکەرە نەك دەستی هاوەڵدانان و دووڕوویی، کەسی یەکتاپەرست شکۆی کاروکردەوەکانی خۆی بەرزدەکاتەوە نەك کەسی دووڕوو، خودایە لە دووڕوویی لە هەموو کار و حاڵ و بارێکدا بەدوورمان بگرە:

﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾﴾

البقرة: ٢٠١

# مەجلیسی حەوتەم

## ئارامگرتن

ڕۆژی یەکشەممە لە "الرباط"، ۱۷/شەوال/٥٤٥ھ شێخ عبدالقادر(خودا لێی ڕازی بێت) فەرمووی: أللهم صل علی محمد وعلی آل محمد، خودایە ئارامیمان پێ ببەخشە و دامەزراومان بکە: ﴿أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا﴾ البقرة: ۲٥۰

بەخشینەکانت بۆ ئێمە زۆر و بێسنوورن، لەسەریان شوکرمان پێ ببەخشە..تا کۆتایی دوعایەکەی، پاشان فەرمووی:

**خەڵکینە**، ئارام بگرن دونیا هەمووی ئافەت و ناخۆشییە، کەمێکی زۆر کەمی بەو جۆرە نییە، هەموو نیعمەتێك نەقمەتێکی لەپاڵدایە، هەموو خۆشییەك ناخۆشییەکی لەگەڵدایە، هەموو بەرینییەك تەنگەلانییەکی لەگەڵدایە، شتێك لە دونیا بە ژیانتان ببەخشن و بەشی خۆتان بە دەستی شەرع دەست بۆ ببەن، چونکە ئەوە دەرمان و دەوایە لە دەستبردن بۆ دونیا.

**ئەی گەنج**، گەر خۆت بە مورید دەزانی بە دەستی شەرع دەست بۆ بەشی خۆت ببە، گەر لە خاسان و صادیقانی بە دەستی ئەمر دەستی بۆ ببە، گەر کەسێکی گەردنکەچ و نزیك لە خودا و بە خوداگەیشتوویت بە دەستی کرداری خودا(عزوجل) دەستی بۆ ببە، بەدەستی شەرع بۆت ڕەوانە دەکرێت و بەدەستی ئەمر فەرمانت پێ دەکرێت و نەهیت لێ دەکرێت و بەدەستی کرداریش لەناو تۆدا دەبیزوێنێت.

**خەڵکی سێ جۆرن: ڕەشۆکی و تایبەت و تایبەتی تایبەتان.**

ڕەشۆکی کەسێکی موسڵمانی خۆپارێزە و شەرع دەستی گرتووە و ڕێنموونی دەکات، پابەندە بە شەریعەتەوە و لێی جیانابێتەوە، بەم ئایەتە کار دەکات کە دەفەرموێت:

﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا ﴾ الحشر: ٧

گەر ئەمەی بۆ تەواو بوو و لە ئاشکرا و پەنهاندا کاری پێکرد دەبێتە دڵێکی نوورانی و پێی دەبینێت، کاتێك شتێك بە دەستی شەرع وەردەگرێت دڵی لێی بێنیازە، و داوای ئیلهامی حەق(عزوجل) دەکات، چونکە ئیلهامی ئەو(سبحانە وتعالی) گشتییە لە هەموو شتێکدا، خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ۝٨ ﴾ الشمس: ٨

دڵی ئەو کەسە خۆپارێزی دەکات و ترسی لێ دەنیشێت و چاوەڕوانی ئیلهامی حەق(عزوجل) دەبێت، نیشانەکەی بە وەرگرتنی ئاشکرای کارەکەیە، وادەبینێت ئەوەی لە دوکانەکەیدایە مولکی خودایە و بەدەستی ئەوە(سبحانە وتعالی)، پاشان دەگەڕێتەوە نوور لە دڵی خۆی وەردەگرێت و تەماشا دەکات بزانێت لەو دوکانە چەندە بەشی خۆیەتی، ئەمە دوای کارکردن بە شەرع دێت، لە باری هێزی ئیمان و یەکتاپەرستییەکەیدا لەدوای دەرچوونی دڵی لە دونیا و لە خەڵکی و دابڕان لە شەپۆلەکانی دونیا و پەڕینەوە لە دەریاکەی، لەو کاتەدا بەرەبەیانی لێ هەڵدێت، نووری ئیمان رووی لێ دەکات، نووری نزیکی لە خودا(عزوجل)، نووری کاروکردەوەکان، نووری ئارامگرتن، نووری ئارامی و دڵنیایی و لەسەرخۆیی، هەموو ئەم بەروبوومانە لەدوای جێبەجێ کردنی مافەکانی شەرع و بەرەکەتی شوێنکەوتنی شەرع.

بەڵام ئەبدال بریتین لە تایبەتی تایبەتان، داوای فتوا لە شەرع دەکەن و پاشان تەماشای ئەمری خودا(عزوجل) دەکەن و سەرنجی کردار و بزوانی ئەو و ئیلهامی ئەو دەدەن، لەپشتی ئەم سیانەوە تیاچوونە لەناو تیاچووندا، ئەخۆشییە لەناو ئەخۆشیدا و حەرامە لەناو حەرامدا و سەرنێشەیە لەسەری ئاییندا و کرمۆکەیە لە دڵدا و دەردەدارییە لە جەستەیدا.

خەڵکینە، کارەکانی خودا لە ناو ئێوەدا بۆ ئەوەیە تەماشا بکات ئێوە چی دەکەن و چی ئەنجام دەدەن، ئایا دامەزراو دەبن یان شکست دەخۆن و دەدۆڕێن، ئایا لەگەڵ خودا راست دەکەن یان درۆ، هەر کەس لەگەڵ قەدەر تەبا نەبێت هاوەڵی پێ ناگرێت و



Scanned by CamScanner

# مەجلیسی هەشتەم

## بیٚ ریایی

ڕۆژی سێشەممە لە مەدرەسەکەی ١٩/شەوال/ ٥٤٥ھ شێخ عبدالقادر فەرمووی:

کەسی ریاکار جلەکانی پاکن و دڵی پیسە، لە موباحات زوهد دەکات و لە کەسابەت تەمبەڵی دەکات، بە دینەکەی نان دەخوات و بەگشتی وەرع لە هیچ شتێك ناکات، حەرامی ئاشکرا دەخوات، حاڵ و باری خۆی لە خەڵکی ڕەشۆکی دەشارێتەوە، بەڵام لە کەسانی تایبەت شاراوە نییە، هەرچی زوهد و گوێڕایەڵییەتی لە ڕوواڵەتیدایە، ئاشکراکەی ئاوەدانە و ناوەوەی وێرانە.

هاوار بە حاڵت، گوێڕایەڵی خودا(عزوجل) بە دڵە نەك بە ڕوواڵەت، هەموو ئەم شتانە: پەیوەستن بە دڵان و پەنهان و ماناوە، ڕووتببەرەوە لەوەی تۆی تێدای لە پاداشتیدا لە حەقەوە(عزوجل) پۆشاکێکت بۆ وەردەگرم هەرگیز نەڕزێت، تۆ ڕووت ببەرەوە بۆ ئەوەی ئەو پۆشتەت بکاتەوە، پۆشاکی تەمبەڵیت بەرانبەر مافی خودا(عزوجل) فڕێبدە، پۆشاکی وەستان لەگەڵ خەڵکی و کردنیان بە هاوەڵی خودا فڕێبدە، پۆشاکی حەز و مەیل و خۆپەسەندی و دووڕووی و خۆشەویستی قبوڵبوون لەلای خەڵکی و ڕووکردنیان لە تۆ و بەخشینیان بە تۆ فڕێبدە، پۆشاکی دونیا فڕێبدە و پۆشاکی دوارۆژ لەبەربکە، لە هەوڵ و هێز و تەکانی خۆت وەرە دەرەوە، خۆت لەبەردەم خودا(عزوجل) ڕاخە بەبێ هەوڵ و هێز و وەستان لەگەڵ هۆیەکان و هاوەڵدانان بۆ خودا بە شتێك لە دروستکراوەکانی، گەر ئەو کارەت ئەنجامدا لوتفی خودا لە دەوروبەرەوە بەسەر تۆدا دادەبارێت، ڕەحمەتی ئەو کۆتدەکاتەوە و نیعمەت و منەتی ئەو(سبحانە وتعالی) پۆشتەت دەکات و لەئامێزت دەگرێت، هەڵبێ بۆ لای ئەو(سبحانە وتعالی) و بەڕووتی و بەبێ خۆت و کەسانی تر خۆت بۆ لای ئەو یەکلابکەرەوە، بە دابڕاوی و

جیابووەوە لە هەرچی شتە بچۆ بۆ لای ئەو، بەتەنهایی و خۆهەڵواردن لە هەرچی شتە رووی لێ بکە، ئەویش کۆتدەکاتەوە و بە هێزی ئاشکرا و ناوەوەی خۆتت دەگەیەنێت، ئەنانەت گەر هەرچی گەردوونە لەسەر تۆ داخرابێت و هەرچی کۆڵی قورسە لەسەر پشتت دانرابێت هەموو ئەوانە زیانت پێ ناگەیەنن بەڵکو لە هەموو ئەوانەدا دەتپارێزێت، هەر کەس بە دەستی یەکتاپەرستی حەزەکانی فانی کرد، بە دەستی زوهد دونیای فانی کرد و بە دەستی حەز بۆ گەیشتن بە خودا هەرچی شتە جگە لە خودا لای فانی بوو ئەوا ئەو کەسە چاکە و سەرفرازی بەدەستهێناوە و خێری دونیا و دوارۆژی مسۆگەر کردووە، ئەفسی خۆتان و ئارەزووەکانتان و شەیتانەکانتان بمرێنن بەر لەوەی خۆتان بمرن، مردنی تایبەت ئەنجام بدەن بەر لە مردنە گشتییەکە.

**خەڵکینە**، وەڵامبدەنەوە من بانگکەرەکەی خودام بۆ دەرگای خودا و گوێڕایەڵی ئەو(سبحانە وتعالی)، بۆ لای خۆم بانگتان لێ ناکەم، کەسی دووڕوو هیچ کەس بۆ لای خودا(عزوجل) بانگ ناکات، ئەو بانگ بۆ لای ئەفسی خۆی دەکات، ئەو لەلای خەڵکی داوای بەش و قبوولکردن دەکات، ئەو داوای دونیا دەکات.

**ئەی نەزان**، بیستنی ئەم قسانە وازلێدەهێنیت و لە خەڵوەتدا لەگەڵ نەفس و ئارەزووی خۆت دادەنیشی، یەکەمجار تۆ ئاتاجی بە هاوەڵی کردنی پیاوانی رێگە، و کوشتنی نەفس و سروشتی خۆت و هەرچی شتی ترە جگە لە مەولا(عزوجل)، بچۆ بۆ لای ئەوان(مەبەستم پیاوانی رێگەیە) و دەرگاکەیان بەرمەدە، لەدوای ئەوە خۆت تەنها بکەرەوە و بەتەنهایی لەگەڵ خودا لە خەڵوەتدا دابنیشە، گەر ئەمەت بۆ تیر وتەواو بوو دەبێت بە دەرمان و دەوا بۆ خەڵکی، دەبیت بە هیدایەتدەر و خۆیشت جێگەی هیدایەت دەبیت بە مۆڵەتی خودا(عزوجل)، تۆ زمانت وەرع دەکات و دڵت پڕە لە بەدکاری، زمانت حەمدی خودا دەکات و دڵت پشتی لێکردووە، ، رووالەت و دەرەوەت موسڵمانە و پەنهان و ناوەوەت بێباوەڕ، ئاشکرا و دەرەوەت یەکتاپەرستە و ناوەوەت هاوەڵدانەر، زوهدت تەنها لە رووالەتدایە و دینت تەنها لە دەرەوە، و ناوەوەت وێرانەیە، وەك سپێتییەك لە پیسیدا و پینتێك لەسەر سەرەنگوێلکێك، گەر بەم جۆرە بوویت شەیتان لەسەر دڵت رەشماڵی خۆی هەڵدەدات و دەیکاتە شوێن و ماوای خۆی،

كەسـى بـاوەڕدار بـە ئاوەدانكردنـەوەى نـاوەوەى دەسـت پێـدەكات، پاشـان بـە ئاوەدانكردنەوەى دەرەوە، وەك ئەو كەسەى خانوويەك دروست دەكات و پارەيـەكى زۆر لە ناوەوەى خەرج دەكات، بەڵام دەرگاى حەوشەكەى شكاو و رزيوە، گـەر بينـاكردن و ئاوەدانكردنەوەى خانووەكە كامڵ بوو لەدواى ئەوە دەرگـاى حەوشـەكەش چـاكدەكات، سەرەتاش بە خودا و رازيبوونى خوداوە(عزوجل) بەم جۆرەيە، پاشان لاكردنەوە بۆ لاى دروستكراوان بە مۆڵەتى خودا، سەرەتا بە بەدەستهێنانى دوارۆژ و پاشان دەستبردن بۆ بەشەكانى دونيا.



# مەجلیسی نۆیەم

## تاقیکردنەوەی باوەڕدار

بەیانی رۆژی هەینی لە مەدرەسە ٢٢/شەوال/٥٤٥ه، شێخ عبدالقادر(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی:

لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: ((خودا خۆشەویستی خۆی ئازار نادات، بەڵام تاقیدەکاتەوە))[١].

باوەڕدار ئەوەی لا ساغبووەتەوە خودا تەنها لەپێناو بەرژەوەندییەکدا ئەو تاقیدەکاتەوە، بەرژەوەندییەك کە بەدوای تاقیکردنەوەکەدا روو لە بەندە دەکات، جا بەرژەوەندییەکە یان دونیاییە یان دوارۆژی، ئەو بە بەڵاکە رازییە و ئارام دەگرێت لەسەری و پەروەردگاری(عزوجل) تۆمەتبار ناکات، یادی پەروەردگاری بەڵاکەی لەبیربردووەتەوە، با ئەوانەی بە دونیاوە سەرقاڵن قسە لەم مەقامانە وازلێبهێنن، چونکە ئێوە تەنها بە زمان قسە دەکەن نەك بە دڵ، ئێوە پشتتان لە خودا و کەلامی خودا و پێغەمبەران و شوێنکەوتوانی راستەقینەی پێغەمبەران کردووە، ئەو شوێنکەوتووانەی خەلیفە و وەسێتدارانی پێغەمبەرانن، ئێوە ململانێ لەگەڵ قەدەری براوە و دەسەلاتی خاوەن قەدەردا دەکەن، بە بەخشینەکانی خەڵکی رازین و بەخشینەکانی خودا و بەهرەکانی خوداتان وازلێهێناوە، قسەیەکی بیستراوتان لەلای خودا و بەندە صالحەکانی خودا بۆ نییە تا تەوبە دەکەن و لە تەوبەکەتاندا ئیخلاص نەنجام دەدەن و بەردەوام و دامەزراو دەبن لەسەری و لەگەڵ قەدەر و قەزادا تەبا بن، لەو شتانەی بۆ ئێوەیە و لەو شتانەی لەسەر ئێوەیە لەگەڵ قەدەر و قەزادا تەبا دەبن،

---

[١] مرسل، رواه ابن أبي عاصم في كتاب الزهد.

بەهەمان شێوە لەو شتانەی عیززەت دەبەخشن و لەو شتانەی زەلیلی دەسەپێنن، هەر بەو جۆرە لە دەوڵەمەندی و هەژاری و لەشساغی و نەخۆشی و ئەو شتانەی خۆشتاندەوێن و ئەوانەی لێیان بێزارن.

**هەڵگینە**، شوێنکەوتوو بن یا شوێنتان بکەون، خزمەتکار بن یا خزمەتتان بکرێت، شوێنپێی باشترین و قەدردارترین هەڵبگرن و خزمەتیان بکەن تاکو شوێنتان بکەون و خزمەتتان بکەن، بۆیان زەلیل بن تاکو بۆتان زەلیل بن، ئەوەتان نەبیستووە کە دەفەرموێت: ((وەك چۆن قەرز دەکەی قەرزت لێ داوا دەکرێت))[1]

**هەروەها**: (( ئێوە چۆن بن لەو جۆرەتان بۆ دەکرێت بە دەسەڵاتدار))[2].

کاروکردەوەکانی ئێوە کرێکاری ئێوەن، خودا(عزوجل) کەمترین ستەم لە بەندەکانی خۆی ناکات، لەسەر کەم پاداشتی زۆر دەداتەوە، دروست بە تێکچوو دانانێت و راستگۆ بە درۆزن سەرژمێر ناکات.

**ئەی گەنج**، گەر خزمەت بکەیت خزمەتت دەکرێت، گەر رابوەستی رادەگیرێیت و سەرکەوتوو دەبیت، خزمەتی حەق(عزوجل) بکە و بە خزمەتی سوڵتانەوە -کە نە زیان دەبەخشن و نە قازانج- سەرقاڵ مەبە و خزمەتی خودا وازلێمەهێنە، ئەوان چی بە تۆ دەدەن؟ ئایا شتێك بە تۆ دەبەخشن بەشی تۆ نەبێت، یان دەتوانن شتێك بە تۆ ببەخشن خودا(سبحانه وتعالى) نەیکردبێت بە بەشی تۆ؟ هیچ شتێك نییە لەلای ئەوان تۆ تێهەڵچوونەوەی بۆ بکەی، گەر بڵێی بەخشینەکانی ئەوان تێهەڵچوونەوە بۆ بڕیاری خودا دەکەن بەوە بێباوەڕ بوویت، ئایا نازانیت (معطي، مانع، ضار، نافع، مقدم، مؤخر) تەنها بریتییە لە خودا(عزوجل)؟ گەر بیشڵێیت: من ئەوە دەزانم ئەوا پێت دەڵێم: چۆن ئەمە دەزانی و کەسانی تر بەسەر خودادا پێشدەخەی؟!

هاوار بە حاڵت، چۆن دوارۆژت بە دونیا خراپ دەکەی؟! چۆن گوێڕایەڵی مەولای خۆت(عزوجل) بە گوێڕایەڵی نەفس و ئارەزوو و شەیتان و خەڵکی خراپ دەکەی؟! چۆن

---

[1] صحيح: رواه البيهقي في الزهد الكبير مرسلاً وابن أبي عاصم في الزهد

[2] قال حافظ السخاوي: رواه الحاكم ومن طريقه البيهقي عن أبي بكرة مرفوعاً.

تەقوای خۆت بە سکالاً لەلای خەلکی خراپ دەکەی؟! بۆ نازانیت خودا(عزوجل) تەقواداران دەپارێزێ و سەرخەری ئەوانە و ناخۆشییەکانیان لێ دووردەخاتەوە و فێریان دەکات و خۆی بە ئەوان دەناسێنێت، و دەستیان دەگرێت و لە بەلاّ و ناخۆشییەکان دەریاندەهێنێت؟ تەماشای دلاّنیان دەکات و بە جۆرێک رۆزییان دەدات بە بیر و خەیالّیاندا نەهاتبێت.

**خودا(عزوجل) لە هەندێ لە کتێبەکانیدا فەرموویەتی:** ((ئەی رۆلّەی ئادەم شەرمم لێ بکە وەك چۆن شەرم لە جیرانە صالّحەکەت دەکەیت))[1].

**پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:** ((گەر بەندەیەك دەرگاکانی خۆی داجخات و پەردەکانی دابداتەوە و خۆی لە خەلکی بشارێتەوە و بە یاخیبوون لە خودا تەنهابکەوێت، خودا(عزوجل) دەفەرموێت: ئەی رۆلّەی ئادەم منت کرد بە سووکترین سەیرکەرانی خۆت؟))[2].



[1] قال الهيثمي في "المجمع" رواه الطبراني وأخرجه السيوطي في "الجامع الصغير" وصححه فالطبراني في "الكبير" والبيهقي في "الشعب".

[2] ذكره ابن رجب في "جامع العلوم والحكم".

# زۆر لەخۆ نەكردن[1]

بەیانی رۆژی یەكشەممە ٢٤/شەوال/ ٥٤٥هـ شێخ عبدالقادر(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی:

لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: ((مـن و تـەقواداران لـە ئومەتەكـەم لـە زۆرلەخۆكردن(تكلف) بەرین))[2].

كەسـی تـەقوادار لـە عیبـادەتی حەقـدا(عزوجل) زۆرلـەخۆكردنی نییـە، چـونكە عیبادەت بووە بە سروشتی ئەو، ئەو بە ئاشكرا و پەنهانی-بەبێ زۆرلەخۆكردن- خـودا دەپەرستێت.

بـەڵام كەسـی دووڕوو لـە هـەموو حاڵ و بارێكـیدا زۆرلـەخۆدەكات، بەتایبـەت لـە عیبادەتكردنی حەق(عزوجل)، لە رووالەتیدا زۆر لەخۆ دەكات و لـە نـاوەوەش خاڵییـە لە عیبادەت، ناتوانێت بگاتە مەنزڵگای تەقواداران، بۆ هەر شوێنێت گوتارێك هەیە و بۆ هەر كارێك پیاوی تایبەت بە خۆی هەیە، كۆمەڵێك پیاو بۆ جەنگ خولقاون، ئـەی دووڕووان لە دووڕوویـیەكەتان تەوبە بكەن، لە هەڵهاتن بگەڕێنەوە، چۆن واز لە شەیتان دەهێنن پێتان پێبكەنێت و دەست بە سینەیدا بهێنێت و ئۆخەی بكـات؟ كاتێـك نوێـژ دەكەن و بەرۆژوو دەبن ئەو كارانە بۆ خەڵكی دەكەن نەك بۆ حەق(سبحانە وتعالی)، هـەر

---

[1] ("تكلف" بەم مانایەش هاتووە: دەسكردن لە شتێك پەیوەندی بە ئەوەوە نییە، هەروەها زۆری بەكارهێنانی رەوانبێژی و هونەرەكانی تری زمان لە قسەكردندا، یاخود شتێك بەدی بەسەر ئەمەشدا لە عادەت و ئەزموونی ئەو نەبێت، لەم شوێنەدا شێخی گەیلانی مانای زۆرلەخۆكردن لە ریا و دووڕوویی نزیك دەكاتەوە).

[2] أشار الحافظ ابن حجر بقوله: روي مرفوعا من حديث سلمان.

بەر جۆرە کاتێك صەدەقە دەکەن و زەکات دەردەکەن و حەج دەکەن، ئێوە بەر ئەم ئایەتە کەوتوون کە دەفەرموێت: ﴿ عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ ﴾ الغاشية: ٣، کارکەری ماندوو. بەم نزیکانە دەگەنە ئاگرێکی سوتێنەر گەر پێدانەگەن و تەوبە نەکەن و داوای لێخۆشبوون نەکەن، شوێنی پێغەمبەر(ﷺ) بکەون بەبێ دروستکردنی بیدعە، شوێن رەوگەی پێشینی چاکان بکەون، لەسەر راستە شەقامی دروست هەنگاو هەڵبگرن، بەبێ چوواندن و پەککخستن(بلا تشبيه و تعطيل)، بەڵکو بە شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ)، بەبێ زۆرلەخۆکردن و رووالەتکاری و توندڕەوی و زماندرێژی و رووپامایی، ئەوەندەتان بەسە کە ئەوانەی پێش ئێوە لەسەری بوون.

**هاوار بە حاڵت**، قورئان لەبەر دەکەی و کاری پێ ناکەی، سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) لەبەردەکەی و کاری پێ ناکەی، بۆ چ شتێك ئەو کارە ئەنجام دەدەی؟ فەرمان دەکەی بە خەڵکی و خۆت ئەنجامی نادەی، نەهی دەکەی لە خەڵکی و خۆت ئەنجامی دەدەی، خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُوا۟ مَا لَا تَفْعَلُونَ ۝٣ ﴾ الصف: ٣

بۆچی شتێك دەڵێن و خۆتان سەرپێچی لێ دەکەن، ئایا شەرم ناکەن؟ بۆ بانگەشەی ئیمان دەکەن و خۆتان باوەڕتان نەهێناوە؟

**ئیمان رێگری لە ئافەت دەکات**، ئیمانە لەژێر باری قورسی ئێمەدا ئارام دەگرێت، ئەوە ململانێ دەکات، ئەوە دەجەنگێ، ئیمانە دەتوانێت دونیا ببەخشێت، ئیمانە بۆ رووی پاکی خودا(عزوجل) دەبەخشێت، ئارەزوو بۆ شەیتان و مەرامەکانی نەفس دەبەخشێت، هەر کەس دەرگای حەقی(سبحانه وتعالی) لەدەست بچێت لەبەر دەرگای خەڵکیدا دادەنیشێت، هەر کەس رێگەی حەق(عزوجل) بزر بکات و سەرلێبشێوێت لەسەر رێگەی خەڵکی دادەنیشێت، هەر کەس خودا خێری بۆی بوێت دەرگای خەڵکی بەڕوودا دادەخات و بەخشینەکانی خەڵکی لە ئەو دەبڕێت تا بەو کارەی ئەو بگێڕێتەوە بۆ لای خۆی، لە ستەم و ناپاکییەوە دەیگێڕێتەوە بۆ دادپەروەری، لە کەسێکی نەبووەوە دەیگۆڕێت بۆ کەسێکی هەبوو، هاوار بە حاڵت، بە دانیشتن لە زستان و

نیعمەتەکانی دڵخۆش مەبە بەم نزیکانە هاوین دێت و ئەو ئاوەی لاتە دەبێت بە هەڵم، ئەو کات لە شوێنی خۆت -کە لە قەراغ دەریایە- ئاوەکەت لێ دەبڕێت و دەمرێت، لە زستانیش دەگەڕێتەوە و زۆر دەبێت، لەگەڵ خودا ببە دەبێت بە کەسێکی ئەمیری دەوڵەمەندی بەڕێزی سەرۆکاری ڕێنیشاندەر، هەر کەس بە خودا لە شتەکانی تر بێنیاز بێت هەرچی کەسە پێی ئاتاج دەبێت، ئەمە شتێکە بە خۆزگە و ئاوات بەدەست نایەت، بەڵام بە شتێك کە لە سینەدا نیشتەجێ بووە و کاروکردەوەکانیش بەڕاستی دەردەکەن.

ئەی گەنج، با بێدەنگی ئاکارت بێت و خامۆشی پۆشاك و هەڵهاتن لە خەڵکی هەموو مەبەستت بێت، گەر توانیت کونێك بکەیە زەوی و خۆتی تێدا بزر بکەی ئەنجامی بدە، با ئەوە ئاکارت بێت تا ئیمانت گەشە دەکات و پێی یەقینت دادەمەزرێت، و باڵی صدقت پەڕ دەردەکات، و چاوی دڵت دەکرێتەوە، ئەوکات لانەیماڵەکەی خۆت بەجێدەهێڵی و دەفڕیت بۆ ئاسمانی زانستی خودا، خۆرهەڵات و خۆرئاوا دەگەڕێیت، دەریا و وشکانی و دەشت و چیا تەی دەکەی، ئاسمانەکان و زەویەکان دەپشکنی، تۆ ئەو کات لەگەڵ دۆستێکی ڕێنیشاندەری بەئاگای، ئەو کات زمانت بە قسە دەپژێت و پۆشاکی خامۆشی فڕێ دەدەی، و هەڵهاتن لە خەڵکی وازلێدەهێنیت ئەو کات لە تەنهایی خۆت وەرە دەرەوە بۆ لای خەڵکی، چونکە تۆ دەوای ئەوانی و زیان بە خۆت ناگەیەنیت، گوێ مەدە بە زۆری و کەمی و ڕووتێکردن و پشتهەڵکردن و مەدح و زەمیان، گوێ بەمانە مەدە، لە هەر کوێ بەربوویەوە تۆ لەگەڵ پەروەردگاری خۆتی و بە پەروەردگاری خۆت(عزوجل) دەگەیت.

خەڵکینە، ئەم دروستکەرە(عزوجل) بناسن و لەبەردەستیدا بەئەدەب بن، هەتا دڵتان لە ئەو(سبحانه وتعالى) دووربێت ئەدەبتان لەگەڵی خراپ دەبێت، کاتێك دڵتان لێی نزیکبوویەوە ئەدەبتان جوان دەبێت، ژاوەژاوی خزمەتکاران لەبەر دەرگا بەر لە سواربوونی مەلیکە، کاتێك مەلیك هات و سواربوو بێدەنگی و جوانی ئەدەب ڕوویان لێ دەکات، چونکە لە مەلیکەوە نزیکن، هەریەکەیان هەڵدێت بۆ گۆشەیەك، ڕووکردنە خەڵکی بریتییە لە خودی پشتهەڵکردن لە خودا(عزوجل)، هیچ سەرکەوتن و

بەرفرازییەکت بۆ نییە تا پۆشاکی ئەرباب فڕێ نەدەی و هۆکارەکان لە خۆت ئەبڕی و تەماشاکردنی خەلکی لە زیان و قازانجدا وازلێ نەهێنیت، ئێوە لەشساغانی نەخۆشن، دەولەمەندانی هەژارن، زیندووی مردوون، هەبووی نەبوونن، تاکەی ئەم هەلهاتنە لە حەق(عزوجل) و پشتهەلکردن لێی، تا کەی ئاوەدانکردنەوەی دونیا و ویرانکردنی دوارۆژ؟ بۆ هەر یەکێك لە ئێوە تەنها یەك دڵ بوونی هەیە، چۆن دەتوانی دونیا و دوارۆژ لە یەك دڵدا جێبکەیەوە؟ چۆن دەبێ خەلك و خودای تێدا بێت؟ چۆن ئەوە لە یەك حالەت و لە یەك دڵدا روودەدات؟ ئەمە درۆیە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((درۆ لە ئیمان پەڕیگرتووە))[1].

هەموو دەفرێك ئەوەی لێ دەرژێت کە تێیدایە، کاروکردەوەکانت بەلگەن لەسەر بیروباوەڕت، ئاشکرات بەلگەیە لەسەر ناوەوەت، بۆیە یەکێك لە خوداناسان دەڵێت: ئاشکرا ناونیشانی پەنهانە، ناوەوەت لای حەق(عزوجل) و بەندە تایبەتەکانی خودا ئاشکرایە، گەر یەکێك لەو بەندانەی خودات بەرچنگ کەوت لەبەردەستی ئەودا خاوەن ئەدەب بە، بەر لەوەی بە لیقای ئەو بگەیت لە گوناهەکانت تەوبە بکە، خۆت بچووك بکەرەوە و تەوازوعی بۆ بنوێنە، گەر تەوازوع بۆ صالحان بنوێنی ئەوا تەوازوعت بۆ خودا نیشانداوە، بۆیە ببە بە کەسێکی خاوەن تەوازوع، چونکە هەر کەس تەوازوع بنوێنێت خودا(عزوجل) بەرزی دەکاتەوە، ئەدەبی جوانت هەبێت لەبەردەم کەسانێك لە خۆت گەورەترن، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((بەرەکەت لە خەلکە بەتەمەنەکەی ئێوەدایە))[2].

دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) نەیویستووە تەنها باسی تەمەن بکات، بەلکو دەبێ لەگەڵ زۆری تەمەن تەقوا و هەستان بە فەرمانەکان و خۆگرتنەوە لە خراپەکان و پابەندبوون بە کیتاب و سوننەتەوە بوونیان هەبێت، ئەگینا چەندین کەسی بەتەمەن بوونیان هەیە و دروست نییە ڕێزیان لێ بگریت و سەلامیان لێ بکەی، و لە بینینیاندا بەرەکەت بوونی

---

[1] صحیح موقوف، رواه احمد في المسند.

[2] إسناده صحيح، رواه ابن حبان والطبراني في "الأوسط" والبيهقي في "الشعب" والحاكم في "المستدرك" وصححه ووافقه الذهبي في "التلخيص".

کارکەر بە زانست و وەرعی خاوەن تەقواداری لە صالحانی بریتین گەورەکان نییە، لە هەرچی شت بێگەردن کە و پاك دڵێکی کۆمەڵە گەورەکان لە کارەکانیاندا، موخلیص خوداناسن و دڵی کۆمەڵێك گەورەکان هەڵکردووە، پشتیان خودا(عزوجل) لە جگە بەدەست بهێنن زۆرتر دڵی زانستی هەتا نزیکن، لەوەوە و هەیە خودا بە زانستیان بێت لە تێدا دونیای خۆشەویستی دڵێك هەر نزیکدەبنەوە، مەولاوە(عزوجل) لە زیاتر بەدەست خودا لە نزیکی بێت تێدا دوارۆژی خۆشەویستی دڵێك هەر دادەبڕێت، خودا بە ئەندازەی دەبێتەوە، کەم دوارۆژ لە حەزت دونیا لە حەزت ئەندازەی بە ناهێنێت، کەم (عزوجل) خودا بۆ خۆشەویستیت خۆشییەکانی) و (بەهەشت دوارۆژ لە حەزت داینەناون، تیایدا خودا کە دایمەنێن شوێنێك لە و بزانن خۆتان پایەی و پلە دەبێتەوە، ((هەر کەس سنوور و رادەی خۆی نەزانێت رۆژگار دەڵێت: خوداناسان لە یەکێك بۆیە دامەنیشە شوێنێك لە ،((دەدەن نیشان پێ خۆی رادەی و سنوور قەدەرەکانی و تێدا تۆی ماڵ خاوەن دامەنیشە شوێنێك لە ماڵێك بۆ رۆیشتی گەر هەڵتبستێنن، شوێنەکە لە نەتەوێ گەر هەڵتدەستێنن، شوێنە لەو خۆت ویستی بەبێ چونکە دانانێت، دەرەوە. دەرتدەکەنە و دەکەن پێ سووکایەتیت و بەرزتدەکەنەوە ئەوا هەڵبستێت

**ئەی گەنج**، تەمەنی خۆت لەناو کتێبی زانست و لەبەرکردنیان بەبێ کارکردن پێیان بەفیڕۆدا، چ سوودێکی بە تۆ گەیاند؟ پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((خودا(عزوجل) لە رۆژی دواییدا بە پێغەمبەران و زانایان دەفەرموێت: ئێوە کاتی خۆی شوانی خەڵکی بوون ئایا لەگەڵ رەعییەتەکانتاندا چیتان ئەنجامدا؟ هەروەها بە مەلیکان و دەوڵەمەندا دەفەرموێت: ئێوە کاتی خۆی خەزنەداری گەنجینەکانی من بوون ئایا بە هەژاراتان گەیاند و بێباباتان پەروەردەکرد و مافی منتان لێ دەرکرد کە لەسەرتان پێویستم کرد بوو؟))[1].

**ئەی خەڵکینە**، ئامۆژگاری وەربگرن لە ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەر(ﷺ) و قسەکەی قبووڵ بکەن، چەندە دڵی ئێوە سەخت و رەقە! پاکێتی بۆ ئەو خودایەی لەسەر

[1] لم أجد له أصلا في الكتب المشهورة.

ئازارەكانی خەڵكی توانای پێداوم، هەركات دەمەوێ بفڕم مەقەستی قەدەر دێت و باڵەكانم دەبڕێت، بەڵام بەوە دڵنەوایی خۆم دەكەم من لە خزمەتی مەلیكدام، هاوار بە حاڵت ئەی دووڕوو، ئاوات دەخوازی لەم شارە بچمە دەرەوە، گەر من لێرە بجووڵێم كارەكان ئاڵوگۆڕ دەبن و ئەندامەكان جیادەبنەوە، و قسەكان دەگۆڕێن، بەڵام لە سزای خودا(عزوجل) دەترسم لەو پەلەكردنەدا، من خۆم بۆ هەڵنەكردووە، بەڵكو لە بەرینییەكی قەدەردام، من لەگەڵی تەبام و خۆم رادەست كردووە، خودایە ئاسایش و خۆڕادەست كردنمان پێ ببەخشە.

**هاوار بە حاڵت**، گاڵتە بە من دەكەی لەكاتێكدا من لەبەر دەرگای حەقدا(عزوجل) راوەستاوم و خەڵكی بانگ دەكەم بۆ لای؟ پاشان وەڵامەكەی خۆت وەردەگریت، پێوانەی باڵێك بۆ سەرەوە بینا بكە، بەڵام بۆ ناوەوە هەزار باڵ، پاشان ئەی دووڕووان سزا و تۆڵەی خودا(عزوجل) لە دونیا و دوارۆژدا دەبینن، رۆژگار سكی پڕە، پاشان دەبینن چی لێوە لەدایك دەبێت، من لەبەر دەست وەرگێڕانی حەقدام(عزوجل)، تاوێك دەمكات بە چیایەك و تاوێك دەمكات بە گەردیلەیەك، تاوێك دەمكات بە دەریایەك و تاوێك بە دڵۆپێك، تاوێك دەمكات بە خۆرێك و تاوێك بە رووناكی مۆمێك، هەروەك چۆن شەو و رۆژ وەردەگێرێت: ﴿كُلَّ يَوۡمٍ هُوَ فِي شَأۡنٖ ۝٢٩﴾ الرحمن: ٢٩

بەڵكو هەموو چركەیەك، رۆژ بۆ ئێوەیە و چركەسات بۆ كەسانی تر.

**ئەی گەنج**، گەر سینە فراوانی و دڵپاكیت دەوێت گوێ بۆ ئەوە مەگرە خەڵكی دەبڵێن، و لا بە لای قسەكانیاندا مەكەرەوە، تۆ دەزانی ئەوان لە دروستكەری خۆیان رازی نین ئیتر چۆن لە تۆ رازی دەبن؟

تۆ ئازانیت زۆرینەی ئەوانە نە قسە دەژنەون و نە دەبینن و نە باوەڕ دەهێنن؟ بەڵكو درۆ دەكەن و راستگۆ نین، شوێنی ئەو دەستەیە بكەوە كە تەنها خودایان لەلایە و بەوەوە خەریكن، گوێ ناگرن لە كەسی تر جگە لە ئەو و تەنها ئەو دەبینن، لەسەر ئازاری خەڵكی ئارام بگرە بۆ رازیبوونی خودا(عزوجل)، ئارامبگرە لەسەر هەموو ئەو بەڵا و ناخۆشییانەی تۆی پێ تاقیدەكاتەوە، ئەمە سوننەتی خودایە لەگەڵ ئەو

بەندانەی هەڵبژێرراون و دڵیان بۆ خودا یەکلابووەتەوە، لە خواردن دایاندەبڕێت، بە چەندین جۆر لە بەلاّ و ئافەت و ناخۆشی دایاندەگرێتەوە، دونیا و دوارۆژیان لێ تەنگەاڵ دەبێت، لە عەرشەوە بۆ فەرشیان لێ بەرتەسك دەكاتەوە، بوونیان بەو كارە دەسڕێتەوە، كاتێك بوونیانی سڕییەوە ئەوان بۆ خۆی یەكلادەكاتەوە نەك بۆ كەسانی تر، لەگەڵ خۆی ڕاوەستاویان دەكات نەك لەگەڵ كەسانی تر، دەیانگۆڕێك بە دروستكراوێكی تر، وەك دەفەرموێت:

﴿ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ ۚ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ ﴿١٤﴾﴾ المؤمنون: ١٤

خەڵقی یەكەم هاوبەشە، بەلاّم ئەم خەلقەیان تاك و ناوازەیە، لە براكان و هاوڕەگەزەكانی(لە ڕۆڵەكانی ئادەم) تەنهای دەكاتەوە و مانای یەكەمی دەگۆڕێت و ئاڵوگۆڕی پێ دەكات، سەرەوەی دەخاتە ژێرەوە، دەیكات بە كەسێكی ڕەبانی ڕۆحانی، دڵی لە بینینی خەڵكی بەرتەسك دەكاتەوە، خودا دەروازەی پەنهانی ئەو لە خەڵكی دادەخات، دونیا و دوارۆژ و بەهەشت و ئاگر و هەموو دروستكراوەكان و بوونەوەرەكان وەكو یەك شت بۆی وێنا دەكرێت، پاشان ئەو شتە ڕادەستی دەستی نهێنی ئەو دەكرێت و قووتی دەدات و لە ئەو جیانابێتەوە، هێز و دەسەلاّتی تێدا دەردەكەوێت وەك چۆن لە عەساكەی موسادا(علیه السلام) دەریخست، پاكێتی بۆ ئەو خودایەی هێز و دەسەلاّتی خۆی دەردەخات لە هەر شتێكدا بیەوێت و لەسەر دەستی هەركەس بیەوێت، عەساكەی موسا(علیه السلام) زۆرێك لە پەت و شتی تری قووتدا، بەلاّم ئاوەوەی عەساكە نەگۆڕا، خودا(عزوجل) ویستی فێریان بكات ئەوە هێز و دەسەلاّتە و حیكمەت نییە، چونكە ئەوەی ساحیرەكان لەو ڕۆژەدا ئەنجامیاندا حیكمەت و ئەندازیاری بوو، بەلاّم ئەوەی لە عەساكەی موسادا(علیه السلام) دەركەوت هێز و دەسەلاّتێك بوو لە حەقەوە(عزوجل)، تێكشكاندنی عادەت بوو، موعجیزەیەكی مەزن بوو، بۆ ئەو مەبەستە ئەمیری ساحیرەكان وتی بە یەكێك لە هاوەڵانی: تەماشای موسا بكە ئەو لە چ حاڵەتێكدایە؟ ئەویش پێی وت: موسا ڕەنگی گۆڕاوە و عەساكەش كاری خۆی دەكات، ئەویش وتی: ئەمە لە كرداری خودایە(عزوجل) نەك لە كرداری موسا، چونكە ساحیر لە سیحرەكەی خۆی ناترسێت و دروستكەر لە دروستكراوەكەی خۆی

ئاترسێت، پاشان ئیمانی بە موسا(علیه السلام) هێنا و هاوەڵانی بەدوای ئەودا ئیمانیان هێنا.

**ئەی گەنج**، کەی لە حیکمەت هەڵدەستیت و روو لە قودرەت دەکەی، کەی کارکردنت بە حیکمەت تۆ دەگەیەنێت بە قودرەتی خودا(عزوجل)، کەی ئیخلاصت لە کاروکردەوەکاندا دەتگەیەنێت بە دەروازەی نزیکی لە پەروەردگارت(عزوجل)، کەی خۆری مەعریفەت رووی دڵ خەڵکی رەشۆکی و دڵی خاسانت پێ نیشان دەدات؟

**بەهۆی بەڵاوە لە حەق(عزوجل) رامەکە**، ئەو بۆیە تاقیتدەکاتەوە بۆ ئەوەی دەریکەوێت ئایا دەگەڕێیەوە بۆ هۆکار و واز لە دەرگانەی ئەو دەهێنی یان نە؟

ئایا دەگەڕێیەوە بۆ ئاشکرا یان دەگەڕێیەوە بۆ پەنهان؟ دەگەڕێیەوە بۆ ئەوەی پەیی پێبراوە یان بۆ ئەوەی پەیی پێنەبراوە؟

دەگەڕێیەوە بۆ ئەوەی دەیبینی یان بۆ ئەوەی نایبینی؟

**خودایە**، تاقیمانمان مەکەرەوە، خودایە بەبێ بەڵا نزیکی لە خۆتەوە بە ئێمە ببەخشە، خودایە نزیکی و لوتفی تۆمان دەوێت، خودایە نزیکی تۆ بەبێ دوورکەوتنەوە، توانامان نییە بۆ دووری لە تۆ و چەشتنی ئازاری بەڵا و ناخۆشییەکان، خودایە نزیکی خۆتمان پێ ببەخشە لەگەڵ نەبوونی ئاگری ئافەتەکان، ئەگەر هەر دەبێ رووبەڕووی ئاگری ئافەت ببینەوە خودایە وەك گیانداری "سمندل"مان[1] لێ بکە کە لە ئاگردا هێلکە دەکات و بێچوو پەروەردە دەکات، لە کاتێکدا ئاگرەکە نە زیانی پێ دەگەیەنێت و نە دەبێتە هەڕەشە بۆ سەری، خودایە بیگێڕە بە ئاگرەکەی ئیبراهیمی خەلیل(علیه السلام)، بە دەورماندا سەوزی و گژوگیا بروێنە وەك چۆن بە دەوری ئیبراهیمدا رواندت، خودایە لە هەرچی شتە بێنیازمان بکە، وەك چۆن ئیبراهیمت بێنیاز کرد، خودایە هۆگریمان پێ ببەخشە و سەرپەرشتیمان بکە و بمانپارێزە وەك چۆن ئیبراهیمت(علیه السلام) پاراست.. ئامین.

---

[1] (دا باوە بالندەیەك بێت لە هندستان بە ئاگر نەسوتێ(معجم المعاني)).

ئیبراهیم(علیه السلام) بەر لەوەی رێگە بگرێتە بەر هاوەڵی بۆ خۆی هەڵبژارد، جیرانی بەر لە خانوو دیاریکرد، رازیبوونی بەر لە قەزایی خودایی هەڵبژارد، لە باوکتان ئیبراهیمەوە(علیه السلام) فێر بن، لە گوفتار و کرداریدا شوێنی بکەون، پاکێتی بۆ ئەو خودایەی لە دەریای بەڵادا لوتفی بە ئەو کرد، داوای مەلەی لێکرد لە دەریای بەڵادا و پشتیوانی خۆی بۆ رەوانە کرد، داوای لێکرد هێرش بکاتە سەر دوژمنەکەی لە کاتێکدا ئەو تەنها سوارێك بوو، داوای بەرزبوونەوەی لێکرد بۆ شوێنێکی بەرز و دەستی لە پشتەوە دانابوو، داوای لێکرد خەڵکی بانگهێش بکات بۆ سەر سفرە و خوان و خەرجی بۆکردنیان لەلای خۆیەوە، ئەمە بریتییە لە لوتفی ناوەکی شاراوە.

**ئەی گەنج**، لە باری هاتنی قەدەر و کرداری خودادا ئارام بە تاکو زۆرێك لە لوتفی لێ ببینی، گوێت لە منداڵەکەی گالینۆسی حەکیم بووە؟ دەبینی چۆن خۆی کرد بە کەر و لاڵ و گێل و خۆی بێدەنگ کرد تا هەموو زانستەکەی لێ وەرگرت، حیکمەتی خودا(عزوجل) بەهۆی زۆری ژاوەژاو و ململانێ و ناکۆکی و پشتهەڵکردنەوە روو لە دڵت ناکات.

خودایە تەبایمان پێ ببەخشە و ناکۆکی و ململانێمان لێ بەدووربگرە.

﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ حَسَنَةٗ وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ٢٠١﴾

البقرة: ٢٠١



# مەجلیسی یازدەهەم

## ناسینی خودا( عزوجل )

بەیانی رۆژی هەینی لە مەدرەسەکەی ٢٩/شەوال/٥٤٥ه شێخ عبدالقادر(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی:

**خەڵکینە**، خودا بناسن و نەزان مەبن بەرانبەری، گوێڕایەڵی خودا بکەن و لێی یاخی مەبن، تەباییتان لەگەڵی هەبێت و سەرپێچی لێ مەکەن و بە قەزای ئەو رازی بن و ناکۆك مەبن لەگەڵی، بە بەدیهاتووەکاندا حەق بناسن، ئەو بەدیهێنەری رۆزیدەرە، ئەو(سبحانە وتعالی) یەکەمین و دواهەمین و ئاشکرا و پەنهانە(الخالق الرازق، الأول الآخر، الظاهر الباطن) ئەو(سبحانە وتعالی) دێرینە و یەکەمە، هەرهەرییە و کۆتایی پێ نایەت، ئەو هەر شتێکی بوێت دەتوانێت بەئەنجامی بگەیەنێت.

﴿ لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾ الأنبياء: ٢٣

ئەو دەوڵەمەندکەر و هەژارکەرە، ئەو قازانبەخش و مرێنەر و سزادەر و ترسێنەر و رجابەخشە، لێی بترسن و لە هیچ کەسی تر مەترسن، رجاتان لای هەبێت و رجاتان لە کەسی تر نەبێت، لەگەڵ دەسەڵات و حیکمەتی ئەودا بسوڕێنەوە تا قودرەت زاڵ دەبێت بەسەر حیکمەتدا، لە رەشێتییەوە بۆ سپێتی خاوەن ئەدەب بن، تا ئەوە دێت ئێوە لە ئەو جیادەکاتەوە، ئەو کات پارێزراو دەبن لە سنووربەزێنی شەرع کە بە مانا ئاماژەی پێ دەکەم نەك بە رووالەت، دانە دانەی صالحان دەگەنە ئەمە، لە دەرەوەی بازنەی شەرع پێویستییەکمان نییە، هیچ کەس ئەم کارە نازانێت مەگەر هەنگاوی بۆ ناو هەڵگرتبێت، تەنها بە سیفەت مەیناسە، لە هەموو کار و بارێکدا لەبەر دەستی پێغەمبەری خودادا(ﷺ) خۆت کۆبکەرەوە، لەژێر فەرمان و نەهی و شوێنکەوتنی

ئەوکات مۆڵەت لە پێغەمبەری خودا بە، تا مەلیک بانگت دەکات بۆ لای خۆی، بۆچی ئەبدال بە ئەبدال ناونراون؟ چونکە ئەوانەی دەچن بۆ لای مەلیک، وەربگرن و بچن بۆ لای مەلیک، خودا(ﷺ) وەربگرن و بچن بۆ لای مەلیک، لەگەڵ ویستی خودا ویستێکیان بۆ نییە و لەگەڵ هەڵبژاردنی خودا هەڵبژاردنێکیان بۆ نییە، بە حوکمی ڕواڵەت و ئاشکرا حوکم دەردەکەن و کار و کردەوەی ئاشکرا و دەرەوە ئەنجام دەدەن، پاشان تەنها دەبنەوە بۆ ئەو کارانەی تایبەتە بە خۆیان، هەتا پلە و پایەیان لە خودا نزیکتر بێت ئەمر و نەهییان بۆ سەر خۆیان زۆرتر دەبێت، تا دەگەنە مەنزیلەیەک نە فەرمانی تێدایە و نە نەهی، بەڵکو فەرمانەکانی شەرع لەگەڵیان کارلێک دەکات و دەدرێتە پاڵیان و ئەوان لێیان کەنارگیرن، بەردەوام لەگەڵ حەق(عزوجل) ڕۆچوون، و لە کاتەکانی ئەمر و نەهیدا ئامادە دەبنەوە(دێنەوە بەر هۆش)، لەو دوو بارەی شەرعدا(ئەمر و نەهی) بەئاگان و پارێزگاریان لێ دەکرێت بۆ ئەوەی سنوورێك لە سنوورەکانی شەرع نەبەزێنن، چونکە دەرچوون و وازهێنان لە عیبادەتە فەرزکراوەکان زەندەقەیە و ئەنجامدانی قەدەغەکراوەکان یاخیبوونە لە خودا، لە هیچ بارێکدا فەرزەکان لەسەر کەس لاناچن و بەرنابنەوە.

ئەی گەنج، کار بە حیکمەت و زانستی خودا بکە و لە بەرنامە ڕەنگڕێژکراوەکەی خۆت لامەدە، پەیمانەکە لەبیر مەکە، دژ بە نەفس و ئارەزوو و شەیتان و سروشتی خۆت و دونیا تێبکۆشە، لە سەرخستنی خودا بۆ تۆ بێهیوا مەبە، چونکە لەگەڵ دامەزران و خۆڕاگری تۆ ڕووت لێ دەکات، خودا(عزوجل) دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ البقرة: ١٥٣، هەروەها دەفەرموێت: ﴿فَإِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ﴾ المائدة: ٥٦، هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا﴾ العنكبوت: ٦٩

زمانی خۆت بگرە لە سکاڵاکردن لەلای خەڵك، لەپێناوی خودا ببە بە نەیاری زمانی نەفست، هەر بەو جۆرە لەپێناوی خودا ببە بە نەیاری هەموو خەڵکی، فەرمانیان پێ بکە بە گوێڕایەڵی خودا و نەهییان لێ بکە لە سەرپێچی و یاخیبوون لە خودا، نەهییان لێبکە لە گومڕایی و بیدعە و شوێنکەوتنی ئارەزوو و تەبایی لەگەڵ نەفس، فەرمانیان پێ بکە بە شوێنکەوتنی کتێبەکەی خودا(عزوجل) و سوننەتی پێغەمبەرەکەی(ﷺ).

**خەڵکینە**، ڕێز لە کتێبەکەی خودا بگرن و لەگەڵی بەئەدەب بن، ئەو کتێبە پەتی پەیوەندی نێوان ئێوە و خودایە(عزوجل) و مەیکەن بە مەخلوق[1]، خودا(عزوجل) دەفەرموێت: ئەمە کەلامی منە، ئێوە پێی دەڵێن نەخێر، هەر کەس بەرپەرچی خودا بداتەوە و قورئان بکات بە مەخلوق ئەوە کوفری بە خودا کردووە، و قورئان لە ئەو وەسفەکەی بەرییە، ئەم قورئانە خوێنراوە، ئەم قورئانە بیستراوە، ئەم قورئانە تێڕامانی تێدا دەکرێت، ئەم قورئانە لە مەسحەفەکاندا نووسراوەتەوە بریتییە لە کەلامی خودا(عزوجل)، ئیمامی شافیعی و ئیمامی ئەحمەد(خودا لێیان رازی بێت) دەیانفەرموو: قەڵەم مەخلوقە(دروستکراوە) و ئەوەی پێی دەنوسرێت مەخلوق نییە، دڵ مەخلووقە، بەڵام ئەوەی تیایدا پارێزراوە مەخلوق نییە.

**خەڵکینە**، ئامۆژگاری قورئان وەربگرن بە کارکردن بە قورئان نەک موجادەلە کردن لەسەر قورئان، بیروباوەڕ چەند وشەیەکە، بەڵام کارکردن بەو بیروباوەڕە زۆر و بێسنوورە، ئیمان بە قورئان بهێنن و بە دڵ بەڕاستی بزانن، و بە ئەندامەکانتان کاری پێ بکەن، سەرقاڵ بن بە شتێکەوە سوودتان پێ بگەیەنێت و لامەکەنەوە بە لای کۆمەڵێک ئەقلی ناتەواوی پەست و نزمدا.

**خەڵکینە**، نابێت بە ئەقڵ دەستبەرداری گوازراوە(المنقول) ببین، دەق بە پێوانە(القیاس) وازلێناهێنرێت، بەڵگەی ڕۆشن وەلانانرێت و بانگەشەی بێ بەڵگە وەرناگیرێت، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((گەر خەڵکی بە بانگەشەکانیان بگیرێن ئەوا دەستەیەک بانگەشەی خوێن وماڵی دەستەیەکی تر دەکات، بەڵام بەڵگە لەسەر ئەو کەسەیە بانگەشە دەکات و سوێندیش لەسەر ئەو کەسەی ڕەدی بانگەشەکە دەکاتەوە))[2].

زمانی زانا و دڵی نەزان سوود و قازانجێک ناگەیەنێت، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: ((ئەوەی زۆر دەترسم لەسەر ئوممەتەکەم دووڕوویەکی زمان پاراوە(کەسێکی زانا بە زمانە)))[3].

---

[1] (لێرەدا شێخی کەیلانی ئاماژە بە فیتنەی موعتەزیلە دەکات کە پێیانوابوو قورئان مەخلوقە)).

[2] صحیح رواه البخاري ومسلم.

[3] صحیح، رواه الطبراني في "الكبير" والبيهقي في "الشعب" والمنذري في ترغيبه، وقال الهيثمي: و رجاله رجال الصحيح.

ئەی زانایان، ئەی نەزانان، ئەی ئامادەبوان و نائامادەبوان شەرم لە خودا(عزوجل) بکەن، بە دڵ تەماشای بکەن و بۆی زەلیل بن، نەفسی خۆتان بخەنە ژێر چەکوشی قەدەرەکانی، پابەند بن بە شوکری نیعمەتەکانیەوە، لە رۆشناییەوە بۆ داهاتنی لێڵە لە گوێڕایەڵی خودادا بن، گەر ئەوە لە ئێوەدا هاتە دی ڕێز و پلە و پایەی خودا(عزوجل) بەدەست دەهێنن و بەهەشتی خودا لە دونیا و دوارۆژدا رووتان لێ دەکات.

ئەی گەنج، هەوڵبدە شتێك لە دونیا نەمێنێتەوە خۆشتبوێت، گەر ئەمەت بۆ هاتەدی ساتێك لەگەڵ نەفسی خۆت بەجێمەهێڵە، گەر لەبیرت کرد یادی بکەرەوە، گەر بێئاگا بوویت خۆت بەئاگا بهێنە، رێگە مەدە چاوبڕیتە شتێکی تر جگە لە خودا، بەگشتی هەرکەس چێژی ئەمەی کرد خودای ناسیوە، ئەمە دانە دانەیەکن لە خەڵکی کە سوکنایییان لەلای خەڵك نییە، ئەی دووڕوان ئافەت و بەڵا لەسەر سەری دڵتانە، خوداناسان هەر کات بە چاوی دڵ تەماشای شتێك دەکەن جگە لە خودا(عزوجل) سەلامەتی خۆیان لە سوکنایی بۆ لای خودا و کەوتن لەبەردەستیدا و بێئاگابوون لە خەڵکی و زمان کۆڵیان لە بەرهەڵستی کردنی قەدەرەکانی خودا لەدەست دەدەن، بۆیە چەندین رۆژ و شەو و مانگ و ساڵ بەسەریاندا گوزەر دەکەن و ئەوان لە یەك دۆخدا(دۆخی چاوبڕینە دەرگانەی خودا) دەمێننەوە، ئەوان ژێرترین خەڵقی خودان، گەر بیانبینن دەڵێن ئەمانە شێتن، گەر ئەوانیش ئێوە ببینن دەڵێن: ئەمانە باوەڕیان بە رۆژی دوایی نییە، دڵیان پڕ لە حوزن و شکاو لەبەر دەستی خودادا(عزوجل)، بەردەوام لە ترسی خودادان و دەلەرزن، هەر کات پەردەی جەلال و مەزنی خودا بۆ دڵیان لادەدرێت ترسیان زۆرتر دەبێت، خەریکە دڵیان پارچە پارچە ببێت و ئەندامەکانی جەستەیان لەیەکتر جیاببنەوە، گەر ئەوەی لێ ببینیین دەرگاکانی رەحمەت و جوانی و لوتف و رجای خۆی بەڕوویاندا دەکاتەوە و سوکنایی بەو حاڵەیان دەبەخشێت، تەنها پێمخۆشە تەماشای ئەوانە بکەم داواکەری دوارۆژ و عەودالی حەقن(عزوجل)، بەڵام داواکەرانی دونیا و خەڵك و نەفس و ئارەزوو، من نازانم چی لەوانە بکەم، تەنها دەمەوێت چارەسەریان بکەم، چونکە ئەوان نەخۆشن و دەبێت پزیشك لەگەڵ نەخۆش ئارام بگرێت.

هاوار بە حاڵت، نهێنییەکانی خۆت لە من دەشاریتەوە، لە کاتێکدا ناشارێنەوە، وا بۆ من نیشان دەدەی داواکەری دوارۆژی لە کاتێکدا تۆ داواکەری دونیایت، ئەو هەوەسبازییەی لە دڵی تۆدایە لە نێوچاوانت نووسراوە، نهێنییەکەت لە ئاشکرای تۆدا دیارە، ئەو دینارەی-بەناو زێڕەی- لە دەستی تۆدایە تەزویرکراوە، دانقێک ئاڵتوونی تێدایە و ئەویتری زیووە، خۆت لە من مەگۆڕە، چونکە نموونەی زۆرم لەو شێوەیە بینیوە، رادەستی منی بکە و بیخە ژێر دەستم تاکو بیتوێنمەوە و زێڕەکەی لێ دەربهێنم و خەوشوخاڵەکەی فڕێ بدەم، کەمێکی باش چاکترە لە زۆرێکی خراپ، دینارەکەی خۆتم رادەست بکە من سکەلێدەرم و ئامێری ئەوەم لەلایە، لە ریا و دووڕوویی تەوبە بکە و شەرم مەکە لە دانپیادانانی بەسەر نەفسی خۆتدا، چونکە زۆربەی موخلیصان لە دووڕووان بوون، بۆ ئەو مەبەستە یەکێک لە خوداناسان(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت: ((تەنها ریاباز ئیخلاص دەناسێت))، کەمێکی زۆر کەم هەن لە سەرەتاوە تا کۆتایی موخلیص بن، منداڵان لە سەرەتای تەمەنیانەوە درۆ دەکەن و بە خاك و خۆڵ و پیسی یاری دەکەن و خۆیان بەردەدەنەوە بۆ ناو تیاچوونەکان و دزی لە باوك و دایکیان دەکەن و قسە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگوێزنەوە، هەرکات ژێری رووی لەوان کرد وردە وردە ئەو شتانە وازلێدەهێنن و لە دایك و باوك و مامۆستایانەوە ئەدەب وەردەگرن، ئەوەی خودا خێری بۆی بوێت ئەدەبی دادەڕێت و ئەو سیفەت و ناکارانە وازلێدەهێنێت، هەرکەسیش خودا شەڕی بۆ ئەو بوێت لەسەر ئەو ناکارانە دەمێنێتەوە و دونیا و دوارۆژ لەدەست دەدات، خودا(عزوجل) دەرد و دەوای دروستکردووە، یاخیبوون دەردە و گوێڕایەڵی دەوایە، ستەمکردن دەردە و دادپەروەری دەوایە، هەڵەکردن دەردە و راست و دروستی دەوایە، سەرپێچی کردن لە حەق(عزوجل) دەردە و تەوبەکردنیش لە مەستی گوناه دەوایە، کاتێك دەوا بەدەست دەهێنیت گەر بە دڵ لە خەڵکی جیابوویەوە و دڵت بە پەروەردگارەوە(عزوجل) پەیوەست کرد و بۆ لای ئەو بەرزت کردەوە، ئەوکات دڵت لە ئاسمان دەبێت و رۆح و ماڵەکەت لە زەوی، بە دڵت لەگەڵ خودا تەنهابکەوە بەوەی خودا دەیزانێت و لە دڵت بمناگایە، لەگەڵ خەڵکیش بە کارکردن بە حوکم بەشداری بکە، لە هیچ یەکێك لەو

فەرمانانەدا لە خەڵکی جیامەبەرەوە تاکو بەڵگەی خودا و خەڵکی لەسەر تۆ راستنەبێتەوە، بە ناوەوە و پەنهانت لەگەڵ پەروەردگارت(عزوجل) تەنهابیەرەوە، بە دەرەوە و ئاشکراش لەگەڵ خەڵکیدا بە، کاتێك سواری پشتی نەفس بوویت رێگە بە سەرەرۆیی ئەو مەدە، ئەگینا ئەو سوار پشتی تۆ دەبێت، هەوڵبدە بیبەزێنە و ژێردەستەی بکە ئەگینا ئەو تۆ دەبەزێنێت گەر گوێڕایەڵ نەبێت لەوەی داوای لێ دەکەیت لە گوێڕایەڵی کردنی خودا(عزوجل)، ئەگەر نە، سزای بدە بە قەمچی برسێتی و تینوێتی و زەلیلی و رووتی و تەنهایی لە شوێنێکدا دڵنەواییکەرێکی لە خەڵکی تێدا نەبێت، ئەو قەمچییەی لەسەر هەڵمەگرە تا دڵنیادەبییەوە لە هەموو بارێکدا گوێڕایەڵی خودا(عزوجل) دەکات، کاتێك نەفس گەیشتە پلەی سوکنایی و ئارامی ئەوا سزادان لەنێوان خۆت و ئەو هەڵمەگرە، پێی بڵێ: فلان کار و فلان کارت کرد، بەردەوام سەرزەنشتی بکە تا بەتەواوی و بە هەمیشەیی زەلیل و ملکەچ دەبێت، لە هەموو ئەم کارانەدا مەبەستت رازامەندی خودا بێت و بتەوێت لەگەڵی تەبا بیت و واز لە یاخیبوون بهێنیت، شوکری بکەیت بەبێ کوفری نیعمەت و یادی بکەی بەبێ لەبیرچوون، دڵت سەرکەوتن و سەرفرازی بەدەست ناهێنێت گەر کەسێکی تێدا بێت جگە لە خودا(عزوجل)، گەر هەزار ساڵ لەسەر پشکۆ بۆ خودا سوژدە ببەیت، گەر دڵت روو لە کەسێکی تر بکات هیچ سوودێکت پێ ناگەیەنێت، هیچ سەرئەنجامێکی ناپێت لە کاتێکدا کەسێکی تری خۆشدەوێت جگە لە مەولای خۆی(عزوجل)، بە خۆشەویستی ئەو بەختەوەر ناپیت تا هەرچی شتە لەلات بزر نەبێت، دەرخستنی زوهد لە شتەکان چ سوودێك بە تۆ دەگەیەنێت لە کاتێکدا بە دڵ رووت لە شتەکان کردووە؟! ئەی نازانیت خودا(عزوجل) ئەوەی لە دڵی هەمواندایە لێی بەئاگایە و دەیزانێت؟! تۆ شەرم ناکەی بە زمان دەڵێی پشتم بە خودا بەستووە و لە دڵی تۆدا کەسێکی تر هەیە جگە لە خودا؟!

ئەی گەنج، بە حیلمی خودا(عزوجل) بەرانبەر بە تۆ فریو مەخۆ، چونکە دەستوەشاندنی خودا زۆر توند و تیژە، بەو زانا نەزانانە بە خودا(عزوجل) فریو مەخۆ، چونکە هەموو زانستەکانیان لەسەریان ماڵە و بۆ ئەوان نییە، ئەوان زانان بە

حوکمەکانی خودا و نەزانن بە خودا(عزوجل)، فەرمان بە خەلکی دەکەن بە فـەرمانی خودا و خۆیان پێیهەڵناسن، نەهییان لێ دەکـەن لـە شـتێك و خۆیـانی لـێ ناگرنـەوە، بانگ بۆ لای حەق(عزوجل) دەکەن، بەڵام خۆیان لێی هەڵدێن، بە یـاخیوون و هەڵـە و تێکـەوتن زۆران لەگـەڵ خـودادا دەگـرن، ناوەکانیـان لـەلام نووسـراو و تۆمـارکراو و ژمێرراون.

خودایە تەوبـە لـە مـن و لـە ئـەوانیش قبـووڵ بفـەرموو، هـەمووومان ببەخشـە بـە پێغەمبەرەکەت(ﷺ) و باوکمان ئیبراهیم(علیه السلام)، خودایە هەندێکمان زاڵ مەکە بەسەر هەندێکی ترمان و هەموومان بخە ناو رەحمەتی خۆتەوە.. ئامین.



## مەجلیسی دوازدەهەم

# نەهی لە "داواکردن لە کەسانی تر جگە لە خودا"

لە بەیانی رۆژی یەکشەممە ٢/ذي القعدة/ ٥٤٥هـ لە "الرباط" شێخ عبدالقادر(خودا لێی رازی بێت) فەرموی:

**ئەی گەنج**، تۆ ویستت بۆ خودا نەهاتووەتە راستە و موریدی ئەو نیت، چونکە هەر کەس بانگەشەی ویستی حەق(عزوجل) دەکات و لەپاڵ ئەوەدا داوای کەسێکی تر دەکات بانگەشەکەی پووچ دەبێتەوە، موریدەکانی دونیا لەناو ئەوەندا زۆرن، موریدەکانی دوارۆژ لەناویاندا کەمن، موریدەکانی حەق(عزوجل) -کە لە ویست و لێراناندا راستگۆن- لە کەم زۆر کەمترن، ئەوان لە کەمی و نەبووندان وەك کبریتی سوور، ئەوان تاکەتاکەیەکی زۆر دەگمەن و نازارەن، دانەیەك ئەگەر ببینرێتەوە، ئەوانە لە عەشرەتێك ژمارەیەکی زۆر کەمن، ئەوان لە زەویدا کانزان و تیایدا مەلیکن، ئەوانە بەگەرخەری بەندە و وڵاتن، بەوان بەلا لەسەر خەڵکی هەڵدەگیرێت، بەوانەوە بارانیان بۆ دەبارێت، و ئاسمان بارانی خۆی رەوانە دەکات و زەوی سەوز دەبێت، لە سەرەتای کاریانەوە لە لوتکەیەکەوە هەڵدێن بۆ لوتکەیەکی تر، لە وێرانەیەکەوە بۆ وێرانەیەکی تر، لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی شوێنێکی تر دەکەن، هەمووان دەخەنە پشتی خۆیانەوە، کلیلەکانی دونیا رادەستی دەکرێت، و رووبارەکان روو بە دڵی ئەوان جاری دەبن، کۆمەڵێك سەرباز لەلایەن حەق(عزوجل) چواردەوریان دەدەن، هەریەکەیان جۆرێك لە پاسەوانی دەکات، ئەوان ئەمانە لە پشتی ژیری ئەوانەوەیە، لەو کاتەدا رووکردنیان لە خەڵکی(بۆ بانگکردنیان) دەگرێت، بەو جۆرە دەبن تا قەڵا بە دەوریاندا دروست دەکرێت و پارێزگاری دەکرێن، و دەکرێنە سەرپەرشتیاری خەڵکی، هەموو ئەمانە لە پشتی ژیری ئەوانەوەیە، لەو کاتەدا رووکردنیان لە خەڵکی(بۆ بانگکردنیان)

دەبێت بە فەرز، ئەوان وەك پزیشكیان لێ دێت و خەلكانی تر وەك نەخۆش، هاوار بە حاڵت، بانگەشەی ئەوە دەكەی تۆ لەوان بیت، چ نیشانەیەكت لەوان هەیە؟

نیشانەی نزیكی لە حەق(عزوجل) و لوتفی ئەو چییە بۆ تۆ؟

تۆ لەلای حەق لە چ مەنزیلەتێكدای و لە چ مەقامێكدای؟

ناو و لەقەبی تۆ چییە لە مەلەكوتی باڵا؟

لەسەر چ شتێك هەموو شەوێك دەرگات دادەخرێت؟

خواردن و خواردنەوەكەت موباحە یان حەڵاڵی رەهایە، دەچییە لای دونیا یان لای دوارۆژ یان نزیكی لە خوداوە(عزوجل)؟

كێ هۆگری تۆیە لە تەنهاییدا؟

كێ هامنشینی تۆیە لە تەنهاییدا؟

ئەی درۆزن، هۆگری تۆ لە تەنهاییدا نەفس و شەیتان و ئارەزوو و بیركردنەوەیە لە دونیا، لە ئاشكراشدا هۆگرانی تۆ مرۆڤە شەیتانەكانن، ئەوانەی هاوەڵی خراپن و هاودەمی وتیوتین، ئەو كارە بە ژاوەژاو و تەنها بانگەشە بەدینایەت، قسەی تۆ لەم هەوەسبازییە سوودێك بە تۆ ناگەیەنێت، سوكنایی و خامۆشی هەڵبژێرە لەبەردەم حەقدا(عزوجل) لەگەڵ وازهێنان لە خراپی ئەدەب، ئەگەر هەر دەبێ لەم بابەتە قسە بوونی هەبێت ئەوا با قسەكردنت لێی لە رێگەی بەرەكەت وەرگرتنەوە بێت لێی و بەفەرپوون لە یادكردنی ئەهلی ئەو رێگەیە، نەك بە ئاشكرا و رووالەتت بانگەشەی بكەی لەگەڵ خاڵیبوونی دڵت لەو بابەتە، هەر ئاشكرایەك پەنهان تەبایی لەگەڵی نەبێت ورێنە و ژاوەژاوە، گوێت لە فەرموودەكەی پێغەمبەر(ﷺ) بووە كە دەفەرموێت: ((ئەو كەسەی بەبەردەوامی گۆشتی خەڵكی دەخوات بەرۆژوو نەبووە))[1].

پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی رۆشن كردەوە رۆژوو تەنها بریتی نییە لە وازهێنان لە خواردن و خواردنەوە و ئەو شتانەی رۆژوو دەشكێنن، بەڵكو تەنانەت بریتی نییە لەوانە و وازهێنان لە گوناهیش، خۆتان لە غەیبەت بپارێزن، چونكە چاكەكان دەخوات وەك چۆن ئاگر پلۆپۆش دەسووتێنێت.

---

[1] رواه الدیلمي في "مسند الفردوس".

هەرکەس سەرفراز بێت هەرگیز دەق بە غەیبەتەوە ناگرێت، هەرکەسیش بە غەیبەت ناسرا لەلای خەلکی کەم حورمەت دەبێت.

خۆتان لە سەیرکردن بە حەزەوە بپارێزن، چونکە ئەو جۆرە تەماشاکردنە تۆوی گوناه بە زەمینەی دڵی ئێوەدا دەوەشێنێت، و سەرئەنجامەکەی لە دونیا و دوارۆژدا ناپەسەندە، خۆتان لە سوێندی درۆ بەدووربگرن، چونکە ئاوەدانی وێران دەکات و بەرەکەتی ماڵ و ئاین ناهێڵێت.

**هاوار بە حاڵت**، ماڵەکەت بە سوێندی درۆ ساغدەکەیەوە و دینەکەت دەدۆڕێنی، گەر تۆزێك ئەقڵت ببوایە ئەوە لە خودی خۆیدا زیانێکی گەورەیە، سوێند دەخۆیت و دەڵێیت: سوێند بە خودا لەم شارەدا وەك ئەم شمەکانەی من بوونی نییە و لای کەس بەدەست ناکەوێت، سوێند بە خودا ئەوەندە و ئەوەندە دەهێنێت، سوێند بە خودا نرخەکەی ئەوەندە و ئەوەندە لەسەر خۆمە، لەگەڵ ئەوەش تۆ لەو قسانەدا درۆ دەکەی، پاشان شایەتی درۆ دەدەی و سوێند بە خودا(عزوجل) دەخۆی کە تۆ کەسێکی راستگۆی، بەم نزیکانە کوێری و چاوئێشە رووت لێ دەکات، لەبەردەستی خودا(عزوجل) خاوەنی ئەدەب بن-خودا رەحمتان پێ بکات- هەرکەس بە ئادابی شەرع ئەدەب وەرنەگرێت ئاگری رۆژی دوایی ئەدەبی دادەدات.

**پرسیارکەرێك پرسیاری لێکرد و وتی:** ئایا هەر کەس ئەو پێنج خەسڵەتەی تێدا بێت یان بەشێك لەو پێنج خەسڵەتەی تێدا بێت حوکم دەدرێت بە بەتاڵبوونەوەی رۆژووەکەی و دەستنوێژەکەی؟

فەرمووی: رۆژوو و دەستنوێژی بەتاڵ نابنەوە، بەڵام ئەمە لەسەر شێوازی ئامۆژگاری و ئاگادارکردنەوە و ترساندن هاتووە.

**ئەی گەنج**. لەوانەیە سبەینێ بێت و تۆ لەسەر پشتی زەوی نەمابێت، یان لەوانەیە لە کاتێکی تردا زەوی بەجێبهێڵێت، ئەم بێئاگاییەت لە چییە؟! چەندە دڵی ئێوە رەقە، ئێوە وەك بەرد وان، من و کەسانی تر پێتان دەڵێین و ئێوە لە یەك دۆخدان، قورئانتان بەسەردا دەخوێنرێتەوە، فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) و سیرەی پێشینانتان بۆ

دەخوێنرێتەوە کەچی ئێوە پەند و ئامۆژگاری وەرناگرن و لە گوناهـ خۆتان نابەزنەوە و کردەوەکانتان ناگۆڕن، هەر کەس لە شوێنێك ئامادە بێت و ئامۆژگاری وەرنەگرێت ئەو کەسە لە خراپانی ئەو شوێنەیە.

**ئەی گەنج**، سووك تەماشاکردنت بۆ ئەولیاکانی خودا (عزوجل) لە کەمی ناسینی خودایە، دەڵێیت ئەوانە تۆمەتبارن بۆ لەناو ئێمەدا نایێن؟ بۆ لەگەڵمان دانانیشن؟ بەهۆی نەزانینت بە نەفسی خۆت ئەم قسەیە دەکەیت، کاتێك دەڵێم مەعریفەت بە نەفسی خۆت نییە، مەبەستم مەعریفەی تۆیە بە قەدر و پلە و پایەی خەڵکی، بە ئەندازەی کەمی مەعریفەتی تۆ بە دونیا و دوارۆژ قەدری دوارۆژ لەلات کەمدەبێتەوە، بە ئەندازەی کەمی مەعریفەتت بە قەدری دوارۆژ ئەناسینت بە خودا کەم دەبێتەوە، ئەی ئەو کەسەی سەرقاڵی بە دونیاوە، بەم نزیکانە زیانمەندی و پەشیمانی لە دونیا و دوارۆژدا لەسەر تۆ دەردەکەوێت، پەشیمانییەکان لە رۆژی دواییدا دەردەکەون، ئێستا زیانمەندی و رۆژی رسوابوون و رۆژی پەشیمانی و زیانمەندی، دادگایی نەفسی خۆت بکە بەر لە هاتنی دوارۆژ، بە حوکمی خودا لە تۆ و بەخشندەیی ئەو بەرتیەرت فریو مەخۆ، تۆ لە خراپترین باری یاخیبوون و هەڵە و ستەمکردن لە خەڵکی و دەستدرێژی، یاخیبوونەکان پەیامبەری بێباوەڕین، وەك چۆن تا(گەرماهاتن) پەیامبەری مردنە، بەر لە مردن تەوبە بکە، بەر لەوەی فریشتەی رۆح کێشان رووت تێ بکات.

**ئەی گەنجینە**، تەوبە بکەن، نابینن خودا (عزوجل) بە بەڵا ئێوە تاقیدەکاتەوە تاکو تەوبە بکەن، بەڵام ئێوە تەوبە ناکەن و بەردەوام دەبن لەسەر یاخیبوون لە خودا، ئەگەر دانەیەك لەم سەردەمەدا رووبەرووی بەڵا و ناخۆشی دەبێتەوە، درۆکردن نەقصەتە بەسەر نیعمەت، سزایەکە بۆ گوناهان نەك زیادەیەك لە پلە و پایە و ریزداری، دەستەبەر تاقیدەکرێنەوە بۆ ئەوەی لەلای مەلیکی خۆیان پلە و پایەیان بەرز بێت، ئەوان لەگەڵ خودا ئارام دەگرن، چونکە رووی پاکی خودایان دەوێت، گەر ئەمەیان بۆ تێبر و ئەوە بوو ئەوا مەلیکیان بەدەست هێناوە، گەر ئەمەیان بۆ بەدەست نەهات دەورییان و بە ئەوان لە تیاچووندان، خودایە تیاچوون نەبێت، داوای نزیکی لە تۆوە دەکەین، داوای سەیرکردنی تۆ دەکەین لە دونیا و دوارۆژ، لە دونیادا بە دڵ و لە دوارۆژدا بە چاو.

خەلكینە، لە رەحمەتی خودا(عزوجل) و دەرووی ئەو بێهیوا مەبن، چونکە رەحمەتی خودا زۆر نزیکە، بێهیوا مەبە، چونکە بەدبەهێنەر بریتییە لە خودا(عزوجل):

﴿لَا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا ۝١﴾ الطلاق: ١

لە بەلا رامەکە، چونکە بەلا لەگەل نارامگرتن بنچینەی هەموو خێرێکە، بنچینەی پێغەمبەرایەتی و پەیام و مەعریفەت و خۆشەویستی بریتییە لە بەلا، گەر لەسەر بەلا نارام نەگریت بنچینە و بناغەیەکت بۆ نییە، بینا لەسەر بنچینە و بناغە رادەوەستێت، هەرگیز مالێکی دامەزراوت لەسەر سەرنگوێلکێکی فشەل بینیوە؟ تۆ بۆیە لە بەلا و ئافەت هەلدێیت لەبەر ئەوەی پێویستت بە ویلایەت و مەعریفەت و نزیکی لە خوداوە(عزوجل) نییە، نارام بگرە و کاربکە تاکو دل و نهێنی و رۆحت ببەیت بۆ دەرگای نزیکی لە پەروەردگار(عزوجل)، زانایان و ئەولیا و ئەبدال میراتگرانی پێغەمبەرانن، پێغەمبەران(علیهم السلام) ئەو کەسانەن مامەلەی بەندەکان لەگەل خودای خۆیان رێکدەخەن، ئەو خەلکانە بانگ دەکەن، باوەڕدار تەنها لە خودا(عزوجل) دەترسێت و رجای تەنها لەلای ئەوە، لە دل و نهێنیدا هێزی پێبەخشراوە، چۆن دلی باوەڕداران بە خودا(عزوجل) بەهێز نابێت لە کاتێکدا ئەوان دلیان بردووەتە خزمەتی خودا؟ بەردەوام ئەو دلانە لەلای خودا دەمێننەوە و جەستەکانیش لەسەر زەوی، خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿وَإِنَّهُمْ عِندَنَا لَمِنَ الْمُصْطَفَيْنَ الْأَخْيَارِ ۝٤٧﴾ ص: ٤٧

لەناو ئەهلی سەردەم و خانەوادەیاندا هەلدەبژێررێن، ماناکانیان جیادەکرێتەوە و بیناکانیان نوورانی دەبن، بۆ ئەم مەبەستەیە لە خەلکی جیابوونەتەوە و لە دەقێتوەگێراوەکان زوهدیان کردووە، بەرەو پێشەوە هەنگاو هەلدەگرن و گیا لەدوایانەوە دەروێت، گەڕانەوە بۆ ئەوان نییە، و بە تەنهاییەوە هۆگرییان پەیدا کردووە، وێرانە و بیابان و کەنار دەریا و چۆلەوانی و سارایان هەلبژارد، نەک ئاوەدانی، لە رووەکی بیابانەکان دەخۆن و لە جۆگە ئاوەکان دەخۆنەوە، نارام دەگرن لەسەر درندەکان، لەو جێگەدایە دلیان لە خودا نزیک دەبێتەوە و هۆگری پێوە پەیدا دەکەن، بینای ئەوان لەسەر

بیناى پێغەمبەران و صادیقان و شەهیدان بیناکراوە، ماناکانیان هەر بەو جۆرە لەسەر ماناکانی ئەوان وەستاون، بەردەوام بە شەو و ڕۆژ لە خزمەتی ئەواندان، تەنهایی و ئاسوودەیی موشتاقان و ئارامی و خۆشی هۆگران تەنها بە خوداوەیە(عزوجل).

ئەی گەنج، هەردەبێ شیرینی و تاڵی و چاکی و تێکچوون و پاکی و لێڵی بوونیان هەبێت، گەر پاکی و ڕوونی تەواوت دەوێت ئەوا دڵت لە خەڵکی جیابکەرەوە و پەیوەستی بکە بە حەقەوە(عزوجل)، لە دونیا جیاببەرەوە و واز لە خانەوادەکەت بهێنە و رادەستی پەروەردگاری خۆیان بکە و دڵت لە هەمووان ڕووتبکەرەوە و وەرە دەرەوە، لە دەرگای دوارۆژ نزیکببەرەوە و پاشان بچۆرە ژوورەوە، گەر پەروەردگاری خۆتت تێدا نەبینییەوە ئەوا بە هەڵهاتن لێی وەرە دەرەوە بۆ ئەوەی نزیکی لە ئەو بەدەست بهێنیت، گەر خودا ببینییەوە هەرچی پاکی و ڕوونی و ئاسوودەییە دەیبینییەوە، ئەوانەی خودایان خۆشدەوێت بە هیچ شتێکی تر نایگۆڕنەوە، بەهەشت خانەی ئەوانەیە بەدوای پلە و پایەدا وێڵن، خانەی بازرگانەکانە، دونیایان بە بەهەشت فرۆشتووە، بۆ ئەو مەبەستە خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ ٱلْأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلْأَعْيُنُ﴾ الزخرف: ٧١

ئایەتەکە ئاماژەی بە دڵ و نهێنی و مانا نەکرد، بەهەشت بۆ ئەو کەسانەیە بەڕۆژوو دەبن و شەونوێژ دەکەن، بۆ ئەو کەسانەیە وازیان لە هەموو شت هێناوە و زوهدیان لە حەز و تام و چێژەکان کردووە، ڕۆژوویەك بە ڕۆژوویەك دەفرۆشن، بێستانێك بە بێستانێك دەفرۆشن، خانوویەك بە خانوویەك، کارم لە ئێوە دەوێت بەبێ قسەکردن، کەسی عاریفی کارکەر بۆ ڕووی خودا(عزوجل) دەرگای ئاسنگەرییە و هەموو شتێکی لەسەر دەکوترێ و ئەو بەدەنگ نایەت، زەوییەکە لەسەری دەڕۆن و گۆڕانی بەسەردا دێت و ئاڵوگۆڕ دەبێت بەبێ ئەوەی دەنگی لێوە بێت، دۆستانی خودا تەنها خودا(عزوجل) دەبینن، تەنها لە ئەوەوە دەبیستن، ئەوان ویژدانیان هەیە بەبێ زمان، ئەوان ڕێسا و یاسان و بە هەمیشەیی بەو جۆرە دەمێننەوە، کاتێك خودا(عزوجل) بیەوێت ناویان بڵاودەکاتەوە و دەیانناسێنێت، بەبێ ویستی خۆیان ویژدانیان دەهێنێتە سەر زمان وەك ئەوەی بەشکرابن، مەلیك بە دەستی سۆز و بەزەیی خۆی ئەوان دەبات بۆ لای خۆی، تەنها بۆ

خۆی دایانده‌رژێنێت و پێکیان ده‌هێنێت نه‌ك بۆ که‌سانی تر، بۆ خودی خۆی به‌دییه‌ ده‌هێنێت وه‌ك چۆن موسای(علیه السلام) بۆ خۆی به‌دیهێنا و پێی فه‌رموو:

﴿وَاصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِي ۝٤١﴾ طه: ٤١

ناسووده‌یی به‌بێ ماندبوون، هۆگری به‌بێ ئاموٚبوون، نیعمه‌ت به‌بێ ناخۆشی، دڵخۆشی به‌بێ دڵته‌نگی، شیرینی به‌بێ تاڵاوی ژیان، موڵك و ده‌سه‌ڵات به‌بێ تیاچوون.

﴿هُنَالِكَ الْوَلَايَةُ لِلَّهِ الْحَقِّ﴾ الكهف: ٤٤

هه‌رکه‌س گه‌یشته ئه‌م حاڵه‌ته ئاسووده‌یی بۆ پێشده‌که‌وێت، به‌ڵام له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی تۆ له‌سه‌ریتی له دونیادا ئاسووده‌یی نابینیته‌وه، چونکه خانه‌ی لێڵی و خانه‌ی ئافه‌ته و هه‌ر ده‌بێ لێی بێیه ده‌ره‌وه، بۆیه له‌سه‌رته له دڵ و له ده‌ستت دونیا ده‌ربکه‌ی، گه‌ر لات گران بوو له ده‌ستت ده‌ریبکه، ئه‌وجا له دڵت ده‌ریبکه، پاشان که به‌هێز بوو له ده‌ستت ده‌ریبکه و بیده به هه‌ژاران و گه‌دایان که بریتین له خانه‌واده‌ی حه‌ق(عزوجل)، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ش له دونیادا هه‌ندێ شت بۆ تۆ هه‌یه هه‌ر ده‌بێت ده‌ستی بۆ ببه‌ی و له‌ده‌ستت ئه‌چن، یه‌کسانه ده‌وڵه‌مه‌ند بیت یان هه‌ژار، زاهید بیت یان دونیاپه‌رست، ته‌ندروستی دڵ و نهێنی تۆ و پاکێتیان به فێربوونی زانست و کردار کردن به زانست و ئیخلاص له کردار و صدق له داوای حه‌قدا(عزوجل) به‌ده‌ست دێن.

ئه‌ی گه‌نج، ئه‌و قسه‌ت نه‌بیستووه که ده‌ڵێت: فێرببه و پاشان که‌ناربگره، به فیقهی ئاشکرا ئاشنا ببه و پاشان بۆ فیقهی ناوه‌وه گۆشه‌نشین ببه، به‌م ئاشکرا کار بکه تا کردار له زانستێك(زانستی دڵ) نزیکت ده‌کاته‌وه که پێشتر نه‌تزانیوه، ئه‌م زانسته ئاشکرا رۆشنایی ده‌ره‌وه‌ی مرۆڤه، رۆشنایی ناوه‌وه‌ش ناوه‌وه رووناك ده‌کاته‌وه، ئه‌وه نوورێکه له نێوان تۆ و په‌روه‌ردگارادا(عزوجل)، هه‌رکات به زانسته‌که‌ت کار ده‌که‌ی رێگه‌که‌ت له حه‌ق(عزوجل) نزیکده‌بێته‌وه و ده‌رگاکه له نێوان تۆ و خودادا به‌رین ده‌بێت و ئه‌و ده‌رگایه‌ی تایبه‌ته به تۆ ده‌خرێته سه‌رپشت.

﴿رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ ۝٢٠١﴾

البقرة: ٢٠١

# مەجلیسی سیازدەهەم

## پێشخستنی دوارۆژ بەسەر دونیادا

شەوی سێشەممە لە مەدرەسەکەی ٤/ذي القعدة ٥٤٤هـ شێخ عبدالقادر(خوا لێی ڕازی بێت) فەرمووی:

**ئەی گەنج**، دوارۆژ پێش دونیا بخە، چونکە هەردووکیان بەدەست دەهێنیت، بەڵام گەر دونیا پێش دوارۆژ بخەی -وەك سزایەك بۆ تۆ- هەردووکیان دەدۆڕێنی، چۆن دەبێ بە شتێکەوە خەریك بیت فەرمانت پێنەکراوە، گەر بە دونیاوە سەرقاڵ نەبیت خودا کۆمەکی خۆی بۆ تۆ ڕەوانە دەکات و سەرکەوتنت پێ دەبەخشێت و کاتی دەستبردن بۆ دونیا بۆ تۆ دیاریدەکات، گەر شتێك لە دونیا بەدەست بهێنیت بەرەکەتی تێدا دادەنرێت، باوەڕدار بۆ دونیا و دوارۆژی کاردەکات، بۆ دونیا کار دەکات بەو ئەندازەی پێویستی پێیەتی، بەوەندە قەناعەت دەکات وەك توێشووی کەسێکی موسافیر، زۆر لەگەڵ خۆی هەڵناگرێت، کەسی نەزان هەموو خەم و پەژارەیەکی بریتییە لە دونیا، کەسی عاریفیش هەموو خەم و پەژارەیەکی بریتییە لە دوارۆژ و ئەوجا مەولای خۆی(عزوجل)، گەر کولێرەیەکت لە دونیا کەوتە بەردەست و نەفست ململانێی لەگەڵ دەکردی و حەزەکان داوایان دەکرد ئەوا تەماشا بکە بزانە دەتوانی نەفس و حەزت بشکێنی و کولێرەکەت لەگەڵ کەسانی تر لەت بکەیت، تۆ سەرکەوتن بەدەست ناهێنیت تا ڕقت لە نەفسی خۆت دەبێتەوە و لەپێناوی خودا(عزوجل) دەستبرێژی دەکەیە سەر، صادیقان هەندێکیان هەندێکی تریان دەناسنەوە، هەریەکەیان بۆنی صدق و قبووڵ لەویتریان دەکات، ئەی ئەو کەسەی لە حەق(عزوجل) و صادیقان لە بەندەکانی خودا کۆچت کردووە و ڕووت لە خەڵکی کردووە و بە هۆی ئەوانەوە هاوەڵت بۆ خودا داناوە تا کەی ڕوو لەوان دەکەی؟ ئەوانە چ سوودێك بە تۆ دەگەیەنن؟ زیان بە دەستی

ئەوان نییە، قازانج و پێبەخشین و لێگرتنەوە لەلای ئەوان نییە، لەو شتانەی بۆ زیان و قازانج دەگەڕێتەوە هیچ جیاوازییەک نییە لە نێوان ئەوان و بێگیانانندا، یەک مەلیک و یەک زیانبەخش و یەک سوودبەخش و یەک بزوێنەر و وەستێنەر، یەک زاڵکەر و یەک رامهێنەر و یەک بەخشەر و یەک لێگرەوە، دروستکەری رۆزیدەر بریتییە لە خودا(عزوجل)، ئەو دێرینی هەرهەری هەمیشەییە، ئەو بەر لە دروستکراوەکان بوونی هەبووە، بەر لە باب و باپیران و دایکان و دەوڵەمەندانی ئێوە بوونی هەبووە، ئەو دروستکەری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیاندایە.

﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾ الشورى: ١١

**هاوار بە حاڵتان**، ئەی دروستکراوەکانی خودا، بە دروستی دروستکەری خۆتان ناناسن، گەر لە رۆژی دواییدا شتێکم لەلای خودا(عزوجل) هەبێت کۆڵەکاتان لە یەکەمین کەستانەوە تا دواهەمین کەس هەڵدەگرم، ئەی ئەو کەسەی بەسەر مندا دەخوێنییەوە بەتەنها بەسەرمدا بخوێنەوە، بەبێ ئەهلی ئاسمانەکان و زەوی، هەرکەس بە کارەکانی خۆی هەڵدەستێت دەرگایەک دەکەوێتە نێوان ئەو و خودا(عزوجل) و دڵی لێیەوە دەچێتە ژوورەوە، بەڵام تۆ ئەی زانا سەرقاڵی وتیوتیت، بە زانستەکەت ماڵ و سامان کۆدەکەیەوە، بۆیە تەنها رووالەت دەکەوێتە بەردەستت نەک مانا، گەر خودا خێری بۆ یەکێک لە بەندەکانی بوێت فێری دەکات، و پاشان کردار و ئیخلاصی ئیلهام دەکات، لەوێوە لێی نزیکدەبێتەوە و نزیکی دەکاتەوە و مەعریفەی پێ دەبەخشێت و زانستی دڵانی فێر دەکات، نهێنی و پەنهانی لەناو خەڵکیدا پێی دەبەخشێت، وەک چۆن موسای(علیه السلام) هەڵبژارد و لەخۆی نزیک کردەوە ئەویش هەڵدەبژێرێت و نزیکی دەکاتەوە.

﴿وَٱصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِى ﴿١١﴾﴾ طه: ٤١، بۆ خۆمم بەدیهێناوی نەک بۆ کەسانی تر، نەک بۆ حەزەکان و چێژ و تورەهات، نەک بۆ زەوی و بۆ ئاسمان، نەک بۆ بەهەشت و ئاگر، نەک بۆ موڵک و تیاچوون، هیچ شتێک نابێت بۆ لای من کۆتوبەندت بکات، خەرۆکەر(سەرقاڵکەر)ێک نابێت سەرقاڵت بکات، رووالەتێک نابێت ئەسوت بکات، دروستکراوێک نابێت لە منت دابڕێت، حەزێک نابێت لە منت بێنیاز بکات.

**ئەی گەنج**، بەهۆی یاخیبوونێکەوە نەنجامت داوە لە ڕەحمەتی خودا(عزوجل) بێهیوا مەبە، بەلکو پیسی پۆشاکی ئاینت بە ئاوی تەوبە و دامەزران لەسەر تەوبە و ئیخلاص تیایدا بشۆ، ئەوجا بۆنی خۆشی مەعریفەت بدە لە پۆشاکی ئاینت، لەو شوێنەی تۆی تێکەوتووی خۆت بپارێزە، چونکە هەرکات لا بەلایدا دەکەیەوە دڕندەکان لە دەوری تۆن، و ئازارەکان ڕووت لێ دەکەن، خۆتی لێ لابدە و بە دڵ بگەڕێرەوە بۆ لای حەق(عزوجل)، بە سروشت و حەز و ئارەزوو شت مەخۆ، بە دوو شایەتی ڕاست و دروست شت بخۆ، ئەو دوانەش بریتین لە کیتاب و سوننەت، پاشان دوو شایەتی تر داوا بکە، ئەو دوانەش بریتین لە دڵی تۆ و کرداری خودا لە تۆدا(عزوجل)، گەر کیتاب و سوننەت و دڵت مۆڵەتیاندا تەماشای شایەتی چوارەم بکە کە بریتییە لە کرداری خودا(عزوجل)، وەك ئەو کەسە مەبە بە شەودا دار و چلوچێو کۆدەکاتەوە و نازانێت چی دەکەوێتە بەردەست، ئەو کات دروستکەر و دروستکراو دەست بۆدەبات، ئەم کارە بە ڕووالەت و ئاواتخواستن و زۆرلەخۆکردن نییە، بەلکو ئەوە کارێکە لە سینەدا نیشتەجێ بووە و کردارەکان بەڕاستی دەگەڕێنن، واتە کارێك ئەنجام دەدات کە مەبەست پێی ڕووی پاکی خودایە.

**ئەی گەنج**، عافییەت لەوەدایە واز لە داوای عافییەت بهێنی، دەولەمەندی لە وازهێناندایە لە داوای دەولەمەندی، دەوا و دەرمان لە وازهێناندایە لە داوای دەوا، هەموو دەوایەك لە ڕادەستکردنی حەق(عزوجل) و بڕینی هۆکار و دەرکردنی ئەربابدایە لەناو دڵ، دەرمان لە یەکتاپەرستیدایە بە دڵ نەك تەنها بە زمان، یەکتاپەرستی و زوهد بە جەستە و زمان نییە، یەکتاپەرستی لە دڵدایە، زوهد لە دڵدایە، تەقوا دڵدایە، مەعریفە لە دڵدایە، زانست بە حەق(عزوجل) لە دڵدایە، خۆشەویستی خودا(عزوجل) لە دڵدایە، نزیکبوونەوە لە ئەو(سبحانە وتعالی) لە دڵدایە، کەسێکی ژیرومەند بە، هەوەسبازی مەکە و زۆرلەخۆکردن وازلێبهێنە، تۆ لە هەوەسبازیدای و زۆرلەخۆدەکەی و درۆ و ریا و دووڕوویی ئەنجام دەدەی، هەموو ئاواتی تۆ ڕاکێشانی خەلکییە بۆ لای خۆت، ئەی نازانیت هەر کات بە دڵ هەنگاوێك بۆ لای خەلکی هەلدەگریت لە حەق(عزوجل) دووردەکەوییەوە؟ بانگەشەی ئەوە دەکەی تۆ بەدوای حەقدا(عزوجل)

عەودالّی لە کاتێکدا تۆ بەدوای خەلکدا عەودالّی، نموونەی تۆ وەك ئەو کەسە وایە کە دەلێت: دەمەوێت بچم بۆ مەکە کەچی روو لە خۆراسان دەکات، بۆیە لە مەکە دووردەکەوێتەوە، بانگەشەی ئەوە دەکەی دلّت لە خەلکی هاتووەتە دەرەوە لە کاتێکدا تۆ لێیان دەترسی و رجات پێیان هەیە، رووالّەتت زوهدە و ناوەوەت حەزە، رووالّەتت حەقە و ناوەوەت خەلکی، ئەم کارە بە وتنی زمان ئەنجام نادرێت، ئەم حالّەتە خەلك و دونیا و دوارۆژ و بەگشتی هەرشتێکی تر جگە لە خودای تێدا نییە، ئەو یەکە و تەنها یەك قبوولّ دەکات، ئەو یەکە و هاوەلّ قبوولّ ناکات، ئەو ئەو کەسەیە کاروبارەکانی تۆی لەدەستدایە و بەرێوەیان دەبات، هەموو خەلکی دەستەوسانن، زیان و سوودت پێ ناگەیەنن، تەنها خودا(عزوجل) ئەو کارانە لەسەر دەستی ئەوان جاری دەکات، لەوانەیە لە تۆ و لەواندا جاری بکات، قەلّەم لە زانستی خودادا(عزوجل) بەسەر تۆ و ئەوانەی لە دەوروبەری تۆدان جاری بووە، یەکتاپەرستانی بۆ خودا صالح بەلگەی خودان لەسەر هەموو دروستکراوەکانی، هەیانە لەرووی ناوەوە و دەرەوە لە دونیا رووتدەبێتەوە، هەشیانە تەنها لەرووی ناوەوە لە دونیا رووتدەبێتەوە، لە ناوەوەیان حەق(عزوجل) شتێك لە دونیا نابینێتەوە، ئەو دلاّنە کۆمەلێك دلی پاك و بێگەردن، هەر کەس بتوانێت دلی بەو جۆرە لێ بکات مولکیان لەناو خەلکیدا پێ دەدرێت، ئەو کەسە ئازای پالّەوانە، ئازا ئەو کەسەیە دلی خۆی لە هەرچی شتە جگە لە خودا(سبحانە وتعالى) پاککردووەتەوە و لە دەرگای دلّیدا بە شمشێری تیژی یەکتاپەرستی و شەرعەوە وەستاوە و رێگە نادات شتێك لە دروستکراوەکان بچنە ناو دلّییەوە و لەگەلّ وەرگێری دلاّن(خودا) نیشتەجێ بێ، شەرع[1] رووالّەت و دەرەوە پاك دەکاتەوە، یەکتاپەرستی و ناسینی خوداش ناوەوە پاك دەکەنەوە، لەگەلّ تۆمە، لە نێوان وتیان و وتمان هیچ سەوز نابێت، دەلێی ئەوە حەرامە و خۆت ئەنجامی دەدەی، ئەوە حەلاّلە و خۆت بەکاری ناهێنیت، تۆ هەوەسبازیت لەناو هەوەسبازیدا، لە **پێغەمبەری خوداوە(ﷺ)** فەرموویی: ((یەك جار وەیل بۆ نەزان و حەوت جار وەیل بۆ زانا))[2].

---

[1] (لەم شوێنەدا مەبەستی فیقهە).

[2] لا اصل له، روی بنحوه بلفظ آخر.

یەك وەیل بۆ نەزانێك بۆچی نەیزانی، بەڵام حەوت جار وەیل بۆ ئەو زانا چونکە زانی و کاری پێ نەکرد، بەرەکەتی زانستی لێ هەڵگیرا، و زانستەکە وەك بەڵگەیەك لەسەری راستبوویەوە، زانست فێربە و پاشان کاری پێ بکە و ئەوجا بە گۆشەنشینی خۆت لە خەڵکی کەنارگیر بکە و بە خۆشەویستی خوداوە(عزوجل) سەرقاڵ ببە، گەر تەنهاکەوتنەوە و خۆشەویستیت بۆ هاتە راستە ئەوا خودا تۆ لە خۆی نزیکدەکاتەوە و تیایدا فەنات دەکات، پاشان گەر خودا ویستی ئاشکرات دەکات و ناوبانگت پێ دەدات و بۆ خەڵکی دەرتدەخات و دەتگێڕێتەوە بۆ دەستبردن بۆ بەشەکان، فەرمان بە با دەکات و لە دیواری خەڵوەگاکەت هەڵدەکات و ویرانی دەکات، بۆ خەڵکی تۆ ئاشکرا دەکات، ئەوکات تۆ بە خوداوە لەناو خەڵکیدا دەژیت نەك بە خۆتەوە، بەشی خۆت وەردەگریت بەبێ هەڵپەی نەفس و سروشت و ئارەزوو، دەتگێڕێتەوە بۆ بەشەکانت بۆ ئەوەی یاسای کارکردنی لە تۆدا پووچ نەبێتەوە، بەشەکان وەردەگریت و دڵت لەگەڵ حەقدایە(عزوجل)، گوێبگرن و کاربکەن ئەی ئەو کەسانەی بە حەق(عزوجل) و دۆستانی خودا نەزانن، ئەی ئەو کەسانەی تانە لە خودا و لە دۆستانی خودا دەدەن، حەق بریتییە لە حەق(عزوجل)، پووچ بریتییە لە نێوەی دروستکراو، حەق لە دڵان و پەنهان و مانادایە، پووچیش لە نەفس و ئارەزوو و سروشت و بەندوباو و نەریت و دونیا و هەر شتێکی تردایە جگە لە خودا(عزوجل)، ئەم دڵە سەرفرازی بەدەست ناهێنێت تا پەیوەست دەبێت بە نزیکی لە خوداوە(عزوجل)، ئەو خودایەی دێرین و هەرهەری و هەمیشەیی و هەتاهەتاییە، شانشانێن مەکە ئەی کەسی دووڕوو، تۆ لەم مەیدانەدا خێرێکت بۆ نییە، تۆ بەندەی نان و پێخۆر و شیرینی و پۆشاك و نەسپ و دەسەڵاتەکەتی، دڵی صادق کۆچ لە خەڵکی دەکات و دەچێت بۆ لای حەق(عزوجل)، لە رێگەدا شتگەلێك دەبینێت سەلامیان لێ دەکات و بە پاڵیاندا گوزەر دەکات، زانایانی کارکەر بە زانستەکەیان نوێنەرانی پێشینی چاکانن، ئەوان میراتگری پێغەمبەرانن، ئەوانەن لە پاشێن کە بە "اولو بقية" ناوبراون، ئەوانە پێشی خەڵکی دەکەون و فەرمانیان پێ دەکەن بە ئاوەدانکردنەوە لە شاری شەرعدا، و نەهییان لێ دەکەن لە ویرانکاری لەو شارەدا، لە رۆژی دواییدا ئەوان و

پێغەمبەران(علیهم السلام) کۆدەبنەوە و پاداشتی خۆیان لە پەروەردگار(عزوجل) وەردەگرن، خودا نموونەی ئەو زانایەی کە کار بە زانستەکەی ناکات لەم ئایەتەدا ئاماژە پێداوە: ﴿كَمَثَلِ ٱلْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًا﴾ الجمعة: ٥

ئەسفار بریتییە لە کتێبی زانست، ئایا گوێدرێژ سوود لە کتێبی زانست وەردەگرێت؟ تەنها ماندووبوون و شەکەتییان لێوە دروێنە دەکات، هەر کەس زانستی زیاد بوو پێویستە ترسی لە پەروەردگاری(عزوجل) زۆرتر بێت و زۆرتر گوێڕایەڵی بکات، ئەی ئەو کەسەی بانگەشەی زانست دەکەی کوا گریانت لە ترسی خودا(عزوجل)؟ کوا خۆپارێزی و ترست؟ کوا دانانت بە گوناهەکاندا؟ کوا بەردەوامبوونت لە رووناکییەوە بۆ تاریکی لە گوێڕایەڵی خودادا(عزوجل)؟ کوا ئەدەبدادانت بۆ نەفسی خۆت و تێکۆشان لەگەڵی لە پێناوی حەقدا(عزوجل) و دوژمنایەتی کردنی؟ تۆ هەموو هەوڵ و خۆزگەیەکت بووە بە کراس و جبە و مێزەرە و خواردن و هاوسەریکردن و دروستکردنی خانوو و ریزە دوکان و دانیشتن لەگەڵ خەلکی و هۆگری پێیانەوە، هەوڵ و خۆزگەت لە هەموو ئەو جۆرە شتانە کەناگیر بکە، گەر بەشی تۆ لەوانەدا بوونی هەبێت لە کاتی خۆیدا رووت لێ دەکات، دڵت لە ماندووبوونی چاوەڕوانی و کۆڵی قورسی هەڵپەکردن رزگار بکە و لەگەڵ حەقدا(عزوجل) راستبەرەوە، ئەم ماندووبوونەی تۆ لەپای چی لە پێناوی شتێک کە براوەتەوە.

ئەی گەنج، خەلوەتەکەت تێکچووە و دروست نییە، پیسە و پاک نییە، من نازانم چی بە تۆ بکەم؟ دڵت یەکتاپەرستی و ئیخلاصی تێدا دانەمەزراوە، ئەی ئەو کەسانەی خەوتوون، خودا لە ئێوە بەئاگایە و ناخەوێت، ئەی ئەوانەی پشتتان هەلکردووە، ئێوە پشتتان لێ نەکراوە، ئەی ئەوانەی خوداتان لەبیر کردووە، ئێوە لەبیرنەکراون، ئەی ئەوانەی وازتان لە کاری چاکە هێناوە، ئێوە وازتان لێ نەهێنراوە، ئەی ئەوانەی نەزانن بە خودا و پێغەمبەر(ﷺ) و ئەوانەی پێشکەوتوون و ئەوانەی دواکەوتوون، ئێوە وەک تەختەیەکی فرێدراون و بەکاری هیچ شتێک نایەن،

﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾﴾

البقرة: ٢٠١

# مەجلیسی چواردەهەم

## نەهیکردن لە دووڕوویی

بەیانی ڕۆژی هەینی لە مەدرەسەکەی ٧/ذي القعدة/ ٥٤٥هـ، شيخ عبدالقادر(خودا لێی ڕازی بێت) فەرمووی:

ئەی دووڕوو، داوامە لە خودا زەوی لە تۆ پاکبکاتەوە، دووڕوویییەکەت بەس نییە دەستتداوەتە غەیبەت کردنی زانایان و دۆستانی خودا و صالحان بە خواردنی گۆشتی ئەوان، تۆ و برا دوڕووەکانت بەم نزیکانە کرم زمان و گۆشتی جەستەتان دەخوات و پارچە پارچەتان دەکەن، زەوی لە باوەشتان دەگرێت و وردوخاشتان دەکات و وەرتان دەگێڕێت، هەرکەس گومانی باشی بە خودا(عزوجل) و بەندە صالحەکانی خودا نەبێت و تەوازوعیان بۆ نەنوێنێت سەرفرازی بۆ نییە، بۆ تەوازوعیان بۆ نانوێنیت لە کاتێکدا ئەوان سەرکردە و فەرماندەی ڕاستەقینەن، تۆ چیت بەراورد بە ئەوان؟ حەق(عزوجل) دامەزران و هەڵوەشانی داوەتە دەست ئەوان، بەوانەوە ئاسمان باران دەبارێنێت و زەوی شین دەبێت، هەموو خەڵکی ڕەعییەتی ئەوانن، هەریەکەیان وەك چیایەك وایە بارمەتی نافەت و موسیبەتەکان نایانهێننە لەرزە و هەژان، لە شوێنی یەکتاپەرستی و ڕازیبوونی خۆیان لە مەولا(عزوجل) نایانبزوێنن، داوا بۆ خۆیان و بۆ خەڵکی دەکەن، بۆ لای خودا بگەڕێنەوە و تەوبە بکەن و لە نێوان خۆتان و خودادا دان بنێن بە گوناهەکاندا و لەبەردەستی بپاڕێنەوە و بۆی گەردنکەچ ببن، چ شتێك لەبەردەستی ئێوەدایە؟ گەر بتانزانیبایە چ شتێك چاوەڕوانتان دەکات ئەوا دەکەوتنە سەر بارێك جیاواز لەمەی ئێوەی لەسەرە، لەبەردەم حەقدا(عزوجل) خاوەنی ئەدەب بن وەك چۆن ئەوانەی پێش ئێوە خاوەنی ئەدەب بوون، ئێوە بەراورد بە ئەوان ئێرەموورك و شافرەتن، نازایەتیتان ئەو کاتانەیە نەفس و ئارەزوو و سروشتتان فەرمانتان پێ دەکەن، نازایەتی

له ئاییندا له جێبەجێکردنی مافەکانی خودادایه(عزوجل)، قسەی حەکیمان و زانایان به سووك تەماشا مەکەن، چونکه وتەکانیان دەوایه و وشەکانیان بەری وەحی خودایه(عزوجل)، له نێوان ئێوەدا به رووالەت(له دەرەوه) پێغەمبەرێك بوونی نییه تاکو شوێنی بکەون، کاتێك شوێنی شوێنکەوتوانی راستەقینەی پێغەمبەر(ﷺ) دەکەون وەك ئەوه وایه شوێنی پێغەمبەر(ﷺ) کەوتبن، کاتێك ئەو کەسانه دەبینن وەك ئەوه وایه پێغەمبەرتان(ﷺ) بینی بێت، شوێنی زانایانی خاوەن تەقوا بکەون، گەر هاوەڵیتان کردن دەبێت به بەرەکەت لەسەرتان، هاوەڵی ئەو زانایانه مەکەن کار به زانستەکەیان ناکەن، چونکه گەر هاوەڵی ئەوانه بکەن دەبێت به شوومی لەسەرتان، گەر هاوەڵی کەسێکت کرد له تەقوا و زانستدا له تۆ گەورەتر بوو هاوەڵی کردنەکەت دەبێته بەرەکەت لەسەرت، گەر هاوەڵی کەسێکت کرد له تەمەندا له تۆ گەورەتر بوو- بەلام تەقوا و زانستی نەبوو- هاوەڵی تۆ لەگەڵی دەبێته شوومی لەسەرت، بۆ خودا(عزوجل) کار بکه، نەك بۆ کەسێکی تر، بۆ خودا واز له شتێك بهێنه نەك بۆ کەسێکی تر، کارکردن بۆ کەسانێك جگه له خودا بێباوەڕییه، وازهێنان له کارێك بۆ کەسانێك جگه له خودا ریایه، هەرکەس ئەمه نەزانێت و جگه لەمه کارێکی تر ئەنجام بدات ئەو کەسه له هەوەسبازیدایه، بەم نزیکانه مردن رووت لێ دەکات و هەوەسبازییەکەت کۆتایی پێ دەهێنێت.

هاوار به حاڵت، به پەروەردگارەوه پەیوەست به و له دڵەوه له کەسانی تر دابڕێ، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت: ((ئەوەی له نێوان ئێوه و پەروەردگاری ئێوەدایه جێبەجێی بکەن بەختەوەر دەبن))[1].

ئەوەی له نێوان ئێوه و پەروەردگاردایه رێکی بخەن و دڵی صالحان رابگرن.

ئەی گەنج، گەر جیاوازیت بینییەوه له نێوان دەوڵەمەند و هەژاردا لەباری رووتێکردنت ئەوا سەرفرازی بۆ تۆ نییه و بەدەستی ناهێنیت، رێز له هەژارانی شارامگر بگرن و فەر و بەرەکەت له خۆیان و دانیشتن لەگەڵیان وەربگرن،

[1] رواه ابن ماجة

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((هەژارانی ئارامگر ئەهلی مەجلیسی رەحمانن لە رۆژی دواییدا))[1].

لە ئەمرۆدا ئەهلی مەجلیسی خودا بە دڵە و لە رۆژی دواییدا بە جەستە، ئەوانە ئەو کەسانەن لە دونیادا دڵیان زوهدی کرد و پشتی هەڵکرد لە جوانییەکانی دونیا و هەژارییان بەسەر دەوڵەمەندیدا هەڵبژارد و نارامیان گرت لەسەری، کاتێك ئەمەیان بۆ تەواو بوو دوارۆژ چووە داخوازییان و خۆی بۆ نمایش کردن، ئەوانیش پەیوەست بوون بە دوارۆژەوە، کاتێک ئەوەیان بەدەستهێنا بینییان دوارۆژ شتێکە جیا لە پەروەردگاریان(عزوجل)، بۆیە خۆیانیان لێ کەنارگیر کرد و پشتی دڵیان لە دوارۆژ وەرگێڕا و لێی هەڵهاتن، ئەوەش وەك حەیایەك لە حق(عزوجل)، چۆن لەگەڵ شتێك جگە لە پەروەردگار رادەوەستن و سوکنایییان لە دروستکراوەوە بۆ دێت و هۆگریی پێوە پەیدا دەکەن؟ کردەوە چاکەکان و هەموو ئەوەی ئەنجامیان دابوو رادەستی دوارۆژ کرد و پاشان بە باڵی صدق روو بە مەولایان(عزوجل) دایان لە شەقەی باڵ، قەفەسەکەیان بەجێهێلا، لە قەفەسی بوونی خۆیان هاتنە دەرەوە و بەرەو خاوەنەکەیان فڕین، ئەوان داوای هاوەڵی باڵا(خودا) دەکەن، داوای ئەو کەسە دەکەن یەکەمین و دواهەمین و ئاشکرا و پەنهانە، رۆیشتن بۆ لای بورجی نزیکی لە خودا، بوون بە یەکێك لەوانەی خودا دەربارەیان دەفەرموێت:

﴿ وَإِنَّهُمْ عِندَنَا لَمِنَ ٱلْمُصْطَفَيْنَ ٱلْأَخْيَارِ ﴿٤٧﴾ ﴾ ص: ٤٧

دڵی ئەوان و خەم و پەژارەی ئەوان و ماناکانی ئەوان لەلای ئێمەیە، کرۆك و ناوەرۆکیان لە دونیا و دوارۆژدا لەلای ئێمەیە، گەر ئەمە بۆ دەستەیەك هاتە دی و تێر و تەواو بوو ئایا دونیا و دوارۆژ لەلایان ناسڕێنەوە، ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیاندایە بەراورد بە دڵ و نهێنی ئەوان دەپێچرێنەوە، لە هەرچی شتە فەنا دەکەن و بە خوداوە بوون پەیدا دەکەن، گەر بەشێکیان لە دونیادا هەبێت ئەوا خودا دەیانگێڕێتەوە بۆ مرۆڤبوونیان بۆ ئەوەی بەشەکەی خۆیان وەربگرن بۆئەوەی زانست و

[1] ذكره الغزالي في الإحياء بلفظ قريب منه.

تەزای دێرین و بڕیاری پێشینی خودا ئاڵوگۆڕی بەسەردا نەیەت، بۆیە لەگەڵ زانستی خودا و قەزا و قەدەری ئەودا خاوەنی ئەدەبی جوانن، ئەوەی پێیان دەدرێت بە هەنگاوی زوهد و بەجێهێڵان دەستی بۆ دەبەن نەك بە نەفس و ئارەزوو و ویستەوە، لە هەموو بارێکدا حوکمی ئاشکرا(پابەندبوون بە شەرعەوە) لەلایان پارێزراوە، بەرانبەر خەڵکی بە بەخشینی دونیا دەستنوقاو نین، گەر بتوانن هەموویان لە حەق(عزوجل) نزیك دەكەنەوە، شتێك لە دروستکراوەکان و ڕووداوەکان لە دڵیاندا کێشی گەردیلەیەکی بۆ نەماوەتەوە، هەتا لە دونیادا بێت پەیوەست بوونت نییە بە دوارۆژەوە، هەتا لە دوارۆژدا بێت پەیوەستبوونت نییە بە مەولاوە(عزوجل)، ببە بە کارکەر و نەزانی بەخەرج مەدە، تۆ یەکێکی لەوانەی لەسەر زانست خودا گومڕایی کردوویت، یەکێك لە مافەکانی خودا ئەوەیە شتێك لە ماڵەکەت بە هەژاران ببەخشیت، ئەوەت زانیوە صەدەقەکردن مامەڵەیە لەگەڵ حەق(عزوجل) کە کەسێکی دەوڵەمەند و بەخشندەیە، ئایا مامەڵە لەگەڵ کەسێکی دەوڵەمەند و بەخشندە زیانی لێوە پەیدا دەبێت؟ لەبەر خودا گەردیلەیەك ببەخشە چیایەکت پێ دەبەخشێت، دڵۆپێك ببەخشە دەریایەکت پێ دەبەخشێت، لە دونیا و دوارۆژدا پاداشتت دەداتەوە.

خەڵکینە، گەر مامەڵە لەگەڵ حەق(عزوجل) بکەن کشتوکاڵەکەتان گەشە دەکات و پاك دەبێتەوە، ڕووبارەکانتان دەتەقێن و جاری دەبن، درەختەکانتان گەڵا دەکەن و لق و پۆپ لێ دەدەن و بەر دەدەن، فەرمان بە چاکە بکەن و نەهی لە خراپە بکەن، ئایینی خودا سەربخەن و لەو پێناوەدا پشت لە هاوەڵان و دۆستانتان بکەن، هەر کەس لە خێردا لەگەڵ ئەو(سبحانە وتعالی) ڕاست بکات لە تەنهای و ئاشکرا و خۆشی و ناخۆشی و گرانی و هەرزانیدا ڕاستگۆییەکەی بەردەوام دەبێت، پێویستییەکانتان لە حەق(عزوجل) داوا بکەن نەك لە دروستکراوەکانی، گەر ناچار بووی لە خەڵکی داوا بکەی ئەوا بە دڵ بچنە خزمەتی حەق(عزوجل)، ئەو ئاراستە و شوێن و جێگەی داوایەکەت ئیلهام دەکات، گەر پێتان درا یان پێتان نەدرا ئەوە لە خوداوەیە(سبحانە وتعالی) نەك لەوانەوە، دۆستانی خودا خەم و پەژارەی ڕۆزییان لە دڵ دەرکردووە، ئەوەیان زانیوە لە کاتی دیار و زانراودا بۆیان براوەتەوە، بۆیە وازیان هێنا لە داواکردن و دەرگای مەلیکی خۆیان

بەرنەدا، بە چاکە و تریکی و زانستی خودا لە هەرچی شتە بێنیاز بوون، کاتێک ئەمەیان بۆ تەواو بوو بوون بە رووگەی خەلکی و وتارخوێن بۆ بردنیان بۆ لای مەلیکی خۆیان، دەستی دڵیان دەگرن بۆ لای خودا و پزشاکی قبووڵ و رازیبوونیان لەبەر دەکەن.

لە یەکێک لە خوداناسانەوە(رەحمەتی خودای لێ بێت) فەرمووی: بەندەکانی خودا(عزوجل) کە بەندایەتیان بۆ خودا هاتووەتە راستە دونیا و دوارۆژ لە خودا داوا ناکەن، بەڵکو ئەو(سبحانه وتعالى) لە ئەو داوا دەکەن نەک شتێکی تر، خودایە هەموو خەلکی هیدایەت بدە بۆ دەرگای خۆت، ئەمە هەمیشە داوامە و کارەکەش لەلای خۆتە، ئەمە دوعایەکە پاداشتی لەسەر وەردەگرم، خودا(عزوجل) لەناو دروستکراوەکانیدا ئەوە ئەنجام دەدات کە دەیەوێت، گەر دڵێک دروست و تەندروست بوو پڕ دەبێت لە سۆز و بەزەیی بەرانبەر دروستکراوەکان.

لە یەکێک لە خوداناسانەوە(رەحمەتی خودای لێ بێت) فەرمووی: زۆرن ئەوانەی خێری زۆر ئەنجام دەدەن بەڵام ناتوانن واز لە گوناه بهێنن جگە لە صادیقان، کەسی صادق گوناهی گەورە و بچووک وازلێدەهێنێت، پاشان وەرعەکەی ورد دەبێتەوە لە وازهێنان لە حەزەکان ئەوجا وازهێنان لە موباحی تێکەڵ، ئەو هەمیشە بەدوای حەڵاڵی رەهاوەیە، کەسی صادق زۆربەی کاتەکانی شەو و رۆژی لە عیبادەتی پەروەردگاردایە(عزوجل)، عادەت و نەریتەکانی خەلکی تێکدەشکێنێت، بۆیە شتگەلێک لەسەر دەستی روودەدەن کە تێپەڕاندنی عادەتە، و بە جۆرێک رۆژی دەدرێت بۆی لێ نەکردبێتەوە، پێیدەدرێت و فەرمانی پێ دەکرێت دەستی بۆ ببات، شتەکان پاڵفتە و پاک و بێگەرد دەبن بۆی، چونکە ماوەیەکی زۆر لێی گیراوەتەوە، پێویستییەکانی لە سینەیدا پەنگیان خواردووە و لەسەر شکاندنی مەرام و پێویستییەکانی نارامی گرتووە، ئەو لە هەموو حاڵەکانیدا رەدکراوەتەوە، دوعای کردووە و وەڵام نەدراوەتەوە، داوای کردووە و پێینەدراوە، پاڕاوەتەوە و پاڕانەوەکەی لێ وەرنەگیراوە، سکاڵای کردووە و ئەوەی سکاڵای لەدەست کردووە بۆی زیاد کراوە، داوای دەرووبەک دەکات و بەڕوویدا ناکرێتەوە، رێگەی خۆپاریزی دەگرێتە بەر چارەسەرێک

نابینێتەوە، یەکتاپەرستە و لە کارەکانیدا ئیخلاص ئەنجام دەدات کەچی نزیکییەک لەو کەسەوە(خودا) نابینێتەوە کارەکەی بۆ ئەنجام داوە، وەک ئەوەی باوەڕدار و یەکتاپەرست نەبێت، لەگەڵ هەموو ئەمانەدا مەدارات دەکات و ئارام دەگرێت لەسەر مەداراتی ئەو شتانە، ئەوە دەزانێت ئارام گرتن دەوای دڵی ئەوە، و هۆیەکە بۆ پاڵفتەبوونی دڵی و نزیککردنەوەی لە خودا(سبحانه وتعالی)، دەزانێت خێر لەدوای ئەو تاقیکردنەوانە رووی لێ دەکات، **ئەو تاقیکردنەوانە بۆ ئەوەیە کەسی باوەڕدار لە دووڕوو، و یەکتاپەرست لە هاوەڵدانەر، و کەسی موخلیص لە ریاباز و کەسی ئازا لە ترسنۆک و کەسی دامەزراو لە لەرزۆک و کەسی ئارامگر لە پەریشان و حەقڕەو لە پووچ و راستگۆ لە درۆزن و خۆشەویست لە بێزراو و شوێنکەوتوو لە بیدعەچی جیاببێتەوە،** گوێ لە قسەی یەکێك لە ئەوان بگرە کە دەڵێت: لە دونیادا وەک ئەو کەسە وایە کە تیماری برینێکی خۆی دەکات و ئارام دەگرێت لەسەر تاڵاوی دەوا و رجای لاچوونی بەلا، بەڵکو هەموو بەلا و نەخۆشییەکان.. هاوەڵدانانت بە دروستکراوەکان بریتییە لە بینینی زیان و قازانج و بەخشین و لێگرتنەوە لە ئەوانەوە، هەرچی دەوا و لابردنی بەلایە لە دەرکردنی دروستکراوەکانە لە دڵ و ویستی پێتەو لەباری دابەزینی قەزا و قەدەرەکان بۆ سەرت، هەروەها وازهێنان لە داوای سەرۆکایەتی بەسەر خەڵکیدا و بەرزبوونەوە بەسەریاندا، هەروەها لەوەدایە دڵت بۆ پەروەردگارت(عزوجل) یەکلا ببێتەوە و نهێنیت بۆ ئەو پاڵفتە ببێت و هەوڵ و لێبڕانت بەرز ببێتەوە، گەر ئەمەت بۆ هاتە دی دڵت بەرز دەبێتەوە و نزیك دەبێتەوە لە پێغەمبەران و شوهەدا و صالحان و فریشتە نزیکەکانی خودا، هەتا ئەوەت بۆ بەردەوام بێت گەورە و مەزن و بەرز و پێشکەوتوو دەبێت و کارەکان دەگریتە دەست و فەرمانت پێ دەکرێت، ئەوەی دەتەوێ رووت لێ دەکات، ئەوەی دەتەوێ لەدەستی بگری لەدەستی دەگرێت، ئەوەی دەتەوێ پێتبدرێت پێت دەدرێت، مەحرووم کەسێکە لە بیستنی ئەم قسانە و ئیمان بەم قسانە و رێزگرتن لە ئەهلی ئەم قسانە مەحرووم دەبێت.

**ئەی سەرقاڵان بە ژیان و گوزەرانە،** دەوڵەمەندی ژیان و گوزەران لەلای منە، قازانج لەلای منە، کەلوپەلی دوارۆژ لەلای منە، ، من جارێك دەبم بە بانگکەر د

جارێکیش دەبم بە ڕێکخەری مامەڵەی نێوە و خودا، هەموو شتێك مافی خۆی پێ بدە، گەر شتێك لە دوارۆژم بۆ بەدەست هات بەتەنها نایخۆم، چونکە مرۆڤی بەخشندە و دڵاوا بەتەنها شت ناخوات، هەر کەس لە بەخشندەیی خودا حاڵی بووبێت بەخیلی لەلا نامێنێتەوە، هەر کەس خودای ناسیبێت جگە لە خودا هەرچی شتە لەلای کەمبایەخە، دەستنوقاوی(دەروونتەسکی) لە نەفسەوەیە، نەفسی کەسی عاریفیش مردووە بەراورد بە نەفسی دروستکراوەکان، ئەو نەفسێکی ئارام و پڕ لە سوکنایییە بەرانبەر بەڵێنەکانی خودا(عزوجل) و لە هەڕەشەکانیشی دەترسێت.

خودایە ئەوەی بە خوداناسانت بەخشی بە ئێمەشی ببەخشە..ئامین.

﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾﴾

البقرة: ٢٠١



## مەجلیسی پازدەهەم

# پێشخستنی باوەڕدار بەسەر نەفسی خۆدا

ڕۆژی یەکشەممە لە "الرباط" ٩/ذي القعدة/٥٤٥هـ شێخ عبدالقادر(خودا لێی ڕازی بێت) فەرموی:

کەسی باوەڕدار توێشوو کۆدەکاتەوە و بێباوەڕ چێژ و خۆشی وەردەگرێت، باوەڕدار توێشوو کۆدەکاتەوە، چونکە لەسەر ڕێگەیەکە بە کەمێك لە ماڵ قەناعەت دەکات و زۆرێك پێش خۆی دەخات بۆ دوارۆژ، بە ئەندازەی توێشووی موسافیرێك بە نەفسی خۆی دەبەخشێت، ئەوەندەی بیگەیەنێتە جێگە، هەموو ئەوەی هەیەتی لە دوارۆژدایە، هەموو دڵ و هەوڵ و لێبڕانی لەوێیە، ئەو دڵی لێرە لە دونیا بڕاوە، هەموو گوێڕایەڵی و چاکەکانی ڕەوانەی دوارۆژ دەکات نەك ڕەوانەی دونیا و ئەهلی دونیا، گەر خۆراکێکی پاك و حەڵاڵی لەلا بێت بە هەژارانی دەبەخشێت و بەسەر نەفسی خۆیدا پێشیان دەخات، ئەو دەزانێت لە دوارۆژدا چاکتر و پاکتر لەوەی پێدەدرێت، ئامانجی باوەڕداری عاریفی زانا دەروازەی نزیکبوونەوەیە لە حەق(عزوجل)، هەر ئەوەش ئامانجی هەنگاوەکانی دڵ و ڕێگەی نهێنی و پەنهانییەتی، من تۆ لە وەستان و دانیشتن و ڕکوع و سوژدە و شەوخونی و ماندووبووندا دەبینم کەچی دڵت لە جێگەی خۆیدایە و هەنگاو هەڵناگرێت و لە ماڵی بوونی خۆی نایەتە دەرەوە و گۆڕان بەسەر ئەرێت و ئاکارەکانیدا نایەت، ڕاستترین هەوڵ هەوڵە بۆ گەیشتن بە مەولا(عزوجل)، ڕاستگۆییەکەت لە زۆرێك لە ماندبوون بێنیازت دەکات، بە دەنوکی صدق بدە لە هێلکەی بوونی خۆت، دیواری بینینی خەلکی و کۆتوبەند بەوانەوە بە پاچ و نوێڵی ئیخلاص و یەکتاپەرستی بڕوخێنە، بە دەستی زوهد لە دونیا قەفەسی هەڵپە و داوای شتەکان بشکێنە، بە دڵ لە شەقەی باڵ بدە تا دەگەیە ڕۆخی ڕزگاری دەریای نزیکبوونەوە لە

پەروەردگارت(عزوجل)، ئەوکات دەریاوانی پێشینە بڕیار -کە کەشتی رزگاری لەگەڵە- دەگانە هانات و پەلت دەگرێت و دەتپەڕێنێتەوە بۆ لای پەروەردگار(عزوجل)، ئەم دونیایە دەریایەکە و ئیمانەکەت بریتییە لە کەشتی ناو ئەو دەریا، بۆ ئەو مەبەستە لوقمانی حەکیم(رەحمەتی خودای لێ بێت) فەرمووی: کوڕی خۆم، دونیا دەریایەکە، ئیمان کەشتییە، دەریاوان کارە چاکەکانە و کەنارەکەی بریتییە لە دوارۆژ، ئەی ئەوانەی لەسەر گوناه و یاخیبوون سوور و بەردەوامن، بەم نزیکانە کوێری و کەڕی و پیری و هەژاری و دڵڕەقی خەڵکی بەرانبەرتان رووتان لێ دەکەن، ماڵ و سامانەکەتان بە زیانکردن و دەستبەسەرداگرتن و دزی کۆتاییان پێ دێت، بۆ بە کەسانێکی ژیر و هۆشمەند و بگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگارتان(عزوجل)، بە ماڵ و سامانەکانتان هاوەڵ بۆ خودا بڕیار مەدەن و شانی لەسەر دامەدەن و لەپای مەوەستن، لە دڵتان دەریبکەن و لە خانوو و گیرفاندا دایبنێن، لەلای خزمەتکاران و وەکیلەکانتان دایبنێن، چاوەڕوانی مردن بن، هەڵپەتان کەم بکەنەوە و هیوا و خۆزگەکانتان کورت بکەنەوە.

لە "ئەبو یەزیدی بوستامی"یەوە(رەحمەتی خودای لێ بێت) وتی: باوەڕداری عاریف دونیا و دوارۆژ لە خودا(عزوجل) داوا ناکات، بەڵکو مەولای خۆی(عزوجل) لە خودا داوا دەکات.

ئەی گەنج، بە دڵ بۆ لای خودا(عزوجل) بگەڕێرەوە، تەوبەکار بۆ لای خودا ئەو کەسەیە بۆ لای ئەو دەگەڕێتەوە ﴿ وَأَنِيبُوا إِلَىٰ رَبِّكُمْ ﴾ الزمر: ٥٤، واتە بگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگارتان، بگەڕێنەوە و هەموو شتێک رادەستی ئەو بکەن، نەفسی خۆتانی رادەست بکەن و لەبەردەستی قەزا و قەدەر و فەرمان و نەهی و وەرگێڕانەکانی ئەودا(سبحانه وتعالى) رایبخەن، دڵتان لەبەر دەستی رابخەن، بەبێ زمان و دەست و پێ و چاو، بەبێ چۆن و بۆچی و ململانێ و سەرپێچی، بەڵکو بە تەبایی و بەڕاستزانین، بڵێن: فەرمان راست و دروستە، قەدەر راست و دروستە، بڕیاری پێشینە راست و دروستە، گەر ئێوە بەو جۆرە بن گومانی تێدا نییە دڵتان بۆ لای ئەو دەگەڕێتەوە و تەماشای ئەو دەکات و بە هیچ شتێکی ترەوە هۆگری پەیدا ناکات، بەڵکو لە هەرچی شتە -لە عەرشەوە بۆ فەرش- نامۆ دەبێت، لە هەرچی دروستکراوە هەڵدێت، لە هەرچی

رووداوه خۆی دادەڕنێت و دادەبڕێت، تەنها ئەوانەی خزمەتی گەورە پیاوان دەکەن و ئاگاهییان بە هەندێ لە حاڵیان هەیە لەگەڵ خودا(عزوجل) دەزانن بە جوانی لەوان ئەدەب بکەن، خوداناسان حەمد و زەمیان لەلا وەك هاوین و زستان و شەو و رۆژ وایە، هەردووکیان لە خوداوە دەبینن، چونکە تەنها خودا دەتوانێت ئەوانە بهێنێت و ئاڵوگۆڕیان پێ بکات، کاتێك ئەوەیان بۆ هاتە دی و لایان نەکردەوە بە لای مەدحکەران و لەگەڵ زەمکەرانیش بە جەنگ نەهاتن و خۆیانیان بەوانەوە سەرقاڵ نەکرد، خۆشەویستی و رق لە خەڵکی لە دڵیاندا نەما، نە خۆشیاندەوێن و نە رقیان لێیانە، بەڵکو بەزەییان پیایاندا دێتەوە، زانست بەبێ صدق چ سوودێك بە تۆ دەگەیەنێت، خودا لەسەر زانست تۆی گومڕا کردووە: زانست فێر دەبیت و نوێژ دەکەی و بەرۆژوو دەبیت لە پێناوی خەڵکیدا تاکو بە گەورە تەماشات بکەن و ماڵ و سامانت پێ ببەخشن و لە ماڵەکان و دانیشتنەکانیاندا مەدحت بکەن، وادابنێ ئەوەت لەوانەوە بەدەستهێنا، بەڵام کاتێك مردن و سزا و تەنگەلانی و ترس و هەژان رووی لێکردی هەموو ئەوانەت لێ جیادەبێتەوە، و سوودێك بە تۆ ناگەیەنن، ئەوەی بەدەستت هێناوە لە ماڵ و سامانی ئەوان میراتگرانت دەیخۆن و سزا و دادگاییەکەی لەسەر تۆیە، ئەی ئەو کەسەی پشتت هەڵکردووە، ئەی بێ بەش، تۆ لە کارکەرانی ماندوویت: ﴿عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ ﴿٣﴾﴾ الغاشية: ٣، سبەینێ لە شاگردای، عیبادەت پیشەیەکە و پیشەوەرەکانی بریتین لە دۆستانی خودا و ئەبدالە دڵسۆز و نزیکەکان لە خوداوە(عزوجل)، زانایانی کارکەر بە زانستەکەیان نوێنەری خودا و پێغەمبەرانن لە زەویدا، ئەوان زانستی پێغەمبەرانیان(علیهم السلام) بە میرات گرتووە، نەك ئێوە ئەی هەوەسبازان، ئەی سەرقاڵان بە زمانبازی و فیقهی رووالەتی لەگەڵ نەزانی ناوەوە.

ئەی گەنج، تۆ لەسەر هیچ شتێك نیت، هێشتا ئیسلامت بۆ نەهاتووەتە راستە، ئیسلام ئەو بنچینەیە شایەتمانی لەسەر بینا دەکرێت گەر بۆت تەواو ببێت، دەڵێیت: "لا إله إلا الله" و درۆ دەکەی، لە دڵی تۆدا دەستەیەك "إلـه" بوونیان هەیە، ترست لە سوڵتان و والی شارەکەت "إله"ە، شاندادانت لەسەر کەسابەت و قازانج و هەوڵ و هێز و بیستن و بینین و دەستوەشاندنی خۆت "إلـه"ە، بینینی زیان و قازانج و پێدان و

لێگرتنەوە لە خەڵکەوە "إلە"ە، خەڵکێکی زۆر بە دڵ شانیان لەسەر ئەم شتانە داداوە وا نیشان دەدەن پشتیان بە حەق(عزوجل) بەستووە، تا وایلێهاتووە باسی حەق(عزوجل) لەسەر زمانیان-نەك لەناو دڵیان- بووە بە عادەت، گەر لەو مەیدانەدا لێپێچانەوەیان لەگەڵ بکرێت تووڕە دەبن و دەڵێن: چۆن دەبێت ئەو قسەیە بە ئێمە بوترێت؟! بۆ مەگەر ئێمە موسڵمان نین؟! سبەینێ رسوایییەکان دەردەکەون و شاراوەکان دێنە دەرەوە.

**هاوار بە حاڵت**، لە وتنی: ("لا إله" نەرێکردنی هەموو و "إلا الله" جێگیرکردنی هەموو بۆ خودا نەك بۆ کەسێکی تر) پشتگیری دەکەی، هەرکات دڵت شانی لەسەر شتێك جگە لە حەق(عزوجل) دادا ئەوا لەو جێگیرکردنەدا بۆ خودا درۆت کردووە و ئەو شتەی شانت لەسەر داداوە دەبێت بە "إلە"ت، بۆیە رووالەت و دەرەوە بەهەند وەرناگیرێت، باوەڕدار بریتییە لە دڵ، دڵ یەکتاپەرست و موخلص و تەقوادار و خاوەن وەرع و زوهد و خاوەن یەقین و عاریف و کارکەرە، دڵ بریتییە لە ئەمیر و هەموو شتەکانی تر سەرباز و شوێنکەوتوون، گەر دەتەوێ بڵێیت "لا إله إلا الله" یەکەمجار بەدڵ بیڵێ پاشان بەزمان، پشتی پێ ببەستە و بەتەنها شان لەسەر ئەو دابدە، ئاشکرا و دەرەوەت بە فەرمانەکانی شەریعەتەوە سەرقاڵ بکە و ناوەوەش بە دروستکەری خێر و شەڕەوە خەریك بکە، هەر کەس خودا بناسێت بۆی زەلیل دەبێت و لەبەردەستیدا زمانی لاڵ دەبێت و تەوازوع بۆ ئەو و بەندە صالحەکانی دەنوێنێت، خەم و پەژارە و گریانی زیاد دەکات، ترس و لەرزینی زۆر دەبێت، حەیا و پەشیمانی لەسەر ئەوەی ئەنجامیداوە لە زیادەڕەوی زۆر دەکات، خۆپاریزی و ترسی -لە تیاچوونی ئەوەی لەلایەتی لە مەعریفە و زانست و ئەدەب- پەرە دەسێنێت، چونکە حەق(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ۝١٦﴾ البروج: ١٦،

هەروەها دەفەرموێت:

﴿لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ۝٢٣﴾ الأنبياء: ٢٣

لە نێوان دوو سەرنجدا هاتووچۆ دەکات، سەرنجێك بۆ ئەوەی پێش خۆی خستووە لە کاری خراپە و کرداری پیس و نەزانی، بۆیە لە حەیادا دەتوێتەوە و ترسی گرتن دایدەگرێتەوە، لەگەڵ سەرنجێك بۆ ئێستا و داهاتوو، ئایا قبووڵ دەکرێت یان رەد دەکرێتەوە، ئایا ئەوەی پێیدراوە لێی وەردەگیرێتەوە یان لەسەر ئەو حاڵە دەمێنێتەوە، ئایا لە رۆژی دواییدا لە هاوەڵی باوەڕدارانداییە یان بێباوەڕان، بۆ ئەو مەبەستە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((من لە هەمووتان زیاتر خودا دەناسم و لە هەمووتان زۆرتر لە خودا دەترسم))[1].

هەندێ لە عاریفان-کە دەگمەن و ناوازەن- سەرئەنجام و ئەو چارەنووسەی روویان لێ دەکات لایان ئاشکرا دەبێت، ئەوەش بە خوێندنەوەیەك کە بەسەریدا دەخوێنرێتەوە، نهێنی(السر) چارەنووسی خۆی لە "اللوح المحفوظ" دەخوێنێتەوە، پاشان دڵ ئاگاهی بەوە پەیدا دەکات و نهێنی فەرمانی پێ دەکات بیپارێزێت و نەهێڵێت نەفس پێی بزانێت، سەرەتای ئەم کارە بریتییە لە ئیسلام، و جێبەجێ کردنی فەرمانەکان و خۆگرتنەوە لە نەهێلێکراوەکان و ئارامگرتن لەسەر ئافەتەکان، کۆتایی ئەم کارەش بریتییە لە زوهد لە هەرچی شتە جگە لە حەق(عزوجل)، هەروەها بگاتە قۆناغێك ئاڵتوون و خۆڵی لا یەکسان بێت، هەر بەو جۆرە حەمد و زەم و پێبەخشین و لێگرتنەوە و بەهەشت و دۆزەخ و نیعمەت و نیقمەت و دەوڵەمەندی و هەژاری و بوونی خەڵکی و نەبوونیان، گەر هەموو ئەمانەی بۆ تەواو بوو خودا(عزوجل) لە پشتی هەموو ئەمانەوەیە، پاشان وازووی ئەمارەت و ویلایەت لەسەر خەڵکی لە خوداوە(عزوجل) بۆ ئەو رەوانە دەکرێت، هەر کەس ببینێت سوودی لێ دەبینێت، ئەوەش بە هێزی هەیبەت و نووری خوداوە کە بەوی بەخشیوە و لەودا دایناوە.

﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ۝٢٠١﴾

البقرة: ٢٠١

---

[1] صحيح رواه البخاري ومسلم.

## مەجلیسی شازدەهەم

# کارکردن بە قورئان

شەوی سێشەممە ١١/ذي القعدة/ ٥٤٥هـ لە مەدرەسەکەی شێخ عبدالقادر(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی:

حەسەنی بەصری(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەفەرموێت: ((دونیا سووك و رسوا بکەن، سوێند بە خودا تەنها دوای رسواکردنی خۆش و بەتام دەبێت))

ئەی گەنج، کارکردن بە قورئان بۆ لای دابەزێنەرەکەی سەرکەوتووت دەکات، کارکردن بە سوننەت بۆ لای پێغەمبەرمان محمد(ﷺ) سەرکەوتووت دەکات، ئەو فەخر ناکات بە دڵ و هەوڵ و کۆشانی خۆیەوە، کێ بوو ئەو کەسەی دڵی ئەوانی بەو جۆرە گۆڕی؟ ئەوە(ﷺ) دڵی ئەوانی جوان و رازاوە کردووە و بۆنی خۆشی پیادا پڕژاندووە و بۆ نهێنییەکان پاڵفتەی کردووە و جوانی و رازاوەیی پێ بەخشیوە، ئەوە(ﷺ) بۆ دڵانیان لە دەرگای نزیکی خودا دەدات، ئەوە(ﷺ) شانەی دڵیان دەکات، ئەوە دەبێتە نوێنەر لە نێوان دڵان و پەنهان و پەروەردگاردا(عزوجل)، هەر کات یەك هەنگاو لە ئەو نزیك دەبێتەوە و پێش دەکەوێت خۆشی و سروور بەو نزیکییە بۆ زیاد دەبێت بەهۆی ئەو حاڵە باڵاوە، لەسەری پێویستە شوکر بکات و گوێڕایەڵی بۆ خودا زیاد ببێت، بەڵام دڵخۆشی بەبێ ئەم حاڵە و بەبێ ئەم هەنگاوە هەوەسبازییە، نەزان لە دونیادا دڵخۆشە، زاناش لە دونیادا خەم دایدەگرێتەوە، نەزان ململانێ و کێبەرکێ لەگەڵ قەدەر دەکات و زاناش تەبایە لەگەڵی و پێی رازییە، ئەی هەژار ململانێ مەکە لەگەڵ قەدەر و زۆرانبازی لەگەڵ مەکە، چونکە تیادەچیت، بازنەکە ئەوەیە بە کردارەکانی خودا(عزوجل) رازی بیت و دڵت لە دروستکراو بهێنێتە دەرەوە و پێیەوە بە پەروەردگاری دروستکراوەکان بگەیت، بە دڵ و نهێنی و مانات بە خودا بگەیت،

چونکە تۆ بەردەوام بوویت لەسەر شوێنکەوتنی حەق(عزوجل) و پێغەمبەرانی(عیلهم السلام) و بەندە صالحەکانی، گەر توانیت خزمەتی صالحان بکەیت بیکە، چونکە ئەوە لە دونیا و دواڕۆژدا بۆ تۆ خێر و چاکەیە، گەر ببیت بە خاوەنی هەموو دونیا و دڵت وەك دڵی ئەوان نەبێت وەك ئەوە وایە خاوەنی گەردیلەیەك نەبیت، هەر کەس دڵی بۆ خودا ساز و چاك بکات دونیا و دواڕۆژی لەگەڵە و لە نێوان خەڵکی ڕەشۆکی و تایبەتاندا بە فەرمانی خودا فەرمان دەردەکات.

**هاوار بە حاڵت**، ڕێز و ڕادەی خۆت بزانە، تۆ چیت بەراورد بەوان، تۆ هەموو خەم و هەوڵێکت بریتییە لە خواردن و خواردنەوە و پۆشین و هاوسەریکردن و کۆکردنەوەی دونیا و سووربوون و هەڵپە بۆی، بۆ کاروبارەکانی دونیا کارکەر و سەرقاڵن و بۆ کاروبارەکانی دواڕۆژ بێکار و دەستبەتاڵن، خۆت قەڵەو بکە و ئامادەی بکە بۆ کرم و مێرووەکانی ناو زەوی، لە **پێغەمبەری خوداوە**(ﷺ) **فەرمووی**: ((خودا فریشتەیەکی هەیە هەموو ڕۆژێك بەیانی و ئێوارە بانگ دەکات و دەڵێت: ئەی ڕۆڵەی ئادەم بۆ مردن لە دایکبن و بۆ وێرانە بینابکەن و بۆ دوژمنەکانتان کۆیکەنەوە))[1].

کەسی باوەڕدار خاوەنی نییەتی چاك و پاکە لە هەموو کارەوبار و هەڵسوکەوتەکانیدا، لە دونیادا بۆ دونیا بینا ناکات، لە دونیادا بۆ دواڕۆژ بینا دەکات، مزگەوت ئاوەدان دەکاتەوە و جۆگە و قوتابخانە و قەڵا و قوللە بینا دەکات و ڕێگەکان بۆ موسڵمانان خۆشدەکات، گەر جگە لەمانە شتێکی تری بینا کرد ئەوا بۆ خانەوادە و بێوەژنان و هەژاران و ئەوەیە کە هەر دەبێت ببێت، ئەو کارانە ئەنجام دەدات تاکو لە دواڕۆژدا و لە پاداشتی ئەوانەدا بۆی بینابکرێت، بۆ سروشت و ئارەزوو و نەفس هیچ شتێك بینا ناکات، گەر ڕۆڵەی ئادەم ڕاست و دروست بوو ئەوا لە هەموو بارەکانیدا لەگەڵ حەقدایە(عزوجل)، ئەوا بوون و نەبوونی بە خوداوە دەبێت، دڵی بە پێغەمبەران(علیهم السلام) دەکات لە دونیا و دواڕۆژدا.

کەسی یادکەری خودا بە هەمیشەیی زیندووە و لە ژیانێکەوە دەگوێزرێتەوە بۆ ژیانێکی تر، تەنها یەك چرکە دەمرێت، گەر زیکر لە دڵدا دامەزرا یادی بەندە بۆ خودا

[1] ذكره السيوطي في "الجامع الصغير" والبيهقي في "الشعب".

بەردەوام دەبێت با بە زمانیش یادی نەکات، هەتا بەندە لە یادی خودا(عزوجل) بەردەوام بێت تەبایی و رازیبوون بە کردارەکانی لە خوداوە بۆ ئەو بەردەوام دەبێت، گەر لە هاتنی هاوین لەگەڵ حق(عزوجل) تەبا نەبین هاوین بەدرۆمان دەخاتەوە، گەر لە هاتنی زستان لەگەڵ خودا(سبحانە وتعالى) تەبا نەبین زستان بەدرۆمان دەخاتەوە، تەبایی لەگەڵ خودا لەو وەرزەدا ئازار و توندی کاریگەریەکەی دەسڕێتەوە، تەبایی لە بەلا و ئافەتیشدا هەر بەو جۆرەیە، ناخۆشی و تەنگەلانی و ناڕەحەتی و بێزارییەکەی لە کاتی دابارینیدا نامێنێت، چەندە کاروباری دۆستانی خودا سەیروسەمەرەیە! چەندە حاڵ و باریان سەیروسەمەرەیە! هەر شتێك لە حەقەوە(عزوجل) روو لەوان بکات لایان چاك و پاکە، شەرابی مەعریفەتی خۆی دەرخواردی ئەوان داوە و مەستی کردوون و لە ئامێزی لوتفی خۆیدا ئەوانی خەواندووە، بە هۆگری خۆی هۆگری پێ بەخشیون، بۆیە مانەوە لەگەڵی و بزربوون لە هەر شتێکی تر جگە لە ئەو دریژە دەکێشێت و لایان خۆشدەبێت، بەردەوام وەك مردوو وان لەبەردەستی ئەودا، هەیبەت ئەوانی داگرتووەتەوە گەر بیەوێت ناویان بلاوە پێ دەکات و راستیان دەکاتەوە و زیندوویان دەکاتەوە و بەئاگایان دەهێنێت، ئەوان لەبەردەستی خودادا وەك یارانی ئەشکەوت وان لە ئەشکەوتەکەیاندا، ئەوانەی خودا(عزوجل) دەربارەیان دەفەرموێت:

﴿وَنُقَلِّبُهُمْ ذَاتَ ٱلْيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِ﴾ الكهف: ١٨

ئەوان هۆشمەندترینی خەلکین، لە هەموو بارێکدا داوای لێخۆشبوون و رزگاربوون لە پەروەردگاریان داوا دەکەن، ئەمە بریتییە لە هەوڵ و لێبڕانیان، هاوار بە حالّت، بە کاری ئەهلی دۆزەخ کار دەکەی و رجای بەهەشتی خودا دەکەی، تۆ چاوتبڕیوەتە شتێك جێگەی چاوتێبڕینی تۆ نییە، بە شتی خوازراو فریو مەخۆ و وا گومان ببەی تۆ خاوەنیتی، بەم نزیکانە خاوەنەکەی لێت وەردەگرێتەوە، حەق(عزوجل) ژیانی بە خواستن پێداوی تاکو تیایدا گوێڕایەڵی ئەو بکەیت، وا دادەنێی تۆ خاوەنی ئەو ژیانە بیت و ئەوەی دەتەوێ تیایدا ئەنجامی دەدەی، هەر بەو جۆرە لەشساغی لەلات خوازراوە، دەوڵەمەندی لەلات خوازراوە، ئاسایش و پلە و پایە و هەموو ئەوەی لەلای تۆیە لە نیعمەتەکان و هەموو شتەکانی تر خوازراون، لەم شتە خوازراوانەدا زیادەڕەوی مەکە،

چونکە داوات لیّ دەکریّتەوە و لەسەریان دادگایی دەکریّت، لەسەر هەموو شتیّك پرسیارت لیّ دەکریّت، هەموو ئەو نیعمەتانەی لەلای ئیّوەیە خودا خاوەنیەتی بۆیە بۆ کاری چاکە بەکاریان بهیّنن، هەموو ئەوەی ئیّوە حەزی لیّ دەکەن لەلای خوداناسان سەرقالکەرە و لە دونیا و دوارِۆژدا تەنها سەلامەتییان لەگەلّ حەق(عزوجل) گەرەکە.

**لە یەکێك لە خوداناسانەوە فەرمووی:** لەناو خەلکیدا لەگەلّ خودادا(عزوجل) تەبا بە، لەگەلّ خەلکیدا لە حەقدا تەبا مەبە، شکاوەکان راستبکەرەوە و شکستەکان بگرەوە، لە بەندە صالح و تەباکانی خوداوە فیّری تەبایی بن لەگەلّ حەق(عزوجل).



# راستەقینەی پشتبەستن بە خودا

بەیانی رۆژی هەیینی ١٤/ذي القعدة/ ٥٤٥ھ شێخ عبدالقادر(خودا لێی رازی بێت) لە مەدرەسەکەی فەرمووی:

**گرنگی بە رۆزییەکەت مەدە**، چونکە داوای رۆزییەکە بۆ تۆ لە ئەوەوە(سبحانه وتعالى) زۆتر و توندترە لە داوای تۆ بۆ رۆزییەکەت، گەر ئەمڕۆ رۆزییەکت بۆ بەدەست هات ئەوا خەم و پەژارە بۆ رۆزی سبەینێ لە خۆت بکەرەوە، وەك چۆن دوێنێ گوزەری کرد و بەڕێتکرد ناشزانی سبەینێ بە تۆ دەگات یان نە، بە ئەمڕۆوە سەرقاڵ ببە، گەر حەقت(عزوجل) بناسیبابە ئەوا بە خوداوە سەرقاڵ دەبووی و بێئاگا دەبووی لە داوای رۆزی، گەورەیی و شکۆمەندی ئەو(سبحانه وتعالى) رێگر دەبوو لەوەی داوای رۆزی لێ بکەیت، چونکە هەر کەس خودا بناسێت زمانی کۆڵ دەبێت، بەردەوام کەسی "عاریف بە خودا" لەبەردەستیدا کەڕ و لاڵە تا دەیگێڕێتەوە بۆ بەرژەوەندی دروستکراوەکان، کاتێك خودا ئەو دەگێڕێتەوە بۆ ناو خەڵکی لاڵی و کۆڵی و لەکە لەسەر زمانی هەڵدەگرێت، موسا(علیه السلام) کاتێك سەرقاڵی لەوەڕاندنی مەڕ و ماڵات بوو لەکە و گرێ و وەستانێك لە زمانیدا بوو، کاتێك خودا ویستی بیگێڕێتەوە ئیلهامی کرد تا فەرمووی: ﴿وَاحْلُلْ عُقْدَةً مِّن لِّسَانِي ﴿٢٧﴾ يَفْقَهُوا قَوْلِي ﴿٢٨﴾﴾ طه: ٢٧ - ٢٨

وەك ئەوەی بفەرموێت کاتێك لە دەشت و سارا بووم و مەڕ و ماڵاتم دەلەوەڕاند پێویستیم بەوە نەبوو، ئێستا کارم لەگەڵ خەڵکی بۆ هاتووەتە پێش و دەبێت قسەیان بۆ بکەم، داوامە ئەم کۆڵی و لەکەیە لەسەر زمانم لابە، بۆیە خودا گرێیەکەی لەسەر زمانی کردەوە، لە منداڵیدا نەوەد وشەی رەوانی ماناداری بە زماندا جاری دەبوو بە

ئەندازەی ئەوەی کەسانی تر قسەیان پێ دەکرد، دەیویست لەبەردەستی فیرعەون و ئاسیەدا لە منداڵیدا قسە بکات خودا پشکۆیەکی خستە ناو دەمیەوە.

ئەی گەنج، دەبینم کەسێکی کەم مەعریفەتی بە خودا(عزوجل) و پێغەمبەرەکەی(ﷺ)، کەم مەعریفەتی بە دۆستانی خودا و ئەبدالی پێغەمبەرەکانی و خەلیفەکانی، تۆ لە مانا خاڵیبوویتەوە، تۆ قەفەسێکی بەبێ باڵندە، ماڵێکی چۆڵی ویرانەی، درەختێکی وشکی و گەڵاکانت هەڵوەریون، ئاوەدانی دڵی بەندە بە ئیسلامەوەیە، پاشان لە بەدیهێنانی حەقیقەتی ئیسلام کە بریتییە لە خۆڕادەستکردن(الإستسلام)، هەموو بوونی خۆت ڕادەستی حەق(عزوجل) بکە ئەویش نەفسی خۆت و نەفسی کەسانی تر ڕادەستی تۆ دەکات، بە دڵ لە خۆت و خەلکی دەربچۆ و لەبەردەستیدا بەڕووتی لە خۆت و لە خەلکی ڕابوەستە، گەر حەق(عزوجل) بیەوێت پێت دەپۆشێت و پۆشتەت دەکاتەوە و دەتگێڕێتەوە بۆ ناو خەلکی، ئەوکات فەرمانی خودا لە خۆت و لەواندا جێبەجێ دەکەیت، ئەمەش بە ڕازیبوونی پێغەمبەری خودا(ﷺ) و ڕەوانەکراو، پاشان بە چاوەڕوانییەوە بوەستە بۆ ئەوەی فەرمانی پێ دەکات تەبا لەگەڵ هەموو ئەوەی فەرمانی پێ دەکات بەسەر تۆدا، هەر کەس لە هەرچی شتە جگە لە حەق(عزوجل) خۆی دابڕێنێت و لەپای دڵ و نهێنی خۆیدا لەبەردەستی خودادا(سبحانه وتعالى) بوەستێت ئەوا بە زمانی حاڵ ئەوەی وتووە کە موسا(علیه السلام) فەرمووی: ﴿وَعَجِلْتُ إِلَيْكَ رَبِّ لِتَرْضَىٰ ۝٨٤﴾ طه: ٨٤

خۆم لە دونیا و دواڕۆژ و هەموو خەلکی کەنارگیر کرد، هۆکارەکانم بڕی، ئەربابم لەبەر خۆم داکەند، بە پەلە هاتم بۆ لات بۆ ئەوەی لێم ڕازی بیت و بۆ ئەو وەستانەی پێشتر هەمبوو لەگەڵ خەلکی لێمخۆش بیت، ئەی ئەزان تۆ چیت داوە لەمە؟ تۆ بەندەی نەفس و دونیا و ئارەزووی خۆتی، تۆ بەندەی خەلکیت و بەوان هاوەڵت بۆ خودا داناوە، چونکە لە زیان و قازانج بە خۆت دەیانبینی، لەگەڵ ئەوەش لای بەهەشتی و ڕجای چوونە ژوورەوە دەکەی، لەلای دۆزەخ ترسی چوونە ژوورەوەت هەیە، ئێوە لە کوێن، هەمووتان لە کوێی وەرگێڕی دڵان و چاوانن، ئەو کەسەی گەر بە شتێک بڵێ: ببە دەبێت ﴿كُن فَيَكُونُ ۝١١٧﴾ البقرة: ١١٧؟!

ئەی گەنج، بە گوێڕایەڵی خۆت فریو مەخۆ و پێی سەرسام مەبە، داوا لە حەق(سبحانه وتعالى) بکە قبووڵی بفەرموێت، ئاگاداربە و بترسە لەوەی خودا ڕەوانەی ناراستەیەکی ترت بکات جگە لە گوێڕایەڵی، چ شتێك تۆی دڵنیا کردووە؟ کێ ناڵێت بە چاکەکانت دەوترێت بێن بە خراپە و بە پاکێتی و ڕوونییەکەت دەوترێت بێن بە لێڵی؟ هەرکەس خودا(عزوجل) بناسێت لەگەڵ شتێك ناوەستێ و فریو بە شتێك ناخوات، لە سەلامەتی نایێن و پارێزگاری ئەوەی لە نێوان ئەو و خودادایە دڵنیا نابێتەوە تا لە دونیا دەردەچێت.

خەڵکینە، خۆتان سەرقاڵ بکەن بە کار و کردەوەی دڵان و ئیخلاص تیایاندا، ئیخلاصی تەواو بریتییە لە خۆدارنین لە هەرچی شتە جگە لە خودا(عزوجل)، ناسینی خودا(عزوجل) بنچینەیە، دەبینم زۆرینەتان لە گوفتاری بێ کردار و کرداری بێ ئیخلاص و یەکتاپەرستیدا درۆ دەکەن، گەر سەنگی مەحەك کە بە دەستی منە پیست بکات یان ڕازی بێت لە تۆ، چ شتێك سوودی بۆ تۆ دەبێت؟ دەتەوێ حەق(عزوجل) تۆ قبووڵ بکات و لێت ڕازی بێت؟ بەم نزیکانە ڕسواییەکەت دەردەکەوێت، کاتێك دەخرێیە ناو کورە و دارِشتەت لێ دروست دەکرێت، دەوترێت ئەمە سپییە و ئەمە ڕەشە و ئەمەش تێکەڵە، هەموو ئەوانە لە ڕۆژی دواییدا دێنە دەرەوە، هەموو کاروکردەوەکانت -کە بەم جۆرە دووڕوویت تێدا ئەنجامداون- بە کەم و بێنرخ تەماشا دەکرێن، هەر کارێك بۆ خودا ئەنجام نەدرابێت پووچ و بێ بەهایە، کار و خۆشەویستی و هاودڵی و داواتان لە کەسێك بێت کە:

﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾ الشورى: ١١

ئەرێی ناتەواوی و کەموکوڕی لە خودا بکەن و پاشان سیفەتە بەرز و شکۆدارەکانی بۆ جێگیر بکەن، ئەو سیفەتانەی شایستەی خودا نین ئەرێیان بکەن، و ئەوانەش کە شایستەی خودان جێگیریان بکەن، ئەوانەش بریتین لەو سیفەتانەی خودا بۆ خۆی پێی ڕازییە و پێغەمبەر(ﷺ) ڕایگەیاندوون، گەر ئەم کارەتان ئەنجامدا چوواندن و بەکخستن(التشبيه والتعطيل) لە دڵتاندا دەسڕێنەوە، بە ڕێزلێگرتن و شکۆدارکردن و

بەمەزنزانینی هاوەڵی خودا(عزوجل) و پێغەمبەری خودا(ﷺ) و بەندە صاڵحەکان بکەن، گەر سەرفرازیتان دەوێت تەنها بە ئەدەبی جوانەوە لەلام ئامادە بن، ئەگینا با ئامادە نەبێت، ئێوە بەردەوام لە زیادەڕەویدان، ئەم ساتەی لەلای منن زیادەڕەوی وازلێبهێنن، لەوانەیە لەم دانیشتنەدا کەسانێك ئامادە بن لە پشتی ژیری و تێگەیشتنی ئێوەوە بن و پێویست بێت ڕێزیان لێ بگیرێت و ئەدەبی جوانیان لەگەڵ بەکاربهێنرێت، چێشتلێنەر چێشتەکەی خۆی دەزانێت و دەناسێتەوە، نانەوا نانەکەی خۆی دەزانێت و دەناسێتەوە، پیشەوەر پیشەکەی خۆی دەزانێت و دروستکراوەکەی دەستی خۆی دەناسێتەوە، خاوەنی بانگەواز دەزانێت کامانەن بانگکراوان و دەیانناسێتەوە، ئامادەبوان دەناسێتەوە، دونیا دڵی کوێر کردوون و شتێکی پێ نابینن، لێی بەئاگا بن، دونیا جار لە دوای جار ئێوە لە خۆیدا نوقم دەکات تا هەڵتان بنێت و دواجار سەرتان ببڕێت، شەراب و مادەی سڕکەری خۆی دەرخواردی ئێوە بدات پاشان دەست و لاقتان ببڕێتەوە و چاوتان هەڵبکۆڵێت، کاتێك بەنجەکە بەرتان دەدات و هۆش دەکەنەوە دەبینن چی بەسەر ئێوە هێناوە، ئەمە بریتییە لە سەرئەنجامی خۆشەویستی دونیا، دوژمن لەودیو دونیا و هەڵپە بۆ دونیا و کۆکردنەوەی دونیاوە خۆی حەشارداوە، ئەمە بریتییە لە کارەکانی دونیا و خۆتانی لێ بپارێزن.

ئەی گەنج، تۆ سەرفرازی بەدەست ناهێنیت لە کاتێکدا دونیات خۆشدەوێت، تۆش ئەی ئەو کەسەی بانگەشەی خۆشەویستی حەق(عزوجل) دەکەی سەرفرازی و هاتنە ڕاستەت بۆ نییە لە کاتێکدا دوارۆژت خۆشدەوێت یان شتێکت خۆشدەوێت جگە لە خودا، کەسی عاریفی خۆشەویست هیچ کام لە دونیا و دوارۆژی ناوێت، جگە لە حەق(عزوجل) هیچ کەس و شتێکی تری ناوێت، کاتێك خۆشەویستی بۆ تەواو بوو و هاتە دی بەشی خۆی لە دونیا ڕووی لێ دەکات ئەوەش وەك پاداشت و دڵدانەوەیەك، هەر بەو جۆرە کاتێك دەگاتە دوارۆژ، هەموو ئەوەی لە پشتی خۆیەوە بەجێیهێلاوە لە دەرگای حەقدا(عزوجل) دەیانبینێتەوە، بەر لە ئەو گەیشتوونەتە ئەوێ و پێشی ئەو دەدات، چونکە ئەوان خۆیانیان لێ کەنارگیر کردووە، حەز و بەشەکانی دڵ بریتییە لە

ناوەوەی، حەز و بەشەکانی نەفس بریتییە لە دەرەوەی، حەز و بەشی دڵ کاتێك دێت ڕێگری بکرێت لە نەفس بگات بە حەز و بەشی خۆی، کاتێك ڕێگری لێکرا دەروازەکانی بەشی دڵ دەکرێنەوە، کاتێك دڵ بە بەشی خۆی لە حەقەوە(عزوجل) بێنیاز بوو ڕەحمەت ڕوو لە نەفس دەکات، بەو بەندەیە دەوترێت نەفسی خۆت مەکوژە، ئەو کات بەشەکانی نەفس دێن و بەدەستی دڵنیاییەوە دەستیان بۆ دەبات، دانیشتن لەگەڵ ئەوانەی حەزی دونیات بۆ زیاد دەکەن و لەسەری هانت دەدەن وازلێبهێنە و ڕوو لە دانیشتنی ئەوانە بکە زوهدت لە دونیا بۆ دروست دەکەن، ڕەگەز مەیلی بە لای ڕەگەزدا هەیە، هەندێکیان بەدەوری هەندێکیاندا خول دەخۆن، موحیب بەسەر موحیبباندا تا لەلایان خۆشەویستەکەی دەبینێتەوە، ئەوانەی خودایان خۆشدەوێت لە خودادا و بۆ خودا یەکتریان خۆشدەوێت، گومانی تێدا نییە خوداش ئەوانی خۆشدەوێت و پشتیوانیان دەکات و هەندێکیان دەبەستێتەوە بە هەندێکی تریانەوە، لەسەر بانگەوازی خەلکی کۆمەکی یەکتر دەکەن و بانگیان دەکەن بۆ ئیمان و یەکتاپەرستی و ئیخلاص لە کاروکردەوەکاندا، دەستیان دەگرن و لەسەر ڕێگەی حەق(عزوجل) دامەزراویان دەکەن، هەرکەس خزمەت بکات خزمەت دەکرێت، هەر کەس چاکە بکات چاکەی لەگەڵ دەکرێت، هەر کەس ببەخشێت پێی دەبەخشرێت، گەر بۆ ئاگر کار دەکەی ئەوا سبەینێ ئاگر بەشی تۆیە.

((وەك چۆن قەرز دەکەی داوای قەرزت لێ دەکرێتەوە- ئێوە چۆن بن لەو شێوەیە دەبنە سەرۆکارتان))[1].

کاروکردەوەکانی ئێوە کرێکارەکانی ئێوەن، بە کاروکردەوەی ئەهلی دۆزەخ کاردەکەیت و ڕجات لە خودا(عزوجل) باخچەکانی بەهەشتە، چۆن ئاوات بۆ بەهەشت دەخوازی بەبێ کارکردن بە کاری ئەهلی بەهەشت، خاوەن دڵان ئەوانەن لە دونیادا بە دڵ کاریان ئەنجامدا نەك تەنها بە ئەندامەکانی جەستەیان، کار بەبێ دڵ چی پێ ئەنجام دەدرێت؟ ڕیاباز بە ئەندامەکانی جەستەی کار دەکات، کەسی موخلیص بە دڵ و

---

[1] القلم تحريجهما.

ئەندامەکانی کار دەکات، بە دڵ -بەر لە ئەندامەکانی- کار دەکات، باوەڕدار زیندووە و دووڕوو مردووە، باوەڕدار کار بۆ خودا(عزوجل) دەکات و دووڕوو کار بۆ خەڵکی دەکات و لەسەر کارەکەی داوای مەدح و بەخشیشیان لێ دەکات، کاری باوەڕدار لە ئاشکرا و پەنهانیدایە، لە تەنهایی و تێکەڵیدایە، لە خۆشی و ناخۆشیدایە، بەڵام کاری کەسی دووڕوو تەنها لە ئاشکرادایە، کاری ئەو لە کاتی خۆشیدایە، کاتێک زیان و ناخۆشی دێتە بەرەوە کاری بۆ نییە، هاوەڵی نییە لەگەڵ خودا(عزوجل)، باوەڕی نییە بە خودا و پێغەمبەران(علیهم السلام) و کتێبەکانی، بیر لە ڕۆژی دوایی و دادگاییکردن ناکاتەوە، ئیسلامەکەی بۆ ئەوەیە لە دونیادا سەر و ماڵی سەلامەت بن، نەک لە دوارۆژدا لە ئاگر سەلامەت بن، ئەو ئاگرەی بریتییە لە سزای خودا(عزوجل)، بەڕۆژوو دەبێت و نوێژ دەکات و لەبەرچاوی خەڵکیدا زانست دەخوێنێت، کاتێک لەوان تەنها دەکەوێت دەگەڕێتەوە بۆ سەرقاڵی خۆی و بێباوەڕی خۆی.

خودایە، ئێمە لەو حاڵە پەنات پێ دەگرین، داوای ئیخلاصت لێ دەکەین لە دونیادا و داوای خەلاصت(ڕزگاری) لێ دەکەین لە دوارۆژدا. ئامین.

ئەی گەنج، ئیخلاص لە کاروکردەوەکاندا ئەنجام بدە، چاوت لەسەر کارەکەت هەڵبگرە و لە خودا و خەڵکی لەسەری داوای بریتی و پاداشت مەکە، تەنها بۆ ڕووی پاکی خودا(عزوجل) کار بکە نەک بۆ نیعمەتەکانی، ببە بە یەکێک لەوانەی ڕووی پاکی خودایان دەوێت(یریدون وجهه)، داوای ڕووی پاکی خودا بکە تا پێتدەبەخشێت، گەر ئەوەی پێدای لە دونیا و دوارۆژدا بەهەشت بەدەست دەهێنیت، لە دونیادا نزیکی لە خوداوە و لە دوارۆژیشدا تەماشاکردنی خودا(سبحانه وتعالی)، پاداشت بۆ بەڵێندراوەکەی فرزشتن و دەستەبەرییە.

ئەی گەنج، نەفس و ماڵەکەت ڕادەستی دەستی قەدەر و حیکمەت و بڕیاری براوەی خودا بکە، کڕراو(ئەو شتەی فرۆشراوە) ڕادەستی کڕیارەکە بکە و سبەینێ نرخەکەیت پێ دەدات.

ئەی بەندەکانی خودا، نەفسی خۆتان ڕادەستی ئەو(سبحانه وتعالی) بکەن، نرخ و نرخدەر بەدەست بهێنن، بڵێن نەفس و ماڵ و بەهەشت بۆ تۆیە، هەرچی شت هەیە

جگە لە تۆ لە تۆوەیە و هیچ شتێکمان ناوێت جگە لە خۆت، جیران بەر لە خانوو، هاوەڵ بەرلە گرتنەبەری رێگە، ئەی ئەو کەسەی دەتەوێت لێرە بەهەشت بەدەست بهێنیت و ئەمڕۆ و نەك سبەینێ بیکڕیت، روبارەکانت زۆر بکە و ناو بە بەهەشتەکەتدا جاری بکە، ئەمڕۆ نەك سبەینێ.

خەڵکینە، لە رۆژی دواییدا دڵان و چاوان وەردەگەڕێن، پێیەکان هەڵدەخلیسکێن، هەریەکێك لەسەر پێی ئیمان و تەقوای خۆی رادەوەستێت، لەو رۆژەدا جێگیربوونی پێیەکان بەپێی ئیمانە، رۆژێك ستەمکار گاز لە دەستەکانی دەگرێت: ﴿يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيْهِ﴾ الفرقان: ٢٧، دەستی خۆی دەگەزێ، چۆن و بۆچی ستەمی کرد، تێکدەر دەستی خۆی دەگەزێت بۆچی کاری تێکدانی ئەنجامدا و ئیصلاح و چاکسازی ئەنجام نەدا، چۆن لە مەولای خۆی(عزوجل) هەڵهات و رووی لێ نەکرد.

ئەی گەنج، بە کاری چاکە فریو مەخۆ، چونکە کارەکان بە سەرئەنجامەکانیان دەنرخێنرێن، داوا لە حەق(عزوجل) بکە بۆ ئەوەی سەرئەنجام و کۆتایت بە خێر کۆتا پێ بهێنێت و لەسەر باشترین کردار لەلای ئەو(سبحانە وتعالى) گیانت بکێشێت، نەکەی گەر تەوبەت کرد بگەڕێیەوە بۆ سەر یاخیبوون، بە قسەی کەسێك لە تەوبەکەت پەشیمان مەبەرەوە، لەگەڵ نەفس و ئارەزوو و سروشتی خۆتدا تەبا مەبە و سەرپێچی مەکە لە لە مەولای خۆت، یاخیبوون لەو رۆژدا و لە سبەینێدا زۆر گرانە، گەر لە حەق(عزوجل) یاخی بیت رسوا و شەرمەزارت دەکات و سەرتناخات، خودایە، بە گەورەیی خۆت سەرمان بخە و بە یاخیبوون لە خۆت رسوا و شەرمەزارمان مەکە.

﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ۝٢٠١﴾

البقرة: ٢٠١



## مەجلیسی هەژدەهەم

# تێکۆشان دژ بە نەفس و ئارەزوو و شەیتان

بەیانی رۆژی یەکشەممە لە "الرباط" ١٦/ذي القعدة/٥٤٥هـ شێخ عبدالقادر(خودا لێی رازی بێت) فەرموی:

**خودا هەواڵی بە دوو جیهاد پێداوی: دەرەوە و ناوەوە.**

**جیهادی ناوەوە:** بریتییە لە جیهادی نەفس و ئارەزوو و سروشت و شەیتان، و تەوبەکردن لە یاخیبوون و هەڵە، و جێگیربوون لەسەر تەوبە و وازهێنان لە حەزەکان و حەرامکراوەکان.

**جیهادی دەرەوەش:** بریتییە لە جیهادی بێباوەڕانی سەرپێچیکار لە خودا و پێغەمبەرەکەی(ﷺ)، جیهادی ئەوانەی شمشێر و نێزە و تیریان لێ راکێشاوە و دەجەنگن و جەنگیان لەگەڵ دەکرێت، جیهادی ناوەوە لە جیهادی دەرەوە سەخت و گرانترە، چونکە شتێکی پەیوەستی دووبارەیە، چۆن لە جیهادی دەرەوە دژوارتر نییە لە کاتێکدا بریتییە لە بڕینی ئولفەتپێگیراوەکانی نەفس لە حەرامکراوەکان و کۆچکردن لێیان و پابەندبوون بە فەرمانەکانی شەرع و کۆتاهێنان بە نەهیلێکراوەکانی، هەر کەس لەو دوو جیهادەدا فەرمانی خۆی جێبەجێ کرد لە دونیا و دوارۆژدا پاداشت بەدەست دەهێنێت، برینی جەستەی شەهید وەك برینی مولوولە دەمارێك وایە لە دەستی یەکێك لە ئێوەدا و هیچ ئازارێکی نییە، مردن لە حەقی کەسی تێکۆشەری نەفسدا و تەوبەکار لە گوناهەکانی وەك خواردنەوەی ئاوی سارد وایە لەلایەن کەسی تینووەوە.

**خەڵکینە،** هەر شتێکتان دارا لێ بکەین چاکتر و باشتر لەو شتەتان پێ دەبەخشین، کەسی موراد لە هەموو ساتێکدا ئەمر و ئەهییەك بۆ سەر دڵی دادەبەزێت و پێی

تایبەت دەکرێت، بە پێچەوانەی خەڵکانی ترەوە، بە پێچەوانەی دووڕووان- دوژمنانی خودا و پێغەمبەر(ﷺ)- ئەوەش بەهۆی نەزانییان بە حەق(عزوجل)، چۆن ناچنە ناو دۆزەخەوە لە کاتێکدا لە دونیادا سەرپێچییان لە حەق(عزوجل) دەکرد و تەبایی و گوێڕایەڵیان بۆ نەفس و ئارەزوو و سروشت و عادەت و شەیتان بوو، دونیایان بەسەر دوارۆژدا هەڵبژارد، چۆن ناچنە ناو دۆزەخەوە لە کاتێکدا ئەم قورئانەیان بیست و باوەڕیان پێ نەهێنا و بە فەرمانەکانی کاریان نەکرد و لە نەهیلێکراوەکانی خۆیان نەگرتەوە؟!

خەڵکینە، ئیمان بەم قورئانە بهێنن و کاری پێ بکەن و لە کارەکاندا ئیخلاص ئەنجام بدەن، ریابازی مەکەن و دووڕوو مەبن لە کاروکردەوەکاندا، بە کاروکردەوەکانتان داوای مەدح و ستایش و بریتی و پاداشت مەکەن لە خەلکی، تاکەتاکەیەکی خەڵکی ئیمان بەم قورئانە دەهێنن و بۆ رووی پاکی خودا(عزوجل) کاری پێ دەکەن، بۆیە موخلیصان کەمبوونەوە و دووڕووان زۆربوون، چەندە لە گوێڕایەڵی خودادا تەمبەڵن و لە گوێڕایەڵی دوژمنی خودا و دوژمنی خۆتان(شەیتانی نەفرەتلێکراو) بەهێزن، خوداناسان ئاواتیانە خاڵی نەبن لە داوای حەق(عزوجل)، ئەوەیان زانی ئارامگرتن لەسەر داوا و بڕیارەکان و قەدەرەکانی خێرێکی زۆری تێدایە لە دونیا و دوارۆژدا، لە تارتوێکردن و وەرگێڕانەکانیدا ئەوان تەباییان لەگەڵ خودا(عزوجل) هەیە، جارێك لە ئارامگرتندا و جارێکیش لە شوکرکردندا، جارێك لە نزیکی لە ئەوەوە و جارێکیش لە دووری لە ئەوەوە، جارێك لە ماندووبوون و جارێکیش لە پشوو و ئاسوودەیی، جارێك لە دەوڵەمەندیدا و جارێکیش لە هەژاریدا، جارێك لە لەشساغیدا و جارێکیش لە نەخۆشیدا، هەموو ئاواتیان بریتییە لە پارێزگاری کردنی دڵ لەگەڵ حەق(عزوجل)، ئەمە گرنگترین شتێکە لەلایان، ئاواتی سەلامەتی خۆیان و خەڵکی دەخوازن لەگەڵ دروستکەر(عزوجل)، بەردەوام داوا لە حەق(عزوجل) دەکەن بۆ بەرژەوەندی خەڵکی.

ئەی گەنج، ببە بە کەسێکی دروست و تەندروست دەبیت بە کەسێکی زمانڕەوان، لە حوکمدا راست و دروست بە لە زانستدا زمانڕەوان دەبیت، لە پەنهان و نهێنیدا راست و دروست بە لە ئاشکرادا زمانڕەوان دەبیت، هەرچی سەلامەتییە لە گوێڕایەڵی

خودادایە(عزوجل)، هەروەها لە جێبەجێ کردنی هەموو ئەوەی فەرمانی پێکردووە و خۆگرتنەوە لەوەی نەهی لێکردووە و ئارامگرتن لەسەر هەموو ئەوەی بۆ تۆی بڕیوەتەوە، هەر کەس وەڵامی خودا بداتەوە خودا وەڵامی دەداتەوە، هەر کەس گوێڕایەڵی خودا بکات هەرچی شتە گوێڕایەڵی لێ دەکات.

**خەلکینە**، لە من قبووڵ بکەن من ئامۆژگاریکەری ئێوەم، لەوەی منی تێدام لە هەرچی شتی خۆم و ئێوەیە کەنارم گرتووە، من لەوانە کەنارمگرتووە و تەماشای کرداری خودا(عزوجل) دەکەم لە خۆم و ئێوەدا، تۆمەتبارم مەکەن، چونکە ئەوەی بۆ خۆمم دەوێت بۆ ئێوەشم دەوێت، **پێغەمبەر**(ﷺ) **دەفەرموێت:** ((باوەڕدار ئیمانەکەی تەواو نابێت تا ئەوەی بۆ خۆی دەیەوێت بۆ برا موسڵمانەکەشی بوێت))[1].

ئەمە فەرموودەی ئەمیر و سەرۆك و گەورە و پێشەوا و سەفیر و شفاعەتکارمانە، قسەی پێشەوای پێغەمبەران و صادیقان لە سەردەمی ئادەمەوە(علیه السلام) هەتا رۆژی دوایی، کەماڵی ئیمانی نەرێ کرد لە کەسێك گەر ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ برا موسڵمانەکەی پێی خۆشنەبێت، گەر خواردنی خۆش و پۆشاکی جوان و ماڵی رازاوە و روخساری شیرین و زۆری ماڵ و سامانت بۆ خۆت پێخۆشە و پێچەوانەی ئەوەت بۆ برا موسڵمانەکەت پێخۆشە ئەوا لە بانگەشەی ئیماندا درۆت کردووە، ئەی ئەو کەسەی کەم تەگبیری، جیرانێکی هەژارت هەیە، کەسوکاری هەژارت هەیە و ماڵەکەت زەکاتی لەسەرە، هەموو رۆژێ قازانج دەکەی و قازانج دەخەیە سەر قازانج، زۆر زیاتر لەوەت لەلایە پێویستت پێیەتی، کاتێك لێیان دەگریتەوە و پێیان نابەخشی رازیت بەو هەژارییەی ئەوان تێیکەوتوون، بەڵام گەر نەفس و ئارەزوو و شەیتانەکەت لە پشتی تۆوە خۆیان حەشاردابێت گومانی تێدا نییە کاری خێر و چاکە لەسەرت ئاسان نابێت لە کاتێکدا هەڵپەی زۆر و ئاواتی دووردرێژ و خۆشەویستی دونیا و کەمی تەقوا و ئیمان تۆی داگرتووەتەوە، تۆ بە خۆت و ماڵەکەت و خەڵکی و ئەو خێرەی لەلاتە هاوەڵت بۆ خودا داناوە، هەرکەس زۆر حەزی لە دونیا بوو و هەڵپەی

[1] صحیح، رواه البخاري ومسلم.

زیادی کرد و مردنی لەبیرچوویەوە و لیقای خودای لەیاد کرد و جیاوازی نەکرد لە نێوان حەلاڵ و حەرام ئەوا خۆی بە بێباوەڕان چواندووە، ئەوانەی دەڵێن:

﴿مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَا إِلَّا الدَّهْرُ﴾ الجاثية: ٢٤

وەك ئەوەی تۆ یەکێك بیت لەوان، بەڵام پۆشاکی ئیسلامت لەبەرکردووە و بە وتنی شایەتمان خوێنی خۆت رزگارکردووە، و لە نوێژ و رۆژوودا -بە عادەت نەك بە عیبادەت- لەگەڵ موسڵمانانی، بۆ خەڵکی وا نیشان دەدەی تۆ کەسێکی تەقوادار و دڵت پڕە لە بەدکاری، بۆیە ئەوە هیچ سوودێکت پێ ناگەیەنێت.

خەڵکینە، برسێتی و تینوێتی رۆژگرتن لە رۆژدا و رۆژووشکاندن بە حەرام لە شەودا چ سوودێك بە ئێوە دەگەیەنێت، بە رۆژ بەڕۆژوو دەبن و بە شەو گوناه و تاوان دەکەن، ئەی ئەوانەی حەرام دەخۆن ئێوە لە رۆژدا خواردنەوەی ئاو لە خۆتان قەدەغە دەکەن پاشان لەسەر خوێنی موسڵمانان رۆژوو دەشکێنن، هەتانە بە رۆژ بەڕۆژوو دەبێت و شەو خەریکی بەدڕەفتارییە، **لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی:** ((هەتا ئومەتەکەم مانگی رەمەزان گەورە رابگرن شەرمەزار و سەرشۆڕ نابن))[1].

بە مەزنڕاگرتنی مانگی رەمەزان بریتییە لە ئەنجامدانی تەقوا تیایدا و بەڕۆژووبوون بۆ رووی پاکی خودا لەگەڵ پارێزگاری لە سنوورەکانی شەرع.

**ئەی گەنج بەڕۆژوو بە**، گەر شکاندت بە شتێك لە بەربانگەکەت دڵنەوایی هەژاران بکە، بەتەنها نان مەخۆ، چونکە ئەو کەسەی بەتەنها نان دەخوات و بەشی کەسی لێ نادات ترسی رووبەڕووبوونەوەی هەژاری و سواڵی بۆ هەیە.

خەڵکینە، تێردەخۆن و جیرانەکانتان برسین و بانگەشەی ئەوە دەکەن ئێوە باوەڕدارن، کەسێك لە ئێوە لەبەردەمیدا خواردنێکی زۆر دادەنرێت و لە خۆی و خانەوادەکەی زیادە و هەژارێك لە بەردەم دەرگاکەی وەستاوە و داوای خواردن دەکات، بەڵام دەست بەڕوویەوە دەنێت و بە بێهیوایی دەگەڕێتەوە، کەسێك بەرانبەر هەژاران

---

[1] لم أجد له أصلا.

بەو جۆرە بێت ئیمانەکەی دروست نییە، بەزوویی هەواڵی تۆش دەزانرێت، بەم نزیکانە وەك ئەو هەژارەت لێ دێت، دەست بەڕووی تۆشەوە دەنێن بەهۆی ئەو دەستبەڕوودانانەی لێت وەشایەوە لەگەڵ توانینی بەخشین.

هاوار بە حالت، بۆ دەبێ هەڵنەستی و ئەوەی لەبەر دەستت دانراوە بەو هەژارەی بیبەخشی و دوو حاڵ لە خۆتدا کۆبکەیەوە، تەوازوع لە هەستان و بەخشینی ماڵەکەت، پێغەمبەرمان(ﷺ) بەدەستی خۆی بە هەژاری دەبەخشی و ئالفی بە وشترەکەی دەدا، و مەڕ(شەك)ی دەدۆشی و کراسەکەی خۆی دەدووری(پینە دەکرد)، چۆن دەبێ بانگەشەی شوێنکەوتنی پێغەمبەر(ﷺ) بکەن لە کاتێکدا لە گوفتار و کرداردا سەرپێچی لەو دەکەن، ئێوە بانگەشەیەکی بێبنەما و بێ بەڵگە رادەگەیەنن، لە پەندێکدا هاتووە: یان یەهودییەکی پالفتە بە، ئەگەر نە دەم لە تەورات مەکوتە، بە هەمان شێوە بە تۆش دەڵێم مەرجەکانی ئیسلام لە خۆتدا بەدیبهێنە-کە بریتیین لە خۆڕادەست کردن بە خودا(عزوجل) و دڵنەوایی دروستکراوەکانی لە ئەمڕۆدا تا سبەینێ پەروەردگار(عزوجل) بە بەزەیی خۆی دڵنەوایت بکات، بەزەییت هەبێت بەوانەی لەسەر زەوین تا ئەو کەسەی لە ئاسمانە بەزەییت پێ بکات...

لەدوای ئەم قسانە فەرمووی: گەر لەگەڵ نەفسی خۆت راوەستاوییت ناگەیە ئەم مەقامە، تا بەش و حەزەکان بە نەفست بیبەخشی تۆ لە کۆتوبەندی نەفسی خۆتدای، مافی خۆی پێ بدە و حەز و بەشەکانی تری لێ بگرەوە، پاراستن و مانەوەی بە پێدانی مافەکەیەتی و تیاچوونی بە پێدانی حەز و بەشەکانی ترە، مافی نەفس پێدانی خواردنی زەروور و پۆشاك و خواردنەوە و شوێنی نیشتەجێبوونە، حەزەکانی بریتین لە حەزبازی و چێژەکان، لە دەستی شەرعەوە مافی خۆی پێ بدە، حەزەکانیشی رادەستی قەدەر و شەرع دابنێشە و نەفست پابەند بکە بە خزمەت کردن و گوێڕایەڵی سەرکەوتن بەدەست دەهێنیت، خودا(سبحانه وتعالى) دەفەرموێت:

﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟﴾ الحشر: ٧

بەکەم رازییە و نەفست دابمەزرێنە لەسەری، گەر لە دەستی پێشینەی خودا و زانستی خودا(عزوجل) زۆرت لە ماڵ و سامان بۆ هات ئەوا تیایدا سەرکەوتوو دەبیت، گەر بە کەم رازی بووی، ئەوکات نەفسی خۆت تیانابەی و بەشی خۆیشی پێ دەدەی.

حەسەنی بەصری دەیفەرموو: ئەوەی بەشی گیسکێکی بچووک دەکات بەشی مرۆڤێکیش دەکات، مشتێك ئالف و قومێك خواردنەوە، باوەڕدار بۆ تین و وزە دەخوات و دووڕوو بۆ تام و چێژ، باوەڕدار بۆ تین و وزە دەخوات، چونکە لەسەر ڕێگەیە و نەگەیشتووەتە مەنزڵ، ئەو دەزانێت لە مەنزڵگاکەی هەموو شتێکی بۆ ئامادەکراوە، کەسی دووڕوو مەنزڵی نییە و ئامانج بەدەست ناهێنێت، لە ڕۆژان و مانگاندا چەندە زیادەڕەویتان زۆر و بێشومارە! بەبێ سوود تەمەن بەڕێدەکەن، دەبینم لە دونیاکەتان کەمتەرخەمیتان نییە، بەڵام بۆ دینەکەتان کەمتەرخەمن، پێچەوانەیان بکەنەوە دەکەونە سەر ڕێگەی دروست، دونیا بۆ کەس نامێنێتەوە، هەر بەو جۆرە بۆ ئێوەش نامێنێتەوە.

خەڵکینە، ئایا واژوویەکت لە حەقەوە(عزوجل) وەرگرتووە بۆ ژیان، چەندە ئێوە بێ تەگبیرن، هەرکەس دونیای کەسێکی تر بە وێران کردنی دواڕۆژی خۆی ئاوەدان بکاتەوە و دونیا بۆ کەسانی تر کۆبکاتەوە ئەو کەسە دینەکەی خۆی بەخشیوەتەوە، و تووڕەبوونی خودای(عزوجل) بە ڕازی کردنی خەڵکی بەدەستهێناوە، گەر بیزانیبایە و یەقینی هەبوایە کە بەم نزیکانە دەمرێت و لەبەردەم خودادا(عزوجل) ئامادە دەکرێت و لەسەر هەموو هەڵسوکەوتەکانی دادگایی دەکرێت ئەوا زۆرێك لە کردەوە خراپەکانی وازلێدەهێنا.

لە لوقمانی حەکیمەوە(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) فەرموویەتی: کوڕی خۆم، وەك جۆن نەخۆش دەکەویت و نازانیت چۆن نەخۆش دەکەویت بەهەمان شێوە دەمریت و نازانیت چۆن دەمریت.

ئاگادارتان دەکەمەوە و ڕێگریتان لێ دەکەم، بەڵام ئێوە بەئاگا نایەن و لە خراپە دوورناکەونەوە، ئەی ئەوانەی لە خێر بزر و نادیارن و بە دونیاوە سەرقاڵن بەم نزیکانە دونیاتان لێ لێڵ و تاریك دەبێت و دەتاڵێنێت و ئەوەی کۆتان کردووەتەوە لە

دەستی دونیا و چێژتان لێ وەرگرتووە سوودێك بە ئێوە ناگەیەنێت، بەڵكو هەموو ئەوانە دەبن بە كۆڵ و باری گەردنتان.

ئەی گەنج، خۆگریە و ڕێگە مەدە وشەی شەڕ و خراپە بە زمانی تۆدا گوزەر بكات، گەر وشەیەكی خراپ بە زمانی تۆدا گوزەری كرد چەندین وشەی خراپی تر رووت لێ دەكات و شەڕ لە نێوانتان ئامادە دەبێت.

دانە دانەیەكی خەڵكی ئامادە دەكرێن بۆ بانگ كردنی خەڵكی بۆ دەروازەی حەق(عزوجل)، ئەو دانە دانەیە دەبن بە حوجە(بەڵگەی یەكلاكەرەوە)ی خودا لەسەر خەڵكی گەر لێیان وەرنەگرن، ئەوان بۆ باوەڕداران نیعمەتن و لەسەر دووڕووان- دوژمنانی ئایینی خودا- نەقمەتن.

خودا بە یەكتاپەرستی پاك و خاوێنی كردووین و بە فەنابوون لە خەڵكی و هەموو شتێك جگە لە خودا(عزوجل) بۆنخۆشی كردووین.

ئەی یەكتاپەرستان، ئەی هاوەڵدانەران، هیچ كەسێك هیچ شتێكی بەدەست نییە، هەموان دەستەوەستانن، پادشایان و دەسەڵاتداران و سوڵتانەكان و دەوڵەمەندان و هەژاران هەموو دیل و یەخسیری قەدەری خودان، دڵیان بەدەستی خودایە و چۆنی بوێت بەو جۆرە وەریان دەگێرێت:

﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾ الشورى: ١١

نەفسی خۆتان تەڵەو مەكەن، چونكە دەتانخوات وەك چۆن كەسێك سەگێكی دڕندە دێنێت و گەورەی دەكات و قەڵەوی دەكات، پاشان لەگەڵی تەنها دەكەوێت، گومانی تێدا نییە خاوەنەكەی دەخوات، ڕەشۆ(ڕەشوو) بۆ نەفستان شل مەكەن و چەقۆكانی لە خۆتان تیژ مەكەن، چونكە هەڵتان دەداتە دۆڵی تیاچوونەوە و فریوتان دەدات، ئارەزووەكانی ببڕن و ڕەشوو بۆ حەزەكانی شل مەكەن، خودایە لەسەر نەفسمان كۆمەكیمان بكە.

﴿رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ ﴿٢٠١﴾﴾ البقرة: ٢٠١

# مەجلیسی نۆزدەهەم

## ترسان لە خودا(عزوجل)

شەوی سێشەممە لە مەدرەسەکەی ١٨/ذي القعدة/٥٤٥هـ شێخ عبدالقادر(خودا لێی رازی بێت) فەرموویی:

حەق(عزوجل) شایستەی ئەوەیە لێی بترسی و رجات بۆ لای ئەو بێت گەر بەهەشت و ئاگریشی دروست نەکردبایە، گوێڕایەڵی خودا بکەن بۆ بەدەستهێنانی رووی پاکی خودا(عزوجل)، گوێڕایەڵی لێ بکەن لە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی و خۆگرتنەوە لە نەهیلێکراوەکان و ئارامگرتن لەسەر قەدەرەکانی، تەویە بکەن و بۆ لای ئەو(سبحانە وتعالی) بگەڕێنەوە، لەبەردەستیدا بگرین، بە فرمێسکی چاو و دڵتان زەلیلی بۆ دەربڕن، گریان عیبادەتە و زیادەیەکە لە دەربڕینی زەلیلی، گەر لەسەر تەوبە و نیێتی پاك و کاروکردەوەی چاك بمریت خودا(عزوجل) سوود و قازانجت پێ دەگەیەنێت و بۆ خۆی پاداشتی مەزلومان دەداتەوە، چونکە هیچ کەسێك نییە بەزەیی و سۆز بۆ گوێڕایەڵانی خۆی نیشان بدات جگە لە خودا، لە دونیا و دوارۆژدا خودات خۆشبوێت، خۆشەویستی ئەو بکە بە گرنگترین شت لەلات، هەر دەبێ خودات خۆشبوێت، چونکە ئەوە سوود و قازانج بە تۆ دەگەیەنێت، هەموو خەڵکی تۆیان بۆ خۆیان دەوێت، بەڵام حەق(عزوجل) تۆی بۆ خۆت دەوێت.

خەڵکینە، نەفسی نێوە بانگەشەی خواوەندی دەکات کەچی نێوە لێی بێئاگان، چونکە دەیەوێت زۆر لە خودا بکات، شتێکی دەوێت خودا نایەوێت، دوژمنەکەی خودا(شەیتانی نەفرەتلێکراو)ی خۆشدەوێت کە خودا خۆشیناوێت، کاتێك برپارە براوەکانی خودا رووی لێ دەکەن لەگەڵیان تەبا نییە و ئارام ناگرێت، بەڵکو بەرهەڵستی دەکات و ململانێ دەکات و لە خۆبادەست کردن هەواڵێکی نییە،

تەنها بە ناوی ئیسلام رازی بووە، ئەمەش سوودێکی پێ ناگەیەنێت و بە قازانج بەسەریدا ناشکێتەوە.

ئەی گەنج، پابەندی ترسان بە لە خودا و ئاوات مەخوازە تا بە خزمەتی پەروەردگارت دەگەی و پێیەکانی دڵ و نییەتت لەبەردەمیدا جێگیر دەبن و واژووی ئاسایش و دڵدەدان لەبەردەستیدا بەدەست دەهێنیت، ئەو کات دەتوانی خۆت لە ئاسایش و ئەماندا ببینیت، گەر ئەمانت پێ بدات خێرێکی زۆر لەلای ئەو دەبینییەوە، گەر ئەمانی پێدای ئارام و دامەزراو بە، چونکە گەر شتێکی بەخشی لێی پەشیمان نابێتەوە، گەر خودا(عزوجل) بەندەیەکی هەڵبژارد نزیکی دەکاتەوە، هەرکات ترس بە سەریدا زاڵ دەبێت شتێکی بۆ هەڵدەدات تاکو ئەو ترسەی بسڕێتەوە و دڵ و پەنهانی ئارام ببنەوە، ئەو شتەش لە نێوان ئەو و خودادایە(سبحانه وتعالی).

**هاوار بە حاڵت**، ئەی نەزان، پشت لە حەق(عزوجل) دەکەی و هەڵیدەدەیە پشتی دڵتەوە و خۆت سەرقاڵی خزمەتی خەڵکی دەکەی، خوداناسان بە خزمەتی حەقەوە(عزوجل) خۆیان سەرقاڵ کرد خوداش دڵی ئەوانی لە خۆی نزیک کردەوە، خۆی بە دڵیان دەناسێنێت، گەر یەکێك لەوان حەقی(عزوجل) ناسی و لە جەنگان دژ بە نەفس و ئارەزوو و سروشتی خۆی و شەیتانەکەی بوویەوە و رزگاری بوو لەوانە ئەوا خودا(عزوجل) لە دونیا دەروازەی نزیکی لە خۆی بۆ والا دەکات و کارێکی فێر دەکات پێیەوە سەرقاڵ بێت، ئەو کات پێی دەوترێت بگەڕێوە بۆ ئەو شوێنەی لێیەوە هاتوویت و خۆت بە خزمەت کردنی خەڵکیەوە(واتە بانگکردنیان بۆ لای حەق) سەرقاڵ بکە، ڕێگەیان بۆ لای ئێمە نیشان بدە، خزمەتی شاگردان و موریدانی-بۆ لای ئێمە- بکە، ئێوە بێناگان لەوەی خوداناسان تیایدا دەژین، لە بەیانییەوە هەتا ئێوارە لەپێناوی نەفسدا خۆتان ماندوو دەکەن، ئەو نەفسەی دوژمنی ئێوەیە، ژنەکانتان بە تووڕەکردنی خودا(عزوجل) لە خۆتان رازی دەکەن، زۆرێك لە خەڵکی رازیکردنی ژنەکانیان و منداڵەکانیان بەسەر رازی کردنی خودادا پێشدەخەن، من جووڵە و وەستانی تۆ دەبینم، هەر بەو جۆرە هەموو خەم و هەوڵێکت بۆ نەفس و ژن و منداڵ، کەچی لە حەق(عزوجل) هەواڵێکت نییە.

هاوار بە حاڵت، تۆ لە ریزی پیاوان سەرژمێر ناکرێیت، پیاوی تەواو پیاوەتی تەنها بۆ خودا(عزوجل) کار دەکات، هەردوو چاوی دڵت کوێربوونەتەوە و پاکێتی نهێنی و پەنهانت لەدەستداوە، لەخودا دابڕاوی و هەواڵێکت لێی نییە، بۆ ئەو مەبەستە یەکێك لە خوداناسان دەڵێت: وەیل بۆ ئەو بێبەش و دابڕاوانەی نازانن بێبەش و دابڕاون.

هاوار بە حاڵت، خۆراکەکەت وردە شووشەی تێدایە و دەیخۆیت و پێی نازانیت، ئەمەش بەهۆی زۆری هەڵپەی خواردن و زاڵبوونی حەز و ئارەزوو و سووربوونت بۆ هەڵلوشینی خواردنەوە.. دوای ماوەیەك گەدەت وێران دەکات، هەموو بەڵاکانت بەهۆی دوورییەوە لە خودا(عزوجل) و هەڵبژاردنی کەسانی تر بەسەر خودادا، گەر خەڵکی تاوتوێ بکەی و بیانناسیت رقت لێیان دەبێت و دروستکەری ئەوانت خۆشدەوێت، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((أخبر تقله-تاوتوێی بکە و بیناسە رقت لێی دەبێتەوە))[1].

تۆ بەبێ هەواڵی ئەقڵ خۆشەویستی و رق بەکاردەهێنیت، ئەقڵ هەواڵ دەدات، بەڵام تۆ ئەقڵت نییە، دڵ هەواڵ دەدات، بەڵام تۆ دڵت نییە، دڵ بیردەکاتەوە و دەهێنێتەوە بیری خۆی و ئامۆژگاری وەردەگرێت، خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُۥ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى ٱلسَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ ۝٣٧﴾ ق: ٣٧

ئەقڵ وەردەگەڕێت بۆ دڵ و دڵ وەردەگەڕێت بۆ نهێنی و نهێنی وەردەگەڕێت بۆ فەنا و فەناش وەردەگەڕێت بۆ بوون(وجود)، ئادەم و پێغەمبەران(علیهم السلام) حەز و رەغبەتیان هەبوو، بەڵام سەرپێچییان لە نەفسی خۆیان دەکرد و داوای رازیبوونی خودایان دەکرد، ئادەم(علیه السلام) تەنها یەك حەزی لە بەهەشتدا ئەنجامدا و تەنها یەك جار هەڵەی کرد و لە بەهەشتدا بوو، پاشان تەوبەی کرد و ئەگەڕایەوە سەر گوناهەکەی، حەزەکەشی پەسەند بوو، چونکە داوای دەکرد لە جیرانی خودادا بێنێتەوە و لێی جیانەبێتەوە، پێغەمبەران(علیهم السلام) بەردەوام سەرپێچییان لە نەفس و سروشت و حەزی خۆیان کردووە تا لەڕووی حەقیقەتەوە چوونەتە خانەی فریشتەکانەوە

[1] اخرجه ابو يعلى في مسنده والطبراني في "الكبير".

بەهۆی زۆری سەرپێچی و تێکۆشانیان دژ بە نەفس، پێغەمبەران و دۆستانی خودا نارام دەگرن، ئێوەش لە نارامگرتندا لەگەڵیان تەبا بن.

ئەی گەنج، تێبکۆشە و هەوڵبدە کەس ئازار نەدەی، و بەرانبەر هەمووان نییەتەکەت چاك و پاك بێت، مەگەر کەسێك شەرع فەرمانی کردووە بە سزادانی، ئەوکات ئازاردانی بۆ تۆ دەبێتە عیبادەت، لای کەسانی هۆشمەند و نەجیب و صادق نەفخی صوور لێدراوە و دوارۆژیان لەسەر نەفسی خۆیان هەستاندووە و بە خەم و هەوڵیان پشتیان لە دونیا کردووە و پەڕینەوە لەسەر پردی سیرات لەلایان بووە بە راستی، دڵی خۆیان هەلگرت و بردیان بۆ بەر دەرگای بەهەشت، لە رێگە رایان وەستاندن، ئەوانیش وتیان بەتەنها ناخۆین و ناخۆینەوە، چونکە کەسی بەخشندە بەتەنها خواردن ناخوات، لەو جێگەیەوە ئەوانیان گێڕایەوە بۆ دونیا، بۆ ئەوەی خەڵکی بانگ بکەن بۆ گوێڕایەڵی خودا(عزوجل) و هەواڵیان پێ بدەن بەوەی بینیویانە و کارەکەیان لەسەر ئاسان بکەن، هەرکەس ئیمانەکەی بەهێز بێت و لە یەقیندا دامەزراو بێت ئەوا هەموو ئەوەی خودا هەواڵی دەربارەی داوە -لە کاروبارەکانی دوارۆژ- بە دڵ دەیبینێت، بەهەشت و دۆزەخ و ئەوەی لەو دوانەدایە دەبینێت، دیمەنەکان و فریشتە بەرپرسەکان بەو دوو شوێنە دەبینێت، خەڵکی وەك کۆمەڵێك جەستەی مردووی ناو گۆڕ دەبینێت کە لەم دونیادا هاتووچۆ دەکەن، کاتێك بە پاڵ قەبرستانێکدا گوزەر دەکات هەست بەو نیعمەت و سزایە دەکات کە تێیدایە، دوارۆژ و ئەوەی تێیدایە لە وەستان دەبینێت، رەحمەتی خودا و سزای خودا(عزوجل) دەبینێت، پێغەمبەران و ئەبدال و ئەولیا و فریشتەکان بەپێی پلە و پایەی خۆیان دەبینێت، ئەهلی بەهەشت دەبینێت سەردانی یەکتری دەکەن، ئەهلی دۆزەخ دەبینێت لە نالە و هاواردان، هەر کەس سەرنجی دروست بێت بە چاوی سەر دروستکراوەکان دەبینێت و بە چاوی دڵیش کرداری خودا(عزوجل) تەماشا دەکات، جوولاندن و وەستاندنی خودا بۆ دروستکراوەکان دەبینێت، ئەمە بریتییە لە سەرنجی عیززەت لە دۆستانی خوداوە، ئەوانەی کاتێك تەماشای کەسێك دەکەن بە چاوی سەر رووالەتی دەبینن و بە چاوی دڵ ناوەوە و پەنهانی تەماشا دەکەن و بە چاوی نهێنیش مەولای ئەو سەرنج دەدەن، هەر کەس خزمەت بکات خزمەت دەکرێت،

کاتێك قەدەر رووی لێ دەکات لەگەڵی تەبایـە، هـەڵی دەگرێت بۆ وشکانی یـان بـۆ دەریا، بۆ دەشت و سارا یان بـۆ چیاکان، شـیرینی دەرخـوارد دەدات یـاخود تـاڵ، لـە عیززەت و زەلیلیدا، لە دەوڵەمەندی و هەژاریدا و لە لەشساغی و نەخۆشـیدا لەگـەڵی تەبایە، لەگەڵ قەدەر دەڕوات، کاتێك قەدەر دەزانێت کەسەکە ماندوو بووە دادەبەزێت و ئەو لە جێگەی خۆی سوار دەکات، ئەو کات کەسەکە سواری قەدەر دەبێت و قـەدەر دەبێتــە خزمــەتکاری ئـەو و بـۆی گەردنکـەچ دەبێـت بـەهۆی نزیکـی کەسـەکە لـە خوداوە(عزوجل) و رێز و پلە و پایەی لەلای ئەو، هەموو ئەوانەش بـەهۆی سەرپێچـی لە نەفس و ئارەزوو و سروشت و عادەت و شەیتان و دۆستی خراپ.

خودایە، لە هەموو بارێکدا تەباییمان پێ ببەخشە لەگەڵ قەدەری خۆت.

﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ حَسَنَةٗ وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ٢٠١﴾

البقرة: ٢٠١.



## مەجلیسی بیستەم

# گوفتار بەبێ کردار

بەیانی رۆژی هەینی لە مەدرەسەکەی، ٢١/ذي القعده/٥٤٥هـ، شێخ عبدالقادر(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی:

ئەی خەڵکی شار، دووڕوویی لە ناوتان زۆربووە و ئیخلاص کەمبووەتەوە، قسەی بێ کار زۆربووە، قسە بەبێ کردار هیچ بەهایەکی نییە، بەڵکو دەبێتە بەڵگە لەسەرتان نەك بەڵگە بۆتان، قسەی بێ کردار وەك خانوویەك وایە دەرگا و دەستشۆری تێدا نەبێت، گەنجینەیەکە لێی خەرج نەکرێت، بانگەشەیەکی بێ بەڵگەیە، وێنەیەکە بەبێ رۆح، بتێکە دوو دەست و دوو لاقی نییە و ناتوانێت دەستبوەشێنێت و بجووڵێت، زۆربەی کارەکانتان وەك جەستەیەکی بێ رۆح وان، رۆح بریتییە لە ئیخلاص و یەکتاپەرستی و دامەزران لەسەر کتێبەکەی خودا(عزوجل) و سوننەتی پێغەمبەرەکەی(ﷺ)، بێئاگامەبن وەرگەڕانێك لە خۆتاندا بکەن رێگەی راست دەگرنە بەر، فەرمانی خودا جێبەجێ بکەن و خۆتان لە نەهیلێکراوەکان بگرنەوە و لەگەڵ قەدەر تەبا بن، دانەدانەیەك لە خەڵکی دڵیان بە هۆگری و موشاهەدە و نزیکی لە خودا مەست دەبێت، بۆیە هەست بە نازاری قەدەرەکان و بەڵا و ناخۆشییەکان ناکەن، رۆژەکانی بەڵا بەسەریاندا گوزەر دەکات و تەواو دەبن، بەڵام ئەوان پێی نازانن، حەمدی خودا(عزوجل) دەکەن و شوکری بۆ دەردەبڕن، ئەوان وەك ئەوە وان بوونێکیان نەبێت تاکو بەرهەڵستی بڕیارەکانی خودا(عزوجل) نەکەن.

ئافەت و ناخۆشی بۆ سەر خودناسان دادەبارێت وەك چۆن بۆ سەر ئێوە دادەبارێت، هەیانە ئارام دەگرێت و هەیانە بەرز و بێئاگا دەبێت لە ئافەت و ناخۆشییەکە و ئارامگرتن لەسەری، هەست بە زیانکردن لەباری لاوازی ئیماندایە، ئەو کاتەی کە

ئیمان منداڵە، نارامگرتنیش بۆ کاتێکە ئیمان تازە لاو و هەرزەکارە، تەباییش لەگەڵ زیان و ئازار و ئافەتەکان کاتێکە ئیمان پێگەیشتووە، رازیبوونیش کاتێکە کەسەکە لە خودا نزیك بێت، بە زانستی خودا تەماشای پەروەردگاری(عزوجل) دەکات، بزربوون و فەناش کاتێکە دڵ و نهێنی لەلای حەق(عزوجل) بوونیان هەبێت، ئەوەش بریتییە لە حاڵەتی موشاهەدە و ئاخافتن لەگەڵ خودا، بەراورد بە خەڵکی ناوەوە و بوونی خۆی فەنا دەکات و دەیانسڕێتەوە، لە خزمەتی حەقدا(عزوجل) بوون پەیدا دەکات، ناوەوە و بوونی خۆی دەسڕێتەوە و دەتوێنەوە، توانەوەیەکی مەزن لەو شوێنە روودەدات، پاشان گەر خودا(عزوجل) بیەوێت ئەو کەسە دەناسێنێت، گەر بیەوێت دەیگێڕێتەوە و بەشە پارچە پارچەبووەکانی پێکەوە دەلکێنێت و کۆیان دەکاتەوە، وەك چۆن لە رۆژی دواییدا جەستەی مردوویان لەدوای پوان و رزان کۆدەکاتەوە، ئێسك و گۆشت و موویان کۆدەکاتەوە، پاشان فەرمان بە ئیسرافیل دەکات رۆحیان بەبەردا بکاتەوە، ئەمە لە پای دروستکراوەکان، بەڵام هێنانەوە(زیندووکردنەوە)ی ئەوانە بەبێ ناوەند و ئامرازە، سەرنجێك فەنایان دەکات و سەرنجێك دەیانهێنێتەوە، مەرجی خۆشەویستی ئەوەیە لەگەڵ خۆشەویستەکەت ویست(إرادة) بوونی نەبێت، و بە دونیا و دوارۆژ و خەڵکەوە لە ئەو بێئاگا نەبیت، خۆشەویستی خودا(عزوجل) ئاسان نییە تا هەموو کەسێك بانگەشەی بکات، زۆرن ئەوانەی بانگەشەی خۆشەویستی دەکەن و لێی دوورن، زۆرن ئەوانەی بانگەشەی ناکەن و دڵیان لەلایەتی، هیچ کەس لە موسڵمانان بەچاوی سووك تەماشا مەکە، چونکە نهێنییەکانی حەق(عزوجل) بەواندا چێنراوە، لە نەفسی خۆتاندا خاوەنی تەوازوع بن و بەسەر بەندەکانی خودادا لوتبەرزی مەنوێنن.

لە بێئاگاییەکانتان بەئاگا بێن، ئێوە لە بێئاگاییەکی مەزنـدان، وەك ئەوەی ئێوە دادگایی کرابن و لە پردی سیرات پەڕیبنەوە و شوێنی خۆتان لە بەهەشت بینیبێت، ئەم فریوخواردنە گەورەیە چییە ئێوەی تێکەوتووە، هەریەك لە ئێوە یاخیبوون و گوناهی زۆری بەرانبەر بە خودا ئەنجامداوە و بیری لێناکاتەوە و تەوبەی لێ ناکات، وا گومان دەبات گوناهەکان لەبیرچوونەتەوە، بەڵام ئەو گوناهانە لە لاپەڕەکاندا بە بەروار و رۆژ تۆمارکراون، لەسەر زۆر و کەمی ئەو گوناهانە دادگایی دەکرێن، بەئاگابێن ئەی

بێئاگایـــان، لـــه خـــەو بـــەئاگایێن ئـــەی خـــەوتووان، خۆتـــان بدەنـــە بـــەر ڕەحمـــەتی خودا(عزوجـل)، هەرکـەس گونـاه و هەڵـە و تێکەوتنـەکانی زۆر بـوون و لەسەریان سوور و بەردەوام بوو و تەوبەی نەکرد و پەشیمان نەبوویەوە ئەو کەسە بێباوەڕی ویستووە و بەوەوە بۆ لای خودا دەگەڕێتەوە گەر فریای خۆی نەکەوێت، ئەی ئەوانەی دونیاتان بەبێ دوارۆژ هەڵبژاردووە، خەڵکتان بەبێ خودا بەدۆست کردووە، لە هەژاری دەترسی و تەنها هیوات دەوڵەمەندییە.

**هاوار بە حاڵت**، ڕۆزی بەشکراوە و زۆر و کەم ناکات و پێشناکەوێ و دواناکەوێ، تۆ لە دەستەبەرکردن و دابینکردنی حەق(عزوجل) بۆ ڕۆزی شکت هەیە، هەڵپە دەکەی بۆ شتێك بۆت نەبڕاوەتەوە، هەڵپەکەت بووە بە ڕێگر لـە نـەهاتنت بـۆ لای زانایـان و کاری خێر و چاکە، دەترسی قازانجەکەت کەم بکات و کڕیارەکانت کەم ببنەوە.

**هاوار بە حاڵت**، کێ خۆراکی بە تۆ بەخشی کاتێك تۆ کۆرپەیـەك بـووی لـە سـکی دایکدا، تۆ شانت لەسەر هەوڵی خۆت و خەڵکی و دینار و درهەمەکانت داداوە، شانت لەسەر کڕین و فرۆشتن و دەسەڵاتداری شارەکەت داداوە، شـانت لەسـەر هـەر کەسێك دادابێت ئەو کەسە خواوەندی تۆیە، لە هـەر کـەس بترسـی و ڕجـات لای هـەبێت ئـەو کەسە خواوەندی تۆیە، هەرکەست لە زیان و قازانج بە خۆت بینییەوە و وا نەبینی ئەو شتانە لەسەر دەستی حەق(سبحانه وتعالى) جاری دەبـن ئـەوا ئـەو کەسـەت بـە خواوەنـد کردووە، بەو نزیکانە هەواڵی تۆش دەبیسترێ، خـودا(سبحانه وتعالى) بیسـتن و بینـین و تۆ وەردەگرێتەوە، پەیوەندی تۆ بە خەڵکییەوە دەبڕێت و دڵیان بەرانبەرت ڕەقت دەکات و دەستیان لە ئاشتت دەنوقێنێت و لە کارەکـەت کـەنارگیرت دەکـات و دەرگاکـان بـە ڕووی تۆدا دادەخات، و لە دەرگایەکەوە بـۆ دەرگایـەکی تـر دەردەکرێیـت، لوقمەیـەك خواردن و گەردیلەیە بەزەیی بە تۆ نابەخشن، گەر بانگی لێ بکەی وەڵامت ناداتـەوە، هەموو ئەوانە لەبەر هاوەڵدانان بۆ خودا و شانداداتت لەسەر کەسانی تر جگە لە خودا و داوای نیعمەت لە کەسانی تر و بەکارهێنانی نیعمەت لە یاخیبوونی خودادا، هەموو ئەمانە لەسەر زۆرینە لە خەڵکی دەبینرێن و لە یاخیبوواندا زۆرتر و زاڵترن، یەکێك بە

تەوبە فریای کارەکە دەکەوێت و خودا(عزوجل) تەوبەکەی وەردەگرێت و بە رەحمەتەوە تەماشای دەکات و بە لوتف بەخشندەیی خۆی مامەڵەی لەگەڵ دەکات، ئەی دروستکراوەکانی خودا تەوبە بکەن، ئەی زانایان، ئەی فەقیهان، ئەی زاهیدان، ئەی عابیدان هیچ کەس لە ئێوە نییە ئاتاج نەبێت بە تەوبە، هەواڵی ئێوە لەلای منە لە ژیان و مردنتان، گەر لای کەسە سەرەتاکان حاڵ و باری ئێوە ناڕوون بێت ئەوا تیاچوونی تۆ لای من پەردەی لەسەر لادراوە.

**ئەی دروستکراوانی خودا تەوبە بکەن**، ئەی زانایان، ئەی فەقیهان، ئەی زاهیدان، ئەی عابیدان، هەریەك لە ئێوە ئاتاجە بە تەوبە، هەواڵی ئێوە لەلای منە لە ژیان و لە مردنتان، گەر سەرەتای کاروبارتان لەلام نادیار و ئاڵۆز بێت ئەوا لە کۆتاییدا و لە کاتی مردنی ئێوەدا بۆم دەردەکەوێت، گەر بنەڕەتی ماڵ و سامانی یەکێك لە ئێوە لام شاراوە بوو، چاوەڕوانی چۆنێتی خەرجکردنی ئەو ماڵ و سامانە دەکەم، گەر خەرجی بۆ منداڵ و خانەوادە و هەژارانی راستەقینە کرد و لە بەرژەوەندی خەڵکدا بەکاریهێنا دەزانم بنەڕەتی ئەو ماڵ و سامانە لە حەڵاڵەوە هاتووە، گەر بەسەر صادیقاندا و ئەوانەی تایبەتانی خودان بەخشییەوە تێدەگەم بنچینە و بەدەستهێنانی ئەو ماڵ و سامانە بە پشتبەستن بووە بە خودا(عزوجل)، ئەو ماڵ و سامانەش بەرهەمی حەڵاڵە، من لە بازاڕ و کڕین و فرۆشتندا لەگەڵ ئێوە نیم، بەڵام بەم رێگەیە و بە چەندین رێگەی تر حەق(عزوجل) بۆمی رۆشن کردووەتەوە.

**ئەی گەنج**، ئاگاداربە حەق(عزوجل) کەسێکی تر لەناو دڵی تۆدا نەبینێت، چونکە رسوا و شەرمەزار دەبیت، ئاگاداربە ترس لە کەسێکی تر یان رجا لای کەسێکی تر یان خۆشەویستی بۆ کەسێکی تر لە دڵی تۆدا نەبینێت، دڵتان پاکبکەنەوە لە هەرچی شتە لەخوار خوداوە، زیان و قازانج تەنها لە ئەو(سبحانه وتعالى) ببینن، ئێوە لە خانە و میوانداری خودادان.

**ئەی گەنج**، هەموو ئەوەی تۆ دەیبینێت لە روخساری جوان و خۆشتدەوێن خۆشەویستییەکی ناتەواوە و تۆ لەسەریان سزا دەدرێیت، خۆشەویستی راستەقینەی نەگۆڕاو بریتییە لە خۆشەویستی خودا(عزوجل)، ئەو خۆشەویستییەی بە دوو چاوی دڵ

لە خۆشەویستی صادیقان و کەسە
دەیبینێت، ئەو خۆشەویستییە بریتییە لە خۆشەویستی بە ئیمانەوەیە، بەڵکو بە یەقین و چاوی دڵەوەیە،
ڕۆحانییەکان، ئەو خۆشەویستییەی بە نهێنییە بریتییە لە خۆشەویستی صادیقان و کەسە
پەردە لەسەر چاوی دڵیان لادراوە و ئەوەی لە پەنهاندایە دەیبینن، ئەوان شتێکیان
بینی کە ناتوانرێت گوزارشتی لێ بدرێت و لێکدانەوەی بۆ بکرێت.

خودایە، خۆشەویستی خۆت لەگەڵ لێبووردن و عافییەت بە ئێمە ببەخشە.

بەشەکانتان لەلای دونیا دانراوە بۆ کاتە دیاریکراوەکان لەلای حەقەوە(عزوجل)، هیچ
کەس ناتوانێت ڕێگری بکات لە رادەستکردنیان بە ئێوە کاتێک مۆڵەت لە خوداوە
دێت، دونیا بە خەڵکی پێدەکەنێت و ئەقڵیان بە سەرلێشێواو تەماشا دەکات و
گاڵتەیان پێ دەکات و پێیان پێدەکەنێت کاتێک داوای شتێك دەکەن بۆ ئەوان
نەبڕاوەتەوە، یان لە کەسێك داوای بەشێك دەکات بەبێ مۆڵەتی خودا(عزوجل).

خەڵکینە، گەر پشت لە دەروازەی دونیا بکەن و روو لە دەروازەی حەق(عزوجل)
بکەن دونیا دێتە دەرەوە و شوێنتان دەکەوێت، داوای ژیری لە خودا(عزوجل) بکەن،
کاتێك دونیا روو لە دۆستانی خودا دەکات پێیدەڵێن بڕۆ بە ڕێگەی خۆتەوە، بڕۆ
کەسانی تر فریو بدە، ئێمە تۆمان ناسیوە، تۆمان بینیوە و تاقیمان مەکەرەوە،
سەرئەنجامی تۆمان زانیوە، خۆت مەڕازێنەرەوە بۆ ئێمە، چونکە دینارەکانت ساختەن
و جوانییەکەت لەسەر پەیکەرێکی بێناوەڕۆکی تەختەیە و ڕۆحی تێدایە، تۆ رووالەتی
بەبێ مانا، دیمەنێکی بەبێ گوزارشت، دیمەن و گوزارشت بۆ دوارۆژە، کاتێک
ئەنگییەکانی دونیا بۆ خوداناسان بەدەرکەوتن لە خەڵکی خۆیان بزر کرد و هەڵهاتن،
نامۆییان لەوان بۆ دروست بوو و هۆگرییان بە دەشت و سارا و بیابان و وێرانە و
ئەشکەوت و جن و فریشتە گەڕۆکانی سەر زەوییەوە بۆ دروست بوو، جن و فریشتە
لەسەر شێوەی تر جیا لە شێوەی خۆیان روویان لێ دەکەن، هەندێ کات لە شێوەی
زاهیدان و راهیبان ریش هاتوو بۆیان دەردەکەون، هەروەها لە شێوەی دڕندەدا خۆیان
ئاشکرا دەکەن، لە هەر شێوەیەکدا بیانەوێت دەردەکەون، شێوە لەلای فریشتە و جن
وەك پۆشاکی هەڵواسراو وایە لەلای یەکێك لە ئێوە لە ماڵەکەیدا کامەیانی بوێت
لەبەری دەکات، موریدی راستگۆ لە ویستی حەقدا(عزوجل) لە سەرەتای ڕێگەی بەرەو

خوداچوونی لـه بینـینی دروسـتکراوەکان و بیسـتنی وشـەیەك لـە ئـەوان و بینـینی گەردیلەیەك لە دونیا سینەی تەسـك دەبێتـەوە، ناتوانێـت شـتێك لـە دروسـتکراوەکان ببینێت، دڵی سەرگەردان و ئەقڵی بزر و چاوی ئەبڵەق دەبێت گەر شتێك لەوانە لە دڵی خۆیدا ببینێت، ئەو بەردەوام بەو جۆرە دەبێت تا دەستی رەحمەت دەگاتـە سـەر دڵـی، ئەوکات سوکنایی و ئارامی رووی لێ دەکات، بەردەوام مەست و سەرخۆش دەبێت تـا بۆنی نزیکی و زانست و خۆشەویسـتی لـە پـەروەردگارەوە(عزوجل) دەکـات، ئـەوکات دامەزران و فراوانبوون بۆ خەلکی رووی لێ دەکـات، لـە خوداوە(عزوجـل) هێـزی پـێ دەبەخشرێت، بۆیە کۆڵی خەلکی هەڵدەگرێت بەبێ زۆرلەخۆکردن و تێچـوونێك، لێیـان نزیك دەبێتەوە و داوایان دەکات و هـەموو کاروبـاری بـۆ بەرژەوەنـدی ئەوانـە، لەگـەڵ ئـەوەش چـاوتروکانێك لــە پـەروەردگاری بێئاگـا نییـە، زوهدکـەری سـەرەتایی لـە زوهدەکەیدا لە خەلکی رادەکات، بەڵام زاهیدی کامڵ لە زوهدەکەیدا گوێ بە خـەلکی نادات، لێیان راناکـات، بـەلکو بەدوایانـدا دەڕوات، چونکە ئـەو بـووە بـە کەسـێکی خوداناس، هەر کەس خودا بناسێت لە هیچ شتێك راناکات و لە هیچ شتێك جگـە لـە خـودا ناترسـێت، کەسـی سـەرەتا لـە لادەران و یـاخیبووان هەڵـدێت، بـەڵام ئـەوەی گەیشتووەتە کۆتایی داوایان دەکات، چۆن داوایان ناکات لە کاتێکدا هەموو دەرمـانی دەردیان لەلای ئەوە، بۆ ئەو مەبەستە یەکێك لە عاریفان(رەحمـەتی خـودای لـێ بێـت) دەڵێـت: تـەنها عـاریف دەتوانێـت بـەرووی فاسـیق(لادەر)ەوە پێبکـەنێت، هەرکـەس مەعریفەکەی بۆ خودا کامڵ بوو دەبێتە رێنیشاندەر بۆ لای ئەو(سبحانه وتعالی)، دەبێتە تۆڕێك لە دەریای دونیـا خـەلکی پـێ راو دەکـات، هێزێکـی پـێ دەدرێـت ئیبلـیس و سەربازەکانی شکست پێ دەهێنێت، خەلکی لە دەستی شەیتان دەردەهێنێت، ئەی ئەو کەسەی بە زوهدەکەی گۆشەنشین بووە لەگـەڵ نـەزانی، وەرە و لـە مـن ببیسـتە: ئـەی زاهیدانی زەوی، وەرن، خەڵوەتگاکەتان بڕوخێنن و لە من نزیك ببنەوە، لە خەڵوەتگادا دانیشتوون بەبێ بنەڕەت و بنچینەیەك، ئێوە لـەناو هیچدان، وەرنـە پێشـەوە و بـەری حیکمەت بکەنەوە رەحمەتی خوداتان لێ بێت، هـاتنی ئێـوەم بـۆ خـۆم ناوێـت، بـەلکو هاتنەکەتان بۆ خۆتانە.

**ئەی گەنج**، پێویستە ماندوو بیت تا پیشەکە فێر دەبیت، هەزار جار بینا دەکەی و دەیڕوخێنی تا فێری ئەوە دەبیت شتێك بینا بکەی رووخانی بەسەردا نەیەت، گەر لە بیناکردن و رووخاندا فەنا بووی خودا(عزوجل) بینایەکت بۆ دروست دەکات کە رووخانی بەسەردا نایەت.

**خەڵکینە**، کەی ئاقڵ دەبن، کەی پەی بەوە دەبەن من هەنگاوی بۆ هەڵدەگرم، سەردانی موریدانی حەق(عزوجل) بکەن، کاتێك پێیان گەیشتن بە ماڵ و گیانتان خزمەتیان بکەن، موریدانی صادق بۆن و بەرامەی خۆشی خۆیان هەیە، نیشانەی ئاشکرای رووناکیان لەسەر روخسار هەیە، بەڵام ئافەتەکە لە ئێوەدایە، ئافەتەکە لە بینینی ئێوەدایە، لە تێگەیشتنی نەخۆشی ئێوەدایە، ئێوە "صدیق و زەندیق"تان بۆ جیاناکرێتەوە، حەڵاڵ و حەرام و ژەهراوی و خاوێن و هاوەڵدانەر و یەکتاپەرست و موخلیص و دووڕوو و یاخی و گوێڕایەڵتان پێ جیا ناکرێتەوە، ناتوانن موریدی حەق(عزوجل) لە موریدی خەڵك جیابکەنەوە، خزمەتی ئەو گەورەپیاوانە بکەن بە زانستەکەیان کار دەکەن تاکو شتەکانتان وەك پێویست فێربکەن، لە ناسینی حەقدا(عزوجل) تێبکۆشن، چونکە گەر ئەوتان ناسی هەرچی شتی تر جگە لە ئەو دەناسن، یەکەمجار بیناسن و پاشان خۆشتان بوێت، گەر بە چاوی سەرتان تەماشای شتەکان دەکەن ئەوا بە چاوی دڵ سەرنجی ئەو(سبحانه وتعالى) بدەن، گەر نیعمەتەکان لە خودا بناسن بەناچاری خۆشتان دەوێت، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((خوداتان خۆشبوێت بۆ ئەو نیعمەتانەی دەرخواردی ئێوەی دەدات، منیشتان بە خۆشەویستی خوداوە(عزوجل) بۆ من خۆشبوێت))[1].

**خەڵکینە**، خودا نیعمەتی خۆی دەرخواردی ئێوە داوە لە کاتێکدا ئێوە لە سکی دایکاندا بوون، هەر بەو جۆرە دوای لەدایکبوونتان، پاشان تەندروستی و لەشساغی و هێز و جووڵەی پێ بەخشین، لە گوێڕایەڵی خۆی بێبەشی نەکردن، ئێوەی کرد بە موسڵمان و شوێنکەوتەی پێغەمبەرەکەی(ﷺ)، شوکرکردن و خۆشەویستی ئەو

[1] رواه الترمذي والبيهقي في "الشعب" والحاكم وصححه، و وافقه الذهبي.

پێغەمبەرە(ﷺ) وەك شوكركردن و خۆشەویستی خودا وایە، گەر نیعمەت لە خوداوە ببینن خۆشەویستی خەڵكی لە دڵتان دەردەچێت، كەسی عاریف بە خودا و خۆشەویستی ئەو و تەماشاكەری بە دوو چاوی دڵ-كە چاكە و خراپە لە ئەوەوە دەبینێت- هیچ سەرنجێكی نامێنێت بۆ ئەو كەسانەی چاكەی لەگەڵ دەكەن یاخود خراپەی لەگەڵ دەكەن، گەر چاكەی لێ بینین بە رامهێنانی خودا(عزوجل) تەماشای دەكات، گەر خراپەی لێ بینین بە زاڵكردنی ئەو(سبحانه وتعالى) تەماشای دەكات، سەرنجی لە خەڵكەوە بۆ خودا دەگوێزێتەوە، لەگەڵ ئەوەش حەقی شەرع دەدات و حوكمەكانی بەرنادات‌ەوە، بەردەوام دڵی عاریف لە حاڵەتێكەوە بۆ حاڵەتێكی تر دەگوێزێتەوە تا زوهدەكەی لە خەڵكی و دەستبەرداربوون لێیان و پشتتێكردنیان بەهێز دەبێت و رەغبەتی بۆ لای حق(عزوجل) بۆ دروست دەبێت و تەوەكولەكەی لەسەر خودا بەهێز دەبێت، وەرگرتنی شت لە خەڵكی لێ دەڕوات و نامێنێت، لە كاتی وەرگرتنی شتێك لە خەڵكی لەگەڵ دەستی خودا(عزوجل) دەمێنێتەوە، ئەقڵی هاوبەشی لە نێوان ئەو و خەڵكیدا دڵنیای دەكاتەوە و پشتیوانی لێ دەكات و نەقڵێكی تری بۆ زیاد دەبێت كە بریتییە لە نەقڵێك لە خوداوە(عزوجل)، ئەی هەژاری دەرگای خەڵكی، ئەی ئەو كەسەی بەوان هاوبەشت بۆ خودا داناوە، وریابە مردن رووت لێ دەكات و تۆ لەسەر ئەوەی كە ئێستا لەسەری دەژی، خودا دەرگای خۆی بۆ رۆحەكەت ناكاتەوە و تەماشای رۆحەكەت ناكات، چونكە ئەو(سبحانه وتعالى) لە هەموو هاوەڵدانەران و شانادەران بۆ سەر خەڵكی تووڕەیە، لە نەفست گۆشەنشین ببە، پاشان لە خەڵكی گۆشەنشین ببە، پاشان لە دونیا گۆشەنشین ببە، پاشان لە دوارۆژ گۆشەنشین ببە، پاشان لە هەرچی شتە جگە لە مەولا(عزوجل) گۆشەنشین ببە، گەر دەتەوێ لەگەڵ مەولا(عزوجل) تەنهابكەویت ئەوا لە بوونی خۆت و تەگبیر و وڕێنە و ژاوەژاوی خۆت وازبهێنە.

هەژار بە حاڵەت، لە خەلوەتگاكەت دانیشتووی و دڵت لە ماڵی خەڵكییە و چاوەڕوانی هاتن و هەدیەكانیان دەكەی، عومری خۆت بەفیڕۆ دەدەی، وێنەیەكی رووالەتی پێمانای بۆ دروست كردووی، خۆت شایستە مەكە بە شتێك خودا(عزوجل)

لە خوداوە بۆ نەیەت تۆ و هەموو شایستەی نەکردبیت پێی، گەر شایستەبوونت لە خوداوە بۆ نەیەت تۆ و هەموو

شایستەی نەکردبیت پێی، گەر خودا تۆی بۆ کارێك بوێت ئامادەت دەکات، خەلکی تواناتان بەسەریدا نابێت، گەر خاوەنی پەنهانێکی دروست و دڵێکی خاڵی نەبیت خەڵوەتکردن و کەنارگیربوون لە خەڵکە سوودێك بە تۆ ناگەیەنێت، خودایە، سوودم پێبگەیەنە بەوەی دەیلێم، و هەرچی سوود بەوانیش بگەیەنە بەوەی دەیلێم و دەیبیستن.



# مەجلیسی بیست و یەك

## لانەکردنەوە بەلای دروستکراواندا

شەوی سێشەممە لە مەدرەسەکەی ٢٥/ذي القعدة/٥٤٥ھ شێخ عبدالقادر(خودا لێی رازی بێت) فەرموی:

دونیا پەردەیەکە بۆ دوارِۆژ، دوارِۆژیش پەردەیەکە بۆ پەروەردگاری دونیا و دوارِۆژ، هەرچی دروستکراوە پەردەن بۆ دروستکەر(عزوجل)، گەر لەپایان بوەستی دەبنە پەردەی نێوان تۆ و خودا، لامەکەرەوە بەلای خەڵك و دونیا و هەر شتێکی تر جگە لە حەق(عزوجل) تا دەگەیە دەرگای حەق(عزوجل)، ئەوەش بە هەنگاوی نهێنی(السر) خۆت و دروستی زوهدەکەت لە هەرچی شتە جگە لە ئەو(سبحانه وتعالى)، لە هەموو شتێك رووت ببەرەوە، عەودالّی خودا بە، پەنای بۆ ببە، کۆمەکی لێ وەربگرە، تەماشای پێشینە زانست و پێشینە بڕیاری بکە، کاتێك گەیشتنی دڵ و نهێنیت هاتە دی و چوونە ژوورەوە بۆ خزمەتی و نزیکی کردییەوە و بەخێرهاتنی کردی و تۆی کرد بە سەرپەرشتیاری دڵان، و فەرمانکەر بە سەریاندا و بوون بە پزیشك بۆیان ئەوکات لا بەلای خەڵکی و دونیادا بکەرەوە، ئەوکات لاکردنەوەکەت دەبێتە نیعمەت بۆ ئەوان، و وەرگرتنی دونیا لەدەستیان و پێدانی بە هەژاران، هەر بەو جۆرە وەرگرتنی بەشی خۆت لە دونیا دەبێتە عیبادەت و گوێڕایەڵی و سەلامەتی، هەرکەس دونیا بەم سیفەتە وەربگرێت زیانی پێ ناگەیەنێت، بەڵکو لێی سەلامەت دەبێت و بەشەکەی لە بۆگەنی و لێڵی دونیا پاك و پاڵفتە دەبێت، ویلایەت لە روخساری ئەولیادا نیشانەی هەیە، ئەهلی فیراسەت دەیناسنەوە، ناماژەکان باسی ویلایەت دەکەن نەك زمان، هەرکەس رزگاری دەوێت با ئەفسی خۆی و ئەوەی هەیەتی بە حەق(عزوجل) ببەخشێت، بە دڵ لە

خەلك و دونیا بێتە دەرەوە، وەك چۆن موویەك لە هەویر یان لە ماست دەهێنیتە دەرەوە، هەر بەو جۆرە هاتنە دەرەوە لە دوارۆژ، بەهەمان شێوە هاتنە دەرەوە لە هەرچی شتە جگە لە خودا(عزوجل)، ئەوكات مافی هەموو خاوەن مافێك دەدەی، لەبەردەستی خودادا بەشی خۆت لە دونیا و دوارۆژ وەردەگریت، تۆ لە دەرگای خودادای و بەشی دونیا و دوارۆژیش بە پێوە وەك دوو خزمەتكار راوەستاون، بەشی خۆت لە دونیا مەخۆ لە كاتێكدا ئەو دانیشتووە و تۆ بە پێوە وەستاوی، بەلكو لە دەرگای مەلیك وەریبگرە و تۆ دانیشتووی و ئەو بەپێوە وەستاوە و سینییەك لەسەر سەری دانراوە و خزمەتی ئەو كەسانەی پێ دەكات لەبەر دەرگای خودا راوەستاون، ئەو كەسەی لە دەرگای دونیا رادەوەستێ زەلیلی دەكات، لە دەوڵەمەندی و عیززەت بە حەقەوە(عزوجل) لە دونیا بخۆ، خوداناسان رازیبوون بە خودا با لە دونیادا مایەپووچ بن، هەر بەو جۆرە بە خودا رازی بوون بەوەی لە خۆی ئەوان نزیك بكاتەوە بەرانبەر بە دوارۆژ، تەنها خودا داوا دەكەن لە خودا، زانییان دونیا بەشكراوە، بۆیە داوای بەشی دونیایان وازلێهێنا، زانییان پلەكانی دوارۆژ و نیعمەتەكانی بەهەشت بەشكراون بۆیە داوای ئەوانە و كاركردن بۆیان وازلێهێنا، ئەوان تەنها رووی پاكی خودایان دەوێت، كاتێك دەچنە بەهەشتەوە چاو ناكەنەوە تا نووری رووی پاكی خودا نەبینن، دارنینی سیفەتە ناتەواوەكان و تەنهاكردنەوەی خودا بە سیفەتەكانی كەماڵ كاری خوداناسانە، هەركەس دڵی لە خەلكی و هۆ(سبب) دانەرنیبێت ناتوانێت شارێگەی پێغەمبەران و صادیقان و صالحان بگرێتە بەر، دەبێت بە كەمێك لە دونیا قەناعەت بكات و زۆرێك گەر لە حەقەوە(عزوجل) زۆرێك لە دونیا رووی لێكردی بەبێ ویست و هەڵبژاردنی خۆت ئەوە تۆ تیایدا پارێزراو دەبیت.

لە حەسەنی بەصرییەوە(خودا لێی رازی بێت) دەیفەرموو: بە زانست و قسەكانت ئامۆژگاری خەلكی بكە، ئەی ئامۆژگاریكەر بە پاكێتی نهێنی و تەقوای دڵت ئامۆژگاری خەلكی بكە، بە جوانی و رازاوەیی ئاشكرا و ناشیرینی ناوەوەت

ئامۆژگاری خەڵکی مەکە، حەق(عزوجل) ئیمانی لە دڵی باوەڕدارانـدا نووسـیوە بـەر لەوەی دروستیان بکات، ئەمە پێشینەیەکە و دروست نییە لـەپای پێشـینە بوەسـتین و شانی لەسەر دابدەین، بەڵکو تێدەکۆشێت و خۆی دەخاتە بەر ڕەحمەتی خودا و هـەوڵی خۆی دەدات، هەوڵی بەدەستهێنانی ئیمان و یەقین دەدات و خۆی دەخاتە بـەر بـەزەیی حـەق(عزوجل)، بـەردەوام لەبـەر دەرگانـەی خـودا دەمێنێتـەوە، بۆیـە دڵمـان بـۆ بەدەستهێنانی ئیمان تێدەکۆشێت، بەڵکو حەق(عزوجل) پێمان ببەخشێت بەبێ کەسپ و ماندوویوونی ئێمـە، ئێـوە شـەرم ناکـەن، حـەق(عزوجل) زاتـی خـۆی بـە کۆمـەڵێك سیفەت وەسف دەکات و پێیان ڕازییە کەچی ئێوە تەئویلی دەکەن و دەیدەنەوە بەڕووی خودادا؟ ئایـا ئـەوەی بـۆ هـاوەڵان و شـوێنکەوتوان بـەس بـوو بۆ ئێـوە بـەس نییـە؟ پـەروەردگارمان(عزوجل) لەسـەر عەرشـە وەك چـۆن فەرموویـەتی بـەبێ چـواندن و پەکخستن و بەرجەستاندن[1].

خودایە، ڕۆزیمان پێ ببەخشـە، و سـەرکەوتوومان بکـە و لـە بیدعـەکاری دوورمـان بخەرەوە.

﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾﴾

البقرة: ٢٠١



[1] (من غير تشبيه ولا تعطيل ولا تجسيم).

# مەجلیسی بیست و دوو

## دەرچوونی خۆشەویستی دونیا لە دڵ

بەیانی دواین رۆژی ذي القعدة/ ٥٤٥ھ لە "الرباط" فەرمووی:

**کەسێك پرسیاری کردووە: چۆن خۆشەویستی دونیا لە دڵم دەربکەم؟**

**دەڵێم:** تەماشای ئەرباب و رۆڵەکانی دونیا بکە چۆن دەیانگوێزێتەوە، چۆن فێڵیان لێ دەکات و فریویان دەدات و بێئاگایان دەکات و دەستدرێژییان پێ دەکاتە سەر خەلکی و پلە بە پلە بەرزیان دەکاتەوە تا بەسەر خەلکیدا باڵایان دەکات و دەچنە کۆڵ و گەردنی خەلکی و گەنجینە و سەیروسەمەرەی خۆییان بۆ دەردەخات، لە کاتێکدا ئەوان دڵخۆشن بە بەرزبوونەوە و دامەزران و ژیان خۆشی و خزمەتکاری بۆیان لەناکاو دەیانگرێت و کۆتوبەندیان دەکات و چاوبەستیان لێ دەکات و لەو شوێنە بەرزەوە بەسەر سەردا هەڵیاندەداتە خوارەوە و پارچە پارچە دەبن و تیادەچن، دونیاش بەپێوە وەستاوە و پێیان پێدەکەنێت و ئیبلیس لە تەنیشتی دونیاوە وەستاوە و لەگەڵی قاقا دەکێشێت، ئەمە کاری دونیایە لەگەڵ زۆرێك لە سوڵتان و مەلیك و دەوڵەمەندان لە ئادەمەوە(علیه السلام) تا رۆژی دوایی، بەم جۆرە خەلکی بەرزدەکاتەوە و پاشان بەریاندەداتەوە، پێشیان دەخات و پاشان دوایان دەخات، دەوڵەمەندیان دەکات و پاشان هەژاریان دەخات، نزیکیان دەکاتەوە و پاشان سەریان دەبەڕێنێت، کەمێکی زۆر کەم لە خەلکی لە دونیا سەلامەت دەبن و زاڵ دەبن بەسەر دونیادا و ناهێڵێت دونیا زاڵ ببێت بەسەریدا، کەمێکی زۆر کەم یارمەتی دەدرێن و لە شەڕەکەی سەلامەت دەبن، ئەوانە دانەدانەیەکی خەلکین، ئەو کەسەی دونیا دەناسێت و خۆی لێ دەپارێزێ و لە فێڵ و فریودانی بەئاگایە لە شەڕەکەی سەلامەت دەبێت، ئەی پرسیارکەر، گەر بە دوو چاوی دڵت لە ئەنگییەکانی دونیا

وردبییەوە دەتوانیت دونیا لە دڵ دەربکەی، بەڵام گەر بە دوو چاوی سەرت تەماشای بکەی خۆت بە جوانی و زرق و برقی دونیاوە خەریك دەكەی و نەنگییەكانی نابینی، ئەوكات ناتوانی لە دڵ دەریبکەی و زوهدی لێ بکەی، بۆیە چۆن کەسانی تری کوشت تۆش دەکوژێت، لەگەڵ نەفسی خۆت تێبکۆشە تا دەگاتە دڵنیایی و ئارامی، کاتێك دڵنیا و ئارام بوو نەنگییەکانی دونیا دەناسێت و زوهدی لێ دەکات، دڵنیاییەکەی نەفس لەو شوێنەوەیە لە دڵەوە وەردەگرێت و تەبایی هەیە لەگەڵ نهێنی خۆیدا، گوێڕایەڵی دڵ و نهێنی دەکات لەوەی فەرمانی پێدەکەن و نەهی لێ دەکەن، بە پێدان و بەخشینی ئەو دوانە رازی بووە و لەو شتانەی رێگری لێ دەکەن خۆی دەگرێتەوە، گەر نەفس دڵنیایی و ئارامی بەدەستهێنا خۆی دەداتە پاڵ دڵ و لەلای ئەو سوکنایی بۆ دێت، تاجی تەقوا و پۆشاکی نزیکی لە خودا لەسەر سەری و لەبەریدا دەبینێت، ئیمان و بەڕاستزانین(تصدیق) بەدەست بهێنن و لە بەدرۆزانینی خوداناسان و مرجادەلە لەگەڵیان خۆتان بەدوور بگرن، ململانێ و کێبەرکێیان لەگەڵ مەکەن، چونکە ئەوانە مەلیکی دونیا و دوارۆژن، نزیکییان لە خوداوە بەدەستهێنا، بۆیە هەرچی شتە لە خوار خوداوە بەدەستیان هێنا، خودا(عزوجل) دڵی ئەوانی دەوڵەمەند کرد و لە نزیکی خۆی و هۆگری پێیەوە لێوانلێوی کرد، هەر بەو جۆرە لێوانلێوبوون لە ئەنوار و رێز و پلە و پایەی خودایی، گوێ بەوە نادەن دونیا بە دەستی کێوەیە و کێ دەیخوات و تەماشای سەرەتای دونیا ناکەن، بەڵکو سەرنجی سەرئەنجامەکەی و تیاچوونەکەی دەدەن، حەق لەبەردەم چاوی نهێنی خۆیاندا دادەنێن، لە ترسی تیاچوون و رجا بۆ موڵك و ماڵێك خودا بۆ ئەوانی دروستکردووە خودا ناپەرستن، بەڵکو بۆ بەردەوامی هاوەڵیکردنی خودا ئەو دەپەرستن، ئەو کۆمەڵێك شت دروست دەکات نێوە نایزانن، ئەو(سبحانە وتعالی) کارایە بۆ ئەنجامدانی ئەو کارەی دەیەوێت، ((دووڕوو کاتێك قسە دەکات درۆ دەکات و کاتێك بەڵێن دەدات نایباتە سەر و کاتێك ئەمانەتی لا دادەنرێت ناپاکی لێ دەکات))[1] هەر کەس لەم خەسڵەتانە -کە پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی پێکردوون پاکبێتەوە- ئەوا لە دووڕوویی پاکبووەتەوە.

---

[1] صحیح رواه البخاري ومسلم

ئەم خەسڵەتانە سەنگی مەحەكن و جیاكاری نێوان باوەڕدار و بێباوەڕن، ئەم سەنگی مەحەك و ئاوێنەیە لەدەستبگرە و رووی دڵی خۆتی پێ ببینە، سەرنج بدە بزانە تۆ باوەڕداری یان دووڕوو، یەكتاپەرستی یان هاوەڵدانەر، هەموو دونیا فیتنە و سەرقاڵكەرە مەگەر ئەوەندەی بە نییەتی باش لە پێناوی دوارۆژدا دەستی بۆ ببرێت، گەر نییەت لە دەستبردن بۆ دونیا چاك و پاك بوو ئەوا بۆی دەبێتە كارێكی دوارۆژ، هەر نیعمەتێك خاڵی بێت لە شوكر بۆ حەق(عزوجل) دەگۆڕێت بۆ نەقمەت(تاڵاوی سزا)، بە شوكردن نیعمەتەكانی خودا(عزوجل) رابگرن، **شوكركردنی حەق(عزوجل)** دوو شتە:

یەكەم: بەكارهێنانی نیعمەتەكە لە گوێڕایەڵی خودادا و دڵنەوایی كردنی هەژاران بەو نیعمەتە.

دووەم: دانپیادانان بە نیعمەتەكەدا بەوەی بۆ خاوەن نیعمەتەكە(خودا) دەگەڕێتەوە و شوكركردنی ئەو كەسەی دایبەزاندووە، ئەو كەسەش بریتییە لە حەق(عزوجل).

لە یەكێك لە خوداناسانەوە(رەحمەتی خودای لێ بێت) فەرموویەتی: هەر شتێك لە خودا(عزوجل) سەرقاڵت بكات ئەو شتە دەبێتە شوومی لەسەرت، گەر بوو بە هۆی سەرقاڵ كردنت لە یادی خودا ئەو شتە لەسەر تۆ شوومی و خراپییە، تۆ بە یاخیبوون رووبەڕووی نیعمەتەكانی خودا دەبییەوە و لە كاروبارەكاندا بۆ لای خەڵكانی تر دەگەڕێیەوە، درۆ و دووڕوویی لە جوڵە و وەستان و رووالەت و مانای تۆدا شەو و رۆژ بنجی داكوتیوە، شەیتان فێڵی لێكردووی و درۆ و كاری ناشیرینی لا جوان كردووی، تەنانەت لە نوێژەكەتدا درۆ دەكەی كاتێك دەڵێیت: "الله أكبر"، درۆ دەكەی، چونكە خواوەندێكی ترت لە دڵ داناوە، تۆ تەنها پشتت بە خواوەندەكەی خۆت بەستووە، ترس و رجات لە خواوەندەكەی خۆتە، دڵت لەگەڵ زمانت تەبا نییە، كردارەكانت لەگەڵ قسەكانت پێكنایەنەوە، هەزار جار بە دڵ بڵێ "الله أكبر" و تەنها یەك جار بە زمان بیڵێ، تۆ شەرم ناكەی دەڵێی "لا إله إلا الله" و هەزار پەرستراوی ترت هەیە، لە هەموو ئەوەی تۆی تێكەوتووە تەوبە بكە، ئەی ئەو كەسەی زانست دەزانیت -و تەنها بە ناوەكەی و بەبێ كاركردن قەناعەتت كردووە- زانستەكەت چ سوودێكت پێ دەگەیەنێت؟

گەر بڵێی من زانام درۆت کردووە، چۆن لە نەفسی خۆت رازی دەبیت فەرمان بە شتێك بکات بە خەلکانی تر کە خۆت ئەنجامی نادەی، خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ۝٢﴾ الصف: ٢

**هاوار بە حاڵت**، فەرمان دەکەی بە خەلکی راستگۆبن کەچی خۆت درۆ دەکەی، فەرمانیان پێ دەکەی بە یەکتاپەرستی کەچی خۆت هاوەڵدانەری، فەرمانیان پێ دەکەی بە ئیخلاص کەچی خۆت رووپامایی و دووڕوویی بەخەرج دەدەی، فەرمانیان پێ دەکەی واز لە گوناه و یاخیبوون بهێنن خۆت ئەنجامی دەدەی، حەیا و شەرم لە چاوت هەلگیراوە، گەر ئیمانت هەبوایە شەرمت دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((حەیا لە ئیمانەوەیە))[1].

نە ئیمانت هەیە و نە یەقین و نە ئەمانەت، ناپاکیت لە زانست کرد و ئەمانەتت لەدەستدا و لەلای خودا بە ناپاك تۆمارکرای، تەنها تەوبەکردن و بەردەوامی لەسەری دەوای دەردی تۆیە، هەر کەس ئیمانی بە خودا و قەدەری خودا راست و دروست بێت هەموو کاروبارەکانی رادەستی ئەو دەکات و لە کارێك لەو کارانەدا هاوەڵی بۆ دانانێت، بە دروستکراوەکان و هۆکارەکان هاوەڵ بۆ خودا دامەنێ، پێیانەوە کۆتوبەند ببیت و لە خودا بێئاگا ببیت، گەر کەسەکە لەمانەدا سەرکەوتوو بوو لە هەموو بارێکدا لە ئافەت سەلامەت دەبێت، پاشان لە ئیمانەوە بەرەو یەقین دەگوێزێتەوە، پاشان ویلایەتی ئەبدالی بۆ دێت، ئەوجا ویلایەتی پەنهان(غەیبییەت)ی بۆ دێت، لەوانەیە لە کۆتایی حاڵەکانیدا ویلایەتی قوتبی بۆ بێت[2]، خودا لەلای هەموو دروستکراوەکانی -لە مرۆڤ و جین و فریشتە و رۆحەکان- شانازی پێوە دەکات، راوەستاوی دەکات و نزیکی دەکاتەوە و دەیکاتە سەرپەرشتیاری دروستکراوەکانی و موڵك و دەسەڵاتی پێ دەدات و دامەزراوی دەکات و خۆشی دەوێت و لەلای دروستکراوەکانی خۆشەویستی دەکات، هەموو ئەمانە بنچینە و بناغە و سەرەتای ئەو

---

[1] صحیح، رواه البخاري ومسلم.

[2] (س: بلەی یەك لەدوای یەکن لە ویلایەت).

کەسەیە، ئیمان بە خودا و بە پێغەمبەرانی و بەڕاستزانینیان بنچینەی ئەم کارەیە، ئیسلام پاشان ئیمان پاشان کردار بە کتێبەکەی خودا(عزوجل) و شەریعەتی پێغەمبەرەکەی(ﷺ)، پاشان ئیخلاص لە کرداردا لەگەڵ یەکتاپەرستی دڵ لەباری کەماڵی باوەڕدا، باوەڕدار لە خۆی و لە کردارەکانی و لە هەر شتێکی تر جگە لە حەق(عزوجل) فانی دەبێت، کۆمەڵێك کردار ئەنجام دەدات لێیان کەنارگیرە، بەردەوام دژ بە نەفسی خۆی لە کۆشاندایە و لە پێناوی حەقدا(عزوجل) لاکردنەوەی بە لای خەلکدا نییە، تا خودا هیدایەتی دا بۆ سەر رێگەی خۆی، خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿ وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ﴾العنكبوت: ٦٩

لە شتەکان زاهید بن و بە تەگبیرکردنی خودا رازی بن، ئەو(سبحانه وتعالى) لە دەستی قەدەری خۆیدا وەریاندەگێرێت، گەر لەو قەدەرانەدا لەگەڵی تەبابوون دەیانگوێزێتەوە بۆ قودرەتی خۆی، خۆشبەختی بۆ کەسێك تەبایی هەیە لەگەڵ قەدەردا، و چاوەڕوانی کرداری قەدەرداڕێژ(خودا) دەکات، بە قەدەر کار دەکات و لەگەڵ قەدەر دەڕوات و ناشوکری بۆ نیعمەتی قەدەرەکان دەرنابڕێت، بەڵگەی بەزەیی نیعمەتی قەدەرداڕێژ بریتییە لە نزیکی لە خودا و بێنیازبوون بە ئەوەوە لە هەرچی دروستکراوە، گەر دڵی بەندە بە پەروەردگاری گەیشت بەو گەیشتنە لە هەرچی خەلکە بێنیازە دەبێت، نزیکی دەکاتەوە و دامەزراوی دەکات و دەیکاتە خاوەنی مولك و پێی دەفەرموێت:

﴿ إِنَّكَ الْيَوْمَ لَدَيْنَا مَكِينٌ أَمِينٌ ﴾ یوسف: ٥٤

لە مولکی خۆیدا دەیکاتە جێنشین وەك چۆن مەلیکی مصر یوسوفی(عليه السلام) کردە جێنشین و کاروباری مولکەکەی رادەست کرد و پیاوانی دیوان و بەڕێوەبردنی مەملەکەت و هۆکارەکانی دایە دەست و کردی بە ئەمیندار لەسەر گەنجینەکانی وڵات، دڵیش هەمان شێوەیە، کاتێك راست و دروست لێی دەوەستێت و جوانی و پایەداری ئەو دەردەکەوێ و لە هەرچی شتە جگە لە مەولا(عزوجل) خۆی پاك دەکاتەوە لە دڵی بەندەکانیدا و لە مەملەکەتەکەیدا -لە دونیا و دوارۆژ- دامەزراوی دەکات، ئەو کات دەبێتە رووگەی موریدان، رێگەی گەیشتن بەم زانستە بریتییە لە

زانست بە زانستی ئاشکرا(شەریعەت)، خۆت لەسەر بێکاری و تەمبەڵی رامەهێنە و لە گوێڕایەڵی خودا(عزوجل) خۆت بەدوور مەگرە، چونکە وەك سزایەك تاقیتدەکاتەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: ((گەر بەندە لە کاردا کەمتەرخەمی کرد خودا بە خەم و پەژارە دایدەگرێتەوە(تاقیدەکاتەوە)))[1].

خودا بە خەم و پەژارەی شتێك دایدەگرێتەوە کە بەشی ئەو نییە، هەر بەو جۆرە خەم و پەژارەی ماڵ و منداڵ و ئازاری خانەوادە و کەمی قازانج لە زیندەگیدا و یاخیبوونی منداڵ لە ئەو و بێزاری ژنەکەی لێی، روو لە هەر کوێیەك دەکات رووبەڕووی هەموو ئەوانە دەبێتەوە بەهۆی کەمتەرخەمییەکەیەوە لە گوێڕایەڵی کردنی خودا و سەرقاڵبوون بە دونیا و خەڵکەوە، خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿ مَّا يَفْعَلُ اللَّهُ بِعَذَابِكُمْ إِن شَكَرْتُمْ وَآمَنتُمْ ﴾النساء: ١٤٧

بۆ هیچ کەسێك دروست نییە بەڵگە بە قەزا و قەدەری خودا بهێنێتەوە و بڵێت خودا کارەکان تاوتوێ دەکات و بڕیارەکانی دەرکردووە:

﴿ لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾ الأنبياء: ٢٣

**هاوار بە حاڵت**، تاکەی بە خۆت و خانەوادەی خۆتەوە خۆت سەرقاڵ دەکەی و خودا لەیاد دەکەی، لە یەکێك لە خوداناسانەوە(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت: گەر منداڵەکەت فێری ئەوە بوو ناوکە خورما کۆبکاتەوە ئیتر پشتی لێ بکە و بە نەفسی خۆتەوە لەگەڵ پەروەردگارت(عزوجل) سەرقاڵ ببە، مەبەستی ئەوەیە گەر منداڵەکە زانی ناوکەخورما بۆ شتێك باشە و نرخێکی هەیە ئەوا کەسابەت فێربووە و بۆ ژیانی خۆی خۆی ماندوو دەکات، بۆیە تۆ کاتی خۆت بە ماندووبوون لەگەڵی بەفیڕۆ مەدە، چونکە ئەو لە تۆ بێنیاز بووە، پیشەیەك فێری منداڵەکەت بکە و بۆ عیبادەتی خودا(عزوجل) یەکلاببەرەوە، چونکە خانەوادە و منداڵ لەلای خودا سوودێکت پێ ناگەیەنن، خۆت و خانەوادە و منداڵەکانت لەسەر قەناعەت بەوەی هەر دەبێ ببێ(واتە

[1] عزاه في "الجامع الصغير" لأحمد في "الزهد" وأورده ابن حجر في اللسان.

زەرووەتەکانی ژیان) رابهێنە و خۆت و ئەوان بۆ گوێڕایەڵی کردنی مەولا(عزوجل) بەکلابکەرەوە، گەر لە پەنهانەوە رۆزی فروانتان هەبوو ئەوا لە کاتی خۆیدا ئەوەی لەلای خودا بڕاوەتەوە رووتان لێ دەکات و لە خودای بناسن، خۆت رزگار بکە لە هاوەڵدانان بە خەڵك بۆ خودا، گەر لە قەدەرەوە ئەو رۆزییە بەرینەت بۆ نەبڕابوویەوە ئەوا بە زوهد و قەناعەت بێنیاز بە لە هەرچی شتە، کەسی باوەڕداری خاوەن قەناعەت گەر ناتاج بوو بە شتێك لە دونیا بە داواکردنی پڕ لە گەردنکەچی و زەلیلی و تەوبەکردنەوە روو لە پەروەردگاری(عزوجل) دەکات، گەر پێی نەبەخشرا لە لێگرتنەوەدا تەبا دەبێت و لەگەڵی ئارام دەگرێت بەبێ بەرهەڵستکاری و ململانێ و کێبەرکێ، بە ئایینەکەی داوای دەوڵەمەندی ناکات و ریا و دووڕووی و چاوڕاو بەکارناهێنێت وەك چۆن تۆ بەکاریان دەهێنیت، ئەی کەسی دووڕوو، ریا و دووڕوویی و یاخیبوون هۆی هەژاری و زەلیلی و دەرکردنن لە دەرگای حەق(عزوجل)، کەسی ریاباز و دووڕوو و پۆشەری پۆشاکی صالحان-بەبێ ئەوەی لە صالحان بێت- بە ئایینەکەی دەست بۆ دونیا دەبات، بە قسەی ئەوان قسە دەکات و پۆشاکی ئەوان دەپۆشێت، بەڵام ئەو کارانە ناکات ئەوان ئەنجامی دەدەن، بانگەشەی رەچەڵەکی خۆی دەکات بۆ سەر ئەوان، بەڵام ئەو لە رەچەڵەکی ئەوان نییە، وتنی "لا إلـه إلا الله" تەنها بانگەشەیە، تەوەکولت لەسەر خودا و متمانەت بە ئەو و پشتهەڵکردنی دڵت لە خەڵکانی تر ئاشکرایە، ئەی درۆزنان راستگۆ بن، ئەی ئەو کەسانەی لە مەولای خۆتان هەڵهاتوون بگەڕێنەوە، بە دڵ روو لە دەروازەی حەق(عزوجل) بکەن و ئاشتەوایی لەگەڵ بکەن و داوای لێبوردن و لێخۆشبوونی لێ بکەن، لە باری ئیماندا بە موباحی شەرع دەست بۆ دونیا دەبرێت، لە باری ویلایەتدا بە دەستی خودا دەست بۆ دونیا دەبرێت، فەرمانەکانی خودا(عزوجل) دەبێت دوو شایەتی کیتاب و سوننەیان لەسەر بێت، لە باری ویلایەتی ئەبدالی و قوتبیدا بە کرداری خودا دەست بۆ شتەکان دەبرێت.

ئەی گەنج، تۆ شەرم ناکەی، بەسەر نەفسی خۆتدا بگری، چونکە تۆ لە راستیەوەی سەرکەوتن مەحرومکراوی، شەرم ناکەی لە خۆت ئەمرۆ گوێڕایەڵ دەبیت و سبەینێ یاخی دەبیت، ئەمرۆ موخلیص و سبەینێ هاوەڵدانەر، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ)

فەرمووی: ((هەرکەس دوو ڕۆژ لە تەمەنی یەکسان بن زیانی کردووە، هەرکەس دوێنێی باشتر بوو بێت لە ئەمڕۆی ئەو کەسە بێبەشکراوە))[1].

ئەی گەنج، هیچ شتێك بە تۆوە نایەت و هەر دەبێ تۆش ببیت(واتە هەردەبێ هەوڵ و تێکۆشانت هەبێت لە کاتێکدا بکەری ڕاستەقینەش تۆ نیت، بەڵکو خودایە)، تێبکۆشە و کۆمەکی لە پەروەردگارەوەیە(عزوجل)، لەو دەریایەی تۆی تێکەوتووە بزوێ و جووڵە بکە، شەپۆلەکان بەرزت دەکەنەوە و بەرەو کەنار دەریا وەرتدەگێڕن، دوعا لە تۆوەیە و وەڵامدانەوە لە ئەوەوە، تێکۆشان لە تۆوە و سەرکەوتن لە ئەوەوە، وازهێنان لە تۆوە و پارێزگاری لە ئەوەوە، لە داواکەتدا ڕاستگۆ بە دەرگای نزیکی خۆیت پێ نیشان دەدا، بەزەیی خودا رووت لێ دەکات و لوتف و بەخشندەیی و خۆشەویستی ئەو بۆت تامەزرۆ دەبن، ئەمە ئامانجی داوا و هەوڵی خوداناسانە، نازانم چی لەگەڵ ئێوە بکەم ئەی بەندەکانی نەفس و سروشت و ئارەزوو و شەیتان، من تەنها حەقم لە حەق و کرۆکم لە کرۆك و پاڵفتەم لە پاڵفتە و بڕین و گەیاندنم لەلایە، لە هەرچی شتە جگە لە خودا دابڕێ و خۆت بە خودا بگەیەنە، من هەوەسبازی ئێوەم قبووڵ نییە ئەی دووڕووان، ئەی بانگەشەکەران، ئەی درۆزنان، من لە رووی ئێوەدا شەرم ناکەم، چۆن شەرمتان لێ دەکەم لە کاتێکدا ئێوە شەرم لە پەروەردگاری خۆتان ناکەن، کاری ناشیرین ئەنجام دەدەن و گوێ نادەن بە سەیرکردنی خودا و فریشتە بەرپرسەکانی لەسەر ئێوە، ڕاستگۆییەکم لەلایە سەری هەموو بێباوەڕ و دووڕوویەکی درۆزنی پێ دەپەڕێنم، ئەوانەی تەوبە ناکەن و ناگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگار و هەنگاوی گەڕانەوە و داوای لێخۆشبوون بۆ لای ئەو هەڵناگرن.

لە یەکێك لە خوداناسانەوە(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت: ڕاستگۆیی لە زەویدا شمشێری خودایە(عزوجل)، لەسەر هەر شتێکی دابنێت دوولەتی دەکات، لێم وەربگرن من ئامۆژگاریکەری دڵسۆزی ئێوەم، ئێوەم بۆ خۆتان دەوێت، من لە ئێوە مردووم و بە حەقەوە(عزوجل) زیندووم، هەرکەس لە هاوەڵیدا لەگەڵم ڕاستگۆ بێت سوود و قازانج

[1] أورده السخاوي بلفظ آخر، وقال: رواه الديلمي عن علي مرفوعا.

دەبینێ و سەرفرازی بەدەست دەهێنێت، هەر کەس بە درۆم بزانێت و لە هاوەڵیکردنما درۆ بکات بێبەش دەبێت و بە سزایی دونیا یان دواڕۆژ سزا دەدرێت، لە هۆکارەکانی ناسینی خودا وازهێنانە لە ململانێ و بەرهەڵستکاری قەدەرەکانی خودا و رازیبوون بە تەگبیرەکانی، بۆ ئەو مەبەستە مالیکی کوڕی دینار بە هەندێ لە موریدانی دەڵێت: گەر ناسینی خودات دەوێ بە تەگبیر و قەدەرەکانی رازی بە و نەفس و ئارەزوو و سروشت و ویستی خۆت لە تەگبیر و قەدەری خودادا مەکە بە هاوەڵ بۆ خودا، ئەی ئەوانەی جەستەتان ساغ و تەندروستە، ئەی ئەوانەی لە کارەکانتان تەواو بوون، زۆر شت لە پەروەردگارەوە لەدەست دەدەن، گەر دڵتان تەماشای ئەو شتانەی بکردبایە کە لەدەستی چوون پەشیمانی و حەسرەت دایدەگرتەوە، بەئاگا بێن.

ئەی خەڵکینە، ئێوە بەم نزیکانە مردوون، بەسەر نەفسی خۆتاندا بگرین بەرلەوەی بەسەرتاندا بگرین، کۆمەڵێك گوناهی کەڵەکەبووتان هەیە بەسەر سەرئەنجامێکی نادیاردا، دڵتان بە خۆشەویستی دونیا و هەڵپە لەسەری ئەخۆشکەوتووە، بە زوهد و وازهێنان لە دونیا و رووکردنە حەق(سبحانه وتعالى) چارەسەری بکەن، سەلامەتی ئایین سەرمایەیە و کردارە چاکەکان قازانجە، واز لە داوای شتێك بهێنن گومڕاتان دەکات، بەوەی بەشتان دەکات قەناعەت بکەن، کەسی ژیر بە شتێك دڵخۆش نابێت حەڵاڵەکەی دادگایی لەسەرە و حەرامەکەی سزادان، زۆرینەتان دادگایی و سزاتان لەبیرکردووە.

ئەی گەنج، گەر شتێك لە دونیات لەبەردەستدا ئامادە بوو و بینیت دڵت لێی بێزارە ئەوا وازیلێبهێنە، بەڵام تۆ کوا دڵت هەیە، هەموو بوونت بووە بە نەفس و ئارەزوو و سروشتی خۆت، هاوەڵی خاوەن دڵان بکە تا دڵت بۆ پەیدا دەبێت، هەردەبێت شێخێکی کارکەر بە حوکمی خوات هەبێت پەروەردەت بکات و فێرت بکات و ئامۆژگاریت بکات، ئەی ئەو کەسەی هەموو شتێکی بە هیچ شتێك فرۆشتووە و هیچ شتی بە هەموو شت کڕیوە، دونیات بە دواڕۆژ کڕیوە و دواڕۆژت بە دونیا فرۆشتوە، تۆ ئارەزووبازیت لەناو ئارەزووبازیدا، نەبوونیت لە نەبووندا، نەزانیت لە نەزانیدا، وەك چۆن ئاژەڵان دەخۆن تۆ بە هەمان شێوە دەخۆی، بەبێ ئەوەی خواردنەکە بپشکنی و لێی وردبیبیەوە و پرسیاری دەربارە بکەی، بەبێ نیێت و بەبێ فەرمان و بەبێ کردار،

باوەڕدار لە موباحی شەرع دەخوات، وەلی لە دڵەوە فەرمانی پێ دەکرێت بە خواردن و نەهی لێ دەکرێت، بەدەل(ئەبدال) گرنگی بە شتێك نادات، بەڵکو کۆمەڵێك شت ئەنجام دەدات لە کاتێکدا ئەو لە نوقمبوون و فەنابووندایە لەگەڵ پەروەردگاری(عزوجل)، وەلی لەگەڵ فەرمان راوەستاوە، کەسی بەدەل ویست و هەڵبژاردنی لێ وەرگیراوەتەوە، هەموو ئەوانە لەگەڵ پارێزگاری سنووری شەرعدا، ئەو کەسەی فانی بووە لە خۆی و خەڵکی سنووری شەرع پارێزگاری لێ دەکات پاشان لە دەریای قودرەتدا هاوار دەکات، شەپۆلەکانی جارێك بەرزی دەکەنەوە و جارێك دایدەگرن، جارێك بەرەو کەناراو وەریدەگێڕن و جارێکی هەڵیدەدەنە ناوەڕاستی دەریاوە، وەك یارانی ئەشکەوتی لێ دێت کە خودا(عزوجل) دەربارەیان دەفەرموێت:

﴿ وَنُقَلِّبُهُمْ ذَاتَ ٱلْيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِ ﴾ الكهف: ١٨

نە هۆش و نە تەگبیر و نە ئاگاهییان لەلا مابوو، ئەوان لە خانەی لوتف و نزیکی لە خوداوە چاوەکانیان لە ناوەوە و دەرەوە لێکنابوو، هەر بەو جۆرە ئەم کەسە نزیکە لە خوداوە دوو چاوی دڵی لە هەرچی شتە جگە لە خودا لێکناوە، تەنها تەماشای خودا دەکات و بە ئەوەوە دەبینێت و تەنها لە ئەوەوە دەبیستێت، خودایە لە هەرچی شتە جگە لە خۆت فانیمان بکەی و بە خۆتەوە بووغان پێ ببەخشە.

﴿ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾ ﴾

البقرة: ٢٠١



# مەجلیسی بیست و سێ

## سپیکردنەوەی ژەنگی دڵان

بەیانی ڕۆژی هەینی لە مەدرەسەکەی ١٢/ذي الحجة/ ٥٤٥هـ فەرمووی:

لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: ((ئەم دڵانە ژەنگ دەگرن، پاککەرەوەکەیان بریتییە لە قورئان و یادی مردن و ئامادەبوون لە مەجلیسی زیکردا))[١].

دڵ ژەنگ دەگرێت، گەر خاوەنەکەی فریایکەوت بەو ڕێگانەی پێغەمبەر(ﷺ) وەسفی کردوون پاکی دەکاتەوە، ئەگەر نە، دڵەکە بەرەو ڕەشبوون هەڵدەگەڕێت، بە هۆی دوورییەوە لە نوور ڕەشدادەگەڕێت، بە هۆی خۆشەویستی بۆ دونیا و دەستگرتن بەسەریدا بەبێ وەرع ڕەشهەڵدەگەڕێت، چونکە هەر کەسێك خۆشەویستی دونیا لە دڵیدا چەسپا وەرعی نامێنێت و لە حەڵاڵ و لە حەرام کۆدەکاتەوە، جیاکاری لە کۆکردنەوەدا ناکات، حەیا و چاودێری لە پەروەردگاری(عزوجل) نامێنێت.

خەڵکینە، لە پێغەمبەرەکەتان(ﷺ) وەربگرن و ژەنگ و ژاری دڵتان-بەو دەوایەی بۆی وەسف کردوون- پاك بکەنەوە، گەر یەکێك لە ئێوە نەخۆشییەکی هەبێت و پزیشکێك دەوای بۆ دیاری بکات ئەوا تا ئەو دەوایە بەکارنەهێنێت تامی ژیان ناکات، چاودێری خودا بکەن لە ئاشکرا و پەنهاندا، لەبەر چاوی خۆتان دایبنێن وەك ئەوەی خودا ببینن، گەر ئێوە ئەو(سبحانه وتعالى) نەبینن ئەوا ئەو ئێوە دەبینێت، هەر کەس بە دڵ یادی خودا بکات ئەو کەسە یادکەرە، هەر کەس بە دڵ یادی خودا نەکات یادکەر نییە، زمان خزمەتکاری دڵە و شوێنی ئەو دەکەوێت، بەردەوام بە لە بیستنی ئامۆژگاری، چونکە کاتێك دڵ لە بیستنی ئامۆژگاری بزر دەبێت کوێر دەبێت،

[١] لم أجده بهذا اللفظ، رواه البيهقي في الشعب بلفظ آخر.

حەقیقەتی تەوبە بریتییە لە بەمەزنزانینی فەرمانی حەق(عزوجل) لە هەموو کاروبار و دۆخ و حاڵێکدا، بۆ ئەو مەبەستە یەکێك لە خوداناسان(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت: هەموو خێر لە دوو وشەدایە: بەمەزنڕاگرتنی فەرمانی خودا(عزوجل) و بەزەیی لەسەر دروستکراوەکانی، هەر کەسێك فەرمانی خودا(عزوجل) بەمەزن رانەگرێت و سۆز و بەزەیی لەسەر دروستکراوەکانی خودا نەبێت ئەو کەسە لە خوداوە دوورە.

خودا وەحی بۆ موسا(علیه السلام) رەوانە کرد و پێی فەرموو: بەزەییت هەبێت تا بەزەییت پێ بکەم من بەزەییکار(رحیم)م، هەر کەس بەزەیی هەبێت بەزەیی پێ دەکەم و دەیخەمە بەهەشتەکەمەوە، پیرۆزبایی لە بەزەییکاران.

لە خواردیان و خواردمان تەمەنی خۆت بەفیڕۆ دا، خواردیانەوە و خواردمانەوە، پۆشییان و پۆشیمان، کۆیانکردەوە و کۆمانکردەوە، هەرکەس سەرفرازی دەوێت با نەفسی خۆی لە حەرامکراوەکان و گومانلێکراوەکان و ئارەزووەکان بەدوور بگرێت، ئارام بگرێت لەسەر جێبەجێ کردنی فەرمانی خودا(عزوجل) و کۆتاهێنان و خۆگرتنەوە لە نەهییەکانی و تەبایی لەگەڵ قەدەرەکانی، دەستەیەك لەگەڵ خودا ئارامیان گرت و بۆ گەیشتن بە ئەو ئاتارام بوون، بۆ ئەو و لە پێناوی ئەودا ئارامیان گرت، ئارامیان گرت بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەو بن، داوای ئەویان کرد بۆ ئەوەی نزیکی لە ئەوەوە بەدەست بهێنن، لە خانەی نەفس و ئارەزوو و سروشتی خۆیان هاتنە دەرەوە و هاوەڵی شەرعیان کرد و بەرەو پەروەردگاریان هەنگاویان هەڵگرت، ئافەت و ناخۆشی و بەلا و خەم و پەژارە و برسێتی و تینوێتی و زەلیلی و لارەملی و رسوایی ئەوانی داگرتەوە، ئەوان گوێیان پێ نەدا و لایان بەلایاندا نەکردەوە، لە رۆیشتنی خۆیان بەردەوام بوون و نەگەڕانەوە و گۆڕانیان بەسەردا نەهات، ئەوان لە پێشەنگانن و ساردبوونەوە و خاوبوونەوە روویان لێ ناکات، ئەوان بەردەوام بەو جۆرە دەبن تا مانەوەی دڵ و جەستە بەدەستدەهێنن.

خەڵکینە، کار بۆ لیقای خودا(عزوجل) بکەن و شەرمی لێ بکەن بەر لەوەی بە خزمەتی بگەن، حەیای باوەڕدار لە خودایە ئەوجا لە دروستکراوەکانی خودا، مەگەر کارەکە پەیوەندی بە ئاین و پێشێلی سنووری شەرعەوە هەبێت، لەو بارەدا شەرم کردن

بۆ ئەو حەڵاڵ نییە، بەڵکو لەپێناو ئایینی خودادا(عزوجل) کارەکە بە ناشیرین دادەنێت و سنووری خودا راوەستاو دەکات و کارەکەی خودا پیادە دەکات، خودا(عزوجل) دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ﴾ النور: ٢

هەرکەس شوێنکەوتنی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) بێتە راستە زرێپۆشێکی لەبەر دەکات و خودەیەکی لەسەر دەنێت و شمشێرێکی دەداتە دەست، لە ئەخلاق و ئاکار و سیفەتە بڵندەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بەهرەمەند دەبێت، پۆشاکی ئەوی لەبەر دەکرێت، و بەوەوە دڵخۆشییەکەی زۆر دەبێت بەوەی یەکێکە لە ئومەتی ئەو(ﷺ)، لەسەر ئەو کارە شوکری پەروەردگاری دەکات و پاشان خودا دەیکات بە جێگری ئەو(ﷺ) لەناو ئومەتەکەیدا، دەیکات بە رێنیشاندەر و بانگکەری ئومەتەکەی بۆ دەرگانەی حەق(عزوجل)، ئەو(ﷺ) بانگخواز و رێنیشاندەر بوو، کاتێك خودا بردییەوە بۆ لای خۆی لەناو ئومەتەکەیدا کەسانێکی راستکردەوە ببن بە جێنشینی، ئەوانەش دانەدانەیەکن لە هەر هەزار کەسێك تەنها یەك کەس، رێنومایی خەڵکی دەکەن و لەسەر ئازارەکانیان ئارام دەگرن لەگەڵ بەردەوامی ئامۆژگاری کردنیان، بەرووی دووڕووان و لادەرانەوە خەندە دەخەنە سەر لێوانیان و هەموو رێگەیەکیان لەگەڵ دەگرنە بەر تا رزگاریان بکەن لەوەی تێیکەوتوون و هەڵیان بنێن بەرەو دەرگای پەروەردگاریان(عزوجل)، بۆ ئەو مەبەستە یەکێك لە خوداناسان(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت: تەنها عاریف بەرووی فاسقەوە پێدەکەنێت، بەروویەوە پێدەکەنێت و وا نیشان دەدات نایناسێت، لەگەڵ ئەوەش ئەو بەئاگایە لە وێرانی خانەی دینەکەی و رەشی رووخساری دڵی و زۆری ناپاکی و لێڵی دەروونی، لادەر و دووڕوو وا گومان دەبەن خۆیان لە خوداناس شاردووەتەوە و ئەو نایان ناسێت، نەخێر، شەرمەزار بن، ئەوان لە ئەو شاراوە نین و بە سەرنج و تەماشاکردن و قسە و جووڵە دەیانناسێتەوە، بەبێ هیچ گومانێك لە دەرەوە و لە ناوەوە دەیانناسێتەوە، هاوار بە حاڵتان، وا گومان دەبەن ئێوە لە عاریفانی صادیق و زانا خۆتان دەشارنەوە، تاکەی تەمەنی خۆتان لە پووچیدا بەفیڕۆ دەدەن؟ ئەی ئەو کەسانەی رێگەی دواڕۆژتان بزر کردووە بەدوای کەسێکدا بگەڕێن رێگەکەتان نیشان بدات، "الله أكبر" لەسەر ئێوە ئەی ئەوانەی

دڵتان مردووه، ئەی ئەوانەی بە هۆکارەکان چوونەتە ریزی هاوەڵدانەرانەوە، ئەی ئەوانەی بوونەتە بەندەی هەوڵ و هێز و زیندەگی و سەرمایە و سوڵتانی وڵات، ئەوانە لە خودا(عزوجل) بێبەشن، هەر کەس زیان و قازانج لە شتێکی ترەوە جگە لە خودا(عزوجل) ببینێت بەندەی خودا نییە، ئەو بەندەی ئەو کەسەیە زیان و قازانجەکەی لێوە تەماشا دەکات، ئەو ئەمڕۆ لەناو ئاگری تووڕەیی و دابڕاندایە لە خودا و سبەینێش لەناو ئاگری دۆزەخدا، تەنها تەقواداڕانی یەکتاپەرستی موخلیصی تەوبەکار لە ئاگری خودا(عزوجل) رزگاری دەبێت.

**بە دڵ پاشان بە زمان تەوبە بکەن،** تەوبەکردن وەرگێڕانی دەوڵەتێکە، وەرگێڕانی دەوڵەتی نەفس و ئارەزوو و شەیتان و دۆستی خراپ، گەر تەوبە بکەی بیستن و بینین و زمان و دڵ و هەموو ئەندامەکانت وەردەگێڕێت و خواردن و خواردنەوەت لە لێڵی حەرام و شوبهە پاك دەکەیەوە و لە ژیان و زیندەگی و کڕین و فرۆشتنندا وەرع پەیدا دەکەی و مەولات(عزوجل) دەکەیت بە خەم و پەژارەی خۆت، عادەت وازلێدەهێنیت و عیبادەت لە جێگەی دادەنێیت، یاخیبوون و گوناه وازلێدەهێنیت و گوێڕایەڵی لە جێ دادەنێیت، پاشان لە حەقیقەت ورددەبییەوە لەگەڵ دروستی شەریعەت و شایەتی شەریعەت لەسەری، چونکە هەر حەقیقەتێك شەریعەت شایەتی بۆ نەدات بریتییە لە زەندەقە، گەر ئەمەت بۆ هاتە دی فەنابوون لە ئەخلاقی ناپەسەند و بینینی تەواوی دروستکراوەکان رووت لێ دەکات، ئەو کات ئاشکرات(دەرەوەت) پارێزراو و پەنهانت(ناوەوەت) بە پەروەردگارەوە(عزوجل) سەرقاڵ دەبێت، کاتێك ئەمەت بۆ تێر و تەواو بوو گەر سەراپای دونیا رووت لێ بکات و خۆی رادەستی تۆ بکات و هەموو خەڵکی-ئەوەی رۆیشتووە و ئەوەی دێت-شوێنت بکەوێت زیانت پێ ناگەیەنێت و لە دەرگای مەولا(عزوجل) لاتنادەن، چونکە تۆ لەگەڵ ئەو راوەستاوی و رووت لە ئەو کردووە و بە ئەوەوە سەرقاڵیت، تەماشای شکۆمەندی و مەزنی و جوانی ئەو دەکەیت، کاتێك تەماشای سیفەتی جەلالی(مەزنی و شکۆمەندی) دەکەی پەرتبوون(جیابوونەوە) رووت لێ دەکات، کاتێك تەماشای سیفەتی جەمالی(جوانی و شیرینی) دەکەی کۆدەبییەوە، لەکاتی بینینی سیفەتی جەلالدا ترس رووت لێ دەکات و لە کاتی

بینینی سیفەتی جەمالدا رجات بۆ پەیدا دەبێت، لە بینینی جەلالدا مەحو و سڕانەوە رووت لێ دەکات، لە بینینی جەمالدا بوون و دامەزراوی رووت لێ دەکات، خۆشبەخت ئەو کەسانەی لەم خواردنەی تام و چێژ کردووە.

**خودایە**، خۆراکی نزیکی لە خۆتمان دەرخوارد بدە و بە خواردنەوەی هۆگربوون بە خۆتەوە پاراومان بکە.

﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي ٱلْأٓخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ٢٠١﴾

البقرة: ٢٠١



# مەجلیسی بیست و چوار

## رادەستبوونی رەها بۆ خودا( عزوجل )

بەیانی رۆژی یەکشەممە ١٤/ذي الحجة/ ٥٤٥ھ لە "الرباط" فەرمووی:

لە تەگبیر و زانستی خودادا بە نەفس و ئارەزوو و سروشتی خۆتان هاوەڵ بۆ خودا دامەنێن، لە خۆتان و خەڵکیدا خۆپارێزی بکەن و لە خودا بترسن، یەکێك لە خوداناسان(رەحمەتی خودای لێ بێت) فەرمووی: لە خەڵکیدا لەگەڵ خودا تەبا بە، نەك لە خودادا لەگەڵ خەڵکی تەبا بیت، شکاوان راستبکەرەوە و شکستەکان چارەسەر بکە، لە بەندە صالحە تەباکانەوە فێری تەبایی بن لەگەڵ حەق(عزوجل)، زانست بۆ کارکردن دانراوە، نەك تەنها بۆ لەبەرکردن و خوێندنەوەی بەسەر خەڵکیدا، فێر ببە و کار بکە و پاشان کەسانی تر فێر بکە، گەر زانست فێربوویت و کارت پێکرد زانست لە تۆوە قسە دەکات، گەر زانست لە قسە کەوت بە زمانی کردار قسە بکە زیاتر لەوەی بە زمانی زانست قسە بکەی، بۆ ئەو مەبەستە یەکێك لە خوداناسان(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت: (هەر کەس سەرنجدانی سوودت پێ نەگەیەنێت ئامۆژگارییەکەی سوودت پێ ناگەیەنێت)، کارکەر بە زانستەکەی خۆی و کەسانی تر لە زانستەکەی سوودمەند دەبن، چونکە خودا(عزوجل) بەوەی دەیەوێت زمانم دەهێنێتە گۆ، ئەوەش بەپێی قەدەری حاڵ و باری ئەوانەی لەلام ئامادەن، ئەگینا لە نێوان من و ئێوەدا دوژمنایەتی هەیە، ماڵ و شتە تایبەتەکانی با بۆ ئێوە بێت، بەڵام من هیچم نییە و شتێك شك نابەم، گەر شتێکم شکبردبا لە ئێوەم نەدەگرتەوە، تەنها ئامۆژگاری لە نێوان من و ئێوەدا هەیە، بۆ خودا(عزوجل) ئامۆژگاریتان دەکەم نەك بۆ خۆم، لەگەڵ قەدەر تەبا بە ئەگینا پشتت دەشکێنێت، بەپێی هەڵبژاردنی ئەو لەگەڵی برۆ ئەگینا سەرتدەبڕێت، لەبەردەمیدا ئەژنۆ دابدە تا بەزەیی بە تۆدا دێتەوە و لە پاشکۆی خۆیەوە

سوارت دەکات، سەرەتای کاری ئەهلی ڕێگە بریتییە لە کەسابەت، بەپێی پێویستی و لە دەستی شەرعەوە لە دونیا وەردەگرن، تا بوونیان لە کەسابەت دەستەوسان دەبێت و تەوەکول ڕوویان لێ دەکات، ئەو کات مۆرێك لەسەر دڵیان دەنرێت و دەستوپێیەکانیان دەبەسترێنەوە، ئەو کات بەشەکانیان لە دونیا بەپێی پێویست و بەبێ ماندووبوون و شەکەتی ڕوویان لێ دەکات، یەکێك لە نزیکانی خودا لە دوارۆژدا بەبێ ویستی ئەو لە نیعمەتەکانی بەهەشت هەڵدەژەنرێت، بەڵکو لەگەڵ حەق(عزوجل) تەبا دەبێت وەك چۆن لە دونیادا ڕووبەڕووی بەشی خۆی کرایەوە، لە دونیا و دوارۆژدا بەشی خۆیان پێ دەدرێت، چونکە ئەو(سبحانە وتعالى) کەمترین ستەم لە بەندەکانی خۆی ناکات.

ئەی گەنج، بەپێی هەوڵ و لێبڕانت پێت دەبەخشرێت، هەرچی شتە جگە لە خودا لە دڵت دووربخەرەوە تا لە ئەو(سبحانە وتعالى) نزیك ببییەوە، لە خۆت و لە خەڵکی بمرە پەردە لە نێوان تۆ و پەروەردگارت(عزوجل) هەڵدەگیرێت، (یەکێك پرسی: چۆن بمرم؟) فەرمووی: لە شوێنکەوتنی نەفس و ئارەزوو و سروشت و عادەتی خۆت و شوێنکەوتنی خەڵکی و هۆیەکان بمرە و لێیان بێهیوا ببە و بەهۆی ئەوانە و داوای شتێك جگە لە حەق(سبحانە وتعالى) هاوەڵ بۆ خودا دامەنێ، هەموو کردەوەکانت با بۆ ڕووی پاکی خودا بێ نەك بۆ داوای نیعمەتەکانی، بە تەگبیر و قەزا و کرداری ئەو(سبحانە وتعالى) ڕازی بە، گەر ئەمەت ئەنجامدا لە خۆت مردووی و بە ئەوەوە زیندووبوویتەوە، دڵت دەبێت بە نشینگەی ئەو، چۆنی بوێت بەو جۆرە وەریدەگێڕێت، دڵ دەکەوێتە کەعبەی نزیکی لە ئەوەوە، خۆی بە دیوار و پەردەکەیدا هەڵدەواسێت و یادی دەکات، هەرچی شتی ترە جگە لە ئەو(سبحانە وتعالى) لەیاد دەکات، کلیلی بەهەشت بریتییە لە "لا إله إلا الله محمد رسول الله" ئەمڕۆ و سبەینێ بە فەنابوونت لە خۆت و خەڵکی و هەرچی شتی ترە جگە لە خودا لەگەڵ پارێزگاری لە سنوورەکانی شەرع بەهەشت بەدەست بهێنە، نزیکی لە حەق(عزوجل) بەهەشتی خوداناسانە و دووری لە ئەو دۆزەخیانە، تەنها ڕجایان ئەو بەهەشتەیە و ترسیان لەو ئاگرەیە، ئەوان چ عەمەل و غەشێکیان تێدایە تا لە ئاگری دۆزەخ بترسن؟! ئاگری دۆزەخ پەنا دەگرێت بە خودا لە باوەڕدار و لێی ڕادەکات، چۆن لە موحیبانی موخلیصان هەڵنایەت؟! چەندە حاڵی باوەڕدار لە

دونیا و دوارۆژدا باش و چاکە! ئەو لە دونیادا باکێکی بەوە نییە لە چ بار و دۆخێکدایە دوای ئەوەی دەزانێت پەروەردگاری(عزوجل) پێی رازییە، لە هەر کوێ بەرێتەوە بەشەکەی خۆی دەبینێتەوە و پێی رازی دەبێت، روو لە هەر کوێ بکات بە نووری خودا(عزوجل) تەماشا دەکات و تاریکی بۆ نییە، هەموو ئاماژەکانی بۆ لای ئەوە، هەموو متمانەیەکی بە ئەوە، هەموو تەوەکولێکی لەسەر ئەوە، خۆتان لە ئازاردانی باوەڕدار بەدوور بگرن، چونکە ئەو ئازاردانە وەك ژەهرێك وایە لە جەستەی کەسی ئازاربەخشدا و زیانی پێ دەگەیەنێت و هۆیەکە بۆ هەژاری و سزادانی، ئەی ئەو کەسەی بە خودا و ئەهلی تایبەتی خودا نەزانیت تامی غەیبەت کردنی ئەوان مەکە، چونکە ئەوە ژەهرێکی کوشندەیە، ئاگاداربە و نەکەی خراپەیان دەرحەق بکەی، چونکە کەسێك هەیە بۆ ئەوان خاوەنی غیرەتە، ئەی کەسی دووڕوو شکی دووڕووی بە دڵتەوە لکاوە و دەرەوە و ناوەوەی تۆی داگیرکردووە، لە هەموو بارێکدا یەکتاپەرستی و ئیخلاص بەکاربهێنە دەبێتە هۆی شیفای تۆ و شکەکەت دەڕوات، زۆرجار سنووری شەرع دەبەزێنن و زرێپۆشی تەقوای خۆتان پارچە پارچە دەکەن و پۆشاکی یەکتاپەرستیتان دەدڕێنن و نووری باوەڕتان کپ دەکەنەوە و خۆتان لەلای خودا ناشیرین دەکەن و لە هەموو کار و بارێکدا خۆتان رووبەڕووی خەشمی خودا دەکەنەوە، گەر یەکێك لە ئێوە سەرفرازی بەدەستهێنا و کاری گوێڕایەڵی ئەنجامدا ئەوا تێکەڵە بە خۆپەسەندی و بینینی خەڵکی و داوای مەدح و سەنا لەسەر کارە چاکەکانی، هەرکەس لە ئێوە دەیەوێت خودا(عزوجل) بپەرستێت با خۆی لە خەڵکی کەنارگیر بکات، چونکە بینینی ئەوان کارە چاکەکان پووچ دەکاتەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: ((با کەنارگیریتان هەبێت چونکە عیبادەتە و ئاکاری صالحانی پێش ئێوەیە))[1].

یەکەمجار دەست بۆ ئیمان ببەن، پاشان یەقین و ئەوجا فەنا و بوون(الوجود) بە خوداوە(عزوجل) نەك بوون بە خۆت و شتانی ترەوە، لەگەڵ پارێزگاری لە سنوورەکانی شەرع و رازیکردنی پێغەمبەری خودا(ﷺ) و رازیکردنی خوێنراو و بیستراو، هەرکەس

[1] رواه البيهقي في "الزهد الكبير".

جگە لەمە شتێکی تر بڵێت ڕێز و شکۆیەکی بۆ نییە، ئەوەی لە مەصحەفەکان و لاپەڕەکاندایە کەلامی خودان(عزوجل)، لایەکی بەدەستی ئەوەوەیە و لاکەی تری بەدەستی ئێمەوە، خۆت بە خوداوە خەریك بکە و بۆ ئەو یەکلاببەرەوە و پێیەوە پەیوەست بە، چونکە ئەوە تێچوون و ناخۆشییەکانی دونیا و دوارۆژت لەکۆڵ دەکاتەوە و لە ژیان و مردن پارێزگاریت لێ دەکات و لە هەموو بارێکدا بەرگریت لێ دەکات، دەست بۆ ئەم ڕەشییە ببە لە سپێتی، خزمەتی بکە تا خزمەتت بکات، و دەستی دڵت بگرێت و لەبەردەم پەروەردگار(عزوجل) ڕاوەستاوی بکات، کارکردن بەمە پەڕەکانی باڵت دەردەکات و بەرەو پەروەردگارت پێیان دەفڕیت، ئەی ئەو کەسەی خوریت پۆشیوە یەکەمجار خوری بکە بە بەر نهێنی و پەنهانی خۆتدا پاشان بە بەر دڵی خۆتدا ئەوجا بەر بە بەر نەفس و دواتر بە بەر جەستەدا، سەرەتای زوهد لێرەوە دەست پێ دەکات نەك لە دەرەوە بۆ ناوەوە، کاتێك نهێنی و پەنهان پاك دەبنەوە پاکێتییەکە سەردەکات بۆ دڵ و نەفس و ئەندامەکان و خواردن و خواردنەوە و پۆشاك، سەردەکات بۆ هەموو حاڵ و بارێکت، یەکەمین شتێك ئاوەدان دەکرێتەوە ناو خانووەکەیە، کاتێك ئاوەدانکردنەوەکەی کامڵ بوو بڕۆ بۆ دامەزراندنی دەرگاکە، نەك یەکەمجار ئاوەدانکردنەوەی ئاشکرا و دەرەوە بەبێ ناوەوە، نەك پەیوەندی لەگەڵ خەڵك بەبێ خودا، نەك چاککردنی دەرگا بەبێ خانوو، نەك لێدانی قوفڵ لە کەلاوە، ئەی ئەو کەسەی دونیایت بەبێ دوارۆژ، خەلکیت بەبێ خودا، هەموو ئەوەی تۆی تێدایە لە ڕۆژی دوایدا سوودێکت پێ ناگەیەنن، بەڵکو زیانت پێ دەگەیەنن، ئەم شەکەی لەگەڵ تۆیە لێت وەرناگیرێت، شەکی تۆ بریتییە لە ڕیا و دووڕوویی و یاخیبوون، ئەمانەش شتگەلێکن لە بازاڕی دوارۆژدا ساغنابنەوە، یەکەمجار ئیسلامەکەت ڕاستبکەرەوە ئەوجا دەست بۆ شتەکانی تر ببە، ئیسلام لە "إستسلام-خۆڕادەستکردن"ەوە داتاشراوە، فەرمانەکانی خودا(عزوجل) ڕادەستی خودا بکەی و خۆت بە ئەو بسپێریت و شانی لەسەر دابدەی و هەوڵ و هێزی خۆت لەیاد بکەی، هەموو ئەوەی لە دونیا لەدەستی تۆدایە لە گوێڕایەڵی خودا خەرجی بکەی، کار بە گوێڕایەڵییەکان بکەی و ڕادەستی ئەویان بکەی و لەبیریان بکەی، تۆ هەموو کارەکانت وەك گوێزێکی پووچ

وایە، هەر کارێك ئیخلاصی تێدا نەبێت تویکلێکی بێ ناوەرۆکە، تەختەیەکی بێ ڕۆحی فڕێدراوە، شێوەیەکە بەبێ مانا، ئەوەش بریتییە لە کاری دووڕووان.

**ئەی گەنج**، هەموو دروستکراوەکان ئامرازن و خودا(عزوجل) دروستکەر و هەڵسوڕێنەریانە، هەرکەس ئەمەی بینی رزگاری دەبێت لە کۆتوبەندبوون بە ئامرازەوە و کار و هەڵسوڕاندنی خودا دەبینێت، وەستان لەگەڵ خەڵکی کینە و تێچوون و تەنگژەیە، وەستان لەگەڵ خودا(عزوجل) ئاسوودەیی و خۆشگوزەرانی و نیعمەتە، تۆ لەو راستەشەقامەی پێشینان لەسەری بوون دابڕاوی، هیچ رەچەڵەکێك لە نێوان تۆ و ئەواندا بوونی نییە، رازی بووی بە رای خۆت و مامۆستایەکت نەگرت خودات پێ بناسێنێت و ئەدەبت دابدات، ئەی ئەو کەسەی لە رێگەکە دابڕاوی، ئەی ئەو کەسەی شەیتانەکانی ئینس و جین یاریت پێ دەکەن، ئەی بەندەی نەفس و ئارەزوو و سروشتی خۆت.

**هاوار بە حاڵت**، زمانت لاڵ بووە، پەنا بگرە بە پەروەردگار(عزوجل)، بە هەنگاوی پەشیمانی و داوای لێبوردنەوە بگەڕێوە بۆ لای تا لەدەستی دوژمنەکانت رزگارت بکات و لە دەریای تیاچوون بەهاناتەوە بێت، بیر لە سەرئەنجامی ئەو کارانە بکەرەوە ئەمڕۆ تۆی تێدای، وازهێنانیان لەسەرت ئاسانە، تۆ پەنات گرتووە بە سێبەری داری بێئاگایی، لە سێبەرەکەی وەرە دەرەوە و رۆشنایی خۆر ببینە و رێگەکە بناسەرەوە، درەختی بێئاگایی بە ئاوی نەزانی دەڕوێت، درەختی بەئاگاییش بە ئاوی بیرکردنەوە گەشە دەکات، درەختی تەوبە بە ئاوی پەشیمانی و درەختی خۆشەویستیش بە ئاوی تەبایی لەگەڵ خودا و قەدەرەکانی.

**ئەی گەنج**، تۆ هەندێ بیانوو و پاساوت هەبوو کاتێك منداڵ و گەنج بووی، بەڵام ئێستا تۆ لە چل ساڵی نزیکبوویەوە، بەڵکو زیاتر لە چل ساڵ کەچی هێشتا یاری بەوانە دەکەی منداڵان یاری پێ دەکەن، خۆت لە تێکەڵبوون بە نەفامان و تەنهاکەوتنەوە لەگەڵ ئافرەتان و منداڵان بپارێزە، هاوەڵی گەورە پیاوانی خۆپارێز بکە و لە گەنجی نەفام خۆت بەدووربگرە، لە خەڵکی خۆت کەنارگیر بکە، هەر کەسێك لەوان هات بۆ لات وەك پزیشکێك وابە بۆی، لەگەڵ خەڵکی وەك باوك لەگەڵ منداڵەکانی بەسۆز بە، گوێڕایەڵی خودا زیاد بکە، چونکە گوێڕایەڵی خودا یادی خودایە.

**له پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی:** ((هەر کەس گوێڕایەڵی خودا بکات یادی خودای کردووە، با نوێژ و ڕۆژوو و خوێندنەوەی قورئانی کەم بێت، هەرکەس لە خودا یاخی ببێت خودای لەبیرکردووە، با نوێژ و ڕۆژوو و خوێندنەوەی قورئانی زۆر بێت))[1].

باوەڕدار گوێڕایەڵی پەروەردگارییەتی(عزوجل) و بۆ ئەو ئارام دەگرێت، لەگەڵ خودا لەپای حەزەکانی و قسەکانی و خواردن و پۆشین و هەموو هەڵسوکەوتەکانی دەوەستێت، کەسی دووڕوو لە هەموو کاروبارەکانیدا گوێ بەو شتانە نادات.

**ئەی گەنج،** بیر لە کاروباری خۆت بکەرەوە، بانگەشەی شتێك مەکە لە تۆدا بوونی نییە، تۆ نە صادقی و نە صدیق، نە موحیب و نە ئەبا، نە رازی و نە عاریف، تۆ بانگەشەی ناسینی خودات کردووە، پێم بڵێ نیشانەی ناسینی خودا چییە، چی لە دڵی خۆتدا دەبینی لە نوور و حیکمەت، نیشانەی دۆستانی خودا و ئەبدالی پێغەمبەرانی خودا چییە؟ وا گومان دەبەی هەرکەس بانگەشەی شتێکی کرد ڕادەستی دەکرێت و داوای بەڵگەی لێ ناکرێت و دینارەکەی نادرێتە لە سەنگی مەحەك؟ لە سیفەتەکانی کەسی عاریف بە خودا(عزوجل) ئەوەیە لەسەر ئافەتەکان ئارام دەگرێت و بە قەزا و قەدەری خودا لە هەموو حاڵ و بارێکدا -لە نەفسی خۆی و خانەوادە و هەموو خەڵکیدا- ڕازی دەبێت.

**ئەی گەنج،** خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿ مَّا جَعَلَ اللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِي جَوْفِهِ ﴾الأحزاب: ٤

دونیا و دوارۆژ کۆنابنەوە، خودا و خەڵکی کۆنابنەوە، واز لە شتە فانییەکان بهێنە تا شتێك بەدەست بهێنی کە فانی نییە، ماڵ و نەفست ببەخشە تا بەهەشت بەدەست بهێنی، خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَىٰ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُم بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ ﴾

التوبة: ١١١

---

[1] عزاه الهيثمي في "المجمع" للطبراني في "الكبير".

پاشان لە دڵەوە زوهدت هەبێت لە هەرچی شتە جگە لە خودا تا نزیکی لە خوداوە بەدەست بهێنی و لەوێشەوە دونیا و دوارۆژت پێ ببەخشرێت، ئەی ئەو کەسەی حەقت(عزوجل) خۆشدەوێت لەگەڵ قەدەرەکەیدا بسوڕێ بۆ هەر کوێیەک سوڕا، دڵت کە نشینگەی نزیکییە لە خوداوە(عزوجل) پاکبکەرەوە، هەرچی شتی ترە جگە لە خودا لە دڵ رابماڵە و بە شمشێری یەکتاپەرستی و ئیخلاص و صدق لەبەر دەرگای دڵ دابنیشە و بۆ هیچ کەسی مەکەرەوە جگە لە ئەو(سبحانە وتعالی)، گۆشەیەک لە گۆشەکانی دڵت بە هیچ کەسێکەوە جگە لە خودا خەریك مەکە، ئەی گەمەکەران لەلای من گەمە بوونی نییە، ئەی ئەوانەی توێکڵتان دەوێت لەلای من تەنها ناوەرۆک بوونی هەیە، لەلای من ئیخلاص هەیە بەبێ دووڕوویی، صدق هەیە بەبێ درۆ، حەق(عزوجل) تەقوا و ئیخلاصی لە دڵتان دەوێت، سەرنجی رووالەتی کارەکانتان نادات، خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿ لَن يَنَالَ اللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَاؤُهَا وَلَٰكِن يَنَالُهُ التَّقْوَىٰ مِنكُمْ ﴾

الحج: ٣٧

ئەی رۆڵەی ئادەم، هەرچی لە دونیا و دوارۆژدایە بۆ ئێوە دروستکراوە، کوا شوکر کردنتان، کوا تەقواتان، کوا ئامادەتان بۆ لای ئەو و خزمەتکاریتان بۆ ئەو؟ هۆشناکەنەوە و کۆمەڵێك کاری بێ رۆح ئەنجام دەدەن، کردارەکان رۆحیان هەیە کە بریتییە لە ئیخلاص.



## مەجلیسی بیست و پێنج

# زوهد لە دونیا

١٩/ذي الحجة/ ٥٤٥هـ فەرمووی:

((لە عیساوە(علیه السلام) کاتێك هەستی بە بۆنێکی خۆش دەکرد کونی لوتی دەئاخنی و دەیفەرموو: ئەمە لە دونیاوەیە، ئەمە دەبێتە بەڵگە لەسەرتان))

ئەی ئەوانەی بە قسە و کردارەکانتان بانگەشەی زوهـد دەکـەن، بـەناو پۆشـاکی زوهـدتان پۆشـیوە و ناوەوەتـان لێوانلێـوە بـە حـەز و حەسـرەت بـۆ دونیـا، گـەر ئـەم پۆشـاکەتان لەبـەر خۆتـان بکەنـەوە و دڵتـان لـە حـەزەکان پاکبکەنـەوە ئـەوا خوداتـان خۆشدەوێ و لە دووڕوویی دوور دەکەونەوە، کەسی ڕاستگۆ لە زوهدەکەیدا بەشی خۆی بۆ دێت و وەریدەگرێت، دەرەوەی دەست بۆ ئەو بەشە دەبات و نـاوەوەی(دڵی) پـڕە لـە زوهـد لـەو بەشـە و لـە شـتانی تـریش، بـۆ ئـەو مەبەسـتە پێغەمبـەرمان(ﷺ) لـە عیسـا(علیه السلام) و پێغەمبەرانی تر(علیهم السلام) زاهیـدتر بـوو، لەگـەڵ ئـەوەش فەرموویەتی: (لە دونیای ئێوە سێ شتم لا خۆشەویستکراوە: بۆنی خۆش و ئـافرەت، و بینایی چاویشم لە نوێژدا دانراوە))[1].

ئەو(ﷺ) ئەو شتانەی خۆشویسـتووە لەگـەڵ ئـەوەی زوهـدی هـەبووە لەوانـە و لـە شتەکانی تر، چونکە ئـەوە لـەو بەشانەیە کـە زانسـتی پێشـینەی پـەروەردگاری بـۆی بڕیوەتەوە، بۆیە دەستبۆبردنەکەی وەك جێبەجێ کردنـی فـەرمانی خـودا و گوێڕایـەڵی بووە لە ئەو، هەرکەس بەشی خۆی لەسەر ئەم سیفەتە دەست بۆ ببات لە گوێڕایەڵیدایە یا هـەموو دونیـاش بەرەوویدا کرابێتـەوە، ئـەی زاهیـدان لـەپای ئـەزانی، گـوێبگرن و

[1] تقدم تخریجه.

قسەکانم بەڕاست بزانن و بەدرۆیان مەزانن، فێری ئەمە ببن بۆ ئەوەی بە هۆی نەزانینەکەتانەوە قەدەر ڕەد نەکەنەوە، هەر نەزانێك بە زانست بە ڕای خۆی بێنیاز بووە و قسەی نەفس و شەیتانەکەی وەرگرتووە، ئەو بەندەی ئیبلیسە و شوێنی ئەو کەوتووە و ئەوی کردووە بە شێخی خۆی، ئەی نەزانان و دووڕووان چەندە دڵتان تاریکە! چەندە بۆنتان ناخۆشە! چەندە زمانتان هەڵدەسوڕێنن و دەم دەدەن بە یەکدا! لە هەموو ئەوانەی تێیکەوتوون تەوبە بکەن، وازبهێنن لە تانەدان لە خودا و دۆستانی خودا، ئەوانەی خودا خۆشیدەون و ئەوانیش خودایان خۆشدەوێت، بەرهەڵستییان مەکەن لە دەستبردن بۆ بەشی خۆیان، چونکە بە فەرمان دەستیان بۆ بردووە نەك بە ئارەزوو، ئەوان خۆشەویستی و شەوقیان بۆ لای خودایە و لە هەرچی شتی تر جگە لە خودا زوهدیان کردووە و ناوەوە و دەرەوەیان پشتی لە هەموو شتێك کردووە، بەڵام بەشێکیان هەیە زانستی پێشینە بڕیویەتەوە و هەردەبێ دەستی بۆ ببەن، گەورەترین بەڵا لەسەریان ڕاوەستانیانە لە دونیا و مانەوە لەگەڵی و دەستبردن بۆ بەشەکانیان و بینینی ئەوانەی خودا(عزوجل) و دۆستانی خودا بەدرۆ دەزانن.

ئەی گەنج، هەتا لەگەڵ نەفس و ئارەزوودا بژیت کۆچ بکە لە قسەکردن دەربارەی خەڵکی و لەسەر خەڵکی، لە قسەکردن بڕە، چونکە گەر حەق(عزوجل) تۆی بۆ کارێك بوێت ئامادەت دەکات بۆی، گەر خودا ویستی ئاشکرات دەکات و شایستە و دامەزراوت دەکات، ئەو کات ئەو دەبێتە دەرخەری تۆ نەك خۆت، نەفس و قسە و هەموو حاڵ و بارێکت ڕادەستی قەدەری خودا بکە و بە کارکردن پێیەوە سەرقاڵ بە، ببە بە کردارێکی بێ قسە و ئیخلاصێکی بێ ڕیا و یەکتاپەرستییەکی بێ هاوەڵدانان و خامۆشییەکی بێناو، و تەنهاییەکی بێ دەرکەوتن و ناوەوەیەکی بێ دەرەوە، بە ناوەوە خەریك بە بە ڕاستکردنەوەی نیێت، تۆ گفتوگۆ لەگەڵ حەق(عزوجل) دەکەی و لە نوێژەکەتدا دەڵێیت:﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ۝٥﴾ الفاتحة: ٥

ئەمە گوتارە روو بە کەسێکی ئامادەیە "إياك" تۆ لەلام ئامادەی، ئەی ئەو کەسەی زانای بە من و لە منەوە نزیکی، ئەی ئەو کەسەی شاهیدی لەسەرم، بەو نیێتە و لەسەر ئەم سیفەتە لە نوێژەکانتان و کارەکانی تردا لەگەڵ خودا بدوێن، بۆ ئەو

مەبەستە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((خودا بپەرستە وەك ئەوەی دەیبینیت، گەر تۆ ئەو نەبینیت ئەو تۆ دەبینێت))[1].

ئەی گەنج، دڵت بە خواردنی حەڵاڵ پاڵفتە بکە لەدوای ئەوەی پەروەردگاری خۆت ناسی، پاروو و پۆشاك و دڵت خاوێن بکەرەوە و ببە بە کەسێکی پاك و پاڵفتە، تەصەوف(التصوف) لە وشەی "صفاء-پاکی و بێگەردی و رۆشنی"ەوە داتاشراوە، نەك لەوەی "صوف-خوری"یان پۆشیوە، صۆفی صادق لە تەصەوفەکەیدا دڵی پاڵفتە دەکات لە هەرچی شتە جگە لە مەولا(عزوجل)، ئەمەش کارێکە بە گۆڕینی خەرقە(پۆشاك) و رەنگ زەردهەڵگەڕان و شان بەربوونەوە و زمان هەڵسوڕان بە گێڕانەوەی سەربوردەی صالحان و بزوانی پەنجەکان بە تەسبیح و تەهلیل بەرهەم نایەت، بەڵکو بە راستگۆیی لە داوای حەق(عزوجل) و زوهد لە دونیا و دەرکردنی خەڵك لە دڵ و خۆدارنین لە هەرچی شتە جگە لە مەولا(عزوجل) بەدەست دەهێنرێت.

یەکێك لە خوداناسان(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت: (یەکێك لە شەوەکان داوام لە خودا کرد و وتم: خودایە، شتێکم لێ مەگرەوە سوودم پێدەگەیەنێت و زیان بە تۆ ناگەیەنێت پاشان خەوتم، لە خەوندا بینیم وەك ئەوەی کەسێك پێم بڵێت: کەوابوو تۆش لە کارێك خۆت مەگرەوە سوودت پێ دەگەیەنێت، لە کارێك خۆت بگرەوە زیانت پێ دەگەیەنێت)، رەچەڵەکتان لە پێغەمبەرەکەتانەوە(ﷺ) راستبکەنەوە، هەر کەس شوێنکەوتنەکەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دروست بێت رەچەڵەکەکەی بۆ لای ئەو دروست دەبێت، بەڵام بە وتنی من لە ئوممەتی ئەوم بەبێ شوێنکەوتنی سوودێکت پێ ناگەیەنێت، گەر لە گوفتاری و رەفتاریدا شوێنی بکەون ئەوا لە خانەی رۆژی دوایدا دەبن بە هاوەڵی، گوێتان لەم ئایەتە پیرۆزە بووە:

﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا﴾

الحشر: ٧

---

[1] رواه البخاري ومسلم.

ئەوەی فەرمانتان پێ دەكات جێبەجێی بكەن و ئەوەی نەهیتان لێ دەكات خۆتانی لێبگرنەوە، ئەو كات لە دونیا بە دڵ لە پەروەردگارتان(عزوجل) نزیك دەبن و لە دوارۆژیشدا بە نەفس و جەستەتان، ئەی زاهیدان ئێوە نازانن چۆن زوهد بكەن، بە نەفس و ئارەزوو و خودڕاییەوە زوهد دەكەن، بە خوداوە هاوەڵی گەورە پیاوان لە عاریفان بكەن، ئەوانەی زانای كاركەرن، بە زمانی ئامۆژگاری روویان لە خەڵكی كردووە بەبێ ئەوەی چاویان بڕیبێتە دونیای ئەوان، ئەوانەی دڵیان لە ئێوە كۆچی كردووە و روویان لە حەق(عزوجل) كردووە، ئەوان روویان لە خودا كردووە و لە هەرچی كەس و شتی ترە پشتیان كردووە.

ئەی گەنج، بە دڵ بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگارت بەر لەوەی دڵت لێت دوابكەوێت، تەنها بە قسەكردن دەربارەی صاڵحان قەناعەتت كردووە و وازت لە حاڵی صاڵحان هێناوە، خەریكی هیوا و ئاوات خواستنی، وەك ئەو كەسەی دەست دەبات بۆ ئاو و كاتێك دەستی دەكاتەوە هیچ لە دەستیدا نابینێت.

ئەی گەنج، بە دڵ بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگارت بەر لەوەی دڵت لێت دوابكەوێت، تەنها بە قسەكردن دەربارەی صاڵحان قەناعەتت كردووە و وازت لە حاڵی صاڵحان هێناوە، خەریكی هیوا و ئاوات خواستنی.

**هاوار بە حاڵت،** هیوا و ئاوات خواستن دۆڵی گەمژەییە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((ئاگادار هیوا و ئاوات خواستن بن چونكە دۆڵی گەمژەییە))[1].

كاری ئەهلی شەڕ ئەنجام دەدەی و هیوا و ئاوات بۆ پلە و پایەی ئەهلی خێر هەڵدەكێشیت، هەر كەس رجاكەی زاڵ بێت بەسەر ترسەكەیدا دەبێتە زەندیق، هەر كەسیش ترسەكەی زاڵ بێت بەسەر رجاكەیدا تووشی رەشبینی دەبێت، سەلامەتی لە هاوتایی و هاوسەنگی ئەو دوانەدایە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((گەر ترسی باوەڕدار و رجاكەی بكێشرێت هاوتا دەبن))[2].

---

[1] لم اجده بهذا اللفظ، إنما روى احمد بلفظ آخر وبسند حسن.

[2] قال الحافظ السخاوي في "المقاصد": لا اصل له في المرفوع، وقال العجلوني في "الكشف": قال في الآلي هذا مأثور عن بعض السلف وهو كلام صحيح.

له یەکێك لە خوداناسانەوە(رەحمەتی خودای لێ بێت) فەرمووی: (لە دوای مردنی سوفیانی سەوریم لە خەوندا بینی و پێم وت: خودا(عزوجل) چی لەگەڵ کردی؟ وتی: یەکێك لە پێیەکانم خستە سەر پردی سیرات و پێیەکەی ترم لە بەهەشت بوو)، سەلامی خودای لەسەر بێت، ئەو فەقیهێکی زاهید و واریع بوو، فێری زانست بوو کاری پێ ئەنجامدا، مافی زانستی دا ئەوەش بە کارکردن پێی، مافی کارکردنی دا بە ئیخلاص تیایدا، هەستا بە مافی خودا لەسەری و رازیکردنی بە مەبەستگرتنی خودا و گرتنەبەری رێگە بۆ لای، هەستا بە مافی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەری و رازیکردنی بە شوێنکەوتنی، رەحمەتی خودا لە ئەو و هەموو صالحان و ئێمەش لەگەڵیان، هەر کەس شوێنی پێغەمبەر(ﷺ) نەکەوێت و شەریعەتەکەی بە دەستێك لێ وەرنەگرێت و کتێبە دابەزێنراوەکە بۆ سەری بە دەستێکی تر وەرنەگرێت و لە رێگەی ئەوەوە نەڕوات بۆ لای خودا(عزوجل) ئەو کەسە تیاچووە و خەڵکیش تیادەبات، گومڕابووە و خەڵکیش گومڕا دەکات، ئەو دوانە(قورئان و سوننەت) دوو رێنیشاندەرن بۆ لای خودا(عزوجل)، قورئان رێنیشاندەری تۆیە بۆ لای حەق(عزوجل) و سوننەت رێنیشاندەری تۆیە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ).

خودایە لە نەفسمان بەدوورمان بگرە.

﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾﴾

البقرة: ٢٠١



# مەجلیسی بیست و شەش

## سکاڵانەبردن بۆ لای دروستکراوان

٢٠/ذي الحجة/ ٥٤٥هـ لە "الرباط" فەرمووی:

**لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی:** ((لە گەنجینەکانی عەرش شاردنەوەی موسیبەتەکانە))[1].

ئەی ئەو کەسەی لەلای خەڵکی سکاڵا دەکات لەدەست موسیبەتەکانی خۆی، سکاڵاکەت بۆ لای خەڵکی چ سوودێك بە تۆ دەگەیەنێت، ئەوان نە سوودت پێ دەگەیەنن نە زیان، کاتێك شان لەسەر ئەوان دادەی و هاوەڵ بۆ خودا دادەنێیت بەهۆی ئەوانەوە لە دەرگای خودا دوورت دەخەنەوە و هەڵتدەدەنە ناو خەشم و تووڕەیی خوداوە، پەردە دەخەنە نێوان تۆ و خودا، تۆ ئەی نەزان بانگەشەی زانست دەکەی، لە نەزانینی تۆ داوای دونیایە لە کەسانێکی تر جگە لە پەروەردگارت(عزوجل)، بە سکاڵاکردنت لەلای خەڵکی دەتەوێ لە ناخۆشییەکان قوتارت ببێت.

**هاوار بە حاڵت،** گەر ئەو سەگە چڵێسە فێری پارێزگاری دەبێت لە نێچیری راوکراو و چڵێسی و سروشتی خۆی وازلێدەهێنێت، گەر ئەو باڵندەیە بە فێرکردن سەرپێچی دەکات لە سروشتی خۆی و ئەوە وازلێدەهێنێت کە لەسەری بوو لە خواردنی نێچیرەکەی کاتێك راوی دەکات ئەوا نەفسی تۆ لەپێشترە بە فێرکردن و رامهێنان، فێری بکە و تێیبگەیەنە بۆ ئەوەی دینەکەت نەخوات، و پارچە پارچەت نەکات و ناپاکی لە ئەمانەتەکانی حەق(عزوجل) نەکات کە سپاردەی دەستی ئەو کراوە، ئایینی باوەڕدار لەلای گۆشت و خوێنەکەیەتی، هاوەڵی نەفست مەکە هەتا فێری نەکەی،

---

[1] بلفظ"من كنوز البر كتمان المصائب والأمراض والصدقة"، ذكره السيوطي في "الجامع الصغير" وعزاه لأبي نعيم في "الحلية".

کاتێك فێرت کرد و تێتگەیاند و نارامبوویەوە ئەوکات روو لە هەر شوێنێك دەکات هاوەڵی بکە و لە هەموو حاڵ و بارێکدا لێی جیامەبەرەوە، کاتێك دڵنیا و ئارام دەبێتەوە دەبێتە کەسی حەلیم و زانا و رازی بەوەی قەدەر لە بەشە دونیاییەکان رووی لێ دەکات و بۆی دەهێنێت، جیاوازی ناکات لە نێوان کرۆکی گەنم و نانی جۆ، لە حەزەکانی نەفس بەرزدەبێتەوە، گەر نەخوات لەلای باشترە، گەر بخوات بۆ هاوکاریکردنە لەسەر کاری خێر و گوێڕایەڵی و چاکەکاری، سروشتەکەی دەگۆڕێت و دەبێت بە کەسێکی خاوەن سەخاوەت و بەخشندەی زاهید لە دونیا، خاوەن رەغبەت بۆ دوارۆژ، پاشان گەر لە دوارۆژ زوهدی کرد و مەولای(عزوجل) داوا کرد ئەوا لەگەڵ تۆ و دڵی تۆ بەرەو دەرگای مەولا هەنگاو هەڵدەگرێت، ئەوکاتە بڕیاری پێشینەی بۆ دێت پێی دەڵێت: بخۆ ئەی ئەو کەسەی خواردن و خواردنەوەت نەدەخوارد، نەخۆشی ژێر تەنها لە دەستی پزیشك و لەسەر فەرمان و رێنموونی ئەو شت دەخوات لەگەڵ بەردەوامی ئەدەب و قبوولکردن لە ئەوەوە و وازهێنان لە هەڵپەی خواردن لە کاتی ئامادەبوونی ئەو و ئامادەنەبوونیدا، ئەی هەڵپەکەر بۆ خواردن و ئەی پەلەکەر لە خواردنیدا، خواردنێك بۆ تۆ خولقێنرابێت کێی تر دەتوانێت بیخوات جگە لە تۆ، پۆشاك و نشینگە و سواری و هاوسەرییەك بۆ تۆ خولقێنرا بێت کێ دەتوانێك دەستیان بۆ ببات و بیانپۆشێت، ئەم نەزانینەی تۆ چییە، دامەزراوییەکت پێوە نابینم، هەر بەو جۆرە ژیری و ئیمان و بەڕاستزانینی بەڵێنی خودات(عزوجل) پێوە شك نابەم، ئەی پەلەکار، گەر لەگەڵ پاوێکی بەرێز و بەخشندە کارت کرد لەگەڵی خاوەن ئەدەب بە، داوای سامان و کرێ مەکە، ئەو دوانە بەبێ داوا و بێ ئەدەبی بۆت دەستەبەر دەبن، گەر بتبینێت هەڵپە و داوا و بێئەدەبیت وازلێهێناوە تۆ لە هاوەڵەکانت جیادەکاتەوە، ئەو هاوەڵانەی کارت لەگەڵ دەکەن، ئەوکات خۆشگوزەرانیت پێ دەبەخشێت و پلە و پایەیەکی مەزنت پێ دەدات، بە بەرهەڵستی کردن و کێبەرکێ هاوەڵی خودا(عزوجل) ناکرێت، بەڵکو بە ئەدەبی جوان و سوکنایی دەرەوە و ناوەوە و تەبایی هەمیشەیی لەگەڵی هاوەڵی پەروەردگار دەکرێت، هەر کەس لەگەڵ قەدەر تەبا بێت هاوەڵییەکەی لەگەڵ حەق(عزوجل) بەردەوام دەبێت، کەسی عاریف و زانا بە خودا لەگەڵ خودا

راوەستاوە نەك لەگەڵ كەسان و شتانی تر، لەگەڵ خودا تەبایە نەك لەگەڵ شتێكی تر، بە خوداوە زیندووە و لە شتەكانی تر مردووە.

**ئەی گەنج**، گەر قسەت كرد بە نییەتێكی باش و چاك قسە بكە، گەر بێدەنگ بوویت بە نییەتێكی باش و چاك بێدەنگ بە، هەر كەس نییەت نەخاتە پێش كردارەوە نییەتی بۆ نییە، گەر قسەت كرد یان بێدەنگ بووی تۆ لەناو گوناهدای ئەگەر نییەتەكەت نەهێنابێتە راستە، بێدەنگ بوون و قسەكردنت بەبێ شوێنكەوتنی سوننەتە، لەباری گۆڕینی حاڵەكاندا و بەرتەسكبوونەوەی رۆزیدا -لەپێناو پاروو نانێك-لەگەڵ خودا دەگۆڕێن، لەباری شكانی ناموسێكدا بێباوەڕی بە هەرچی نیعمەتە دەردەبڕن، لەپێناو بڕین و تیابردنی نیعمەتی كەسێكدا وەك كەسانێكی ستەمكار و ملهوڕ حوكم بەسەریدا دەدەن، ئەوە بكە و ئەوە مەكە، بۆ ئەوەت كرد؟ پێویست بوو بەو جۆرە بێت... ئەمە دووری و خەشملێگیراوی و دوورخستنەوەیە، تۆ كێی ئەی رۆڵەی ئادەم، تۆ لە ئاوێكی سووك و قێزەون دروستكراوی، بۆ پەروەردگارت تەواوزوع بنوێنە و بۆی زەلیل ببە، گەر تەقوا بوونی نەبێت ئەوا لەلای خودا و بەندە صالحەكانی كەسێكی بەڕێز و بەخشندە نیت، دونیا پیس و بۆگەنە و دوارۆژ هەمووی حیكمەتە.

**ئەی خەڵكینە**، ئێوە چاودێرتان لەسەرە، ئێوە لە بریكاریی حەقدان و هەوڵێكتان لێی نییە، كەسانێكی ئاقڵ بن و چاوی دڵتان بكەنەوە، گەر لە ماڵی یەكێك لە ئێوە دەستەیەك ئامادە بوو خاوەن ماڵ دەستپێشخەری ناكات لە قسەكردن، بەڵكو قسەكەی بریتییە لە وەڵام، پرسیار لە شتێك ناكات پەیوەندی بە ئەوەوە نییە، یەكتاپەرستی فەرزە، داوای حەلاڵ فەرزە، داوای ئەوەی لە زانست هەر دەبێت ببێت فەرزە، وازهێنان لە بریتی و پاداشت لەسەر كردارەكان لەلای خەڵكی فەرزە، لە لادەران و دووڕووان خۆت بەدووربگرە و خۆت بگەیەنە بە كاروانی صالحان و صادیقان، گەر كارەكەت لا ئاڵۆز بوو و جیاوازیت بۆ نەكرا لە نێوان كەسی صالح و كەسی دووڕوو: (شەوەكەی هەستە و دوو ركات نوێژ بكە پاشان بڵێ: پەروەردگار، صالحانم لە بەندەكانت پێنیشان بدە، خودایە كەسێكم پێ نیشان بدە رێنموونیم بكات بۆ لای تۆ، و لە خۆراكی تۆم دەرخوارد بدات و لە خواردنەوەی تۆم پێ نۆش بكات، چاوی نزیكیم بە نووری نزیكی

تۆ بڕژێت، هەواڵم پێ بدات بەوەی بە ئاشکرا بینیویەتی نەك وەك تەقلید کردن)، خوداناسان لە خۆراکی فەزڵی خودایان(عزوجل) خواردووە، هۆگری ئەویان نۆشیوە و دەرگای نزیکی ئەویان بینیوە، تەنها بە هەواڵەوە نەوەستان بەڵکو تێکۆشان و ئارامیان گرت و سەفەریان لە خۆیان و خەڵکی کرد تا هەواڵ لەلایان بوو بە ئاشکرا و بینراو، کاتێك گەیشتنە خزمەتی پەروەردگاریان ئەدەبی دادان و پاڵفتەی کردن و حیکمەت و زانستی فێرکردن، موڵکی بەرینی خۆی پێنیشاندان و تێیگەیاندن لە ئاسمان و زەویدا تەنها ئەو بوونی هەیە و کەسێکی تر بوونی نییە ببەخشێت و بگرێتەوە، تەنها ئەو جوڵێنەر و وەستێنەری شتەکانە، ئەندازەگیر و بڕیاردەر تەنها ئەوە، عیززەتبەخش و زەلیلکەر تەنها ئەوە، زاڵکەر و رامکەر تەنها ئەوە، ئەو زاڵ و دەستڕۆیشتووە، ئەوەی لەلایەتی نیشانیان دەدات بۆیە بە چاوی دڵ و نهێنی دەیبینن، بۆیە دونیا و موڵکی دونیا لەلایان رێز و کێشی نییە، خودا پێمان نیشان بدە وەك چۆن بە ئەوانت نیشاندا، لەگەڵ لێبووردن و عافییەت، ﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ حَسَنَةٗ وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ٢٠١﴾ البقرة: ٢٠١

خەڵکینە، تەوبە بکەن لە وازهێنان لە تەقوا، تەقوا دەرمانە و وازهێنان لە تەقوا نەخۆشییە، تەوبە بکەن تەوبە دەوایە و گوناه نەخۆشییە، رۆژێك پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((دەتانەوێ پێتان نیشان بدەم دەوا و دەردی ئێوە کامەیە؟ وتیان: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: دەردی ئێوە گوناهە و دەوای ئێوە تەوبەکردنە))[1] تەوبە شەوی زاوایی ئیمانە، بەردەوامی لەسەر مەجلیسی یادی خودا و گوێڕایەڵی ئەو(سبحانە وتعالی) شیفای ئەو دەردەیە، بە زمانی ئیمان تەوبە بکەن سەرفرازی رووتان لێ دەکات، بە زمانی یەکتاپەرستی و ئیخلاص قسە بکەن سەرفرازی رووتان لێ دەکات، لە کاتی هاتنی ئافەت لە پەروەردگارتانەوە ئیمان بکەن بە چەکی دەستتان.

شێخ عبدالقادر لە سەرەتای هەر مەجلیسێکەوە دەیفەرموو: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢﴾ الفاتحة: ٢

[1] رواه البيهقي في "الشعب"

سێ جار دووبارەی کردەوە، لەدوای وتنی هەر جارێك بێدەنگ دەبوو، پاشان دەیفەرموو: "عدد خلقه و زنة عرشه و رضاء نفسه و مداد كلماته و منتهى علمه و جميع ماشاء و خلق وذرأ و برأ، عالم الغيب والشهادة الرحمن الرحيم، الملك القدوس العزيز الحكيم، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد يحي ويميت وهو حي لا يموت بيده الخير وهو على كل شيء قدير وإليه المصير، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله أرسله بالهدى ودين الحق ﴿لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ﴿٣٣﴾﴾ التوبة: ٣٣ ، أللهم صل على محمد وعلى آل محمد، واحفظ الإمام والأمة والراعي والرعية، ألف بين قلوبهم في الخيرات، ادفع شر بعضهم عن بعض، أللهم وأنت العالم بسرائرنا فأصلحها وأنت العالم بحوائجنا فاقضها، وأنت العالم بذنوبنا فاغفرها وأنت العالم بعيوبنا فاسترها، لا ترنا حيث نهيتنا، لا تفقدنا حيث أمرتنا، لا تنسانا ذكرك ولا تؤمنا مكرك ولا تحوجنا إلى غيرك، ولا تجعلنا من الغافلين، أللهم ألهمنا رشدنا وأعذنا من شر أنفسنا، أشغلنا بك عن من سواك، اقطع عنا كل قاطع يقطعنا بك، ألهمنا ذكرك وشكرك، وحسن عبادتك" پاشان لای دەکردەوە بەلای راستدا و دەیفەرموو: ((لا إله إلا الله ما شاء الله، لا حول ولا قوة إلا بالله العلي العظيم)) پاشان بۆ پێشەوە و بەرەو رووی خۆی هەمان دوعای دەفەرموو، پاشان بۆ لای چەپی هەمان دوعا، پاشان دەیفەرموو: ((لا تبدأ أخبارنا ولا تهتك أسرارنا ولا تؤاخذنا بسوء أعمالنا، لا تحينا في غفلة ولا تأخذنا على غرة ﴿رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا ۚ رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَآ إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِنَا ۚ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ ۖ وَٱعْفُ عَنَّا وَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَآ ۚ أَنتَ مَوْلَىٰنَا فَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٨٦﴾﴾ البقرة: ٢٨٦))

پاشان دەستی بە قسەکردن دەکرد بەوەی خودا(عزوجل) لەسەر زمانی والای دەکرد لە کردنەوەی دەروازەکانی بەنهان بەبێ خۆئامادەکردن، لە هەندێ مەجلیسدا هەواڵێکی لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) رادەگەیاند، یان حیکمەتێکی لە قسەی حەکیمان باس دەکرد، بۆیە بەوە دەستی بە قسەکردن دەکرد وەك وەرگرتنی بەرەکەت لێی و ریشەدارکردنی قسەکان و بناغە دانان بۆ وتارەکەی.

# مەجلیسی بیست و حەوت

## نەهیکردن لە درۆ

بەیانی رۆژی هەینی لە مەدرەسەکەی ١٧/جمادي الآخرة/ ٥٤٥ھ، فەرمووی:

کەسێکی ژیرمەند بە و درۆ مەکە، دەڵێیت من لە خودا(عزوجل) دەترسم بەڵام تۆ لە غەیری خودا دەترسی، نە لە جنی و نە لە مرۆڤ و نە لە فریشتە مەترسە، لە گیاندارانی قسەکەر و قسەنەکەر مەترسە، لە سزای دونیا مەترسە، لە سزای دوارۆژ مەترسە، بەڵکو لە خاوەن سزاکە بترسە کە سزا دەسەپێنێت، کەسی ژیرمەند لە پێناوی خودادا لە لۆمەی لۆمەکەران ناترسێت، ئەو لە قسەی هەر کەسێکی تر جگە لە خودا وەکو کەڕ وایە، هەموو خەڵکی لەلای ئەو دەستەوسان و پەککەوتە و نەخۆش و هەژاران، ئەمانە و نموونەی ئەمانە بریتین لە زانایان کە سوود لە زانستەکەیان دەبینرێت، زانایان بە شەرع و حەقیقەتی ئیسلام بریتین لە پزیشکانی ئاین و راستکەرەوەی لاری و لادان، ئەی ئەو کەسەی دینەکەی شکستی بەسەردا هاتووە برۆ پێشەوە بۆ لایان(بۆ لای صالحان) بۆ ئەوەی شکستەکەت بگرنەوە.

ئەو کەسەی دەردی دابەزاندووە هەر ئەو کەسەیە دەوا دادەبەزێنێت، ئەو زاناترە بە بەرژەوەندی تا کەسانی تر، پەروەردگارت لە کارەکانیدا تۆمەتبار مەکە، نەفست بە تۆمەت و لۆمەکردن لە هەر کەسێکی تر لەپێشترە، پێی بڵێ: بەخشین بۆ کەسێکە گوێڕایەڵە و عەساش بۆ کەسێك کە یاخی بێت، گەر خودا خێری بۆ بەندەیەك ویست لێی دەگرێتەوە، گەر ئارامی گرت بەرزی دەکاتەوە و جوان و باشی دەکات و پێی دەبەخشێت و قەناعەتی پێ پەیدا دەکات.

خودایە، داوای نزیکیت لێ دەکەم بەبێ بەلا، لە قەزا و قەدەری خۆتدا لوتفمان پێ بکە، خودایە، شەڕی شەڕەنگێزان و فێڵی بەدکارانمان لێ بەدوور بگرە، چۆنت دەوێ و

وەك دەتەوێت پارێزگاریمان لێ بکە، داوای لێبوردن و عافییەتت لە دین و دونیا و دوارۆژ لێ دەکەین، داوای کۆمەکی و ئیخلاصت لێ دەکەین لە کار و کردەوەی چاکەدا. ئامین.

**پیاوێك رۆیشت بۆ لای ئەبو یەزیدی بوستامی(رەحمەتی خودای لێ بێت) تەماشای لای راست و لای چەپی دەکرد، ئەبو یەزید پێی وت: ئەوە چیتە؟**

وتی: شوێنێکی پاکم دەوێت نوێژی تێدا بکەم، ئەویش پێی وت: دڵت پاکبکەرەوە و لە کوێ دەتەوێ نوێژی خۆت بکە، تەنها موخلیصان ریا دەناسنەوە، کاتی خۆی لەناو ریادابوون و لێی رزگار بوون، ئەوە لەمپەرێکە لەبەردەم خوداناساندا هەر دەبێت لەسەری بپەڕنەوە، ریا و خۆپەسەندی و دووڕوویی لە تیرەکانی شەیتانن کە دەیانگرێتە دڵ، روو لە گەورەپیاوان بکەن و رۆیشتن بۆ لای خودایان لێوە فێر بن، ئەوە رێگەیەکە ئەوان گرتیانە بەر، پرسیاری ئافەتی نەفس و ئارەزوو و سروشتیان لێ بکەن، چونکە ئەوان ئازاری ئافەتی ئەوانەیان چەشتووە، دەزانن نەخۆشی و پێچ و پەناکانیان لە کوێدایە، ئەوان سەردەمێکی زۆر لەو مەیدانەدا بوون، زۆری خایاند تا زاڵبوون بەسەریاندا و جڵەویان گرتە دەست، بە فووی شەیتان بە بەرتدا فریو مەخۆ، بە تیرەکانی نەفس شکست مەخۆ، چونکە ئەو تیرەکانی خۆی لە تۆ دەگرێت و تەنها بەو رێگەیە زاڵ دەبێت بەسەر تۆدا، شەیتانی جن تەنها لە رێگەی شەیتانی ئینسەوە بەسەر تۆدا زاڵ دەبێت، ئەوەش بریتییە لە نەفس و هاوەڵ و هاودەمی خراپ، پەنا بگرە بە خودا(عزوجل) و هانای بۆ ببە و داوای کۆمەکی لێ بکە، ئەو لەو دوژمنانە دالدەت دەدات، گەر خودات بینییەوە و ئەوەی لەلایەتی بینیتەوە و بەدەستت هێنا ئەوا لەلای ئەوەوە بگەڕێرەوە بۆ لای منداڵ و خانەوادە و دروستکراوەکان و ئەوان ببە بۆ لای خودا، پێیان بڵێ: هەموو خانەوادەکەتان بهێنن بۆ لام، کاتێك یوسف(علیه السلام) موڵك و دەسەڵاتی گرتە دەست فەرمووی بە خانەوادەکەی:

﴿وَأْتُونِي بِأَهْلِكُمْ أَجْمَعِينَ ۝﴾

یوسف: ٩٣

بێبەش ئەو کەسەیە لە خودا بێبەشە و نزیکی لە ئەو لە دونیا و دوارۆژدا لەدەست دەدات، خودا(عزوجل) لە یەکێك لە کتێبەکانیدا دەفەرموێت: (ئەی رۆڵەی ئادەم، گەر منت لەدەست بچێت هەموو شتێکت لەدەست دەچێت)

چۆن حەقت(عزوجل) لەدەست ناچێت لە کاتێکدا تۆ پشتت لە خودا و بەندە باوەڕدارەکانی کردووە، بە گوفتار و رەفتارت ئازاریان دەدەی، بە ناوەوە و دەرەوە پشتت لێ کردوون.

**لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ):** ((ئازاردانی باوەڕدار لەلای خودا خراپترە لە پازدە جار روخاندنی کەعبە و بەیتولمەعمور))[1].

**هاوار بە حاڵت، گوێبگرە،** ئەی ئەو کەسەی بەردەوام ئازاری هەژارانی بەردەرگای خودا(عزوجل) دەدەی، ئەوان باوەڕیان بە خوداهێناوە و بۆ ئەو سوڵحاون، خودا دەناسن و شانیان لەسەر داداوە، هاوار بە حاڵت، تۆ بەم نزیکانە دەمری و راتدەکێشنە دەرەوە و لە ماڵەکەت دەرتدەکەن، ئەو ماڵەش کە فەخرت پێوە دەکرد دابەش دەکرێت و سوودێك بە تۆ نابەخشێ و بۆت ناگەڕێتەوە.



---

[1] اخرجه ابن ماجة بلفظ آخر.

# مەجلیسی بیست و هەشت

## خۆشەویستی لە پێناوی خودا( عزوجل )

لە "الرباط" ٩/جمادي اللآخرة/ ٥٤٥هـ فەرمووی:

**لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی:** ((پیاوێك هات بۆ لای و پێی وت: من تۆم لەبەر خودا(عزوجل) خۆشدەوێت، پێی فەرموو: بەڵا بکە بە بە عەبایەك و بیپۆشە، و هەژاری بکە بە عەبایەك و بیپۆشە))[١].

چونکە تۆ دەتەوێت بە سیفەتی من(پێغەمبەر) خۆت برازێنیتەوە، وەسفی من وەربگریت، چونکە لە مەرجی خۆشەویستی تەباییە، کاتێك ئەبوبەکری صدیق(خودا لێی رازی بێت) لە خۆشەویستی پێغەمبەری خودادا(ﷺ) راستی کرد هەمووماڵەکەی بۆ خەرج کرد و بە سیفەتی ئەو خۆی رازاندەوە و لە هەژاریدا بەشداری ئەوی کرد تاکو ببێتە خۆشەویستی ئەو، لە دەرەوە و ناوەوە لەگەڵی تەبا بوو، لە نهێنی و ئاشکرایدا لەگەڵی تەبا بوو، تۆش ئەی درۆزن، بانگەشەی خۆشەویستی صاڵحان دەکەی و دینار و درهەمەکانی خۆتیان لێ دەشاریەوە لەگەڵ ئەوەش داوای نزیکی لەوان و هاوەڵی ئەوان دەکەیت، کەسێکی ژیر بە، ئەوە خۆشەویستییەکی درۆزنانەیە، کەسی موحیب لە مەحبووبەکەی هیچ ناشرێتەوە و ئەو بەسەر خۆیدا پێش دەخات، هەژاری بە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) پەیوەست بوو و لێی جیانەدەبوویەوە، بۆ ئەو مەبەستە فەرموویەتی: ((هەژاری بۆ ئەو کەسەی منی خۆشدەوێت خێراترە لە جاریبوونی ناو بۆ کۆتاییەکەی))[٢].

---

[١] تقدم تخريجه.

[٢] تقدم تخريجه.

عائشه(خودا لێی رازی بێت) دەفەرموێت: (تا پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەناوماندا بوو دونیا لەسەرمان لێڵ و دژوار بوو، کاتێك کۆچی دوایی کرد دونیا بەسەرماندا دباری، بۆیە مەرجی خۆشەویستی پێغەمبەری خودا بریتییە لە هەژاری، مەرجی خۆشەویستی خوداش(عزوجل) بریتییە لە بەلا).

لە یەکێك لە خوداناسانەوە(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت: (بەلا بە وەلاوە(الولاء) گرێدراوە، تاکو کەسەکە بانگەشەی خۆشەویستی خودا(عزوجل) نەکات لەگەڵ درۆ و دووڕوویی و ریا)، لە بانگەشە و درۆ بگەڕێوە، سەری خۆت مەخە بەر مەترسی، گەر راستگۆیانە هاتووی باشە، ئەگینا شوێنی ئێمە مەکەوە، خۆت مەڕازێنەرەوە و فریوکاری وازلێبهێنە، تۆ وەك پارەی تەزویر وایت لەلای عوملەچی، چونکە دەتناسێتەوە و لێت وەرناگرێت و رسوا و شەرمەزارت دەکات، هۆگری لەگەڵ مار و درندە پەیدا، مەکە چونکە رۆژێك تۆ تیادەبەن، گەر مارەوانی لە مارەکە بچۆ پێشەوە، گەر هێزت هەیە لە درندەکە بچۆ پێشەوە، رێگەی خودا(عزوجل) ئاتاجە بە صدق، ئاتاجە بە نووری مەعریفەت، خۆری مەعریفەت لە دڵی صادیقان هەڵهاتووە و نە شەو و نە رۆژ لێیان ئاوا نابێت.

ئەی گەنج، پشت لە دووڕووان بکە، ئەوانەی خۆیان خستووەتە بەر خەشم و تووڕەیی خودا، کەسێکی ژیر بە و لە زۆرینەی ئەهلی ئەم سەردەمە نزیك مەبەرەوە، ئەوان گورگن و پۆشاکی مرۆڤیان پۆشیوە، ئاوێنەی بیر بگرە دەست و لێی وردبەرەوە، داوا لە خودا(عزوجل) بکە بەرچاوڕوونیت لەسەر خۆت و خەلکی پێ بدات، من خەڵك و خودام تاقیکردەوە، بینیم شەڕ لەلای خەلکییە و خێر لەلای خودایە.

خودایە لە شەڕی خەلکی سەلامەتمان بکە و لە دونیا دوارۆژدا خێری خۆتمان پێ بدە، من ئێوەم بۆ خۆم ناوێت، بەڵکو ئێوەم بۆ خۆتان دەوێت، لە فێڵ و داوی ئێوەدا دەجەنگم، هەر شتێك لە ئێوە وەردەگرم بۆ ئێوەیە نەك بۆ من، ئەوەی تایبەتە بە خۆم لەلای خۆم هەیە و بێنیازم لەوەی لێتان وەردەگرم، تەنها کەسابەت و تەوەکول لەسەر خودا(عزوجل) لەلای من هەیە، چاوەڕوانی ئەوە نیم بۆم دەهێنن وەك چۆن ئەو کەسە دووڕووە ریابازە لە ئێوە چاوەڕوانە و تەوەکولی بە ئێوە بەستووە و پەروەردگاری لەیاد

کردووە، من سەنگی مەحەکی ئەهلی سەر زەویم، بۆیە ژیر بن و بە زرق و برقەوە روو لە من مەکەن، چونکە بە کۆمەکی خودا و شایستەکردنی من لەلایەن ئەوەوە(سبحانه وتعالی) چاکتان لە خراپ جیادەکەمەوە، گەر بۆ سەرفرازی هاتووی ببە بە دەزگا بۆ چەکوشەکانی من تاکو دەماغی نەفس و ئارەزوو و سروشت و شەیتان و دوژمن و هاوەدمانی خراپت بکوتم، پەنابگرن بە پەروەردگارتان بۆ سەرکەوتن بەسەر ئەو دوژمنانەدا، سەرکەوتوو کەسێکە لەسەریان ئارام دەگرێت، رسوا و دۆڕاویش کەسێکە دەدرێتە دەست ئەوانە، ئافەتەکان زۆرن و دابەزینەری ئافەتەکان یەك کەسە، نەخۆشییەکان زۆرن و پزیشکەکەیان یەك کەسە، ئەی ئەوانەی نەفستان نەخۆشە نەفسی خۆتان رادەستی پزیشك بکەن، لەوەی پێتان دەکات تۆمەتباری مەکەن، ئەو لە خۆتان بۆ ئێوە بەبەزەیی ترە، لەبەردەمیدا لاڵ و بێدەنگ بن و بەرهەڵستی مەکەن هەموو خێری دونیا و دوارۆژی لا دەبیننەوە، خوداناسان لە بێدەنگی و خامۆشی و سەرسامییەکی سەراپادا بوون، کاتێك ئەوەیان بۆ تەواو و بەردەوام بوو خودا ئەوانی هێنایە قسە وەك چۆن بێگیانەکان لە رۆژی دوایدا دێنێتە قسە، قسە ناکەن تا دەهێنرێنە گۆ، وەرناگرن تا پێیان وەردەگرن، کرانەوە روویان لێ ناکات تا دەکرێنەوە، دڵیان لەناو کۆڕی فریشتەکاندایە، خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿لَّا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ۝٦﴾ التحریم: ٦

ئەوان گەیشتن بە کۆڕی فریشتەکان و پلە و پایەیان لەوانیش بالآتر بوو، مەعریفەت و زانستیان بە خودا لە ئەوان زۆرتر بوو، فریشتەکان خزمەتکار و شوێنکەوتەی ئەوانن، سوودیان لێ دەبینن، چونکە حیکمەت بەسەر دڵیاندا دادەبارێت، لە هەرچی ئافەتێك روو لە ئەندامەکان و جەستە و نەفسیان دەکات پاسەوانی دڵیان دەکرێت، دڵی ئەوان ئافەت رووی لێ ناکات، گەر دەتەوێ بگەی بە مەنزیلەی ئەوان ئەوا ئیسلام لە خۆتدا بەدیبهێنە، پاشان واز لە گوناه بهێنە ئەوەی ئاشکرایە و ئەوەی شاراوەتەوە، پاشان وەرعێکی تەواو، پاشان زوهد لەوەی پێت دەبەخشرێت و بێنیازبوون لە هەرچی شتە بە هۆی نزیکی لە خوداوە، گەر بێنیازبوونت بە نزیکی لە خودا بۆ بەدەستهات لە بەخششەکانی خۆی بەسەر تۆدا دەرێژێت، و دەرگای بەشەکانی بەرووی تۆدا دەکاتەوە،

دەروازەی لوتف و بەزەیی و منەتی خۆی بۆ تۆ والآ دەکات، یەکەمجار دونیا لەسەرت بەرتەسك دەکاتەوە، پاشان تا کۆتایی بەرینی دەکات، ئەمانە دانە دانەیەکن لە دۆستانی خودا و صدیقان بەهۆی زانستی خودا بە تەقوایان، ئەوان بە شتێکەوە لە خودا بێئاگا نابن، بەلآم زۆرینەیان دونیا لەسەریان بەرتەسکە، چونکە خودا یەکلابوونەوەی ئەوانی بۆ خۆی پێخۆشە، هەر بەو جۆرە چوونە ژوورەوەیان بۆ لای ئەو و داوایان لە ئەو(سبحانه وتعالى)، گەر دونیایان پێ بدات لەوانەیە پێیەوە سەرقاڵ ببن و لە خزمەت کردنی خودا دووربکەونەوە و لەگەڵ دونیا دابنیشن، ئەمە زۆرینەیانە، ئەویتریش زۆر دەگمەنە، دەگمەنیش حوکمی پێغەمبەرمان(ﷺ) بەسەریدا ناسەپێت، ئەو(ﷺ) لەوانە بوو هەموو دونیای بۆ خرایە روو، بەلآم لە خزمەت کردنی خودا سەرقاڵی نەکرد، لای بە لای بەشە دونیاییەکاندا نەکردەوە لەگەڵ کەماڵی زوهد و پشتکردن لە دونیا، هەموو گەنجینەکانی زەوی بۆ خرایە روو، بەلآم ئەو رەدی کردنەوە و فەرمووی:

((خودایە بە گەدایی بمژیینە، بە گەدایی بمرێنە، و لەگەڵ گەدایاندا حەشرم بکە))[1].

زوهد لە بەشی خۆ کارێکی باشە، ئەگەر نە، کەس ناتوانێت لە بەشی خۆی زوهد بکات، باوەڕدار لە قورسی و شەکەتی هەوڵ و هەڵپە ئاسوودە بووە، هەڵپە ناکات و پەلە ناکات، بە دڵ لە شتەکان زوهدی کردووە و بە نهێنی و پەنهانی پشتی تێکردوون و بەوەوە خۆی سەرقاڵ کردووە کە فەرمانی پێکراوە، ئەو دەزانێت بەشەکەی تیاناچێت بۆیە هەڵپەی بۆ ناکات، دەستبەرداری بەشەکانی خۆی بووە و پشتگوێیخستوون و سەرقاڵی دەربڕینی گەردنکەچییە بۆ خودا و داوای لێ دەکات قبووڵی بفەرموێت.

**ئەی گەنج، تۆ ناتاجیت بە ئیمانێك بە رێگەی خودادا(عزوجل) هەنگاوت پێ هەڵبگرێت، بتبات بەرەو یەقین و تیایدا دامەزراوت بکات، لە سەرەتای سلوکەوە لەسەر ئەم رێگەیە ئاتاجی بە کیسەی پارە، لە کۆتایی رێگەکەشدا ئاتاجی بە ئیمان، بە پێچەوانەی رێگەی "مەککە"وە، هەندێ لە خوداناسان دەڵێن: رێگەی مەککە**

---

[1] رواه الترمذي وابن ماجة والحاكم وصححه و وافقه الذهبي.

پێویستی بە ئیمان و کیسەی پارەیە، ئەم رێگەیە من ئاماژەی پێ دەکەم پێویستی بە کیسەی پارە و ئیمانە لە سەرەتا و لە کۆتاییدا.

**لە سوفیانی سەورییەوە(رەحمەتی خودای لێ بێت):** یەکەجار کە بەدوای زانستدا دەگەڕا توورەکەیە پارەی هەلگرتبوو پێنجسەد دیناری تێدا بوو، لەو پارەیەی خەرج دەکرد و زانست فێر دەبوو و دەستی دەدا لە دینارەکان و دەیوت: ئەگەر تۆ نەبوویتایە بۆ خزمەتکاری خاولیان دەدا بەسەر شانماندا، کاتێک زانستی بەدەستهێنا و خودای ناسی ئەوەی مابوویەوە لە پارەکەی لە یەک رۆژدا بەسەر هەژاراندا دابەشی کرد و وتی: گەر ئاسمان ئاسن بێت و نەبارێنێت، زەوی تاشە بەرد بێت و هیچی لێ نەڕوێت من خەم و هەولی رۆزییم هەبێت ئەوا خۆم بە بێباوەڕ دادەنێم.

کەسابەت بکە و پەیوەستبە بە هۆیەکانەوە تا ئیمانەکەت بەهێز دەبێت، پاشان لە هۆیەکانەوە بگوێزەرەوە بۆ خاوەنی هۆیەکان، پێغەمبەران(علیهم السلام) لەسەرەتای کاریانەوە کەسابەتیان کردووە و لەسەر خۆیان پێویست کردووە و دەستیان بە هۆیەکانەوە گرتووە لە کۆتایی کارەکەشیاندا پشتیان بە خودا بەستووە، کەسابەت و تەوەکولیان لە سەرەتا و کۆتاییەوە و لەڕووی شەریعەت و حەقیقەتەوە لە خۆیاندا کۆکردووەتەوە، ئەی بێبەش با دەستت لە کەسابەتدا بێت و تەوەکول مەبەستە بەوەی لە دەستی خەلکیدایە و سوالیان لێ بکەی، ئەو کات بێباوەڕ دەبیت بە نیعمەتی خاوەن قەدەرەکان و خودا خەشمت لێ دەگرێت و دوورت دەخاتەوە، وازهێنان لە کەسابەت و سوالکردن لە خەلکی سزایەکە لە خوداوە(عزوجل) بۆ بەندە، کاتێک تیاچوون رووی لە مولکەکەی سولەیمان(علیە السلام) کرد بەدوایدا گەدایی و هەژاری رووی لێ کرد، لە رۆژگاری مەملەکەتەکەیدا بەدەستی دەهێنا و دەیخوارد، کاتێک خودا(عزوجل) دونیای لێ بەرتەسک کردەوە لە مەملەکەتەکەی دەریکرد و رێگەی رۆزی لێ تەنگەلان کرد تا وای لێ هات داوای لە خەلکی دەکرد، هۆی ئەو سزایە چل رۆژ عیبادەتی ئافرەتێک بوو بۆ بتێک لە مالی سولەیماندا(علیە السلام)، بۆیە چل رۆژ لە سزادا مایەوە، چل رۆژ بە چل رۆژ، خوداناسان ئاسوودەیی و دلخۆشی بۆ خەم و هەژارمیان نییە و کۆلیان لە پشت داناگیرێت، چاویان ئارام ناگرێت و دلنەواییەک بۆ

موسیبەتەکەیان نییە تا بە خزمەتی پەروەردگاریان دەگەن، لیقای ئەوانە بە خودا دوو جۆرە: لیقایەك لە دونیادا بۆ دڵ و نهێنی و پەنهانیان ئەمەیان زۆر دەگمەنە، لیقای دوارۆژیش کاتێك بە خزمەتی پەروەردگاریان دەگەن و ئاسوودەیی و ئارامی و دڵخۆشی روویان لێ دەکات، بەڵام بەر لەو دوانە موسیبەتەکەیان هەمیشەییە.

**دوای قسەکردن لە نەفس فەرمووی:**

**ئەی گەنج**، نەفست لە حەزەکان و چێژەکان بگەڕەوە، خواردنێکی پاکی دەرخوارد بدە، با خواردنەکە پیس نەبێت، خواردنی پاك بریتییە لە حەڵاڵ، خواردنی پیسیش بریتییە لە حەرام، (پاشان فەرمووی) حەڵاڵی دەرخوارد بدە تا لە سنووری خۆی دەرنەچێت و لوتبەرزی رووی لێ نەکات و بێئەدەبی نەنوێنێت، خودایە مەعریفەمان بە خۆت پێ ببەخشە تاکو بتناسین. ئامین.



# مەجلیسی بیست و نۆ

## تەوازوع نەنواندن بۆ دەوڵەمەند لە پێناو دەوڵەمەندییەکەیدا

١١/جمادي الآخرة/ ٥٤٥ھ لە مەدرەسەکەی فەرمووی:

**لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی:** ((هەر کەس بۆ دەوڵەمەندێك بچەمێتەوە- لەپێناو داوای ئەوەی لە دەستیدایە- دوو لەسەر سێی دینەکەی لەدەست دەدات))[١].

گوێگرن ئەی دووڕووان، ئەم حاڵی کەسێکە بۆ دەوڵەمەندان دەچەمێتەوە، ئەی دەبێ ئەو کەسە حاڵی چۆن بێت نوێژ و ڕۆژوو و حەج بۆ ئەوان دەکات و لۆمـە و زەمنشـتی ئەوان قبووڵ دەکات، ئەی ئەوانەی هاوەڵتان بۆ خودا(عزوجل) داناوە، هیچ ئاگایەکتان لە خودا و پێغەمبەرەکەی(ﷺ) نییە، موسڵمان بن و تەوبە بکەن و ئیخلاصتان لـە تەوبەدا هەبێت تا ئیمانەکەتان ساغ و سەلامەت بێت و یەقینەکەتان گەشە بکات و یەکتاپەرستییەکەتان بڵاوببێتەوە و لق و پۆپەکانی خۆی بگەیەنێتە عەرش.

**ئەی گەنج،** گەر ئیمانەکەت پەروەردە ببێت و گەشە بکات و درەختەکەی بەرز ببێتەوە ئەوا خودا(عزوجل) لە خۆت و خەڵکی و کەسابەت و بەدەستهێنان بێنیازت دەکات، خودا(عزوجل) نەفس و دڵ و نهێنیت تێر دەکات، لە دەرگای خۆی ڕاوەستاوت دەکات و بە یادی خۆی و نزیکی لە ئەو و هۆگری بەوەوە لـە هەژارییەکەت بێنیازت دەکات، گرنـمـەدە بەوانـەی لـە دونیـا دەخۆن و پێیـەوە سـەرقاڵن، گرنـمـەدە بـەوەی لەدەستی ئەواندایە، چونکە بینینەکەت بۆی دەبێتە زەحمەت و تێچوون و تاریکی، ئەی ئەو کەسەی بانگەشەی زانست دەکەی و لە ڕۆڵەکانی دونیا داوای دونیا دەکەی و بۆیان

---

[١] رواه البیهقي بلفظ آخر.

زەلیل دەبی تۆ لەسەر زانست خودا گومڕایی کردووی، بەرەکەتی زانستەکەت ڕۆیشتووە، کرۆك و ناوەرۆکی ڕۆیشتووە و توێکڵەکەی ماوەتەوە، تۆش ئەی ئەو کەسەی بانگەشەی عیبادەت دەکەی و دڵت خەڵکی دەپەرستیێ و لێیان دەترسیێ و ڕجای لەلایانە، ڕووالەتی عیبادەتەکەت بۆ خودایە و ناوەوەی بۆ خەلکییە، هەموو داوا و خەم و پەژارەیەکت بۆ ئەو شتەیە لەدەستی ئەواندایە لە درهەم و دینار و شتی دونیایی، ڕجای حەمد و مەدح و سەنای ئەوانت هەیە، لە زەمکردن و پشتهەلکردنی ئەوان دەترسی، لە لێگرتنەوەیان دەترسی و ڕجای پێ بەخشینی ئەوان دەکەی، ئەمەش بە پێڕاکێشانی زۆر و فێلکردن و زمان لووسی لەبەر دەرگایان.

**هاوار بە حاڵت**، تۆ هاوەڵدانەری دووڕووی ریابازی پێچلێدەری زەندیقیت، هاوار بە حاڵت، بۆ کێ زرق و برق لە خۆت دەدەی، خۆت لە کەسێك دەگۆڕی کە:

﴿ يَعْلَمُ خَائِنَةَ الْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِي الصُّدُورُ ﴿١٩﴾ ﴾ غافر: ١٩

**هاوار بە حاڵت**، لە نوێژدا ڕادەوەستی و دەڵێیت "الله أكبر" لەگەڵ ئەوەش لە وتنی ئەوەدا درۆ دەکەی، خەلکی لە دلی تۆدا لە خودا(عزوجل) گەورەترن، تەوبە بکە بۆ لای خودا(عزوجل)، چاکەیەك بۆ هیچ کەس جگە لە خودا ئەنجام مەدە، نە بۆ دونیا و نە بۆ دوارۆژ، لەو کەسانە بە ڕووی پاکی خودایان دەوێت، مافی پەروەردگاری خودا بدە، بۆ مەدح و سەنا کار مەکە، بۆ پێدان و لێگرتنەوە کار مەکە، هاوار بە حاڵت، ڕۆزییەکەت کەم و زیاد ناکات، ئەوەی لە خێر و شەڕ بۆ تۆ بڕیاری لەسەر دراوە هەر دەبێت ڕووت لێ بکات، بە شتێکەوە خەریك مەبە براوەتەوە و کۆتایی پێهاتووە، بە گوێڕایەلی کردنی خوداوە سەرقاڵ بە، هەڵپەت کەم بکەرەوە و هیوا و ئاوات کورت بکەرەوە، مردن بێنە پێش چاوی خۆت بەم جۆرە سەرفرازی بەدەست دەهێنیت، لە هەموو حاڵ و بارێکدا لەگەڵ شەرع تەبا بە.

خەلکینە، ئەو کەمەش لە تەبایی لەگەڵ شەرع کە لەلاتان بوو لە ئاشکرا و پەنهاندا وازتان لێهێنا و شوێنی نەفس و ئارەزوو کەوتن، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بە حیلمی خودا(عزوجل) فریوتان خوارد، لە دونیادا سزا و تۆڵەتان لەسەر هەلدەگرێت و لە

دوارۆژدا لـه هـەموو لایەکـەوە بەسـەر ئێـوەدا دایـدەبارێنێت، دەتگرێـت و تۆڵـەت لێدەکاتەوە، پاشان مردن و دابەزین بۆ گۆڕ رووت لێ دەکات، تەنگەلانی و سزای گۆڕ هـەتا رۆژی دوایـی بـەرۆکت دەگـرن، پاشـان لاشـە رزیوەکـەت یەکدەگرێتـەوە و لـە کۆبوونەوەی مەزندا حەشر دەکرێن، لەسەر گەردیلەیەك لە کار و کردەوە و هەموو ئەوەی ئەنجامت داوە لە ساتەکاندا دادگایی دەکرێیت، پرسیاری زۆر و کەمت لێ دەکرێت، تۆ بتێکی بەبێ رۆح، پێستێکی وشکهەلگەڕاوی بەبێ مانا و هێز، تەنها شایستەی ئاگری و بۆ ئەوێ شیاویی، عیبادەتەکانت ئیخلاصی تێدا نییە، گەر عیبادەتەکان رۆحیان تێدا نەبێت تۆ و عیبادەتەکان تەنها بۆ ئاگر شیاون، ئاتاج نیت بە خـۆ مانـدووکردن، گـەر ئیخلاصت لە کار و کردەوەکاندا نەبێت هیچ سوودێکت پـێ ناگەیـەنێت، تـۆ لەوانـەی قورئان دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ ۝٣﴾ الغاشية: ٣، لە دونیادا کاری کردووە و لە رۆژی دواییدا ماندووبوونی بۆ دەمێنێتەوە و دەچێتە ناو ئاگرەوە، مەگەر لەم دونیا تەوبە بکەی و داوای لێبووردن و لێخۆشبوونی لێ بکەی بەر لـەوەی مـەرگ بـەرۆکت بگرێت، بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت(عزوجل) بە نوێکردنەوەی ئیسـلام و تەوبـەی باش و ئیخلاص لە تەوبەکەدا بەر لەوەی مردن رووت لێ بکات، ئەوکات بەڕووی تۆدا دەرگاکە دادەخرێت و ناتوانی بچیتە ناو دەرگای تەوبەوە، بە هەنگاوەکانی دڵ بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگارت تا دەرگای چاکەی ئەو بەڕووی تۆدا دانەخراوە و رادەستی نەفس و هێز و ماڵی دونیات بکات و لە هەموو ئەوانەدا فەرمانت نەکات.

**هاوار بە حاڵت**، بۆ شەرم لە خودا ناکەی، دینارت کردووە بە پەروەردگاری خۆت و درهەمت کردووە بە خەم و پەژارە و بە تەواوی ئەوت(سبحانه وتعالى) لـەبیرکردووە، بـەم نزیکانە هەواڵی خۆت دەبیستی.

**هاوار بە حاڵت**، دوکان و ماڵەکەت بـۆ خانـەوادە و منداڵـەکان تـەرخان بکـە، بـە فەرمانی شەرع کەسابەتیان بۆ بکە و دڵت پشتبەستنی بە خودا بێت(عزوجـل)، رۆزی خۆت و ئەوان لە خودا(عزوجل) داوا بکات نەك لە ماڵ و دوکانەکەت، ئـەوکات رۆزی خۆت و ئەوان لەسـەر دەستت جاری دەبێت و فەزڵ و نزیکی و هۆگریش بە خـوداوە بـۆ دڵت بەدیدێنێت، منداڵەکانت لە تۆ بێنیاز دەبن و تۆش بە خوداوە بێنیاز دەبیت، بەوەی

خودا دەیەوێت و چۆنی بوێت ئەوان بێنیاز دەکات و بە دڵی تۆش دەوترێت ئەمە بۆ تۆیە و ئەمە بۆ منداڵەکانت، چۆن دەگەیە ئەم مەقامە لە کاتێکدا بە هەموو تەمەنت هاوەڵدانەرێکی بێبەشی دەرکراو بوویت لە قاپی خودا، لە دونیا و کۆکردنەوەی دونیا تێر ناخۆی، دەرگای دڵت داخە و هەمووان بێهیوا بکە لە چوونەژوورەوە بۆ ناوی، تەنها یادی حەق(عزوجل) دابارێنە بە سەریدا، تەوبە بکە لە تەوبەکردن لە کار و کردەوەکانت، پەشیمان ببەرەوە لەو پەشیمانییەی لە کارە ناشیرینەکان و خراپی ئەدەبەوە لات دروستبووە، زۆر بگری بەسەر ئەوەی ئەنجامتداوە، دڵنەوایی هەژاران بکە بە شتێك لە ماڵ و سامانەکەت و دەستنوقاو مەبە بەرانبەریان، بەم نزیکانە ماڵەکەت بەجێدەهێڵیت، باوەڕداری خاوەن یەقین بە وەرگرتنەوەی پاداشت لەسەر بەخشینەکانی لە دونیا و دواڕۆژدا دەستنوقاو نییە لە بەخشینی ماڵەکەی.

لە عیساوە(علیه السلام) بە ئیبلیسی فەرموو: (خۆشەویسترین دروستکراو لەلای تۆ کێیە؟ وتی: باوەڕدارێکی دەستنوقاو، فەرمووی: ئەی خراپترینیان لەلای تۆ کامەیە؟ وتی: کەسێکی فاسیقی بەخشندە، پاشان پێی فەرموو: بۆچی ئەوە؟ وتی: چونکە هیوام وایە باوەڕدارە دەستنوقاوەکە بەهۆی دەستونوقاوییەکەیەوە بەرێتەوە بۆ ناو گوناه و یاخیبوون، بەڵام دەترسم فاسقە بەخشندەکە بەهۆی بەخشندەییەکەیەوە خراپەکانی بسڕێتەوە)، بە دونیاوە سەرقاڵ بە بۆ دونیا، بۆیە شەرع کەسابەتی بە ڕەوا داناوە بۆ ئەوەی کۆمەکی لێ وەربگریت بۆ گوێڕایەڵی کردنی خودا(عزوجل)، بەڵام تۆ کاتێك کەسابەت دەکەی و ڕۆزی بەدەستدەهێنی بۆ یاخیبوون لە خودا کۆمەکی لێ وەردەگری، نوێژ و کاری چاکەت وازلێهێنا و زەکاتت دەرنەکرد، بۆیە لە یاخیبووندای نەك لە گوێڕایەڵیدا، کەسابەتەکەت وەك چەتەیی و ڕێگری وایە، بەم نزیکانە مردن دێت و باوەڕدار پێی دڵخۆش دەبێت و کەسی بێباوەڕ و دووڕووش پێی خەمبار دەبن، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: ((کاتێك باوەڕدار دەمرێت ئاواتی ئەوە دەخوازێت ساتێك لە دونیادا نەبوویێت بەهۆی ئەو هەموو ڕێز و پلە و پایەی خودا(عزوجل) بەوی بەخشیوە))[1].

[1] رواه البخاري ومسلم والترمذي والنسائي بالفاظ متقاربة.

تەوبەکاری دامەزراو لەسەر تەوبە لە کوێیە، کەسی حەیاکار لە پەروەردگاری و چاودێر بۆ خودا لە هەموو کاروبارێکیدا لە کوێیە، کەسی پاك لە حەرامکراوەکان لە ئاشکرا و پەنهانیدا لە کوێیە، ئەو کەسە لە کوێیە چاوی دڵ و چاوی سەری خۆی دادەخات؟ لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: ((دوو چاو زینا دەکەن، زیناکەشیان بریتییە لە تەماشاکردنی حەرامکراوەکان))[1].

چاوت زینای زۆری کردووە بە تەماشاکردنی ئافرەتان و منداڵان، گوێت لەم ئایەتە نەبووە کە دەفەرموێت: ﴿ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ ﴾ النور: ٣٠

ئەی کەسی **هەژار**، ئارام بگرە لەسەر هەژارییەکەت، چونکە هەژاری دونیا کۆتایی پێ دێت، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی بە عائشە(خودا لێی رازی بێت): ((ئەی عائشە تاڵاوی دونیا لەپێناو نیعمەتەکانی دوارۆژدا بنۆشە))[2].

تۆ نازانی ناوەکەت لەگەڵ خوداناسان بە چی نووسراوە: بەدبەخت یان بەختەوەر؟ ئەمە لە زانستی پێشینەی خودادا(عزوجل) زانراوە، بەڵام نەکەی ترس وازلێبهێنی و شان لەسەر زانستی پێشینە دابدەی، چونکە لە سنووری شەرع دەردەچیت، بکۆشە بۆ ئەنجامدانی ئەوەی فەرمانت پێکراوە و واز لە زانستی پێشینە بهێنە، ئەوە شتێکە نە تۆ و نە هیچ کەسێکی تر ئاگاهی پێی نییە و لەو شتانەیە سەر بە زانستی پەنهانە، خوداناسان فەرشی دونیایان پێچایەوە و خۆیان لێ کەنارگیر کرد و لەبەردەستی مەولای خۆیاندا راوەستان و خۆیان بە خزمەت کردنییەوە سەرقاڵ کرد، لە دونیا شتێك وەك توێشوو وەردەگرن نەك وەك چێژ و خۆشی، بەڵکو وەك زەرووورەتێك ئەو کارە دەکەن، بە نیێت و مەرامی کۆمەکی وەرگرتن بۆ عیبادەت بەو کارە هەڵدەستن و داوێنی خۆیان دەپارێزن لە فێڵ و پیلانی شەیتان، لەو کارەدا فەرمانی پەروەردگاریان(عزوجل) جێبەجێ دەکەن و شوێنی سوننەتی پێغەمبەرەکەیان(ﷺ) دەکەون، هەموو سەرقاڵییەکیان بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکان و شوێنکەوتنی پێغەمبەرە(ﷺ)، لەگەڵ

---

[1] رواه البخاري ومسلم واحمد وغيرهم من طرق بالفاظ متقاربة.

[2] ذكره الغزالي في "الإحياء". قال مخرجه العراقي: اخرجه ابوبكر بن لال في "مكارم الأخلاق".

ئەوەش ئەوان لە ئەوپەڕی هەوڵ و لێبڕان و هێزی زوهددان لـە هـەموو شـت، خودایە، بەمانگێڕە لەوانە و بەرەکەتی ئەوان بۆ سەر ئێمە بگێڕەوە. ئامین.

ئەی گەنج، هەتا خۆشەویستی دونیا لە دڵی تۆدا بێت شـتێك لـە حاڵی صالحان نابینیت، هەتا داوا لە خەڵکی بکەی و ئەوان بکەی بە هاوەڵی خودا دوو چاوی دڵت ناکرێنەوە، تا لە دونیا و دروستکراوەکان زوهد نەکەی قسە نییە، تێکۆشەر بە شتێك دەبینی کە کەسانی تر نەیانبینیوە و یاسا و ڕێسـای عادەتـت بـۆ تێکدەشـکێن، گەر دەستبەرداری ئەوە ببیت لە ئەخشەدایە شـتێك رووت لـێ دەکـات لـە ئەخشـەی تۆدا نییە، گەر متمانەت بە حەق(عزوجل) بێت و لە ئەو بترسی لە ئاشکرا و پەنهاندا لە ڕێگەیەکەوە ڕۆزیت دەدات بەبیری تۆدا نـەهاتبێت، تـۆ دەسـتبەردار ببـە و ئـەو پێت دەبەخشێت، تۆ زوهد بکە و ئەو حەزت پێ پەیدا دەکـات، لـە سـەرەتاوە وازهێنـان و دەستبەرداربوونە و لە کۆتاییەوە وەرگرتنە، لە سەرەتای کارەکەوە داوا کردنە لە دڵ بۆ دەستبەرداربوون لە حەز و دونیـا و لـە کۆتاییـەوە داواکردنـە لێـی بـۆ وەرگرتنیـان و دەستبۆبردنیان، سەرەتا بۆ تەقوادارانە و کۆتایی بۆ ئەبدالی گەیشتووان بە گوێڕایەڵی خود(عزوجل).

ئەی ڕیابازی دووڕوو، ئەی هاوەڵدانەر، لەو شـتانەی وازی لـێ دەهـێنی شانشانێی لەگەڵ خوداناسان مەکە ئەوان بە پەنجەی دەست دەژمێررێن، داوای حاڵی ئەوان مەکە لەوەی بەردەستت دەکـەوێت، ئـەوان یاسـا و ڕێسـاکانی عادەتیـان شـکاند، بـەڵام تۆ وەك خۆی مایەوە، ئەوان لە کاتی خەوی تۆدا ڕاستدەبنەوە، لە کـاتی دەسـتگرتنەوەی تۆدا ئەوان دەبەخشن، ئەوان بۆ حەق(عزوجل) کاریان کرد و تۆ بۆ کەسانی تر جگە لە خودا، ئەوان خودایان ویست تۆ کەسانێکی تر جگە لـە خـودا، ئـەوان کاروبارەکانیان ڕادەستی خودا کرد بەڵام تۆ بۆ خۆتت ڕاکێشا و دژ بە خودا جەنگای، بۆیە ئـەوان بە بڕیاری بڕاوەی خوداوە بێنیاز بوون و زمانیان لە سکاڵا بۆ لای دروستکراو بڕی، بـەڵام تۆ ئەوەت ئەنجام نەدا، هەر بەو جۆرە ئەوان لەسەر تاڵاو ئارامیان گرت و تاڵاویـان بـۆ گۆڕا بە شیرینی، چەقۆی قەدەر گۆشتی لە ئەوان دەبڕی، بـەڵام گوێیـان پـێ نـەدەدا و

ئازاریان نەدەخوارد، ئەوەش بەهۆی بینینی ئەو کەسەوە ئازاری بەدەستە و سەرسام بوونیان بە ئەوەوەیە، خەڵکی لەدەستی ئەوان لە ئاسوودەیدان، ئازار لە ئەوانەوە بۆ سەر کەسانی تر تێناپەڕێت، وتراوە: ئەبرار(چاکان) ئەوانەن ئازاری مێروولەی ورد نادەن کە لە بچووکیدا خەریکە نەبینرێن، لەگەڵ حەقدا(عزوجل) بە گوێڕایەڵییەوە پەیوەستن و لەناو خەڵکیدا بە مامەڵەی شیرین و لەگەڵ خانەوادەدا بە سیلەی رەحم، ئەوان لە نیعمەتی دونیا و دوارۆژدان، لە دونیادا نیعمەتی نزیکی و لە دوارۆژدا نیعمەتی بەهەشت و بینینی خودا(عزوجل) و نزیکی لە ئەوەوە و گوێگرتن بۆ کەلامی و پۆشینی پۆشاکی مەجلیسی ئەو، تۆ چیتە لەوانە، تۆ بە تەوبەوە لە گوناهەکان و کارە ناشیرینەکانت لەبەرچاوی خودا و بوێریت لە ئەنجامدانیان خۆت سەرقاڵ بکە، هاوار بە حاڵت، حەیا لە خودا(عزوجل) دەکرێت نەك لە دروستکراوەکانی، ئەو بەر لە بوونی هەموو شتێك بوونی هەبووە، کەچی تۆ لە رووداو شەرم دەکەی و لەبەردەم دێرین(خودا)دا بێشەرمی دەنوێنی، ئەو بەخشندەیە و جگە لە ئەو بەدکارە، ئەو دەوڵەمەندە و جگە لە ئەو هەژارە، رەوشتی ئەو بەخشینە و رەوشتی کەسانی تر گرتنەوە، پێویستییەکانت بگێڕەوە بۆ لای ئەو، ئەو لە هەر کەسێکی تر لەپێشترە، بە دروستکراوەکانی بەڵگەی لەسەر بهێنەوە، سنووری شەرعەکەی پارێزگاری لێ بکە و پابەندبە بە تەقواوە، چونکە گەر بەردەوام بیت لەسەر تەقوا ئەوا خۆت بە خوداوە سەرقاڵ کردووە و لە دروستکراوەکانی خۆت بێئاگا کردووە، بەڵگە لەسەر ئەو بلۆزەرەوە و داوای ئەو بکە و دونیا و دوارۆژ وازلێبهێنە، چونکە ئەوەی بەشی تۆیە لەو دوو خانەیەدا رووت لێ دەکات و لەدەستت ناچێت، وازهێنانت لە هەرچی شتە جگە لە خودا دڵت لە لێڵی و لیخنی پاك دەکاتەوە، گەر ئەقڵت تۆی رێنموونی نەکرد بۆ لای ئەو ئەوا تۆ وەك ئاژەڵانی بێ ژیری وایت، لە دونیا وەرە دەرەوە و روو لە ژیرمەندان بکە، ئەوانەی ئەقڵیان رێنموونی کردن بۆ لای خودا(عزوجل)، ژیری لەوانەوە فێر ببە و بەهۆیەوە نەفسی خۆت و پەروەردگارت بناسە.

هاوار بە حاڵت، تەمەنت-وەك بەفر- دەتوێتەوە و تۆش هەواڵێکت لێی نییە، تا کەی ئەم پشتکردنە لە دوارۆژ و رووکردنە لە دونیا؟

شوێنەکەت لە بەهەشت و لە دۆزەخ تۆ بخوات، کەس ناتوانێت ڕۆزی
هاوار بە حاڵت، کەس ناتوانێت ڕۆزی تۆ بخوات، بێئاگایی تۆی کردووە بە کۆیلە و
جگە لە تۆ کەسێکی تری لێ نیشتەجێ نابێت، بێئاگایی تۆی کردووە بە کۆیلە و هەوڵێکت خواردن و خواردنەوە و
ئارەزوو یەخسیری کردووی، هەموو خەم و هەوڵێکت خواردن و خواردنەوە و
هاوسەرگیری و خەو و گەیشتنە بە مەرامەکانت، خەم و هەوڵی تۆ خەم و هەوڵی
بێباوەڕان و دووڕووانە لەدوای ئەوەی لە حەڵاڵ یان حەرام تێردەبیت، ئەوەی یەکەمجار
لەسەر دڵی تۆیە ئەوە بۆ تۆ دینە، ئەی هەژار بەسەر نەفسی خۆتدا بگری، منداڵەکەت
دەمرێت و قیامەت لە خۆت هەڵدەستێنی، کەچی دینەکەت دەمرێت گوێیەکی پێ
نادەی و بەسەریدا ناگریت، فریشتە ڕاسپێرراوەکان بە تۆ بۆت دەگرین کاتێک
زیانۆمەندی تۆ لە مامەڵەی ئایینداا دەبینن، تۆ ئەقڵت نییە، گەر ئەقڵت ببوایە بەسەر
لەدەستدانی دینەکەی خۆتدا دەگریای، تۆ سەرمایەیەکت هەیە و بازرگانی پێوە ناکەی،
ئەم ئەقڵ و حەیایە بریتین لە سەرمایە کەچی تۆ بەباشی نازانی بازرگانیان پێوە بکەی،
زانستێك کاری پێ ناکەی و ئەقڵێك قازانجی لێ ناکەی و ژیانێك سوودی لێ نابینی،
وەك ئەو خانووەی کەسی لێ نیشتەجێ نابێت و ئەو گەنجینەی کەس شوێنەکەی نازانێت
و ئەو خواردنەی کەس نایخوات و دەستی بۆ نابات، گەر تۆ بێئاگای لەوەی تێیکەوتووی
ئەوا من دەیزانم و ئاگاهیم پێی هەیە، ئاوێنەی شەرعم لەلایە کە بریتییە لە حوکمی
ئاشکرا، و ئاوێنەی زانست بە خودام لەلایە کە بریتییە لە زانستی ناوەوە، لە خەوی
بێئاگایی ڕاپەڕە، بە ئاوی وریابوونەوە ڕوخسارت بشۆ، تەماشا بکە بزانە تۆ موسڵمانی
یان بێباوەڕ، باوەڕداری یان دووڕوو، یەکتاپەرستی یان هاوەڵدانەر، ڕیابازی یان
موخلیص، تەبای لەگەڵ خودا و بڕیارەکانی یان سەرپێچیکاری، ڕازیت لە ئەو یان تووڕە
و دڕدۆنگ، خودا (عزوجل) باکێکی بە تۆ نییە ڕازی بیت یان ناڕازی، زیانی و قازانجی
ئەوە بۆ سەر خۆت دەگەڕێتەوە، پاکێتی بۆ خودای بەخشندەی حەلیمی خاوەن فەزڵ و
چاکە، هەموان لەژێر لوتف و فەزڵی ئەودان، گەر لوتفمان پێ نەکات ئێمە تیاچووین،
گەر لەسەر کاروکردەوەکانمان بەرانبەرمان لەگەڵ ئەنجام بدات هەموومان تیادەچین.
ئەی گەنج، بە عیبادەتی پڕ لە هەڵە و لەبیرچوون و ڕیا و دووڕوویی ئاواتی دوور و
درێژ لەسەر خودا دەخوازیت و داوای ڕێز و پلە و پایە دەکەی و بە بوونی لادان و

تێکدانت شانشانێن لەگەڵ صاڵحاندا دەکەی، تۆ چیت داوە لە باسکردنی ئەوان و بانگەشەی ناسینی ئەوان، ئەی بەندەی هەڵهاتوو، ئەی وێڵی سەرگەردان، ئەی دەرچوو لە بازنەی موخلیصانی یەکتاپەرستانی ئەم ئوممەتە.

**هاوار بە حاڵت**، بگری تا لەگەڵت دەگری، دانیشە لەناو ئەو موسیبەتەی تۆی تێکەوتووە و بەرگی تازیباری بپۆشە تا لەگەڵت دابنیشێت، تۆ بێبەشی و هەواڵێکت نییە.

**یەکێك لە صاڵحان(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت:** هاوار بۆ بێبەشان کە نازانن بێبەشن.

**هاوار بە حاڵت**، ئەم دڵەی تۆ چۆن دڵێکە؟ تۆ چی دەژنەوی؟ سکاڵا لای کێ دەکەی؟ پەنا بۆ کێ دەبەی؟ لەگەڵ کێ دەنووی؟ کاتێك بەربوویتەوە بۆ ناو تەنگەژە و تەنگەلانی بە کێ متمانە دەکەی؟ قسەم بۆ بکە مـن درۆ و دووڕوویی تۆ دەزانم، تۆ و دروستکراوەکان لەلام وەك مێشوولە وان، دەبم بە زانا و خزمەتکاری راستگۆیان لە ئێوە، گەر دەیەوێت هەڵمبگرێت بۆ بازاڕ بۆ ئەوەی بمفرۆشێت یان نووسراوێکم پێ بکات با ئەو کارە بکات، گەر دەیەوێت پۆشاکەکانی بەرم و ئەوەی بەدەستمەوەیە ببات یان فەرمانم پێ بکات تا بچم سواڵ بکەم با ئەو کارە بکات، تۆ راستگۆیی و یەکتاپەرستی و باوەڕت نییە، نازانم چیت لەگەڵ ئەنجام بدەم، نازانم چ کەلەبەرێك بە تۆ بگرم، تۆ تەختەی زیادەی دارتاشی و بۆ هیچ شتێك شیاو نیت و تەنها بۆ ناو ئاگر شیاوی.

خەڵکینە، دونیا دەڕوات و تەمەن فانی دەبێت و بەم نزیکانە دوارۆژ دێتە بەرەوە، هیچ خەم و هەوڵێکت بۆ دوارۆژ نییە، بەڵکو هەوڵ و خەمتان بۆ دونیا و کۆکردنەوەی دونیایە، ئێوە دوژمنی نیعمەتەکانی خودان(عزوجل) گەر نیعمەتەکانی خودا بشارنەوە و لەسەریان شوکر نەکەن لێتان وەردەگرێتەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموویەتی: ((گەر خودا(عزوجل) نیعمەتێکی خۆی بە بەندەکەی بەخشی پێیخۆشە نیعمەتەکەی بەسەرەوە ببینێت))[1].

[1] رواه الترمذي، والبيهقي في "السنن" والطبراني في "الكبير".

خوداناسان تەنها یەك خەمیان هەبوو، شتەكانیان لە دڵی خۆیان دەركرد و تەنها یەك شتیان لە ناودا جێگیر كرد نەك وەك شتەكان، عیبادەتی خۆیان لە ریا و دووڕوویی و ناوبانگ پاككردەوە، بەندایەتیان بۆ پەروەردگاریان(عزوجل) ئەنجامدا كەچی ئێوە بەندەی خەڵكین، بەندەی ریا و دووڕووین، بەندەی ئارەزوو و بەشی دونیایی و مەدح و سەنان، كەسێك نابینم لەناو ئێوە بەندایەتی لە خۆیدا بەدیهێنابێت مەگەر كەسێك خودا(عزوجل) بیەوێت، ئەوانەش دانە دانەیەكن، ئەمەیان بەندایەتی دونیا دەكات و پێیخۆشە بەردەوام بێت و ترسی ئەوەی هەیە تیاچوون رووی لێ بكات، ئەمەی تر خەڵكی دەپەرستێ و ترس و رجای لەلای ئەوانە، ئەمەش بەهەشت دەپەرستێ و هیوای بە نیعمەتەكانی بەهەشتە و رجای بۆ دروستكەری بەهەشت نییە، ئەمەی تر ئاگر دەپەرستێ و لێی دەترسێ و لە دروستكەری ئاگر ناترسێت، خەڵك و دۆزەخ و بەهەشت و شتانی تر جگە لەوانە چین؟ خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿وَمَآ أُمِرُوٓا۟ إِلَّا لِيَعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ﴾ البينة: ٥

عاریفە زاناكان بە خودا بۆ ئەو(سبحانه وتعالى) بەندایەتیان كرد نەك بۆ كەسانی تر، ساغی پەروەردگاری و خواوەندی خودایان دا، وەك جێبەجێ كردنی فەرمانەكانی و خۆشەویستی بۆ ئەو خودایان پەرست نەك بۆ مانایەكی تر، گرنگییان بە ئەو دا نەك بە كەسان و شتانی تر جگە لە خودا، دەستبەرداری هەموو شتێك بوون جگە لە ئەو، ئێوە كۆمەڵێك پەیكەری بێ رۆحن، ئێوە تەنها رووالەتن بەڵام خوداناسان كرۆك و پەنهان بوون، ئێوە وشەن ئەوان مانا بوون، ئێوە ئاشكران ئەوان نهێنی بوون، خوداناسان پیادەرەوی پێغەمبەران بوون لە ئیمان و ئەخلاق و پیشەوە و دواوەیان، ئەوان پاشماوەی خواردن و خواردنەوەی پێغەمبەران بوون، بە زانستەكانی ئەوان كاریان دەكرد، میراتگری لە ئەوانەوە بۆیان بەجێما، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((زانایان میراتگری پێغەمبەرانن))[1]. كاتێك بە زانستەكەیان كاریان كرد بوون بە جێنشینی پێغەمبەران و میراتگرانیان و نوێنەرانی ئەوان.

---

[1] تقدم تخريجه.

**هاوار بە حاڵت،** تەنها زانست بەس نییە، وەك چۆن بانگەشەی بێ بەڵگە سوودێك ناگەیەنێت، زانستی بێ کرداریش بەهەمان شێوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: ((زانست بانگ لە کردار دەکات، گەر وەڵامی دایەوە باشە، ئەگەر نە، کۆچی لێ دەکات))[1].

بەرەکەتی زانستەکە کۆچ دەکات و لێکۆڵینەوە و تاوتوێکردنی دەمێنێتەوە، کرۆکەکەی کۆچ دەکات و توێکڵەکەی دەمێنێتەوە، ئەی ئەوانەی وازتان هێناوە لە کارکردن بە زانستەکەتان زمانتان بە هۆنراوە پڕە لە پاراوی و گوزارشت و ڕەوانبێژی، بەڵام کار و ئیخلاصی تێدا نییە، گەر دڵت پاڵفتە بکردبایە ئەندامەکانت پاڵفتە دەبوون، چونکە دڵ مەلیکی ئەندامەکانە، گەر مەلیك چاك و پاك بوو ڕەعییەتەکانی چاك و پاك دەبن، زانست توێکڵە و کارکردن بە زانست کرۆکەکەیەتی، بۆیە توێکڵ پارێزگاری لێ دەکرێت بۆ ئەوەی کرۆك پارێزگاری لێ بکات، بۆیە کرۆك پارێزگاری لێ دەکرێت ڕۆنی لێ دەربهێنرێت، گەر لەناو توێکڵەکەدا کرۆك بوونی نەبێت چی پێ بکرێت، گەر لە کرۆکەکەدا ڕۆن بوونی نەبێت چی پێ بکرێت؟ زانست ڕۆیشت، چونکە گەر کاری پێ نەکرێت دەڕوات، لەبەرکردنی و تاوتوێکردنی بەبێ کارکردن چ سوودێك بە تۆ دەگەیەنێت، ئەی کەسی زانا گەر خێری دونیا و دوارۆژت دەوێ کار بە زانستەکەی خۆت و خەڵکی بکە، ئەی کەسی دەوڵەمەند گەر خێری دونیا و دوارۆژت دەوێ دڵنەوایی هەژاران بکە بە شتێك لە ماڵەکەت، لە **پێغەمبەری خوداوە**(ﷺ) فەرمووی: ((خەڵکی خانەوادەی خودان، خۆشەویسترین کەس لە خەڵکی لای خودا(عزوجل) بەسوودترینیانە بۆ خانەوادەکەی))[2].

پاکێتی بۆ ئەو خودایەی هەندێکی ناتاج کردووە بە هەندێکی تر، لەوەدا حیکمەتی هەیە، ئەی دەوڵەمەند لە من هەڵدێیت؟ من لە تۆ وەردەگرم بۆ خۆت، لە خوداوە(عزوجل) خێرم پێ دەکات و لە نیوە بێنیازم دەکات و نیوە بە من ناتاج دەکات.

---

[1] تقدم تخريجه.

[2] تقدم تخريجه.

**ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم(ڕەحمەتی خودای لێ بێت)** کاتێك کەمی نارامگرتنی لە هەژار دەبینی دەیوت: خودایە لە دونیادا بەرینی و زوهدمان پێ ببەخشە، خودایە دونیامان لێ بەرتەسك مەکەرەوە، چونکە بە داواکردنی دونیا تیادەچین، خودایە لە بڕیاری بڕاوە و قەدەرەکاندا لوتفمان پێ بکە.



# مەجلیسی سێهەم

## داننان بە نیعمەتەکانی خودادا(عزوجل)

سەرلەبەیانی ١٦/جمادي الآخرة/ ٥٤٥ھ لە "الرباط" فەرمووی:

خۆشبەختی بۆ ئەوانەی دانیان بەوەدا ناوە نیعمەتەکان بۆ خودا دەگەڕێنەوە و هەموو شتێك دەدەنە پاڵ ئەو و نەفسیان لە هۆیەکان و هەوڵ و هێزی خۆ دارنیوە، کەسی ژیر ئەو کەسەیە کار لەسەر خودا ناژمێرێت و لە هەموو حاڵ و بارێکدا پاداشتی لێ داوا ناکات.

**هاوار بە حاڵت،** تۆ بەبێ زانست خودا(عزوجل) دەپەرستی و بەبێ زانست زوهد دەکەی و بەبێ زانست دەست بۆ دونیا دەبەی، ئەوەش پەردەیە لەناو پەردەدا، خەشم و تووڕەییە لەناو خەشم و تووڕەییدا، خێر لە شەڕ جیاناکەیەوە، نازانی کامە بەشی تۆیە و کامە بەشی تۆ نییە، نازانی کامە دۆستی تۆیە و کامە دوژمنتە، هەموو ئەوانە بەهۆی نەزانیت بە حوکمی خودا(عزوجل) و وازهێنانت لە خزمەتی گەورەپیاوان، گەورەپیاوانی کار و گەورەپیاوانی زانست حەقت(عزوجل) پێنیشان دەدەن، یەکەمجار بە قسە و دووەمجار بە کردار، بەوەش بە خودا(عزوجل) دەگەی، هەموو ئەوانە بەهۆی زانست و زوهد لە دونیا و پشتهەڵکردن لێی و بە دڵ و دەرەوە بە خودا گەیشتوون، ئەوانەی لە سەرەتای زوهددان دونیا لە دەست دەردەکات، بەڵام کەسی زاهیدی دامەزراو دونیا لە دڵ دەردەکات، ئەوان بە دڵ زوهدیان لە دونیا کرد و زوهد بوو بە سروشتیان و تێکەڵ بە دەرەوە و ناوەوەیان بوو، سروشتی ئاگرینیان کوژایەوە، ئارەزوویان خامۆش بوو، دڵیان ئارامی و دڵنیایی رووی لێکرد و شەڕی لێ دوورکەوتەوە.

**ئەی گەنج،** ئەم زوهدە پیشەیەك نییە ئەنجامی بدەی، شتێك نییە بیگریت بە دەستەوە و هەڵیبدەی، بەڵکو کۆمەڵێك هەنگاوە، یەکەم هەنگاوی وردبوونەوەیە لە

روخساری دونیا و بینینیەتی بەو جۆرەی کە هەیە بە بینینی پێغەمبەران(علیهم السلام) و دۆستانی خودا و ئەبدال، ئەوانەی هیچ سەردەمێك نییە ئەوانی تێدا نەبێت، کاتێك بینینت بۆ دونیا راست و دروست دەبێت لە گوفتار و کرداردا شوێنپێی هەنگاوەکانی ئەوان هەڵبگریت، گەر شوێنیان کەوتی ئەوەی ئەوان بینییان تۆش دەیبینی، گەر شوێنپێی ئەوانت هەڵگرت بە گوفتار و کردار لە خەڵوەت و تێکەڵبووندا، لە زانست و کرداردا، لە رووالەت و مانادا، وەك ئەوان بەرۆژوو بیت و وەك ئەوان نوێژ بکەی، وەك ئەوان وەربگریت و وەك ئەوا واز لە شتێك بهێنی و ئەوانت خۆشبوێت ئەوکات خودا نورێکت پێ دەدات خۆت و کەسانی تری پێ دەبینی، ئەنگییەکانی خۆت و خەڵکیت بۆ رۆشن دەکاتەوە، بۆیە لە خۆت و هەموو خەڵکی زوهد دەکەی، گەر ئەمەت بۆ هاتە راستە ئەنواری نزیکی روو لە دڵت دەکات و دەبیت بە باوەڕدارێکی خاوەن یەقینی عاریفی زانا، شتەکان لەسەر وێنە و مانای خۆیان دەبینی، دونیا هەروەك زاهیدان و پشتهەلکەران لە دونیا دەبینی، لە شێوەی پیرەژنێکی روخسار شێواوی دیمەن ناشیریندا دێتە پێش چاوت، دونیا لای خوداناسان لەم شێوەدایە، بەڵام لای مەلیکان وەك بوکێك وایە لە جوانترین شێوە و نمایشدا، لەلای خوداناسان بێنرخ و زەلیلە، پرچی دەسوتێنن و پۆشاکەکەی دەدڕێنن و روخساری دەڕوشێنن و بە زۆر و زاڵی بەشی خۆیان لە دونیا وەردەگرن بە هاوەڵیکردنی دوارۆژەوە.

ئەی گەنج، گەر زوهدەکەت لە دونیا هاتە راستە ئەوا لە هەڵبژاردنیش زوهد بکە، هەر بەو جۆرە لە هەموو خەڵکی زوهد بکە و لێیان مەترسە و رجات لەلایان نەبێت، هەروەها زوهد بکە لە هەموو ئەوەی نەفست فەرمانت پێ دەکات هیچی لێ وەرمەگرە تا فەرمانت لە خوداوە(عزوجل) پێ نەگات، با زاڵی و زۆری بۆ تۆ لەرووی دڵەوە بە رێگەی ئیلهام یان خەون بێت، لە هەرچی دروستکراوە هەڵبێ و خۆت بەدووربگرە و پشتیان تێبکە، خامۆشبوونی ئەندامەکان بەهەند وەرناگیرێت، ئەوە بوونی نییە هەتا نەفس و سروشت و ئارەزووت دەمرێت، لە هەرچی شتە جگە لە مەولا(عزوجل) بڕیت، ئەوکات بە نزیکی ئەو زیندوو دەبییەوە، بمرە و زیندووببەرەوە، پاشان گەر خودا بیەوێت بۆ خۆی زیندووت دەکاتەوە، دەتگێڕێتەوە

بۆ لای خەڵکی بۆ ئەوەی لە بەرژەوەندییەکانیان وردببیەوە و ئەوان بۆ دەرگای خودا بگێڕیتەوە، مەیل بۆ دونیا و دوارۆژ رووت لێ دەکات بۆ ئەوەی بەشەکانت لەو دوانە وەربگریت، هێزی ئارامگرتنت لەسەر ئازار و مەینەتییەکان لە خەڵکییەوە پێ دەبەخشرێت، بۆیە لە گومراییان دەیانگێڕیتەوە و فەرمانی خودایان پێ جێبەجێ دەکەی، گەر ئەوەت بەدەستنەهێنا نزیکی لە خودا بەسە بۆ تۆ و لە هەموو کەس و شتەکانی تر بێنیازت دەکات، دوای بەدەستهێنانی دورستکەری هەموو شتەکان بە دروستکراو رازی نابیت، ئەو کەسەی شتەکانی لە نەبوونەوە هێناوەتە بوون، ئەو بەر لە هەموو شتێك بوونی هەبووە، و بەدیهێنەری هەموو شتەکانە و دوای هەموو شتەکانیش هەر ئەو(سبحانه وتعالی) دەمێنێتەوە، تاوانەکانی ئێوە وەك لێزمەی باران وایە با تەوبەکانتان هەموو ساتێك بەرانبەریان بوەستێ.

**هاوار بە حاڵت**، تۆ زیادەڕەویت، تۆ شەڕەنگێزیت، تۆ حەزی بێسنووری، تۆ ئارەزوویت، تۆ گوزارشتی، تەماشای گۆڕە کۆنەکان بکە و بە زمانی ئیمان قسە لەگەڵ خەڵکی ناو ئەو گۆڕانە بکە، ئەوان هەواڵی حاڵ و باری خۆیان بە تۆ دەگەیەنن.

**ئەی گەنج**، تۆ بانگەشەی ئەوە دەکەی خودا و دۆستانی خودات دەوێت، وازت لێ دەهێنم و قسە ناکەم و سەرنجت دەدەم، من بە مۆڵەتی خودا(عزوجل) بانگکەری ئێوەم، دوای دووڕووان و درۆزنان-لە گوفتار و کردارياندا- دەبرم، زۆر جار رۆیشتووم بەدەم بانگی گەورەپیاوانەوە تا بانگکردنم بۆ هاتووەتە راستە، ئەی ئەهلی سەر زەوی هەویرەکەتان بەبێ خوێ دەشێلن، وەرن خوێی بۆ ببەن، ئەی ئەو کەسەی خوێ دەکڕیت وەرە پێشەوە، ئەی دووڕووان هەویرەکەتان بەبێ خوێ کەڕوو هەڵدێنێت، ئەو هەویرە ناتاجە بە خوێ، زانست و ئیخلاص بریتین لە خوێ، ئەی کەسی دووڕوو تۆ بە دووڕووییەوە شێلراوی بەم نزیکانە دووڕووییەکەت لێ دەگوزرێت بە ئاگر، دڵت پاڵفتە بکە لە شتە کاتی و تیاچووەکان رزگارت دەبێت، کاتێك دڵ پاڵفتە بوو ئەندامەکانیش پاڵفتە دەبن، دڵ پاسەوانی ئەندامەکانە گەر بێتە راستە ئەوانیش دێنە راستە، کاتێك دڵ و ئەندامەکان راستە شەقامیان گرت و کەوتنە سەر رێگەی دروست کاری باوەڕدار تەواو دەبێت و دەبێتە شوانی خانەوادە و جیران و ئەهلی شارەکەی، حاڵی بەپێی هێزی ئیمان و نزیکی لە مەولاوە(عزوجل) بەرز دەبێتەوە.

**ئەی خەڵکینە**، جوان مامەڵەی خودا بکەن و خۆتانی لێ بپارێزن، کار بە بڕیارەکانی بکەن، چونکە خودا داوای لێکردوون لە خۆتاندا کار بکەن بە حیکمەتی سەرقاڵبوون بە "زانستی پێشینەی ئەو"، بەو حوکمە کار بکەن و مافی خۆی پێ بدەن، چونکە گەر کارت پێ کرد کار دەستت دەگرێت و دەتبات بۆ لای ئەو کەسەی کارەکەت بۆ ئەنجامداوە(واتە خودا) ئەوکات زانستێکی لێوە بەدەست دەهێنیت کە پێشتر نەتزانیوە، بۆیە بە زانستی خودا لەگەڵ خودا دەبیت و بە حوکمی خودا لەگەڵ خەڵکی دەبیت، تۆ هەرکات یەکەم جار کارت بەو زانستە کرد دووەمت لێ داوا دەکرێت، گەر پێیەکانت لە یەکەمدا جێگیر بوون ئەوکات داوای دووەم بکە، ئەی گەنج بە چی گەیشتیت؟چۆن مامۆستایەك دەبینییەوە؟ بگەڕێوە بۆ دواوە و کەسێکی ژێر بە، یەکەمجار زانست بەدەست بهێنە و پاشان کارکردن و ئیخلاص تیایدا، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((یەکەمجار فیقە بەدەستبهێنە و پاشان خۆت کەنارگیر بکە))[1].

باوەڕدار کەسێکە ئەوەی پێویستە لەسەری فێری دەبێت و پاشان کەنارگیر دەبێت لە خەڵکی و بە عیبادەت کردن خۆی تەنهادەکاتەوە بۆ پەروەردگاری(عزوجل)، خەڵکی ناسی و لە دڵی دەرکردن، خودای ناسی و خۆشیویست و داوای کرد و خزمەتی کرد، خەڵکی شوێنی کەوتن و ئەویش لە دەستیان هەڵهات و کەسێکی تری جگە لەوان داوا دەکرد، لەوان زوهدی کرد و حەزی بۆ جگە لەوان دروست بوو، ئەوەی زانی زیان و قازانج و خێر و شەڕ لە دەستی ئەواندا نییە، گەر شتێکی لەسەر دەستی ئەوان جاری بێتع لە خوداوەیە نەك لەوانەوە، بۆیە بینی دووری لەوان باشترە لە نزیکی لەوانەوە، بەو یەکەوە گرت، تەماشای ناوێنەی بیری کرد بینی وەستان لەبەر دەرگای یەك دانەدا باشتر لە وەستان لە بەردەم چەندین دەرگادا، بۆیە تەنها لە دەرگای ئەودا وەستا و دەستی پێوە گرت، باوەڕداری یەقینداری موخلیصی ناقڵ ژێری ژێرییەکانی پێدراوە، بۆ ئەو مەبەستەیە لە خەڵکی هەڵهات و پەڕی لێ سەندن.

---

[1] نقله الغزالي في "الإحياء" من قول النخعي. ورواه أبو نعيم الأصفهاني عن الربيع بن الخثيم. و رواه أحمد في "الزهد".

# مەجلیسی سی و یەك

## تووڕەیی پەسەند و ناپەسەند

شێوانی ۱۸/جمادي الآخرة/٥٤٥هـ دوای هەندێك قسە فەرمووی:

گەر تووڕەبوون بۆ خودا بێت پەسەندە، بەڵام گەر بۆ شتێکی تر بێت جگە لە خودا ناپەسەندە، باوەڕدار بۆ خودا تیژ دەبێتەوە نەك بۆ نەفسی، بۆ سەرخستنی ئایینەکەی گردەگرێت نەك بۆ سەرخستنی نەفسی خۆی، تووڕە دەبێت گەر سنوورێك لە سنوورەکانی خودا ببەزێنرێت و رازی دەبێت لەگەڵ رازی بوونی خودا، تووڕەبوون بۆ خودا نیشان مەدە لە کاتێکدا بۆ نەفسی خۆت تووڕەبوویت، ئەوکات تۆ دەبیت بە کەسێکی دووڕوو یان هاوشێوەی ئەوە، چونکە ئەوەی بۆ خودا بێت تەواو دەبێت و دەمێنێتەوە و زیاد دەکات، ئەوەش بۆ کەسێکی تر بێت جگە لە خودا گۆڕانی بەسەردا دێت و تیادەچێت، گەر کارێکت ئەنجامدا نەفس و ئارەزوو و شەیتانت لەو کارە وەلابنێ و تەنها بۆ خودا(عز) و جێبەجێ کردنی فەرمانی خودا ئەنجامی بدە، تەنها بە فەرمانێکی یەکلاکەرەوە لە خوداوە کار ئەنجام بدە، جا یان لە رێگەی شەرعەوە یان بە ئیلهام لە خوداوە(عزوجل) بۆ سەر دڵت لەگەڵ تەبایی شەرع لەو کارەدا، لە خۆت و لە خەڵکی و لە دونیا زوهد بکە خودا لە دروستکراوان ئاسوودەت دەکات، با حەزت بۆ هۆگری حەق و ئاسوودەیی لە نزیکی ئەو بێت، هۆگری تەنها بە ئەوەوەیە و ئاسوودەیی تەنها لەگەڵ ئەوە لەدوای پاکبوونەوە لە لیخنییەکانی نەفس و ئارەزوو و بوون، لەگەڵ خوداناسان بە ئەوا بە پشتیوانی ئەوان پشتیوانی دەکرێیت و بە بەرچاوڕۆشنی ئەوان بەرچاوت رۆشن دەبێتەوە، شانازیش بە تۆوە دەکات وەك چۆن شانازی بەوانەوە کرد، مەلیك لە نێوان هەموو بەندەکانی خۆیدا شانازی بە تۆوە دەکات، دڵت لە هەرچی شتە جگە لە خودا پاکبکەرەوە بە ئەوەوە هەرچی شتی ترە

دەبینیت، شتەکان بەگشتی دەبینی، پاشان بە ئەوەوە کردارەکانی ئەو لەناو دروستکراوانیدا دەبینیت، وەك چۆن دروست نییە بچیتە لای مەلیکانی دونیا بە پیسی دەرەوەت ناتوانیت بە پیسی ناوەوەت بچیتە ژوورەوە بۆ لای مەلیکی هەموو مەلیکان کە بریتییە لە حەق(عزوجل)، تۆ کوندەیەکی پڕ لە قوڕ و لیتەی، چی لە تۆ بکرێت؟ ئەوەی لە تۆدا هەڵی بدە دەرەوە و پاکببەرەوە، لەدوای ئەوە چوونە ژوورەوە بۆ لای رەمەلیك دێتە بەرەوە، لە دڵی تۆدا یاخیبوون و ترس و رجا لە خەڵکی و خۆشەویستی دونیا و ئەوەی لە دونیادایە بوونی هەیە، هەموو ئەمانەش لە پیسی و لیخنی دڵن، قسە نییە تا نەفست دەمرێت و لەسەر تابووتی صدق هەڵدەگیرێت، ئەوکات گوێ بە رووتێکردنی خەڵکی نادەی، بەڵام تا بوونت بۆ ئەوان هەبێت و بیانبینی دەستت درێژ مەکە بۆ ئەوان تاکو ماچی بکەن، قسەکردن نییە تا سەرسامیت نەبێت بە نزیکی لە ئەو(سبحانه وتعالى)، ئەوکات کارت کارت لە ئەوانەوە و لە دەست ماچکردنت دەبێت، هەر بەو جۆرە لە بەخشین و لێگرتنەوە و مەدح و زەمیان، گەر تەوبە دروست بێت ئیمان دروست دەبێت و زیاد دەکات(لای ئەهلی سوننەت ئیمان کەمبوون و زیادبوون رووی لێ دەکات) بە گوێڕایەڵی زیاد دەکات و بە یاخیبوون کەم دەکات، ئەمە لەپای خەڵکی رەشۆکی، بەڵام تایبەتان ئیمانیان زیاد دەکات بە دەرچوونی دروستکراوان لە دڵیان، کەم دەکات بە چوونەژوورەوەی دروستکراوان بۆ ناو دڵیان، بە سوکنایییان بۆ لای خودا(عزوجل) زیاد دەکات و بە سوکنایییان بۆ لای کەسانی تر جگە لە خودا کەم دەکات، ئەوان پشتیان بە پەروەردگاری خۆیان بەستووە و متمانەیان بە ئەوە، پشتی خۆیان بە ئەو قایم کردووە و لە ئەو دەترسن و بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە، ئەو بە تاك و تاقیدەکرێنەوە، یەکتاپەرستییەکەیان لە دڵیاندایە و مەداراتیان بۆ خەڵکی لە دەرەوەیان، گەر نەفامی بەرانبەریان بکرێت نەفامی نانوێنن، خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿ وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلَامًا ﴿٦٣﴾ ﴾
الفرقان: ٦٣

دەست بە بێدەنگییەوە بگرە و بەرانبەر نەفامی ئەهلی نەفامی و هەڵچوونی سروشت و نەفس و ئارەزوویان حەلیم بە، بەڵام گەر لە حەق(عزوجل) یاخیبوون بێدەنگی نییە چونکە حەرامە، ئەوکات قسەکردن دەبێتە عیبادەت و وازهێنان لە قسەکردن دەبێتە یاخیبوون، گەر توانات بەسەر فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپەدا هەبوو ئەوا کەمتەرخەم مەبە چونکە ئەو کارێکی خێرە و بە رووی تۆدا کراوەتەوە، بۆیە پەلە بکە لە چوونەژوورەوەی.

عیسا(علیه السلام) لە گژوگیای زەوی دەیخوارد و ئاوی چەم و جۆگەکانی دەخواردەوە و رووی لە ئەشکەوت و چۆڵەوانی و وێرنە دەکرد، کاتێك دەنوست قۆڵی خۆی یان بەردێکی دەنایە ژێر سەری، باوەڕداریش بەو جۆرە دەکات و دەیەوێت لەسەر ئەم پایە بە پەروەردگاری بگات، گەر بەشێکی لە دونیادا هەبێت رووی لێ دەکات و دەرەوەی دەچێتە ناویەوە و دەستبۆبردنەکەی لەلایەن نەفس و دڵەوە لەگەڵ خودایە(عزوجل) و لەسەر پای یەکەمە، ئەو ناگۆڕێت، چونکە گەر زوهد لە دڵدا دامەزرا هاتنی دونیا و دەستبردن بۆ بەشەکان نایگۆڕێت، باوەڕدار گەر دونیا و ئەهلی دونیا و حەزی و چێژی دونیای خۆشویست لە شەو و رۆژدا بۆ تەنها چرکەیەکیش پێیانەوە سەرقاڵ نابێت، عیبادەت و زوهدی لە دونیا و یاد و گوێڕایەڵی بۆ خودا دەبێتە هۆی بەرچاورۆشنبوونی بە ئەنگییەکانی نەفسی لە دونیا و تەویەلێکردنیان و پەشیمانی لەسەریان بۆ ئەو زیادەڕەوییەی لە ئەو وەشایەوە لەو رۆژگارەدا، ئەمەش لە رێگەی قورئان و سوننەت و گەورەپیاوانەوە،بۆیە زوهد لە دونیا رووی لێ دەکات، هەرکات تەماشای ئەنگییەك دەکات چەندین ئەنگی تر دەبینێتەوە، بۆیە دەزانێت دونیا فانییە و تەمەنی بۆ ماوەیەکی کورتە، دەزانێت نیعمەتەکانی دونیا تیاچووە و جرانییەکەی گۆڕانی بەسەردا دێت، ئەخلاقی دونیا شەرەنگێزانەیە و دەستی گەردنپەڕێنە، قسەکانی ژەهراوین، چێژی لە چەندین پیاو کردووە و تەڵاقی خۆی لێ وەرگرتوون، گەڕانەوە و بنچینە و پەیمانی بۆ نییە، راستبوونەوە تیایدا وەك راستبوونەوە وایە لەسەر ئاو، بۆیە باوەڕدار نایکات بە جێگەی دڵی و نایکات بە خانەی خۆی، پاشان پلەیەك بەرز دەبێتەوە و دامەزرانی بەهێز دەبێت، حەق(عزوجل)

دەناسێت، بۆیە دوارۆژیش ناکات بە جێگەی دڵی، بەڵکو نزیکی لە مەولاوە(عزوجل) دەکات بە جێگەی خۆی لە دونیا و دوارۆژدا، بۆ نهێنی و دڵی خانوویەك لەو جێگەیە دروست دەکات، ئەوکات ئاوەدانکردنەوەی دونیا زیانی پێ ناگەیەنێت با هەزار خانووش بینا بکات، چونکە بۆ کەسانی تر بینا دەکات، نەك بۆ خۆی، لەو کارەدا فەرمانی خودا(عزوجل) جێبەجێ دەکات و لەگەڵ قەزا و قەدەری ئەودا تەبا دەبێت، خودا ئەو بۆ خزمەت کردنی خەڵکی و گەیاندنی ئاسوودەیی پێیان راستدەکاتەوە، لە خواردن دروستکردن و نان دروستکردندا رۆژ دەگەیەنێت بە شەو بەڵام گەردیلەیەك لەو خواردن و نانە ناخاتە دەمیەوە، ئەو خواردنێکی تایبەت بە خۆی لەلای خوداوە بۆ دێت کە هیچ کەس لەگەڵی بەشدار نییە، بۆیە بە خواردنەکەی خۆی رۆژوو دەشکێنێ و لە خواردنی خەڵکی بەرۆژووە و خۆی برسی دەکات، کەسی زاهیدی بەرۆژوو لە خواردن و خواردنەوە لە هەرچی شتی تر جگە لە زانراوەکەی خۆی بەرۆژووە، ئەو برسییەتی و جگە لە دەستی پزیشکەکەی خۆی خواردن لە دەستی کەسی تر وەرناگرێت، دەرمانی ئەو دوورییە، دەرمانی ئەو نزیکییە، رۆژووی کەسی زاهید بە رۆژە و رۆژووی کەسی عاریف بە رۆژ و شەوە، ئەو تەنها بە لیقای پەروەردگاری رۆژووەکەی دەشکێنێت، کەسی عاریف بە هەمیشەیی بەرۆژووە و بە هەمیشەیی گەرمداهاتووە، بە دڵ بە هەمیشەیی بەرۆژووە و بە نهێنیش گەرمداهاتووە، ئەوەی زانیوە شیفای ئەو لیقای پەروەردگار و نزیکییە لە ئەوەوە.



## مەجلیسی سی و دوو

# جێبەجێ کردنی فەرمانەکان و دوورکەوتنەوە لە نەهیلێکراوەکان

بەیانی رۆژی هەینی لە مەدرەسەکەی، ١١/جمادي الآخرة/٥٤٥هـ دوای هەندێك قسە فەرموویی:

فەرمانەکان جێبەجێ بکە و لە نەهیلێکراوەکان دەست بکێشەرەوە، لەسەر ئەو ئافەتانە ئارامبگرە و بە نەوافل لە خودا نزی ببەرەوە، ئەوکات بە کەسێکی بەناگای کارکەر بۆ داوای کۆمەکی لە پەروەردگارەوە(عزوجل) ناودەبرێیت، لەگەڵ کۆشان و وازهێنان لە زۆرلەخۆکردن بۆ ئامادەبوون لە دەرگای کار، چونکە خودایە تۆ بەکاردەهێنێت، داوای لێ بکە و لەبەردەستیدا گەردنکەچ بە تا هۆیەکانی گوێڕایەڵیت بۆ ئامادە دەکات، چونکە ئەو(سبحانه وتعالى) گەر تۆی بۆ کارێك بوێت ئامادەت دەکات، ئەو فەرمانی پێکردووی بە پەلەکردن بۆ ئەنجامدانی کار لە تۆوە و ئاراستەکردنی کۆمەکی لە ئەوەوە بۆ تۆ، فەرمان ئاشکرایە و کۆمەك شاراوەیە، نەهیکردن لە یاخیبوون ئاشکرایە و خۆپارێزی لێی شاراوەیە، دەست بە کۆمەکی ئەوەوە بگرە و بە پارێزگاری و عیسمەتی ئەوەوە واز لە گوناه و خراپە بهێنە و بە هێزی ئەوەوە ئارام بگرە، لەلای من بە ژیری و دامەزران و بینێت و لێبڕان و لادانی تۆمەت لەسەرم و گومانی باش بە من ئامادە ببە، ئەوکات ئەوەی من دەیڵێم سوودی لێ دەبینن و ماناکانی تێدەگەن، ئەی ئەو کەسەی من تۆمەتبار دەکەی سبەینێ هەموو ئەوەی منی تێدام بۆت روون دەبێتەوە، ئانشانێن مەکە لەگەڵم لەوەی من لەسەریم، دڵت شکست دەخوات ژێردەستە دەبێت، قورساییەکانی دونیا لەسەر سەرمە و قورساییەکانی دوارۆژ لەسەر دڵم و قورساییەکانی حەق(عزوجل)

لەسەر نهێنیم، ئایا یارمەتیدەرێکم بۆ هەیە؟ هەرکەس چاکە بکات دێتـە پێشـەوە بـۆ لام و سەری خۆی دەخاتـە بـەر هەڕەشـە، بـە حەمـدی خودا(عزوجـل) ئاتـاج نـیم بـە کۆمەکی هـیچ کەسـێك جگـە لـە کۆمـەکی خودا(عزوجـل)، کەسـانێکی ئاقـڵ بـن و لەگەڵ خوداناسـان ئـەدەبتان جـوان بێـت، ئەوانـە هەڵبـژاردەی عەشـرەتەکان و خێـری بەندە و وڵاتن، بەوانە زەوی دەپارێزرێت، ئـەگینا بـە ریـا و دووڕوویـی و هاوەڵـدانانی ئێوە چی دەپارێزرێت، ئەی دووڕووان، ئەی دوژمنـانی خـودا و پێغەمبـەر(ﷺ)، ئێـوە پڵوپووش و سووتەمەنی دۆزەخن.

**خودایـە**، تەوبـە لـە مـن و لـەوانیش قبـووڵ بفـەرموو، خودایـە، مـن و ئـەوانیش بەئاگابهێنە، ڕەحم بە من و بەوانیش بکە، دڵ و ئەندامانمان بۆ خۆت خاڵی بکـەرەوە، ئەگـەر هـەردەبێ شـتێك داگیریـان بکـات، ئـەوا ئەندامـەکانمان بـۆ مـاڵ و منـداڵ و کاروباری دونیا و نەفس و شتانی تر و دڵ و نهێنیشمان تەنها بۆ تۆ بێت، ئامین.

**ئەی گەنج**، شتێك لە تۆوە سەوز نابێت هەردەبێت لە خۆتەوە بێت، شـتێك لـە تـۆوە سـەرهەڵنادات هـەردەبێت لـە ئامـادەبوونی خۆتـەوە بێـت، دەرگـای کـار دابمەزرێنە تا ئەو(سبحانه وتعالى) بۆ بیناکردن بەکارت بهێنێت، تۆ و کۆمـەکی بـەم جۆرەن، تۆ کرێکاری و کۆمەکیش بەکارهێنراوە و خاوەنی کارەکـەش بریتییـە لـە خودا(عزوجل)، خودا فەرمانی پێکردووی بە پەلەکردن بۆ لای گوێڕایـەڵی خـۆی و کۆمەکیش لە ئەوەوەیە.

**هاوار بە حاڵت**، نەفسی خۆت بـە ترسان لـە خـەڵکی و رجـا پێیـان کـۆت و بەنـد کـردووە، ئـەم کـۆت و بەنـدە لـە پێیـەکانی بکـەرەوە و دەسـت بـە خزمـەتیکردنی دونیا و حەزەکان و ئافرەت و هەموو ئەوەی تێیکـەوتووە زوهـدی پـێ بکـە، گـەر لـە بڕیاری پێشینەی خودادا شتێك لەوانەی بۆ نووسرابێت ئەوا بەبێ فـەرمان و داوای تـۆ ڕووت لێ دەکات و لـەلای حـەق(عزوجل) بـە زاهیـد ناودەبرێـت و بـە چـاوی رێـزەوە تەماشات دەکرێت، و بەشەکەشت نافەوتێت، هەتا تۆ پشتت بە هەوڵ و هێزی خۆت و ئەوەی لە دەستدایە بەستبێت هیچ شتێك لە پەنهانەوە ڕووت لێ ناکات.

**یەکێک لە خوداناسان دەڵێت:** هەتا لە گیرفاندا شتێک بوونی هەبێت لە پەنهانەوە هیچ رووت لێ ناکات.

خودایە ئێمە پەنات پێدەگرین لە پشتبەستن بە هێز و وەستان لەگەڵ هەوەس و ئارەزوو و نەریت، هەروەها لە هەموو حاڵ و بارێکدا پەنات پێدەگرین لە شەڕ.

﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ۝٢٠١﴾

البقرة: ٢٠١



# مەجلیسی سی و سێ

## بینینی خودا لە رۆژی دواییدا

بەیانی رۆژی یەکشەممە لە "الرباط"، ١٣/جمادي الآخرة/٥٤٥هـ فەرمووی:

هەرکەس موحیبێکی خودا دەبینێت خودای بینیوە، هەرکەس بەدڵ خودا(عزوجل) ببینێت بە نهێنی خۆی دەچێتە ژوورەوە بۆ لای، پەروەردگارمان(عزوجل) هەبوو و بینراوە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:

((وەك چۆن خۆر و مانگ دەبینن ئا بەو جۆرە پەروەردگارتان دەبینن، و جیاوازیتان لە بینینی نابێت))[1].

ئەمڕۆ بە چاوی دڵ و سبەینێ بە چاوی سەر دەیبینن.

﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾ الشورى: ١١

ئەوانەی خۆشیاندەوێت بە ئەو رازیبوون نەك بە شتێك لەخوار ئەوەوە، داوای کۆمەکیان لە ئەو کرد و لە کەسانی تر جگە لە ئەو دەستیان پان نەکردەوە، تاڵاوی هەژاری لەلایان بوو بە شیرینی، لە دونیادا هەژارییان لەلای خۆیانە، رازیبوونیان بە هەژاری لەلای خۆیانە، خۆشی لێوەرگرتنی لەلای خۆیانە، دەوڵەمەندییان لە هەژاریدایە و خۆشی و تام و چێژیان لە نەخۆشیدایە و هۆگرییان لە نامۆبووندایە، و نزیکییان لە دووریدایە و ئاسوودەییان لە ماندووبووندایە، خۆشبەختی بۆ ئێوە ئەی ئارامگرانی رازی بە بەشی خودا، ئەی ئەوانەی لە نەفس و ئارەزوو فەناتان کردووە.

---

[1] رواه البخاري ومسلم.

**خەڵكینە**، لەگەڵ خودا تەبا بن و رازیبن بە كردارەكانی لەناو ئێوە و كەسانی تردا، خۆتان بە زانا نیشان مەدەن، لای كەسانی ئاقڵتر لە خۆتان ژیرمەند خۆتان نیشان مەدەن، خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ۝٢١٦﴾ البقرة: ٢١٦

لەبەردەم مندا لەسەر پێی ئیفلاس لە ئەقڵ و زانستتان بوەستن، بۆ ئەوەی زانستەكەی وەربگرن، سەرسامی نیشان بدەن و هەڵبژاردەتان نەبێت، تیایدا سەرسام بن تاكو زانستتان بە ئەو بۆ دێت، یەكەمجار سەرسامبوون، دووەمجار زانست، پاشان گەیشتن بە زانراوەكان، یەكەمجار مەبەست پاشان گەیشتن بە مەبەست، ویست پاشان بەدەستهێنانی ویستراو، گوێبگرن و بزانن، چونكە من پەت و داوی ئێوە دەپسێنم، پەتی شلی ئێوە دەپسێنم و پچڕاوەكەی دەگەیەنم، من هیچ هەوڵێكم نییە جگە لە ئێوە، هیچ خەم و پەژارەیەكم نییە جگە لە ئێوە، من باڵندەیەكم لە كوێ داباریم هەڵدەگرمەوە، ئێوە تەنها چەند بەردێكی هەڵدراوتان بەسە ئەی پاڵكەوتووانی لاشەقورسی یەخسیر بە نەفس و بەستراوە بە ئارەزوو، خودایە رەحم بە من و بەوانیش بكە.



# مەجلیسی سی و چوار

## نەهی لە خراپە

شێخ عبدالقادر(خودا لێی رازی بێت) دوای هەندێك قسە فەرمووی:

خوداناسـان بەخشـین و بینینـەوەی ئاسـوودەیی بـۆ خـەڵكی سـەرقاڵی كردبـوون، تالانكەری بەخشەر بوون، لە فەزڵ و بەزەیی خودایان تالان دەكرد و دەیانبەخشی بە هەژاران و گەدایان، ئەو هەژارانەی دونیان لێ بەرتەسك بووبوویـەوە، قـەرزیان لەسـەر قەرزدار و دەستەوسانان لادەبرد كە نەیاندەتوانی قەرزەكەیان بدەنـەوە، ئـەوان مـەلیك بوون نەك وەك مەلیكـەكانی دونیـا، چونكە مەلیكـەكان تـالان دەكـەن و نابەخشـن، خوداناسـان ئـەوەی لـەلایان بـوو دەیانبەخشـی و خـەڵكی تریـان بەسـەر خۆیانـدا پێشدەخست، و چاوەڕوانی بزربوو(مفقـود) بـوون، لـە دەسـتی حـەق(عزوجل) وەریـان دەگرت نەك لە دەستی خەڵك، كەسپی ئەندامەكانیان بۆ خەڵكی بـوو، بـەڵام كەسـپی دڵیان بۆ خودا بوو، بۆ خودا(عزوجل) خەرجیان دەكـرد، نـەك بـۆ ئـارەزوو و مـەرامی نەفس، نەك بۆ مەدح و سەنا، واز لە لوتبـەرزی بهێنـە بەرانبـەر بـە حـەق(عزوجل) و بەرانبەر بە خەڵك، چونكە ئـەوە لـە سیفەتەكانی ملهوڕان و ستەمكارانە، ئەوانـەی خودا(عزوجل) لەسەر روو بەناو ئاگری دۆزەخدا رایاندەكێشێت، گـەر خودا(عزوجـل) شـوورە بكـەی لوتبـەرزیت نوانـدووە بەرانبـەری، گـەر بانگكـەرێك بـانگی كـرد و بـە راستبوونەوەت وەڵامت نەدایەوە ئەوا لوتبەرزیت بەرانبەر بە خودا نواندووە، گەر ستەم لە یەكێك لە دروستكراوەكانی بكەی لوتبەرزیت بەرانبەری نواندووە، تەوبە بكـە و لـە تەوبەكەتدا ئیخلاصت هەبێت بەر لەوەی بە لاوازترین روستكراوی خودا تیابچیت وەك جۆن نەمروود و كەسانی تر لە مەلیكانی تیابرد، كاتێك لوتبـەرزیان بەرانبـەری نوانـد خودا لەدوای عیززەت و دەسەڵات زەلیلی كردن، لەدوای دەوڵەمەندی هەژاری خسـت،

لەدوای خۆشی سزای دان و ئازاری بۆ هێنان، لەدوای ژیان مراندنی، بچنە ریزی خۆپارێزانەوە، هاوەڵدانان لە ئاشکرا و پەنهاندا بوونی هەیە، لە ئاشکرادا بریتییە لە بەندایەتی بت و لە ناوەوەدا بریتییە لە شانادان لەسەر دروستکراوەکان و بینینیان لە زیان و قازانجدا، لەناو خەڵکیدا کەسانێك هەن دونیایان لەدەستدایە و خۆشیان ناوێت، دەبن بە خاوەنی دونیا و دونیا نابێت بە خاوەنی ئەوان، دونیا ئەوانی خۆشدەوێت ئەوان دونیایان خۆشناوێت، دونیا بەدوای ئەواندا رادەکات ئەوان بەدوای دونیادا راناکەن، دونیا بەکاردەهێنن دونیا ئەوان بەکارناهێنێت، لە دونیا جیادەبنەوە و دونیا نایەوێت لە ئەوان جیاببێتەوە، دڵی بۆ خودا(عزوجل) هاتووەتە راستە، دونیا ناتوانێت ئەوان تێکبدات، بۆیە ئەوان دونیا هەڵدەسورێنن و دونیا ناتوانێت ئەوان هەڵبسورێنێت، بۆ ئەو مەبەستە **پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:**

((باشترین ماڵ و سامان ماڵ و سامانی کەسێکی صاڵحە))[1].

**یان فەرمووی:** ((خێر لە دونیادا نییە مەگەر کەسێك بڵێت ئاوا و ئاوا))[2] ئاماژەی بەدەستی کرد بۆ دابەشکردنی ماڵ و سامانەکە بەدەستی لە مەیدانی خێر و چاکەدا، دونیا لە دەستتان وازلێبهێنن بۆ بەرژەوەندی خانەوادەی خودا(عزوجل)، لە دڵتان دونیا دەربکەن گومانی تێدا نییە زیانێکتان پێ ناگەیەنێت، خۆشی و جوانی دونیا فریوتان نەدات، بەم نزیکانە ئێوە دەڕۆن و ماڵەکەشتان بەدوای ئێوەدا دابەش دەکرێت.

**ئەی گەنج،** بە بۆچوونی خۆت لە من بێنیاز مەبە، چونکە گومڕا دەبیت، هەرکەس بە را و بۆچوونی خۆی بێنیازی نیشاندا گومڕا و زەلیل بووە و پێیەکانی خلیسکاون، گەر بە را و بۆچوونی خۆت بێنیاز بووی بێبەش دەبیت لە هیدایەت و پارێزگاری، چونکە داوات نەکردوون و هەنگاوت بۆ هۆکارەکانیان هەڵنەگرتووە، دەڵێیت من بێنیازم لە زانستی زانایان و بانگەشەی زانست دەکەی، ئەی کوا کار و کردەوەت؟ ئەم بانگەشەیە چ کاریگەرییەکی هەیە، کوا راستێتی بانگەشەکەت؟ کاتێك بانگەشەی

---

[1] رواه ابن حبان في صحيحه وأحمد والبيهقي في "الشعب".

[2] رواه البخاري ومسلم



Scanned by CamScanner

زانستەکەت بەڕاست دەگەڕێت کار و کردەوەی باشت هەبێت و ئیخلاصیان تێدا ئەنجام بدەی و لەسەر بەلاَ و ناخۆشییەکان ئارام بگریت، گۆڕانت بەسەردا نەیەت و نائارامی و پەرێشانی ڕووت لێ نەکات و لەلای خەلکی سکالاَ نەکەی، تۆ کوێری چۆن دەبێت بانگەشەی بینین بکەی، تۆ تێگەیشتنێکی دەرداویت هەیە چۆن دەبێت بانگەشەی تێگەیشتنی دروست بکەیت؟ لە بانگەشە درۆینەکەت تەوبە بکە و بۆ لای خودا(عزوجل) بگەڕێوە، تەنها دەست بە خوداوە بگرە نەك شتانی تر، پشت لە هەموان بکە و ڕوو بکە دروستکەری هەموان، ئەوانەی شکاون یان هاتوونەتە ڕاستە، تیاچوون یان بوون بە دەسەلاَتدار پەیوەندیان بە تۆوە نییە، تۆ خەریکی نەفسی خۆت بە تا نەفست ئارام و دلنیا دەبێتەوە و پەروەردگاری خۆی دەناسێت، لەو کاتەدا لا بەلای کەسانی تردا بکەرەوە، دەست بە ڕاستە شەقامی مەبەست و مەرامی خوداوە بگرە، لە دونیا و دوارۆژدا داوای هاوەلَی ئەو بکە، دەست بە تەقواوە بگرە و خۆت لە هەموو شتێك دابڕنە، هەمیشە نەفسی خۆت بسڕەوە و نەفست لە شتێکدا جێگیر مەکە مەگەر لە مەیدانی فەرمانەکانی خودا و دوورکەوتنەوە لە نەهیلێکراوەکانی، ئەوە خودایە(سبحانه وتعالی) تۆ لەو شوێنانەدا دامەزراو دەکات، ئەی پیاوان و ئەی ئافرەتان کەسانێك لە ئێوە ڕزگاری و سەرفرازی بەدەست دەهێنێت گەر گەردیلەیەك لە ئیخلاصی لەلا بێت، گەردیلەیەك لە تەقوای لەلا بێت، گەردیلەیەك لە ئارامگرتن و شوکرکردنی لەلا بێت، بەلاَم دەبینم ئێوە لە هەموو ئەوانەدا مایەپووچن.



# مەجلیسی سی و پێنج

## ترسان لە خودا(عزوجل)

شێخ عبدالقادر(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی:

هاوار بە حاڵتان، ئەی لوتبەرزان، عیبادەتەکاندا ناچنە ناو زەوییەوە بەڵکو بۆ ئاسمان بەرزدەکرێنەوە، خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿إِلَيْهِ يَصْعَدُ ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلْعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرْفَعُهُۥ﴾فاطر: ١٠

پەروەردگارمان(عزوجل) لەسەر عەرشەکەی ئیستیوای کردووە و لەسەر مولکەکەی راوەستاوە، زانستەکەی ئابلۆقەی هەموو شتێکی داوە، ئەو بەدیهێنەرە، حەوت ئایەت لە قورئاندا لەم مانایەدا هاتوون، ناتوانم لەپێناو نەزانی و لادانی تۆدا ئەو ئایەتانە بسڕمەوە، بە شمشێرەکەت هەڕەشەم لێ دەکەی من ناترسم، بە ماڵ و سامانەکەت حەزم بۆ دروست دەکەی، بەڵام من حەزێکم نییە، تەنها لە خودا(عزوجل) دەترسم لە هیچ شتێکی تر جگە لە ئەو ناترسم، رجام لەلای ئەوە و لەلای خەڵکی نییە، بەندایەتیم بۆ ئەوە و بەندایەتی بۆ کەسێکی تر ناکەم، بۆ ئەو کار دەکەم و بۆ کەسێکی تر کار ناکەم، رۆزیم لەلای ئەوە و بەدەستی ئەوە، هەموان بەندەی ئەون و ئەوەی ئەو خاوەنییەتی بەشی خودایە، -پاشان باسی ئەوەی کرد کە لەسەر دەستی ئەو نزیکەی پێنجسەد کەس موسڵمان بووە و نزیکەی بیست هەزار کەس تەوبەی کردووە، وتی-: ئەمەش لە بەرەکەتی پێغەمبەرمان(ﷺ) محەمەدەوەیە.

﴿عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِۦٓ أَحَدًا ۝ إِلَّا مَنِ ٱرْتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ﴾

الجن: ٢٦-٢٧

پەنهان(غیب) لەلای خودایە، لە خودا نزیك ببەرەوە تاكو خودا و ئەوەی لەلایەتی ببینیت، واز لە خانەوادە و ماڵ و سامان و شار و وڵات و ژن و منداڵ بهێنە، بە دڵ لەوانە وەرە دەرەوە و هەمووان وازلێبهێنە و بەرەو دەرگای ئەو هەنگاو هەڵبگرە، گەر گەیشتییە بەر دەرگای ئەو بە خزمەتكاران و دەسەڵات و موڵكی ئەوەوە خەریك مەبە، گەر خوانێكیان پێشكەش كردی مەیخۆ، گەر لە ژوورێكدا نیشتەجێیان كردی نیشتەجێ مەبە، گەر هاوسەرگیرییان بۆ رێكخستی هاوسەرگیری مەكە، هیچ یەكێك لەوانە قبووڵ مەكە تا بە خزمەتی خۆی دەگەی، بە پۆشاك و ماندووبوون و تەپوتۆزی سەفەر و قژی شێواوەوە بچۆ خزمەتی، با ئەو خواردن و خواردنەوەت پێ ببەخشێت، هۆگریت لەدوای نامۆبوون بۆ دروست بكات و دەرووت لێ بكاتەوە، لە ماندووبوونەكەت بتحەوێنێتەوە و ترست بڕەوێنێتەوە، بە نزیكی ئەو لە تۆ بێنیاز ببیت، بە بینینی ئەو خواردن و خواردنەوە و پۆشاك بەدەست بهێنیت، مانای وەلابەخشین بە خەلكی چییە؟ بریتییە لە ترس لەوان و رجا لای ئەوان، و ئارامی و سوكنایی بەوانەوە، و متمانە پێیان، ئەمە بریتییە لە وەلابەخشین بەوانە.



## مەجلیسی سی و شەش

# ئیخلاص لە کاردا بۆ خودا (عزوجل)

ڕۆژی سێشەممە لە مەدرەسەکەی، ٢/ڕەجەب/٥٤٥ھ لەدوای هەندێك قسە فەرمووی:

ئەم دونیایە بازاڕێکە پاش کەمێکی تر کەسی تێدا نامێنێت، کاتێك شەو دادێت خەلکی بازاڕ کۆچ لەبازاڕ دەکەن و دەڕۆن، هەوڵبدەن شتێك بفرۆشن و شتێك بکڕن سبەینێ لە بازاڕی دواڕۆژدا سوود و قازانجتان پێبگەیەنێت، چونکە خودا کار و کردەوەکانی ئێوە دەبینێت، یەکتاپەرستی حەق(عزوجل) و ئیخلاص لە کارەکاندا بۆ خودا لەلای ئێوە زۆر کەمە.

**ئەی گەنج**، ژیرمەند بە و پەلە مەکە، چونکە بە پەلەکردن شتێکت ناکەوێتە بەردەست، کاتی خۆرئاوابوون و کاتی خۆرهەڵهاتن مەیە بۆ لام، بۆ ئارام ناگری و خۆت خەریك ناکەی تا کاتی هاتنی شێوان و وەرگرتنی ئەوەی تۆ دەتەوێت، کەسێکی ژیرمەند بە و لەگەڵ خودا و بەندەکانیدا بەئەدەب بە، ستەم لە خەلکی مەکە و شتێکیان لێ داوا بکەی کە لەلای ئەوان بەرچنگت ناکەوێت، قسە بوونی نییە تا واژوو بۆ بڕیکارەکە نەکرێت، ئەوکات پێدان دەبینی، بەر لە واژوو بۆ کردن گەردیلەیەك نابەخشرێت، گەردیلەیەك بە تۆ نادرێت لە وشکانی و دڵۆپێك بە تۆ نادرێت لە دەریا مەگەر بە مۆڵەتی خودا (عزوجل)، چونکە ڕۆزی لەلای ئەو دابەشکراوە و بەدەستی ئەوە.

**هاوار بە حاڵت**، سبەینێ بە چ ڕوویەکەوە بە خزمەتی خودا دەگەی، لە کاتێکدا تۆ لە دونیادا بەربەرەکانێی لەگەڵ دەکەی و پشتت لێکردووە و ڕووت لە خەلکی کردووە و هاوەڵت بۆ داناوە، و پێویستییەکانت لەلای ئەوان داناوە و پشتت بەوان بەستووە لە کارە گەورە و گرنگەکاندا، پێویستی بۆ لای خەلکی سزایەکە بۆ زۆرینەی داواکەران، ئەوان بە گوناهەکانیانەوە بەدوای داواکانیاندا دەگەڕێن، کەمێکیان هەیە داواکانیان

بۆ جێبەجێ ناکرێت بەبێ ئەوەی ناپەسەندییەك لە ئەواندا هەبێت، گەر داوا بکەیت و سزادرابێت تۆ بێبەش دەبیت بەوەی پێت نابەخشرێت.

ئەی گەنج، من پێمباشە لەباری لاوازیدا هیچ شتێك لە کەس داوانەکەی، شتێکت نەبێت نایزانیت و نازانرێت، نایبینیت و نابینرێت، گەر توانیت ببەخشی و وەرنەگریت ئەنجامی بدە، گەر توانیت خزمەت بکەی و داوای خزمەت نەکەی لە هیچ کەسێك ئەنجامی بدە، خوداناسان بۆ ئەو و لەگەڵ ئەو(سبحانه وتعالی) کاریان ئەنجامدا، ئەویش(سبحانه وتعالی) نایەتە سەیر و سەرسوڕهێنەکانی خۆی لە دونیا و دوارۆژدا پێنیشاندان، لوتف و سەرپەرشتیاری خۆی بە ئەوان نیشاندا.

ئەی گەنج، گەر ئیسلامت نەبێت ئیمانت نابێت، گەر ئیمانت نەبێت یەقینت نابێت، گەر یەقینت نەبێت مەعریفە بۆ خودا و زانست بە ئەوت نابێت، ئەمە کۆمەڵێك پلە و ئاستی جۆراوجۆرن، گەر ئیسلامت بۆ هاتە راستە خۆڕادەستکردنت بۆ دێتە راستە، لە هەموو حاڵ و بارێکدا موسڵمان بە بۆ لای خودا لەگەڵ پارێزگاری سنووری شەرع و پابەندبوون پێیەوە، کاروباری خۆت و کەسانی تر رادەستی ئەو بکە، لەگەڵ خودا و خەڵکی ئەدەبی باشت هەبێت، ستەم لە نەفسی خۆت و کەسانی تر مەکە، چونکە ستەم لە دونیا و دوارۆژدا تاریکییە، ستەم دڵ تاریك دەکات و روو رەش دەکات و لاپەڕەی کاروکردەوەکان رەش دەکاتەوە، ستەم مەکە و هاوکاری ستەمکار مەکە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((لە رۆژی دواییدا بانگکەرێك بانگ دەکات: ستەمکاران لە کوێن؟ کۆمەککارانی ستەمکاران لە کوێن؟ ئەوانە لە کوێن قەڵەمیان بۆ دادەتاشین؟ ئەوانە لە کوێن رووپەڕی نووسینیان بۆ ئامادە دەکردن؟ کۆیانبکەنەوە و بیانخەنە تابوتێك لە ئاگر))[1].

لە خەڵکی هەڵبێ و تێبکۆشە نە ستەملێکراو بیت نە ستەمکار، گەر هەر دەبێت یەکێکیان بیت ئەوا ستەملێکراو بە نەك ستەمکار، چەوساوە بیت نەك چەوسێنەر، سەرخستنی حەق(عزوجل) بۆ ستەملێکراوانە بەتایبەت گەر سەرخەرێکی لەناو

[1] رواه القرطبي في تفسره.

خەلکیدا بۆ نەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت: ((گەر کەسێك ستەمی لێکراو و جگە لە حەق(عزوجل) سەرخەرێکی نەبوو پێی دەفەرمووێت: سەرتدەخەم با ماوەیەکیشی پێ بچێت))[١].

ئارامگرتن هۆی سەرخستن و بەرزبوونەوە و عیززەتە، خودایە، ئێمە داوای ئارامگرتنت لێدەکەین لەگەڵ خۆت، هەروەها داوای تەقوا و ژیانێکی تێر و تەواوت لێ دەکەین، هەر بەو جۆرە داوای خاڵیبوونەوە لە هەموان و سەرقاڵبوون بەتەنها تۆوە و بەرزبوونەوەی پەردەی نێوان ئێمە و تۆ دەکەین، ناوەندەکانی نێوان خۆتان و خودا هەڵبگرن، چونکە وەستان لەگەڵ ئەوانە هەوەسبازییە، هەرچی موڵك و دەسەڵات و دەوڵەمەندی و عیززەتە خودا خاوەنییەتی، ئەی کەسی دووڕوو تاکەی ریابازی دەکەی و دووڕوویی نیشان دەدەی؟ چی بەدەست دەهێنیت لەو کەسەوە کە دووڕوویی لەپێناویدا دەکەی؟

**هاوار بە حاڵت**، تۆ شەرم لە خودا ناکەی و باوەڕت بە لیقای ئەو نییە؟ بەم نزیکانە کارێك ئەنجام دەدەی رووالەتەکەی بۆ خودایە و ناوەوەی بۆ کەسێکی ترە، دەتەوێ خودا فریو بدەی، بەڵام ئەو زانایە بە تۆ، بگەڕێرەوە و فریای کارەکانت بکەوە و نییەتەکەت بۆ ئەو راستبکەرەوە، هەوڵبدە خواردنی پاروویەك و هەڵگرتنی هەنگاوێك بە نییەتی چاك و پاك بێت، خۆت بۆ خودا چاك بکە، گەر ئەوەت ئەنجامدا هەرکارێك ئەنجامی دەدەی بۆ خودایە نەك بۆ کەسانی تر، زۆرکردن لە خۆ لێدەبێتەوە و ئەم نییەتە چاکە دەبێت بە سروشتی بەندە، گەر بەندایەتییەکەی بۆ پەروەردگاری هاتە راستە ناتاج نابێت بە زۆرلەخۆکردن لە شتێکدا، چونکە مەولا(عزوجل) سەرپەرشتی ئەو دەکات، کاتێك خودا بەندەکەی سەرپەرشتی دەکات بێنیازی دەکات و لە خەلکی دایدەپۆشێ و پێیان ناتاج نابێت، هەتا مورید بیت خۆت ماندوو بکە، مەبەست دیاریبکە و هەنگاوی بۆ هەڵبگرە، کاتێك گەیشتیت و ماوە و دووری سەفەرەکەت بڕی و گەیشتییە خانەی نزیکی لە پەروەردگارت(عزوجل) زۆرلەخۆکردن کۆتایی پێ دێت و

---

[١] رواه الطبراني في "الأوسط" و"الصغير".

هۆگری بە خوداوە لە دڵدا جێگیر دەبێت و زیاد دەکات تا هەموو دڵ لێوانلێو دەکات، یەکەمجار بچووکی پاشان گەورە دەبێت، کاتێک گەورەبوویت دڵ پڕ دەبێت لە خودا(عزوجل) و ڕێگە و گۆشەیەک لە دڵدا بۆ کەسانی تر ناهێنێتەوە، گەر دەتەوێ بەم ئاستە بگەی ئەوا فەرمانەکانی جێبەجێ بکە و لە نەهییەکانی خۆت بکێشەرەوە و لە خێر و شەڕ و دەوڵەمەندی و هەژاری و عیززەت و زەلیلیدا خۆت رادەستی ئەو بکە، هەروەها لەباری گەیشتن بە مەرامەکان و زۆرێک لە کاروباری دونیا و دوارۆژدا، کار بۆ خودا بکە و داوای گەردیلەیەک پاداشت مەکە، کار بکە و مەبەستەکەت نزیکی و رازیکردنی ئەو کەسە بێت کاری بە تۆ ئەنجامداوە، پاداشتەکەی دەبێت بە رازیبوون و نزیکی لە تۆوە لە دونیا و دوارۆژدا، لە دونیادا بۆ دڵ و لەدوارۆژدا بۆ دڵ و جەستەت، کار بکە پێشبڕکێ مەکە بۆ کەمترین پاداشت، تەماشای کارە چاکەکانی خۆت مەکە بەڵکو با ئەندامەکانت کار بکەن و دڵت لەگەڵ ئەو کەسە بێت کارەکەی بە تۆ ئەنجامداوە، کاتێک ئەمەت بۆ تێر و تەواو بوو دڵت دەبێتە خاوەنی چاو و پێی دەبینی، مانا دەبێت بە وێنە و شێوە و بزر و نادیار دەبێتە دیار و ئامادە، هەواڵ دەبێت بینراو، کاتێک بەندە بۆ خودا(عزوجل) هاتە راستە ئەوا خودا لە هەموو حاڵ و بارێکدا لەگەڵ ئەو دەبێت، گۆڕانی بەسەردا دەهێنێت و تاوتوێی دەکات و لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێکی تر دەیگوێزێتەوە، هەموو بوونی دەبێت بە مانا، هەموو بوونی دەبێت بە ئیمان و یەقین و مەعریفە و نزیکی و بینین، دەبێتە رۆژێکی بێ شەو، رۆشناییەکی بێ تاریکی، پاکێتی و روونییەکی بێ لێڵی و لیخنی، دڵێکی بێ نەفس، نهێنییەکی بێ دڵ، فەنابوونێکی بێ بوون، نوقمبوون و بزربوونێکی بێ ئامادەبوون، لە خەڵکی و لە خۆی بزر و نادیار دەبێت، هەموو ئەمانە بنچینەکەی بریتییە لە هۆگری بە خوداوە(عزوجل) تا ئەم هۆگرییەت لە نێوان تۆ و پەروەردگارت(عزوجل) بۆ تەواو دەبێت، هەنگاوێک لە خەڵکی خۆت بەدووربگرە، نە زیانیان و نە قازانجیان، تۆ ئەوانت ئەزموون کرد، لە نەفست هەنگاوێک خۆت بەدووربگرە و تەنها مەبە لەگەڵی و لەپێناو رازیکردنی پەروەردگارت(عزوجل) دەستدرێژی بکە سەری، ئەمەشت ئەزموون کردووە، خەڵک و نەفس دوو دەریای ئاگرن، دوو دۆڵی تیاچوونن، خۆت یەکلا بکەرەوە و

تێبکۆشە بۆ رزگاربوون لەو تیاچوونە، چونکە تـۆی تێکـەوتووە، لـە مـوڵکی دونیـادا نەخۆشی هەیە و لە موڵکی دوارِۆژدا دەرمان بوونی هەیـە، هـەموو دەرد و دەرمـان و نەخۆشی وازلێبهێنە، دەرمان لەلای خۆیـەتی و بەدەسـتی خۆیـەتی و بەدەسـتی هـیچ کەسێکی تر نییە جگە لە خودا، گەر لەسەر تەنهایی ئارامت گرت ئـەوا هۆگریـت بـە خـودای تـاك و تـەنهاوە بـۆ دروسـت دەبێـت، گـەر لەسـەر هـەژاری ئارامـت گـرت دەوڵەمەندی رووت لێ دەکات، واز لە دونیا بهێنە پاشـان داوای دوارِۆژ بکـە، پاشـان داوای نزیکی لە مەولا(عزوجل) بکە، واز لە خەڵك بهێنـە و پاشـان بگـەرِێوە بـۆ لای دروستکەر(سبحانە وتعالی).

**هاوار بە حاڵت**، دروستکراو و دروستکەر لە دڵی تۆدا کۆنابنـەوە، دونیـا و دوارِۆژ کۆنابنەوە، وێنا ناکرێت و دروست نییە و هیچی لێوە بەرهەم نایەت، یـان دروسـتکراو یان دروستکەر، یان دونیا یان دوارِۆژ، وێنا دەکرێت دروستکراو لە دەرەوە و ئاشـکرای تۆدا بێت و دروستکەر لە ناوەوە و پەنهانی تۆدا بێت، دونیا لە دەستی تـۆدا و دوارِۆژ لە دڵـدا، بـەڵام هـەموو ئەوانـە لـە دڵـدا کۆنابنـەوە، بـۆ نەفسـت وردببـەرەوە و بـۆی هەڵبژێرە، گەر دونیات گەرەك بوو دوارِۆژ لە دڵت دەربکە، گەر مـەولات گـەرەك بـوو دونیـا و دوارِۆژ و هەرچـی شـتی تـرە جگـە لـە ئـەو لـە دڵ دەربکـە، چـونکە هـەتا گەردیلەیەك لە دروستکراو لە دڵی تۆدا بێت نزیکی لـە ئـەوەوە نابینیـت و هـۆگری و سوکناییت بە ئەوەوە بۆ بەدەست نایەت، هەتا گەردیلەیەك لە دونیا لە دڵی تۆدا بێت دوارِۆژ لە بەردەمی خۆت نابینیت، هەتا گەردیلەیـەك لـە دوارِۆژ لـە دڵـی تـۆدا بێـت نزیککردنەوەی حەق(عزوجل) نابینیت، کەسێکی ژیرمەند بە و بە هـەنگاوی صـدقەوە وەرە بۆ دەرگای پەروەردگارت، چونکە خودا ناوەوە و دەرەوەی تۆ دەبینێت.

**هاوار بە حاڵت**، خۆت لە دروستکراوەکان شاردووەتەوە، بەڵام خۆت لـە دروسـتکەر پێ ناشارێتەوە، چۆن دەتوانی خۆت بشاریەوە؟! بەم نزیکانـە لـەلای خـەڵکی رسـوا و شەرمەزار دەبیت، پارەکە لە گیرفان و ماڵت دەردەهێنن، ئەی ئەو کەسـەی شووشـەی وازلێهێناوە بۆ شکان سبەینێ خواردنەکـەت لـە جامـە شووشـەکەدا هەواڵەکـەت بـۆ رۆشن دەکاتەوە، ئەی ئەو کەسەی ژەهر دەخۆی بـەم نزیکانـە کاریگەرییـەکەی لەسـەر

جەستەت دەردەکەوێ، خواردنی حەرام ژەهرە بۆ جەستەی ئایینەکەت، وازهێنان لە شوکری نیعمەت ژەهرە بۆ ئایینەکەت، بەم نزیکانە حەق(عزوجل) سزات دەدات بە هەژاری و سوالکردن لە خەلکی و هەلگرتنی رەحمەت لە دلّی خەلکی بەرانبەرت، تۆش ئەی ئەو کەسەی وازت لە کارکردن هێناوە بە زانستەکەت بەم نزیکانە زانستت لەبیر دەچێتەوە و بەرەکەتەکەی لە دلّت هەلّدەگیرێت، ئەی نەزانان، گەر خوداتان بناسیبایە سزاکەیتان دەناسی، لەگەلّ خودا و خەلکی خاوەنی ئەدەبی جوان بن، قسە کەم بکەنەوە دەربارەی ئەو شتانەی پەیوەندییان بە ئێوەوە نییە.

**لە یەکێك لە صالّحانەوە فەرموویەتی:** گەنجێکم بینی سوالّی دەکرد، پێم وت: گەر کارت بکردبایە بۆ تۆ باشتر بوو، بۆیە بە شەش مانگ هەلّنەستان بۆ شەونوێژ سزا درام.

**ئەی گەنج،** ئەو شتەی بێنیازت دەکات خۆتی پێوە سەرقالّ بکە و بە شتێکەوە خەریك مەبە پەیوەندی بە تۆوە نییە، نەفس لە دلّ دەربکە خێر رووت لێ دەکات، چونکە نەفس لێلّییە و لیخنی بۆ دلّت دروست دەکات، لەدوای دەرکردنی نەفس لە دلّ روونی و پاکێتی بێ لێلّی و لیخنی روت لێ دەکات و گوزراوی بە کەسێکی تر، خودا(عزوجل) دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾ الرعد: ١١

ئەی مرۆڤ گوێبگرە، ئەی خەلکینە گوێبگرن، ئەی داوالێکراوان گوێبگرن، ئەی کەسی پێگەیشتووی، ئەی ئەو کەسەی لە کەلامی خودا(عزوجل) و هەوالّەکانی تێدەگەی و دەزانیت ئەو(سبحانە وتعالى) راستگۆترین راستگۆیە، خۆتان بۆ خودا بگۆڕن، لە نەفسی ئێوەدا کۆمەلّێك شت بوونی هەیە لەلای خودا ناپەسەندە، تاکو ئەوەی ئێوە خۆشتان دەوێت رووتان لێ بکات، رێگەکە بەرینە، ئێوە چیتانە ئەی ئەهلی سەردەم؟! هەستن و هەولّبدەن، کار بکەن و بێناگا مەبن تا هەردوو سەری پەتەکە بەدەستی خۆتانەوەیە، لەو شتانەی ئێوە دەهێننە راستە تەمەنتان بەکاربهێنن، سواری نەفسی خۆتان بن نەگینا سوارتان دەبێت، ئەو نەفسە لە دونیادا فەرمانکەرە بە خراپە و لە دوارۆژیشدا لۆمەکەرتانە، لەوانەی لە خودا سەرقالّ و بێناگاتان دەکەن هەلّبێن وەك چۆن لە درندە هەلّدێن، مامەلّە لەگەلّ خودا بکەن، چونکە هەر کەس مامەلّەی لەگەلّ

خودا کردبێت قازانجی کردووە، هەر کەس خودای خۆشویستبێت خودا خۆشیویستووە، هەر کەس خودای بوێت خودا ئەوی دەوێت، هەر کەس لە خودا نزیک ببێتەوە خودا نزیکی دەکاتەوە، هەر کەس خۆی بە خودا بناسێنێت خوداش خۆی بە ئەو دەناسێنێت، لە من ببیستن و قسەکەم وەربگرن، لەسەر ئەم زەوییە کەسێك بوونی نییە بەم حاڵەی منەوە قسە بۆ خەڵکی بکات، خەڵکم بۆ خودا دەوێت نەك بۆ خۆم، گەر داوای دوارۆژ دەکەم بۆ ئەوان داوای دەکەم، هەر وشەیەك لە دەمم دەردەچێت تەنها مەبەستم پێی حەقە(عزوجل)، من چیمداوە لە دونیا و دوارۆژ و ئەوەی لەناو ئەو دووانەدایە، ئەو(سبحانه وتعالی) راستگۆیی من دەزانێت، چونکە زانایە بە نهێنی و پەنهانەکان، وەرن بۆ لای من، من سەنگی مەحەکم، من خاوەنی کوورەم و سکە لەلای من لێ دەدرێت، ئەی کەسی دووڕوو بۆچی وڕێنە دەکەی؟ وڕێنەکەت پووچ و بەتاڵە، زۆر دەڵێیت: "من" بەڵام تۆ کێیت؟.

**هاوار بە حاڵت**، کەسانی تر جگە لە خودا دەبینی و دەڵێیت: "من خودا دەبینم"، هۆگریت بە کەسانی ترەوەیە و دەڵێیت "من بە خوداوە هۆگرم"، ناوی نەفسی خۆت دەنێیت "رازی" کەچی نەفست پشتهەڵکەر و بەرهەڵستکارە، بە نەفسی خۆت دەڵێیت ئارامگر کەچی مێشوولەیەك بێزارت دەکات و بێباوەڕت دەکات، قسە بوونی نییە تا گۆشتەکەت دەمرێت بەهۆی زۆری ئازار و ئافەتەوە تیایدا، ئەو کات مقەستی ئافەت ئازاری نادات و هەموو بوونت لەگەڵ خودا دەبێت بە خەڵوەت، دڵت لە دونیا و دوارۆژ خاڵیدەبێتەوە و دونیا و ئەوەی تێیدایە لەلای تۆ وەك نەبوونی لێ دێت، بوونت دەچێتە ناو جێبەجێ کردنی فەرمانەکان و خۆگرتنەوە لە نەهێلێکراوەکان، ئەو بوونت پێ دەبەخشێت و کردارەکەی دەتبزوێنێت و دەتوەستێنێت و تۆش لە نوغرۆبوون(نوقمبوون)دای لەگەڵ ئەو(سبحانه وتعالی)، هیچ مەقامێکت بۆ جێگیر نابێت تا پێ لەم مەقامە نەنێیت، خودا(عزوجل) رووالەت لە بەندەکەی داوا ناکات، بەڵکو مانا لە بەندەکەی داوا دەکات، ئەوەش بریتییە لە یەکتاپەرستی خودا و ئیخلاص بۆ ئەو(سبحانه وتعالی)، هەروەها سڕینەوەی خۆشەویستی دونیا و دوارۆژ لە دڵدا، بە هەمان شێوە هەرچی شتە لە دڵ کەنارگیر بکات، کاتێك ئەمەی بۆ تێر و تەواو بوو

خودا ئەوی خۆشدەوێت و نزیکی دەکاتەوە و بەرزی دەکاتەوە بەسەر کەسانی تردا، ئەی تاك و تەنها بۆ خۆت تەنهامان بکەرەوە، لە دروستکراوەکان رزگارمان بکە و بۆ خۆت پاڵفتەمان بکە، بانگەشەکانمان بە بەڵگەی فەزڵ و بەزەیی خۆت راستبکەرەوە، دڵمان پاك و بێگەرد بکە و کارەکانمان ئاسان بکە، هۆگریمان بە خۆتەوە بێت و نامۆییمان لەگەڵ کەسان و شتانی تر جگە لە خۆت، هەموو خەم و پەژارەیەکمان بکە بە یەك خەم، ئەوەش بریتییە لە خەم بە تۆوە و نزیکی لە تۆوە لە دونیا و دوارۆژدا:

﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ حَسَنَةٗ وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ٢٠١﴾

البقرة: ٢٠١



# مەجلیسی سی وحەوت

## سەردانی نەخۆش

بەیانی رۆژی هەینی لە مەدرەسەکەی ٥/رەجەب/٥٤٥ھ فەرمووی:

**لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی:** ((سەردانی نەخۆش بکەن و شوێنی جەنازە بکەون چونکە ئەوانە دوارۆژتان بیردەخاتەوە))[1].

مەبەستی پێغەمبەر(ﷺ) بەو کارە ئەوە بووە دوارۆژیان بیربکەوێتەوە، بەڵام ئێوە لە یادی دوارۆژ هەڵدێن، دونیاتان خۆشدەوێت، بەم نزیکانە بەبێ ویستی خۆتان ئێوە لە دونیا دادەبڕێن، ئەوەی ئێوە پێی دڵخۆشن لە دەستتان وەردەگیرێت، بێزاری و ناخۆشی جێگەی ئەو خۆشییەتان دەگرێتەوە، ئەی کەسی بێناگا، ئەی کەسی بێسەروبەر، وەرەوە سەر خۆت، تۆ بۆ دونیا دروستنەکراوی، بەڵکو بۆ دوارۆژ دروستکراوی، ئەی ئەو کەسەی بێناگای لە شتێك کە هەر دەبێت بۆت ببێت، خەم و هەوڵی خۆت بۆ حەز و تام و چێژ و کۆکردنەوەی دونیا و دینار تەرخان کردووە، ئەندامەکانی جەستەت بە گاڵتە و یارییەوە خەریك کردووە، گەر کەسێك دوارۆژ و مردنت یادبخاتەوە دەڵێیت: ژیانی لێ تاڵ کردم و بەم جۆرە و بەو جۆرە سەریادەدەی، ترسێنەر و ئاگادارکەرەوەی مردن رووی لە تۆ کردووە، ئەوەش بریتییە لە پیری(سپێتی) پرچ و ریشت کە تۆ دەیتاشی یان بە رەش بۆیاخی دەکەی، گەر رادەی مردن هات تۆ چی دەکەی؟ گەر فریشتەی گیانکێشان و دارودەستەکەی رووی لە تۆ کرد بە چ شتێك دەیانگێڕییەوە؟ گەر رۆزییەکەت بڕا و ماوەی تەمەنت تەواو بوو پەنا بۆ چ فێڵێك دەبەی؟ ئەم هەوەسبازییە واز لێ بهێنە، دونیا لەسەر کارکردن بیناکراوە، گەر کارت تێدا ئەنجامدا پاداشتت دەدرێتەوە، گەر کار ئەنجام نەدەی

---

[1] رواه احمد وابو يعلى والبزار في مسنده.

هیچت پێ نادرێت، ئەم دونیایە خانەی کارکردن و نارامگرتنە لەسەر ئافەت، ئێرە خانەی ماندووبوونە و دوارۆژیش خانەی پشوو و بەختەوەری، باوەڕدار لە دونیادا نەفسی خۆی ماندوو دەکات بۆیە هیچ گومانێکی تێدا نییە لە دوارۆژدا پشوو دەدات، بەڵام تۆ پشووی خۆت پێشخست و لە تەوبە دواکەوتی و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ و مانگ لە دوای مانگ ساڵ لەدوای ساڵ دواتر دواترت کرد و تەمەنەکەت کۆتایی پێهات، بەم نزیکانە پەشیمان دەبییەوە، چۆن ئامۆژگاریت قبووڵ نەکرد و چۆن بەئاگا نەهاتی و راستت نەکرد، هاوار بە حاڵت، کۆڵەکەی سەقفی ژیانت شکاوە، ئەی کەسی لەخۆبایی دیواری ژیانت داڕماوە، ئەم خانەی تۆی تێدایە وێران دەبێت و لێیەوە دەگوێزرییەوە بۆ خانەیەکی تر، داوای خانەی دوارۆژ بکە و لاقت بۆ ئەوێ بگوێزرەوە، ئەو لاقە کامەیە؟ لاقەکە بریتییە لە کار و کردەوەی چاکە، ئەوەی هەتە پێش خۆتی بخە تاکو کاتی گەڕانەوەت بۆ ئەوێ بەدەستیان بهێنییەوە، ئەی لەخۆبایی بە دونیا و سەرقاڵ بە پڕوپووچەوە، ئەی ئەو کەسەی تیپەکەی(تیپی سوپا) وازلێهێناوە و سەرقاڵی خزمەتکارانە.

**هاوار بە حاڵت**، دوارۆژ لەگەڵ دونیا کۆنابێتەوە، چونکە دونیا رازی نابێت خزمەتی دوارۆژ بکات، دونیا لە دڵ دەربکە دوارۆژ دەبینی چۆن دێت و دڵت داگیر دەکات، گەر تەمەنت بۆ تەواو بوو نزیکی لە خوداوە(عزوجل) بانگت لێ دەکات، ئەوکات دوارۆژیش وازلێبهێنە و خودا داوا بکە، لەو شوێنەدا دروستی دڵ و پاکێتی نهێنی کامڵ دەبن.

ئەی گەنج، گەر دڵت هاتە راستە، خودا و فریشتەکان و خاوەن زانست شایەتیت بۆ دەدەن، بانگکەرێکت بۆ راستدەبێتەوە بانگ دەکات و شایەتیت بۆ دەدات، تۆ ئاتاج نیت بەوەی شایەتی بۆ خۆت بدەی، گەر تەمەنت بۆ تەواو بوو دەبیت بە چیایەك بارەش هەڵیناکەنێت و تیر و نێزە کاری تێناکات و بینینی خەڵکی و تێکەڵی پێیان کاریگەری نابێت و دڵت ناڕوشێنێت و پاکێتی و روونی نهێنیت لێڵ و لیخن نابن.

**خەڵکینە**، واز لە کارێك بهێنن مەبەست پێی رازیکردن و قبووڵ کردنی خەڵك بێت بۆی، ئەو کەسەی بەو جۆرە کار دەکات بەندەیەکی هەڵهاتووە و دوژمنی خودایە(عزوجل)، بێباوەڕە بە نیعمەتەکانی و کەسێکی بێبەشی بێزراوی نەفرەتلێکراوە،

خەلکی دڵ و خێر و ئاینت لێ وەردەگرنەوە، دەتکەن بە هاوەڵدانەر بۆ خودا، دەتکەن بە کەسێك پەروەردگارت لەبیر بکەی، ئەوان تۆیان بۆ خۆیان دەوێت نەك بۆ خۆت، بەڵام حەق(عزوجل) تۆی بۆ خۆت دەوێت نەك بۆ ئەوان، هەوڵی بەدەستهێنانی ئەو کەسە بدە تۆی بۆ خۆت دەوێت و خۆتی پێوە سەرقاڵ بکە، چونکە سەرقاڵ بوون بە ئەوەوە بۆ تۆ باشترە لە خەریکبوون بە کەسێکەوە تۆی بۆ خۆی دەوێت، گەر هەر دەبێت داوایەکت هەبێت ئەوا داوا لە ئەو بکە نەك لە دروستکراوەکانی، چونکە بێزراوترین دروستکراوێك لەلای خودا(سبحانه وتعالى) ئەو کەسەیە داوای دونیا لە دروستکراوەکان دەکات، پەنابگرە بە خودا بۆ لای خودا، ئەو خاوەنی ناوی (الغني-دەوڵەمەند)ە ، هەموو خەلکی هەژار و نەدارن و نە بۆ خۆیان و نە بۆ خەلکانی تر زیان و قازانجیان لەدەستدا نییە، داوای خۆشەویستی پەروەردگارت بکە چونکە ئەو تۆی دەوێت، لە سەرەتاوە تۆ موریدی و ئەو(سبحانه وتعالى) مورادە، لە کۆتاییدا تۆ دەبیت بە موراد و ئەو(سبحانه وتعالى) دەبێت بە مورید، بچووك(منداڵ) لەباری بچووکی خۆیدا داوای دایکی دەکات، کاتێك گەورە بوو دایکی ئەو داوا دەکات، گەر لە ویستدا راستگۆیت لێ ببینێت تۆی دەوێت و داوات دەکات، گەر لە خۆشەویستیدا راستگۆیت لێ ببینێت تۆی خۆشدەوێت و دڵت رێنموونی دەکات و تۆ لە ئەو نزیکدەکاتەوە، چۆن سەرفرازی بەدەست دەهێنیت لە کاتێکدا دەستی نەفس و ئارەزوو و سروشت و شەیتانت لەسەر دوو چاوی دڵت داناوە، ئەو دەستانە کەنارگیر بکە شتەکان وەکو خۆیان دەبینی، نەفست بە تێکۆشان و سەرپێچی لێکردن کەنارگیر بکە، دەستی ئارەزوو و سروشت و شەیتان کەنارگیر بکە خودا دەبینییەوە، ئەم دەستانە کەنارگیر بکە پەردە لە نێوان تۆ و پەروەردگارت لادەدرێت، ئەوکات بە خودا هەرچی شتی ترە جگە لە خودا دەیبینیت، نەفسی خۆت و کەسانی تر دەبینی، ئەنگییەکانی خۆت دەبینییەوە و خۆتیان لێ لادەدەیت، ئەنگی کەسانی تر دەبینی و لێیان هەڵدێیت، گەر ئەمەت بۆ تەواو بوو خودا نزیکت دەکاتەوە و ئەوەی چاو نەیبینیوە و گوێ نەیبیستووە و بە دڵی مرۆڤدا نەهاتووە بە تۆی دەبەخشێت، بیستنی دڵ و نهێنی و بینینی ئەو دوانە تیژ دەکات و راستیان دەکاتەوە و پۆشتەیان دەکاتەوە و پۆشاکی رێز و شکۆیان لەبەر دەکات و ویلایەتی خۆی دەداتە دەست، پاشان سوڵتانی

خۆی و ئەوجا مولکی خۆی لەناو هەموو دروستکراوەکانیدا، ئازادت دەکات، دەتکات بە پاسەوانی دڵت، فریشتەکانی خزمەتت دەکەن، و رۆحی پێغەمبەرانت(علیهم السلام) پێ نیشان دەدات، ئەوکات شاراوەیەك لەناو دروستکراوەکاندا لە تۆ شاراوە نییە.

ئەی گەنج، داوای ئەم مەقامە بکە و ئاواتی بۆ بخوازە و بیکە بە خەم و هەوڵی خۆت و سەرقاڵبوون بە داوای دونیاوە وازلێبهێنەوە، چونکە تێرت ناکات، هەرچی شتی تر جگە لە حەق(عزوجل) ناتوانن تۆ تێر بکەن، بە خوداوە خەریك بە، چونکە تەنها ئەو تێرت دەکات، گەر خودات بەدەستهێنا دەوڵەمەندیی دونیا و دوارۆژ بەدەست دەهێنی، ئەی کەسی بێئاگا، ئەو کەسەی تۆی دەوێت وەڵامی بدەرەوە، ئەو کەسەی داوات دەکات داوای بکە، ئەو کەسەی تۆی خۆشدەوێت خۆشتبوێت، سەرقاڵ بە بۆ لای ئەو کەسەی تامەزرۆیە بۆت، گوێت لەم ئایەتە بووە کە دەفەرموێت: ﴿يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ﴾ المائدة: ٥٤

هەروەها ئەو فەرموودەی کە دەفەرموێت: (من بۆ لیقای ئێوە تامەزرۆترم)، تۆی بۆ عیبادەتی خۆی دروستکردووە بۆیە گاڵتە و یاری مەکە، تۆی بۆ هاوەڵی خۆی دەوێت بۆیە بە کەسانی ترەوە خەریك مەبە، لە خۆشەویستی ئەودا کەسێکی تر مەکە هاوتا و هاوەڵی، گەر جگە لە ئەو کەسێکت خۆشویست وەك سۆز و بەزەیی و لوتف خۆشتبوێت، ئەمە شیاوە، خۆشەویستی بە نەفس دروستە، بەڵام خۆشەویستی بە دڵ دروست نییە، خۆشەویستی نهێنی بەهەمان شێوە دروست نییە، کاتێك ئادەم(علیه السلام) دڵی بە خۆشەویستی بەهەشتەوە سەرقاڵ بوو و مانەوەی تیادا لا خۆشەویست بوو خودا ئەوی لە بەهەشت جیاکردەوە و لە بەهەشت دەریکرد لە رێگەی خواردنی بەری درەختەکەوە، مەیلی دڵی دا بە حەوای هاوسەری خودا لە ئەوی جیاکردەوە، و سێسەد ساڵ ماوەی خستە نێوانیانەوە، ئادەم لە "سر ندیب" بوو حەواش لە "جیدە"، کاتێك یەعقوب(علیه السلام) مەیلی و سرکنایی خۆی لە کورەکەیدا یوسف(علیه السلام) دەبینییەوە و ئەوی بە خۆیدا دەگوشی خودا لەیەکتری دابڕین، پێغەمبەرمان(ﷺ) کاتێك مەیلی بە عائشە دا ئەوەی بەسەرهێنا کە بەسەریهات لە تۆمەت و بوختان، چەندین رۆژ مایەوە و لێی نزیك نەدەکەوتەوە، تەنها بە خوداوە(عزوجل) سەرقاڵ بە و خۆت بە

کەس و شتێکی ترەوە خەریك مەکە، هۆگری هیچ کەس و شتێکی تر مەبە جگە لە خودا، هەموو خەلکی بکە دەرەوەی دڵت، خۆتیان لێ کەنارگیر بکە و لێیان خاڵیببەرەوە، ئەی دەستبەتاڵی تەمبەڵ، ئەی ئەو کەسەی زۆر کەمت لێ قبووڵ دەکرێت گەر لێم قبووڵ بکەی و کار بکەی بەوەی دەیڵێم ئەوا بۆ خۆت کاردەکەی، گەر کاری پێ نەکەی خەشم و رق و بێبەشبوون بەسەر تۆدا دادەبارێت، خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ﴾البقرة: ٢٨٦،

هەروەها دەفەرموێت:

﴿إِنْ أَحْسَنتُمْ أَحْسَنتُمْ لِأَنفُسِكُمْ وَإِنْ أَسَأْتُمْ فَلَهَا﴾الإسراء: ٧

سبەینێ لە بەهەشتدا نەفس دەگات بە پاداشتی کار و کردەوەکان، هەروەها لە ئاگردا دەگات بە سزای کردەوەکانی، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: ((خواردنەکانتان بدەن بە خەلکانی خۆپارێز، پۆشاکەکانتان بدەن بە باوەڕداران))[1].

گەر خواردنەکەت دا بە کەسی خۆپارێز و لە کاروباری دونیایدا کۆمەکیت کرد ئەوا تۆ دەبیت بە هاوبەشی کارەکانی و شتێك لە پاداشتی ئەویش کەم ناکات، چونکە لە مەبەستیدا کۆمەکیت کردووە و باری قورست لەسەر هەلگرتووە و هەنگاوت بۆ لای پەروەردگار خێراتر کردووە، گەر خواردنەکەی خۆت دا بە کەسی دووڕووی ریابازی یاخی لە خودا و لە کاروباری دونیایدا کۆمەکی و یارمەتیت پێشکەش کرد ئەوا دەبیت بە هاوەڵی کارە خراپەکانی و شتێك لە سزاکەی ئەویش کەم ناکات، چونکە لە یاخیبوون لە خودا کۆمەکیت کردووە، بۆیە شەڕەکەی بۆ تۆ دەگەڕێتەوە.

ئەی نەزان فێری زانست ببە، خێر لە عیبادەتێکدا نییە زانستی لەگەڵ نەبێت، خێر لە یەقینێکدا نییە زانستی لەگەڵ نەبێت، زانست فێرببە و کار بکە بە زانست لە دونیا و دوارۆژدا سەرفرازی دەستەبەر دەکەیت، گەر لەسەر بەدەستهێنانی زانست و کارکردن

---

[1] ذكره الحافظ السيوطي في "الجامع الصغير".

به زانست ئارامت نەگرت چۆن سەرکەوتن و سەرفرازی بەدەست دەهێنیت؟! گەر هەموو بوونی خۆت بە زانست بدەی بەشێکت لە زانست پێ دەبەخشرێت.

**بە یەکێك لە زانایان(رەحمەتی خودای لێ بێت) وترا:** ئەم زانستەی لەلاتە بە چی بەدەستت هێنا؟ فەرمووی: بە زوو هەستانی قەلەڕەش و ئارامگرتنی حوشتر و هەڵپەی بەراز و کلکەلەقێی سەگ، بەیانیان زوو دەچووم بۆ دەرگای زانایان وەك چۆن قەلەڕەش بەیانیان زوو دەست بە فڕین دەکات، ئارامم دەگرت لەسەر کۆڵی قورسی ئەوان وەك چۆن حوشتر لەژێر باری قورسدا ئارام دەگرێت، هەڵپە و سووربوونم هەبوو لە داواکردنی زانستدا وەك چۆن بەراز هەڵپە دەکات بۆ خواردن، بە دەوری زانایان و لەبەردەم دەرگاکەیاندا کلکەلەقێم بوو وەك چۆن سەگ بە دەوری خاوەنەکەیدا و لەبەردەم ماڵەکەیدا کلکەلەقێ دەکات تاکو شتێکی پێ بدەن بیخوات.

ئەی ئەو کەسەی داوای زانست دەکەی وتەی ئەم زانایە ببیستە و کاری پێ بکە گەر زانست و سەرفرازیت دەوێت، زانست زیندەگییە و نەزانی مردن، زانای کارکەر بە زانستەکەی، موخلیص لە کارەکانیدا و ئارامگر لەسەر فێرکردنی خەڵکی لەپێناو خودا(سبحانە وتعالی) مردنی بۆ نییە، چونکە کاتێك دەمرێت بە خزمەتی پەروەردگاری خۆی دەگات و ژیانی بەردەوام دەبێت.

**خودایە**، ڕۆزی زانست و ئیخلاص لە زانستدا بە ئێمە ببەخشە.



# گەورەیی "لا إله إلا الله"

بەیانی رۆژی یەکشەممە لە "الرباط" ٧/رەجەب/٥٤٥ھ فەرمووی:

**لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموویی:** ((شەیتانەکانتان بە وتنی **"لا إلـه إلا الله محمد رسول الله"** لاواز و شەکەت و سەرکز بکەن، چونکە شەیتان پێی لاواز و شەکەت و سەرکز دەبێت، وەك چۆن یەکێك لە ئێـوە حوشـترەکەی لاواز و شـەکەت دەکـات بـە زۆری سواربوون و دانانی کۆڵی قورس لەسەر پشتی))[١].

**خەڵکینە** بە ئیخلاص لە وتـنی **"لا إلـه إلا الله محمـد رسـول الله"** شـەیتانەکانتان لاواز و شەکەت و سەرکز بکەن، تەنها بە وتنی، یەکتاپەرستی شـەیتانەکانی ئیـنس و جـن دەسـوتێنێت، چـونکە بـۆ شـەیتانەکان ئـاگرە و بـۆ یەکتاپەرسـتان نـوورە، چۆن دەڵێیت **"لا إله إلا الله"** لە کاتێکدا زۆرێك لە خواوەند لەناو دڵی تۆدایە؟!هەر شـتێك شـانی لەسـەر دابـدەی و متمانـەت پێـی هـەبێت لـەخوار خـوداوە ئـەوە بـتی تۆیـە، یەکتاپەرستی زمان لەگەڵ هاوەڵدانانی دڵ سوودێك بە تۆ ناگەیـەنێت، پـاکێتی قالـب لەگەڵ پیسێتی دڵ سوودێك بە تۆ ناگەیەنێت، کەسی یەکتاپەرست شـەیتانەکەی لاواز و شـەکەت دەکـات، کەسـی هاوەڵدانـەر شـەیتانەکەی ئـەو لاواز و شـەکەت دەکـات، ئیخلاص کرۆکی گوفتار و کردارە، چونکە گەر ئەو دوانە لە ئـیخلاص خـاڵی بـن وەك توێکڵێکی بێ ناوەرۆك وان، توێکڵ تەنها بۆ ئاگر باشـە، قسـەکانم ببیسـتە و کاریـان پێ بکە، چـونکە ئـاگری هەڵپـە و چاوچنۆکیت دەکوژێننـەوە و درك و داڵـی نەفسـت رادەماڵن، لە شوێنێك ئامادە مەبە ئاگری سروشتت هەڵدەگرسێنێت و خانەی ئـاین و باوەڕت وێران دەکات، سروشت و ئارەزوو و شەیتان هەڵدەچن و دەبنە هـۆی تیـابردنی

---

[١] رواه أحمد بلفظ آخر، وأخرجه السيوطي في "الجامع الصغير" وعزاه لأحمد.

ئەوانەی قسەی زرق و برق و زماندرێژییان لەلایە، چونکە سروشت مەیلی بە لای قسەی زرق و برق و هەوەسبازیدا هەیە، وەك هەویرێکی هەڵچووی بێ خوێ سکی بخۆرەکەی ئازار دەدات و ماڵەکەی وێران دەکات، زانست لە زمانی پیاوانەوە وەردەگیرێت نەك لە لاپەڕەکانەوە، لەناو پیاواندا پیاوانی خودا هەن، ئەوان کەسانێکی تەقوادارن، وازیان لە دونیا هێناوە، میراتگر و عاریف و کارکەر و موخلیصن، جگە لە تەقوا هەر شتێکی تر هەوەسبازی و پووچییە، ویلایەت لە دونیا و دوارۆژدا بۆ تەقوادارانە، بناغە و بینا لە دونیا و دوارۆژدا بۆ ئەوانە، خودا(عزوجل) بەندە تەقوادار و چاکەخواز و ئارامگرەکانی خۆشدەوێت، گەر بیر و هەستێکی دروستت هەبوایە ئەوانەت دەناسی و خۆشتدەویستن و هاوەڵیت دەکردن، کاتێك هەست راست و دروست دەردەچێت دڵ بە مەعریفەی خودا(عزوجل) نووورانی بوویێت، لا بەلای هەستی خۆتدا مەکەرەوە تا مەعریفەکەت دێتە راستە و خێر و دروستیت لە ئەوەوە بۆ رۆشن دەبێتەوە، چاوت لە حەرامکراوەکان داخە، نەفست لە حەزەکان بگەرەوە، نەفست لەسەر خواردنی حەڵاڵ رابهێنە، ناوەوەت بە چاودێرکردنی خودایی و دەرەوەت بە شوێنکەوتنی سوننەت پارێزگاری لێ بکە، ئەوکات هەستی راست و دروستت بۆ دێت و مەعریفەت بە خودا راست و دروست دەبێت، من خاوەن ئەقڵ و خاوەن دڵەکان پەروەردە دەکەم، بەڵام خاوەن نەفس و سروشت و عادەتی خراپ رێز و پلە و پایەیان لای من نییە.

ئەی گەنج، فێری زانست ببە و ئیخلاصت هەبێت، تا لە تۆڕ و داو و کۆتوبەندی دووڕوویی رزگارت دەبێت، بۆ خودا داوای زانست بکە نەك بۆ خەڵکی و بۆ دونیا، نیشانەی داوای زانستت بۆ خودا بریتییە لە ترس و لەرزینت لەباری هاتنی فەرمان و نەهیدا، خودا بکە بە چاودێری خۆت و لە نەفسی خۆتدا بۆی زەلیل و گەردنکەچ ببە و تەوازوع بۆ خەڵکی بنوێنە بەبێ ئەوەی ئاتاجییەکت بۆ لای ئەوان هەبێت، چاونەبڕییە ئەوەی لە دەستی ئەواندایە، لەپێناو پەروەردگار هاوەڵی و دۆستایەتی بکە و لەپێناوی ئەودا دوژمنایەتی بکە، چونکە دۆستایەتییەك بۆ خودا نەبێت دوژمنایەتییە،

جێگیربوون و دامەزران بۆ خودا نەبێت تیاچوون و نەمانە، بەخشین بۆ ئەو نەبێت بێبەشییە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((ئیمان دوو نیوەیە، نیوەیەکی ئارامگرتنە و نیوەکەی تری شوکرکردنە))[1].

گەر لەسەر ناخۆشییەکان و مەینەتییەکان ئارام نەگریت و لەسەر خۆشییەکان شوکر نەکەیت تۆ باوەڕدار نیت، حەقیقەتی ئیسلام بریتییە لە خۆڕادەست کردن(الإستسلام)، خودایە، دڵمان لەسەر تەوەکول بە خۆت و گوێڕایەڵی لە خۆت و یادی تۆ و تەبایی لەگەڵت و یەکتاپەرستی بۆ تۆ زیندوو بکەرەوە، گەر پیاوانی پەرشوبڵاوی سەر زەوی ئەم جۆرە زیندەگییە لە دڵیاندا نەبوایە ئێوە تیادەچوون، چونکە حەق(سبحانه وتعالى) بە دوعای ئەوان سزای خۆی لەسەر ئەهلی سەر زەوی لادەبات، وێنەی پێغەمبەرایەتی هەڵگیراوە و ماناکەی تا ڕۆژی دوایی ماوەتەوە، ئەگینا لەسەر چ شتێك لە زەویدا چل کەس لەوان دەمێنێتەوە، هەر کەس مانایەك لە مانای پێغەمبەرایەتی تێدا بێت دڵی وەك دڵی یەکێك لە پێغەمبەرانە، هەیانە جێنشینی خودا و پێغەمبەرانن(علیهم السلام) لە زەویدا، خزمەتکاران لە جێگەی مامۆستایان ڕاست دەکاتەوە، بۆ ئەو مەبەستە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((زانایان میراتگرانی پێغەمبەرانن))[2].

ئەوان لەڕووی پارێزگاری و گوفتار و کردارەوە میراتگرن، چونکە گوفتار بەبێ کردار هیچ نرخێکی نییە، بانگەشەی بێ بەڵگە بەهایەکی بۆ نییە.

ئەی گەنج، بەڵگەی تۆ پابەندبوونە بە کیتاب و سوننەت و کارکردن پێیان و ئیخلاص لە کرداردا، من دەبینم زانایانی ئێوە نەزانن، زاهیدەکانی ئێوە داوای دونیا دەکەن و حەزیان لە دونیایە، پشتیان بە دروستکراو بیستووە و حەقیان(عزوجل) لەبیرکردووە، متمانە بە شتێك جگە لە حەق(سبحانه وتعالى) هۆی بەرکەوتنی نەفرەتە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: ((نەفرەتلێکراوە، نەفرەتلێکراوە ئەو کەسەی متمانەکەی بە دروستکراوێکی وەك خۆیەتی))[3].

---

[1] قال الحافظ العراقي في تخريج احاديث "الإحياء": اخرجه أبو منصور الديلمي في مسنده.

[2] تقدم تخريجه.

[3] لم اجد له اصلا.

هەروەها دەفەرموێت: ((هەر کەس بە دروستکراوێك خۆی بە عیززەت بکات زەلیل دەبێت))[1].

هاوار بە حاڵت، گەر لە دروستکراو بێیە دەرەوە و لەگەڵ دروستکەر بیت ئەوەی لەسەر تۆیە و ئەوەی مافی تۆیە بە تۆ دەناسێنێت، دەتوانی جیاکاری بکەی لە نێوان ئەوەی مافی تۆیە و ئەوەی مافی کەسانی ترە، لەبەردەم دەرگای حەقدا(سبحانه وتعالى) جێگیر و بەردەوام بە و هۆیەکان لە دڵ ببڕە و دەریانبکە، ئەوکات خێری دونیا و دوارۆژ دەبینییەوە، ئەم کارە بەدیناییەت گەر دروستکراو و ریا لەناو دڵی تۆدا بوونیان هەبێت، هەر بەو جۆرە دوارۆژ و هەر شتێکی تر تەنانەت بە ئەندازەی گەردیلەیەك جگە لە حەق(عزوجل) گەر لەناو دڵی تۆدا رەگی داکوتیبێت، گەر ئارام نەگریت ئایینت بۆ نییە، باوەڕەکەت بێ سەر دەبێت، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((ئارامگرتن لە ئیماندا وەك سەر وایە لە جەستەدا))[2].

مانای ئارامگرتن ئەوەیە سکاڵات بۆ لای هیچ کەسێك نەبێت و پەیوەست نەبیت بە هۆیەکەوە و بوونی بەڵات لا ناپەسەند و بێزراو نەبێت، و حەز نەکەی بەڵاکەت تیاچوونی بەسەردا بێت و بسڕێتەوە، گەر بەندە لەباری هەژاری و نەبوونیدا بۆ خودا تەوازوعی نواند و لەسەر هەژارییەکەی لەگەڵ خودا و بە مەبەستی خودا ئارامی گرت و لە سیفەتی موباحدا سەرپێچی نەکرد و خۆی نەگرتەوە، و بە عیبادەت کردن و تێکۆشان رۆشنایی بە تاریکییەوە گرێدا ئەو کەسە خودا بە چاوی بەزەیی تەماشای دەکات و خۆی و خانەوادەی لە جێگەیەکەوە بێنیاز دەکات بە بیریدا نەهاتبێت، خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا ۝ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ﴾ الطلاق: ٢- ٣

تۆ وەك کەڵەشاخگری ئەخۆشی لە کەسانی تر دەردەهێنیت، بەڵام دەردی دژوار لە خۆتدایە و چارەسەری ناکەی، من دەبینم بە رووالەت زانستت زیاد دەکات و لە ناوەوە

---

[1] رواه الطبراني في تفسيره.

[2] رواه الديلمي في "المسند" وذكره الغزالي في "الإحياء".

نەزانیت زۆر دەبێت، لە تەوراتدا نووسراوە: (هەر کەس زانستی زیاد بکات با ئازاری زیاد بکات)، ئەو ئازارە بریتییە لە ترسان لە خودا(عزوجل) و زەلیلی بۆ ئەو و تەوازوع بۆ بەندەکانی، گەر زانستت لا نەبوو فێری ببە، گەر زانست و کردار و ئیخلاص و ئەدەب و گومانی باش بە گەورەپیاوانت لا نەبوو لە کوێ و چۆن شتێك لە تۆ بەرهەم دێت، خەم و پەژارەت بووە بە دونیا و شمەکی دونیایی، بەم نزیکانە تۆ لە دونیا جیادەبییەوە، تۆ لە کوێ و ئەوانە لە کوێ کە خەم و هەوڵیان تەنها یەك شت بوو، لە ناوەوە سەرقاڵی چاودێری کردنی خودایی بوون وەك چۆن لە دەرەوە و ئاشکرایاندا خودایان لەسەر خۆیان کردبوو بە چاودێر، دڵیان پاڵفتە دەکەن وەك چۆن ئەندامەکانی دەرەوەیان پەروەردە دەکەن، کاتێك ئەمەیان بۆ تەواو بوو تەواوی خەمی حەزەکانیان لێ دەبێتەوە و تەنها یەك حەز لە دڵیاندا دەمێنێتەوە، ئەوەش بریتییە لە داواکردن خودا(عزوجل) و نزیکی لە ئەوەوە و خۆشەویستی تەنها بۆ ئەو.

دەگێڕنەوە: (بەنی ئیسرائیلییەکان بەڵا و ناخۆشییەك رووی لێکردن، رۆیشتن بۆ لای یەکێك لە پێغەمبەرەکانیان و وتیان: هەواڵمان پێ بدە چۆن خودا(عزوجل) لە ئێمە رازی دەبێت بۆ ئەوەی شوێنی فەرموودەکەت بکەوین و ببێتە هۆیەك بۆ هەڵگرتن و لادانی ئەم بەڵایە، پێغەمبەرەکە(علیە السلام) داوا و پرسیاری بۆ لای خودا(عزوجل) بەرزکردەوە، خوداش وەحی بۆ رەوانە کرد و پێی فەرموو: پێیان بڵێ: گەر رازیبوونی منتان دەوێت هەژاران و گەدایان رازی بکەن، گەر ئەوان رازیبوون منیش رازی دەبم، گەر ئەوان تووڕە و ناڕازی بن منیش ناڕازی دەبم)، گوێ بگرن ئەی ژێرمەندان، ئێوە تاکو ئێستا هەژاران تووڕە و بێزار دەکەن و دەتانەوێ رازیبوونی خوداش بەدەست بهێنن، بەڵام رازیبوونی ئەو بەدەست ناهێنن، بەڵکو ئێوە لەناو تووڕەیی خودادا دێن و دەچن، لەسەر زبری قسەکانم خۆڕاگر و دامەزراو بن سەرفرازی بەدەست دەهێنن، خۆڕاگری و دامەزران وەك رووەکێك وایە، من بۆ خۆم هەڵنەهاتم لە قسەی گەورەپیاوان و زبری و وشکی مامەڵەیان، بەڵکو وەك کەڕ و لاڵ و کوێر لە خزمەتیاندا بووم، لەوانەوە ئافەت بەسەرمدا دادەباری، بەڵام من بێدەنگ بووم، تۆ لەسەر قسەی ئەوان ئارام ناگریت، لەگەڵ ئەوەش دەتەوێ سەرفرازی بەدەست بهێنی، هەرگیز، تۆ رێز و پلە

و پایەت بۆ نییە، ناتوانی سەرکەوتن و سەرفرازی بەدەست بهێنیت تا تەبا نەبیت لەگەڵ ئەو قەدەرە براوەی بۆ تۆیە و لەسەر تۆیە، هەروەها هاوەڵی گەورەپیاوان بکەی لەگەڵ سرینەوەی تۆمەت لە بەش و چارەنووسی خۆتدا، شوێنیان بکەوی و لە هەموو حاڵ و بارێکدا لەگەڵیان تەبا بیت، ئەوکات سەرفرازی دونیا و وارۆژ بەدەست دەهێنی، ئەوەی من دەیڵێم لێی حاڵی بێ و کاری پێ بکەن، تێگەیشتن بەبێ کارکردن هیچ نرخێکی نییە، کارکردن بەبێ ئیخلاص چاوتێبڕینێکی پووچ و خاڵییە، یەك بە یەکی پیتەکانی "طمع-چاوتێبڕین" پووچ و بەتاڵ و بێ ناوەرۆکە، خەڵکی رەشۆکی پارەی تەزویری تۆ ناناسێتەوە، تەنها ئاڵوگۆڕکەری پارە(صراف) ئەو سکەیە دەناسێتەوە و خەڵکی رەشۆکی فێر دەکات بۆ ئەوەی خۆیان لە تۆ بەدوور بگرن، گەر لەگەڵ خودا(عزوجل) ئارامت بگرتبایە شتی سەیروسەمەرەت لە لوتفی ئەو دەبینی، کاتێك یوسف(علیه السلام) ئارامی گرت لەسەر گرتن و بردن و کۆیلایەتی و بەندکردن و زەلیلی و تەبابوون لەگەڵ پەروەردگار(عزوجل) گەورەیی و شکۆمەندییەکەی دەرکەوت و بوو بە مەلیك، لە زەلیلییەوە گوازرایەوە بۆ عیززەت، لە مردنەوە بۆ ژیان، تۆش بەهەمان شێوە گەر شوێنی شەرع بکەویت و لەگەڵ خودا(عزوجل) ئارام بگریت و لێی بترسییت و رجات لای ئەو بێت و سەرپێچی لە نەفس و ئارەزوو و شەیتان بکەیت لەو دۆخەی تۆی تێدای دەگوێزرێیتەوە بۆ دۆخێکی تر، لەو شوێنەی لات بێزراو و ناپەسەندە دەگوێزرێیتەوە بۆ ئەو شوێنەی لات پەسەند و خۆشەویستە، تێبکۆشە و کۆشان بکە، شتەکان بە تۆوە نایەن، بەڵام هەر دەبێت بکۆشیت و هەوڵ بدەی، تێبکۆشە و خێر رووت لێ دەکات، هەر کەس داوا بکات دەبینێتەوە، لە خواردنی حەڵاڵدا بکۆشە، چونکە ئەوە دڵت نووورانی دەکات و لە تاریکستان دەریدەهێنێت، باشترین ژیری ئەو ژیرییەیە نیعمەتەکانی خودات(عزوجل) پێ دەناسێنێت و لە شوکری خۆیدا راوەستاو و دامەزراوت دەکات و لەسەر دانانان بە نیعمەتەکانیدا و زۆری نیعمەتەکانی کۆمەکیت دەکات.

ئەی گەنج، هەر کەس بە چاوی یەقین بزانێت خودا(عزوجل) هەموو شتەکانی دابەش کردووە و براوەتەوە ئەوا وەك شەرم و حەیا لە خودا هیچ شتێکی لێ داوا

ناکات، خۆی سەرقاڵ دەکات بە یادی ئەوەوە و لە داواکردن بێئاگا دەبێت، داوای ئەوە ناکات بەشەکەی بۆ پێش بخرێت یان بەشی کەسێکی تری پێ بدرێت، ئاکاری بریتییە لە خامۆشی و بێدەنگی و ئەدەبی جوان و وازهێنان لە بەرهەڵستکاری، لە کەم و زۆردا سکاڵا نابات بۆ لای دروستکراوەکان، سوالکردن لە خەلکی بە دڵ وەك سوالکردن وایە بە زمان، لەلای من لەڕووی راستییەوە هیچ جیاوازییەکیان نییە.

**هاوار بە حاڵت**، تۆ شەرم ناکەی لە کەسانێکی تر جگە لە خودا داوا دەکەی، لە کاتێکدا خودا لە کەسانی تر لە تۆ نزیکترە، داوا لە خەلکی دەکەی کە هیچ پێویستییەکت بەوان نییە، لەگەڵ تۆ گەنجینەیەکی شاراوە بوونی هەیە کەچی بۆ دەنکێك یان بۆ گەردیلەیەك لەگەڵ هەزاران شانشانێن دەکەی، کاتێك مردی رسوا و شەرمەزار دەبیت، نەنگییەکان و شاراوەکانت دەردەکەون و نەفرەت بەهۆی گوناهەکانەوە بەسەر تۆدا دادەبارێت، گەر کەسێکی ژیر بیت گەردیلەیەك لە ئیمانت بەدەست دەهێنا و بەو ئیمانەوە بە خودا(عزوجل) دەگەیشتیت، هاوەڵی صالحانت دەکرد و لێیانەوە بە گوفتار و کرداریان ئەدەب فێردەبوویت، تا ئیمانەکەت گەشە و نەشونمای دەکرد و پاشان یەقینەکەت تێروتەواو دەبوو ئەوکات خودا بە ئیلهام کردنی دڵت تۆی بۆ خۆی پاڵفتە دەکرد و خۆی سەرپەرشتی ئەدەبدادان و فەرمان پێکردن و نەهیلێکردنی تۆی دەکرد، ئەی ئەو کەسەی بوویت بە بەندەی بتی ریا لە دونیا و دوارۆژدا بۆنی نزیکی لە خوداوە(عزوجل) ناکەی، ئەی ئەو کەسەی بە هۆی دروستکراوەوە بوویت بە هاوەڵدانەر و بە دڵ روویان لێ دەکەی، پشتیان لێ بکە، چونکە زیان و قازانج و پێدان و گرتنەوە لە ئەوانەوە نییە، بانگەشەی یەکتاپەرستی خودا مەکە لەگەڵ هاوەڵدانانی پەیوەست بە دڵتەوە، چونکە لەو کارەوە شتێکت بەردەست ناکەوێت.



# مەجلیسی سی و نۆ

## خۆشەویستی ئەولیا و صالحان

بەیانی رۆژی هەینی لە "الرباط" ١٢/رەجەب/٥٤٥هـ فەرمووی:

گەر مولکی دونیا و دوارۆژت دەوێ ئەوا مولکی خودا بگێڕەوە بۆ خودا(عزوجل)، ئەوکات تۆ دەبییە ئەمیر و سەرۆك بەسەر نەفسی خۆت و کەسانی تردا، من ئامۆژگاری تۆم کرد و ئامۆژگاریەکەم قبوولْ بکە، من تۆم بەڕاست زانی تۆش من بەڕاست بزانە، گەر من درۆ بکەم و تۆش درۆ بکەی من بەدرۆ دەخرێمەوە و تۆش بەدرۆ دەخرێیەوە، گەر من راستبکەم و تۆش راست بکەی من قسەکانم بەڕاست وەردەگیرێت و بۆ تۆش بە هەمان شێوە ((وەك چۆن قەرز دەکەی قەرزت لێ داوا دەکرێتەوە))، لە منەوە دەرمان و دەوا بۆ نەخۆشی دینەکەت وەربگرە و بەکاریبهێنە چارەسەر و شیفا رووت لێ دەکات، ئەوانەی پێشوو رۆژهەلاّت و رۆژئاوا دەگەڕان بۆ بینینەوەی دۆستانی خودا و صالحان، ئەوانەی پزیشکی دڵ و دین بوون، گەر یەکێك لەوانەیان ببینیبایەتەوە داوای دەرمانیان بۆ دینەکەیان لێ دەکرد، بەلاّم ئەمڕۆ ئێوە ئەقیهان و زانایان و ئەولیاتان لا بێزراون، ئەوانەی ئەدەبی خەلکی دادەدەن و مامۆستا و فێرکەری صەردوومانن لاتان ناپەسەندن، بۆیە گومانی تێدا نییە دەرمانتان بەرچنگ ناکەوێت، زانست و پزیشکیی من چ سوودێك بە تۆ دەگەیەنێت هەموو رۆژێك بینایەك بۆ تۆ دروست دەکەم و تۆ دەیروخێنی، دەوا و دەرمانت بۆ دەنووسم و بەکاریناهێنیت، پێت دەلێم: ئەم پاروووە مەخۆ ژەهری تێدایە، ئەم پاروووە بخۆ دەوا و چارەسەری تێدایە، بەلاّم تۆ سەرپێچیم لێ دەکەی و ئەو پاروووە دەخۆی ژەهرەکەی تێدایە، بەم نزیکانە کاریگەری ئەو ژەهرە لە بونیادی دین و ئیمانی تۆدا دەردەکەوێت، من ئامۆژگاریت دەکەم و لە شمشێرەکەت ناترسم و

زێڕ و زیوەکەی تۆم ناوێت، هەر کەس لەگەڵ خودا بێت بەگشتی لە هیچ کەس ناترسێت، نە لە جین و نە لە مرۆڤ و نە لە مێرووی زەوی و دڕندەکانی و شەوگەڕەکانی، هەر بەو جۆرە لە هیچ جۆرە دروستکراوێك ناترسێت، گاڵتە بەو گەورەپیاوانە مەکەن کە زانان و بە زانستەکەیان کار دەکەن، ئێوە نەزانن بە خودا و پێغەمبەران و صاڵحان لەو بەندانەی لەگەڵ خودا راوەستاون و رازین بە کردارەکانی، هەرچی سەلامەتییە لە رازیبووندایە بە قەزای خودایی و کورتی هیوا و ئاوات و زوهد لە دونیا، گەر لە نەفسی خۆتان لاوازییەکتان بینی بیر لە مردن بکەنەوە و هیوا و ئاواتتان کورتبکەنەوە.

پێغەمبەر(ﷺ) لە خوداوە(عزوجل) دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: ((باشترین شتێك نزیکان لە من پێی نزیك ببنەوە ئەنجامدانی ئەو فەرزانەیە لەسەرم داناون، بەردەوام بەندەکەم بە نەوافل لێم نزیك دەبێتەوە تا خۆشمدەوێت، گەر خۆشمویست دەبم بە بیستن و بینین و دەست و پاڵپشتکەری، بە من دەبیستێ و بە من دەبینێ و بە من دەست دەوەشێنێت)) [1].

ئەو بەندەیە هەموو کردارەکانی بە خوداوە دەبینێت و بە خوداوە لە هەوڵ و هێز و بینینی نەفسی خۆی و خەڵکی دێتە دەرەوە، جوڵە و هەوڵ و هێزی بە خوداوە(عزوجل) دەبێت، نەك بە خۆی و دروستکراوەکانی ترەوە، وەك گوێڕایەڵی بۆ خودا خۆی لە نەفس و دونیا و دوارۆژ کەنارگیر دەکات، گومانی تێدا نییە گوێڕایەڵییەکەی نزیکی دەکاتەوە و دەبێتە هۆیەك بۆ ئەوەی خودا(عزوجل) ئەوی خۆشبوێت، بە گوێڕایەڵی کردن خودا خۆشیدەوێت و نزیکی دەکاتەوە، بە گوناه کردن و یاخیبوونیش خەشمی لێ دەگیرێت و دووردەخرێتەوە، بە گوێڕایەڵی هۆگری بە خوداوە بەدەست دێت و بە یاخیبوون نامۆبوون سەرهەڵدەدات، چونکە هەر کەس خراپە بکات نامۆبووە لە خودا، بە شوێنکەوتنی شەرع هەموو خێرێك بەدەست دێت و بە سەرپێچی لە شەرع شەڕ و خراپە دێنە ئاراوە، هەر کەس لە هەموو کارو بارەکانیدا شەرع هاوەڵی نەبێت ئەوە لەگەڵ تیاچووان تیاچووە، کاریکە و تێبکۆشە و

[1] رواه البخاري وابن حبان وابن ماجة.

شان لەسەر کردار دامەدە، چونکە ئەو کەسەی واز لە کارکردن دێنێت تەنها چاوتێبڕینە و ئەو کەسەش شانی لەسەر کردار داداوە خۆپەسەند و لەخۆباییە، دەستەیەك لە نێوان دونیا و دوارۆژدا راوەستاون، دەستەیەك لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا راوەستاون، دەستەیەکیش لە نێوان دروستکراو و دروستکەردا راوەستاون، گەر تۆ کەسێکی زاهید بیت ئەوا لە نێوان دونیا و دوارۆژدا راوەستاوی، گەر لەوانە بیت لە خودا دەترسیت لە نێوان بەهەشت و دوارۆژدا راوەستاوی، گەر کەسێکی عاریف بیت لە نێوان دروستکراو و دروستکەردا راوەستاوی، جارێك تەماشای دروستکراو دەکەی و جارێکیش تەماشای دروستکەر، خەڵکی ئاگاداردەکەیەوە و باسی دوارۆژ و دادگاییان بۆ دەکەی، هەر بەو جۆرە باسی ئەوەی لەناو دوارۆژدایە، بەڵکو هەواڵ لەوە دەدەی موشاهەدەت کردووە و بینیوتە، هەواڵ وەك بینین نییە، خوداناسان چاوەڕوانی لیقای خودان(عزوجل) و هەموو کاتێك ئاواتی بۆ دەخوازن، لە مردن ناترسن، چونکە هۆیەکە بۆ لیقای خۆشەویستەکەیان، جیاببەرەوە بەر لەوەی لێت جیاببنەوە، ماڵئاوایی بکە بەر لەوەی ماڵئاوایت لێ بکرێت، کۆچ بکە بەر لەوەی خانەوادە و هەموو خەڵکی کۆچت لێ بکەن، ئەوان سوودێك بە تۆ ناگەیەنن گەر رۆیشتییە ناو گۆڕاوە، تەوبە بکە لە دەستبردن بۆ موباح بە ئارەزووەوە.

**خەڵکینە**، لە هەموو حاڵ و بارێکدا خاوەنی وەرع بن، وەرع پۆشاکی ئایینە، داوای پۆشاك لە من بکەن بۆ ئایینەکەتان، شوێنی من بکەون من لەسەر راستەشەقامی پێغەمبەرم(ﷺ)، من لە خواردن و خواردنەوە و هاوسەریکردن و هەموو حاڵەکانی ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی پێ دەدات شوێنکەوتەی ئەوم، من بەردەوام بەو جۆرە دەبم تا دەگەم بە ویستی خودا(عزوجل) لە خۆمدا، بۆیە من لەسەر ئەوە دەمێنمەوە و تەنها بێ لە حەمدی خودا دەکەمەوە، گوێ بە مەدح و زەم و پێدان و گرتنەوە و خێر و شەڕ و رووتێکردن و پشتتێکردنی تۆش نادەم، تۆ نەزانی و نابێ لا بەلای نەزانندا بکرێتەوە، گەر سەرفراز بوویت و خودات پەرست عیبادەتەکەت بەڕوودا دەدەنەوە، چونکە عیبادەتێکە هارتای نەزانییە، نەزانیش هەموو بوونی بریتییە لە تێکچوون.

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((هەر کەس بە نەزانی خودا بپەرستێت تێکدانی زۆرترە لە چاککردنی))[1].

گەر شوێنی کیتاب و سوننەت نەکەویت سەرکەوتنت بۆ نییە.

**لە یەکێك لە خوداناسانەوە(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەفەرموێت:** هەر کەس شێخێکی نەبێت ئیبلیس دەبێت بە شێخی، شوێنی شێخێکی زانا بە کیتاب و سوننەت بکەوە، زانایەك کار بە کیتاب و سوننەت بکات، یان با گومانی باشت بە زانایان هەبێت و لێیانەوە فێر ببە و ئەدەبی باشت لە خزمەتیاندا هەبێت، بە جوانی هەڵسوکەوت لەبەردەستیان بکە سەرفرازی بەدەست دەهێنی، گەر شوێنی کیتاب و سوننەت و گەورە عاریفان بە کیتاب و سوننەت نەکەویت هەرگیز سەرفرازی بەدەست ناهێنی، گوێت لەو قسەیە بووە کە دەڵێت: هەر کەس بە بۆچوونی خۆی بێنیاز بوو لە خەڵکی گومڕابووە، نەفسی خۆت بە هاوەڵی کردنی کەسانی لە خۆت زاناتر پەروەردە بکە، سەرقاڵی چاککردنی نەفست بە پاشان روو لە نەفسی کەسانی تر بکە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((بە نەفسی خۆت دەست پێ بکە پاشان بەوانەی بەخێویان دەکەی))[2].

هەروەها دەفەرموێت: ((صەدەقە بۆ کەسێك نییە کەسێکی نزیکی ئاتاج بێت))[3].



---

[1] قال العجلوني في "كشف الخفاء": قيل: هو من كلام ضرار ابن الأزور الصحابي رضي الله عنه.

[2] رواه مسلم وفي الصحيحين "وابدأ بمن تعول".

[3] رواه الطبراني في "الأوسط" والديلمي في "المسند" والمنذري في "الترغيب".

## مەجلیسی چلهەم

# تێگەیشتن لە ئایین

بەیانی ڕۆژی یەکشەممە لە "الرباط" ١٤/ڕەجەب/٥٤٥ھ فەرمووی:

لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) ((گەر خودا خێری بۆ بەندەکەی ویست لە دیندا شارەزای دەکات و نەنگییەکانی نەفسی خۆی پێ دەناسێنێت))[1].

شارەزایی لە دین هۆیەکە بۆ ناسینی نەفسی خۆ، هەر کەس پەروەردگاری ناسی هەموو شتەکانی تر دەناسێت، بەو شارەزاییە بەندایەتی ڕاست و دروست دەبێت و لە بەندایەتی کەسانی تر و شتانی تر ڕزگاری دەبێت، سەرفرازی و قوتاربوون بۆ تۆ نییە تا خودا بەسەر هەموو شتەکانی تردا پێشنەخەی، دینەکەت بەسەر حەزدا پێشبخەی، دواڕۆژت بەسەر دونیادا پێشبخەی، دروستکەرەکەت بەسەر دروستکراودا پێشبخەی، تیاچوونی تۆ لە پێشخستنی حەزدا بەسەر دینەکەتدا، لە پێشخستنی دونیاکەتدایە بەسەر دواڕۆژدا، لە پێشخستنی دروستکراودا بەسەر دروستکەردا، بەم شێوازە کار بکە پێیەوە ڕزگار دەبیت، تۆ لە حەق(عزوجل) بێبەش بوویت و وەڵامت نادرێتەوە، وەڵامدانەوەی ئەو دوای وەڵامدانەوەی تۆ دێت بۆ بانگی خودا، گەر بە کردار وەڵامتدایەوە لە کاتی داواکردندا وەڵامت دەداتەوە، بوونی کشتوکاڵ لەدوای چاندنە، بچێنە تا دروێنە بکەی، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((دونیا کێڵگەی دواڕۆژە))[2].

کشتوکاڵی ئەم چاندنە لە دڵ و جەستەدا بریتییە لە ئیمان، کێڵان و هەڵگرتنی جۆگەی ئاو بۆی و ئاودانی بە کار و کردەوەی چاکە دەبێت، گەر ئەم دڵە نەرمی و سۆز

---

[1] قال مخرج "الإحياء" العراقي: اخرجه الديلمي في المسند.

[2] ذكره الغزالي في "الإحياء".

و بەزەیی تێدا بوو تۆوی ئیمانی تێدا دەڕوێت، گەر رەق و وشك و بێفەڕ بوو، زەوییەکە کرێن بوو -زەوی کرێنیش هیچی تێدا سەوز نابێت- ئەوا هیچ بەرهەمێك نادات بەدەستەوە، گەر لە لوتکەی چیایەك کشتوکاڵت کرد هیچی لێ سەوز نابێت و لە تیاچوونەوە نزیکترە تا رووان، ئەم کشتوکاڵە لە کشتیارانەوە فێرببە و شوێنی را و بۆچوونی خۆت مەکەوە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:

((لەسەر هەموو پیشەیەك کۆمەکی وەربگرن لە پیشەوەرانی باش))[1].

تۆ سەرقاڵی بە کشتوکاڵی دونیاوە نەك بە کشتوکاڵی دوارۆژەوە، ئەوەت زانیوە ئەو کەسەی بەدوای دونیادا رادەکات لە دوارۆژدا سەرفرازی بەدەست ناهێنێت و خودا(عزوجل) نابینێت؟ گەر دوارۆژت دەوێت واز لە دونیا بهێنە، گەر خودات(عزوجل) دەوێت وازبهێنە لە حەز و بەش و دروستکراو و ئەوەی بەدەستت هێناوە، گەر ئەمەت بۆ راست و دروست بوو دونیا و دوارۆژ و بەش و دروستکراو یەك بەدوای یەکدا -گەردنکەچانە- رووت لێ دەکەن، چونکە ئەسڵەکەت لەلایە و هەموو لقەکان شوێنی ئەو ئەسڵە دەکەون، کەسێکی ژیرمەند بە، تۆ ئیمانت نییە، تۆ ژیریت نییە، تۆ جیاکردنەوەت نییە، تۆ لەگەڵ دروستکراوەکان راوەستاوی، تۆ بە دروستکراوەکان هاوەڵت بۆ خودا داناوە، تۆ لە لێواری تیاچووندای گەر تەوبە نەکەی، لەسەر رێگەی خوداناسان مەوەستە و کەنارگیر بە، خۆت لە دەروازەی خوداناسان بەدووربگرە، تەنها بە نییەتی بێ دڵ شانشانێنیان لەگەڵ مەکە، بە دوورڕوویی و بانگەشە و هەوەسبازی شانشانێنیان لەگەڵ مەکە، بە دڵ و نهێنی، بە شانی تەوەکول و نارامگرتن لەسەر ئافەت و رازیبوون بە بەشی خۆ دەتوانی شانشانێن لەگەڵ ئەوان بکەی.

ئەی گەنج، خۆت بخە بەر دەستی خودا(عزوجل) ئافەتیش بەسەر تۆدا دادەبارێت، تۆ لەسەر پێی خۆشەویستی ئەو راوەستاوبە و مەگۆڕێ، بارەش و بۆران تۆ ئەسڕنەوە و رمەکان تۆ داغان نەکەن، لە ناوەوە و دەرەوە کەسێکی دامەزراوبە، لە مەقامێکدا راوەستاوبە کە دروستکراو و دونیا و دوارۆژی تێدا نەبێت، نە ماف و نە بەش و نە ئازار

---

[1] ذكره السيوطي في "الدرر" وتفرد بإخراجه.

و نە چۆن و نە هەر شتێکی تر جگە لـە خـودای تێدا نـەبێت، بینـینی دروسـتکراو و سەرقاڵی بە خانەوادەوە لێڵت نەکەن، بە زۆری و کـەمی و مـەدح و زەمـی خـەلکی و رووتێکردن و پشتێکردنیان گۆڕانت بەسەردا نەیەت، لە پشتی ژنەوراوەکانەوە لە ئینس و جن و فریشتە و دروستکراوەکانەوە لەگەڵ خودا بە، چـەند جـوانی فـەرمووە یـەکێك لەوان کە دەڵێت: گەر راستگۆی باشە، ئەگینا شوێنمان مەکەوە، ئارامگرتن و ئیخلاص و صدق بنچینەن بۆ ئەوەی بۆ تۆم باسکرد، تۆ دەتەوێ من لەگەڵ پیاوێکی دووڕوو بم و قسەی نەرمت لەگەڵ بکەم، نەفست پێی خۆشبێت و خۆی لا پەسەند بێت و وا گومان ببات لەسەر راستییەك وەستاوە، نەخێر، نەفست هیچ رێز و پلە و پایەیەکی نییە، من ئاگرم تەنها "سمندل"[1] دەتوانێت لەناو ئاگردا هێلکە بکات و هەڵیان بهێنێت و لەناویدا دابنیشێت، هەوڵبدە ببیت بە "سمندل" لەناو ئاگری ئافەت و تێکۆشـان و مـەینـەتی و ئارامگرتن لەسەر چەکوشی قەزا و قەدەر دابنیشی تا لە هاوەڵی کردنی من و بیستنی قسە زبرەکانم و کارکردن پێیان لە دەرەوە و لە ناوەوە و لـە پـەنهان و ئاشـکرادا ئـارام بگریت، یەکەمجار لە تەنهاییدا و دووەمجار لە دەرکەوتن و ئاشکرادا و سێیەمجار لە بوونی خۆتدا، گەر ئەمەت بۆ راست و دروست بوو سەرکەوتنی دونیا و دوارۆژ بـە ویـستی و بڕیاری خودا(عزوجل) رووت لێ دەکات، من لە شتێکدا کـە بەشـی خودایـە(عزوجل) سۆزداری بۆ هیچ کەسێك ناکەم، لە مافی خودا ئەوەیە لە هیچ شتێکدا -بەبێ فەرمانی ئـەو- لانەکـەمـەوە بـەلای هـیچ کەسـێکدا، بـەلکو لـە وەرگرتنـەوەی مافەکـەیـدا لـە دروستکراوەکان هێز و کۆمەکی لە ئەو(سبحانه وتعالى) وەربگرم و لاوازی نەنوێنم و لەگەڵ نەفسی خۆم بەهێز بم و لەناو ئەواندا لەگەڵ خودا تەبابم.

لە یەکێك لە خوداناسانەوە(رەحمەتی خودای لێ بێت) فەرمووی: لەناو خەلکیـدا لەگەڵ خودا تەبا بە، نەك لە خودادا لەگەڵ خەلکی تەبابیت، ئەوەی دەشکێت(شکـست دەخـوات) بـا بشـکێت و ئـەوەی چاکدەبێتەوە(سـەرکەوتن بەدەسـت دەهێنێـت) بـا چاکببێتەوە، بۆچی گوێ بەوە بدەم لە کاتێکدا تۆ لە خودا(عزوجل) باخیبووی و گاڵتە

[1] وا باوە باڵندەیەك بێت لە هندستان بە ئاگر نەسوتێ(معجم المعاني).

بە فەرمانەکان و نەهییەکانی دەکەی، لە قەزا و قەدەریدا کێبەرکێی لەگەڵ دەکەی، شەو و ڕۆژ دەستدرێژی دەکەیە سەر، بۆیە تۆ بێزراو و خەشمڵێگیراو و نەفرەتلێکراوی.

لە هەندێ فەرموودەیدا خودا(عزوجل) فەرموویەتی: (گەر گوێڕایەڵ بوویت رازی دەبم، گەر رازی بووم بەرەکەتدارت دەکەم و سنوورێك بۆ بەرەکەتم نییە، گەر یاخی بوویت توورە دەبم، گەر توورەبووم نەفرەت دەکەم و نەفرەتەکەم تا منداڵی حەوتەم دەڕوات)، ئەم سەردەمە سەردەمی فرۆشتنی دینە بە تین(هەنجیر)، سەردەمی هیوا و ئاواتی دووردرێژ و هەڵپەی زۆر و بەهێزە، هەوڵبدە یەکێك مەبە لەوانەی قورئان دەربارەیان دەفەرموێت:

﴿ وَقَدِمْنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُوا۟ مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَٰهُ هَبَآءً مَّنثُورًا ﴿٢٣﴾ ﴾ الفرقان: ٢٣

هەر کار و کردەوەیەك خودا تیایدا بەمەبەست نەگیرێت بریتییە لە تۆزی بەر با.

**هاوار بە حاڵت**، گەر حاڵ و بارت لە خەڵکی رەشۆکی شاراوە بێت لە تایبەتمەندان شاراوە نییە، رووی تەزویرکراوی زرق و برقت لەلای خەڵکی رەشۆکی شاراوەیە، بەڵام لەلای ئەوانەی پارە ئاڵوگۆڕ دەکەن سکەی راستەقینەی تۆ ئاشکرایە، ئەزان لێی شاراوەیە، زانا نەخێر، کار بکە و لە کارەکەتدا خاوەنی ئیخلاص بە، بە خوداوە سەرقاڵ بە و هەر شتێکی تر پەیوەندی بە تۆوە نییە وەلابنێ و خۆتی پێوە سەرقاڵ مەکە، خەریکی نەفسی خۆت بە تا زاڵ دەبیت بەسەریدا و ملکەچی دەکەی و یەخسیری دەکەی و دەیکەیت بە وڵاخی سواری خۆت و سارای دونیای پێ دەبڕیت، گەر ئەوەندە بەهێز بووی کەسێکی تر لە پاشکۆی خۆت دابنێی و لە دونیا دەریبهێنیت و بیبەیت بۆ لای مەولا(عزوجل) و پێشکەش بەوی بکەی و پارووی حیکمەتی دەرخوارد بدەی ئەوا کارێکی گەورەت ئەنجامداوە، لە قسەکردندا راستگۆ بە، تەئویل مەکە، چونکە کەسی تەئویلکەر دەستدرێژکارە، لە خەڵکی مەترسە و رجات لەلای ئەوان نەبێت، چونکە ئەوە لە کزی و لاوازی باوەڕەوەیە، هەوڵ و لێبڕانت زیاد بکە بۆ لای خودا بەرز دەبییەوە.

تێبکۆشە و خۆت بدە بەر رەحمەتی خودا و داوای لێ بکە و بزانە هەر شتێك بەشی تۆ بێت دەبێت روو لە تۆ بکات، هەوڵبدە کاری چاکە بەدەست بهێنیت وەك چۆن هەوڵی

بەدەستهێنانی رۆزی دەدەی، شەیتان یاری بە خەڵکی رەشۆکی دەکات وەك چۆن شۆڕەسوار یاری بە گۆی هونەر دەکات، بەڕێوەیان دەبات وەك چۆن یەکێك لە ئێوە وڵاخەکەی بەڕێوە دەبات، دەدات لە پشتەملی دڵیان و چۆنی بوێت بەکاریان دەهێنێت و لە خەڵوەتگا و میحراب وەدەریان دەنێت و لە خزمەتی خۆیدا رایاندەوەستێنێت و نەفسیش لەو کارەدا یارمەتی شەیتان دەدات و هۆکارەکانی بۆ دەڕەخسێنێت.

ئەی گەنج، بە قەمچی برسێتی و خۆگرتنەوە لە حەزەکان و تام و چێژەکان و تورەهات لە نەفسی خۆت بدە، بە قەمچی ترس و چاودێری خودایی لە دڵی خۆت بدە، داوای لێخۆشبوون(الإستغفار) بکە بە نەرێتی دڵ و نهێنیت، چونکە بۆ هەریەکێك لەو دوانە(نەفس و دڵ) گوناهێکی تایبەت بوونی هەیە، لە هەموو حاڵ و بارێکدا بە تەبایی و شوێنکەوتن پابەندیان بکە.

ئەی ئەو کەسەی پەیڕەنت زۆر کەمە، گەر ناتوانی بەرپەرچی قەدەر بدەیەوە و گۆڕانی بەسەردا بهێنی و بیسڕییەوە و سەرپێچی لێ بکەی ئەوا تەنها ئەوەت بوێت خودا دەیەوێت، گەر تەنها ئەوانەت بۆ دێنێت خودا ویستوویەتی ئەوا تەنها ئەوەت بوێت خودا دەیەوێت، چونکە تەنها ئەوانە رووت لێ دەکات خودا دەیەوێت، گەر خودا شتێکی نەوێت نایەتە دی بۆیە نەفس و دڵ و نهێنیت تیایدا ماندوو مەکە، هەموو شتێك رادەستی پەروەردگار(عزوجل) بکە، بە دەستی تەوبەکردن و گەڕانەوە بۆ لای خودا دەست بە پەتی بەزەیی خوداوە بگرە، گەر لەسەر ئەمە بەردەوام بوویت دونیا لەبەر چاوی دڵ و چاوی سەرت دەسڕێتەوە و موسیبەتەکانی لەلات ئاسان دەبن و حەزەکان و چێژەکان وازلێدەهێنن و لە گەستن و پێوەدانی دونیا سکاڵا ناکەیت، نەفست لەگەڵ ئازاری بەڵادا وەك ئاسیەی خێزانی فیرعەونی لێ دێت(خودا لێی رازی بێت)، کاتێك دەرکەوت ئیمانی بە خودا(عزوجل) هێناوە، فەرمانکرا کوت و زنجیری ئاسنین بکرێتە دەست و قاچ و گەردنی و بە قەمچی لێدان سزا بدرێت، ئەویش سەری بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و دەرگاکانی بەهەشتی بە کراوەیی بینی و تەماشای کرد فریشتەکانماڵێکی تێدا دروست دەکەن، فریشتەی گیانکێشان هات بۆ ئەوەی گیانی بکێشێت و پێی وت: ئەو خانووە بۆ تۆیە، ئەویش پێکەنی و ئازاری سزادانەکەی نەما

و وتی: ﴿رَبِّ ٱبۡنِ لِي عِندَكَ بَيۡتٗا فِي ٱلۡجَنَّةِ﴾ التحريم: ١١

تۆش بەم جۆرەت لێ دێت، چونکە بە چاوی دڵ و یەقینت تەماشای شتەکان دەکەی، بۆیە ئارام دەگریت لەسەر بەلاّ و ئافەت، لە هەوڵ و هێزی خۆت دێیە دەرەوە، وەرناگریت و نابەخشی و نابزوێیت و ناوەستی مەگەر بە هەوڵ و هێزی خوداوە(سبحانه وتعالى)، لەبەردەستی خودادا فانی دەبیت، کاروباری خۆتی رادەست دەکەی، لە خۆت و خەڵکیدا لەگەڵ خودا تەبا دەبیت، لەگەڵ تەگبیری ئەو تەگبیرت نییە، لەگەڵ بڕیاری ئەو بڕیارت نییە، لەگەڵ هەڵبژاردنی ئەو هەڵبژاردنت بۆ نییە، هەر کەس ئەم حاڵەی ناسی داوا لە هیچ کەسێکی تر ناکات جگە لە ئەو، هیچ ئاواتێکی تری نییە جگە لە ئەو، چۆن کەسی ژیرمەند ئاوات بۆ ئەم حاڵە ناخوازێت لە کاتێکدا هاوەڵی کردنی حەق(عزوجل) تەنها بەم حاڵەوە تێر و تەواو دەبێت.



# مەجلیسی چل و یەك

## خۆشەویستی لە پێناوی خودا( عزوجل )

لەدوای هەندێ قسە فەرمووی:

بزانە هەرچی شتە بە جوڵاندنی ئەو لە جوڵەدان و بە وەستاندنی ئەو لە وەستاندان، گەر ئەمەی بۆ دامەزرا لە کۆڵ و قورسایی هاوەڵدانان-بە هۆی دروستکراوەکانەوە- رزگاری دەبێت و خەڵکی لە دەستی ئەو ئاسوودە دەبن، چونکە نەنگییان لێ ناگرێت و هیچیان لێ داوا ناکات لەوەی رووی لێ دەکات، بەڵکو تەنها داوای ئەوەیان لێ دەکات شەرع داوایان لێ دەکات، بە شەرع داوایان لێ دەکات و بە زانست عوزریان بۆ دادەنێت، واتە حوکم و زانست کۆدەکاتەوە، بینینی کرداری خودا(عزوجل) لە دروستکراوەکاندا بیروباوەڕێکە حوکم(حوکمی شەرع)ی پێ هەڵناوەشێتەوە، ئەو(سبحانە وتعالى) تەقدیرکەر(ئەندازەگیر)ە و هەر ئەویش داواکارە.

﴿ لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾ الأنبياء: ٢٣

ئەمە بیروباوەڕی هەموو موسڵمانێکی خاوەن یەقینی رازی لە خودا(عزوجل) و تەبا لەگەڵ قەزا و قەدەری خودایە، رازی لە کاری ئەو(سبحانە وتعالى) لە خۆی و لە دروستکراوەکانی تردا، ئەو(سبحانە وتعالى) لە تۆ و لە ئارامگرتنی تۆ بێنیازە، بەڵام تەماشا دەکات بزانێت لە بانگەشەکەتدا چی دەکەی، ئایا راست دەکەی یان درۆ؟ کەسی موحیب خاوەنی هیچ شتێك نییە و هەموو شتێك رادەستی خۆشەویستەکەی دەکات، خۆشەویستی و موڵکداری کۆنابنەوە، کەسی موحیب بۆ حەق(عزوجل) راستگۆ لە خۆشەویستییەکەیدا نەفس و ماڵ و سەرئەنجامی رادەست دەکات و هەڵبژاردن لە خۆی و کەسانی تردا وازلێدەهێنێت، لە کارەکانیدا تۆمەتباری ناکات، پەلەی لێ ناکات و بە دەستنووقاو تەماشای ناکات، هەر شتێك لە ئەوەوە(سبحانە وتعالى) بۆ ئەو رەوانە بکرێت

نەهێڵێکراوەکان و کردارەکاندا کۆتوبەندی دەکات تا قەدەر رووی لێ دەکات، خودایە، لەدەستی رەحمەتی خۆتدا بمانهێڵەوە، چونکە لە دەریای دونیا و دەریای بووندا نوقم دەبین، ئەی خودای بەخشندەی خاوەنی بڕیاری پێشینە بە هانامانەوە وەرە.

ئەی گەنج، هەر کەس کار نەکات بەوەی من دەیڵێم تێناگات لەوەی دەیڵێم، کاتێك کاری کرد تێدەگات، گەر گومانی باشم پێ نەبەی و باوەڕت بەوە نەبێت دەیڵێم و کاری پێ نەکەی چۆن تێدەگەی؟ تۆ برسیتە لە تەنیشتمەوە وەستاوی و لە خواردنەکەم ناخۆیت، ئیتر چۆن تێر دەبیت؟ لە ئەبی هورەیرەوە(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەری خودا بوو(ﷺ) دەیفەرموو: ((هەر کەس شەوێك نەخۆش بکەوێت و لە خودا(عزوجل) رازی بێت و ئارام بگرێت لەسەر ئەوەی بەسەریدا دراوە، لە گوناهەکانی دێتە دەرەوە وەك ئەو رۆژەی لەدایك بووە))[1].

گەر شتێك بۆ تۆ بێت هاتنەکەی بە تۆوە نییە، مەعاز(خودا لێی رازی بێت) بە هاوەڵانی دەفەرموو: وەرن با ساتێك باوەڕ بهێنین، واتە وەرن با ساتێك تام و چێژ بکەین، وەرن با ساتێك لە دەرگاکەوە بچینە ژوورەوە، ئەمەش وەك دڵنەرمی و سۆز و بەزەیی بۆ ئەوان(خودایان لێ رازی بێت)، مەعاز ئاماژەی دەکرد بۆ بینینی کۆمەڵێك شتی سەرسوڕهێن، ئاماژەی دەکرد بۆ وردبوونەوە بە چاوی یەقین، هەموو موسڵمانێك باوەڕدار نییە، هەموو باوەڕدارێکیش خاوەن یەقین نییە، بۆ ئەو مەبەستە کاتێك هاوەڵان فەرموویان بە پێغەمبەر(ﷺ): مەعاز پێمان دەڵێت وەرن با ساتێك باوەڕ بهێنین ئایا ئێمە باوەڕدار نین؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((واز لە مەعاز و شانوشکۆی مەعاز بهێنن))[2].

ئەی بەندەی نەفس و ئارەزوو و سروشت و شەیتان و دونیا تۆ لای خودا و بەندە صالحەکانی رێز و قەدرێکت بۆ نییە، هەر کەس دوارۆژ بپەرستێت لا بە لایدا ناکەمەوە، ئەی چۆن لا بە لای کەسێکدا دەکەمەوە دونیا دەپەرستێت؟!

---

[1] رواه السيوطي في "الجامع الصغير" وعزاه للحكيم الترمذي.

[2] قال العجلوني في "الكشف": ((اجلس بنا نؤمن ساعة)) رواه أحمد بإسناد حسن ورواه ابن الجوزي في "صفوة الصفوة".

**هاوار بە حاڵت**، چی بەم زمانبازییە دەکەی بەبێ بوونی کردار، تۆ درۆ دەکەی و لەلای خۆت پێتوایە راستدەکەی، هاوەڵ بۆ خودا دادەنێیت و پێتوایە یەکتاپەرستی، باوەڕت وایە راستی و دروستی لەلای تۆیە و ئەوەش بریتییە لە کرۆك و جەوهەر، بەڵام هیچی تر نییە جگە لە ناڕاستی و ناپاکی، کاری من لەگەڵ تۆ ئەوەیە رێگریت لێ بکەم لە درۆ و فەرمانت پێ بکەم بە راستی، سێ سەنگی مەحەکم لەدەستدایە ئەو کارەی پێ دەناسمەوە: قورئان و سوننەت و دڵم وەك دوایین سەنگی مەحەك، سێبەرەکانی تێدا رۆشن دەبێتەوە، دڵ ناگاتە ئەو مەنزیلەتە تا کارکردنی بە قورئان و سوننەت بۆ نەیەتە دی، کارکردن بە زانست تاجی زانستە، کارکردن بە زانست نووری زانستە، و پاڵفتەی پاڵفتەیە و جەوهەری جەوهەرە و کرۆکی کرۆکە، کارکردن بە زانست دڵ راستدەکاتەوە و پاکی دەکاتەوە، کاتێك دڵ راست و دروست لێی وەستا ئەندامەکان راست و دروست لێی دەوەستن، کاتێك دڵ پاکبوویەوە ئەندامەکان پاکدەبنەوە، کاتێك پۆشاك دەکرێت بەبەر دڵدا ئەندامەکان پۆشاکی بەهەشت دەکرێت بەبەریاندا، کاتێك جواو(مضغة) چاك و پاك بوو بونیادی ئەو جەستەیە چاك و پاك دەبێت، دروستی دڵ لە دروستی نهێنییەوەیە کە لە نێوان مرۆڤ و خودادایە(عزوجل)، نهێنی باڵندەیەکە دڵ بریتییە لە قەفەسەکەی، بونیادی جەستە باڵندەیە و قەبر قەفەسەکەیتی، بونیادی جەستەش قەفەسی دڵە کە هەر دەبێت بچێتە ناویەوە.



# مەجلیسی چل و دوو

## تەقوا

سەرلەبەیانی لە مەدرەسەکەی ١٩/رەجەب/٥٤٥هـ فەرمووی:

**لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی:** ((هەرکەس پێیخۆشە بەرێزترین مرۆڤ بێت با لە خودا بترسێ و خۆپارێزی بکات، هەرکەس پێیخۆشە بەهێزترین مرۆڤ بێت با تەوەکول بە خودا ببەستێت، هەر کەس دەیەوێت دەوڵەمەندترین مرۆڤ بێت با متمانەی زیاتر بێت بەوەی لە دەستی خودادایە تا لەوەی لە دەستی خۆیدایە))[1].

هەرکەس رێزی دونیا و دوارۆژی دەوێت با لە خودابترسێت و خۆپارێزی بکات، چونکە خودا(عزوجل) دەفەرموێت: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾ الحجرات: ١٣

رێز و پلە و پایە لە تەقواکردندایە و سووکی و شەرمەزاریش لە یاخیبووندایە لە خودا، هەرکەس هێزی گەرەکە لە ئایینی خودادا با تەوەکولی بە خودا بێت، چونکە تەوەکول دڵ راستدەکاتەوە و بەهێزی دەکات و پاڵفتەی دەکات و هیدایەتی دەدات و سەیروسەمەرەکانی پێ نیشان دەدات، تەوەکولت بە درهەم و دینار و هۆکارەکان نەبێت، چونکە ئەوانە دەستەوسان و لاوازت دەکەن، تەوەکولت بە خودا بێت بەهێزت دەکات و کۆمەکیت پێ دەبەخشێت و لوتفت پێ دەکات و دڵت بەهێز دەکات و دەرگایەکت بەروودا دەکاتەوە هەرگیز بە بیری تۆدا نەهاتبێت، گوێ مەدە بە هاتنی دونیا و رۆیشتنی، گوێ مەدە بە رووتێکردنی خەڵکی و پشتتێکردنیان، ئەوکات تۆ دەبییە بەهێزترین کەس، بەلام گەر تەوەکولت لەسەر ماڵ و سامان و پلە و پایە و خانەوادە و هۆکارەکان بوو ئەوا خۆت رووبەرووی خەشم و تووڕەیی خودا و تیاچوونی

---

[1] رواه الحاكم وصححه.

ئەو شتانە کردووەتەوە، چونکە ئەو(سبحانه وتعالى) خاوەنی غیرەتە و نایەوێت لە دڵی تۆدا شتێکی تر جگە لە خۆی ببینێت، هەرکەسیش دەوڵەمەندی دونیا و دوارۆژی گەرەکە با تەقوای خودا(عزوجل) بکات و ترسی لە کەسێکی تر نەبێت، با لە دەرگای خودادا بوەستێت و شەرم و حەیا بکات لەوەی روو لە دەرگای کەسێکی تر بکات، با چاوی دابخات لە تەماشاکردنی کەسانی تر، مەبەستم چاوی دڵە نەك چاوی سەر، چۆن متمانە دەکەی بەوەی لە دەستی تۆدایە لەکاتێکدا رووبەڕووی تیاچوون دەبێتەوە، واز لە متمانەکردن دێنیت بەوەی لە دەستی خودادایە لەکاتێکدا ئەوە تیاچوون رووی لێ ناکات، نەزانییت بە خودا هەڵتدەنێت بۆ متمانە کردن بە کەسانی تر، متمانەت بە خودا هەموو دەوڵەمەندییە، متمانەت بە کەسان و شتانی تر جگە لە خودا هەموو هەژارییە، ئەی ئەو کەسەی تەقوات وازلێهێناوە، رێز و پلە و پایەی دونیا و دوارۆژت لەدەستداوە، ئەی ئەو کەسەی بە دروستکراو و هۆکارەکان تەوەکولت بەستووە-لە دونیا و دوارۆژ- بێبەشبوویت لە هێز و عیززەت بە خوداوە(عزوجل)، ئەی ئەو کەسەی متمانەی هەیە بەوەی لە دەستیدایە-لە دونیا و دوارۆژ- بێبەشبووی لە دەوڵەمەندی بە خوداوە(عزوجل).

ئەی گەنج، گەر دەتەوێ خاوەن تەقوابیت و تەوەکولت بە خودا بێت و متمانەت پێی هەبێت ئارامبگرە، چونکە ئەوە بنچینەی هەموو خێرێکە، گەر نیێتی ئارامگرتنت راست و دروست بوو و تەنها لەبەر رووی پاکی خودا(عزوجل) ئارامت گرت ئەوا پاداشتی ئەو بۆ تۆ ئەوەیە دڵت بباتە ناو خۆشەویستی خۆیەوە و لە دونیا و دوارۆژدا نزیکت بکاتەوە، ئارامگرتن تەباییە لەگەڵ حەق(عزوجل) لە قەزا و قەدەریدا، ئەو قەزا و قەدەرەی زانستی پێشینەی خودای لێ پێشکەوتووە و هیچ یەکێك لە دروستکراوەکانی ناتوانن بیسڕنەوە، ئەمە لای باوەڕداری خاوەن یەقین جێگیر بووە، بۆیە ئارام دەگرێت لەسەر ئەوەی بۆی براوەتەوە ئەمەش بە هەڵبژاردنی خۆی نەك بە ناچاری، ئارامگرتن یەکەمجار ناچارییە و لە دووەم هەنگاوبدا هەڵبژاردنە، چۆن بانگەشەی ئیمان دەکەی و ئارام ناگریت، چۆن بانگەشەی مەعریفە دەکەی و رازیبوونت نییە؟ ئەمە کارێکە بە بانگەشە نایێت، قسەیەك بوونی نییە تا دەرگاکە

دەبینی و لەبەردەمیدا رادەکشێیت و لەسەر پێلێنانی قەدەر و پێلێنانی زیان و قازانج ئارام دەگریت، پێ لە جەستەی دڵت دەنێیت نەك لە تەنی لاشەت، تۆ لە شوێنی خۆتی و ناجوڵێیت وەك ئەوەی بێهۆش کرابیت، وەك ئەوەی جەستەیەکی بێ رۆح بیت، ئەم کارە پێویستی بە وەستانێکی پڕ لە سوکنایی بێ جوولەیە، پێویستی بە خامۆشییەکە بەبێ یادکردنی بزربوونت لەلایەن خەڵکییەوە، بەبێ ئامادەبوون لەگەڵیان لەڕووی دڵ و نهێنی و ناوەوە و ماناوە، زۆرتان بۆ وەسف دەکەم و ئێوە بەکاریناهێنن، زۆر درێژەی پێ دەدەم و والای دەکەم و لێکدانەوەی بۆ دەکەم بەڵام ئێوە تێناگەن، زۆرتان پێ دەبەخشم و ئێوە وەریناگرن، زۆر ئامۆژگاریتان دەکەم و ئێوە ئامۆژگاری وەرناگرن، چەندە دڵی ئێوە رەق و نەزانە بە خودا(عزوجل)، گەر خوداتان بناسیبایە و باوەڕتان بە لیقای ئەو ببوایە و یادی مردن و ئەوەی لەدوای مردنە بکردبایە بەم جۆرە نەدەبوون، باشە ئێوە مردنی باوکان و دایکان و کەسوکاری خۆتان نەبینیوە؟ ئایا مردنی مەلیکەکانی خۆتان نەبینیوە؟ باشە بۆ ئامۆژگاریان لەوانەوە وەرناگرن و نەفسی خۆتان دەمکوت ناکەن لە داوای دونیا و خۆشەویستی مانەوە لە دونیادا؟ باشە بۆ دڵتان ناگۆڕن و بە دڵێکی تر ئاڵوگۆڕی ناکەن و دروستکراوی لەناودا دەرناکەن؟ خودا(عزوجل) دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾الرعد: ١١

قسە دەکەن و کار ئەنجام نادەن، زۆر کار ئەنجام دەدەن و ئیخلاصیان تێدا نییە، خەڵکانێکی ژیرمەند بن و لە خزمەتی خودادا(عزوجل) بێئەدەبی مەکەن، دانیپیادا دەنێن و پشتگیری بۆ دەردەبڕن و پاشان لێی دەکۆڵنەوە، ملکەچانە بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە و پاشان بێباوەڕ دەبن، ئەمەی ئێوەی تێدایە لە دوارۆژدا سوودێکتان پێ ناگەیەنێت، ئێوە بە شتێکەوە سەرقاڵبوون کە تیادەچێت و شتێکتان لەدەستچووە کە تیاناچێت، خۆتان بە کۆکردنەوەی ماڵ و سامان و ژن و منداڵەوە سەرقاڵ مەکەن، چونکە بەم نزیکانە لە هەموو ئەوانە جیادەبنەوە، سەرقاڵ مەبن بە داواکردنی دونیا و پشتبەستن بە دروستکراو، چونکە ئەوانە لەلای خودا سوودێکتان پێ ناگەیەنن، دڵت بە هاوەڵدانان پیس بووە و گومانت لە خودا بۆ دروستبووە و تۆمەتباری دەکەی و لە هەموو حاڵ و بارێکدا بەرهەڵستی دەکەی، کاتێك خودا ئەوەی لە تۆ بینی رق و

خەشمی خۆی بەسەر تۆدا داباراند و رقلێبوونی تۆی خستە ناو دڵی بەندە صاڵحەکانییەوە.

یەکێك لە صاڵحان(رەحمەتی خودای لێ بێت) هەرکات لە ماڵەوە دەردەچوو چاوەکانی خۆی دەبەست و کوڕەکەی پەلی دەکێشا، لەوبارەیەوە پرسیاری لێکرا، وتی: تا بێباوەڕێك بە خودا(عزوجل) نەبینم، لە یەکێك لە ڕۆژەکاندا لە ماڵەکەی بەبێ چاوبەستن هاتە دەرەوە کەسێکی بینی و بوورایەوە، چەندە غیرەتی بۆ خودا توند و مەزن بووە! چۆن کەسێکی تر دەپەرستی و هاوەڵی بۆ بڕیار دەدەی؟! چۆن نیعمەتی خودا دەخۆی و بێباوەڕی پێ دەکەی؟! ئێوە هەست بەمە ناکەن و لەگەڵ بێباوەڕاندا دەخۆن و لەگەڵیان دادەنیشن، چونکە لە دڵی ئێوەدا ئیمان و غیرەت بۆ حەق(عزوجل) بوونیان نییە.

تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە و داوای لێخۆشبوون بکەن و حەیا و شەرمتان هەبێت لە خودا، پۆشاکی پیسی بێئەدەبی فڕێدەن و خۆتان لەبەردەمی رووت بکەنەوە، لە حەرامی دونیا و شوبهەکانی دونیا خۆتان بەدووربگرن، پاشان لە دەستبردن بۆ موباح بە حەز و ئارەزووەوە خۆتان بەدوور بگرن، چونکە دەستبردنتان بە حەز و ئارەزووەوە لە حەق(عزوجل) بێئاگاتان دەکات، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:

((دونیا بەندیخانەی باوەڕدارە))[1].

چۆن دیل لە بەندیخانەدا دڵخۆش دەبێت؟! دڵخۆش نابێت، بەڵام کرانەوە و خۆشییەکەی لە روخساریدایە و دڵتەنگییەکەی لە دڵیدا، کرانەوە و خۆشییەکەی لە ئاشکرا و رووالەتیدایە، بەڵام ئافەت-لە ناوەوە و تەنهایی و مانایدا- پارچەپارچەی کردووە، برینەکانی لەژێر پۆشاکەکەیەوە پێچراون، بە کراسی بزە و خەندەی روخساری برینەکانی دادەپۆشێت، بۆ ئەو مەبەستە پەروەردگاری(عزوجل) لای فریشتەکان شانازی پێوە دەکەن، بە پەنهەی هەریەك لەوانە ئاماژەی بۆ دەکرێت، کەسێکی نازایە لە دەوڵەت و نهێنی دینی خودادا(عزوجل)، بەردەوام لەگەڵ خودا ئارام دەگرن و تاڵاوی

[1] صحیح، رواه مسلم وزاده "وجنة الكافر".

قەدەرەکانی دەنۆشن تا خودا ئەوانی خۆشدەوێت، خودا(عزوجل) دەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ ١٤٦﴾ آل عمران: ١٤٦

بەهۆی خۆشەویستی خۆیەوە بۆ تۆ رووبەرووی بەڵا و ناخۆشیت دەکاتەوە، هەرکات فەرمانەکانی جێبەجێ دەکەی و خۆت لە نەهیلێکراوەکانی بەدوور دەگریت خۆشەویستیت بۆ زیاد دەکات، هەرکات لەسەر بەڵاکانی ئارام دەگریت زیاتر لە ئەو(سبحانه وتعالى) نزیکدەبییەوە.

لە یەکێك لە خوداناسانەوە(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) فەرمووی: خودا نایەوێت خۆشەویستەکەی خۆی ئازار بدات، بەڵکو تاقیدەکاتەوە و فێری ئارامگرتنی دەکات، پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: ((وەك ئەوەی دونیا هەر نەبوبێت، وەك ئەوەی دوارۆژ بەهەمیشەیی بەردەوام بوبێت))[1].

ئەی ئەوانەی داوای دونیا دەکەن، ئەی ئەوانەی دونیاتان خۆشدەوێت وەرنە پێشەوە بۆ لای من تا تەنگییەکانی دونیاتان پێ بناسێنم و ڕێنموونیتان بکەم بۆ سەر ڕێگەی حەق(عزوجل) و بەوانەتان بگەیەنم تەنها ڕووی پاکی خودایان دەوێت، ئێوە لەسەر هەوەسبازین، گوێ لەوە بگرن بە ئێوەی دەڵێم و کاری پێ بکەن و ئیخلاصتان لە کارکردندا هەبێت، گەر ئەوەتان زانی من دەیڵێم و لەسەر کردار مردن دەگەنە پلە بەرزەکانی پاداشت، لەوێوە تەماشای ئێرە دەکەن و ڕاستێتی قسەکانی من دەبینن، ئەوکات دوعام بۆ دەکەن و سەلامم بۆ ڕەوانە دەکەن و ڕاستێتی ئەوەی ئاماژەی پێ دەکەم بۆ ئێوە ڕۆشن دەبێتەوە.

**خەڵکینە**، لە دڵی خۆتاندا تۆمەتبار کردنی من وازلێبهێنن، من گاڵتەکار و داخوازیکاری دونیا نیم، بەڵکو حەق دەڵێم و ئاماژە بۆ حەق دەکەم، لە هەموو تەمەنمدا بەردەوام گومانی باشم بە صالحان بردووە و خزمەتیان دەکەم و ئەوەش سوودێکی زۆرم پێدەگەیەنێت، لەسەر ئامۆژگاری و قسەکانم بۆ ئێوە پاداشتم لە ئێوە ناوێت، نرخی قسەکانی من بریتییە لە کارکردن بە قسەکان، ئەوەش قسانێکە بۆ

[1] ورد في "الزهد الكبير" للبيهقي.

تەنهایی و ئیخلاص کەموێنەیە، دووڕوویی کاتێك کۆتایی پێدێت هەوڵ و فێڵ و هۆیەکان کۆتاییان پێ بێت، ئیمان و یەقین ببینێت نەك نەفس و ئارەزوو، بۆ باوەڕدار خەرج بکات نەك بۆ کەسی دووڕوو.

**خەڵکینە**، ئارەزووبازی و هیوا و خۆزگەی پووچ وازلێبهێنن و بە یادی خوداوە سەرقاڵ بن، شتێك بڵێن سوودتان پێ بگەیەنێت و لەو شتانە بێدەنگ بن زیانتان پێ دەگەیەنێت، گەر ویستت قسە بکەی بیر لەو قسەیە بکەرەوە کە دەیڵێیت و نیێتی چاکی تێدا بەدەستبهێنە پاشان قسە بکە، بۆ ئەو مەبەستە وتراوە: زمانی کەسی نەزان لەپێش دڵییەوەیە، بەڵام زمانی کەسی ژیرمەند لەدوای دڵییەوەیە، تۆ لاڵ و بێ قسە بە، گەر خودا(عزوجل) قسەکردنی لە تۆ ویست دەتهێنێتە قسە، گەر بۆ کارێك تۆی ویست ئامادەت دەکات، هاوەڵی کردنی خودا بێدەنگبوونی تەواوی دەوێت، کاتێك بێدەنگبوون تێر و تەواو بوو-گەر بیەوێت- قسەکردن لە ئەوەوە رووت لێ دەکات، یان بێدەنگبوونەکەت درێژە دەکێشێت تا گەیشتن بە دوارۆژ، ئەمە مانای فەرموودەکەی **پێغەمبەر**(ﷺ) **کە دەفەرموێت:** ((هەر کەس خودا بناسێت زمانی کۆڵ دەبێت))[1].

زمانی ئاشکرا و پەنهانی کۆڵ دەبێت لە بەرهەڵستی کردنی بڕیارەکانی خودا لەو شتانەی رووی لێ دەکەن، کەسێکی تەبا دەبێت و هیچ بەربەرەکانییەك ناکات، هەردوو چاوی دڵی خۆی لە سەرنجدان بۆ کەسان و شتانی تر جگە لە خودا دادەخات و کوێر دەکات، نهێنی خۆی پارچە پارچە دەکات و کاروبارەکانی دەسڕێنەوە و ماڵ و سامانەکەی دابەش دەکات و لە بوونی خۆی و دونیا و دوارۆژ دێتە دەرەوە و ناو و وێنە و رووالەتی نامێنێت.

﴿ثُمَّ إِذَا شَاءَ أَنشَرَهُ ۝٢٢﴾ عبس: ٢٢

لەدوای بزربوون و ونبوون بوونی پێ دەبەخشێتەوە، دروستکردنێکی تر(سەرهەڵدانێکی تر)ی پێ دەبەخشێتەوە، بە دەستی فەنا فەنای دەکات، پاشان بە

---

[1] ذكره الغزالي في "الإحياء" بلفظ "من اتقى ربه".

دەستی بەقا(مانەوە) بەقای پێ دەبەخشێتەوە بۆ ئەوەی داوای لیقای خودا بکات، پاشان بەقایەکی تری پێ دەبەخشێت بۆ ئەوەی بانگی مەردوومان بکات لە هەژارییەوە بۆ دەوڵەمەندی، دەوڵەمەند ئەو کەسەیە بە خوداوە(سبحانە وتعالی) دەوڵەمەندە و پەیوەستە بە ئەوەوە، هەژاریش بریتییە لە دووریی لە خودا(عزوجل) و بێنیازبوون لە خودا بە شتەکانی ترەوە، دەوڵەمەند ئەو کەسەیە دڵی نزیکی لە خوداوە بەدەستهێناوە، هەژاریش ئەو کەسەیە ئەوەی بەدەستنەهێناوە، هەر کەس ئەو دەوڵەمەندبوونەی دەوێت با دونیا و دوارۆژ و ئەوەی لەو دوانەدا دانراوە و هەرچی شتە جگە لە خودا وازلێبهێنێت، شتەکان یەك بەیەك لە دڵ دەربکات، بەو کەمە دونیا کە لەلای ئێوەیە خۆتان دیل و یەخسیر مەکەن، ئەو کەمە لە دونیای پێبەخشیون بۆ ئەوەی بیکەن بە توێشوویەك تاکو لە سەفەر بەرەو خودا لەگەڵ خۆتان بەکاریبهێنن و سوودی لێ ببینن، خودا نیعمەتی بە ئێوە بەخشیوە بۆ ئەوەی بۆ لای خودا میوانداری پێ بکەن و بەو ماڵ و سامانە بۆ لای ئەو(سبحانە وتعالی) رێنموونی بکەن، خودا زانستی بە ئێوە بەخشیوە تاکو کاری پێ بکەن و بە نوورەکەی هیدایەت وەربگرن.

خودایە دڵمان بۆ لای خۆت هیدایەت بدە.

﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾﴾
البقرة: ٢٠١



# مەجلیسی چل و سێ

## سەرپێچی لە نەفس

بەیانی رۆژی یەکشەممە لە "الرباط" ٢١/رەجەب/٥٤٥هـ فەرمووی:

**ئەی گەنج،** گەر سەرفرازیت دەوێ-بۆ تەبایی لەگەڵ پەروەردگارت(عزوجل)- سەرپێچی لە نەفسی خۆت بکە، لە گوێڕایەڵی خودادا لەگەڵ نەفست تەبا بە و لە یاخیبوون لە خودا سەرپێچی لێ بکە، نەفست پەردەیەکە بۆ ناسینی دروستکراو، دروستکراویش پەردەیەکە بۆ ناسینی دروستکەر(سبحانه وتعالى)، تا لەگەڵ نەفسی خۆت بیت دروستکراو ناناسیت، تا لەگەڵ خەڵکی بیت حەق(عزوجل) ناناسیت، تا لەگەڵ دونیا بیت دوارۆژ ناناسیت، تا لەگەڵ دوارۆژ بیت پەروەردگاری دوارۆژ ناناسیت، خاوەن موڵك و بەموڵككراو کۆنابنەوە، وەك چۆن دونیا و دوارۆژ کۆنابنەوە، هەر بەو جۆرە دروستکەر و دروستکراو کۆنابنەوە، ئەمە هەویر و سروشتی نەفسی فەرمانکەر بە خراپەیە، لەگەڵی تێبکۆشە تا فەرمان بەوە دەکات دڵ فەرمانی پێ دەکات، لە هەموو حاڵ و بارێکدا دژ بە ئەو بکۆشە و بەم ئایەتە بەرزە بەڵگە و بیانوو بۆ نەفست مەهێنەوە:

﴿ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا ۝٨ ﴾ الشمس: ٨[1].

بە تێکۆشان بیتوێنەوە، چونکە گەر توایەوە و فەنا بوو ئارامی و دڵنیایی رووی لێ دەکات و لا بەلای دڵدا دەکاتەوە، پاشان دڵ لابەلای نهێنیدا دەکاتەوە، ئەوجا نهێنی لا بەلای حەقدا(عزوجل) دەکاتەوە و ئارامی و سوکنایی و دڵنیایی لای ئەو دەبێت، خواردنەوە و هەڵگۆزینی هەموان لەو جێگەدایە، کاتێك توانەوەت بۆ نەفست تێر و

---

[1] (واتە بیانوو بهێنیتەوە و بڵێیت: خودا خراپە(فجور)ی لە نەفسدا داناوە و ناتوانم خراپە نەکەم).

تەواو بوو لەڕووی دڵەوە بانگکەرێک بانگ دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴿٢٩﴾﴾ النساء: ٢٩

ئەم گوتارە لە حەقەوە(عزوجل) کاتێک دێت نەفس پاکبووبێتەوە لە چڵک و چەپەڵی و توابێتەوە و لە شەڕ پاڵفتە بووبێت و دڵ بە یادی خودا(عزوجل) و گوێڕایەڵی کردن لە خودا بوژابێتەوە(قەڵەو بووبێت)، گەر ئەمەی بۆ بەدەست نەهات ئەوا هیوای ئەوەی نییە بەو چڵکنی و چەپەڵی و شەڕەوە لە خودا نزیک ببێتەوە، چۆن نزیکی لە مەلیکەوە بەدەست دەهێنێت لە کاتێکدا لە پیسی و لیخنی پاک نەبووەتەوە؟! هیوا و ئاواتی نەفس کورتبکەرەوە گوێڕایەڵیت لێ دەکات لەوەی داوای لێ دەکەی، بە ئامۆژگارییەکەی پێغەمبەر(ﷺ) نەفست ئامۆژگاری بکە کە دەفەرموێت: ((گەر ڕۆژت لێبوویەوە قسە لەگەڵ نەفسی خۆت مەکە بۆ ئێوارە[1]، گەر ئێوارەت بەسەردا هات قسە لەگەڵ نەفسی خۆت مەکە بۆ بەیانی[2]؛ چونکە تۆ نازانیت سبەینێ ناوت چییە))[3].

تۆ بۆ نەفسی خۆت لە کەسانی تر بە بەزەییتری کەچی ڕووبەڕووی تیاچوونت کردووەتەوە، ئیتر چۆن کەسانی تر بەزەییان بە نەفسی تۆدا دێتەوە و پارێزگاری لێ دەکەن؟! هێزی زۆری هیوا و ئاوات و هەڵپەت نەفسی تۆیان ڕووبەڕووی تیاچوون کردەوە. هەوڵبدە و بکۆشە بۆ کورتکردنەوەی هیوا و ئاوات و کەمکردنەوەی هەڵپە بۆ دونیا. یادی مردن بکە و چاودێری خودایت هەبێت و بە هەناسەی صادیقان و وشەکانیان و یادی پاڵفتە لە لێلی و لیخنی لە شەو و ڕۆژدا تیماری نەفسی خۆت بکە. پێی بڵێ ئەوەی بەدەستتهێناوە لە کرداری چاکە بۆ خۆتە و ئەوەی ئەنجامتداوە لە کرداری خراپە لەسەر خۆتە. هیچ کەسێک کار لەگەڵ تۆدا ناکات و شتێک لە کاری خۆی بە تۆ نابەخشێت. بۆیە هەردەبێت کاربکەیت و تێبکۆشیت، دۆستەکەت ئەو کەسەیە ڕێگریت لێ دەکات لە کرداری خراپە، دوژمنەکەت ئەو کەسەیە فریوت

---

[1] (واتە بۆ بە ئێوارە مەکەرەوە).

[2] (واتە بۆ بە بەیانی مەکەرەوە).

[3] رواه البخاري وهو من قول ابن عمر لا قول النبي ﷺ، وقد ورد فيه قوله: «فإنك لا تدري ما اسمك غدا».

دەدات و دانـت بـۆ ڕۆدەکـات، مـن تـۆ دەبیـنم لـەلای دروسـتکراوی نـەك لـەلای دروستکەر(عزوجل)، مافی نەفس و خەڵکی دەدەی، بەڵام مافی خودا(عزوجل) پێشێل دەکەی، شوکری کەسانی تر دەکەی بۆ نیعمەتەکانی خودا، کێ ئەم هەموو نیعمەتـەی بە تۆ بەخشیوە جگە لە خودا تا بچیت شوکری کەسانی تر بکەی و بیانپەرستی؟ گـەر دەزانی ئەو(سبحانە وتعالی) تۆی دروستکردووە کوا عیبادەت کردنی لە جێبەجێ کردنـی فەرمانـەکان و دەستکێشـانەوە لـە نەهییـەکانی و ئـارامگرتن لەسـەر بـەلاّ و ناخۆشییەکانی؟ دژ بە نەفسی خۆت تێکۆشان بکە تا ڕێگەی هیدایەت دەگرێتـە بـەر، خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٦٩ ﴾ العنكبوت: ٦٩،

هەروەها دەفەرموێت:

﴿ إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرۡكُمۡ وَيُثَبِّتۡ أَقۡدَامَكُمۡ ٧ ﴾ محمد: ٧

پەت بۆ نەفست شل مەکە و خۆراکی دەرخوارد مەدە سەرفرازی بەدەست دەهێنیت، بەڕوویەوە پێمەکەنە، پرسیاری وشە بە وشەی لێ بکە گەر هەزار وشەش بێت تا پاڵفتە دەبێت و ئارامی و دڵنیایی ڕووی لێ دەکات و گەردنکەچ دەبێت، گـەر حـەز و چێژی لێ داواکردی دوایبخە و پشتگوێی بخە و پێی بڵێ لە بەهەشتدا، لەسەر نۆشینی تـاڵاو دامەزراو و خۆڕاگری بکە تا بەخششی بۆ دێت، گەر خۆڕاگری و ئارامیت پێ بەخشـی و ئەویش ئارامی گرت خودا(عزوجل) لەگەڵی دەبێت، چونکە فەرموویەتی:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ٤٦ ﴾ الأنفال: ٤٦

هیچ قسەیەکی لێ قبووڵ مەکە، چونکە ئەو تەنها فەرمان بە خراپـە دەکـات، گـەر وەڵامتدایـەوە سەرپێچـی لـێ بکـە، چـونکە لـە سەرپێچـیکردن لێـی چـاکبوون و هاتنەڕاستەی ئەوی تێدایە، ئەی ئەو کەسەی بانگەشەی خوداویسـتی دەکـەی، کەچـی لەگەڵ نەفسی خۆت وەستاوی، تۆ لە بانگەشەکەدا درۆ دەکەی، نەفس و حـەق(سـبحانە وتعالی) کۆنابنەوە، دونیا و دوارۆژ کۆنابنەوە، هەرکەس لەگەڵ نەفسی خۆی بوەسـتێت

وەستانی لەگەڵ حەق(عزوجل) لەدەستدەچێت، هەر کەس لەگەڵ دونیا بوەستێت وەستانی لەگەڵ دوارۆژ لەدەستدەچێت، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:

((هەر کەس دونیاکەی خۆی خۆشبوێت زیان بە دوارۆژی دەگەیەنێت، هەرکەس دوارۆژی خۆشبوێت زیان بە دونیاکەی دەگەیەنێت))[1].

ئارامبگرە، چونکە گەر ئارامگرتنەکەت تێر و تەواو بوو رازیبوونەکەت تێر و تەواو دەبێت، ئەوکات فەنا رووت لێ دەکات و هەموو شتێك بۆ تۆ چاك و پاك دەبێت، هەموو بۆ تۆ دەبێت بە شوکر، دووری دەبێت بە نزیکی، هاوەڵدانان دەگۆڕێت بۆ یەکتاپەرستی و زیان و قازانج لە دروستکراوەوە نابینی، دژ نابینی، بەڵکو دەرگاکان و ئاراستەکان یەکدەگرن و تەنها یەك ئاراستە دەبینی، حاڵەتێکە زۆرینەی خەڵکی تێینەگەن، بەڵکو ئەوە بۆ دانەدانەیەکە لە خەڵکی، لە هەر هەزار کەسێك دانەیەك، تا کۆتایی تەمەن یەکێکە.

ئەی گەنج، تێبکۆشە لەو مەقامەدا و لەبەر دەستی خودادا(عزوجل) بمریت، هەوڵبدە نەفست بمرێنی بەر لە دەرچوونی رۆحت لە جەستە، بە ئارامگرتن و سەرپێچی لێی بمرێنە، چونکە بەم نزیکانە سەرئەنجامێکی باش لەو کارەوە بەدەست دەهێنیت، ئارامگرتنەکەت کۆتایی پێ دێت، بەڵام پاداشتی خودا کۆتایی پێ نایەت، من ئارامم گرت و بینیم سەرئەنجامی ئارامگرتن چاك و پەسەندە، مردم و زیندووی کردمەوە و پاشان مراندمی، بزربووم و پاشان بوونی پێ بەخشیمەوە لە بزربوونەکەم، لەگەڵی تێچووم و لەگەڵی بووم بە خاوەنی موڵك، دژ بە نەفسم کۆشام لە وازهێنان لە هەڵبژاردن و ویستدا تا ئەوەم بۆ بەدەستهات، بۆیە قەدەر دەستی دەگرتم و رێنموونی دەکردم و منەتی خودایی سەریدەخستم، کردار دەیبزواندم و غیرەت دەیپاراستم، ویست گوێڕایەڵی پێ دەبەخشیم و بڕیاری پێشینەی خودا پێشیدەخستم و ئەو(سبحانە وتعالی) بەرزی دەکردمەوە.

---

[1] رواه احمد واورده الهيثمي في "المجمع" وزاد نسبه للبزار والطبراني.

هاوار به حالّت، له من رادەکەی لە کاتێکدا من گەرمت دەکەمەوە و پارێزگاری لە گەشی و گەرمی تۆ دەکەم، جێگەی تۆ لەلای منە ئەگینا تۆ تیاچوویت، ئەی بچووکی نەزان، یەکەمجار حەجی لای من بکە پاشان حەجی ماڵی خودا، من دەروازەی کەعبەم، وەرە با فێرت بکەم چۆن حەج دەکەی، وەرە با گوتارێکت فێر بکەم لەگەڵ پەروەردگاری کەعبە گفتوگۆی پێ بکەی، لە داهاتوودا دەبینن کاتێك تەپ و تۆز رەوییەوە، لەلام دانیشن ئەی سیاسەتکاران، هانام بۆ بهێنن، چونکە من لە خوداوە(عزوجل) هێزێکم پێدراوە، خوداناسان بەوە فەرمانتان پێ دەکەن من فەرمانم پێکردوون و نەهیتان لەو شتانە لێ دەکەن من نەهیم لێ کردوون، ئەوان ئامۆژگاری ئێوەیان رادەستکراوە، ئەوانیش لەوەدا ئەمانەت دەگەیەنن، لە خانەی حیکمەتدا کاریکەن تا دەگەنە خانەی قودرەت، دونیا حیکمەتە و دوارۆژ قودرەتە، حیکمەت ئاتاجە بە کەرەستە و ئامراز و هۆکار، بەڵام قودرەت ئاتاج نییە بەوانە، خودا(عزوجل) بۆیە ئەوەی بەو جۆرە کردووە بۆ ئەوەی خانەی قودرەت لە خانەی حیکمەت جیابکاتەوە، دوارۆژ سەرهەڵدان(تکوین)ی[1] تێدایە بەبێ هۆ، ئەندامەکانتان پێی دێنە گۆ و شایەتیتان لێ دەدەن بەوەی ئەنجامتانداوە لە یاخیبوون لە حەق(عزوجل)، رۆژی دوایی پەردەکان لادەدرێن و بتانەوێ و نەتانەوێ شاراوەکان دەردەکەون، دروستکراو بە دڵێکی ساردەوە دەچێتە ناو ئاگرەوە بەهۆی ئەنجامدانی ئەوەی بووەتە بەڵگە لەسەری، نووسراوەکانی خۆتان-بە زمانی بیرکردنەوە لێیان- بخوێننەوە، پاشان لە خراپەکان تەوبە بکەن و لەسەر چاکەکان شوکری خودا بکەن، نووسراوەکانی گوناه کەم بکەنەوە و بە تەوبەکردن دێڕەکانی بسڕنەوە.

ئەی گەنج، لەسەر دەستی من تەوبەت کرد و هاوەڵیت کردم گەر ئەوەی من بە تۆی دەڵێم لێم قبووڵ نەکەی چ سوودێك بە تۆ دەگەیەنێت؟ حەزی رووالەتت هەیە بەبێ مانا، هەرکەس دەیەوێ هاوەڵیم بکات دەبێت ئەوەی دەیڵێم قبووڵی بکات و کاری پێ بکات، روو لە کوێ دەکەم روو لەو شوێنە بکات، ئەگینا با هاوەڵیم نەکات، چونکە

[1] (واتە بەشێك لەو کردارەی خودا کە بە شتێك دەفەرموێت ببە و دەبێت(کن فیکون) بە ئەهلی بەهەشت دەبەخشرێت).

زیانکردنی زۆرتر دەبێت لە قازانج، مـن سـفرەی راخـراوم کـەس هیچم لـێ نـاخوات، دەرگایەکی کراوەم کەس لێیەوە ناچێتە ژوورەوە، نازانم چی لەگەڵ ئێوە بکـەم، چەندە قسە بۆ ئێوە دەکەم و ئێوە گوێم بۆ ناگرن، من بۆ ئێـوەم دەوێـت نـەك بـۆ خـۆم، مـن لێتان ناترسم و رجام لەلای ئێوە نییە، جیاوازی ناکەم لە نێوان وێرانە و ئاوەدانیدا، لە نێوان زینـدوو و مـردوودا، لـە نێـوان دەوڵەمەنـد و هـەژاردا، لـە نێـوان مـەلیك و رەعییەتدا، کارەکەی من بە دەستی کەسێکی ترە جیا لە ئێوە، کاتێـك خۆشەویستی دونیام لە دڵم دەرکرد ئەوەم بۆ هاتە راستە، چۆن یەکتاپەرستیت بـۆ دێتـە راستـە لـە کاتێکدا خۆشەویستی دونیا لە دڵی تۆدایە، گوێت لە فەرموودەکـەی پێغەمبـەر(ﷺ) بووە کە دەفەرموێت:

((خۆشەویستی دونیا سەری هەموو خراپەیەکەیە))[1].

لەبەرئەوەی لە سەرەتادای و شانت لەسەر کەسێکی تر داداوە و قوتـابی و سـالیکی خۆشەویستی دونیا بۆ تۆ سەری هەموو خراپەیەکە، کاتێك نهێنی دڵت گەیشتە مەنزڵ و نزیکی خودای بەدەستهێنا بەشی خۆت لە دونیا لا شیرین دەکات و بەشی کەسانی ترت لا قێزەون دەکات، بەشەکانی خۆت لا خۆشەویست دەکات بۆ ئەوەی وەریانبگریت وەك ئەنجامدانی زانستی پێشینەی خودا لە تۆدا، بۆیە پێی رازی دەبیت و لا ناکەیەوە بە لای شتانی تردا، و دڵیشت لەبەردەستی خودادا راستدەبێتەوە و لە دونیادا هاتووچۆ دەکات وەك هاتووچۆکردنی ئەهلی بەهەشت لە بەهەشتدا، هەموو ئەوەی بەسـەر تـۆدا جـاری دەبێت لە لای حەقەوە(عزوجل) بۆ تۆ خۆشەویستە، چونکە بە ویستی ئەو خاوەن ویستی و بە هەڵبژاردنی ئەو خاوەن هەڵبژاردەی، لەگەڵ قەدەری ئەودا دەسـوڕێیەوە و هەرچی شتی ترە جگە لە خودا لە دڵی خۆت دەبڕی، دونیا و دوارۆژ لە دڵت دەردەکـەی، ئـەو کات دەستبردنت بۆ بەشەکان و خۆشەویستی بۆیان بە خوداوە دەبێت نەك بە خۆتەوە.

کەسـی دووڕووی ریابـازی خۆپەسـەندی سەرسـام بـە کارەکـانی رۆژووی بـەردەوام و شەونوێژ دەکات و خواردنی سادە دەخوات و پۆشاکی زبر دەپۆشێت، ئەو لـە نـاوەوە و

---

[1] رواه البيهقي في "الشعب" و ابو نعيم في "الحلية".

دەرەوەدا لـە تاریکیدایـە و لـە دڵـەوە هـەنگاوێك لـە پـەروەردگاری(عزوجل) نزیـك نابێتەوە، ئەو لەوانەیە کە کاردەکەن و ماندووبوونیان بۆ دەمێنێتەوە:

﴿عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ ﴿٣﴾﴾ الغاشية: ٣،

پەنهانی ئەو کەسە لەلای صادیقان و ئەولیا و صالحان و گەیشتوان بە حەق(عزوجل) ئاشکرایە، ئەمڕۆ تایبەتان لە بەندەکانی خودا دەیناسنەوە، سبەینێش هەموو خەڵکی بە چاوی خۆیان دەیبینن، تایبەتان کاتێك ئـەو دەبیـنن بـە دڵ رقیـان لێیـەتی، بـەڵام بـە داپۆشینی خودا دایدەپۆشن، بە دووڕوویەکەت شانشانێن لەگەڵ خوداناسـان مەکـە، چونکە لەگەڵیان دەرناچیت، قسەکردن بوونی نییە تا پشتوێن نەبڕیت و ئیسلامەکەت تازە نەکەیەوە و تەوبە بە دڵ بەدەست نەهێنیت و لە خانەی سروشت و ئارەزوو و بوونی خۆت و راکێشانی قازانج و لادانی زیان کۆچ نەکەیت، قسەکردن نییە تا لە خۆت کۆچ نەکەیت ئەوەش لەبەر دەرگاکەدا بە وازهێنان لە نەفس و ئارەزوو و سروشتی خۆت، دڵت لـە تونناوتوونەکـەدا بـەجێبهێڵیت و نهێنیت لـە جێگـەی نووستن و و لـەلای مـەلیك بەجێبهێڵیت، بەپەلە دەست بۆ بیناکردنی بنچینە و بناغە ببە، کاتێك ئەوەت دامەزراند بەپەلە دەست بۆ بەرزکردنەوەی بیناکە ببـە، جەوهـەری بنچینە و بناغـە بریتییـە لـە تێگەیشتن لـە دیـن، تێگەیشـتنی دڵ نـەك تێگەیشـتنی زمـان، تێگەیشـتنی دڵ لـە حەق(عزوجل) نزیکت دەکاتەوە، بەڵام تێگەیشتنی زمـان لـە خـەڵك و مەلیکـەکانیان نزیکت دەکاتـەوە، تێگەیشـتنی دڵ لـە سـەرەوەی مەجلیسـی نزیکی لـە خـوداوە تـۆ دادەنێت، بەرزت دەکاتەوە و هەنگاوەکانت لە پەروەردگارەوە نزیك دەکاتەوە.

هـاوار بـە حاڵـت، تەمـەنی خـۆت بـە داوای زانسـتەوە بـەفیڕۆ دەدەی و کـار بـە زانستەکەت ناکەی، تۆ لەسەر پێی نـەزانی وەستاوی، لـە هەوەسبازیدای و خزمـەتی دوژمنانی حەق(عزوجل) دەکەی و بەوانەوە هـاوار بـۆ خـودا دادەنێیت، ئـەو(سبحانه وتعالى) لە تۆ و لەو کەسـەی کردووتە بـە هـاوەڵی خـودا بێنیـازە، هاوەڵـت لـێ قبـووڵ ناکات، تۆ ئەوەت زانیوە کە بەندەیەکی و رەشۆی شتەکانی تـۆ لـە دەسـتی ئەودایـە، گەر سەرفرازیت دەوێت رەشۆی دڵت بدە دەستی خودا(عزوجل) و تەوەکولی پێ ببەستە

به راستەقینەی تەوەکول، لە ئاشکرا و پەنهاندا خزمەتی بکە و تۆمەتباری مەکە، چونکە ئەو(سبحانه وتعالى) تۆمەتبار نییە، ئەو لە تۆ زیاتر بە بەرژەوەندییەکانی تۆ ئاگادارە، ئەو(سبحانه وتعالى) دەزانێت و تۆ نازانی، لەبەر دەستی خودادا بێدەنگ و خامۆش بە و چاوەکانت دابخە و سەرت شۆڕبکەرەوە و زمانت لاڵ بکە تا مۆڵەت لە خوداوە رووت لێ دەکات بۆ ئەوەی قسە بکەی، ئەوکات بە خوداوە قسە دەکەی نەك بە خۆتەوە، ئەوکات قسەکردنەکەت دەبێت بە دەوا و دەرمان بۆ نەخۆشییەکانی دڵ و شیفای نهێنی و پەنهان و نوور و رۆشنایی بۆ ژیریت.

خودایە دڵمان نوورانی بکە و رێنموونی بکە بۆ لای خۆت و نهێنی و پەنهانمان پاڵفتە بکە و لە خۆتی نزیك بکەرەوە.

﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾﴾

البقرة: ٢٠١



# مەجلیسی چل و چوار

## دونیا بەندیخانەی باوەڕداره

ئێوارەی رۆژی سێشەممە لە مەدرەسەکەی ٢٣/رەجەب/٥٤٥ھ فەرمووی:

باوەڕدار لە دونیادا نامۆیە، زاهید لە دوارۆژدا نامۆیە، عاریفیش لە هەرچی شتە جگە لە مەولا(عزوجل) نامۆیە، باوەڕدار لە دونیادا بەندکراوە با رۆزی و ماڵ و شوێنیشی هەبێت، خانەوادەکەی لە ماڵ و سامان و پلە و پایەی ئەودا هاتووچۆ دەکەن و دڵخۆشن و بە دەوریدا پێدەکەنن، بەڵام ئەو لە بەندیخانەیەکی ناوەکیدایە، خۆشی و کرانەوەی لە روخساریدایە و دڵتەنگی و پەژارەی لە دڵیدایە، دونیای ناسی و بە دڵ تەڵاقیدا، یەکەمجار یەك تەڵاقی خست، چونکە لە وەرگەڕانی شتەکان دەترسا، لە کاتێکدا ئەو بەو جۆرە بوو دوارۆژ دەرگای خۆی کردەوە و روخساری جوانی خۆی دەرخست، بۆیە تەڵاقی دووەمی دونیای خست، ئەوکات دوارۆژ رووی لێکرد و دەستەملانی بوو ئەویش تەڵاقی سێیەمی دونیای خست و بە هەموو بوونیەوە لەگەڵ دوارۆژ وەستا، لە کاتێکدا ئەو لەو بارەدا بوو رۆشنایی نووری حەق(عزوجل) درەوشایەوە، بۆیە هەروەك دونیا دوارۆژی تەڵاقدا، دونیا پێی وت: بۆ تەڵاقتدام؟ پێی وت: چونکە جوانترم لە تۆ بینییەوە، دوارۆژ پێی وت: بۆ تەڵاقتدام؟ پێی وت: چونکە تۆ وێنە و رووداوی، گەر وا نەبوویتایە تەڵاقم نەدەدای، لەو کاتەوە مەعریفەی بە پەروەردگاری(عزوجل) هاتە راستە و لە هەرچی شتی ترە ئازاد بوو، لە دونیا و دوارۆ نامۆ بوو، لە هەرچی شتە بزر بوو، لە هەرچی شتە سڕایەوە، بۆیە دونیا لە خزمەتیدا راوەستاوە، دەبینێت خزمەتی خێزانەکەی دەکات، وەستاوە و چاوەڕوانی کارێکە بەسەریدا بدرێت، بەڵام خاڵی لە جوانی و زرق و برقەکانی کە لەلای رۆڵەکانی دونیا نمایشی دەکات، بۆیە بەو جۆرەی لێکراوە تاکو لای بەلادا نەکاتەوە وەك لاکردنەوەی

شـاژنێك كاتێـك كەسـێكی خۆشـدەوێت هەدیـەی بـە دەسـتی پیرەژنـان و جاریـە ڕەشپێستەكان بۆ ڕەوانە دەكات، ئەوەش بۆ پارێزگاری لە دڵی ئـەو و غـیرەت لەسـەر ئەو، بە هەموو بوونتەوە ڕوو لە پـەروەردگارت بكـە، واز لـە سـبەینێ بهێنـە لـە پـاڵ دوێنێدا، لەوانەیە سبەینێ بێت و تۆ مردبیت.

تۆ ئـەی دەوڵەمەنـد بـە فـەنابوونت لـە مـاڵ و سـاماندا لـە خـودا سـەرقاڵ مەبـە، لەوانەیە سبەینێ بێت و تۆ هەژار بیت، لەگەڵ شت مەبە، بەڵكو لەگـەڵ دروسـتكەری شت بە كە بریتییە لە شتێك هیچ شـت لـە ئـەو ناچێت، داوای ئاسـوودەیی لـە هـیچ كەسێكی تر مەكە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((ئاسوودەیی بـۆ بـاوەڕدار نییـە تـا نەگات بە لیقای پەروەردگاری))[1].

گەر ئەوەی لە نێوان تۆ و خەڵكیدایە وێران بوو و ئەوەی لە نێوان تۆ و پەروەردگاردایە ئاوەدان بوویەوە ئەوا ئەو بۆ تۆی هەڵبژاردووە، بۆیـە هەڵبـژاردنی ئـەوت لا ناپەسـەند نەبێت، هەركەس لەگـەڵ حـەق(عزوجل) ئـارام بگرێـت لـە لـوتفی سەرسـوڕهێنی ئـەو دەبینێـت، هەركـەس لەسـەر هـەژاری ئـارام بگرێـت دەوڵەمەنـدی ڕووی لـێ دەكـات، پێغەمبەرایەتی بەزۆری لە شوانان بووە و ویلایەتیش بە زۆری لە كۆیلەكان و غەریبان بووە، هەتا بەندە بۆی گەردنكەچ بێت عیززەتی زیاتری پێ دەدات، هەتا بەندە بۆ ئەو تەوازوع بنوێنێت بەرزی دەكاتەوە، ئەو(سبحانه وتعالی) "المعز والمذل والرافع والواضع والموفق والمسهل-عیززەتبـەخش و زەلیكـەر و بەرزكـەرەوە و نزمكـەر و تەوفیقـدەر و ئاسانكەر"ە، گەر ئەو نەبوایە ئێمە نەماندەناسی، ئەی ئەوانەی بـە كارەكـانی خۆتـان سەرسامن، چەندە ئێوە نەزانن! گەر كۆمەكی و یارمەتی خودا نەبوایە نە نوێژتان دەكرد و نەڕۆژوو و نە ئارامگرتن، ئێوە لە مەقامی شوكردان و دەبـێ شـوكر بكـەن نـەك لـە مەقامی خۆپەسەندی(عجب)دا، زۆربەی بەنـدەكان بـە عیبـادەت و كاروكردەوەكـانی خۆیان سەرسـامن، داوای مەدح و سەنا لە خەڵكی دەكەن، حەزیان لەوەیە ئەهلی دونیا و ئەربابی دونیا ڕوویان لێ بكات، هۆی ئەوەش وەستانیانە لەگەڵ نەفس و ئارەزوویاندا،

---

[1] تقدم تخريجه.

دونیا مەحبووبەی نەفسە و دوارۆژیش مەحبووبەی دڵ، بەڵام حەق(عزوجل) مەحبووبی نهێنی و پەنهانە، کاتێك حوکم هەڵدەدرێتە ناو دڵتانەوە-لە دوای دامەزرانی حوکم حیکمەت هەڵدەدرێتە دڵتانەوە، چونکە حوکم پێشەکی ئەو کارەیە، بۆیە هەر کەس بانگەشەی شتێك لەوەی کرد بەبێ جێبەجێ کردنی حوکمەکان ئەو کەسە درۆی کردووە، چونکە هەر حەقیقەتێك شەریعەت شایەتی بۆ نەدات بریتییە لە زەندەقە، بە باڵی کیتاب و سوننەت بفڕە بۆ لای حەق(عزوجل)، بچۆ ژوورەوە بۆ لای خودا و دەستت لە دەستی پێغەمبەردا(ﷺ) بێت، پێغەمبەر(ﷺ) بکە بە وەزیر و مامۆستای خۆت، لێگەڕێ دەستی ئەو(ﷺ) جوانت بکات و قژت شانە بکات و بتبات بۆ لای خودا(عزوجل)، ئەو لە نێوان رۆحەکاندا دادوەرە، پەروەردکاری موریدانە، ئەمیری صالحانە، لە نێوانیاندا حاڵ و مەقام دابەشکەرە، چونکە حەق(عزوجل) ئەوەی داوەتە دەستی ئەو، ئەوی کردووە بە ئەمیری هەموان، کاتێك پۆشاك لە مەلیکەوە بۆ سەربازەکان دەڕوات دابەشکردنی دەدرێتە دەست ئەمیرەکەیان، یەکتاپەرستی عیبادەتە و هاوەڵدانان بە دروستکراو عادەتە، پابەندی عیبادەت ببە و واز لە عادەت بهێنە، خۆت بگۆڕە تا خودا بۆت بگۆڕێت، خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾ الرعد: ١١

**نەفسی خۆت و دروستکراو لە دڵ دەربکە**، دڵ بە بەدیهێنەرەکەی پڕ بکە تاکو بەدیهاتن رووت لێ بکات، ئەم کارە بە رۆژ رۆژگرتن و بە شەو نوێژکردن بەدەست نایەت، بەڵکو بە پاکێتی دڵ و بێگەردی نهێنی.

**لە یەکێك لە خوداناسانەوە(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت:** رۆژ و شەونوێژ سرکە و پاقلەی سەر سفرەن، خواردنەکە شتێکی ترە جگە لەو دوانە، ئەوەش بریتییە لە صدق، ئەو دوانە خۆراکی پەکەمجارن(شۆربای پێش هاتنی خواردنن)، پاشان جۆرێکی تر و رەنگێکی تر لە خواردن دێت لەدوای ئەو رەنگانە، پاشان خواردن، پاشان دەست و دەم شۆرین، پاشان لیقای خودا(عزوجل)، پاشان پۆشینی پۆشاك و پێدانی مولك و ئەمارەت و نوێنەرایەتی و رادەستکردنی وڵات و قەڵاکان، گەر دڵی بەندە بۆ

حەق(عزوجل) بێتە راستە و لە نزیکی خوداوە دامەزرا -لە هەموو وڵاتەکانی سەر رووی زەوی- مەملکەت و دەسەڵاتی پێ دەدرێت، بڵاوەپێکردنی بانگەوازی بەناو خەڵکیدا رادەست دەکرێت، لەسەر ئازارەکانیان ئارام دەگرێت و گۆڕینی باتڵ و دەرخستنی حەقی رادەست دەکرێت، خودا پێی دەبەخشێت و بێنیازی دەکات، چونکە کاتێک خودا دەبەخشێت بێنیازی دەکات، و ناوەوەی پڕ دەکات لە حیکمەت، خودا(عزوجل) لە زەمینەی دڵی بەندە صالحەکان و عاریفاندا چەندین رووباری حیکمەتی داناوە، لە دۆڵی زانستی خوداوە لە لای عەرش و لەوحی خۆیەوە هەڵدەقوڵێن و جاریدەبن بۆ زەوییەکانی دڵە مردووە نەزانەکان بە خودا و پشتهەڵکەران لە ئەو.

ئەی گەنج، خواردنی حەرام دڵت دەمرێنێت و خواردنی حەڵاڵ دڵت زیندوو دەکاتەوە، پارووییەک دڵت نوورانی دەکات و پارووییەک دڵت پڕ لە تاریکی دەکات، پارووییەک بە دونیاوە سەرقاڵت دەکات و و پارووییەک بە دوارۆژەوە، پارووییەک لە دونیا و دوارۆژ زوهدت پێ دەکات و پارووییەکیش هانت دەدات بۆ هەنگاوهەڵگرتن بەرەو دروستکەری دونیا و دوارۆژ، خواردنی حەرام بە دونیاوە سەرقاڵت دەکات و یاخیبوونت لا شیرین دەکات، خواردنی موباحیش بە دوارۆژەوە سەرقاڵت دەکات و گوێڕایەڵیت لا شیرین دەکات، خواردنی حەڵاڵیش دڵت لە مەولا(عزوجل) نزیک دەکاتەوە، ئەم خواردنانە تەنها بە ناسینی حەق(عزوجل) دەناسرێن، ناسینی خوداش لە دڵدایە نەک لەناو پەرتووکەکاندا، لە خوداوەیە نەک لە دروستکراوی خوداوە، ناسینی خودا(عزوجل) لەدوای کارکردن بە حوکمەکانی بەدەستدێت، لەدوای بەراستزانین و صدق، لەدوای یەکتاپەرستی بۆ خودا(عزوجل) و متمانە بە ئەو، لەدوای دەرچوون لە کۆی دروستکراوەکان، چۆن خودا دەناسی لە کاتێکدا تۆ تەنها ئەوە دەناسیت کە دەیخۆیت و دەیخۆیتەوە و دەیپۆشیت و هاوسەری لەگەڵ دەکەی و گوێی پێ نادەی لە هەر رێگەیەکەوە بێت، گوێت لە فەرموودەکەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەبووە کە دەفەرموێت: ((هەرکەس پاکێکی بەوە نەبێت خۆراک و خواردنەوەی لەکوێوەیە خوداش پاکێکی نابێت لە کام دەرگای دۆزەخەوە دەیباتە ناو ئاگرەوە))[1].

---

[1] ذكره الغزالي في "الإحياء" وقال مخرجه العراقي: اخرجه الديلمي في المسند.

**دوای ئەم قسانە شێخ عبدالقادر(خودا لێی رازی بێت) فەرمووی:**

گوێ بە هیچ شتێك مەدە و ناو لە هیچ شتێك مەنێ، هیچ شتێك بە خوداوە خەریکت نەکات، دروستکراو لە خودا سەرقاڵت نەکات، بەڵام قسەیان لەگەڵ دەکەی بۆ ئەوەی ئاقڵ بن و چاکەیان لەگەڵ دەکەی بە هەڵکردن لەگەڵیان، بە فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) کاردەکەی کە دەفەرموێت: ((هەڵکردن لەگەڵ خەڵکی صەدەقەکردنە))[1].

لە بەخششی پەروەردگارت(عزوجل) بەشیان دەدەی، شتێك لەو رێزەی خودا لە تۆی ناوە بە ئەوانی دەبەخشی، بەزەییت پیایاندا دێتەوە لەگەڵیان بە لوتف دەبیت، نەرمونیان لەگەڵیان مامەڵە دەکەی، ئەخلاقت وەك ئەخلاقی حەقی(عزوجل) لێدێت، کردارەکانت لە فەرمانی ئەوەوە دەبن، مورشید دوو جۆرە: مورشیدی حوکم(زانستی شەریعەت) و مورشیدی زانست(زانستی دڵ)، مورشیدێك لە دروستکراو دەرگای نزیکی لە خودات(عزوجل) پێنیشان دەدات، دوو دەرگا هەر دەبێت لێیانەوە بچییە ژوورەوە: دەرگای دروستکراو و دەرگای دروستکەر، دەرگای دونیا و دەرگای دواڕۆژ، یەکێکیان بەدوای ئەویتریاندا دێت، یەکەمجار دەرگای دروستکراو و دووەمجار دەرگای دروستکەر، تا دەرگای یەکەم نەبڕیت دەرگای دووەم نابینیت، دڵت لە دونیا بهێنە دەرەوە تا بچییە ناو دەرگای دواڕۆژەوە، خزمەتی مورشیدی حوکم بکە تا بتگەیەنێت بە مورشیدی زانست، لە دروستکراو وەرە دەرەوە تا دروستکەر(عزوجل) بناسیت، ئەمانە پلەی جۆراوجۆرن، پلە لەدوای پلە، ئەو دوانە دژ بەیەکترن و کۆنابنەوە، ئەم شتانە دژ بەیەکترن و هەوڵی کۆکردنەوەیان مەدە، چونکە بەرچنگت ناکەون، ئەو دڵەت کە خانەی خودایە(عزوجل) مەیبەخشە بە کەسانی تر، گەر فریشتەکان نەچنە ماڵێکەوە وێنەی تێدا بێت ئەی چۆن حەق(عزوجل) دێتە ناو دڵتەوە لە کاتێکدا ئەو هەموو وێنە و بتانەی تێدایە، هەرچی شتی تر جگە لە خودا بریتییە لە بت، ئەم خانەیە پاك بکەرەوە ئامادەبوونی خاوەنەکەی تێدا دەبینیت، شتی سەرسوڕهێن دەبینیت کە پێشتر نەتبینیوە.

---

[1] رواه ابن حبان في صحيحه وابو نعيم في "الحلية".

خودایه سەرکەوتوومان بکە بۆ کارێك تۆ لێمان رازی بیت.

﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾﴾

البقرة: ٢٠١



# مەجلیسی چل و پێنج

## دەستگرتن بە گرێ( قوڵف )ی نەپساوەوە

سەرلەبەیانی لە مەدرەسەکەی ٢٦/رەجەب/٥٤٥ھ فەرمووی:

**لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی:** ((نەفرەتلێکراوە، نەفرەتلێکراوە، هەرکەس متمانەی بە دروستکراوێکی وەك خۆیەتی))[١].

زۆرن ئەوانەی چوونەتە ناو ئەم نەفرەتەوە، تەنها یەکێك لە ژمارەیەکی زۆر متمانەی بە خودایە، هەرکەس متمانەی بە خودا بێت:﴿فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ﴾ البقرة: ٢٥٦

هەرکەسیش خۆی بە دروستکراوێکی هاوشێوەی خۆی ببەستێتەوە و متمانەی دڵی خۆی پێبدات ئەوا وەك ئەو کەسە وایە چنگی بە ئاودا کردبێت کاتێك دەستی دەکاتەوە شتێکی تێدا نابینێتەوە.

**هاوار بە حاڵت،** دروستکراو رۆژێك، دوان، سیان، مانگێگ یان ساڵێك یان دوو ساڵ پێویستییەکانی تۆ جێبەجێ دەکات، بەڵام لە کۆتاییدا لێت بێزار دەبێت، هاوەڵی حەق بکە و پێویستییەکانت لای ئەو دابنێ ئەو لە تۆ بێزار نابێت و لە پێویستییەکانی دونیا و دوارۆژت شەکەت و ماندوو نابێت، کەسی یەکتاپەرست لەپای هێزی یەکتەپەرستییەکەی باوك و دایك و خانەوادە و دۆست و دوژمن و ماڵ و پلە و پایەی بۆ نامێنێتەوە، بەگشتی سوکنایی بۆ لای هیچ شتێك نییە، تەنها پەیوەستبوونی بە دەروازەی حەق و مەنەتباری حەقەوە(عزوجل) بۆ دەمێنێتەوە، ئەی ئەو کەسەی متمانەی دڵی خۆت داوە بە دینار و درهەمەکانی ناو دەستت بەم نزیکانە لەدەستت

[١] لم اجد له اصلا.

دێنە دەردەوە و تیا دەچن وەك سزایەك بۆ تۆ، پێشتر لە دەستی کەسانی تردا بوون و لەدەستیان دەرهێنران و رادەستی تۆ کران بۆ ئەوەی کۆمەکیان لێ وەربگریت بۆ گوێڕایەڵی کردنی مەولای خۆت، بەڵام تۆ ئەو دوانەت کرد بە بتی خۆت، ئەی ئەزان زانست تەنها بۆ رووی پاکی خودا فێربیە و کاری پێ بکە، چونکە زانست ئەدەبت دادەدات، زانست ژیانە و نەزانی مردنە، راستگۆ ئەو کەسەیە گەر لە فێربوونی زانستە گشتییەکە تەواو بوو دەچێتە ناو زانستی تایبەتەوە، زانستی دڵ و نهێنی، گەر لەم زانستەدا دامەزرا و بەهێز بوو دەبێت بە دەسەڵاتی ئایینی خودا(عزوجل)، فەرمان دەکات و رێگری دەکات، دەبەخشێت و دەگرێتەوە، ئەمەش بە مۆڵەتی ئەو کەسەی دەسەڵاتی بە ئەو بەخشیوە، دەبێت بە دەسەڵاتدار لەناو دروستکراواندا و بە فەرمانی خودا فەرمان دەکات و بە نەهی ئەو نەهی دەکات، بە فەرمانی ئەو لێیان وەردەگریت و بە فەرمانی ئەو پێیان دەبەخشێت، ئەوکات بە حوکم(بە فەرمانی شەریعەت) لەگەڵ ئەوان دەبێت و بە زانست(زانستی دڵ) لەگەڵ خودا دەبێت، حوکم دەرگاوانە لە دەرگەکەدا، زانستیش لەناو خانووەکەدایە، حوکم گشتییە و زانست تایبەتە، عاریف لەبەردەم دەرگای حەقدا(عزوجل) راوەستاوە و زانستی ناسین و ئاگاهی پەیدا کردووە بەسەر کۆمەڵێك شتدا کە پێشتر ئاگاهی لێی نەبووە، بە بەخشین فەرمانی پێ دەکرێت و دەبەخشێت، بە گرتنەوە فەرمانی پێدەکرێت و دەگرێتەوە، بە خواردن فەرمانی پێ دەکرێت و دەخوات، بە پەرستنی فەرمانی پێ دەکرێت و خۆی و ئەوان بەرسی دەکات، فەرمانی پێ دەکرێت بە رووکردنە کەسێك و پشتهەڵکردن لە کەسێکی تر، فەرمانی پێ دەکرێت بە وەرگرتن لە کەسێك و وەرنەگرتن لە کەسێکی تر، سەرکەوتوو ئەو کەسەیە خودا سەرکەوتووی دەکات، و رسوا و شەرمەزار ئەو کەسەیە خودا(عزوجل) رسوا و شەرمەزاری دەکات، خوداناسان بۆ ئێوە دێن بۆ لاتان نەك بۆ پێویستییەکانی خۆیان، هیچ پێویستییەکیان لەلای دروستکراوێك نییە، لە پەت و داوی خەڵکی قوتاریان بووە، و لە کۆشك و تەلاری ئەوان بەرزبوونەتەوە و بەزەییان بە حاڵیاندا دێتەوە، ئەوان لە دونیا و دواڕۆژدا مەرتانی حەقن(عزوجل)، ئەوەی لە ئێوە وەریدەگرن بۆ خۆتانە نەك بۆ ئەوان، کاریان ئامۆژگاری کردنی خەڵکی و بەردەوامبوونە لەسەری،

چونکە ئەو شتەی لە خوداوە بێت بەردەوام و جێگیر دەبێت، ئەوەش لە کەسانی ترەوە بێت بەردەوام و جێگیر نابێت، خزمەتی زانست و زانایانی کارکەر بکەن و لەسەر ئەوە ئارام بگرن، گەر یەکەمجار لەسەر خزمەتی زانست ئارامت گرت ئەوا هەردەبێت ئەویش دووەمجار خزمەتت بکات، ئارام بگرە لەسەر خزمەتکردنت وەك چۆن ئارامتگرت لەسەر خزمەتکردنی، گەر لەسەر خزمەتی زانست ئارامت گرت فیقهی دڵ و نووری ناوەوەت پێ دەدرێت.

**خەڵکینە**، کاروبارەکانتان رادەستی حەق(عزوجل) بکەن، ئەو لە ئێوە بە ئێوە زاناترە، چاوەڕوانی دەروویەك بن، چونکە لە ساتێکەوە بۆ ساتێکی تر دەروو بەڕوودا دەکرێتەوە، خزمەتی حەق(عزوجل) بکەن و لە دەرگای ئەو بدەن و دەرگاکانی دروستکراو داخەن، ئەو(سبحانە وتعالی) شتێکی سەرسوڕهێنی واتان نیشان دەدات بەبیرتان نەهاتبێت.

**هاوار بە حاڵت**، گەر خودا(عزوجل) بیەوێت لەسەر دەستی دروستکراو سوودت پێ بگەیەنێت سوودت پێ دەگەیەنێت، ئەگەر ویستی لەسەر دەستی ئەوان زیانت پێ بگەیەنێت ئەوا ئەو کارە روودەدات، تەنها خودایە رامهێنەر و دڵ نەرمکەر و دڵ رەقکەر، ئەو زیندووکەرەوە و مرێنەرە، ئەو بەخشەر و پێنەدەرە، ئەو عیززەتبەخش و زەلیلکەرە، ئەو نەخۆشکەر و شیفابەخشە، ئەو تێرکەر و برسیکەرە، ئەو پۆشتەکەر و رووتکەرەوەیە، ئەو چاکەکار و نامۆکەرە، ئەو یەکەمین و دواهەمین و ئاشکرا و پەنهانە، هەموو ئەوانە بریتین لە ئەو نەك کەسانی تر، بە دڵ ئەم باوەڕەت هەبێت و لە دەرەوەت بە جوانی و بە باشی مامەڵەی دروستکراوەکان بکە، ئەمەش بریتییە لە کاری صالحانی تەقوادار، لە هەموو حاڵ و بارێکیاندا لە خودا دەترسن و پارێزگاری دەکەن و بە رەوشتی جوان و بەرز لەگەڵ خەڵکی هەڵدەکەن، بە رەوشتی کیتاب و سوننەت ئەوەی بەدڵ لێی تێگەیشتوون قسە بۆ خەڵکی دەکەن، بەوەی لەناو کیتاب و سوننەتدایە فەرمان بە خەڵکی دەکەن، گەر قبوڵیان کرد لەسەر ئەو کارە شوکریان دەکات، گەر لێی هاتنە دەرەوە ئەوا دۆستایەتی و خۆشەویستی لە نێوان ئەو و ئەواندا نامێنێت، بۆ فەرمانی خودا و نەهی خودا لەلای خەڵك خۆیان ناشیرین دەکەن، دڵت

بکه به مزگەوت لەگەڵ خودا بانگ لە کەسێکی تر مەکە و هاوەڵی بۆ دامەنێ، خودا(عزوجل) دەفەرموێت:﴿ وَأَنَّ الْمَسَاجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا مَعَ اللَّهِ أَحَدًا ﴿١٨﴾ ﴾ الجن: ١٨

گەر پلەی ئەم بەندەیە لە ئیسلامەوە بۆ ئیمان و لە ئیمانەوە بۆ یەقین و لە یەقینەوە بۆ ناسین و لە ناسینەوە بۆ زانست(زانستی دڵ) و لە زانستەوە بۆ خۆشەویستی و لە خۆشەویستییەوە بۆ مەحبوبیەت(واتە لە داواکردنی خوداوە ببێت بە داواکراوی خودا) بەرزبوویەوە ئەوکات گەر بێئاگایی رووی لێکرد وازیلێناهێنن و گەر لەبیریچوو بیریدەخەنەوە، گەر نووست بەئاگای دەهێنن، گەر پشتی هەڵکرد دەیهێننەوە، گەر بێدەنگ بوو دەیهێننە قسە، بۆیە بەردەوام بەئاگا و پاك و بێگەرد و پاڵفتە دەبێت، چونکە دەفری دڵی پاك و بێگەرد و پاڵفتە بووە و لە دەرەوە ناوەوەی دەبینرێت، ئاگاهی لە پێغەمبەرەکەیەوە(ﷺ) بەمیراتگرتووە، ئەو(ﷺ) چاوەکانی دەنووستن، بەڵام دڵی بەئاگابوو، ئەو(ﷺ) لە پشتەوە دەیبینی وەك چۆن لە پێشەوە دەیبینی، هەر کەسێك ئاگاهییەکەی بەپێی حاڵی خۆیەتی، هیچ کەس ناگاتە ئاگاهی پێغەمبەر(ﷺ) و کەسیش ناتوانێت لە تایبەتمەندییەکانی ئەودا بەشدار بێت، بەڵام ئەبدال و ئەولیا لە ئومەتی پێغەمبەر(ﷺ) دەکەون بەسەر پاشماوەی خۆراك و خواردنەوەی ئەودا، دڵۆپێك لە دەریای مەقاماتی ئەو و گەردیلەیەك لە چیای کەراماتی ئەویان پێدەبەخشرێت، چونکە ئەوان لەدوای پێغەمبەرەوەن(ﷺ)، دەستیان بە ئایینەکەی ئەوەوە گرتووە و ئەو سەردەخەن و خەڵك بۆ لای ئەو(ﷺ) رێنموونی دەکەن و زانستی ئایین و شەرعەکەی بڵاودەکەنەوە(صەلات و سەلامی خودا لەسەر ئەو و هەموو میراتگرانی هەتا رۆژی دوایی)، باوەڕدار چاوێکی دایە دونیا و دەستی بۆ برد و داوای کرد و دڵی بەوە پڕ بوو، دونیا ویستی بیکات بە بەندەی خۆی، بۆیە دونیای تەڵاقدا، و پاشان کەوتە داوای دوارۆژەوە، ئەویشی بینییەوە و دڵی بە دوارۆژ پڕ بوو، ترسا دوارۆژ کۆتوبەندی بکات و بیخاتە بەندیخانەی خۆیەوە و لە پەروەردگار دایبڕێت، بۆیە ئەویشی تەڵاقدا و لە تەنیشت دونیاوە دایناو فەرزی دوارۆژی جێبەجێ کرد و روویکردە دەرگای حەق(عزوجل)، لەوێ رەشماڵی هەڵدا و لەبەر دەرگاکەیدا پاڵیدایەوە، شوێنی ئایینی ئیبراهیمی خەلیل(علیه السلام) کەوت، یەکجار لە هەسارە و پاشان

لە مانگ و ئەوجا لە خۆر بێنیاز بوو، پاشان فەرمووی: ﴿لَا أُحِبُّ الْآفِلِينَ ﴿٧٦﴾﴾ الأنعام: ٧٦ ﴿إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ حَنِيفًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿٧٩﴾﴾ الأنعام: ٧٨ - ٧٩

کاتێك پاڵدانەوەی لەبەر دەرگای خودا(عزوجل) درێژەی کێشا لە داواکەیدا بەڕاستی زانی و دەرگای بۆ کردەوە و مۆڵەتی دا بە دڵی بۆ ئەوەی بچێتە ژوورەوە، پرسیاری لێکرد دەربارەی حاڵی و ئەوەی لەگەڵ دونیا بەسەریهاتووە-خودا زاناترە بەوەی بەسەریهاتووە- ئەویش چیرۆکی خۆی بۆ گێڕایەوە، بۆیە خودا(سبحانه وتعالى) لە خۆی نزیککردەوە و هۆگری پێ بەخشی و لەگەڵی کەوتە ئاخافتن و پۆشاکی رازیبوونی خۆی لەبەرکرد و لە حیکمەت و زانستی خۆی لێوانلێوی کرد و داوای دوو تەڵاقدراوەکەی ئەوی کرد(دونیا و دوارۆژ) گرێبەستەکەی لەگەڵیان بۆ نوێکردەوە و پرسێکی لە نێوان ئەو و دونیا و دوارۆژدا نووسی و لەو دوانەی بەمەرج گرت ئازاری نەدەن و بێن بە دوو خزمەتکاری و ماف و بەشی ئەو بە تەواوی بدەن، خودا خۆشەویستی خۆی بەسەر دونیا و دوارۆژدا بۆ ئەو داباراند و کارەکە لەپێناوی ئەودا وەرگەڕا، مانەوەی دڵی تەنها لەلای پەروەردگارە و جگە لە ئەو هەموو شتێکی تر وەلانرا، بوو بەندەیەکی ئازاد، بەندەیەك بۆ خودا(عزوجل) و ئازاد لە هەر شتێکی تر و رەها لە زەوی و ئاسمان، هیچ شتێك ناتوانێت بیکات بە بەندەی خۆی، بەڵکو ئەو شتەکان دەخاتە ژێر دەستی خۆیەوە، ئەو بوو بە موڵکێك تەنها مەلیك دەتوانێت موڵکداری بکات، دەرگاکە بە رووی ئەودا کراوەتەوە بە مۆڵەتی خودا، نە دەرگاوان و نە رێگر بوونیان نییە.

ئەی گەنج، ببە بە خزمەتکاری خوداناسان، چونکە دونیا و دوارۆژ خزمەتیان دەکات، هەر کات بیانەوێت بە مۆڵەتی حەق(عزوجل) لە دونیا و دوارۆژ وەردەگرن، ژنێمەیەك لە دونیا و مانایەك لە دوارۆژتان پێ دەدەن، خودایە لە دونیا و دوارۆژدا ئێمە بەوان بناسێنە و ئەوان بە ئێمە بناسێنە.

## شوێنکەوتنی پێغەمبەر( صلی الله علیه وسلم )

بەیانی رۆژی یەکشەممە ٢٨/رەجەب/ ٥٤٥ه فەرمووی:

دونیا بازاڕێکە بەم نزیکانە دادەخرێت، دەرگاکانی بینینی دروستکراو دابخەن و دەرگای بینینی حەق(عزوجل) بکەنەوە، لەباری پاڵفتەبوونی دڵ و نزیکی نهێنی لە خوداوە -لەوەی تایبەتە بە ئێوە- دەرگای کەسابەت و هۆکار دابخەن، نەك ئەوەی پەیوەندی بە کەسابەت بۆ خانەوادە و شوێنکەوتووانەوە هەیە، با کەسابەتەکەتان بۆ کەسانی تر بێت(خانەوادە و شوێنکەتووان)، با سوود و قازانج و بەدەستهێنانتان بۆ کەسانی تر بێت، ئەوەی تایبەتە بە خۆتان لە نەسیمی فەزڵی خودا داوای بکەن. نەفستان لەگەڵ دونیا دابنێن و دڵتان لەگەڵ دوارۆژ و نهێنیتان لەگەڵ مەولا(عزوجل). تۆ دەزانی چیت دەوێت.

**هەروەها فەرمووی:**

خوداناسان ئەبدالی پێغەمبەرانن، بۆیە ئەوەی فەرمانتان پێ دەکەن بە فەرمانی خودا و پێغەمبەر(ﷺ) و نەهیتان لێ دەکەن بە نەهی خودا و پێغەمبەر(ﷺ) ئێیان وەربگرن و قبوڵی بکەن، ئەوان دەهێنرێنە قسە و قسان دەکەن، پێیان دەبەخشرێت وەریدەگرن، بە سروشت و نەفسەوە جووڵەیەك ئەنجام نادەن، ئارەزووی خۆیان لە دینی خودادا ناکەن بە هاوەڵی خودا، شوێنی پێغەمبەر(ﷺ) کەوتن لە گوفتار و کرداریدا. گوێیان لەم ئایەتە پیرۆزە بوو کە دەفەرموێت:

﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟﴾

الحشر: ٧

شوێنی پێغەمبەر(ﷺ) کەوتن تا ئەوانی گەیاند بە خودا(سبحانه وتعالی)، لە پێغەمبەر(ﷺ) نزیکبوونەوە تاکو لە خودا نزیکی کردنەوە، نازناو و پۆشاک و ئیمارەت و سەڵتەنەتی لەناو خەڵکیدا پێ بەخشین، ئەی دووڕوان واتان دانا ئایین سووک و ئاسان بێت و کارەکە هەوانتە و بێ مانا بێت، ئێوە و شەیتانەکانتان و هاودەمە خراپەکانتان ڕێز و پلە و پایەتان بۆ نییە.

خودایە، تەوبە لە من و لە ئەوان قبووڵ بفەرموو، خودایە لە زەلیلی دووڕوویی و کۆتوبەندی هاوەڵدانان ڕزگاریان بکە، خودا(عزوجل) بپەرستن و بە کەسابەتی حەڵاڵ داوای کۆمەکی لێ بکەن لەسەر بەندایەتی کردنی، خودا(عزوجل) بەندەیەکی باوەڕداری گوێڕایەڵی حەڵاڵخۆری خۆشدەوێت، ئەو کەسانەی خۆشدەوێت دەخۆن و کاردەکەن، ڕقی لەوانەیە دەخون و کارناکەن، ئەو کەسەی خۆشدەوێت بە کەسابەتی دەستی خۆی دەخوات و ڕکی لەوانە دەبێتەوە بە دووڕوویی دەخۆن و شان لەسەر خەڵکی دادەدەن، یەکتاپەرست بۆ خودای خۆشدەوێت و ڕکی لە هاوەڵدانەرە، خۆڕادەستکەر بە خودای خۆشدەوێت و ڕقی لە کێبەرکێکارە لەگەڵ خودا، لە مەرجی خۆشەویستی تەباییە، لە مەرجی دوژمنایەتیش سەرپێچییە، خۆتان ڕادەستی پەروەردگارتان بکەن، و بە تەگبیرەکانی ڕازی بن لە دونیا و دوارۆژدا، ڕۆژگارێك بە بەڵایەك تاقیکرامەوە، داوام لە خودا کرد بەڵاکەم لەسەر هەڵبگرێت، بەڵایەکی تری بۆ خستمە سەر بەڵاکەی پێشوو، لەمەدا تووشی سەرسوڕمان بووم، گوێم کەسێك بوو پێی وتم: ئایا لە سەرەتاوە بە ئێمەت ئەوت حاڵی تۆ بریتی دەبێت لە حاڵی خۆڕادەستکردن، بۆیە ئەدەبی دادام و بێدەنگ بووم.

هاوار بە حاڵت، بانگەشەی خۆشەویستی خودا(عزوجل) دەکەی و کەسانی ترت خۆشدەوێت، تەنها خودا پاك و بێگەردە و کەسانی تر لیل و لیخنن، گەر پاك و بێگەردیت بە لێڵی و لیخنی کەسانی تر گۆڕییەوە لێڵی و لیخنیت بەسەردا دادەبارێنێت، ئەوەی بە ئیبراهیمی خەلیل و یەعقووبی(علیهما السلام) کرد بە تۆشی دەکات، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) مەیلی بەخشی بە دوو کوڕەکەی فاتیمە(خودا لێی ڕازی بێت) جبریل(علیه السلام) هات بۆ لای و پرسی: خۆشتدەوێن؟ فەرمووی: بەڵێ،

جبریل فەرمووی: ((بزانە، یەکێکیان ژەهرخوارد دەکرێت و ئەویتریان دەکوژرێت))[1]، بۆیە هەردووکیانی لە دڵ دەرکرد و دڵی بۆ مەولای خۆی(عزوجل) خاڵیکردەوە، ئەوکات دڵخۆشی بەو دوانەوە بوو بە دڵتەنگی لەسەریان، خودا(عزوجل) خاوەنی غیرەتە بۆ دڵی پێغەمبەران و ئەولیا و بەندە صاڵحەکان، ئەی ئەو کەسەی بە دووڕووییەکەی داوای دونیا دەکات دەستت بکەرەوە هیچی تێدا نابینیتەوە.

**هاوار بە حاڵت،** وازت لە کەسابەت هێناوە و دانیشتووی بە دینەکەت ماڵ و سامانی خەڵکی دەخۆیت، کەسابەت کاری هەموو پێغەمبەران(علیهم السلام) بووە، هەر پێغەمبەرێك پیشەیەکی هەبووە، دواجار لەگەڵ ویست و کرداری ئەو(سبحانه وتعالی) لە ئەواندا و بە ئەوان دەسوڕێنەوە، لە ئەواندا و لە کەسانی تردا بۆ خودا کێبەرکارێك بوونی نییە، لە زۆر و کەم و بەرز و نزمدا بەرهەڵستی خودا(عزوجل) ناکەن، بە خزمەتی کردنی نەفسی خۆت و هەڵپە بۆ گەیشتن بە مەرامەکان لە خودا سەرقاڵ مەبە، دۆستانی خودا(عزوجل) لە زۆرلەخۆکردنی داوادان لە دروستکراو-بەبێ بوونی پێویستی بەوان- بەڵام بەوە ئیلهامیان بۆ کراوە وەك بەزەییەك بۆ دروستکراو، ئەو بە نەفسەوە و بۆ نەفسی خۆی لەوان داوا ناکات، نەفسی ئەو ئارام و دڵنیابووەتەوە و ویست و حەزی نەماوە لەوەی لە دونیا رووی لێ دەکات، وا دادەنێیت نەفسی ئەو وەك نەفسی نەزانی تۆ وایە کە بۆ خزمەتکردنی خۆت یەکلاکردووەتەوە و بۆ ویست و ئارەزووی ئەو سەرقاڵی، گەر تۆزێ ژیریت هەبوایە پشتت لە خزمەتکردنی دەکرد و خۆت بە خزمەتی پەروەردگارەوە(عزوجل) خەریك دەکرد، نەفست دوژمنی تۆیە، دروست ئەوەیە لە وەڵامدانەوەی بێدەنگ بیت و قسەکانی بکێشیت بە دیواردا، وەك قسەی شێتێکی نەفام و بێ ژیری گوێ بۆ قسەکانی نەفست بگرە، لامەکەرەوە بۆ لای قسە و داوای ئەو، لامەکەرەوە بە لای حەز و چێژ و تورەهاتی ئەودا، تیاچوونی تۆ و ئەو لە قبوولکردنی قسە و داواکانیدایە، و چاکبوون و رزگاربوونی تۆ و ئەو لە سەرپێچیکردن لەو نەفسەدایە، گەر بۆ خودا نەفس ملکەچ بوو رۆزییەکەی لە هەموو

---

[1] رواه البزار بسند رجاله ثقات والطبراني في الكبير بزيادة

شوێنێکەوە بە تێروتەواوی رووی لێ دەکات، بەڵام گەر یاخیبوو و ملهوڕی نواند هۆکارەکانی لێ دەبڕێت و ئازارەکانی بەسەردا زاڵ دەکات و تیادەچێت، و دەبێتە زیانۆمەندی دونیا و دوارۆژ، خاوەنی نەفسی گوێڕایەڵی ملکەچی رازی روو لە هەرکوێیەك بکات خزمەتی دەکرێت و دەگات بەو بەشەی پێی رازییە، ئەوەی لەسەری پێویستکراوە بە دڵی گوشادەوە و بەبێ زۆرلەخۆکردن جێبەجێی دەکات، لە هەرچی شتی تر جگە لە خودا دڵی خاڵی کردووەتەوە، ئەندامەکانی لە ماندووبوون رەخساون بۆ بەدەستهێنانی دونیا و زیادەڕەوی لە دونیا، ئەی ئەو کەسەی نیعمەتی خودات بەسەرەوەیە، شوکری نیعمەتەکان بکە، ئەگینا لەدەستت دەردەهێنرێت، مردوو ئەو کەسەیە لە خودا بێئاگا و مردووە با لە دونیاشدا زیندووش بێت، ژیانی چ سوودێکی بۆ ئەو دەبێت لە کاتێکدا بۆ بەدەستهێنانی حەز و چێژ و تووڕەهات بەختی دەکات، بۆیە ئەو لەڕووی ماناوە مردووە نەك رووالەت(وێنە).

خودایە بە خۆتەوە بمانژیێنە و لە هەرچی شتە جگە لە خۆت بمانمرێنە، ئەی ئەو کەسەی لە تەمەندا پیری و لە سروشتدا منداڵی، کەی منداڵی بەجێدەهێڵیت، سروشتت لەپشت شەڕەنگێزی دونیاوەیە، دونیات کردووە بە خەم و خۆزگەی خۆت، تۆ نازانی خەم و خۆزگە پێویستە شتێك بێت بۆ تۆ گرنگ بێت، تۆ بەندەی کەسێکی کاروبارەکانی تۆی لەدەستدایە، گەر کاروبارەکانت لە دەستی دونیادا بێت تۆ دەبیت بە بەندەی دونیا، گەر لە دەستی دوارۆژدا بێت دەبیت بە بەندەی دوارۆژ، گەر کاروبارەکانت رادەستی خودا کردبێت کەوابوو تۆ بەندەی خودای(عزوجل)، گەر کاروبارەکانت لە دەستی نەفسدا بێت تۆ بەندەی نەفسی خۆتی، گەر لە دەستی ئارەزوودا بێت تۆ بەندەی ئارەزووی خۆتی، گەر لە دەستی دروستکراودا بێت تۆ بەندەی دروستکراوی، تەماشا بکە و بزانە زۆرینەی کاروبارەکانت رادەستی کێ کردووە و لە دەستی کێدایە، لەناو ئێوەدا کەسانێك هەن دونیایان گەرەکە و کەمێك لە ئێوە دوارۆژیان دەوێت، دانە دانەیەکی دەگمەن لە ئێوە رووی پەروەردگاری دونیا و دوارۆژی دەوێت، هاوەڵی ئەوانە بکەن بە ئەدەبی جوانەوە، بەرهەڵستی و ململانێ و

کێبەرکێیان لەگەڵ مەکەن و بە کەم تەماشایان مەکەن، چونکە کەم دەکەیت و بە کەم تەماشا دەکرێیت، ئەدەبت لەگەڵیان خراپ نەبێت، چونکە تیادەچیت، کەسانێکی ژیر و هۆشمەند بن، ئێوە کردارەکانتان لەسەر حەق(عزوجل) دەژمێرن، بەڵام لەلای ئەو کێشی باڵە مێشوولەیەکیان نییە، مەگەر خاوەنی ئیخلاص بن لە تەنهایی و هەموو حاڵ و بارێکدا، ئەو گەنجینەی هەرگیز کۆتایی پێ نایەت بریتییە لە راستگۆیی و ئیخلاص و ترسان لە خودا(عزوجل) و رجا و گەڕانەوە لە هەموو بارێکدا بۆ لای ئەو، دەست بە ئیمانەوە بگرن، چونکە ئیمان بە هاناتانەوە دێت، گەر یەکێك لەو خوداناسانەت بینی باڵی بۆ رابخە و حاڵی خۆی بدە دەستی خۆی و کێبەرکێ و ململانێی لەگەڵ مەکە، لە ئەو بێدەنگ بە و بە ئەدەبی خراپ ئازاری مەدە و بێدەنگ بە لە شتێك کە تۆ نایزانیت، زانست و رادەستکردن لەو شتانەی نایزانیت بریتییە لە ئیسلام، ئەی ئەو کەسەی یەقینت لاوازە، نە دونیات هەیە نە دوارۆژ، ئەوەش بەهۆی ئەدەبی خراپتەوە لەگەڵ حەق(عزوجل) و تۆمەتدانە پاڵ ئەولیای خودا و ئەبدالی پێغەمبەران(علیهم السلام) ئەوانەی خودا لە جێگەی پێغەمبەران دایناون، ئەوەی پێغەمبەران و صادیقان لە خوداوە شانیان داوەتە ژێری بەسەر ئەوانیشدا دراوە، کار و زانستیان رادەستی خۆیان بکەن، چونکە خودا ئەوانی لە نەفس و ئارەزووی خۆیان فەنا کردووە و لەبەر دەستی خۆیدا بوونی پێبەخشیون و راوەستاوی کردوون، دڵی ئەوانی لە هەرچی شتە جگە لە خودا پاك کردووەتەوە و دونیا و دوارۆژ و دروستکراوی داوەتە دەستیان، هێز و دەسەڵاتی خۆی نیشانی ئەوان داوە و فێری حوکمی خۆی کردوون و بەهێزی کردوون بە خوداوە بۆ ئەوان، وتنی **"لا حول ولا قوة إلا بالله العلي العظيم"** بهێنە راستە، ئەوان لە وتنی ئەمەدا راستیان کرد، بۆیە لە حەوڵ و هێزی خۆیان و حەوڵ و هێزی دروستکراو فانی بوون و دەستیان گرت بە هێزی خوداوە(عزوجل)، مەعاز(خودا لێی رازی بێت) دەیفەرموو: خودایە، گەر ئەوەی من دەمەوێت تۆ ئەوەم پێ ئەنجام نادەی، ئەوا ئارامیم پێ ببەخشە لەسەر ئەوەی تۆ دەتەوێت.

ئەی گەنج، رازیبوون بە بڕیاری خودا خۆشتر و باشترە لە دەستبردن بۆ دونیا لەگەڵ ململانێ و کێبەرکێدا، شیرینی رازیبوون بە بڕیاری خودا لە دڵی صادیقاندا لە

دەستبردن بۆ حەز و چێژەکان شیرینترە، ئەو رازیبوونە لە هەموو دونیا و ئەوەی لە دونیادایە لەلای ئەوان شیرنترە، چونکە ژیان و زیندەگی پڕ دەکات لە پاکی و جوانی، بەگشتی لە هەموو حاڵ و بارەکاندا پێچەوانەی هاورەگەزەکانی خۆیەتی.

بە زمانی زانست و کردار و ئیخلاص قسە بۆ خەلکی بکە، نەك بە زمانی زانست بەبێ کردار، چونکە ئەمە سوودێك بە خۆت و کەسانی تر ناگەیەنێت، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: ((زانست بانگ لە کردار دەکات، گەر وەلامیدایەوە باشە، ئەگەر نە کۆچی لێ دەکات))[1].

بەرەکەتی زانستەکە دەڕوات و وەکو بەلگە بەسەر تۆوە دەمێنێتەوە، دەبێت بە زانایەکی سەرشێت بە زانستەکەی خۆی، درەختەکەی لای تۆ دەمێنێتەوە و بەرەکەی دەڕوات، داوا لە خودا(عزوجل) بکە لەبەر دەستی خۆیدا حاڵ و مەقامت پێ ببەخشێت، گەر ئەوەی پێ بەخشیت داوای لێ بکە حاڵ و مەقامت بشارێتەوە و حەز نەکەیت شتێك لە حاڵ و مەقامت ئاشکرا ببێت، گەر حەزت کرد ئەوەی لە نێوان تۆ و حەقدایە(عزوجل) دەربکەوێت ئەوە هۆیەکە بۆ تیاچوونی تۆ، خۆت بەدووربگرە لە خۆپەسەندی بە حاڵ و کردارەکانت، چونکە گومڕاکەرە و خاوەنەکەی رووبەڕووی خەشمی خودا دەکاتەوە و لەبەر چاوی خودا دەکەوێت، خۆت بەدووربگرە لە حەزی قسەکردن بۆ خەلکی و قبوولکردنی شت لە ئەوان، چونکە ئەوە زیانت پێ دەگەیەنێت و سوودێکت پێ ناگەیەنێت، وشەیەك لە زمانت دەرنەچێت تا دەبێتە فەرمان لەسەرت و لە دلەوە-بە فەرمانێکی پێداگر لە حەقەوە(عزوجل)- روو لە تۆ دەکات، چۆن خەلکی بانگ دەکەیت بۆ مالەکەت و هیچ خواردنێکت بۆ ئامادە نەکردوون، ئەم کارە پێویستی بە بناغەیەکە، پاشان لەدوای ئەوە بینا دروست دەکرێت، زەمینەی دلی خۆت هەلبکۆلە تا ئاوی حیکمەتی لێ هەلدەقولێت، پاشان بە ئیخلاص و تێکۆشان و کرداری چاکە بینا دروست بکە تا کۆشکەکەت بەرز دەبێتەوە، پاشان خەلکی بانگ بکە بۆ لای، خودایە جەستەی کردارەکانمان بە رۆحی ئیخلاص زیندوو بکەرەوە،

---

[1] القلم لغريبه.

گۆشەگیربوون لە خەڵکی چ سوودێك بە تۆ دەگەیەنێت لە کاتێکدا خەڵکی لەناو دڵی تۆدا نیشتەجێ بوون؟ هیچ رێز و حورمەتێك بۆ خۆت و گۆشەگیرییەکەت بوونی نییە، گەر گۆشەگیر بوویت و دروستکراو لەناو دڵی تۆدا هەبوو ئەوا بەبێ ئامادەبوونی هۆگربوون بە خوداوە(عزوجل) بەتەنها دانیشتووی، بەڵکو نەفس و شەیتان و ئارەزوو بوون بە هاودەمی تۆ، گەر دڵت هۆگر بێت بە خوداوە(عزوجل) تۆ خاڵیت لە دروستکراو هەرچەند لەناو هۆز و خانەوادەی خۆدا بیت، گەر هۆگربوون لە دڵدا دامەزرا دیواری بوونت تێکدەشکێنێت و چاوی بەصیرەتت دەکاتەوە و چاکە و کرداری خودا دەبینیت، ئەوکات تەنها بە ئەو(سبحانە وتعالی) رازی دەبیت، هەر کەس لە حاڵێکدا بوو لەگەڵ پابەندبوون بە شەرعەوە و ئاواتی بۆ سەرووتر و خوارتر لەو حاڵە نەخواست و ئاواتی نەبوو تیاچوون یان مانەوەی هەبێت ئەوا ئەو حاڵەی بۆ بەدەستهاتووە، ئەوان بە مۆڵەتی حەق(عزوجل) لە خەڵك وەردەگرن، ئەی مەست و سەرخۆش بە شەرابی دونیا و ئارەزووەکان و هەوەسبازییەکانی بەم نزیکانە لە گۆڕەکەتدا بەئاگا دێیت.



# مەجلیسی چل و حەوت

## کۆچی خەڵکی و رقلێبوونیان لەباری پیسی ناخیاندا

رۆژی سێشەممە لە مەدرەسەکەی سەرەتای شەعبان/٥٤٥هـ فەرمووی:

**فێربە**، پاشان کاربکە، و ئیخلاصت هەبێت، ئەوجا لە خۆت و دروستکراو رووتببەرەوە.

﴿ قُلِ ٱللَّهُ ثُمَّ ذَرۡهُمۡ فِي خَوۡضِهِمۡ يَلۡعَبُونَ ﴿٩١﴾ ﴾ الأنعام: ٩١

ئەوەی فەرموو کە ئیبراهیم(علیه السلام) فەرمووی:

﴿ فَإِنَّهُمۡ عَدُوّٞ لِّيٓ إِلَّا رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٧٧﴾ ﴾ الشعراء: ٧٧

کۆچ لە دروستکراو بکە و بیانڕەنجێنە گەر دەتبینی زیانت پێدەگەیەنن، گە یەکتاپەرستییەکەت راست و دروست بوو و پیسی هاوەڵدانان لە دڵت هاتە دەرەوە بگەڕێوە بۆ لایان و تێکەڵیان ببە و بەو زانستەی لەلاتە سوودیان پێبگەیەنە و رێنموونیان بکە بۆ دەرگای پەروەردگاریان(عزوجل)، مردنی تایبەتان مردنە لە دروستکراو بەگشتی، مردنە لە ویست و هەڵبژاردن، هەر کەس ئەم مردنەی بۆ هاتە راستە ئەوا ژیانی هەتاهەتایی لەگەڵ پەروەردگاری(عزوجل) بۆ دێتە راستە، مردنە ناشکرا و دەرەکییەکەی دەبێتە وەستانێکی زۆر کەم، چرکەیەك لە بێهۆشبوون، چرکەیەك لە بزربوون، چرکەیەك لە خەو، پاشان بەئاگاهاتنەوە، گەر ئەم مردنەت دەوێت ئەوا دەست بۆ سڕبوونی مەعریفەت ببە و لێی نزیکببەرەوە و لەبەر دەرگای حەقدا(عزوجل) بخەوە تا دەستی رەحمەت و مننەتی ئەو(سبحانه وتعالى) دەتبات و بە زیندەگییەکی هەتاهەتایی دەتژییەنێت، نەفس خۆراکی خۆی هەیە و دڵ خۆراکی خۆی هەیە و نهێنیش خۆراکی تایبەت بە خۆی هەیە، بۆ ئەو مەبەستە پێغەمبەر(ﷺ)

دەفـەرموێت: ((مـن لـەلای پـەروەردگارم دەمێنمـەوە خـواردن و خواردنـەوەم پـێ دەدات))[1].

واتە مانا بە نهێنیم دەبەخشێت، ڕۆحانییەت بە ڕۆحم دەبەخشێت، خۆراکێکم دەرخوارد دەدات تایبەتە بە من(پێغەمبەر)، یەکەمجار بەرزبوونەوەی بە جەستە و دڵ، پاشان ڕێگریکردنە لە جەستە و بەرزبوونەوەیە بە دڵ و نهێنی لە کاتێکدا ئەو لەناو خەڵکیدا ئامادەیە، ڕاستەقینەی میراتگرانی پێغەمبەر(ﷺ) بەم جۆرەیە، ئەوانەی زانست و کردار و ئیخلاص و فێرکردنی خەڵکیان لە خۆیاندا کۆکردەوە.

خەڵکینە، بخۆن لەوەی خوداناسان بەجێیانهێڵاوە، بخۆنەوە لەوەی لە دەفرەکانیاندا بەجێماوە، ئەی ئەو کەسەی بانگەشەی زانست دەکەی پەند لە زانستی بێ کرداردا نییە، بەهەمان شێوە پەند لە کردارەکانی تۆدا نییە بەبێ بوونی ئیخلاص، چونکە جەستەیەکی بێ ڕۆحن، نیشانەی ئیخلاصەکەت ئەوەیە لانەکەیەوە بە لای مەدح و سەنا و زەمی خەڵکیدا و چاونەبڕییە ئەوەی لەدەستی ئەواندایە، بەڵکو مافی پەروەردگاری بدەی و کار بۆ خاوەن نیعمەت بکەی نەک بۆ نیعمەتەکە، کار بۆ خاوەن موڵکەکە بکەیت نەک بۆ موڵکەکە، کار بۆ حەق بکەیت نەک بۆ باتڵ، ئەوەی لەلای خەڵکییە توێکڵە و ئەوەی لەلای دروستکەرە کرۆکە.

گەر ڕاستگۆییەکەت لە خودادا هاتە ڕاستە و ئیخلاصەکەت بۆ ئەو بوو و وەستانت لەبەردەمیدا بەردەوام بوو لە ڕۆنی ئەو کرۆکەت دەرخوارد دەدات، و کرۆکی کرۆک و نهێنی نهێنی و مانای ماناکانت پێ نیشان دەدات، ئەوکات سەراپا لە هەرچی شتی ترە ڕووتدەبییەوە: ڕووتبوونەوە بۆ دڵە نەک بۆ جەستە، زوهد بۆ دڵە نەک بۆ جەستە، پشتهەڵکردن لە دونیا بۆ نهێنییە نەک بۆ ئاشکرا، وردبوونەوە لە ماناکانە نەک لە پەیکەرەکان، سەرنجدان بۆ حەقە(عزوجل) نەک بۆ دروستکراو، وەرچەرخان بەو جۆرەیە لەگەڵ خودا بیت نەک لەگەڵ دروستکراو، دونیا و دواڕۆژ کۆتاییان پێ دێت، تایبەت بە ئێوە و بەراورد بە ئێوە بوونیان هەبووە، ئەگینا دونیا و دواڕۆژ و هەمو شتێکی تر

---

[1] صحیح، رواە البخاري ومسلم.

جگە لە ئەو(سبحانه وتعالى) نەبوونن، خۆشەویستانی خودا(عزوجل)-کە تایبەتانی خودان لە دروستکراوانی- دەچنە ناو ناز و نیعمەتەوە بەهۆی ئەو بەڵایانەی رووبیان لە جەستەیان کرد، ئەو شەهیدانەی بە شمشێری بێباوەڕان شەهیدکران بەهۆی جەستەی تووشبوویان بە بەڵا، ئەی دەبێ ئەو شەهیدانە پلە و پایەیان چۆن بێت بە شمشێری خۆشەویستی کوژراون؟!

وێرانبوون بەهۆی یاخیبوونەوە بەسەر کۆشك و تەلار و بیناکراوەکاندا زاڵ دەبێت، نابینی شوێنە وێرانەکان یاخیبوونی دانیشتوانەکەی وێرانی کردوون، چونکە یاخیبوون وڵات وێران دەکات و بەندەکان تیادەبات، بونیادی تۆش هەر بەو جۆرەیە، گەر تیایدا یاخی بوویت وێرانبوون رووی لێ دەکات، گەر بەردەوام بوویت لە یاخیبوون وێرانبوون روو لە جەستەت دەکات، پاشان روو لە جەستەی دینەکەت دەکات و کوێری و شەوکوێری و پڕمووشی روو لە بینینت دەکەن و هێز و توانات نامێنێت، نەخۆشی جۆراوجۆر رووت لێ دەکەن، هەژاری رووت لێ دەکات و ماڵەکەت وێران دەبێت و ناتاجت دەکات بە دۆستان و دوژمنانت.

**هاوار بە حاڵت**، ئەی کەسی دووڕوو، هەوڵی خەڵەتاندنی حەق(عزوجل) مەدە، کارێك ئەنجام دەدەی و وانیشان دەدەی بۆ ئەوت کردووە لە کاتێکدا بۆ دروستکراوت ئەنجامداوە، ریابازییان بۆ دەکەی و دووڕوویان بۆ ئەنجام دەدەی و رووپامایان بۆ دەکەی و پەروەردگاری خۆت لەبیر دەکەی، بەم نزیکانە لە دونیا بە مایەپووچی دەردەچیت، ئەی ئەو کەسەی ناوەوەت نەخۆشە دەست بۆ دەوا ببە، دەواش تەنها لای صالحانە لە بەندەکانی خودا(عزوجل)، دەوا لەوان وەربگرە و بەکاریبهێنە، ئەوکات-لەگەڵ پەروەردگارت(عزوجل)- عافییەتی هەمیشەیی و تەندروستی بەردەوام روو لە مانا و دڵ و نهێنی و تەنهایت دەکات، دوو چاوی دڵت دەکرێنەوە، و تەماشای پەروەردگاری پێ دەکەی و دەبیت بە یەکێك لە خۆشەویستانی راوەستار لە دەرگای ئەودا(سبحانه وتعالى)، دەچیتە ریزی ئەوانەی تەماشای هیچ شتێکی تر ناکەن جگە لە ئەو(سبحانه وتعالى)، دڵێك بیدعەی تێدا بێت چۆن دەتوانێت تەماشای حەق(عزوجل) بکات؟

خەڵکینە، شوێنی پێغەمبەر(ﷺ) بکەون و بیدعە ئەنجام مەدەن، تەبا بن و سەرپێچی مەکەن و یاخی مەبن، ئیخلاصتان هەبێت و هاوەڵ بڕیار مەدەن، خودا(عزوجل) تاکوتەنها بکەن و لە دەرگای ئەو دوورمەکەونەوە، داوا لە ئەو بکەن و داوا لە کەسانی تر مەکەن، کۆمەکی لە ئەو وەربگرن و هانا و پەنا مەبەن بۆ کەسانی تر، تەوەکولتان بە ئەو بێت نەك بە کەسانی تر، ئێوەش ئەی تایبەتان نەفسی خۆتان رادەستی ئەو بکەن و رازیبن بە تەگبیری ئەو لە ئێوەدا و سەرقاڵی یادی خودا بن بەبێ داواکردنی هیچ شتێك، گوێتان لە فەرموودەکەی خودا بووە کە لە هەندێك لە کتێبەکانیدا فەرموویەتی: (هەر کەس یادی من لە داواکردن لێم سەرقاڵی بکات باشترینی ئەوەی دەیدەم بە داواکاران بەوی دەبەخشم)، ئەی ئەو کەسەی بە یادی خوداوە سەرقاڵ بووە و دڵی لە پێناوی ئەودا گەردنکەچ بووە، رازی نابیت ببیت بە یەکێك لە هاومەجلیسانی خودا؟ خودا(عزوجل) لە هەندێ لە کتێبەکانیدا فەرموویەتی: ((من هاومەجلیسی کەسێکم یادم دەکات))[1] هەروەها فەرموویەتی: ((من لەگەڵ ئەوانەم لە پێناوی مندا دڵیان شکاوە))[2].

**ئەی گەنج**، یادکردنت بۆ خودا -بە نزیکی دڵت لە ئەو- دەتباتە ناو خانەی نزیکی لە ئەوەوە و دەبیت بە میوانی خودا(سبحانە وتعالی)، میوان رێزی لێ دەگیرێت بەتایبەت میوانی مەلیك، تاکەی خۆت سەرقاڵ دەکەی بە مولکەوە و مەلیك لەبیر دەکەی، موڵك بەم نزیکانە لێت جیادەبێتەوە، بەم نزیکانە دەگەیە دوارۆژ و دەبینیت وەك دونیا هەر نەبووبێت و دوارۆژ بە هەتاهەتایی هەبووبێت، بەهۆی هەژاری دەستی منەوە لە من رامەکەن، چونکە لە ئێوە و ئەهلی خۆرهەڵات و خۆرئاوا بێنیازم، من ئێوەم بۆ خۆتان دەوێت، لە پەت و داوی ئێوە خۆم قوتار دەکەم، بیدعە دروست مەکە و شتێك باس مەکە لە دینی خودادا بوونی نەبووە، شوێنی دوو شایەتە دادپەروەرەکە بکەوە(قورئان و سوننەت)، ئەو دوانە دەتگەیەنن بە پەروەردگارت(عزوجل)، بەڵام گەر بیدعەچی بوویت ئەوا شایەتەکەت بریتی دەبێت لە ئەقڵ و ئارەزووت، گومانی تێدا

[1] رواه البيهقي في "الشعب".

[2] ذكره الحافظ السخاوي في "المقاصد".

نییه ئەو دوانە دەتگەیەنن بە ئـاگر و لەگـەڵ فیرعـەون و هامـان و سـەربازەکانیاندا کۆدەبییەوە، بەڵگە بە قەدەر مەهێنەوە چونکە لێت وەرناگیرێت، هـەر دەبێت بچیتە ناو خانەی زانست و فێربوونەوە پاشان کردار و ئیخلاص، بە تۆوە شتێك ئەنجام نادرێت و هەر دەبێت کاریش بکەی، با هەوڵدانت بۆ داوای زانست و کردار بێت نەك بۆ داوای دونیا، بەم نزیکانە هەوڵەکەت کۆتایی پیّ دێت، بۆیە بـا هەوڵەکـەت بـۆ شـتێك بێـت سوودت پیّ بگەیەنێت.

(پیاوێك هەستا و چوو بۆ لای و وەجد گرتی و وتی: مارەیی پێشـینەی ئـەم بووکـە چەندێکە تا بەدەستی بهێنێت؟) فەرمووی: مارەییەکەی خۆشەویستییە لە گەنجەکـەوە پێش چوونە لا.

**ئەی گەنج**، خۆت بگەیەنە بە رازیبوونی خودا(عزوجل) چونکە گەر لێـت رازی بـوو خۆشیدەویت، خەم و پەژارەی رۆزی لە دڵت دەربکە، رۆزیـت لـە خوداوە(عزوجـل) بـۆ دێت بەبیّ ماندبوون و شەکەتی لە تۆوە، خەم و پەژارە لە دڵت دەربکە و بیکە بە یەك خـەم، ئـەوەش بریتییـە لـە حـەق(عزوجل)، گـەر ئـەوەت ئەنجامـدا هـەموو خـەم و پەژارەکانت لە کۆڵ دەکاتەوە، خەم و پەژارەی تۆ ئەوەیە کە بۆ تۆ گرنگە، گەر خـەم و پەژارەت دونیا بێت ئەوا تۆ لەگەڵ دونیای، گەر خەم و پەژارەت دوارۆژ بێت تۆ لەگەڵ دوارۆژی، گەر خەم و پەژارەت دروستکراو بێت تۆ لەگـەڵ ئـەوانی، بـەڵام گـەر خـەم و پەژارەت خودا بێت تۆ لەگەڵ خودای(عزوجل) لە دونیا و دوارۆژدا.



# مەجلیسی چل و هەشت

## کرداری چاکە

ئێوارەی رۆژی سێشەممە لە مەدرەسەکەی ٨/شەعبان/٥٤٥ھ فەرمووی:

**لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی:** ((هەر کەس خۆی بۆ خەڵکی جوان بکات بەو جۆرەی ئەوان پێیانخۆشە و زۆرانبازی لەگەڵ خودا کرد بەوەی پێیناخۆشە، بە خزمەتی خودا دەگات و لێی تووڕەیە))[1].

گوێ لە قسەی پێغەمبەر بگرن ئەی دووڕووان، ئەی ئەوانەی دوارۆژتان بە دونیا فرۆشتووە، ئەی ئەوانەی حەقتان(عزوجل) بە دروستکراو فرۆشتووە، ئەی ئەوانەی ئەوەی دەمێنێتەوە فرۆشتوتانە بەوەی تیادەچێت، بازرگانییەکەتان زیانی کرد و سەرمایەکەتان تیاچوو، هاوار بە حاڵتان، ئێوە خۆتان خستووەتە بەر رق و خەشمی خودا(عزوجل)، دەرەوەت بە ئادابی شەرع جوان بکە و ناوەوەت بە دەرکردنی دروستکراو ئاوەدان بکەرەوە، دەرگاکانی ئەوان رەد بکەرەوە، لە دڵەوە فەنایان بکە تا وەك ئەوەی دروستنەکرابن، زیان و قازانج لە دەستی ئەوان تەماشا مەکە، خۆت بە جوانی قاڵبەوە خەریك کردووە و وازت لە جوانکردنی دڵ هێناوە، جوانی دڵ بە یەکتاپەرستی و ئیخلاص و متمانە بە خوداوەیە(عزوجل)، یاد کردنی ئەو و لەبیرکردنی هەرچی شتی تر.

**لە عیساوە(علیه السلام) فەرموویەتی:** کرداری چاکە ئەوەیە پێیخۆش نەبێت بدرێتە پاڵی، ئەی گەمژەکان، ئەی ئەوانەی شێتن بەراورد بە دوارۆژ و ئاقڵن بەراورد بە دونیا، ئەم ئەقڵە سوودێك بە ئێوە ناگەیەنێت، هەوڵبدە ئیمان بەدەست بهێنیت،

---

[1] ذکره الهیثمی في "المجمع" وقال: رواه الطبراني في "الأوسط".

ئیمانت بۆ بەدەستهاتووە، تەوبە بکە و داوای لێخۆشبوون بکە و پەشیمان ببەرەوە، با فرمێسك بە گوناتدا بێتە خوارەوە، چونکە گریان لە ترسی خودا(عزوجل) ئاگری گوناه و یاخیبوون دەکوژێنێتەوە، ئاگری تووڕەبوونی خودا(عزوجل) دەکوژێنێتـەوە، گەر بـە دڵ تەوبە بکەیت ئەوا نووری تەوبەی راستگۆیانە لەسەر روخسارت پەخشدەبێتەوە.

ئەی گەنج، چەندە دەتوانی هەوڵی پارێزگـاری نهێنی و پـەنهانی خـۆت بـدە، گـەر زاڵبوونت بەسـەردا هـات تـۆ پاسـاوێکت هەیـە، خۆشەویسـتی دیـواری پـاکیزەیی و خوداپۆشین دەرِوخێنێـت، دیـواری خۆشـاردنەوە، دیـواری بـوون، دیـواری دروسـتکراو، داواکەر فەرمانی بە دەرکردنی کـردووە، داوالێکـراویش ژێردەستەیە، بـە خـاکی ژێـر پێی چاوەکانت برێژە، چونکە ئەوە نەفسییە و ئەمەش کـاری دڵـە، ئـەوە دروسـتکراوە و ئەمە رەبانییە، هەوڵبدە تۆ نەبیت بەڵکو ئەو بێت، هەوڵبدە لـە پاڵپێوەنـانی زیانـدا لە خۆت و راکێشانی قازانج بۆ خۆت جووڵە و بزوانت نەبێت، چونکە گـەر بـەم جۆرە بوویت خودا کەسانێکت بۆ راستەدەکاتەوە خزمـەتت بکـەن و ئـازارت لەسـەر لابـدەن، لەگەڵ ئەو وەك مردوو بە لەبەردەستی مردووشۆردا، هەروەها وەك یـارانی ئەشـکەوت وایە لەبەردەستی جبریلدا(علیە السـلام)، لەگـەڵ ئـەو بـە بـەبێ بـوون و هەڵـبژاردن و تەگبیر، لەبـەر دەسـتی خـودادا لەسـەر دوو پێـی ئیمـان و ئـەفس راوەسـتە لـە کـاتی دابەزینی قەزا و قەدەری خوداییدا، ئیمان لەگەڵ قەدەر راوەسـتاو و دامـەزراو دەبێـت و دووڕوویی هەڵدێت، کەسی دووڕوو بە تێپەڕبوونی شەو و رۆژ بونیـادی لاواز دەبێـت و نەفس و ئارەزوو و سروشتی قەڵەو دەبن و دوو چاوی نهێنی و دڵـی کـوێر دەبنـەوە، دەرگای ماڵەکەی ئاوەدان و ناوەوەی وێران، یادکردنی خودای بـە زمانـە نـەك بـە دڵ، تووڕبوونی بۆ نەفسـی خۆیەتی نـەك بـۆ پـەروەردگاری، بـاوەڕدار پێچـەوانەی ئەوەیـە، یـادکردنی بـە زمـان و دڵ بـۆ خودایـە(عزوجل)، زۆربـەی کاتـەکان دڵـی یـادی خـودا دەکات و زمانی بێدەنگە، تووڕەبوونی بۆ خودا و پێغەمبـەرە(ﷺ) نـەك بـۆ نـەفس و ئارەزوو و سروشـت و دونیـا، حەسـوودی بـە کـەس نایـات و حەسـوودی پـێ نابرێـت، ململانێی و کێبەرکێی ئەهلی خاوەن بەش ناکات لە بەشەکانیاندا.

ئەی گەنج، هەرگیز ململانێ و کێبەرکێ مەکە لەگەڵ کەسێکی خاوەن بەشدا، چونکە ئەو سەلامەت دەبێت و بەرز دەبێتەوە و تۆش تیادەچیت و بەردەبییەوە، زەلیل و رسوا و شەرمەزار دەبیت، چۆن بە ململانێ و کێبەرکێ حەسوودی بە بەشی ئەو دەبەیت لە کاتێکدا زانستی پێشینەی خودا بەو بەشەی ئەوی تێدایە پێشکەوتووە، گەر مامەلانێ لەگەڵ حەقدا(عزوجل) بکەیت لەسەر زانستی پێشینەی لە تۆ و کەسانی تردا لەبەرچاوی خودا دەکەویت و زانستەکەت سوودێکت پێ ناگەیەنێت، وەک خودا(عزوجل) دەفەرموێت: ﴿عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ ۝٣﴾ الغاشية: ٣

ئێستا تەوبە بکە و بگەڕێوە بۆ لای خودا(عزوجل)، کەسی پاکی بێگوناه کەسێکی هۆشمەند و دانایە، بە هۆی بەڵایەکەوە بەسەر تۆدا دایبەزاندووە لە بەمەبەستگرتنی خودا مەگەڕێرەوە، چاوەڕوانی لادانی بەڵایەکە ببە و بێهیوا مەبە، چونکە لە ساتێکەوە بۆ ساتێکی تر دەروو دەکرێتەوە، ﴿كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ ۝٢٩﴾ الرحمن: ٢٩، لە دەستەیەکەوە بۆ دەستەیەکی تر دەگوێزرێتەوە، لەگەڵی ئارام بگەرە و بە بڕیاری ئەو رازی بە، چونکە تۆ: ﴿لَا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا ۝١﴾ الطلاق: ١

گەر ئارام بگریت بەڵات لەسەر سووک دەکات و شتێک روودەدات ئەو و تۆش خۆشتان بوێت، بەڵام گەر نائارام بوویت و بەرهەڵستیت نواند بەڵاکەت لەسەر قورس دەبێت و سزات لە ئەوەوە بۆ زیاد دەبێت بەهۆی بەرهەڵستی کردنت لە بڕیارەکانی، هۆی بەرهەڵستیتان لە بڕیارەکانی خودا و ململانێتان لەگەڵی وەستانە لەگەڵ نەفس و ئارەزوو و مەرام و خۆشەویستیتان بۆ دونیا و هەڵپەتان بۆ کۆکردنەوەی.

**خەڵکینە**، گەر هەر دەبێت بەو جۆرە بن، با نەفستان لەبەر دەرگای دونیا بێت و دڵتان لەبەر دەرگای دوارۆژ و نهێنیتان لەبەر دەرگای مەولا(عزوجل) تا ئەو کاتەی نەفس بۆ دڵ وەردەگەرێ و ئەوەی دڵ چەشتوویەتی ئەویش دەیچێژێت و دڵیش بۆ نهێنی وەردەگەرێت و ئەوەی نهێنی چەشتوویەتی دەیچێژێت، پاشان نهێنی لەناو خۆیدا بۆ فەنا وەردەگەرێت نە چێژدەکات و نە چێژ دەکرێت، پاشان خودا ئەو بۆ خۆی نەک بۆ کەسانی تر زیندوو دەکاتەوە، ئەوکات کیمیای هەموو درهەمێک لە ئەوەوە

دەبێت، لە هەزار مسقاڵ خەوش و خاڵ پاکی دەکاتەوە و دەیکات بە زێڕی پاڵفتە، ئەوەش ئەو ئامانجە هەمووەکییە بنەڕەتییەیە دەمێنێتەوە، خۆشبەخت ئەو کەسانەی تێدەگات لەوەی من دەیڵێم و باوەڕی پێ دەهێنێت، خۆشبەخت ئەو کەسەی کاری پێ دەکات و ئیخلاصی تێدا ئەنجام دەدات، پیرۆزبایی لەوانەی دەست بە کردارەوە دەگرن دەیانبات بۆ لای کاربۆکراو(خودا).

ئەی گەنج کە مردی دەمبینی و دەمناسییەوە، لە راست و چەپتەوە دەمبینی، کۆڵت هەڵدەگرم و بەرگریت لێ دەکەم و لە پێناوی تۆدا داوا و تکا دەکەم، تۆ تا کەی بە دروستکراو هاوەڵ بۆ خودا دادەنێیت و شانیان لەسەر دادەی؟ پێویستە بزانی هیچ کام لەوانە-نە دەوڵەمەندانیان و نە هەژارانیان، نە دەسەڵاتدارانیان و نە لاوازانیان- سوود و زیان بە تۆ ناگەیەنن، دەست بە خوداوە(عزوجل) بگرە، شان لەسەر دروستکراو و کەسابەت و هەوڵ و هێزی خۆت دامەدە، پشت بە فەزڵ و چاکەی خودا ببەستە، پشت بەو کەسە ببەستە کە توانای کەسابەتی بە تۆ بەخشیوە و رۆزی تۆی داوە لە رێگەی ئەو کەسابەتەوە، گەر ئەمەت ئەنجامدا رۆیشتنت لەگەڵ خودایە و سەرسوڕهێنی دەسەڵات و توانین و بڕیاری پێشینەی خۆی نیشانی تۆ دەدات، دڵت دەگەیەنێتە خۆی و پاشان-لەدوای گەیشتن بە ئەو- رۆژانی گوزەرکردەی دێنێتەوە یاد، وەك چۆن ئەهلی بەهەشت لە بەهەشتدا بیر لە دونیا دەکەنەوە، گەر تۆری هۆ ببڕیت دەگەی بە هۆکار(سەبەبکار)، گەر نەرێت و باو ببڕیت نەرێت و باوت بۆ دەبڕێت، هەر کەس خزمەت بکات خزمەت دەکرێت، هەر کەس گوێڕایەڵ بێت گوێڕایەڵی لێ دەکرێت، هەر کەس رێزدار بێت رێزی لێ دەگیرێت، هەر کەس نزیکببێتەوە نزیکی بەدەست دەهێنێت، هەر کەس تەوازوع بنوێنێت بەرز دەکرێتەوە، هەر کەس بەخشندەی بنوێنێت بەخشندەیی بۆ دەنوێنرێت، هەر کەس ئەدەبی جوان بێت نزیك دەکرێتەوە، ئەدەبی جوان نزیکت دەکاتەوە و ئەدەبی ناشیرین دوورت دەخاتەوە، ئەدەبی جوان گوێڕایەڵییە لە خودا و بێئەدەبیش یاخیبوونە لە خودا.

خەڵکینە، کۆبوونەوەی دوارۆژ و خستنەڕووی کردارەکانتان و دادگایی کردنی نەفستان دوامەخەن، لە دونیا و دوارۆژدا -بەسەر نەفسی خۆتاندا- پەلە بکەن لەوە، لە

پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: ((خودا(عزوجل) شەرم دەکات بەندە خاوەن وەرعەکانی لە دونیادا دادگایی بکات))[1].

دەست بە وەرعەوە بگرە ئەگینا شەرمەزاری دەکەوێتە گەردنت، لە دونیادا لە هەڵسوکەوتەکاندا خاوەنی وەرع بە، ئەگینا حەزەکانت لە دونیا و دوارۆژدا دەبن بە کۆڵی حەسرەت، دینار خانەی ئاگرە و درهەم خانەی خەمە، بەتایبەت گەر لە ڕوویەکی حەرامەوە وەرتگرتبێت و لە ڕوویەکی حەرامەوە خەرجت کردبێت، ئەوەی ئەمڕۆ بە تۆی دەڵێم سبەینێ بۆت ڕۆشن دەبێتەوە، تۆ کوێر و کەڕی، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((خۆشەویستیت بۆ شتێك کوێر و کەڕت دەکات))[2].

**دڵت لە دونیا ڕووتبکەرەوە**، ئازاری بدە و تینووی بکە تا حەق(عزوجل) پۆشتەی دەکاتەوە و خواردن و خواردنەوەی پێ دەبەخشێت، دەرەوە و ناوەوەی ڕادەست بکە و تەگبیرت نەبێت، بەڵکو ببە بە ئەو بەبێ خۆت، بە هەمیشەیی یادی خودا بکە، چونکە دونیا خانەی کردارە و دوارۆژیش خانەی سزا و پاداشت، خانەی بەخشین و خانەی پێدان، ئەمە زۆرینەی صالحان دەگرێتەوە، بەڵام کەسانێکی دەگمەن لە صالحان لە دونیادا لە کردار دەهێنێتە دەرەوە و منەتیان بەسەردا دەکات و بەزەیيان پێ دەکات و بەر لە هاتنی دوارۆژ ئاسوودەییان بۆ پێشدەخات، تەنها ئەوەندەی بەسە فەرزەکان جێبەجێ بکات و لە نەوافل ئاسوودەی دەکات، چونکە فەرز لە هەموو حاڵ و مەقامێکدا بەردەوامە و بەرنابێتەوە، ئەمانە دانەدانەیەکن لە بەندەکانی خودا(عزوجل)، ئەمەش زۆر دەگمەنە لەناو دەگمەنەکاندا.

**ئەی گەنج**، زوهد بکە و پشت لە دونیا بکە ئەوا لە دونیادا ئاسوودە دەبیت، گەر بەشێکت لە دونیادا هەبوو هەر دەبێت بەدەستت بگات، بەشەکانت بۆ دێت لە کاتێکدا تۆ کەسی خاوەن عیززەت و ڕێزدار و داوالێکراوی، بە نەفس و ئارەزووەوە مەخۆ، چونکە ئەوە پەردەیەکە دڵت لە پەروەردگارت(عزوجل) دادەبڕێت، باوەڕدار بە

---

[1] رواه الطبراني في "الكبير".

[2] رواه أبو داود، والطبراني في "الأوسط" والبيهقي في "الشعب".

نەفس و لەگەڵ نەفسی ناخوات و ناپۆشێت و چێژ و خۆشی وەرناگرێت، بەڵکو شتێك دەخوات بۆ ئەوەی هێز و تینی لەسەر گوێڕایەڵی کردنی خودا پێ ببەخشێت، دەخوات بۆ ئەوەی پێی ئاشکرای لەبەردەم خودا جێگیر و دامەزراو بکات، بە شەرعەوە دەخوات نەك بە ئارەزووەوە، وەلیش بە فەرمانی خودا(عزوجل) دەخوات، بەدەلیش کە وەزیری قوتبە بە کرداری خودا دەخوات، قوتبیش خواردن و هەڵسوکەوتی وەك پێغەمبەر(ﷺ) وایە، چۆن نابێت بەو جۆرە بێت لە کاتێکدا خزمەتکار و بەردەست و جێگرەوە و جێنشینی پێغەمبەری خودایە لەناو ئومەتەکەیدا ؟! ئەو بریتییە لە خەلیفەی پێغەمبەر(ﷺ) کە خەلیفەی خودایە(عزوجل)، ئەم خەلیفەی ناوەوەیە(باطن) و ئیمامی موسڵمانانیش کە لەوان پێشکەوتووە ئیمامی ئاشکرا(ظاهر)ە، ئیمامی موسڵمانان ئەو کەسەیە بۆ هیچ موسڵمانێك حەڵاڵ نییە واز لە شوێنکەوتن و گوێڕایەڵی کردنی بهێنێت، وتراوە گەر ئیمامی موسڵمانان کەسێکی دادپەروەر بێت دەبێتە قوتبی سەردەم، وامەزانن کارەکە ئاسان بێت، کەسانێك بەسەر ئێوەوە دانراون کار و کردەوە ئاشکراکانتان تۆمار و هەژمار دەکەن و ئەویش(قوتب) کار و کردەوە ناوەکییەکانتان هەژمار دەکات، هەریەك لە ئێوە لە رۆژی دواییدا فریشتەکانی لەگەڵدایە، ئەو فریشتانەی لە دونیادا بەرپرسی نووسینی چاکە و خراپە و هەموو کار و کردەوەیەکی ئێوە بوون، ئەوان ئەوەد و نۆ تۆماریان لەگەڵ خۆیان هێناوە، هەر تۆمارێك هەتا چاو هانا بکات چاکە و خراپە و هەموو کار و کردەوەکانی تێدا نووسراوە، داوای لێ دەکەن هەموو ئەوانە بخوێنێتەوە، ئەویش دەیخوێنێتەوە، با لە دونیاشدا نووسین و خوێندنەوە نەزانێت، چونکە دونیا خانەی حیکمەتە و دوارۆژ خانەی قودرەت، دونیا ئاتاجە بە هۆکار و ئامێر و دوارۆژ پێویستی بەوە نییە، گەر یەکێك لە ئێوە شتێکی لەناو تۆمارەکەدا رەدکردەوە ئەوا ئەندامەکانی لەسەری دێنە قسە، هەر ئەندامێك سەربەخۆ دێتە قسە لەوەی لە دونیادا ئەنجامیداوە، ئێوە بۆ کارێکی مەزن دروستکراون و هەواڵێکتان لێی نییە، خودا(سبحانه وتعالى) دەفەرموێت:

﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾﴾ المؤمنون: ١١٥

# مەجلیسی چل و نۆ

## بەخشینی بە داواکەر و بەخشندەیی

رۆژی هەینی لە مەدرەسەکەی ١١/شەعبان/٥٤٥ك فەرمووی:

**لە عەبدوڵای کوڕی موبارەکەوە(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەگێڕنەوە:** لە یەکێك لە ڕۆژگاندا کەسێك هات بۆ لای داوای شتێك لە خواردنی کرد، ئەویش تەنها دە هێلکەی لەلا بوو، فەرمانی بە جاریەکەی کرد پێی بدات، ئەویش نۆ هێلکەی پێدا و دانەیەکی شاردەوە، کاتی خۆرئاوابوون پیاوێك هات و تەقەی دا لە دەرگا و وتی: ئەم سەبەتەیەم لێبگرن، عەبدوڵا هاتە دەرەوە بۆ لای و لێیوەرگرت، بینی هێلکەی تێدایە، ژمارەی نەوەد هێلکە بوو، بۆیە وتی بە جاریەکەی: کوا هێلکەکەی تر؟ چەند هێلکەت بەو کەسە بەخشی یەکەمجار هات؟ ئەویش وتی: نۆ هێلکەم پێ بەخشی و دانەیەکیام هێڵایەوە بەربانگی لەسەر بکەین، ئەویش پێی وت: تۆ بووی بە هۆی سزادانمان بە دە هێلکە.

ئەوان(خوایان لێ ڕازی بێت) لە مامەڵەکردنیان لەگەڵ پەروەردگاریان(عزوجل) بەو جۆرە بوون، ئیمانیان بەوە هەبوو لە قورئان و فەرموودەدا هاتبوو و بەڕاستیان دەزانی، لەگەڵ قورئان بوون و لە جووڵە و وەستان و وەرگرتن و بەخشینیاندا پێچەوانەی قورئان نەبوون، مامەڵەیان لەگەڵ پەروەردگاریان بوو، ئەوان لە مامەڵەکەیاندا قازانجیان کرد، بۆیە بە خوداوە پەیوەستبوون، دەرگای خودایان بە کراوەیی بینی و چوونە ژوورەوە، دەرگای کەسانی تریان بە داخراوی بینی و کۆچیان لێکرد، لە کەسانی تردا لەگەڵ خودا تەبابوون، نەك لە خودادا لەگەڵ کەسانی تر تەبا بن، لە ڕقیاندا لەگەڵ خودا تەبابوون، ڕقیان لە کەسێك بوو خودا ڕقی لێی بوو، ئەوەیان خۆشدەویست خودا خۆشیدەویست، بۆ ئەو مەبەستە یەکێك لە ئەوان دەڵێت: لە دروستکراودا لەگەڵ خودا(عزوجل) تەبا بە، نەك لە خودادا لەگەڵ دروستکراو تەبا بیت، ئەوەی خودا

دەیشکێنێت بیشکێنە، ئەوەی خودا راستیدەکاتەوە راستیبکەرەوە، خوداناسان بە هەمیشەیی لای حەقیان(عزوجل) گرتووە، خودا بەسەر نەفسی خۆیان و کەسانی تردا سەردەخەن، لە پێناوی خودادا لە لۆمەی لۆمەکاران ناترسن، بۆ سنووری خودا و جێبەجێ کردنی شەرعی خودا لە هیچ کەسێك ناترسن.

**ئەی گەنج**، واز لەو هەوەسبازییە بهێنە تۆی تێکەوتووە و لەسەری دەڕۆی، شوێنی خوداناسان بکەوە لە کردار و گوفتاریاندا، بە بانگەشەی درۆ داوای ئەوە مەکە ئەوان پێیگەیشتن، گەر بەڵا نەبوایە هەموو خەڵکی عابید و زاهید بوون، بەڵام بەڵا روویان لێ دەکات و لەسەری ئارام ناگرن و ئەوەش لە دەرگانەی پەروەردگاریان دابڕاو و بێبەشیان دەکات، هەر کەس بۆ خودا ئارام نەگرێت پێبەخشینی بۆ نییە، گەر ئارامگرتن و رازیبوون نەمان ئەوە دەبێتە هۆی دەرچوونت لە بەندایەتی کردن بۆ حەق(عزوجل)، خودا لە یەکێك لە کتێبەکانیدا فەرموویەتی: ((هەر کەس رازی نەبێت بە قەزای من و لەسەر بەڵای من ئارام نەگرێت با خودایەکی تر جگە لە من بە خودا بکات))[1].

بە خودا رازی بن نەك بە کەسانی تر، رازی بن بەوەی بۆ ئێوە بڕاوەتەوە و بەسەر ئێوەدا گوزەر دەکات، ئیسلام بەدەست بهێنن و قووڵ ببنەوە تا دەگەنە ئیمان، پاشان لە ئیماندا قووڵ ببنەوە تا دەگەنە یەقین، ئەوکات شتێك دەبینن پێشتر نەتابینیوە، یەقین شتەکانتان وەك خۆیان و لەسەر شێوەی خۆیان نیشان دەدات، هەواڵ دەبێت بە بینراو، یەقین دڵ لەسەر حەق(عزوجل) دادەمەزرێنێت و شتگەلێکی لە ئەوەوە نیشان دەدات، گەر دڵ لە دەرگای حەقدا(عزوجل) راوەستا و دامەزرا دەستی بەخشندەیی بۆ دێتە دەرەوە و پێی دەبەخشێت، ئەوکات دەبێت بە کەسێکی بەخشندەی کاریگەر، بە خەڵکی دەبەخشێت و بەرانبەریان دەستنوقاو نابێت، دڵی تەندروست کە خودا تەندروستی پێ بەخشیوە و سازی کردووە دڵێکی بەخشندەیە، نهێنیش کە لە خەوش و لیتە پاڵفتە بووە بەخشندەیە، چۆن دڵ و نهێنی بەو جۆرە نابن لە کاتێکدا "أکرم الأکرمین-بەخشندەترین بەخشندە" بەخشندەیی پێ بەخشیون.

---

[1] رواه الطبراني في "الكبير".

خەڵکینە، لە گوێڕایەڵی حەقدا(عزوجل)-نەك لە یاخیبوون لە ئەو- بەخشندەیتان هەبێت کەسانی تر بەسەر خۆتاندا پێشبخەن، هەر نیعمەتێك لە یاخیبووندا بەکاربهێنرێت رووبەرووی تیاچوون دەبێتەوە، خۆتان سەرقاڵی بەدەستهێنان بکەن لەگەڵ پەیوەستبوون بە گوێڕایەڵییەوە تا نزیکی لە خوداوە بەدەست دەهێنن، ئەوکات خەم و پەژارەتان بە خوداوە و لەگەڵ خودا کۆدەبێتەوە، نەك بە کەسان و شتانی ترەوە، ئەوکات خواردنتان لە سفرەی فەزڵ و بەخشندەیی ئەوەوە دەبێت لە ڕێگەیەکەوە کە نێوەی پەیی پێ نابەن و نایزانن، ئەفس بریتییە لە پەردەی نێوان خەڵك و خودا، گەر لەو ناوەندەدا ئەفس لابدرێت پەردەکە لادەدرێت، بۆ ئەو مەبەستە ئەبو یەزیدی بوستامی(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت: پەروەردگارم لە خەوندا بینی لێم پرسی: ئەی پەروەردگارم ڕێگە بۆ لای تۆ و بۆ گەیشتن بە تۆ چۆنە؟ ئەویش فەرمووی: ئەفست وازلێبهێنە و وەرە بۆ لام، بۆیە خۆم لە ئەفسم داڕنی وەك چۆن مار لە کاژەکەی دادەڕنێت، بەتەنها چاوی حەق(عزوجل) لەسەر ئەفسە نەك کەسانی تر، خودا فەرمانی کردووە بە وازهێنان لەو ئەفسە، چونکە دونیا و ئەوەی تێیدایە و هەرچی شتی ترە جگە لە حەق(عزوجل) سەراپا شوێنکەوتەی ئەفسن، دونیا بۆ ئەفسە و خۆشەویستەکەیەتی، دوارۆژیش بەهەمان شێوە بۆ ئەفسە، خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ الْأَنفُسُ وَتَلَذُّ الْأَعْيُنُ﴾ الزخرف: ٧١

**دوای هەندێك قسە فەرمووی:**

ئەوان لە ڕۆژدا لەپێناو بەرژەوەندی خەڵکی و ماڵ و منداڵ کاریان دەکرد و لە شەودا لە خزمەتی پەروەردگاردا بوون و لەگەڵی تەنهادەکەوتنەوە، مەلیکان لەگەڵ خزمەتکار و بەردەستتان و هامنیشانانی خۆیان و جێبەجێ کردنی پێویستییەکانی خەڵکی هەر بەو جۆرە بوون، کاتێکیش شەو دادەهات لەگەڵ وەزیران و کەسانی تایبەت بە خۆیان تەنها دەکەوتنەوە، ئەوەی دەیڵێم-رەحمەتی خوداتان لێ بێت- بە بیستنی دڵ بیبیستن و پارێزگاری لێ بکەن و کاری پێ بکەن، من لە حەقەوە(عزوجل) و بە حەق زمانم هاتووەتە گۆ، بە سیفەتی ڕێگەی حەق(عزوجل) قسە دەکەم، وەسفی

ئەو ڕێگەیە دەکەم بۆئەوەی بیگرنەبەر، ئەوەم لە ئێوە ناوێت پێم بڵێن چاکت کرد(چاکت وت)، بەڵکو بە زمانی دڵتان بڵێن چاکت کرد، کار بکەن بەوەی دەیڵێم و لە کردارەکاندا ئیخلاصتان هەبێت، تا من ئەوە لە ئێوە دەبینم و پێتان دەڵێم چاکتان کرد، کەی بەسەر نەفس و دونیا و دوارۆژ و دروستکراو و هەرچی شتی تره جگە لە حەق(عزوجل) سەردەکەویت؟ دروستکراو پەردەی نەفسی تۆن، نەفست پەردەی دڵی تۆیە، دڵت پەردەی نهێنی تۆیە، تا لەگەڵ دروستکراودا بیت نەفست نابینێت، گەر دروستکراوت وازلێهێنا نەفست دەبینێت و دەگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگار و بۆ لای خۆت، بەردەوام لەگەڵی دەجەنگی تا بۆ لای پەروەردگاری ئارام و دڵنیا دەبێت، ئارام و دڵنیا دەبێت بۆ لای بەڵێنی خودا و دەترسێت لە هەڕەشەی خودا و فەرمانەکانی جێبەجێ دەکات و دەست لە قەدەغەکراوەکان دەکێشێتەوە و لە قەدەرەکانیدا لەگەڵی تەبا دەبێت، ئەوکات پەردەکان لەسەر دڵ و نهێنی دەسڕێنەوە و شتێك دەبینن پێشتر نەیانبینیوە، پەروەردگاریان دەناسن و پەنای پێ دەگرن و لەگەڵ هیچ شتێك جگە لە ئەو(سبحانه وتعالى) ڕاناوەستن، کەسی عاریف لەگەڵ شتێك ڕاناوەستێت، بەڵکو لەگەڵ دروستکەر رادەوەستێت، هەرچی شتە بوونی نییە، بەڵام مەحبوب(خودا) خەوتن و وەنەوزی نییە، هیچ شتێك لە پەروەردگاری کۆت و بەندی ناکات، ئەو(واتە عاریف) لە دۆڵی قەدەر و زانست بە پەروەردگاریەتی(عزوجل)، شەپۆلەکانی دەریای زانست بەرزی دەکەنەوە و نزمی دەکەنەوە، بەرزی دەکەنەوە بۆ ئاسمان و پاشان بەریدەدەنەوە بۆ خاڵە نزمەکان، لە کاتێکدا ئەو بزر و سەرسامە و هیچ ناژنەوێت، کەڕ و لاڵە و لە هیچ کەسێکەوە جگە لە حەق(عزوجل) شت نابیستێت، هیچ کەسێك نابینێت جگە لە ئەو(سبحانه وتعالى)، ئەو لەبەردەستیدا مردووە، گەر خودا بیەوێت جارێکی تر زیندووی دەکاتەوە، گەر بیەوێت بوونی پێ دەبەخشێتەوە، ئەوان بەهەمیشەیی لەناو پەرژینی نزیکی لە خوداوەن، گەر سەرەی حوکم هات دەچنە حەوشەی حوکمەوە، گەر سەرەی دەرچوونیش هات لە دەرگاکەدان، سەری خەڵکی بەرەو لای خودا ڕادەکێشن و دەبنە ناوەندێك بۆ گەیاندنیان بە خودا(سبحانه وتعالى)، ئەمە بریتییە لە حاڵی ئەوان، بەڵام هەندێ حاڵیان هەیە شاراوەن.

خەڵکینە، ئێوە چیتانە؟ ئێوە لە هەوەسبازیدان، ئێوە لە تەمەن بەفیڕۆداندان بەبێ هیچ شتێك، لەگەڵ خودا(عزوجل) ئارام بگرن خێری دونیا و دواڕۆژ دەبیننەوە، گەر دەتەوێ ئیسلام بەدەستبهێنی ئەوا خۆت رادەست بکە، گەر دەتەوێ نزیکی لە خوداوە بەدەست بهێنی ئەوا لەبەردەستی قەدەر و کرداریدا رابکشێ، بەبێ چۆن و بۆچی، بەوە لە ئەو نزیکدەبییەوە، ویستی هیچ شتێك مەکە، چونکە دروست ناگەڕێت، خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾ الإنسان: ٣٠

گەر ئەوەی ویستی دەکەی بۆت نایەتەدی کەوابوو ویست بۆ هیچ شتێك مەکە و لەگەڵ کردارەکانی خودا کێبەرکێ مەکە، گەر ناموس و ماڵ و لەشساغی و منداڵی تۆی برد و تێکوپێکی شکاندی خەندە بخە سەر لێوانت بەرانبەر بە رووی قەدەر و ویست و ئاڵوگۆڕی، لەسەر ئەوە بمێنەرەوە گەر نزیکی ئەوت دەوێت، گەر نێواخۆشیت دەوێت لەگەڵ ئەو، گەر دەتەوێ دڵت بگاتە ئەو(سبحانه وتعالى) و تۆ لە دونیادا بیت، دڵتەنگییەکەت بشارەوە و دڵخۆشییەکەت دەربخە، لەگەڵ خەڵکی بە ئەخلاقی جوان و باش تێکەڵ ببە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((خۆشی و سروری باوەڕدار لە روخساریدایە و دڵتەنگییەکەی لە دڵیدایە))[1].

سکاڵا لای هیچ کەسێك مەکە، چونکە گەر لەلای کەسێك سکاڵا لە حەق بکەیت لەبەرچاوی دەکەویت و لەگەڵ ئەوەش ئەوەی سکاڵات لەدەستی کردووە ناسڕێتەوە، بە شتێك لە کار و کردەوەکانی خۆت سەرسام مەبە، چونکە خۆپەسەندی کردار تێکدەدات و تیایدەبات، هەرکەس کۆمەکی و یارمەتی خودایی لەسەر خۆی بینی خۆپەسەندی لە کردارەکانیدا دەسڕێتەوە، هەموو مەبەستت با بۆ لای ئەو بێت، چونکە ئەو بەزەیی خۆی بۆ تۆ رەوانە دەکات و هۆکاری گەیشتنت بە خودا بۆ ئامادە دەکات، چۆن دەتوانی مەبەست و مەرامت بۆ لای خودا بێت لە کاتێکدا تۆ لە گوفتار و کرداردا درۆزنی، داوای مەدح و سەنا لە خەڵکی دەکەی، و لە زەمکردنیان دەترسی،

[1] تقدم تخريجه.

هەر هەموو رێگەی حەق(عزوجل) راستگۆییە، خوداناسان راستگۆییان هەیە بەبێ درۆ، راستگۆیی بەبێ خۆدەرخستن، کردارەکانیان لە قسەکانیان زۆرترن، ئەوان نوێنەری حەقن(عزوجل) لەناو دروستکراوەکانیدا، ئەوان جێنشینی خودان لەسەریان، بەرپرسی بەش و کۆڵ و باری ئەون لە زەوی خودادا، ئەوان تایبەتمەندان و دەگمەنەکانی خودان، تۆ ئەی دووڕوو هیچ شتێکت لەوان ناچێت، بە دووڕوویەکەت شانشانێییان لەگەڵ مەکە، ئەوە کارێکە بە خۆزگە و ئەوات و وتی وتی بەدەست نایەت، خودایە بمانگێڕە لە صادیقان.

﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ۝٢٠١﴾

البقرة: ٢٠١

هەروەها فەرمووی:

تەنها بە ناو و پۆشینی پۆشاکی ئەوان و زمانلەرێژی بە قسەکانی ئەوان رازی مەبە، چونکە ئەوە سوودێکت پێ ناگەیەنێت لە کاتێکدا کردارەکانت پێچەوانەی ئەوانە، تۆ لێلی و لیخنیت بەبێ پاکی و رۆشنی، تۆ لەگەڵ دروستکراوی نەک لەگەڵ دروستکەر، تۆ دونیایت نەک دوارۆژ، تۆ پووچیت بەبێ راستەقینە، تۆ رووالەتی بەبێ ناوەرۆک، قسەی بەبێ کردار، کرداری بەبێ ئیخلاص، ئیخلاصیت بەبێ شوێنکەوتنی سوننەت، خودا(عزوجل) قسەی بێ کردار قبووڵ ناکات، کرداری بێ ئیخلاص قبووڵ ناکات، بەگشتی هیچ شتێك قبووڵ ناکات لەسەر قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەی(ﷺ) نەبێت، ئەوە بانگەشەیەکی بێ بەڵگەیە، گومانی تێدا نییە شتێکت لەوە لێ وەرناگیرێت، گەر قبوولی خەلکیت بۆ بەدەست بێت لەگەڵ درۆکەت ئەوا قبووڵ کردنی خودات(عزوجل) بۆ بەدەست نایەت، چونکە زانایە بەوەی لەناو دڵتدایە، خۆت بە زرق و برق مەرازێنەوە، چونکە بۆ جیاکردنەوەی ئەسڵی لە نائەسڵی کەسی شارەزا و بینەر بوونی هەیە، خودا(عزوجل) لە دڵت ورد دەبێتەوە نەک لە رووالەتت، تەماشای ئەو دیوی پۆشاك و پێست و ئێسقان دەکات، تەماشای تەنهایت دەکات نەک ئاشکرا و تێکەڵاویت، تۆ شەرم ناکەیت ئەوەی جێگەی تەماشاکردنی دروستکراوە دەیرازێنیتەوە

و ئـەوەی جێگـەی تەماشـاکردنی حەقـە(عزوجل) پـیس و ناشـیرین دەکـەی؟ گـەر سەرفرازیت گەرەکە تەوبـە بکـە لـە هـەموو گوناهـەکان و لـە تەوبەکـەدا ئیخلاصت هەبێت، تەوبە بکە لە هاوەڵدانانت بۆ خودا بەهۆی دروستکراوەوە، هیچ کارێك ئـەنجام مەدە بۆ خودا نەبێت، من دەبینم هەموو بوونی تۆ لێوانلێوە بە هەڵە، چونکە لەگـەڵ نەفس و ئارەزوو و دونیا و حەز و چێژدای، خۆدارنینەکەت مێشـوولەیەکە پارووپـەکت لێ تاڵ دەکات، بۆ رازیبوونی نەفست رازی دەبیت و بۆ نارازیبوونی نارازی دەبیت، تۆ بەندەی نەفسی خۆتی، رەشـوەت بـە دەسـتی نەفسـەوەیە، تـۆ لـە کـوێ و بەنـدەکانی خودا(عزوجل) لە کوێ، ئەو بەندانەی بەندایەتیان بۆ خودا و رازیبوون بـە کردارەکـانی بۆ هاتە دی، ئافەت بەسـەریاندا دادەبارێـت ئـەوان وەك چـیای دامـەزراو راوەسـتاون، ئافەت بۆ ئەوان و بەسـەر ئەوانـدا دادەبارێـت ئـەوان بـە چـاوی ئـارامگرتن و تـەبایی تەماشای دەکەن، جەستەی خۆیان بۆ بەلا جێهێلا و بە دڵیان بەرەو لای حەق(عزوجل) فرین، ئەوان رەشماڵی بێ پیاوانن، قەفەسی بێ باڵندەن، رۆحـەکانیان لـەلای خودایـە و جەستەکانیان لەبەردەستیدایە، ئـەی ئەوانـەی پشـتتان لـە پـەروەردگار کـردووە، ئـەی ئەوانەی لە پەروەردگارتان نامۆبوون، وەرن بۆ لام تا نێوانخۆشـی بخەمـە نێـوان ئێـوە و خوداوە، بۆ ئێوە داوای لێ بکەم، ئاسایشتان لە ئەوەوە بۆ وەربگرم، لەبەری بپارێمەوە، تا مافەکانی ئەو کە لەسەر ئێوەیە بە ئێوە بگەیەنم.

خودایە، بمانگێرەوە بۆ لای خۆت و لەبەر دەرگای خۆت راوەسـتاومان بکـە، بمانکـە بە بەشی خۆت و لەبەر خۆت و لەگەڵ خـۆت، رازیمـان بکـە بـە خزمـەتکردنی خـۆت، وەرگرتن و بەخشینمان وا لێ بکە بۆ تۆ بێت، ناوەوەمان لە هەرچی شتە جگە لە خۆت پاك بکەرەوە، لەو شوێنانەی نەهیت لێکردووین مەمانبینە، لەو شـوێنانەی فـەرمانت پێکردووین بزرمان مەکە، دەرەوەمان لە یاخیبوون لە تۆ خەریك مەکە و ناوەوەمان بە هاوەڵدانان بۆ تۆ داگیر مەکە، لە نەفسی خۆمان وەرمـانبگرە بـۆ لای خـۆت، هـەموو بوونمان وا لێبکە بۆ تۆ بێت، بە تۆوە دەوڵەمەند بین و بێنیاز بین لە هەرچی شـتی تـرە جگە لە تۆ، لە بێئاگایی لە خۆت بەئاگامان بهێنە، گوێڕایەڵی و موناجاتی خۆتمان پێ ببەخشە، دڵ و نهێنیمان بە نزیکی لە خۆتەوە پڕ لە چێژ بکـە، دوورمـان بخـەرەوە لـە

یاخیبوون لە تۆ وەك چۆن ئاسمانت لە زەوی دوورخستووەتەوە، لە گوێڕایەڵی خۆت نزیکمان بکەرەوە وەك چۆن لە نێوان ڕەشێتی و سپێتی چاودا نزیکیت دروستکردووە، لەوەی لات ناپەسەندە بەدوورمان بگرە وەك چۆن یوسفت لە گوناهی زلێخا دوورخستەوە.

**هەروەها فەرمووی:**

نەفس و ئارەزوو و سروشتی خۆتان بە ڕۆژووی هەمیشەیی و نوێژی بەردەوام و ئارامگرتنی سەررومڕ بتوێننەوە، گەر توانەی نەفس و ئارەزوو و سروشت بۆ بەندە هاتەراستە ئەو و مەولای خۆی بەبێ ئەرك دەمێننەوە، بە دڵ و نهێنی و مەولاوە دەمێنێتەوە، بە فراوانی بێ تەنگەلانی دەمێنێتەوە، بە عافییەتی بێ نەخۆشی دەمێنێتەوە، خەلکانێکی ژیری هۆشمەند بن و فێربن و کاریکەن و ئیخلاصتان هەبێت.

ئەی گەنج، یەکەجار لە دروستکراوەوە فێر ببە پاشان لە دروستکەرەوە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((هەرکەس کار بکات بەوەی دەیزانێت خودا زانستێکی بۆ دەکات بە میرات کە نەیزانیوە))[1].

هەردەبێت یەکەجار لە دروستکراوەوە فێر ببیت، ئەوەش بریتییە لە فێربوونی حوکم، پاشان لە دروستکەرەوە فێر ببە کە بریتییە لە زانستی لەدونی(العلم اللدوني)، زانستێکە تایبەتە بە دڵ، نهێنییەکە تایبەتە بە نهێنی، چۆن دەتوانی بەبێ مامۆستا شتێك فێرببیت، تۆ لە خانەی حیکمەتدای، داوای زانست بکە، چونکە داواکردنەکەی فەرزە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((داوای زانست بکە با لە چینیش بێت))[2].

ئەی گەنج، هاوەڵی ئەوانە بکە کۆمەکیت دەکەن بۆ جیهادی نەفس، هاوەڵی ئەوانە مەکە کۆمەکی نەفست دەکەن لەسەر تۆ، گەر هاوەڵی شێخێکی ئەزانی دووڕووی خاوەن ئارەزوو و سروشتت کرد ئەوا دەبێتە یارمەتیدەری نەفست لەسەر تۆ، گەورە پیاوان بۆ دونیا هاوەڵیان ناکرێت، بەڵکو بۆ دواڕۆژ هاوەڵیان دەکرێت،

---

[1] قال الحافظ العراقي في تخريج "الإحياء" رواه أبو نعيم في "الحلية".

[2] أخرجه ابن حبان في المجروحين والديلمي في "المسند" والبيهقي في "الشعب".

گەر شێخەکە خاوەنی ئارەزوو و سروشت بوو بۆ دونیا هاوەڵی دەکرێت، بەڵام گەر خاوەنی دڵ و نهێنی بوو بۆ مەولا(عزوجل) هاوەڵی دەکرێت، ئەی ئەو کەسەی خۆی کردووە بە شێخ و سەری مەجلیسی گرتووەتە دەست و شانشانێن دەکات لەگەڵ حاڵی موخلیصان لە پیاوانی خودا، هەتا-بە نەفس و ئارەزووت- داوای دونیا بکەی تۆ منداڵی ئەو سروشتە رووتەی، دەگمەن لە هەموو دەگمەنان ئەوانەن نەفسیان پشت لە دونیا دەکات، بە ویست و هەڵبژاردنی خۆی نەك بە ناچاری وازی لێ دەهێنێت، یان دەگمەن لە هەموو دەگمەنان، دوور لە هەموو دوورێك نەفسیان ئارامی و دڵنیایی رووی لێ دەکات و دەبێت بە دڵ، کاتێك ئەو قسەیە بۆ ئەو راستە لە دونیا و دوارِۆژ و هەرچی شتە جگە لە مەولا(عزوجل) چاوی خۆی کوێر بکات، هەتا بەندە لە پەروەردگاری نزیکتر بێت ترسناکییەکەی زۆرتر و ترسەکەی توندتر دەبێت، بۆ ئەو مەبەستە ترسناکترین کەس لە مەلیکەوە وەزیرەکەیەتی، چونکە لە هەموان زیاتر لە مەلیکەوە نزیکە، باوەڕدار تەنها بە ئیخلاص بە خودای خۆی دەگات، ئەو کات ئەو لەبەر ترسی خەلکیدایە، لەسەر ترسێکی مەزنە، ترسیان خامۆش نابێت تا بە پەروەردگاریان دەگەن، هەر کەس خودا بناسێت ترسی زۆر دەبێت، بۆ ئەو مەبەستە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:

((من لە هەمووتان زیاتر خودا دەناسم و لە هەمووتان زیاتر لە خودا دەترسم))[1].

خودا(عزوجل) دۆستانی خۆی تاقیدەکاتەوە بۆ ئەوەی پاڵفتەیان بکات، ئەوان بەهەمیشەیی لەسەری پێی ترسن لە گۆڕان و ئاڵوگۆڕ، با حاڵیشیان ئاسایش بێت بەڵام دەترسن، بێزار و نیگەرانن با حاڵیشیان سوکنایی و خامۆشی بێت، نەفسی خۆیان لەسەر گەردیلەیەك، دەنکە رەشکەیەك، لاکردنەوەیەك، بچووکترین بێناگایی دادگایی دەکەن، هەر کات سوکنایان بۆ دێت دەفرن، هەرکات بێنیازیان بۆ دێت هەژاری دەردەبڕن، هەر کات ئاسایشیان پێ دەدرێت دەترسن، هەرکات پێیان دەبەخشرێت دەستدەکێشنەوە، هەرکات دەیانهێننە پێکەنین دەست بە گریان دەکەن، هەرکات دڵیان

---

[1] تقدم تخریجه

خۆشدەکەن دڵتەنگی دایاندەگرێتەوە، لە وەرچەرخانی نەیار و سەرئەنجامی خراپ دەترسن، ئەوان دەزانن پەروەردگاریان(عزوجل):

﴿ لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾ الأنبياء: ٢٣

**تۆ ئەی کەسی بێئاگا**، لەگەڵ حەق(عزوجل) زۆرانبازی و سەرپێچی دەکەی و پاشان داوای ئاسایشی لێ دەکەی، بەم نزیکانە ئاسایشەکەت دەگۆڕێت بە ترس، و بەرینییەکەت بۆ تەنگەلانی، و عافییەتەکەت بۆ نەخۆشی، و عیززەتەکەت بۆ زەلیلی، و بەرزبوونەوەکەت بۆ دابەزین، و دەوڵەمەندییەکەت بۆ هەژاری، بزانە ئاسایشەکەت لە رۆژی دواییدا لە سزای خودایی بەپێی ترسەکەی تۆیە لە خودا لە دونیادا، ترسیشت لە دوارۆژدا بەپێی ئاسایشی تۆیە لە دونیادا، بەڵام ئێوە لە دەریای دونیادا رۆچوون و لە بێخی بیری بێئاگاییدا نیشتەجێ بوون، گومانی تێدا نییە ژیانتان وەك ژیانی ئاژەڵانی لێهاتووە و تەنها خواردن و خواردنەوە و جووتبوون و خەو دەزانن، حاڵتان لای ئەهلی دڵ ئاشکرایە، هەڵپە بۆ دونیا و کۆکردنەوەی دونیا و گەڕان بە دوای رۆزیدا لە رێگەی حەق(عزوجل) و دەرگای حەق دابڕیون، ئەی ئەو کەسەی هەڵپەکردنەکەی رسوا و شەرمەزاری کردووە، گەر تۆ و هەموو ئەهلی سەر زەوی کۆببنەوە بۆ ئەوەی شتێکت بۆ بهێنن کە بۆت نەبڕاوەتەوە ناتوانن بۆت بهێنن، واز لە هەڵپەکردن و داواکردنی ئەو شتانە بهێنە بۆ تۆ بڕاونەتەوە و ئەو شتانەی بۆ تۆ نەبڕاونەتەوە و بڕیاری لێنەدراوە، بۆیە هەڵپە وازلێبهێنە بۆ ئەو شتانەی بۆت بڕاوەتەوە و ئەو شتانەی بۆت نەبڕاوەتەوە، کەسی ژیر چۆن کاتی خۆی بە شتێکەوە بەفیڕۆ دەدات کە بڕاوەتەوە، دروستکراو لە دڵت دەربکە و لە زیان و قازانج و پێدان و لێگرتنەوە و مەدح و زەم و رێزلێگرتن و سوکایەتی پێکردن و رووتێکردن و پشتتێکردندا مەیانبینە، باوەڕت وابێت زیان و قازانج لە خوداوەیە، و خێر و شەڕ لەدەستی ئەودایە و لەسەر دەستی دروستکراو جاریان دەکات، گەر ئەمانە لە تۆدا هاتنە دی دەبێت بە سەفیری نێوان دروستکراو و خودا(عزوجل)، دەستی ئەوان دەگریت بۆ دەرگای خودا، ئەوان دەبینی وەك ئەوەی نەبوو بن بەراورد بە خۆت، یاخیبووان لە پەروەردگاریان وەك شێت و ئەزان دەبینی،

بۆیە مەداراتیان دەکەی(لەگەڵیان هەڵدەکەی) و بۆیان باش دەبیت و لەسەر ئازار و نەزانینیان ئارام دەگری، گوێڕایەڵانی خودا بریتین لە زانایان ژیرمەندان، یاخیبوان لە پەروەردگاریان(عزوجل) بریتین لە نەزانە شێتەکان، یاخیبوو خودای خۆی نەناسی و لێ یاخی بوو و شوێنی شەیتانەکەی کەوت و تەبایی لەگەڵ پەیدا کرد، گەر نەزان نەبوایە یاخی نەدەبوو، گەر نەفسی خۆی بناسیبایە و بیزانیبایە فەرمانی بە خراپە پێ دەکات لەگەڵی تەبا نەدەبوو، زۆرجار لە ئیبلیس و داروودەستەکەی ئاگادارت دەکەمەوە، بەڵام تۆ هاوەڵی دەکەی و لێی قبووڵ دەکەی، داروودەستەی شەیتان بریتین لە نەفس و دونیا و ئارەزوو و سروشت و هاوەڵانی خراپ، لە هەموو ئەمانە بەئاگابە، چونکە سەراپا دوژمنن، تەنها یەك کەس تۆی خۆشدەوێت ئەویش بریتییە لە خودا(سبحانە وتعالی)، ئەو تۆی بۆ خۆت دەوێت، بەڵام کەسانی تر تۆیان بۆ خۆیان دەوێت، گەر لەباری تەنهاییدا نەفسی خۆت بزر کرد و لەگەڵ داواکەراندا داوات کرد ئەوکات تەنهاییەکەت دەبێتە هۆگربوون بە خوداوە(عزوجل)، گەر نەفست لەگەڵ دونیا وازلێهێنا و دڵت لەگەڵ دواڕۆژ و نهێنیت لەگەڵ مەولا(عزوجل) ئەوکات خەڵوەتەکەت دەبێتە هۆگربوون بە خوداوە(عزوجل)، بەڵام لەگەڵ بوونی نەفس و کەسانی تردا خەڵوەتت بۆ نایەتە دی، خەڵوەت لەگەڵ خودا کاتێکە لە کەسانی تر تەنهاکەوتبیت، کاتێك خودا دەبینییەوە لە کەسانی تر بێزار بیت، چۆن پاکێتی و ڕوونی ڕووت لێ دەکات گەر پاکێتی و ئەهلی پاکێتی نەبینیت؟ گەر حاڵی خۆت هێنایە دی پیاوانی حەق(عزوجل) دەبینیت، گەر دەرگای مەلیکت بینی لەو جێگەیە خزمەتکاران دەبینی بەپێوە وەستاون و تۆش سەرقیان دەدەی، پێت لە دەرگای حەق ئەناوە و ئەتبینیوە ئیتر چۆن خزمەتکارانی شوێنە هەڵدەکرێت و بە خودا پێشکەشت دەکات و بەئاگات دەهێنێت، درۆش دەبینی؟ قسە نییە هەتا خودا(عزوجل) دەبینی، ئەوکات صدق دەبینی، صدق لەو دەتگێڕێتەوە و خەوت لێ دەخات، لەگەڵ ڕاستگۆیان بە تا بەو جۆرە مامەڵەت لەگەڵ بکرێت کە لەگەڵ ئەوان مامەڵە کرا، لە گوفتار و کرداردا ڕاستگۆ بە و لە هەموو حاڵەکاندا ئارام بگرە، صدق بریتییە لە یەکتاپەرستی و ئیخلاص و تەوەکول لەسەر خودا(عزوجل)، حەقیقەتی تەوەکول بریتییە لە بڕینی هۆیەکان و دەرچوون لە هەوڵ و

هێزی خۆت لەڕووی دڵ و نهێنییەوە، گەر دەتەوێ پێیەوە پەیوەست بیت پەیوەستبوونەکان بە کەسانی ترەوە بپڕە و پشت لە خۆت و لەوان بکە، پشت لە رووداو بکە تا دەگەیە خودا، هەتا رووداو لەگەڵ تۆ و ئەوان بێت سەرفراز نابیت، نزیکی حەق(عزوجل) شانشانێن هەڵناگرێت، لە هەزاران هەزار کەس لە ئێوە تەنها یەك کەس تێدەگات لەوەی دەیڵێم و کاری پێ دەکات، ئەوانی ترتان دەچنە ناو نەزانی و سەرگەردانییەوە، بە ئامادەبوونتان لەگەڵ ئەو تاکە کەسە فەڕ و بەرەکەت وەردەگرن، من رجای خێرتان بۆ دەکەم لە دونیا و دوارِۆژدا، دونیا بەندیخانەی باوەڕدارە گەر بەندیخانەکەی لەبیرکرد دەرووی لێدەکرێتەوە، باوەڕداران لە بەندیخانەدان، عاریفانیش لە شوکردان، ئەوان لە بەندیخانە بێئاگان، پەروەردگاریان شەرابی شەوق بۆ لای خۆی و شەرابی هۆگری بە ئەو و شەرابی داوا بۆ ئەو و شەرابی بێئاگایی لە دروستکراو و ئاگاهی بە خۆیەوە دەرخوارد داون، هەموو ئەم شەرابانەی دەرخوارد داون، بۆیە لە خەلکی کەناریان گرت و بە خوداوە و لەگەڵ خودا هۆشیان کردەوە، لە بەندیخانەکە و بەندییەکانی ناوی بێئاگابوون، ئاگر و دۆزەخیان لە دونیا بۆ پێشخرا، کێبەرکێ و ململانێ ئاگرەکەیانە و رازیبوون بە قەزا بەهەشتەکەیانە، بێئاگایی ئاگری ئەوانە و بەرهۆشی و ئاگاهی بەهەشتەکەیان، قیامەت بۆ خەلکی رەشۆکی بریتییە لە دادگایی کردن، بۆ خەلکی تایبەتیش بریتییە لە لۆمەکردن، چۆن ئەوان بەو جۆرە نین لە کاتێکدا قیامەتیان لەسەر خۆیان هەستاندووە و هێشتا لە دونیادان، بەر لە لێدان گریاون، بۆیە گریانەکە لە کاتی لێداندا هات بە هانایانەوە و سوودی پێگەیاندن.

سوفیانی سەوری(رەحمەتی خودای لێ بێت) لە خەوندا بینرا و پێی وترا: خودا چی لەگەڵ کردی؟

وتی: لەبەردەستی خۆیدا رایوەستاندم و پێی فەرمووم: ئەی سوفیان، نەتدەزانی من "غفور رحیم"م ئەو هەمووە لە ترسی من گریای، شەرمت لە من نەدەکرد؟ کەزج لە سروشت و ئارەزوو و شەیتانەکەت بکە و لایان بەلادا مەکەرەوە، گەر ئەمە جێگیر و دامەزراو بوو ئەوا لە نێوان خۆت و دۆستانی خراپدا دوژمنایەتی بەرپا بکە و بەراستیان مەزانە تا لە حاڵدا لەگەڵت تەبا دەبن، تەوبە بریتییە لە ژێرەوژوور کردنی

دەوڵەتێك، هەر کەس تەوبە بکات و گۆڕان نەهێنێت بەسەر ئەوەی بەر لـە تەوبەکەی لەسەری بوو ئەوا لە تەوبەکەیدا درۆی کردووە، کاتێك تۆ دەگۆڕیت ئەویش دەگۆڕێت، خودا(عزوجل) دەفەرموێت:﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡ﴾الرعد: ١١

لە دونیادا ستەم لە هیچ کەس مەکە، چونکە لە دوارۆژدا بەو ستەمە دەگیرێیت، لە دونیادا دادپەروەر بە تا لە ڕێگەی بەهەشت لانـەدەیت، ستەم کاتێـك سـەرهەڵدەدات دادپەروەری وازلێدەهێنن، ئەوەش لە ڕێگەی ئەهلی دادپەروەری لایان دەدات، هەرچی شتە لە جێگەی خۆیان دابنێ تا شوێنێکت لەلای خودا(عزوجل) هەبێت، ئەم سەردەمە کۆتایی زەمانەیە، من دەبینم ئێـوە گـۆڕاون و ئاڵوگۆڕتـان بەسـەردا هـاتووە، مـن لـە گۆڕان و ئاڵوگۆڕ بەسەر ئێوەدا دەترسـم، هـەر دەبێـت شـتەکان بگـۆڕێن و ئاڵوگۆڕیـان بەسەردا بێت، بەڵام هەندێ لە حەڵاڵ هەیە دەشارێتەوە، ئەی دروستکراوانی خودا، من داوای چاکبوونی ئێـوە دەکـەم و بەگشـتی قـازانجی ئێـوەم گەرەکـە، هیـوام داخسـتنی دەرگای دۆزەخ و نەبوونی دۆزەخە بەتەواوی، تاکو هیچ کەسـێك لـە دروسـتکراوەکانی خودای تێنەچێت، هەر بەو جۆرە هیوام کردنەوەی دەرگای بەهەشتە تاکو هیچ کـام لـە دروسـتکراوەکانی خودا نەمێنێتەوە ڕێگری بکرێت لە چوونە نـاوی، بۆیـە ئـەم هیوایـە دەخوازم، چونکە ئاگاهیم هەیە لە بەزەیی و سۆزی بەرینی خودا بۆ دروستکراوەکانی، دانیشتنی من لەم جێگەدا بۆ چاککردن و پاککردنی دڵی ئێوەیە، نەك بۆ گۆڕینی قسە و پاککردنی قسە، لە زبری قسەکانم ڕامەکەن، چونکە هـەموو ڕەبانییـەك بـۆ ئـایینی خـودا قـسـەکانی زبـرە، قـسـەکانم زبـرن، خۆردنەکـەم زبـرە، هـەر کـەس لـە مـن و هاوشێوەکانی من رابکات سەرفرازی بەدەستناهێنێت، گەر بێنەدەبیت بەخەرجدا لـەو شتانەی بۆ دین دەگەڕێتەوە وازت لێ ناهێنم و پێت ناڵێم ئەو کـارە بکـە و گـوێم لـێ نییە لەلام ئامادە بیت یان بڕۆ، هەوڵی من بە خوداوە و لە خوداوەیە نەك لە ئێـوەوە، من لە ژمارە و سەرژمێری ئێوە کەنارمگرتووە، ئەوەی من تێیدام بە زمان ناگۆڕێـت، بەڵکو بە ویژدان دەگۆڕێت، نە ڕاست و نە چـەپ و نـە دواوە، بـەڵکو پێشـەوە، تـەنها سینەی بێ پشت، شوێنکەوتەی پێغەمبەران و نێراوانی خودا(علیهم الصلاة و الـسلام) و پێشینی صالح، بەردەوام بە دوای ئەواندا تەکان بە خۆم دەدەم بۆ گەیشتن بە خانـەی

ترێکی لە خوداوە، لە گوناهان و ئەدەبی خراپتان تەوبە بکەن، ئەمامی تەوبە لە کێڵگەی دڵدا بچێنن، کۆشکێك لە دڵدا بینا بکەن، بینای شەیتان بڕوخێنن و بینای ڕەحمان دروست بکەن بە مەولا و پەروەردگاری خۆتان دەگەیەنم، من لەگەڵ کرۆك وەستاوم نەك لەگەڵ توێکڵ، ئەم ڕووالەت و ئاشکرایە توێکڵە، بۆیە بە پەروەردەکردنیەوە خۆم ماندوو ناکەم، بەڵکو کرۆکی ئێوە پەروەردە دەکەم و توێکڵەکەتان وەلا دەنێم، پەروەردەتان دەکەم بۆ ئەوەی چاوی پێغەمبەرەکەتان(ﷺ) بە بینینی ئێوە ڕۆشن ببێتەوە.

**ئەی گەنجان**، بۆ دونیا هاوەڵیم مەکەن، تەنها بۆ دوارۆژ هاوەڵیم بکەن، گەر هاوەڵی ئێوە بۆ من -بۆ دوارۆژ- هاتە ڕاستە دونیا ڕووتان لێ دەکات وەك پاشکۆ و شوێنکەوتە و دەستەبەری ئەو، ئەو کات دەست بۆ دونیا دەبەن لەسەر برێك لە زوهد تیایدا، و منیش دەستەبەری ئەوەتان بۆ دەکەم لەسەر ئەو دەستبردنە بۆ دونیا دادگایی نەکرێن، دوارۆژ بەسەر دونیادا پێشبخەن، ناوەوە بەسەر ئاشکرادا پێشبخەن، حەق بەسەر باتڵدا سەربخەن، باقی بەسەر فانیدا پێشبخەن، دونیا وازلێبهێنن و پاشان دەستی بۆ ببەن و وەریبگرن، وەرگرتن بە دەستی سروشت و ئارەزوو و نەفس وازلێبهێنن، لە دەستی دڵ و نهێنی وەریبگرن، وەرگرتن لە دەستی دروستکراو وازلێبهێنن و لە دەستی دروستکەر وەریگرن، گوێڕایەڵی پێغەمبەر بن و لە ئەوەوە وەریگرن ئەو فەرمان و نەهیانەی بۆ ئێوەی هێناوە، خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟﴾

الحشر: ٧

بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی خودا(عزوجل) هەڵمەتی دڕندەتان هەبێت و لە نەهیلێکراوەکانیدا نەخۆش بن و لە هاتنی قەزا و قەدەریدا مردوو بن، لەگەڵ ئەمەش بە ئەخلاقی جوان و باش تێکەڵ بە خەڵکی ببن، ئەوە داوا بکەن لە خودا کە لە زانستی خودادایە لە ئێوەدا، لەگەڵ خودا لە حوکم و قەدەرەکانی لە ئێوە و کەسانی تردا تەبا بن. لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: ((کاتێك خودا(عزوجل) قەڵەمی

دروستکرد، پێی فەرموو بنووسە، وتی: چی بنووسم؟ فەرمووی: بڕیاری من لە دروستکراوەکانمدا هەتا ڕۆژی دوایی بنووسە))[1].

ئەی دڵمردووانی نەفس زیندووان، دڵی ئێوە مردووە، بۆیە لەپێشترە لە تەعزێباری دڵی خۆتاندا بن تا تەعزێباری بەڵا و ناخۆشی سەر کەسانی تر، مردنی دڵ بریتییە لە بێئاگایی لە خودا(عزوجل) و یادی خودا، هەر کەس لە ئێوە دەیەوێت دڵی زیندوو بکاتەوە با یادی حەق و هۆگری بە حەقی(عزوجل) تێدا جێگیر بکات، لە دەسەڵات و شکۆمەندی ئەو(سبحانە وتعالی) ورد ببێتەوە، سەرنجی هەڵسوکەوت و دەستێوەردانەکانی بکات لەناو دروستکراوەکانیدا.

ئەی گەنج، یەکەمجار بە دڵ یادی حەق(عزوجل) بکە، پاشان بە دەرەوەت(قاڵب) یادی بکە، بە دڵ هەزار جار و بە زمان یەك جار، لە کاتی هاتنی ئافەتدا بە نارامگرتن یادی بکە، لە باری هاتنی حەقدا بە یەکتاپەرستی یادی بکە، لە باری هاتنی کەسان و شتانی تر جگە لە خودا بە پشتتکردن لێیان یادی خودا بکە، گەر ڕەشۆت بۆ نەفس شل کرد چاوت تێدەبڕێت و تووشی هەڵدێرت دەکات، بە لەغاوی وەرع لغاوی بکە، و وتی وازلێبهێنە، یادی مردن دڵت پاڵفتە دەکات و دونیا و دروستکراوت لەبەرچاو دەخات، پەردە لەسەر دڵت لادەدرێت، ئەوکات دروستکراو بە فانی و مردوو و تیاچوو و دەستەوسان و بێ زیان و بێ قازانج دەبینی.



[1] صحيح، رواه الحاكم في مستدركه ورواه الترمذي مرفوعا.

# مەجلیسی پەنجا

## خۆلێکردنەوە لە دونیا

بەیانی رۆژی هەینی لە مەدرەسەکەی ١٨/شەعبان/٥٤٥هـ -دوای هەندێ قسە- فەرموی:

بە خۆ چاککردن و چاکبوونی خۆتەوە سەرقاڵ بە و واز لە وتی وتی و هەوەسبازی دونیا بهێنە، هەتا دەتوانی خۆت لە خەم و پەژارەی دونیا یەکلا بکەرەوە، پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: ((هەتا دەتوانن لە خەم و پەژارەی دونیا خۆتان یەکلابکەنەوە))[1].

**ئەی نەزان بە دونیا**، گەر بتناسیبایە داوات نەدەکرد، گەر بێت بۆ لات ماندوو و شەکەتت دەکات، گەر پشتت لێ بکات حەسرەت داتدەگرێتەوە، گەر خودات(عزوجل) بناسیبایە ئەوا بە خوداوە شتەکانی ترت دەناسی، بەڵام تۆ نەزانیت بە خودا و نێراوەکان و پێغەمبەران و دۆستانی خودا.

**هاوار بە حاڵت**، ئایا پەند وەرناگریت لەوەی لە دونیا بەسەر کەسانی تردا جاری بوو، داوای رزگاری بکە لە دەستی دونیا، پۆشاکی دونیا فڕێدە و لەدەستی رابکە، پۆشاکی نەفس فڕێدە و بەرەو دەرگای حەق(عزوجل) هەنگاو هەڵبگرە، گەر لە پۆشاکی نەفست هاتییە دەرەوە ئەوا لە هەرچی شتە جگە لە خودا رزگارت بووە، گەر هەرچی شتە جگە لە خودا شوێنکەوتەی نەفس بێت ئەوا خۆت لە نەفست کەناگیر بکە، ئەوکات پەروەردگارت(عزوجل) دەبینییەوە، خۆت رادەستی ئەو(سبحانه وتعالى) بکە سەلامەت دەبیت، لەپێناویدا بکۆشە هیدایەت وەردەگریت، شوکری بکە زیادە

---

[1] رواه الحافظ الهيثمي في "المجمع" وقال: رواه الطبراني في "الكبير" و "الأوسط".

بەدەست دەهێنیت، خۆت و هەموو دروستکراوەکان رادەستی ئەو بکە، لە خۆت و خەڵکانی تردا بەرهەڵستی خودا مەکە، خوداناسان لەگەڵ خودادا ویست و هەڵبژاردنیان بۆ نییە، بۆ داوای بەشی خۆیان هەڵپە ناکەن و تەماشای بەشی کەسانی تر ناکەن، گەر دەتەوێ لە دونیا و دوارۆژدا هاوەڵی خوداناسان بکەی ئەوا لە گوفتار و کردار و ویست و هەڵبژاردندا لەگەڵ خودا تەبا بە، من دەبینم تۆ کارەکەت پێچەوانە کردووەتەوە شەوانە و رۆژانە سەرپێچی لە خودا دەکەی و کێبەرکێت لەگەڵی کردووە بە نەریت، پێت دەفەرموێ ئەوە بکە نایکەی، پێت دەفەرموێ ئەوە مەکە دەیکەی، وەك ئەوەی(معاذ الله) خودا بەندە بێت و تۆ پەرستراو بیت، پاکێتی بۆ خودا چەندە حەلیمە! گەر حەلیم نەبوایە پێچەوانەی ئەوانەت لەلای خۆت دەبینی، گەر سەرفرازیت دەوێ لەبەردەستیدا خامۆش بە، خامۆشی دەرەوە بەبێ خامۆشی ناوەوە لەلای من کەمنەدەبییە، تەنها وەك روخسەتێك دەیبینم، فەرمان جێبەجێ بکە و لە نەهیلێکراو خۆتبگرەوە و لەگەڵ قەدەر تەبابە و لەبەردەستیدا دەرەوە و ناوەوەت لە قسەکردن خامۆش بکە ئەوکات خێری دونیا و دوارۆژ دەچنییەوە، داوای هیچ شتێك لە خەڵکی مەکە چونکە ئەوان دەستەوسان و هەژارن و بۆ خۆیان و خەڵکی زیان و قازانجیان لەدەستدا نییە، لەگەڵ خودا ئارام بگرە و پەلەی لێ مەکە و بە دەستنوقاوی مەزانە و لەسەر شتەکان تۆمەتباری مەکە، چونکە ئەو(سبحانه وتعالى) لە خۆتان بۆ خۆتان بەبەزەییترە، هەر بەو جۆرە لە تۆ بۆ خۆت بەبەزەییترە، بۆ ئەو مەبەستە یەکێك لە خوداناسان دەڵێت: چی لەسەر منە، لەگەڵ خودا(عزوجل) تەبا بن، ئەو لە ئێوە بە ئێوە زاناترە، مەرج نییە هەموو شتێك بەرژەوەندی ئێوەی تێدا بێت ئێوەی لێ بەئاگا بکات، خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿وَعَسَىٰ أَن تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَعَسَىٰ أَن تُحِبُّوا شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ ۗ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢١٦﴾﴾ البقرة: ٢١٦.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨﴾﴾ النحل: ٨.

هەروەها: ﴿وَمَا أُوتِيتُم مِّنَ الْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾﴾ الإسراء: ٨٥

هەرکەس دەیەوێ ڕێگەی حەق(عزوجل) بگرێتە بەر با بەر لە گرتنەبەری ڕێگەکە نەفسی خۆی پاڵفتە بکات، ئەدەبی نەفس خراپە، چونکە فەرمان بە خراپە دەکات، لەلای حەق(عزوجل) چی دەکات و چۆن ڕێگە بۆ لای ئەو دەگریتە بەر؟ لەگەڵ نەفست بکۆشە تا دڵنیا و ئارام دەبێتەوە، گەر دڵنیا و ئارام بوویەوە هاوەڵی بکە و لەگەڵ خۆت بیبە بۆ دەرگای خودا، دوای وەرزش پێکردن و فێرکردن و ئەدەبی جوان و دڵنیایی و ئارامی لە بەڵێن و هەڕەشەی خودایی هاوەڵی بکە، نەفس کوێر و کەڕ و کەڵفام و گێل و نەزانە بە پەروەردگاری(عزوجل) و دوژمنە بە ئەو، بە بەردەوامی تێکۆشان دژ بە نەفس چاوی دەکرێتەوە و زمانی گۆ دەکات و گوێیەکانی دەبیستن و کەڵفامی و نەزانین و دوژمنکارییەکەی بۆ پەروەردگاری نامێنن، ئەمە پێویستی بە حەبل و پیاو و بەردەوامی سات لەدوای سات و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ و ساڵ لەدوای ساڵ هەیە، ئەمە بە تێکۆشانی ساتێك، ڕۆژێك، مانگێك بەدەست نایەت، بە قەمچی برسیکردن لێیبدە، لە بەشەکانی بێبەشی بکە و ئەرکەکانی بەتەواوی بەسەردا بسەپێنە، بار لەسەر شانی دابنێ و لە شمشێر و چەقۆکەی مەترسە، شمشێرەکەی دارینە و لە ئاسن دروستنەکراوە، قسەی بێ کرداری هەیە، درۆی بێ صدقی هەیە، پەیمانی بێ وەفای هەیە، خۆشەویستی بۆ نییە، پەلاماری بێ دەوڵەتە، ئیبلیس کە ئەمیری نەفسە هیچ هێزێکی نییە لەسەر باوەڕدارانی ڕاستگۆ لە دوژمنایەتی کردنی و سەرپێچی لێی، ئەی ئیبلیس چۆنە؟ وا گومان مەبە ئیبلیس بەهێزی خۆی ڕۆیشتووەتە بەهەشتەوە و ئادەمی(علیه السلام) بەدەرکردن داوە، بەڵکو حەق(عزوجل) بۆ ئەو کارە بەهێزی کرد و گێڕای بە "هۆ" نەك بە ئەسڵ، ئەی کەم فام لە دەرگای حەق(عزوجل) رامەکە بەهۆی بەڵایەکەوە کە تووشت بووە و تاقیتدەکاتەوە، چونکە ئەو لە خۆت بە بەرژەوەندییەکانی تۆ زاناترە، ئەو بۆ سوود و حیکمەتێك تۆ تاقیدەکاتەوە، گەر تووشی بەڵای کردی دامەزراوبە و بگەڕێوە بۆ گوناهەکانت و زۆر داوای لێخۆشبوون و تەوبە بکە و بپاڕێوە ئارامی و دامەزرانت پێ ببەخشێت، لەبەردەستیدا بوەستە و دەست بە پەتی ڕەحمەتی ئەوەوە بگرە و داوای لێ بکە ئەو بەڵایەت لەسەر لابدات و ڕووی بەرژەوەندی ئەو بەڵایەت بۆ ئاشکرا بکات، گەر سەرفرازیت دەوێ هاوەڵی

شێخێکی زانا بە حوکمی خودا بکە، زانستی ئەو فێرت دەکات و ئەدەبت دادەدات و ڕێگەی بەرەو خودات پێ نیشان دەدات، هەردەبێت مورید پێشەوا و ڕێنیشاندەرێکی هەبێت، چونکە ئەو لە دەشت و سارادایە و پڕە لە دووپشك و مار و ئافەت و تینوێتی و دڕندە و تیاچوون، ئەو ڕێنیشاندەرە لەم ئافەتانە ئاگاداری دەکاتەوە و شوێنی ئاو و درەختی بەرداری پێ نیشان دەدات، گەر بەتەنها بێت و ڕێنیشاندەری لەگەڵ نەبێت دەکەوێتە زەوی سەخت و چۆڵ و پڕ لە دڕندە و دووپشك و مار و ئافەت، ئەی ئەو کەسەی ڕێگەی دونیات گرتووەتە بەر لە کاروان و ڕێنیشاندەر و کاروانچییان جیامەبەرەوە، ئەگینا ماڵ و ڕۆحت دەنێیی لەبانی، تۆش ئەی ئەو کەسەی ڕێگەی دوارۆژت گرتووەتە بەر بەهەمیشەیی لەگەڵ ڕێنیشاندەر بە تا دەتگەیەنێتە مەنزڵ، لە ڕێگە خزمەتی بکە و ئەدەبی جوانت بەرانبەری هەبێت و لە ڕای ئەو دەرمەچۆ، چونکە ئەو فێرت دەکات و لە خودا نزیکت دەکاتەوە، پاشان لە ڕێگە تۆ دەکات بە نوێنەری خۆی کاتێك پێکەوتویی و صدق و زیرەکی تۆ دەبینێت، دەتکات بە ئەمیری قافڵەکە و دەسەڵاتت بەسەر کاروانچییاندا پێ دەبەخشێت، لە کاروانەکانیدا تۆ دەکات بە جێنشینی خۆی، بەردەوام لەسەر ئەو حاڵە دەبیت تا دەتگەیەنێت بە پێغەمبەر(ﷺ)، تۆی ڕادەستی ئەو دەکات و چاوی بە تۆ ڕۆشن دەبێتەوە، پاشان دەتکات بە نوێنەری خۆی لەسەر دڵان و حاڵ و ماناکان، ئەوکات دەبیتە سەفیری نێوان خودا و دروستکراوەکانی وەك خزمەتکارێك لەبەردەم پێغەمبەرەکەتدا(ﷺ)، جار لەدوای جار دەچیت بۆ لای خەڵك و خودا، ئەمە کارێکە بە دەستبەتاڵی و خۆزگەخواستن بەدەست نایەت، بەڵکو بە شتێك کە لە سینەدا دانراوە(ئیمان) و کردار بەڕاستی دەگەڕێنن، خوداناسان لە هەر هەزار دانەیەك لە عەشرەتەکان دەرهێنراون، بەدڵ و مانایان قسەی خودا(عزوجل) دەبیستن و بە کاری ئەندامەکانیان ئەو قسانە بەڕاست دەگێڕن، ئەی نەزانان، تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خودا(عزوجل)، بگەڕێنەوە بۆ سەر ڕاستەشەقامی صدیقان و لە گوفتار و کرداریاندا شوێنیان بکەون، شوێنی تووڵەڕێی دووڕووان مەکەون، ئەوانەی داوای دونیا دەکەن و لە دوارۆژ پشتیانهەڵکردووە و ڕێگەی حەقیان(عزوجل) وازلێهێناوە، ئەو ڕێگەیەی پێشینانی صالح لەسەری بوون، لە

ڕاست و چەپ و دواوە وەردەگرن، شوێنی ڕێگەی تەمبەڵان کەوتن و ڕاستەشەقامی صالحانیان نەگرتە بەر، ئەو ڕێگەیەی ئەوانی بە حەق(عزوجل) دەگەیاند.

**ئەی گەنج**، ئەوانەی لە دونیادا بۆ دونیا تێکەڵیان دەبێت سبەینێ نایانبینیتەوە و پەتی پەیوەندی نێوانتان دەپچڕێت، چۆن پەتی پەیوەندی نێوانی تۆ و هاوەڵە خراپەکانت ناپچڕێت لە کاتێکدا لە پێناوی شتێکدا تێکەڵیان بوویت بۆ خودا نەبووە، گەر هەر دەبێت تێکەڵاوی دروستکراو بکەیت ئەوا تێکەڵاوی ئەهلی وەرەع و زاهیدان و عاریفان و کارکەران و موریدانی حەق(عزوجل) و مورادانی ئەو بکە، تێکەڵاوی کەسێك ببە خەڵکت لێدەکاتەوە و نزیکیت لە خوداوە پێدەبەخشێت، گومڕایت لێدەکاتەوە و لەسەر ڕاستەشەقام دامەزراوت دەکات، چاوت لە دونیا دەبەستێت و بۆ دوارۆژ دەیکاتەوە، سفرە و خوانی دونیا لەبەردەستت هەڵدەگرێت و سفرە و خوانی دوارۆژ لەبەردەمت دادەنێت، شاراوەکانت لێ دووردەخاتەوە و لە جێگەی ئەوە ئازادیت پێ دەبەخشێت، لەناو دووپشك و مار و دڕندەدا ڕاستت دەکاتەوە و لە ئاسایش و ئاسوودەیی و خۆشیدا تۆ دادەنێت، تێکەڵی کەسێك بکە سیفەتی بەو جۆرە بێت و لەسەر قسەکانی ئارام بگرە، فەرمانەکان و نەهییەکانی قبووڵ بکە ئەو کات خێری دونیا و دوارۆژ بەدەست دەهێنیت، مەزنترین ئازایەتی ساتێك ئارامگرتنە، تۆ هەر دەبێت ئارام بگریت، چونکە لە ئارامنەگرتندا هیچ بەرهەم نایەت، زوکاری[1] و زەمیلەیەك بکڕە، و لەبەر دەرگای کاردا دابنیشە، گەر کارت بۆ نووسرابێت ئەوا کارت بۆ پەیدا دەبێت، مافی "هۆ" بدە و تەوەکول بە خودا ببەستە و لەبەر دەرگای کاردا دابنیشە، گەر زوکاریەکەیان برد و تۆیان نەبرد لە شوێنەکەت مەجوولێ تا بێهیوا دەبیت لە هاتنی کەسێك بتبات بۆ کارەکەی، ئەوکات نەفسی خۆت هەڵبدە ناو دەریای تەوەکولەوە و هۆ(سەبەب) و هۆکار(سەبەبکار) کۆبکەرەوە، لەبەردەم مامۆستاکەت ئەدەبت جوان بێت، با بێدەنگیت زیاتر بێت لە قسەکردنت، چونکە ئەوە هۆیەکە بۆ فێرکردن و نزیکیت لە دڵی مامۆستاوە، ئەدەبی جوان نزیکت دەکاتەوە و

[1] لە "الزكرة"ـوە وەرگیراوە، لەوانەیە مەبەستی ئەو دەفرە بێت لە پێست دروست دەکرا.

ئەدەبی خراپ دوورت دەخاتەوە، چۆن ئەدەبت جوان دەبێت لە کاتێکدا تێکەڵاوی خاوەن ئەدەبان ناکەیت؟!

چۆن فێر دەبیت لە کاتێکدا بە مامۆستاکەت رازی نابیت و گومانی باشت پێی نییە؟!



# مەجلیسی پەنجا و یەك

## مەیل نەدان بە دونیا

٢٠/شەعبان/٥٤٥هـ فەرمووی:

دونیا هەمووی حیکمەتە و دوارۆژ هەمووی قودرەتـە، ئەمـەیان لەسەر حیکمـەت بیناکراوە و ئەوەیان لەسەر قـودرەت بینـاکراوە، لـە خانـەی حیکمەتـدا کـار و کردار وازلێمەهێنە و لە خانەی قودرەتدا دەسەڵاتی خودا بە دەستەوسان مەزانە، لـە خانـەی حیکمەتدا بە حیکمەتی خودا کار بکە و شان لەسەر قودرەتی دامەدە، قەدەر مەکە بە بیانوو بۆ نەفسی خۆت، چونکە بەڵگەهێناوە بە قەدەر واتلێدەکات واز لە کار بهێنی، بیـانوو هێنانـەوە بـە قـەدەر بەڵگـەی تەمبەڵەکانـە، بیـانوو هێنانـەوە بـە قـەدەر لـە شتانێکدایە جگە لە ئەمر و نەهی.

**دوای هەندێ قسـە فـەرمووی:** بـاوەڕدار پاڵناداتـەوە بـە لای دونیـا و ئـەوەی لـە دونیادایـە، بەشـی خـۆی لـە دونیـا وەردەگرێـت و دڵـی بـۆ لای حـەق(عزوجل) تەنهادەبێتەوە، لەوێ دەوەسـتێت تـا شـەوقی دونیـای لێدەبێتـەوە و مۆڵـەت بـە دڵـی دەدرێت بچێتە ژوورەوە بۆ لای خودا، سەفارەتی نهێنی ئەو نهێنی بۆ دڵ دەردەهێنێت، دڵیش بۆ لای نەفسێکی ئارام و دڵنیا، و ئەندامەکانیش گوێڕایەڵن، لـە کاتێکدا ئـەو بەو جۆرەیە خودا ماڵ و منداڵی لە ئەو بێنیـاز دەکـات و ئـەو لـە ئـەوان دادەبڕێـت و شەڕی خەڵکی لێ دووردەخاتەوە و بۆ ئەو گوێڕایەڵیان دەکات و دڵی ئەو لە دڵی ئەوان دادەبڕێت، بەتەنها لەگەڵ پەروەردگاری دەمێنێتەوە، وەك ئەوەی دروسـتکراو -بـەراورد بە ئەو- دروستنەکرابێت، وەك ئەوەی تەنها ئەو دروسـتکراوی پـەروەردگارە(عزوجل)، پەروەردگار بە بکەری دەمێنێتـەوە و ئـەو دەبێـت بـە کارتێـداکراو، خـودا دەبـێ بـە داواکەر و ئەو دەبێت بە داواکراو، خودا بە ئەسڵ و ئەو بە لق، هیچ کەسێك نایناسێت و هیچ کەسێك نایبینێت، خودا لە دروستکراوان ئەو دەپێچێتەوە.

﴿ثُمَّ إِذَا شَاءَ أَنشَرَهُ ﴿٢٢﴾﴾ عبس: ٢٢

خودا ئەوی بۆ بەرژەوەندی و هیدایەتی ئەوان لەناویاندا داناوە، لەسەر ئازاریان بۆ ڕەزامەندی حەق(عزوجل) ئارام دەگرێت، خوداناسان نیگابانی دڵ و نهێنی و پەنهانن، لەگەڵ حەق(عزوجل) ڕاوەستاون نەك لەگەڵ کەسانی تر، بۆ خودا کار دەکەن نەك بۆ کەسانی تر، ئەی کەسی دووڕوو تۆ هەواڵێکت لە خوداناسان نییە، هەواڵێکت لە ئیمان نییە، هەواڵێکت لە هۆگربوون بە خوداوە نییە، بەم نزیکانە دەمریت و دوای مردنەکەت پەشیمان دەبییەوە، بە پاراویی زمان و لاڵی ویژدان قەناعەتت کرد، ئەوەش سوود و قازانجێك بە تۆ ناگەیەنێت، پاراویی بۆ دڵە نەك بۆ زمان، هەزار جار بەسەر نەفسی خۆتدا بگری و بەسەر کەسانی تردا تەنها یەك جار، ئەی دڵمردووی بزر و نادیار لە کۆڕی خوداناسان، ئەی ئەو کەسەی پشتت هەلکردووە و بە خۆت و خەلکی پەردەت لە نێوان خۆت و خودا دروستکردووە، خودایە، من کەسێکی لاڵ بووم تۆ منت هێنایە گۆ، داوات لێ دەکەم بە قسەکانم سوود بە خەلکی بگەیەنیت و لەسەر دەستی من چاکبوونی ئەوان کامڵ بکەی، ئەگینا خودایە جارێکی تر بمگێڕەوە بۆ زمان لاڵی.

خەلکینە، من ئێوە بۆ مردنی سوور بانگ دەکەم، ئەوەش بریتییە لە سەرپێچی کردن لە نەفس و ئارەزوو و سروشت و شەیتان و دونیا و دەرچوون لە دروستکراو و بەگشتی وازهێنان لە هەموو شتێك جگە لە حەق(عزوجل)، لەم حاڵانەدا تێبکۆشن و بێهیوا مەبن، چونکە حەق(عزوجل) هەر ڕۆژێك لە مەزنی و شانوشکۆیەکدایە:

﴿كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ ﴿٢٩﴾﴾ الرحمن: ٢٩

لەسەر قەدەری دەسەڵاتی ئەو داوا بکەن، لەڕووی قودرەتەوە داوای لێ بکەن نەك لەڕووی حیکمەتەوە، لەڕووی زانستییەوە داوای لێ بکەن نەك لەڕووی زانستی خۆتانەوە، بە دڵ و نهێنیتان داوای لێ بکەن نەك بە قەلقەلەی زمان، لەودیو زانست و قودرەتی خۆتانەوە داوای لێ بکەن، لە بەردەستیدا لەسەر پای مایەپووچی -لە هەموو شتێکدا - بوەستن، کاری بەسەردا مەخوازن و قەدەری بەسەردا دیاریەکەن و پەیوەستبوونی بەسەردا بڕیار مەدەن، بە تەگبیری نەزانی خۆتان تەگبیری خودا ڕەد

مەکەنەوە، هەر کەس بە زانستەکەی کار نەکات نەزانە، با لە لەبەرکردن و پەیبردن بە ماناکانیش زۆر وردەکار بێت، فێربوونی زانست بەبێ کردار دەتگێڕێتەوە بۆ لای دروستکراو و کارکردنیشت بە زانست دەتگێڕێتەوە بۆ لای حەق(عزوجل) و زوهدت لە دونیا پێ دەکات و ناوەوەی خۆت پێ نیشان دەدات و لە رازاندنەوەی دەرەوە سەرقاڵت دەکات و ئیلهامی رازاندنەوەی ناوەوەت بۆ دەکات، ئەوکات حەق(عزوجل) سەرپەرشتیاری تۆ لەدەست دەگرێت، چونکە بۆ ئەو هاتوویتە راستە، خودا(عزوجل) دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ يَتَوَلَّى ٱلصَّٰلِحِينَ ١٩٦﴾ الأعراف: ١٩٦

ئاشکرا و پەنهانیان دەگرێتە دەست، بە دەستی حیکمەتی خۆی دەرەوە و ئاشکرایان پەروەردە دەکات و بە دەستی زانستی خۆی ناوەوەیان ئاوەدان دەکاتەوە، بۆیە ترسیان لە هیچ کەسێك نابێت و رجایان لای هیچ کەسێك نابێت و تەنها لە ئەو(سبحانە وتعالی) وەردەگرن و تەنها بۆ ئەو دەبەخشن، لە کەسانی تر نامۆن و هۆگرییان بە خوداوەیە و لەلای ئەو سوکناییان بۆ دێت، ئەم سەدەمە کۆتایی زەمانە و گۆڕان و ئاڵوگۆڕی زۆری تێدا پەیدا بووە، ئەم سەردەمە سەردەمی خاوبوونەوەیە، سەردەمی دووڕوویی و فرەڕوویییە، ئەی کەسی دووڕوو تۆ بەندەی دونیا و دروستکراوانی، ریابازی بۆ ئەوان دەکەی و بۆ ئەوان کار دەکەی و سەرنجی حەق(عزوجل) بۆ تۆ وەلادەنێیت، وانیشان دەدەی بۆ دوارۆژ کاردەکەی، هەموو کار و مەبەستت دونیایە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: ((گەر بەندەیەك بە کاری دوارۆژ خۆی رازاندەوە، لەکاتێکدا مەبەستی کاری دوارۆژ نەبێت و داوای کاری دوارۆژ نەکات لە ئاسمانەکاندا بە ناو و رەچەڵەکی نەفرەتی لێ دەکرێت))[1].

ئەی دووڕووان من لە رێگەی حوکم و زانستەوە ئێوە دەناسمەوە، بەڵام بە داپۆشینی خودا(عزوجل) داتاندەپۆشم.

هاوار بە حاڵت، ئەندامەکانی جەستەت شەرم ناکەن، لە پیسی و باخیبوونی دەرەوەت پاك نەبوویتەوە، بانگەشەی پاکێتی ناوەوە و پاکێتی دڵ دەکەی،

---

[1] رواه الطبراني في "الأوسط"

بانگەشەکەت ناڕاستە، ئەی دەبێ نهێنیت چۆن بێت؟ لەگەڵ دروستکراودا ئەدەبت نییە و بانگەشەی ئەدەب دەکەی لەگەڵ دروستکەر، مامۆستا لێت ڕازی نییە و ئەگەر بەئەدەب نیت و فەرمانەکانی لێ قبووڵ ناکەی، لە سەرەوەی مەجلیس دادەنیشی و مەجلیس دەگریتە دەست، بزانە قسەکردن نییە تا یەکتاپەرستییەکەت لەسەر پێی خۆی دەوەستێت و لەبەردەستی خودا دامەزراو دەبێت و لەناو هێلکەی بوونی خۆت دێیە دەرەوە و لە باوەشی لوتفدا دادەنیشی، ئەوکات تۆ لەژێر باڵی هۆگربوونی بە خوداوە و دانەوێڵەی ئیخلاص دەچنییەوە و ئاوی موشاهەدە دەنۆشی، پاشان لەسەر ئەوە دەمێنییەوە تا دەبیت بە کەڵەشێر، ئەوکات پارێزگاری لە مریشکەکان دەکەی و دانەوێڵەیان بۆ پەیدا دەکەی و بانگ دەدەی و لە شەو و لە ڕۆژدا خەڵکی ئاگادار دەکەیەوە، ئاگاداریان دەکەیەوە بۆ گوێڕایەڵی کردنی پەروەردگاریان، ئەی ئەزان، دەفتەرەکەی دەستت وازلێبهێنە و وەرە لێرە و لەبەردەستی مندا لەسەر سەر دابنیشە.

زانست لە دەمی پیاوان وەردەگیرێت نەك لە کتێبەکان، لە حاڵەوە وەردەگیرێت نەك لە قاڵەوە، لەوانە وەردەگیرێت لە خۆیان و خەڵکی فانی بوون و بە حەقەوە(عزوجل) باقی بوون، یەکەمجار فانی بوون لە خۆت، ئەوجا فانیبوون لە دروستکراو پاشان بوون و مانەوە بە خوداوە، بەرە لە هەرچی شتە جگە لە خودا، پاشان بە خوداوە و بۆ خودا زیندوو ببەرەوە، هاوەڵی خزمەتکارانی حەق(عزوجل) بکە، ئەوانەی دەرگای حەق بەرنادەن، کاریان بریتییە لە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی و خۆگرتنەوە لە نەهییەکانی و تەبایی لەگەڵ قەدەرەکانی بە مەرجی ڕازیبوون و تەبایی و بەندایەتی.

**هاوار بە حاڵت**، درۆ مەکە، بانگەشەی ڕازیبوون دەکەی کەچی مێشوولەیەك و پارووییەك و وشەیەك و شکانی عیززەتێك گۆڕانت بەسەردا دەهێنێت، درۆ مەکە، من گوێ لە درۆکەت ناگرم و کاری پێ ناکەم و بەڕاستت نازانم، تاکە تاکەیەك لە خەڵکی وەحی بۆ سەر دڵیان دادەبارێت و کۆمەڵە وشەیەکیان بۆ ڕەوانە دەکرێت کە تایبەتن پێیان، خێر دەناسن و لەسەری دەوەستن، چۆن ئەوان بەو جۆرە نابن لە کاتێکدا لەسەر شوێنکەوتنی پێغەمبەرن(ﷺ) لە گوفتار و کرداریدا، پێغەمبەر(ﷺ) وەحی بۆ ئاشکرا و دەرەوەی کراوە و ئەوان وەحی بۆ ناوەوەیان کراوە، چونکە میراتگری

پێغەمبەرن(ﷺ) و شوێنکەوتەی ڕاستەقینەی ئەون لە هەموو ئەو شتانەی فەرمانی پێکردووە، گەر دەتەوێ ئەو شوێنکەوتنەت بۆ بێتە ڕاستە زۆر یادی مردن بکە، چونکە یادی مردن کۆمەکیت دەکات لەسەر نەفس و ئارەزوو و شەیتانەکەت و دوورکەوتنەوە و کەناگیربوونت لە دونیا، هەرکەسێك بە مردن ئامۆژگاری وەرنەگرێت هیچ ڕێگەیەك بۆ ئامۆژگاری ئەو ئامێنێتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((مردن بەسە وەك ئامۆژگاریکەر))[1].

زوهد بکەی یان حەزت لە دونیا بێت بەشەکەت بۆ دێت، بەڵام گەر زوهد بکەی بەشەکەت بە عیززەتەوە دەگاتە دەستت، خۆ گەر حەزت لە دونیا بوو بەشەکەت بە زەلیلییەوە بۆ دێت، کەسی دووڕوو شەرم لە خودا(عزوجل) نیشان دەدات لە کاتی ئامادەبوونی دروستکراو لەلای و لە کاتی تەنهاییدا بێڕێزی نیشان دەدات.

هاوار بە حاڵت، گەر ئیمانەکەت بە خودا دروست بێت و باوەڕت وابێت تەماشات دەکات و لە تۆ نزیکە و چاودێرە لەسەرت ئەوا شەرمت لێ دەکرد، من بە حەق بە ئێوە دەڵێم و لە ئێوە ناترسم و ڕجام لەلای ئێوە نییە، ئێوە و هەموو خەڵکی سەر زەوی لەلای من وەك مێشوولەیەك وان، وەك گەردیلەیەك وان، چونکە زیان و قازانج لە خوداوە دەبینم نەك لە ئێوەوە، کۆیلەکان و مەلیکەکان لەلای من یەکسانن، بە شەرع نەك بە ئارەزوو و سروشت بەرپەرچی نەفسی خۆتان و کەسانی تر بدەنەوە، ئەوەی شەرع لێی بێدەنگە ئێوە لەگەڵ بێدەنگییەکەی تەبا بن، ئەوەش شەرع قسەی لێکردووە لەگەڵ قسەکردنەکەی تەبا بن.

ئەی گەنج، بە نەفس و ئارەزووەوە نەهی لە کاری خراپەی کەسانی تر مەکە، بەڵکو بە ئیمانەکەت نەهی لێ بکە، ئیمان نەهیکەرە لە خراپە و یەقین لابەری خراپەیە، پەروەردگاریش(عزوجل) سەرخەرە و تۆ سەردەخات و شانازیت پێوە دەکات، خودا (عزوجل) دەفەرموێت: ﴿إِن يَنصُرْكُمُ اللَّهُ فَلَا غَالِبَ لَكُمْ﴾ آل عمران: ١٦٠، هەروەها دەفەرموێت: ﴿إِن تَنصُرُوا اللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ ۝٧﴾ محمد: ٧

---

[1] رواه البيهقي في "الشعب".

گەر وەك غیرەتێك بۆ خودا(عزوجل) ئەهیت لە مونكەرێك كرد خودا لەسەر لابردنی ئەو مونكەرە كۆمەكیت دەكات و بەسەر ئەهلی مونكەردا تۆ سەردەخات و ئەوانت بۆ زەلیل دەكات، بەڵام گەر بە نەفس و ئارەزوو و شەیتان و سروشتی خۆتەوە ئەهیت لە خراپە كرد شەرمەزارت دەكات و بەسەر ئەهلی مونكەردا سەرتناخات، ئەوكات تۆ ناتوانی مونكەر بسڕیتەوە، ئیمان ئەهیكەرە لە خراپە، هەر ئەهیكەرێك لە خراپە نەهیكردنەكەی بە ئیمانەوە نەبێت ئەوە نەهیكەر نییە لە خراپە، بۆچی نە، تۆ دەتەوێ نەهیكردنەكەت بۆ خودا بێت نەك بۆ دروستكراوی خودا، بۆ ئایینی خودا بێت نەك بۆ نەفسی خۆت، بۆ ئەو نەك بۆ خۆت، واز لە هەوەسبازی بهێنە و لە كارەكاندا ئیخلاصت هەبێت، مردن بۆ تۆ لە شكاردایە، هەر دەبێت بە شكارگەی مردندا گوزەر بكەی، واز لەو هەڵپەیە بهێنە كە رسوا و شەرمەزاری كردووی، ئەوەی بۆ تۆ بێت هەر دەبێت رووت لێ بكات و ئەوەش بۆ كەسانی ترە هەرگیز روو لە تۆ ناكات، بە خوداوە(عزوجل) سەرقاڵ ببە و واز لە داوای ئەوە بهێنە بۆ تۆ و بۆ كەسانی تر بڕیاری لەسەر دراوە، خودا(عزوجل) بە پێغەمبەرەكەی(ﷺ) دەفەرموێت:

﴿ وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ﴾ طه: ١٣١

سەختترین و دژوارترین شتێك لەسەر ئەوانەی خودایان(عزوجل) ناسی بریتییە لە قسەكردن لەگەڵ خەلكی و دانیشتن لەگەڵیان، بۆ ئەو مەبەستەیە لە هەر هەزار عاریفێك تەنها یەك قسەكەر لەناویاندا بوونی هەیە، ئەویش ئاتاجە بە هێزی پێغەمبەران(علیهم السلام)، چۆن ئاتاج نابێت بە هێزی پێغەمبەران(علیهم السلام) لە كاتێكدا ئەو دەیەوێت لەناو چەندین جۆر لە خەلكیدا دابنیشێت، تێكەڵاوی هۆشمەندان و نەزانان دەكات، لەگەڵ كەسی دووڕوو و كەسی باوەڕدار دادەنیشێت، ئەو لە چەشنی ئازارێكی گەورەدایە و ئارام دەگرێت لەسەر ئەوەی پێیناخۆشە، لەگەڵ ئەوەش پارێزراوە لەوەی ئەو تێیدایە و لەسەری كۆمەك دەكرێت، چونكە فەرمانی حەقی(عزوجل) جێبەجێ كردووە لە كەلامەكەی بۆ سەر خەلكی، ئەو بۆ نەفس و ئارەزوو و هەڵبژاردن و ویستی خۆی نەهاتووەتە قسە، بەڵكو لەسەر قسەكردن ناچاركراوە، بۆیە گومانی تێدا نییە لەسەری پارێزگاری لێ دەكرێت، گەر دەتەوێت

خودا(عزوجل) بناسیت ئەوا لەو شتانەی زیان و قازانجی تێدایە پلە و پایەی دروستکراو لە دڵ دەربکە، چونکە تەنها بەو ڕێگەیە خودا دەناسیت.

**هاوار بە حاڵت**، دونیا لە دەستدایە، دروستە لە گیرفاندا بێت، دروستە پاشاکەوت بکرێت و هەڵبگیرێت، دەستبردن بە نیێتی چاك و پاك دروستە، بەڵام لەناو دڵدا دروست نییە، وەستانی دونیا لەبەردەم دەرگای دڵدا دروستە، بەڵام ڕۆیشتنە ژوورەوەی بۆ ئەودیو دەرگاکە دروست نییە و لەباری چوونە ژوورەوەیدا ڕێز و شکۆ لەدەست دەدەی، گەر ئەم بەندەیە لە دونیا و لە دروستکراو فانی بوو وەك ئەوەی لێ دێت بزربووبێت و سڕابێتەوە، لەباری هاتنی ئافەتدا ئاوەوەی ناگۆڕێت و لە باری هاتنی فەرمانی خودادا جێبەجێکارە و لەباری هاتنی نەهی خودادا خۆگرەوە و نەهێکارە، ئاوات بۆ هیچ شتێك ناخوازێت و هەڵپە بۆ هیچ شتێك ناکات، پێکهاتن و سەرهەڵدان(تکوین) ڕوو لە دڵی دەکات و وەرگێڕانی شتەکانی رادەست دەکرێت، ئێوە لە کوێ و ئەوان لە کوێ، ئەی ناپاکان لە زانست و کردار، ئەی دوژمنانی خودا و پێغەمبەر(ﷺ)، ئەی ئەوانەی بەندەکانی خودا لە ڕێگە لادەدەن ئێوە لە ستەمێکی ئاشکرا و دووڕوویییەکی ئاشکرادان، ئەی زانایان و زاهیدان ئەم دووڕوویییە هەتا کەی؟ زۆر دووڕوویی ئەنجام دەدەن لەگەڵ مەلیك و سوڵتاندا بۆ ئەوەی شتێك لە دونیا و حەز و چێژی دونیایان لێ وەربگرن، ئێوە و زۆرێك لە مەلیکانی ئەم سەردەمە ستەمکار و ناپاکن لە ماڵ و سامانی خودا لەناو بەندەکانیدا.

**خودایە**، هێز و دەسەڵاتی دووڕووان بشکێنە و ڕسوا و شەرمەزاریان بکە یان تەوبەیان لێ وەربگرە، خودایە ستەمکاران قەلاچۆ بکە و زەویان لێ پاك بکەرەوە یان چاکیان بکە. ئامین.

**هەروەها فەرمووی:**

**ئەی مەلیکان**، ئەی کۆیلە و بەندەکان، ئەی ستەمکاران، ئەی دادپەروەران، ئەی دووڕووان، ئەی موخلیصان، دونیا بۆ ماوەیەکە و دوارۆژ هەتاهەتاییە، بە زوهد و تێکۆشان لە هەرچی شتە جگە لە حەق(عزوجل) جیاببەرەوە، دڵت لە هەرچی شتە

جگە لە پەروەردگارت پاکبکەرەوە، ئاگادار بە شتێك راوت نەکات یان شتێك بەندت نەکات یان شتێك راتنەگرێت لە مەولای خۆت(عزوجل)، گەر بەشی خۆتت بۆ هات بە دەستی فەرمان دەستی بۆ ببە، بە دەستی تەبایی لەگەڵ خودا لەسەر پێی زوهد تیایدا دەستی بۆ ببە، نەك بە دەستی هەڵبژاردنی دونیا و خۆشەویستی بۆ دونیا، گەر زوهد بەردەوام بێت کار لە جەستە دەکات و حوزن و دڵتەنگی لە دڵدا دروست دەکات، بونیادی کەسەکە زەرد و لاواز دەکات، گەر ئەم حوزن و لاوازییە هاتە دی دەروو لە خوداوە بە روویدا دەکرێتەوە، ئاسوودەیی بە خوداوە و ناسینی ئەو(سبحانه وتعالی) دڵتەنگی و خەم و پەژارە دەسڕێتەوە، باوەڕدار دڵی لە دروستکراو و خانەوادە و ماڵ و منداڵ دابڕاوە، تەنها دەرەوەی بەوانەوە سەرقاڵە و دڵی چاوەڕوانی هاتنی نێراوی مەلیکە، نێراوی مەلیك گەیشتووتە دەروازەی شار، بۆیە ماڵئاوایی لە خانەوادەکەی کردووە لە کاتێکدا هێشتا لە ناویاندایە، باوەڕدار بە هەمیشەیی لەناو خەلکیدا لە ماڵئاواییدایە، سەری لەناو خەلکیدایە و پەتی پەیوەندی لەگەڵ خودادا، گەر یەکتاپەرستی لە دڵدا جێگیر بوو لە ئاشکرادا کردەوەکان دێنە راستە، چونکە ناوەوە و دەرەوە و دەوڵەمەندی و هەژاری و رووتێکردنی خەلکی و پشتهەلکردنیان و زەمکردن و مەدحکردنیان لەلات یەکسان دەبن، چۆن لەلات یەکسان نابن لە کاتێکدا تۆ لەوان پشتت هەلکردووە و دڵت بە خودا و یادی خودا و شەوق بۆ لای خودا(عزوجل) پڕبوە، ئەوکات: ﴿ هُنَالِكَ ٱلْوَلَٰيَةُ لِلَّهِ ٱلْحَقِّ ﴾الكهف: ٤٤

ئەوکات دەبێت بە خۆشەویستێکی راستەقینەی زانای فێرکەری دانای نزیکی نزیکراوەی ئەدەبی ئەدەبداداری بێنیاز لە خەلکی، واتە ئەوەندەت پێ دەرێت ئاتاج بەوان نەبێت، ئەی نەزان، لە نەزانینەکانی خۆت فێرببە، تۆ وازت لە فێربوون هێنا و بە فێرکردنەوە خۆت سەرقاڵ کرد، خۆت ماندوو مەکە هیچ لە تۆوە بەرهەم نایەت و کەس لەسەر دەستی تۆ سەرفراز نابێت، چونکە هەرکەس نەتوانێ مامۆستایەکی باشی نەفسی خۆی بێت ناتوانێت ببێت بە مامۆستای کەسانی تر.

خەلکینە، خودا لە قەدەرەکانیدا بە دەستەوسان مەزانن، چونکە دەچنە ریزی بێباوەڕانەوە، کار بە حوکم بکەن تا ئەو کارە بە زانستتان دەگەیەنێت، گەر کارتان بۆ

بەدەستهات قودرەت دەبینن، ئەوکات پێکهاتن و سەرهەڵدان(تکوین) دەدرێتە دەستی دڵ و نهێنیتان، گەر لە دڵەوە پەردەیەك لە نێوان تۆ و خودادا نەما توانای پێکهاتن و سەرهەڵدانت پێ دەبەخشێت و گەنجینەی نهێنی خۆیت پێ نیشان دەدات و لە خۆراکی فەزڵی خۆی دەرخواردت دەدات و شەرابی هۆگریت پێ نۆش دەکات و لەسەر خوانی نزیکی لە خۆیەوە تۆ دادەنیشێنێت، هەموو ئەمانەش بەری زانستە بە قورئان و سوننەت، کار بە قورئان و سوننەت بکە و لەو دوانە لامەدە تا خاوەنی زانست کە خودایە رووت لێ دەکات، تۆ دەبات بۆ لای خۆی، گەر مامۆستای فێرکەری حوکم شایەتی زیرەکی لە زانستی قورئاندا بۆ تۆ دا دەتگوێزێتەوە بۆ کتێبی زانست بە فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ)، گەر لەمەشدا قووڵبوویەوە دڵ و مانات راستدەبنەوە و پێغەمبەر(ﷺ) دەبێتە هاوەڵیان و دەستی ئەو دوانە دەگرێت و دەیانباتە ژوورەوە بۆ لای مەلیك و پێیان دەڵێ: ئەوە ئێوە و پەروەردگارتان.



# مەجلیسی پەنجا و دوو

## تەماشاکردنی خەڵکی بە چاوی فەنا

بەیانی رۆژی هەینی لە مەدرەسەکەی، ٣/رەمەزان/ ٥٤٥هـ فەرمووی:

خەڵکینە، هەڵبێن بۆ لای خودا(عزوجل)، لە خەڵك و دونیا و هەرچی شتی ترە هەڵبێن بۆ لای خودا، بە دڵ بچن بۆ لای پەروەردگار(عزوجل)، گوێتان لەم ئایەتە بووە کە دەفەرموێت: ﴿أَلَآ إِلَى ٱللَّهِ تَصِيرُ ٱلْأُمُورُ ۝٥٣﴾ الشورى: ٥٣

ئەی گەنج، بە چاوی مانەوە سەرنجی دروستکراو مەدە، بەڵکو بە چاوی تیاچوون تەماشایان بکە، بە چاوی زیان و قازانج سەرنجیان مەدە، بەڵکو بە چاوی دەستەوسانی و زەلیلی لێیان وردببەرەوە، حەق(عزوجل) بە تاکوتەنها رابگرە و تەوەکولی پێ ببەستە و لە شتێك خودا کۆتایی پێهێناوە(ئەو شتانەی ئەو بڕیاری کۆتایی لێداوە و لێبووەتەوە) وڕێنە مەکە، دونیا و هەموو ئەوەی تیایدا دەردەکەوێت بڕیاری کۆتاییە و لێبووەتەوە، دروستکراو و هەموو ئەوەی تیایاندا تاوتوێ دەکرێت لێبووەتەوە و بڕیاری کۆتاییە، دڵی باوەڕدار لە هەموو ئەمانە خاڵییە، بەتایبەت گەر لە هۆیەکان رووتبووبێتەوە، ئەو دڵنیایە بە حاڵی خۆیەوە، گەر هۆ و ماڵ و منداڵ رووی لێ بکەن لەسەر ئازار و مانەوەبوون بۆیان بارمەتی دەدرێت و هێز و توانای پێدەبەخشرێت، بۆیە لە هەموو حاڵەکاندا دڵی خاڵییە لە هەر شتێك جگە لە پەروەردگاری(عزوجل)، لە بزربووونیدا دەمێنێتەوە و ناسرێتەوە و داوای گۆڕین و ئاڵوگۆڕ ناکات، چونکە دەزانێت ئەو بڕیارەی براوەتەوە، گۆڕانی بەسەردا نایەت و بەشەکەی براوەیە و کۆتایی پێهاتووە و زۆر و کەم ناکات، بۆیە داوای زیاتر و کەمتر ناکات، داوای دواخستن و پێشخستنی بەشەکەی ناکات، چونکە گەیشتووەتە ئەو راستییەی کاتێکی دیاریکراوی تایبەتکراوی هەیە، ئەو و نموونەکانی وەك ئەو هۆشمەندانی لە خەڵکی، بەڵام ئەوانەی داوای زیاد و کەم و پێشکەوتن و دواکەوتنی بەشەکانیان دەکەن

شێتن، هەرکەس لە خودا رازی بێت لە هەموو حاڵەکانیدا لە خۆی و خەڵکانی تردا لەگەڵ ئەو(سبحانه وتعالی) تەبا دەبێت، خودای خۆشدەوێت و دەیناسێت و هەموو تەمەنی هاوەڵی دەکات لەسەر راستە شەقامی مەرامی ئەو، یەکەمجار خودا سەرکەوتووی دەکات و پاشان نزیکی دەکاتەوە و پێی دەفەرموێت: ﴿أَنَا رَبُّكَ﴾ طه: ١٢

لەباری سەرگەردانبوون و دابڕانیدا، وەك چۆن بە موسای(علیه السلام) فەرموو:

﴿أَنَا رَبُّكَ﴾ طه: ١٢، لە ئاشکرادا ئەوەی بە موسا(علیه السلام) فەرموو، لە پەنهانیشدا بە دڵی ئەو عاریفە هەمان شت دەڵێت و ئەوە دەبیستێت، ئەوەش وەك بەزەیی و لوتفێك بە ئەو و رێزلێنانێك لە پێغەمبەرەکەی(ﷺ)، موعجیزەی پێغەمبەران(علیهم السلام) ئاشکران و کەراماتی ئەولیا پەنهانە، ئەوان میراتگرانی پێغەمبەرانن، ئایینی خودا راوەستاو دەکەن و لە شەیتانەکانی ئینس و جن دەیپارێزن، تۆ بە خودا و پێغەمبەران و دۆستانی خودا نەزانیت، تۆ ئەی کەسی دووڕوو نازانێت دۆستانی خودا لە چ دۆخێکدان و لەسەر چ بارێکن، تۆ قورئان دەخوێنیت و نازانیت چی دەکەی، ئەوە بریتییە لە دونیای بێ دوارۆژ، لە دوای هەموو ئەوانەش بەرهەڵستی دۆستانی خودا دەکەی، کەسێکی ژیرمەند بە و ئەدەبت هەبێت و تەوبە بکە و لاڵ بە، تۆ هیچ هەواڵێکت لە خودا(عزوجل) و پێغەمبەرانی و دۆستانی خودا نییە، تۆ هیچ هەواڵێکت لە زانستی خودا و دروستکراوی خودا نییە، بە تەوبە و بێدەنگبوونەوە پابەند بە و بیر لە مردنەکەت بکەرەوە، بیر لەو کاتە بکەرەوە بەرەو گۆڕەکەت هەڵتدەگرن، بۆئەوەی زانست فێرببیت لەگەڵ خودا کارێکە بۆ ئەوەی نوورێکت پێ ببەخشێت دونیا و دوارۆژی پێ رۆشن بکەیەوە، ئەوەی من پێتانی دەڵێم لێم قبووڵ بکەن و تیایدا تێبکۆشن و واز لە پەیوەستبوون بە پێشینەوە بهێنن، چونکە ئەو کارە لە تۆوە هەوەسبازییە و بەربوونەوەیە، بەڵگەی تەمبەڵەکان بریتییە لەوەی لە بڕیاری پێشینەدا لەسەرمان نووسراوە، بەڵکو چاکی لێ دەکەین بەلادا و تێدەکۆشین و کاردەکەین و ناڵێین وتی و وتمان و بۆچی و چۆن، ناچینە ناو زانستی خوداوە(عزوجل)، ئێمە تێدەکۆشین و ئەویش(سبحانه وتعالی) ئەوە دەکات کە دەیەوێت، خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿ لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴾ الأنبياء: ٢٣

گەر کارەکەت تەواو بوو و حەق(عزوجل) دڵی تۆی نزیککردەوە و ئەوەت بۆ هاتە راستە ئەوا لە دونیا زوهدت پێ دەبەخشێت و حەزی دوارۆژت بۆ زیاد دەکات، بە ناوی خۆت دەگەیت کە لەسەر دەرگای نزیکی لە خودا نوسراوە: فلانی کوڕی فلان لەوانەیە خودا رزگاری کردوون، ئەوەش گۆڕانی بەسەردا نایەت و ئاڵوگۆڕ ناکرێت و زیاد و کەم ناکات، ئەوکات شوکرت بۆ پەروەردگار و کارت بۆ خێر و گوێڕایەڵی لەبەر دەستی خودادا زیاد دەبێت، لەگەڵ ئەوەش ترس لە دڵت دەرناکەی و قودرەتی خودا بە یەککەوتوو تەماشا ناکەی، ئەم ئایەتانە بخوێنەرەوە:

﴿ يَمْحُوا اللَّهُ مَا يَشَاءُ وَيُثْبِتُ وَعِنْدَهُ أُمُّ الْكِتَابِ ﴾ الرعد: ٣٩،

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴾ الأنبياء: ٢٣

لەگەڵ ئەو نووسراوەدا مەوەستە، چونکە ئەو کەسەی نووسیویەتی دەتوانێت بیسڕێتەوە، ئەو کەسەی بینای کردووە دەتوانێت هەڵیبوەشێنێتەوە، بەهەمیشەیی لەسەر پای گوێڕایەڵی و ترس و لەرز و خۆپارێزی بە، تا مردنت بۆ دێت و لە دونیا بەرەو دوارۆژ لەسەر پای سەلامەتی دەپەڕییەوە، ئەوکات لە گۆڕان و ئاڵوگۆڕ سەلامەت دەبیت، ئەی ئەو کەسەی بە نەزانی و دووڕوویی و داوای دونیا و ململانێ لەسەری شانشانێن دەکات، ئەی ئەو کەسەی حەرامخۆری، چۆن چاوتبڕیوەتە نووری دڵ و پاکێتی نهێنی و گۆکردنی زمان بە حیکمەت، خوداناسان قسەیان بۆ زەروورەتە و خەوتنیان زاڵبوونی خەوە بەسەریاندا، خواردنیان وەك خواردنی نەخۆش وایە، ئەوان لەسەر ئەوە دەمێننەوە تا نووسراوەکە دەگاتە ماوەی دیاریکراوی خۆی، ئەوان لە شێوەی فریشتەدان، ئەوانەی خودا(عزوجل) دەربارەیان دەفەرموێت:

﴿ لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴾ التحريم: ٦

خوداناسان بەوان دەچن و لەوانیش زیاترن، چونکە فریشتەکان لەبەردەستی ئەواندا و لە دونیا و دوارۆژدا خزمەتکاری ئەوانن.

خەلكینـــە، گــەر قســـەكانم نەگاتــە حـاڵی ئێـوە و تێینەگـەن ئـەوا وەك بـاوەڕ و بەراستزانین گوێی لێبگرن، قسەكانم رووگەیەكن بۆ دڵان بۆیە بە دڵ و نهێنیتـان گـوێی لێبگـرن، ئـەوكات ئاشـكرا و پـەنهانی ئێـوە ئاسـوودە دەبێـت، دەسـەڵاتی نـەفس و ئارەزووتان دەشكێت، ئاگری حەزەكانتان دەكوژێتەوە، خراپترین حەزێك ئێوە لەسەرینی بریتییە لە خۆشویستنی دونیا و رق لە هەژاران و بەربوونەوەتان بۆ ناو تیاچوون.

لە یەكێك لە خوداناسانەوە(رەحمەتی خودای لێ بێـت) فـەرمووی: راستەقینەی تـەقوا گـەر هـەموو ئـەوەی لـەناو دڵدایـە كۆیبكەیـەوە و بیخەیتـە سـەر سـینییەكی سەربەتاڵ و بە بازاڕدا پێیەوە بسوڕێیتەوە شتێك لەسەر ئەو سینییە بـوونی نییـە تـۆ شەرمی لێ بكەیت، ئەی نەزان، ئەوەت بەس نییە كە تۆ لـە خوداناترسـی و خۆپـارێز نیت گەر پێت بوترێت لە خودا بترسە تووڕە دەبیت، گەر حەقت پێ بوترێت گوێدەگریت و سووكایەتی پێ دەكەی، پاشان گەر كەسێك نەهیت لێ بكات لە كارێكی خراپ لێی تووڕە دەبیت و جامی رق و تووڕەیی بەسەردا دەرێژیت.

لــە ئــەمیری باوەڕدارانــەوە عومــەری كــوڕی خــەتاب(خودا لێـی رازی بێـت) فــەرمووی: هــەر كــەس لــە خــودا بترسـێت رق و تــووڕەیی خـۆی خـاڵی ناكاتــەوە، خودا(عزوجل) لە هەندێ فەرموودەیدا دەفەرموێت: ((من ئێـوەم خۆشدەویسـت كـاتێ گوێڕایەڵیتان لێ دەكردم، كاتێك لێم یاخی بوون رقم لێتان هەلگرت))

خودا(عزوجل) ئێوەی خۆشدەوێت نەك لەبەر پێویستی ئەو بە ئێـوە، بـەڵكو وەك رەحمەتێك بە ئێـوە، ئـەو(سبحانه وتعالى) تـۆی خۆشـدەوێت بـۆ خـۆت نـەك بـۆ خـۆی، پێبخۆشـە گوێڕایـەڵی لـێ بكـەی، چـونكە سـوودەكەی بـۆ تـۆ دەگەڕێتــەوە، خـۆت سـەرقاڵبكە و روو لە كەسێك بكە تۆی بۆ خۆت خۆشدەوێت، پشتیش لە كەسێك بكـە تۆی بۆ خۆی خۆشدەوێت، باوەڕدار هەموو شتێكی لەیاد كردووە و یادی مەولای خۆی دەكات، نزیكی ئەوی بەدەستهێناوە و زیندەگی بە ئەوەوە و لەگەڵ ئەو بۆ بەدیهاتووە، بۆیە هیچ گومانی تێدا نییە تەوەكولەكەی هاتووەتە راستە، خودا كاروبارەكانی دونیـا و دوارۆژی ئەوی گرتووەتە دەست، گەر تەوەكول و یەكتاپەرستی باوەڕدار هاتنە راستە

ئەوا حەق(عزوجل) چۆن مامەڵەی لەگەڵ ئیبراهیم(علیه السلام) کرد بەو جۆرە مامەڵە لەگەڵ ئەویش دەکات، مانا و حاڵی ئیبراهیمی پێ دەدرێت نەک نازناوی ئیبراهیم و هەمان مەقامی ئیراهیم(علیه السلام)، لە خۆراکی خۆی خواردنی پێ دەدات و لە خواردنەوەی خۆی خواردنەوەی پێ نۆش دەکات و لە توناوتوونەکانی خانەی خۆیدا نیشتەجێی دەکات، ئەوکات لەڕووی مانەوە نەک لەڕووی رووالەتەوە رەچەڵەکەکەی بۆ سەر ئیبراهیم راست و دروست دەبێت، تۆ شەرم ناکەی هەڵپەت بۆ دونیا هەڵئەدەنێت بۆ ئەوەی خزمەتی ستەمکاران بکەی و حەرام بخۆی، تا کەی دەخۆی و خزمەتی مەلیکان دەکەی؟ ئەوانەی تۆ خزمەتیان دەکەی مولکەکەیان بەم نزیکانە تیاچوون رووی لێ دەکات، برۆ خزمەتی حەق(عزوجل) بکە کە تیاچوون رووی لێ ناکات، کەسێکی ژیرمەند بە و بە کەمێك لە دونیا قەناعەت بکە تا زۆرێك لە دوارۆژ رووت لێ بکات، بەدەستی زوهد دەست بۆ بەشەکانت ببە ئەوکات دەستبڕدنت لەبەردەم دەرگای مەولای خۆت(عزوجل) بە دەستی قودرەت و کرداری خودا دەبێت و لەگەڵ خودا دەبێت نەك لەگەڵ دونیا و دەستی دونیا، نەك لە دەرگای سوڵتانەکان لەناو هاودڵی سروشت و ئارەزوو و شەیتان و خەڵکی رەشۆکی، گەر دەستت بۆ دونیا برد و دڵت لە بەردەم دەرگای پەروەردگار(عزوجل) بێت فریشتەکان و رۆحی پێغەمبەران(علیهم السلام) نابلۆقەی تۆ دەدەن، ئەو دوو بابەت و دوو حاڵە زۆر لەیەکترەوە دوورن، خوداناسان ژیرمەند بوون، وتیان لەسەر رێگە و لەناو ماڵەکانماندا بەشی خۆمان لە دونیا ناخۆین، تەنها لە خزمەتی خودادا بەشی خۆمان دەخۆین، زاهیدان لە بەهەشت دەخۆن، عاریفان لە دونیادا لە خزمەتی خودادا دەخۆن، خۆشەویستان نە لە دونیا و نە لە دوارۆژدا ناخۆن، خواردن و خواردنەوەی ئەوان بریتییە لە هۆگری و نزیکییان لە پەروەردگاریان(عزوجل) و تەماشاکردنی ئەو، دونیایان بە دوارۆژ فرۆشت، پاشان دوارۆژیان بە نزیکی لە پەروەردگاری دونیا و دوارۆژ فرۆشت، راستگۆیان لەپێناو خۆشەویستی خودادا دونیا و دوارۆژیان بە رووی پاکی خودا فرۆشت، خودایان ویست نەك کەسان و شتانی تر لە خوار خوداوە، کاتێك کڕین و فرۆشتنەکە دامەزرا بەخشندەیی زاڵ بوو و دونیا و دوارۆژی بۆ گێرانەوە وەك بەخشش

و هەڵاتێك، فەرمانی پێکردن دەست بۆ دونیا و دوارۆژ ببەن، ئەوانیش تەنها وەك فەرمانی خودا دەستیان بۆ دونیا و دوارۆژ برد لەگەڵ تێری و پڕبوون و بێنیازی لەو دوانە، ئەوان وەك ئەبایی لەگەڵ قەدەری خودا و ئەدەبی جوان لەگەڵ قەدەر ئەو کارەیان ئەنجامدا، قبووڵیان کرد و وەریانگرت لە کاتێکدا دەیانوت:

﴿ وَإِنَّكَ لَتَعْلَمُ مَا نُرِيدُ ﴿٧٩﴾ ﴾ هود: ٧٩

تۆ دەزانی ئێمە تەنها بە تۆ رازیبووین نەك بە کەسانی تر، رازیبووین بە برسێتی و تینوێتی و رووتی و رەجاڵی و زەلیلی و سووکایەتی، خۆمان هەڵدایە بەردەم دەرگای تۆ، کاتێك بەوە رازی بوون بە ئارامی و دڵنیایی دەروونی ئەوانی پڕکرد، بە سەرنجی رەحمەت سەرنجیدان، بۆیە لەدوای زەلیلی عیززەتی پێ بەخشین، لەدوای هەژاری دەوڵەمەند و بێنیازی کردن، پێیبەخشین و لە دونیا و دوارۆژدا نزیکی کردنەوە، باوەڕدار لە دونیا زوهد دەکات، زوهدەکەی پیسی و چەپەڵی و لیخنی ناوەوەی رادەماڵێت، بۆیە روو لە دوارۆژ دەکات دڵی سوکنایی و ئارامی بۆ دێت، پاشان دەستی غیرەت دەگاتە ئەو و هەموو شت لە دڵی رادەماڵێت و فێری دەکات ئەوانە پەردەن بۆ نزیکی لە حەقەوە(عزوجل)، ئەوکات بەگشتی سەرقاڵبوون بە دروستکراوەوە وازلێدەهێنێت و فەرمانەکانی شەرع جێبەجێ دەکات و سنوورە هاوبەشەکانی نێوان خۆی و خەڵکی رەشۆکی پارێزگاری لێ دەکات، هەردوو چاوی بەصیرەتی دەکرێنەوە و نەنگییەکانی نەفسی خۆی و نەنگییەکانی دروستکراوان دەبینێت، بۆیە لەلای هیچ کەس و شتێك جگە لە پەروەردگار سوکنایی و ئارامی بۆ نایەت، گوێ ناگرێت لە هیچ کەسێکی تر جگە لە ئەو(سبحانه وتعالى)، لە کەسی تر نازانەوێت و لا بەلای بەڵێنی کەسێکی تردا ناکاتەوە و لە هەڕەشەی هیچ کەسێکی تر جگە لە خودا ناترسێت، سەرقاڵی بە کەسان و شتانی ترەوە وازلێدەهێنێت و بەتەنها خوداوە خەریك دەبێت، گەر نەمەی بۆ تێر و تەواو بوو دەکەوێتە ناو نیعمەتێك نە چاو بینیویەتی و نە گوێ بیستوویەتی و نە بە خاپلە و خەتوورەی دڵی مرۆڤدا گوزەری کردووە.

ئەی گەنج، بە نەفسی خۆتەوە سەرقاڵ بە و یەکەمجار سوود بە نەفسی خۆت بگەیەنە ئەوجا بە کەسانی تر، وەك ئەو مۆمە مەبە خۆی دەسووتێنێ و کەسانی تر

ڕۆشن دەکاتەوە، بە نەفس و ئارەزووتەوە ڕوو لە هیچ شتێك مەکە و مەچۆرە ناویەوە، گەر خودا(عزوجل) تۆی بۆ کارێك بوێت ئامادەت دەکات، گەر بیەوێت سوود و قازانج بە خەڵکی بگەیەنیت تۆ دەگێڕێتەوە بۆ لای ئەوان و جێگیربوون و دامەزران و هەڵکردنت لەگەڵیان پێ دەبەخشێت و بەهێزت دەکات لەسەر ئازارەکانیان، دڵت فراوان دەکات بۆ دروستکراوان و سینەت والا دەکات و حیکمەتی بۆ هەڵدەدات، ناوەوەت لێوانلێو دەکات و بەرەو نهێنیت جاری دەبێت، ئەوکات ناوەوەت دەبێت بە ئەو ئەك بە تۆ، گوێت لەم ئایەتانە بووە کە دەفەرموێت:

﴿ يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلۡنَٰكَ خَلِيفَةٗ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾ ص: ٢٦،

پەند لەم بەشەی ئایەتەکە وەربگرە: ﴿ إِنَّا جَعَلۡنَٰكَ خَلِيفَةٗ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾ ص: ٢٦

نەیفەرموو: تۆ خۆت خۆت کردووە بە خەلیفە، بۆیە خوداناسان ویست و هەڵبژاردنیان بۆ نییە، بەڵکو ئەوان تەنها لەناو فەرمان و کار و تەگبیری و ویستی حەقدان(عزوجل)، ئەی ئەو کەسەی لە شارێگەی ڕاست و ڕەوان کەنارت گرتووە بەڵگە بە هیچ شتێك مەهێنەرەوە، چونکە تۆ هیچ بەڵگەیەکت بەدەستەوە نییە، ڕاستەشەقام لەبەردەستی تۆدا ڕاخراوە، حەڵاڵ ڕۆشنە و حەرامیش بەهەمان شێوە، چەندە کەم ئەدەبی بەرانبەر بە خودا(عزوجل)، چەندە ترست لە خودا کەمە! چەندە بە بینینی ئەو بۆ تۆ سووکایەتی دەکەی! لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی:

((خودا بپەرستە وەك ئەوەی ببیینی، گەر تۆ ئەو نابینی ئەو تۆ دەبینێت)) [1].

ئەهلی ئاگاهی بە دڵیان خودایان بینی، پەرتەوازەیی دڵیان نەما و کۆبوونەوە و بوونە دارشتە، وەك یەك شتیان لێهات، پەردە لە نێوانیان بەردەبێتەوە و دیوارەکان دەسڕێنەوە و ماناکان دەمێننەوە و پەیوەندییەکان دەپچڕێن و ئەربابەکان دادەماڵرێن، تەنها حەقیان(عزوجل) بۆ مایەوە، تا ئەمەیان بۆ دێتە ڕاستە نە قسەیان هەیە و نە دڵخۆشی بە شتێك، گەر هاتە ڕاستە ئەوا لە پای ئەودا کارەکە تێر و تەواو بووە،

---

[1] تقدم تخريجه.

یەکەم شتێك لێیدەنێنە دەرەوە کۆیلایەتییە بۆ دونیا و بەندایەتی بۆی، پاشان هاتنە دەرەوە لە هەرچی شتی ترە بەگشتی جگە لە خودا(سبحانە وتعالى)، بەردەوام لە مامەڵەکردنی ئەوەدان و لە خانەی ئەودا لەناو تاقیکردنەوەدان:

﴿لِنَنظُرَ كَيۡفَ تَعۡمَلُونَ ١٤﴾ یونس: ١٤

نهێنی بریتییە لە مەلیك و دڵ بریتییە لە وەزیری، نەفس و زمان و ئەندامەکان بریتین لە خزمەتکار بۆ ئەو دوانە، نهێنی لە دەریای حەقەوە(عزوجل) هەڵدەگۆزێت، دڵیش لە نهێنییەوە هەڵدەگۆزێت، نەفسی دڵنیا و ئارامیش لە دڵەوە هەڵدەگۆزێت، زمانیش لە نەفسەوە هەڵدەگۆزێت، ئەندامەکانیش لە زمانەوە هەڵدەگۆزن، گەر زمان چاك و پاك بێت دڵ چاك و پاك دەبێت، گەر زمان پیس و خراپ بێت دڵ پیس و خراپ دەبێت، زمانت پێویستی بە لغاوی تەقوا و تەوبەکردنە لە فرەوێژی و دووڕوویی، گەر لەسەر ئەوە بەردەوام بوویت پاراوی زمان وەردەچەرخێ بۆ پاراوی دڵ، گەر ئەمەی بۆ تێر و تەواو بوو نوورانی دەبێت و لێیەوە نوور بۆ زمان و ئەندامەکان دەگوێزرێتەوە، ئەوکات گۆکردنی زمان گۆکردنی زمانێکی نزیککراوەیە لە خودا و لە حاڵەتی نزیکیدایە لە خوداوە، زمانی نییە، دوعای نییە و یادی نییە، دوعا و یاد و قسە لە دووریدایە، بەڵام لە نزیکەوە تەنها بێدەنگی و خامۆشی و رازیبوون بە تەماشاکردنی و جێژوەرگرتن بوونیان هەیە.

خودایە بمانگێڕە لەوانەی لە دونیادا بە دوو چاوی دڵ تۆ دەبینن و لە دواڕۆژدا بە دوو چاوی سەر تەماشات دەکەن.

﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ حَسَنَةٗ وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ٢٠١﴾

البقرة: ٢٠١



# مەجلیسی پەنجا و سێ

## تاقیکردنەوە و بەڵا

شێوانی ڕۆژی سێشەممە لە مەدرەسەکەی ١٧/ڕەمەزان/٥٤٥هـ فەرمووی:

هەردەبێت تاقیکردنەوە و ئەزموونکردن بوونی هەبێت بەتایبەت بۆ بانگەشەکەران، گەر تاقیکردنەوە و ئەزموونکردن نەبووایە زۆرێك لە خەڵکی بانگەشەی ویلایەتیان دەکرد، بۆ ئەو مەبەستە یەکێك لە خوداناسان دەڵێت: هەموو بەڵاکان بە ویلایەتەوەیە، بۆ ئەوەی کەس بانگەشەی نەکات، لە نیشانەکانی وەلی ئارامگرتنە لەسەر ئازاری خەڵکی و لێبوردن لێیان، دۆستانی خودا خۆیان کوێر دەکەن لەوەی لە خەڵکی دەیبینن و گوێیان کەڕ دەکەن لەوەی لێیان دەیبیستن، ئاگاهی ئامووس و پارێزی خەڵکی بەوان دراوە.

((خۆشەویستیت بۆ شتێك کوێر و کەڕ دەکات))[1].

حەقتان(عزوجل) خۆشبوێت و خۆتان کوێر و کەڕ بکەن لە هەرچی شتی ترە، جارێك بە قسەی باش و جوان و نەرمونیان و هەڵکردن مامەڵە لەگەڵ خەڵکی دەکەن و جارێکیش لێیان تووڕەدەبن وەك غیرەتێك بۆ خودا و تەبایی لەگەڵ تووڕەبوونی ئەودا، ئەوان پزیشکن، دەزانن هەموو دەردێك دەوایەکی هەیە، پزیشك هەموو نەخۆشەکان بە یەك دەرمان چارەسەر ناکات، ئەوان لەڕووی دڵ و مانایانەوە لەبەردەستی حەقدا(عزوجل) وەك یارانی ئەشکەوت وان، جبریل(علیه السلام) یارانی ئەشکەوتی وەردەگێڕا و دۆستانی خوداش دەستی قودرەت و رەحمەت و لوتفی خودا وەریاندەگێڕێت، دەستی خۆشەویستی دڵیان وەردەگێڕێت و لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێکی تر دەیانگوێزێتەوە،

---

[1] تقدم تخریجە.

دونیایان بۆ داواکەرانی دونیا بەجێهێلاوە و دوارۆژیان بۆ داواکەرانی دوارۆژ بەجێهێلاوە، و پەروەردگاریان بۆ خۆیان داواکردووە، گەر دونیایان لێ داوا بکرێت دەستنوقاو نین بە شتێك لە دونیا، دونیا لەلای ئەوان بەخشینی دونیایە، گەر داوای پاداشتی دوارۆژیان لێ داوا بکەی دەیبەخشن، دونیا دەدەن بە هەژاران و پاداشتی دوارۆژیش دەدەن بە کەمتەرخەمان لە داوای دوارۆژ، رووداو بۆ رووداو بەجێدەهێلن و خاوەن رووداو بۆ خۆیان هەڵدەبژێرن، تونێکلّ وازلێدەهێنن، چونکە هەرچی شتی ترە جگە لە حەق(عزوجل) تونێکلّە و داوای خودا و نزیکی لە ئەو بریتییە لە کرۆك.

**لە یەکێك لە خوداناسانەوە(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت:** (تەنها عاریف بەرووی فاسیقەوە پێدەکەنێت)، بەڵێ، فەرمانی پێدەکات و رێگری لێ دەکات و ئازارەکانی هەڵدەگرێت، ئەمەش تەنها عاریف بە خودا دەتوانێت شان بداتە ژێری، بەڵام زاهیدان و عابیدان و موریدان نەخێر، چۆن بەزەییان بە یاخیبواندا نایەتەوە لە کاتێکدا ئەوان جێگەی بەزەیین بە مەقامی تەوبە و داوای لێخۆشبوون؟ ئەخلاقی کەسی عاریف لە حەقەوەیە(عزوجل)، ئەو بۆ رزگارکردنی یاخیبوو لەدەستی شەیتان و نەفس و ئارەزوو تێدەکۆشێت، گەر یەکێك لە ئێوە کورەکەی خۆی بە دیلی و بەخسیری لە دەستی بێباوەڕدا بینی ئایا تێناکۆشێت بۆ رزگارکردنی، کەسی عاریفیش بەهەمان شێوەیە، هەموو خەڵکی وەك رۆڵەی ئەون، بە زمانی حوکم گفتوگۆ لەگەڵ خەڵکیدا دەکات و پاشان رەحمیان پێ دەکات بۆ ئاگاداریان بەسەر زانستدا(زانستی ناوەوە)، کردارەکانی حەق(عزوجل) لەواندا دەبینێت، تەماشای هاتنەدەرەوەی بریارە براوەکان و قەدەرەکان دەکات لە دەرگای حوکم و زانستەوە، بەڵام ئەوانە دەشارێتەوە و لەگەڵ مەردوومان بە حوکم -کە بریتییە لە فەرمان و نەهیکردن- گفتوگۆ دەکات، بە زانست -کە بریتییە لە نهێنی- گفتوگۆیان لەگەڵ ناکات، خودا(عزوجل) پێغەمبەرانی رەوانە کردووە و کتێبەکانی دابەزاندووە و ئاگاداری کردووینەتەوە و هەرەشەی کردووە بۆ ئەوەی بەڵگە لەسەر خەڵکی راستببێتەوە، نابێت بچیتە ناو زانستی خوداوە و بەرهەڵستی بکەیت، هێرش و هەڵهاتنی تێدایە، زانست بەو زانستە دامەزراتێکە پێویستی بە حوکمی هاوبەش هەیە بۆ تۆ و بۆ کەسانی تر، و تەنها پێویستیت بە

زانستی تایبەتە بۆ خۆت، گەر یەکێك لە ئێوە بە زانستی ئاشکرا کاری کرد بە زانستی ناوەوە دەکات بە دەمیەوە، حوکمی ناوەوە دەکات بە پێغەمبەر(ﷺ) لە زانستی ناوەوە دەکات بە دەمیەوە، حوکمی ناوەوە دەکات بە دەمیەوە وەك چۆن باڵندە خواردن دەچۆڕێنێتە ناو دەمی بێچووەکەیەوە، پێغەمبەر(ﷺ) ئەو کارەی لەگەڵ دەکات لەپێناو بەڕاستزانین و کارکردن بە فەرموودەی ئاشکرای ئەو(ﷺ) کە بریتییە لە شەریعەتەکەی، گەر ڕۆڵەی ئادەم ڕاست و دروست بوو ئەوا هیچ ڕاست و دروستێك بە ئەندازەی ئەو نییە، گەر پاك و بێگەرد بوو هیچ پاك و بێگەردێك وەکو ئەو نییە، گەر لە خودا نزیکبوویەوە هیچ نزیکییەك بەقەدەر ئەوە نییە، ئەزان بە چاوی سەر تەماشا دەکات و ژیر بە چاوی هۆش، و عاریفیش بە چاوی دڵ، گەوهەرێکی زانایە، هەموو خەڵکی لەلای ئەو بزر و نادیارن و هیچ شتێك لەلای ئەو نامێنێتەوە جگە لە حەق(عزوجل)، ئەوکات دەڵێت: ﴿هُوَ ٱلۡأَوَّلُ وَٱلۡأٓخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلۡبَاطِنُۖ﴾ الحدید: ٣، حەق(عزوجل) دەبێتە ئاشکرا و پەنهان و یەکەمین و دواهەمین و وێنە و مانای ئەو، هیچ شتێك جگە لە ئەو(سبحانه وتعالی) لەگەڵی نامێنێتەوە، ئەوکات خۆشەویستییەکەی لەگەڵ خودا لە دونیا و دواڕۆژ بەردەوام دەبێت، لە هەموو حاڵەکاندا لەگەڵ خودا تەبا دەبێت، ڕازیبوونی ئەو هەڵدەبژێرێت بەسەر تووڕەبوونی خەڵکیدا، لە پێناوی خودادا لە لۆمەی لۆمەکەران ناترسێت، وەك یەکێك لە خوداناسان(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت: (لەگەڵ خودا تەبابە لەناو خەڵکیدا، لەگەڵ خەڵکی تەبا مەبە لە خودادا)، ئەوەی خودا دەیشکێنێت بیشکێنە و ئەوەی خودا ڕاستی دەکاتەوە ڕاستی بکەرەوە، شەیتان و ئارەزوو و سروشت و هاوەڵی خراپ دوژمنی تۆن لێیان بەئاگابە بۆ ئەوەی نەخەنە ناو تیاچوونەوە، فێری زانست ببە بۆ ئەوەی فێرببیت چۆن دوژمنایەتیان دەکەی و خۆتیان لێ دەپارێزی، پاشان فێرببە چۆن پەروەردگاری خۆت دەپەرستی، ئەزان عیبادەتی لێ قبووڵ ناکرێت.

لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: ((هەرکەس بە ئەزانی خودا بپەرستێت ئەوەی تێکیدەدات زۆرترە لەوەی چاکی دەکات))[1].

---

[1] تقدم تخریجه.

کەسی نەزان عیبادەتەکەی بەهایەکی نییە. بەڵکو تێکچوون و تاریکییەکی سەراپایە، زانستیش سوودێکی نییە گەر کرداری لەگەڵ نەبێت، کرداریش سوودێك نابەخشێت گەر ئیخلاصی تێدا نەبێت، هەر کارێك ئیخلاصی تێدا نەبێت سوود و قازانج ناگەیەنێت و لە کارکەرەکە قبووڵ ناکرێت، گەر زانست فێرببیت و کار نەکەیت زانستەکە دەبێتە بەڵگە لەسەرت، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: ((نەزان جارێك سزا دەدرێت و زانا حەوت جار))[1]، نەزان بۆ ئەوەی کە نەیویست فێرببێت، زاناش بۆ ئەوەی کاری بە زانستەکەی نەکرد، فێر ببە و کاربکە و خەڵکی فێربکە، چونکە ئەوە هەموو خێرێکت بۆ کۆدەکاتەوە، گەر وشەیەك لە زانستت بیست و کارت پێکرد و خەڵکیت پێ فێرکرد ئەوا دوو پاداشتت بۆ هەیە: پاداشتی فێربوون و پاداشتی فێرکردن، دونیا تاریکییە و زانست نوورێکە لەو تاریکییەدا، هەرکەس زانستی نەبێت لەناو ئەو تاریکییەدا بەردەبێتەوە و بەری تێکدانی لە بەری چاککردن و پێکەوەنانی زۆرترە، ئەی ئەو کەسەی بانگەشەی زانست دەکەی لە دەستی نەفس و سروشت و شەیتانت وەرمەگرە، لە دەستی بوونی خۆت وەرمەگرە، لە دەستی ریا و دووڕوویی و زوهدی رووالەتی و حەزی ناوەکی وەرمەگرە، ئەوە زوهدی پڕوپووچە و تۆ لەسەری سزا دەدرێیت، فریوکاری لە حەق(عزوجل) دەکەی، لە کاتێکدا ئەو دەزانێت لە تەنهایی و ئاشکرای تۆدا چی گوزەر دەکات، دەزانێت چی لەناو دڵی تۆدایە، خودا پەنهان و ئاشکرا و داپۆشینی بۆ نییە، بڵێ: هاوار بۆ بێشەرمی و هاوار بۆ شەرمەزاری! چۆن حەق(عزوجل) ئاگادارە بە هەموو کردارەکانم لە شەوان و رۆژاندا، ئەو تەماشام دەکات من شەرم لە تەماشاکردنی ئەو ناکەم، تەوبە بکە لە بێشەرمیت بەرانبەر بە خودا و بە ئەنجامدانی فەرزەکان و خۆگرتنەوە لە نەهێڵێکراوەکانی خۆت لە ئەو نزیك بکەرەوە، واز لە گوناهی دەرەوە و ناوەوە بهێنە و کارە خێرە ئاشکراکان ئەنجام بدە، بەوە دەگەیە دەرگای خودا، لێی نزیك بەرەوە خۆشیدەویت و لەلای دروستکراوانی خۆشەویستت دەکات، بە خۆشەویستی لە کەسانی تر جیاتدەکاتەوە پاشان ئەوە بۆ دروستکراوەکانی دەگوێزێتەوە، گەر خودا و فریشتەکانی تۆیان خۆشویست هەموو دروستکراوەکانی-

[1] تقدم تخريجه

جگە لە بێباوەڕان و دووڕووان- تۆیان خۆشدەوێت، ئەو دوو دەستەیە لە خۆشەویستی تۆدا لەگەڵ خودا تەبا نین، هەر کەسێك ئیمان لە دڵیدا بێت باوەڕداری خۆشدەوێت، هەر کەس لە دڵیدا دووڕوویی هەبێت رقی لە باوەڕدارە، لامەکەرەوە بە لای رقی بێباوەڕان و دووڕووان و شەیتانەکاندا، ئیبلیسە دووڕوو و بێباوەڕەکان بریتین لە مرۆڤە شەیتانەکان، باوەڕداری خاوەن یەقینی عاریف بە دڵ و نهێنی و مانا لە دروستکراو دابڕاوە، دەگاتە حاڵەتێك ناتوانێت زیان لە خۆی دەربکات و قازانج بۆ خۆی بەدەستبهێنێت، لەبەردەستی خودادا(عزوجل) رادەکشێت، هەوڵ و هێزی بۆ نامێنێتەوە، گەر ئەمەی بۆ هاتە راستە لە هەموو لایەکەوە خێر رووی لێ دەکات، تەنها بە بانگەشە و ئاوات و خۆزگە هەڵکێشان شانشانێن لەگەڵ خوداناسان مەکە، چونکە هیچ لەوەوە سەوز نابێت، قسە نییە تا پێیەکانت دەقڵیشێن و لاقەکانت لە هەوڵ و کۆشان بۆ دەرگای خەڵکی دەوەستن، قسە نییە تا دڵ و ئەقڵ و رووت لە خەڵکی وەردەگەڕێن و روو لە دروستکەر دەکەن، ئەوکات پشتت لە دروستکراو و رووت لە حەق(عزوجل) دەبێت، رووالەت و وێنەت لە خەڵکی دەبێت و ناوەوە و کرۆك و مانات لە دروستکەر دەبن، ئەوکات دڵت وەك دڵی فریشتەکان و پێغەمبەرانی(علیهم السلام) لێ دێت، دڵ لە خواردن و خواردنەوەی ئەوان دەخوات و نۆشدەکات، ئەمە کارێکە پەیوەستە بە دڵ و نهێنی و ماناوە نەك بە رووالەتەوە.

خودایە دڵمان پاك و بێگەرد بکەی و پۆشاکی پاکی و جوانی بکەی بە بەر نهێنیماندا، لەودیو ژێری ئێمە و دروستکراوانەوە ژێرمان-لە نێوان ئێمە و تۆدا - پاك و پاڵفتە بکە، ئەی ئەوانەی بە جەستە ئامادەن و بە دڵ بزر و نائامادەن لە رۆژی دواییدا شتی سەیر وسەمەرە لە من دەبینن، من لەپای دووڕووان پێداگری دەکەم چجای لەپای باوەڕداران.

**خودایە، لە هەمەران بێنیازم بکە، خودایە بە خۆتەوە لە هەرچی کەس و شتی ترە بێنیازم بکە، خودایە مامۆستا لە منداڵان و ئەوەی لەناو ماڵی ئەواندایە بێنیاز بکە،** خانەی سفرە و خوانی بکە بە خانەی فێرکردنی دەستەیەك لە خەڵکی، خودایە، تۆ دەزانێت ئەو قسەیە زاڵ بوو بەسەرمدا بۆیە داوای لێخۆشبوون دەکەم و لە رەفتاری

منداڵانم ببووره، حەقدەستی من تێر و تەواو بوو و بەدەستهات، خودایە لە تۆوە هێشتا پاداشتی منداڵانە و شوێنکەتووان و تەقلیدەرانم بۆ ماوە، خودایە، داوای ئاسانکاریت لەوەدا لێدەکەم لەگەڵ پاکی دڵ و پاڵفتەیی نهێنیمدا.

**خەڵکینە**، وا گومان دەبەن من لە ئێوە وەردەگرم و ئێوە دەبینم، نەخێر، بێ هیچ ڕێز و شکۆیەك، من لە خوداوە(عزوجل) وەردەگرم نەك لە ئێوەوە، ئەو(سبحانه وتعالى) ئەوەی دەیەوێت لەسەر دەستی ئێوە جێبەجێی دەکات، کاتێك من لەگەڵتان بووم ئێوەم نەدەناسی، کاتێك لە ئێوە چوومە دەرەوە ئێوەم ناسی، من تیابەری دوورووان و شارەزایی عاریفانم، بە چەکوش بەسەری دووڕووواندا دەدەم نەك بە قامیش، سفرە و خوانی من بۆ ئێوەیە، خواردنم دوای لێبوونەوەیە لە ئێوە، من ئەواڵە(بابۆڵە)م لە کەسێکی ترەوەیە جگە لە ئێوەوە، دوای ڕۆیشتنی ئێوە لە لام خوانێکم لە هاوەڵەکەوە-کە من خزمەتکاری ئەوم- بۆ دەهێنرێت، ئەی ئەهلی بەصیرەت نابینن قۆڵم هەڵکردووە و ناوقەدم بەستووە؟

یەکێك پرسیاری کرد و وتی: پەیامهێنی حەق(عزوجل) بۆ لای پێغەمبەرانی خودا(علیهم السلام) بریتییە لە جبریل(علیه السلام) ئایا پەیامهێنی حەق کێیە بۆ لای دۆستانی خودا؟

فەرمووی: خودا بەبێ ناوەند بۆخۆی پەیامیان پێدەدات ئەوەش بە ڕەحمەت و لوتف و منەتی خۆی، دۆستانی خودا ئیلهام و تەماشاکردنی خودا بۆ دڵ و نهێنییان و سۆز و بەزەیی بەوان لە ئاگاهی و لە خەودا دەبینن، ئەوەش بە چاوی دڵ و پاکێتی نهێنی و بەردەوامی ئاگاهییان.

ئەی **خەڵکینە**، خۆشەویستیتان بۆ دونیا و هەڵپەتان لەسەر دونیا و خۆشەویستی بۆ زۆرکردن بە دونیا و لە دونیا لە مەعریفەی خودا(عزوجل) و مەعریفەی دۆستانی خودا داتاندەبڕێت، یادی دوارۆژ بکەنەوە، بە بەخشندەیی جوان و بەخشینی باش لە سیفەتەکان واز لە دونیا بهێنن، خودایە ئێمە بەندەی تۆین گەردیلەیەك لە بەخشندەییمان پێ ببەخشە. ئامین.

# مەجلیسی پەنجا و چوار

## بیرکردنەوە لە ڕۆژی دوایی

بەیانی ڕۆژی هەینی ١٠/ڕەمەزان/٥٤٥ھ فەرموی:

**ئەی گەنج،** تەنها دوو هەنگاو دەتگەیەنێت، هەنگاوێك لە دونیا و هەنگاوێك لە دوارۆژ، هەنگاوێك لە نەفسی خۆت و هەنگاوێك لە دروستکراو، واز لەم ڕووالەتە بهێنە دەگەیە ناوەڕۆك، سەرەتا ئەوجا کۆتایی، تۆ دەست پێبکە و تەواوکردنی لەسەر خودایە(عزوجل)، سەرەتا لە تۆوەیە و کۆتایی لەسەر خودایە(عزوجل)، پەت و زەنبیلە بگرە دەست و لە مەیدانی کاردا بوەستە، تۆ کە داوای کار دەکەی لە خاوەن کارەوە نزیکی، لەناو جێگەی نووستن و لەژێر لێفەکەتدا و لە پشت دەرگای داخراوەوە مەمێنەرەوە، ئەوجا داوای کار و بەکارهێنانت لە کاردا بکە، دڵت لە یادی خودا نزیك بکەرەوە و ڕۆژی دوایی بەیاد بهێنەرەوە، بیر لەو گۆڕانە بکەنەوە کۆن و پوواون، بیربکەرەوە چۆن حەق(عزوجل) هەموو دروستکراوان حەشر دەکات و لەبەردەستی خۆیدا ڕاستیان دەکاتەوە، گەر لەسەر ئەم بیرکردنەوە بەردەوام بوویت دڵڕەقییەکەت لادەچێ و لە لیخنی پاك دەبێتەوە، گەر بینا لەسەر بنچینەیەکی پتەو بێت جێگیر و دامەزراو و بناغەدار دەبێت، گەر لەسەر ئەو بنچینە پتەوە نەبێت بەخێرایی دەڕمێت، گەر حاڵت لەسەر ئەحکامی حوکمی ئاشکرا بێت هیچ کەسێك لە خەڵکی ناتوانێت حاڵت کەم بکاتەوە، گەر لەسەر حوکمی ئاشکرا حاڵت بینا نەکەی حاڵت بۆ جێگیر نابێت و ناگەیە مەقام و بەردەوام دڵی صادیقان ڕقیان لێت دەبێتەوە و خۆزگە دەخوازن نەتبینن.

**هاوار بە حاڵت،** ئەی نەزان بە ئایین، بۆ ئەم کارە یارییە، ئەم کارە ساختەکارییە؟ نەخێر، ئەی ساختەکار، تۆ ڕێزێکت نییە، نەفسی خۆت بە قسەکردن لەسەر دروستکراو تیابردووە بەبێ ئەوەی تۆ هیچ جۆرە شایستەییەکت هەبێت، ئەو کارە بۆ دانەدانەیەکە لە

خەلکی، بۆ چەند چەند کەسێکە لە صالحان، ئەگینا بێدەنگی نادابیان بووە، ئاماژە بۆیان بێ قسەکردن زۆر دەگمەن بووە، هەیانە باوەڕی بە قسەکردن هەیە و قسە بۆ خەلکی دەکات بەبێ ئەوەی حەز و ویستی خۆی تێدا بێت، لەدوای قسە هەواڵ دەبێت بینراو، کارەکە تایبەت بە دڵ و پاکێتی نهێنیت وەردەچەرخێت، بۆ ئەو مەبەستە ئەمیری باوەڕداران عەلی کوڕی ئەبی تالب(خودا لێی رازی بێت) دەفەرموێت: (گەر پەردە لابدرێت یەقینم زیاد ناکات)، هەروەها دەفەرموێت: (پەروەردگارێك ناپەرستم نەیبینم)، هەروەها فەرمووی: (دڵم پەروەردگاری پێ نیشاندام)، ئەی نەزانان، تێکەڵ بە زانایان بن و خزمەتیان بکەن و لێیانەوە فێربن، زانست لە دەمی پیاوانەوە وەردەگیرێت، بە ئەدەبی جوانەوە لە خزمەتی زانایاندا دابنیشن و بەرهەڵستی کردنیان و داوای سوودێکی دونیایی لەوان وازلێبهێنە بۆ ئەوەی لە زانستەکەیان بەدەست بهێنن و بەرەکەتی ئەوان بەسەر ئێوەدا داببارێت و سوودەکانیان بەسەر ئێوەدا پەخش بێنەوە، لەگەڵ عاریفاندا بە بێدەنگی دابنیشن، لەگەڵ زاهیداندا بە تامەزرۆییەوە دابنیشن، عاریف لە هەر ساتێکدا لە خوداوە نزیکترە تا ساتەکەی پێشتر، لە هەر ساتێکدا عاریف ترس و لەرز و زەلیلی بۆ خودا نوێ دەبێتەوە، لە ئامادەبوویەك دەترسێت نەك لە بزر و نادیارێك، زیادبوونی ترس و لەرزەکەی بەپێی زیادبوونی نزیکییەتی لە پەروەردگارەوە، زیادبوونی لاڵبوونی بەپێی زیادبوونی موشاهەدەی ئەوە، هەرکەس خودا بناسێت زمانی نەفس و سروشت و ئارەزوو و نەرێت و بوونی لاڵ دەبێت، بەڵام زمانی دڵ و نهێنی و حاڵ و مەقام و پێدانی-بە دەرخستنی ئەو نیعمەتانەی لەلایەتی- دەکەوێتە گەڕ، بۆ ئەو مەبەستە بە بێدەنگی لەگەڵیان دادەنیشن بۆ ئەوەی سوود و قازانجیان لێ ببینن و لەو شەرابە بنۆشن لە دڵیانەوە دەچۆڕێت، هەرکەس لەگەڵ عاریفان بە خودا زۆر تێکەڵاو بێت نەفسی خۆی بە پەروەردگاری دەناسێنێت، بۆ ئەو مەبەستە وتراوە: هەرکەس نەفسی خۆی بناسێت پەروەردگاری دەناسێت، نەفس پەردەیەکە لە نێوان بەندە و پەروەردگاری(عزوجل)، هەرکەس نەفسی خۆی ناسی بۆ خودا تەوازوع دەنوێنێت، گەر نەفسی خۆی ناسی خۆی لێ دەپارێزێت، بە شوکری خوداوە لەسەر ناسینی خودا سەرقاڵ بە و بزانە بۆیە خودا خۆی بە تۆ ناساندووە تاکو خێری دونیا و دوارۆژت پێ ببەخشێت،

بۆیە دەرەوەی عاریف سەرقاڵە بە شوکری خوداوە و ناوەوەی سەرقاڵە بە حەمدی خوداوە، دەرەوەی پەرتبوونە و ناوەوەی کۆبوونەوە، ئاسوودەییەکەی لە ناوەوەیە و حوزنی لە دەرەوە بۆ ئەوەی حاڵی خۆی بشارێتەوە، عاریف پێچەوانەی باوەڕدارە، ئەو حوزنی لە دڵدایە و کرانەوە و خۆشحاڵی لە روخساریدا، ئەو زانایە و لەبەر دەرگاکە وەستاوە، نازانێت چی بە ئەو دەکرێت، ئایا وەردەگیرێت یان رەد دەکرێتەوە؟ ئایا دەرگاکە بە روویدا دەکرێتەوە یان داخستنەکەی بەردەوام دەبێت؟ هەرکەس نەفسی خۆی بناسێت لە هەموو حاڵەکانیدا پێچەوانەی باوەڕدارە، باوەڕدار خاوەنی حاڵە و حاڵیش وەردەگەڕێت، عاریف خاوەنی مەقامە و مەقامیش جێگیرە، باوەڕدار دەترسێت لە گواستنەوەی حاڵەکەی و تیاچوونی باوەڕەکەی، بۆیە بەهەمیشەی حوزنی لە دڵیدایە و خۆشی و کرانەوەی لە روخساریدا، لەگەڵ حوزنی خۆیدا دەڕوات، بە رووی تۆدا پێدەکەنێ و دڵی بە حوزن پارچە پارچە بووە، کەسی عاریف حوزنی لە روخساریدایە، چونکە بە رووی ترساندنەوە بە دروستکراوان دەگات، ئاگاداریان دەکاتەوە و فەرمانیان پێ دەکات و نەهییان لێ دەکات وەك نوێنەری پێغەمبەری خودا(ﷺ)، خوداناسان کاریان کرد بەوەی بیستیان بۆیە کردار لە حەق(عزوجل) نزیك کردنەوە، ئەو حەقەی لەپێناویدا کاریان کردووە، ئامۆژگارییەکانی خودایان بە بیستنی دڵ و بەبێ ناوەند وەرگرت، ئەوە لەباری نوغرۆبوون و خەودا لە دروستکراو و ئامادەبوون و ئاگاهی بە دروستکەرەوە، گەر دڵت راست و دروست بوو بەهەمیشەیی لە بزربوونبوون و خەودا دەبێت لە دروستکراو و ئاگاهی لە دروستکەر، ئەو بەردەوام لە ئاشکرایدا و لەناو خەڵکیدا لەگەڵ خودا لە خەڵوەتدایە، بەردەوام هاتوو(وارد)ی خودا و حوکمی ئەو(سبحانه وتعالی) بەسەر نهێنی عاریفدا دادەبارێن، نهێنیش هەڵیدەداتە سەر دڵ و دڵیش هەڵیدەداتە سەر نەفسی دڵنیا و ئارام و نەفسیش هەڵیدەداتە سەر زمان و زمانیش بە دروستکراوانی دەگەیەنێت، هەرکەس بەم سیفەتە قسەی بۆ دروستکراوان کرد دروستە، ئەگینا با قسە نەکات، عەودالبوونی خوداناسان رازهێنانە لە نەرێتە سروشتییەکان و کردارەکانی نەفس و ئارەزوو و خۆکوێرکردن لە حەز و چێژ، چونکە ئەوان وەك سەرگەردانی شێتان سەرگەردان بوون و ژێرپیان رۆیشتووە.

**حەسەنی بەصری(رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت:** گەر بیانبینن دەڵێن ئەوانە شێتن، گەر ئەوان ئێوە ببینن دەڵێن ئەوانە بۆ چاوتروکانێك باوەڕیان بە خودا نییە، خەڵوەتەکەت نادروستە، چونکە خەڵوەت بریتییە لە رووتبوونەوە لە هەموو شتەکان لە دڵەوە، ناوەوەت رووتدەبێتەوە ئەوکات بەبێ دونیا و دوارۆژ و هەر شتێکی تر جگە لە حەق(عزوجل) دەمێنێتەوە، ئەمە ئەو راستە شەقامەیە پێغەمبەران(علیهم السلام) و نێراوان و ئەولیا و صالحان لەسەری رۆیشتوون، فەرمان کردن بە چاکە و رێگری لە خراپە لە عیبادەتی هەزار عابید لە خەڵوەگادا لام شیرینترە، تەماشاکردنی نەفس بەرپەرچ بدەرەوە و چاوی دابخە و کورتی بکەرەوە بۆ ئەوەی تەماشاکردنەکەی نەبێتە هۆیەك بۆ تیاچوونی، تاکو نەفس شوێنی دڵ و نهێنی دەکەوێت و دەبێتە یەکێك لە شوێنکەوتووانی ئەو دوانە و لە رای ئەو دوانە دەرناچێت و لەگەڵیان یەکدەگرێت و جیاوازی لە نێوان ئەو و ئەو دوانەدا نامێنێت، بەوە فەرمان دەکات ئەو دوانە فەرمانی پێ دەکەن و نەهی لەو شتە دەکات ئەو دوانە نەهی لێ دەکەن، ئەوە هەڵدەبژێرێت ئەو دوانە هەڵیدەبژێرن، ئەوکات دەبێتە نەفسێکی دڵنیا و ئارام و هەموویان لەسەر یەك داوا و یەك مەبەست تەبا دەبن، گەر نەفس گەیشتە ئەو حاڵە کەمتەرخەمی لە تێکۆشان وازلێدەهێنێت، ململانێ ناکات لەگەڵ حەق(عزوجل) لەوەی بەسەر ئەو و خەڵکیدا تێیدەپەڕێنێت، گوێت لەم ئایەتە پیرۆزە بووە:

﴿لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴿٢٣﴾﴾ الأنبياء: ٢٣

لە تۆوە شوێنکەوتنی حەق(عزوجل) لە کوێدایە گەر ئەدەبی باشت نەبێت، ئەگەر نە، لە خانەکە بە رسوایی دەردەکرێیت، بەڵام گەر ئەدەبی باشت هەبوو و لەگەڵی تەبابوویت لە خانەکە دادەنرێیت و رێزت لێدەگیرێت، کەسێك خودای خۆشبوێت لەلای ئەو میوانە، میوان لە خواردن و خواردنەوە و پۆشاك و هەموو حاڵ و بارێکیدا لە جێگەی خانەخوێ بریار نادات، بەڵکو بە بەردەوامی تەبا و ئارامگر و رازییە، بۆیە گومانی تێدا نییە پێی دەوترێت مژدەت لێ بێت بەوەی دەیبینی و پێیدەگەیت، هەرکەس خودا بناسێت دونیا و دوارۆژ و هەرچی شتی ترە جگە لە حەق(عزوجل) لە

دڵی بزر دەبن، پێویستە قسەكانت بۆ حەق بێت ئەگینا با لاڵبوون لات خۆشەویستتر بێت، با ژیانت بۆ گوێڕایەڵی خودا بێت(عزوجل)، ئەگینا مردنت لا خۆشەویستتر بێت.

خودایە لە گوێڕایەڵی خۆتدا بمانژییەنە و لەگەڵ ئەهلی گوێڕایەڵی خۆت حەشرمان بكە. ئامین.

**هەروەها فەرمووی:**

باوەڕدار كەسێكە بۆ چاككردنی نەفسی كۆچی كردووە، هاوەڵی شێخێك دەكات ئەدەبی دابدات و فێری بكات، لە منداڵییەوە بە بەردەوامی لەناو فێركردندایە مەگەر لە سەرەتای حاڵییەوە بڕێت، خوێنەری قورئان قورئانی پێ لەبەردەكات، لە حاڵی دووەمیدا زانایەك سوننەتی پێغەمبەری(ﷺ) فێردەكات، لەگەڵ ئەوەش كۆمەكی و سەركەوتن پێیەوە پەیوەستە، كار بەوە دەكات كە دەیزانێت، بۆیە كردار لە حەق(عزوجل) نزیكی دەكاتەوە، هەتا كار بكات بەوەی دەیزانێت خودا(عزوجل) زانستێكی پێ دەدات كە نەیزانیوە، دڵ لەسەر دوو پێی راستدەكاتەوە، ئیخلاصیش هەنگاوەكانی لە حەق(عزوجل) نزیك دەكەنەوە، گەر كارت كرد و بینیت دڵت لە حەق(عزوجل) نزیك نابێتەوە و شیرینی عیبادەت و هۆگربوون بە خوداوە چێژ ناكەی ئەوا بزانە تۆ كاركەر نیت و بێبەشیت بەهۆی ناتەواوییەكەوە لە كردارەكەتدا، ناتەواوییەكە چییە؟ ریا و دووڕوویی و خۆپەسەندی، ئەی كاركەر پێویستە ئیخلاصت هەبێت، ئەگەر نە خۆت، ماندوو مەكە، پێویستە چاودێری حەق(عزوجل) بكەی لە ئاشكرا و پەنهاندا، چاودێری لە ئاشكرادا بۆ دووڕووانە و لە ئاشكرا و پەنهاندا بۆ موخلیصانە.

**هاوار بە حاڵت**، گەر روخسارێكی جوانت بینی(نێر بێت یان مێ) چاوی لێ دابخە، چاوی نەفس و ئارەزوو و سروشتت، بیر لە تەماشاكردنی پەروەردگارت بۆ تۆ بكەرەوە و ئەم ئایەتە بخوێنەرەوە: ﴿وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُوا مِنْهُ مِن قُرْآنٍ وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ وَلَا أَصْغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَا أَكْبَرَ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ ﴿٦١﴾﴾ یونس: ٦١

خۆت لە حەق بپارێزە، چاوت لە سەیرکردنی حەرام دابخە، بیر لە تەماشاکردنی ئەو کەسە بکەوە هیچ شتێك لە تەماشاکردن و زانستی ئەو بزر نابێت، گەر ململانێ لەگەڵ حەق(عزوجل) نەکەی و کێبەرکێ وازلێبهێنیت بەندایەتییەکەت تێر و تەواو دەبێت و دەبیت بە بەندەیەکی راستەقینە و دەچیتە ناو ئەو دەستەیەوە خودا دەربارەیان دەفەرموێت:

﴿ إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ ﴾ الحجر: ٤٢

گەر شوکرت بۆ خودا هاتە دی، ئیلهام بۆ دڵ و زمانی خەلکی دەکرێت بە شوکرکردن و خۆشەویستی بۆت، ئەوکات رێگەیەك بۆ شەیتان و داروودەستەکەی نامێنێتەوە بۆ لای تۆ، وازهێنان لە دوعا عەزیمەتە و سەرقاڵبوون پێیەوە روخسەتە، دوعا هەناسە و پشوویەکە بۆ نوقم بوو و دەلاقەیەکە بۆ بەندکراو تا دەروو بۆ بەندکراو دەکرێتەوە و دەچێتە ژوورەوە بۆ لای مەلیك، خەلکانێکی ژیرمەند بن، ئێوە نازانن چۆن دوعا دەکەن و چۆن واز لە دوعاکردن دەهێنن، هەموو شتێك پێویستی بە ئیێت و ئەقڵ و زانست و شوێنکەوتنی ئەو کەسە هەیە کە دەزانێت، ئێوە نازانن و ناژنەون چی لەلای خودا و بەندە صالحەکانی هەیە، بۆیە گومانی خراپیان پێ دەبەن، بە سەرمایەی ئاین و حاڵی خۆتان لەگەڵ ئەوان سەرکەشی مەکەن، لە هەموو کار و کردەوەکانیاندا بەرهەڵستییان مەکەن، گەر شەرع بەرهەڵستی لەگەڵیان ئەبوو بەرهەڵستیان مەکەن، ئەوان لە ئاشکرا و پەنهاندا لەبەردەستی حەقدان(عزوجل)، دڵی لە ترس خامۆش نابێت تا خودا سوکنایی و سەلامەتی بۆ دەستەبەر دەکات.

**ئەی بەندەکانی خودا لەسەر زەوی**، ئەی زاهیدانی زەوی وەرن شتێك فێربن کە ئێوە هەواڵتان لێی نییە، وەرنە ناو کتێبەکەی من تا شتێکتان فێربکەم لەلای خۆتان بوونی نییە، دڵان کتێبیان هەیە و نهێنییەکان کتێبیان هەیە و نەفسەکان کتێبیان هەیە و ئەندامەکان کتێبیان هەیە، ئەوانەش بریتین لە پلە و مەقام و چەندین هەنگاو.

**هەنگاوی یەکەمت بۆ** دروست نەبووە چۆن دەگەیە هەنگاوی دووەم؟ ئیسلامت بۆ نەهاتووەتە راستە چۆن دەگەیە ئیمان؟ ئیمانت بۆ نەهاتووەتە راستە چۆن دەگەیە

یەقین؟ یەقینت بۆ نەهاتووەتە راستە چۆن دەگەیە مەعریفە و ویلایەت؟ کەسێکی ژیرمەند بە، تۆ لەسەر هیچ شتێك نیت، هەریەك لە ئێوە داوای سەرۆکایەتی دەکات بەسەر خەڵکیدا بەبێ ئەوەی ئامرازی ئەو مەیدانەی لەدەستدا بێت، سەرۆکایەتی بەسەر خەڵکیدا کاتێك دێتە راستە زوهدت لە خەڵکی و لە دونیا و نەفس و سروشت و ویست کردبێت، سەرۆکایەتی لە ئاسمانەوە دادەبەزێت نەك لە زەویەوە، ویلایەت لە حەقەوەیە نەك لە خەڵکەوە، بەهەمیشەیی شوێنکەوتە بە نەك شوێنکەوتوو، هاوەڵی بکە نەك هاوەڵیت بکەن، بە زەلیلی و خامۆشی رازی بە گەر لەلای حەق(عزوجل) پێچەوانەی ئەوەت بۆ دیاریکرا بوو ئەوا لە کاتی خۆیدا رووت لێ دەکات، خۆتی رادەست بکە و خۆت بە خودا بسپێرە و هەوڵ و هێز و بەرهەڵستیکردن و هاوەڵدانان بەهۆی نەفس و دروستکراوەوە وازلێبهێنە، هاوەڵی بەندایەتی بکە کە بریتییە لە جێبەجێ کردنی ئەمر و نەهی و ئارامگرتن لەسەر ئافەت، بنچینەی ئەم کارە بریتییە لە یەکتاپەرستی و دامەزران لەسەری، کار و کردەوەی چاکە بنچینەیە، دەبێت لەسەر بنچینەیەکی پتەو بینابکرێن، تۆ هێشتا نییێتت بۆ نەهاتووەتە راستە چۆن قسە دەکەی؟ بێدەنگییەکەت هێشتا تێر و تەواو نەبووە، چۆن دەبێت قسە بۆ خەڵکی بکەی بە نوێنەرایەتی پێغەمبەران(علیهم السلام)، چونکە ئەوان(علیهم السلام) وتارخوێنی خەڵکی بوون، کاتێك ئەوان رۆیشتن خودا(عزوجل) زانایانی کارکەر بە زانستیان لە جێگەی پێغەمبەران راستکردەوە و ئەوانی کرد بە میراتگری پێغەمبەران(علیهم السلام)، هەرکەس دەیەوێت لە مەقامی پێغەمبەراندا بێت دەبێت لە خەڵکی سەردەمی خۆی پاکتر بێت، و بە حوکمی خودا(عزوجل) و زانست بە خودا لەوان بەئاگاتر و شارەزاتر بێت، وادەزانن ئەم کارە سوك و ئاسانە، ئەی نەزانان بە خودا و پێغەمبەران و ئەولیا و صالحان لە بەندەکانی، ئەی نەزانان بە نەفس و سروشت و دونیا و دوارۆژیان، هاوار بە حاڵتان، لاڵ و بێدەنگ بن تا دێنە قسە و زیندوودەبنەوە و راستدەکرێنەوە یان دێن بۆ لاتان، هەرکەس زانستەکەی بەسەر ئارەزوویدا زاڵ ببێت ئەوە بریتییە لە زانستی بەسوود، چۆن نابێت بە زانستێکی بەسوود لە کاتێکدا دەرگای دروستکراوی داخستووە و دەرگای حەقی(عزوجل) کردووەتەوە کە مەزنترین

دەرگایە؟ گەر ئەو داخستن و کرکردنەوە بۆ بەندەیەك هاتە راستە زەحمەتی لێدەرِوات و خەڵوەت رووی لێ دەکات، دارنین روو لە دڵی دەکات و تەپوتۆزی لێ بەرزدەبێتەوە، کلیلەکان رووی لێ دەکەن و توێکڵەکان دەبن بە تۆز و کرۆکەکە دەمێنێتەوە، دەرگای ئارەزوو دادەخرێت و بەسەریدا زاڵ دەبێت و ئارەزوو شکست دەخوات و رێگە بۆ لای حەق بەرِوویدا دەکرێتەوە، شەقامێك بەرِوویدا والا دەبێت، شەقامی مورادی خودا(عزوجل) کە بریتییە لە شەقامی ئەوانەی پێشکەوتن لە پێغەمبەران و نێراوەکان و ئەولیا، ئەو شەقامە کام شەقامە؟ شەقامی پاکێتییە بەبێ لیخنی، شەقامی یەکتاپەرستییە بەبێ هاوەڵدانان، شەقامی خۆرادەستکردنە بەبێ کێبەرکێ، شەقامی راستگۆییە بەبێ درۆ، شەقامی سەبەبکارە بەبێ سەبەب، ئەو شەقامەی ئەمیرانی ئاین و سوڵتانەکانی مەعریفە و مەلیکانی زانست لەسەری بوون، ئەوانە بریتین لە پیاوانی حەق(عزوجل) و پاڵفتەکراوان و سەرخەرانی ئایینەکەی، ئەوانەی لە پێناوی خودادا دوژمنایەتی و دۆستایەتی دەکەن.

**هاوار بە حاڵت،** چۆن بانگەشەی رێگەی ئەوانە دەکەی لە کاتێکدا تۆ بە خۆت و خەڵکانی تر لە دروستکراوان هاوەڵت بۆ خودا داناوە؟ ئیمانت نییە گەر لەسەر رووی زەوی کەسێك بوونی هەبێت لێی بترسی یان رجات لەلای بێت، زوهدت بۆ نییە گەر لە دونیادا شتێك هەبێت هەڵپەی بۆ بکەی و ئاواتی بۆ بخوازی، یەکتاپەرستیت بۆ نییە لە کاتێکدا -لەسەر رێگەی بەرەو خوداچوونت- کەسانی تر دەبینی، کەسی عاریف لە دونیا و دوارِۆژ نامۆیە و زوهدی هەیە لەو دوانە و لە هەرچی شتی ترە جگە لە حەق(عزوجل)، ئەو بەگشتی هیچ حەزێکی نییە بۆ شتانێکی تر جگە لە خودا(سبحانه وتعالى).

**خەڵکینە،** گوێم لێبگرن و تۆمەت لەسەر من لەناو دڵتان بسرنەوە، چۆن تۆمەتبارم دەکەن و غەیبەتم دەکەن لە کاتێکدا من سۆز و بەزەییم هەیە بۆ ئێوە، کۆڵی قورسی ئێوە هەڵدەگرم و کەڵەبەری کردارەکانی ئێوە دەدوورمەوە و لەلای حەق(عزوجل) شەفاعەتتان بۆ دەکەم تاکو چاکەکانتان لێ وەربگرێ و لە خراپەکانتان ببورێت؟

هەرکەس بناسێت هەتا مردن لەلام دەمێنێتەوە، من دەکات بە حەز و چێژ و خواردن و خواردنەوە و پۆشاکی خۆی، بە من لە هەموو خەڵکی بێنیاز دەبێت.

**ئەی گەنج** چۆن منت خۆشناوێت لە کاتێکدا من تۆم بۆ خۆت دەوێت نەك بۆ خۆم، من سوود و قازانج و رزگاربوونی تۆم دەوێت لە دەستی دونیای بکوژی ستەمکاری فریودەر، تاکەی بەدوای دونیادا رادەکەن، بەم نزیکانە لادەکاتەوە بەلاتاندا و دەتانکوژێت، خودا(عزوجل) بۆ چاوتروکانێك خۆشەویستانی خۆی لەگەڵ دونیا وازلێناهێنێت، ئەوان ناداتە دەست دونیا و لەگەڵ دونیا و شتانی تر بەگشتی جگە لە دونیا بەجێیاناهێڵێت، بەڵکو ئەو(سبحانه وتعالى) لەگەڵ ئەواندایە و ئەوان لەگەڵ ئەودان، دڵیان بەهەمیشەیی لەبەردەستی خودادا و بۆ خودا لەیادایە و ئامادەیە، لە کەسانی تر و شتانی تر پشتیان هەڵکردووە و روویان لە خودا کردووە، ئەو(سبحانه وتعالى) لەگەڵیانە و دەیانپارێزێت و هاودەمی ئەوانە.

خودایە، بمانگێڕە لە ریزی ئەوانە و پارێزگارمان لێ بکە وەك چۆن پارێزگاریت لە ئەوان کرد،

﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ٢٠١﴾

**البقرة: ٢٠١**

**هەروەها فەرمووی:**

ئەی دووڕوو، خودا(عزوجل) دەرخەرە بۆ هەرکەسێك لە بەندەکانی بیەوێت، ئەو لەسەریان بانگ دەکات، ئەو کۆکەرەوەی دڵی بەندەکانە لەسەر هەرکەسێك بیەوێت، ئەو رامهێنەری دڵانە، تۆ بە دووڕووییەکەت دەتەوێت دڵی خەڵکی لە خۆت کۆبکەیەوە، بەڵام ئەوە هیچی لێوە بەرهەم نایەت.

**ئەی گەنج**، حەزەکانت بخە ژێر پێت و بە هەموو دڵتەوە پشتیان لێ بکە، گەر شتێکت لە حەزەکان لە پێشینەی زانستی خودادا بۆ بڕیاردرابوو ئەوا لە کاتی خۆیدا روت لێ دەکات، چونکە زوهد لە پێشینە بڕیاری خودا دروست نییە و زانستی خودا گۆڕان و ئاڵوگۆڕی بەسەردا نایەت، بەشەکەت لە کاتی خۆیدا بۆت رەوانە دەکرێت.

بەشێکی پاك و بەشکەر و حەلاڵ، بەدەستی عیززەت وەریدەگریت نەك بە دەستی زەلیلی، لەگەڵ ئەوەش لەلای خودا پاداشتی زوهدت لە دونیا بۆ بەدەستهاتووە، خودا بە چاوی ڕێزەوە تەماشات دەکات، چونکە چلێسی و هەڵپەت بۆ نەکردووە و لەسەر داوا و بەدەستهێنانی پێداگریت نەکردووە، هەتا تۆ لە بەشەکان رابکەی پێتەوە پەیوەست دەبن و بەدوای تۆدا رادەکەن، بۆیە زوهد تیایاندا دروست نییە، بەڵام هەردەبێت بەر لە هاتنی پشتی تێبکەی، لە منەوە فێری زوهد و دەستبردن بۆ دونیا ببە، لەگەڵ نەزانی خۆت لە خەڵوەتەکەتدا دامەنیشە، سەرەتا فیقهـ وەربگرە ئەوجا کەنارگیر ببە، لە حوکمی خودا(عزوجل) شارەزا ببە و کاری پێ بکە پاشان گۆشەگیر ببە لە هەمووان مەگەر لە دانەدانەیەك لە زانایان بە خودا(عزوجل)، چونکە تێکەڵاویت بەوانە و گوێگرتنت لێیان باشترە لە گۆشەگیرییەکەت، گەر یەکێك لەو زانایانەت بینی پێیەوە پابەند بە و لێیەوە فیقهـ بە زانستی خودا و مەعریفە بە خودا فێرببە، بە گوێگرتن بۆی و لە دەمی خۆیەوە لێیەوە شارەزا ببە، زانست لە دەمی پیاوان وەردەگیرێت، ئەو پیاوانەی زانان بە حوکمی خودا و زانستی خودا، گەر ئەمەت بۆ راست و دروست بوو بەتەنها و بەبێ نەفس و شەیتان و ئارەزوو و سروشت و عادەت و بینینی دروستکراوان کەنارگیر ببە، گەر ئەم گۆشەگیرییەت بۆ راست و دروست بوو فریشتە و رۆحی صالحان و هیمەتیان بەدەوری تۆدا دادەبارێن، گەر لەسەر ئەم رێسایە لە خەڵکی گۆشەگیر بووی کارێکی باشت ئەنجامداوە، ئەگەر نە، گۆشەگیرییەکەت دوورویی و تەمەن بەفیڕۆدانە لە بێمانایدا، ئەوکات لە دونیا و دوارۆژدا لەناو ئاگر دەبێت، لە دونیادا لەناو ئاگری ئافەت و لەدوارۆژدا لەناو ئاگری ئامادەکراو بۆ دووڕووان و بێباوەڕان.

خودایە داوای لێبووردن و لێخۆشبوون و داپۆشین و سڕینەوەی گوناهان و تەوبەت لێ دەکەین، خودایە پەردە لەسەر گوناه و ئەنگی داپۆشراومان هەڵمەدەرەوە، بە گوناهەکانمان مەمانگرە یا اللە، یا کریم، تۆ بۆخۆت فەرموتە:

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ وَيَعْفُوا۟ عَنِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ﴾ الشوری: ٢٥

تەوبەمان لێ قبوڵ بکە و لێمان ببورە. ئامین.

هاوار بە حاڵت، بانگەشەی زانست دەکەی و دڵت خۆشە بە دڵخۆشی نەزانانە و بە تووڕەبوونی ئەوان تووڕە دەبیت، دڵخۆشیت بە دونیا و هاتنی خەڵکی بۆ لات حیکمەتت لەبیر دەباتەوە و دڵت رەق دەکات، باوەڕدار تەنها بە خودا(عزوجل) دڵی خۆشە نەك بە کەسان و شتانی تر، گەر هەردەبێ دڵخۆش بێت ئەوا دڵخۆش بە کاتێك دونیا و بەخشینی دونیا لە گوێڕایەڵی خودادا بێت، خزمەتی خزمەتکارانی حەقی(عزوجل) پێ بکە و لەسەر گوێڕایەڵی کردن کۆمەکیان بکە، شەو و رۆژ بە ترسەوە پەیوەست بە تا بە دڵ و نهێنیت دەوترێت: ﴿لَا تَخَافَا إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَىٰ ﴿٤٦﴾﴾ طه: ٤٦، وەك چۆن خودا بە موسا و هاروونی(علیهما السلام) فەرموو، تۆ لەوان نیت چونکە زانستت لەلایە بەبێ کردار، بۆیە هیچ گومانی تێدا نییە تۆ میراتگر نیت، میراتگری بە زانست و کردار و ئیخلاص راست و دروست دەبێت، قەدری خۆت بزانە و دەست بۆ شتێك درێژ مەکە بەشی تۆ نییە، لەگەڵ حەق لە براوەکانیدا تەبا بە، گومانی تێدا نییە سەرکەوتووت دەکات و لوتفت پێ دەکات و کۆڵی قورست لەسەر شان لادەبات و لە دونیا و دوارۆژدا لەگەڵت میهرەبان دەبێت، گەر ئیمانی باوەڕدار بەهێز بوو پێیدەوترێت یەقیندار، پاشان گەر یەقینی بەهێز بوو پێی دەوترێت عاریف، پاشان گەر مەعریفەی بەهێز بوو پێی دەوترێت زانا، گەر زانستەکەی بەهێز بوو پێی دەوترێت مەحبووب، گەر ئەوەی بۆ هاتە راستە پێی دەوترێت دەوڵەمەندی نزیك بە خودا، هۆگری هۆگربوو بە نزیکی لە خوداوە(عزوجل)، خودا لە نهێنییەکانی حوکم و زانست و پێشینە بڕیار و پاشینە بڕیار و فەرمان و قەدەری خۆی ئاگاداری دەکاتەوە، ئەوەش بەپێی دەفر و ئەوەی پێیدەدات لە هێز و بەرینی دڵ، پاشان لەگەڵ پەروەردگاری راوەستاو دەبێت و بەدڵ لە دروستکراوان دەچێتە دەرەوە، گەر زانستی پێشینەی پەروەردگاری هات و بەشێك لە خواردن و خواردنەوە و پۆشاك و هاوسەری لەگەڵ بوو و کەسێکی نەبینییەوە لێیەوە دەستی بۆ دەبینێتەوە بۆ دەست بۆبردنی، بۆ ئەوەی زانستەکەی پووچ نەبێتەوە و بسڕێتەوە، "بۆ جێبەجێکراو" لە "پێ جێبەجێکراو" ئەوا حەق(عزوجل) ئەوکات بە دروستکردنێکی تر دروستی بکاتەوە، پێکیدەهێنێتەوە بۆ ئەوەی ئەوەی بینای کردووە لە زانستی پێشینەی دا هەڵنەوەشێتەوە، بۆیە بەشەکانی دەرخوارد

دەدرێت وەك چۆن منداڵی شیرەخۆر شیر دەكرێت بە دەمیەوە، هەروەها وەك چۆن دایك ڕۆشاو دەكات بە دەم منداڵەكەیەوە و هەندێ لە دەمی بەردەبێتەوە و دایكی ناچاری دەكات بە خواردنی، هەر بەو جۆرە وەك چۆن نەخۆش ناچار دەكرێت بە خواردنی دەوا و هێز و تینی بە بەردا دەكاتەوە بەبێ بوونی ویست و هەڵبژاردنی نەخۆشەكە، بەڵكو بڕیاری پێشینەیە ئەو باوەڕدارە خاوەن یەقینە عاریفە فانییە لە ڕاكێشانی بەرژەوەندی بۆ خۆی و لادانی زیان لە خۆی پەروەردە دەكات، دەستی ڕەحمەت بەلای ڕاست و چەپدا وەریدەگێڕێت، بەڵكو لوتفی خودا بەرزیدەكاتەوە و دایدەنێتەوە، زیانۆمەندی بۆ ئەو كەسەی خودای نەناسی و دەستی بە پەتی ڕەحمەتی خوداوە نەگرت، زیانۆمەندی بۆ ئەو كەسەی مامەڵەی لەگەڵ خودا نەكرد و خۆی بۆ خودا یەكلانەكردەوە و بە خودا و نهێنی خوداوە پەیوەست نەبوو و دەستی بە لوتف و منەتی خوداوە نەگرت.

**خەڵكینە**، حەق(عزوجل) پەروەردەی دڵی صادیقان دەگرێتە دەست، لە قۆناغی منداڵیانەوە تا باری گەورەبوونیان، هەركات بە شتێك لە بەڵا تاقیاندەكاتەوە و ئارامگرتنیان دەبینێت نزیكییان لە خۆیەوە زیاد دەكات، بەڵا ئەوان نابەزێنێت و ناگات بەپای ئەوان، چۆن بەڵا دەگاتە ئەوان لە كاتێكدا بەبێ دەروات و دڵی ئەوان وەك باڵندە داویەتی لە شەقەی باڵ، زیانۆمەندی بۆ كەسێك دڵی ئەوان ئازار دەدات، هاوار چ تووڕەبوونێكی خودا لەسەر ئەو كەسەیە! چ بێبەشبوونێكی لە خوداوە تووشبووە! چ خەشم و تووڕەبوونێكی لە خوداوە بەسەردا داباریوە!

**ئەی گەنج**، ببە بە خزمەتكاری خوداناسان و زەوی بۆ ئەوان و كارهەڵسووڕێنەری بەردەستی ئەوان، گەر لەسەر ئەوە بەردەوام بوویت دەبیت بە سەردار، هەركەس بۆ خودا و بەندە صالحەكانی ئەوازۆع بنوێنێت خودا لە دونیا و دوارۆژدا بەرزی دەكاتەوە، گەر كۆڵی خوداناسانت هەڵگرت و خزمەتت كردن خودا بەرزت دەكاتەوە بۆ لای ئەوان و تۆ دەكات بە سەرۆكیان، ئەی دەبێ حاڵت چۆن بێت گەر خزمەتی تایبەتمەندان لە دروستكراوانی خودا بكەی؟!

**خودایە**، خێر لەسەر دەستی ئێمە و زمانمان جاری بكە و بمانكە بە ئەهلی لوتف و چاودێری خۆت.

# مەجلیسی پەنجا و پێنج

## رازیبوون بە قەزای خودا

بەیانی رۆژی هەینی لە مەدرەسەکەی، ١٧/رەمەزان/٥٤٥هـ دوای هەندێك قسە فەرمووی:

هەرکەس دەیەوێ رازیبوون بە قەزای خودا بەدەست بهێنێت با بەردەوام بێت لە یادی مردن، چونکە یادی مردن نارەحەتی و بەلا و ئافەت ئاسان دەکات و لەسەر نەفس و ماڵ و منداڵت خودا تۆمەتبار ناکەی، بەڵکو دەڵێی پەروەردگارم زاناترە لە من بە خۆم، گەر لەسەر ئەوە بەردەوام بوویت چێژی رازیبوون و تەبایت بۆ دێت، ئەوکات ئافەت بە رەگ و ریشە و لقییەوە دەڕوات و بە نیعمەت و خۆشی جێگەی دەگیرێتەوە، ئەوەش وەك پاداشتێك بۆ تەبایی و چێژوەرگرتن لە رازیبوون لە کاتی بەلادا، نیعمەت لە هەموو شوێن و جێگەیەکەوە رووت لێ دەکات، هاوار بە حاڵت، ئەی بێئاگا لە ئەو(سبحانه وتعالى) بە داوای شتێکی تر لە خودا سەرقاڵ مەبە، زۆر داوای فراوانی رۆزی لێ دەکەی، لەوانەیە بۆت فیتنە بێت، لە کاتێکدا تۆ نازانیت خێر لە چ شتێکدایە، بۆیە بێدەنگ و تەبا بە و داوای لێ بکە بە کردارەکانی رازی بێت و لەسەر هەموو حاڵ و بارەکان شوکری بکەی، فروانی رۆزی لەگەڵ نەبوونی شوکر فیتنەیە، تەنگەلانی رۆزی لەگەڵ نەبوونی ئارامگرتن دیسان فیتنەیە، شوکر نیعمەت بۆ زیاد دەکات و لە پەروەردگار(عزوجل) نزیکت دەکاتەوە، ئارامگرتنیش پێی دڵت دادەمەزرێنێ و سەربەدەخات و پشتیوانی دەکا و بە ئامانجی دەگەیەنێت و لە دونیا و دواڕۆژدا سەرئەنجامی چاك و باش دەکات، بەرهەڵستیکردنی حەق(عزوجل) حەرامە و دڵ و روو تاریك دەکات.

هاوار بە حاڵت، ئەی نەزان، لە جێگەی ئەوەی نەفسی خۆت بە بەرهەڵستی کردنەوە خەریك بکەی بە داواکردن لە حەق(عزوجل) خەریکی بکە، بە خوداوە سەرقاڵی بکە تا کاتی بەلا بەسەردەچێت و ئاگری ئافەت دەکوژێتەوە، تۆش ئەی ئەو کەسەی حەقت(عزوجل) بە مەبەستگرتووە و بەئاگای لە گەنجینەی رەحمەت و خۆشەویستی ئەو، گەر لەسەر رێگەی-بەر لەگەیشتن پێی- داوای لێ بکە، گەر سەرگەردان بوویت بڵێ: ئەی رێنیشاندەری سەرگەردانان رێگەم نیشان بدە، گەر تاقیکرایتەوە و رووبەرووی بەلا بوویتەوە و دەستەوسان بوویت لە ئارامگرتن بڵێ: خودایە، یارمەتیم بدە و ئارامیم پێ ببەخشە و ئەم بەلایەم لەسەر لابەرە، بەلام گەر کەسێك بوویت بە خودا گەیشتبووی و دڵت فەرمووی لێکرابوو بۆ ژوورەوە و نزیکیت لە خوداوە هەبوو ئەوا نە داوا و نە زمان بوونیان نییە، بەڵکو بێدەنگی و بینینە، دەبێت بە میوان، میوانیش حەزی نییە، بەڵکو ئەدەب دەپارێزێت و ئەوەی پێشکەشی دەکرێت دەیخوات و ئەوەی پێی دەدرێت وەریدەگرێت، مەگەر پێی بوترێت: حەزت لە چییە؟ ئەویش بڵێت حەزم لەوەیە، ئەوەش وەك جێبەجێ کردنی فەرمانی خانەخوێکە نەك هەڵبژاردنی ئەو، داوا لەباری دووریدایە و بێدەنگی لەباری نزیکبوون لە خوداوە، خوداناسان تەنها حەق(عزوجل) دەناسن، ئەریاب لەوان دابڕاوە و هۆ لە دڵیان دارنراوە، گەر چەندین رۆژ و مانگ خواردن و خواردنەوەیان لێببڕێت گوێی پێ نادەن و ناگۆڕێن، چونکە حەق(عزوجل) خۆراکیان پێ دەدات، ئەوەی دەیەوێت دەرخواردیان دەدات، هەرکەس بانگەشەی خۆشەویستی خودا بکات و جگە لە خودای لە ئەو داواکرد ئەوا لە خۆشەویستییەکەیدا درۆی کردووە، بەلام گەر بوو بە کەسێکی مەحبووب و گەیشتوو و میوان و نزیك لە خوداوە پێی دەوترێت داوا بکە و حەزت لە چییە و ئەوەی دەتەوێ بیڵێ، چونکە تۆ دامەزراوی، موحیب لەباری گرژیدایە و مەحبووب لەباری کرانەوەدا، بێبەشبوون بۆ موحیبە و پێبەخشین بۆ مەحبووبە، هەتا بەندە موحیب بێت لەناو سەرگەردانی و دابڕان و پارچەپارچەبوون و بەدەستهێنانداپە لەپێناو رۆزیدا، گەر نزرەکەی وەرگەرا و بوو بە مەحبووب کارەکە لەبای ئەو وەردەگەڕێت و ئازونیعمەت و خۆشگوزەرانی و سوکنایی و بەریتی رۆزی و رامهێنانی دروستکراوان رووی لێ دەکەن،

هـــەموو ئەمانـــە بـــەهۆی فـــەڕی ئـــارامگرتن و دامەزرانەکەیـــەوە لـــە حـــاڵی خۆشەویستییەکەیدا، هاوەڵی بەندە بۆ خودا(عزوجل) و خۆشەویستی خـودا بـۆ بەندە وەك خۆشەویستی دروستکراو نییە بۆ دروستکراو، خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ ۝١١﴾ الشورى: ١١

نموونە بۆ خەلکی دەهێنمەوە، داوای تێگەیشتن لە خودا بۆ ئەو نموونانە بکەن، داوای پاکێتی و باشی دڵـی لێبکـەن لەگـەڵ خـۆی، چـونکە خودایـە پـاکێتی و چـاکێتی دڵ دەبەخشێت بە هەرکەسێك بیەوێت، ڕۆژی دڵان زۆر دەکات بۆ هـەر کەسـێك بیـەوێت، فراوانی دڵی یەکێك لە خوداناسان ئەهلی ئاسمانەکان و زەوی لـەئامێز دەگرێـت، دڵـی وەك عەساکەی موسای(علیه السلام) لێدێت، عەساکەی موسا لـە سـەرەتای کاریـەوە حیکمەت بوو پاشان بوو بە قودرەت، عەساکە خۆراك و توێشووەکەی بـۆ موسـا(علیه السلام) هەڵدەگرت گەر خۆی نەیتوانیبایە هەڵیبگرێت، سواری دەبوو گەر لـە ڕۆیشـتن دەستەوسـان بوایـە، ئـازاری لەسـەر موسـا(علیه السـلام) لادەدا لەکاتێکـدا موسـا وەستابوو یان خەوتبوو، لە هەرچی جۆری بەروبوومە بەری پێدەبەخشـی، سـێبەری بـۆ دەکرد گەر خۆرەتاو بوایە، خودا(عزوجل) هێز و قودرەتی خۆی لەو عەسایەدا نیشانی موسـا دا، بۆیە بەهۆی عەساکەوە هۆگری بە قودرەتەوە پەیدا کرد، کاتێـك کـردی بـە پێغەمبەر و نزیکی کردەوە و قسەی لەگەڵ کرد و داوای لێکرد خودا پێی فەرموو:

﴿وَمَا تِلْكَ بِيَمِينِكَ يَا مُوسَى ۝١٧ قَالَ هِيَ عَصَايَ أَتَوَكَّأُ عَلَيْهَا وَأَهُشُّ بِهَا عَلَى غَنَمِي وَلِيَ فِيهَا مَآرِبُ أُخْرَى ۝١٨﴾ طه: ١٧ - ١٨

پێیفەرموو: ئەی موسا عەساکەت هەڵبدە، ئەویش هەڵیدا و بـوو بـە ئەژدەهایـەکی مەزن، موسا لەدەستی هەڵهات، خودا(عزوجل) پێیفەرموو:

﴿خُذْهَا وَلَا تَخَفْ سَنُعِيدُهَا سِيرَتَهَا الْأُولَى ۝٢١﴾ طه: ٢١

مەبەست لەو کارە ئەوەبوو قـودرەتی خـۆی نیشـانی موسـا بـدات تـاکو فیرعـەونی مەلیك لەبەرچاوی سووك و کەم بێت، هەروەها بۆ ئەوەی فێری جەنگی بکـات لەگـەڵ

پووعەون و گەنەکەیدا. خودا بۆ جەنگان دژ بەوانە ئامادەی کرد و موعجیزەی خۆی پێدان. ئەسەرەتای کارەکەیەوە دڵ و سینەی بەرتەسک بوو پاشان دڵی بەرین کرد و حوکم و پێغەمبەرایەتی و زانستی پێ بەخشی. ئەی نەزان، کەسێک ئەوە قودرەتی بێت بیوردەکرێت و یاخیبوونی لێ دەکرێت؟! ئەو کەسە لەبیر مەکە تۆ لەبیر ناکات، بێئاگا مەبە لەو کەسەی لە تۆ بێئاگا نییە، یادی مردن بکە، چونکە فریشتەی مەرگ بەرپرسە لە رۆحیان. گەنجێتی و ماڵ و سامان و هەموو ئەوەی تۆی تێدای فریوت نەدەن، چونکە بەم نزیکانە هەموو ئەوانەت لە دەست وەردەگرنەوە، ئەوکات بیر دەکەیەوە لە زیادەڕەوی و تەمەن بەفیڕۆدانی خۆت لەو رۆژانەدا، بیر لەو مایەپووچی و دەستبەتاڵییە دەکەیەوە، بۆیە پەشیمانی دادەگرێت، بەڵام پەشیمانی دادت نادات و سوودێکت پێ ناگەیەنێت، بەم نزیکانە دەمریت و بیر لە قسە و ئامۆژگارییەکانم دەکەیەوە. لە گۆڕەکەت خۆزگە دەخوازی لەلای من بوویتایە و قسەت لە من بیستبایە. بکۆشە بۆ ئەوەی قسەکانم وەربگریت و کاریان پێ بکەی بۆ ئەوەی لە دونیا و دوارۆژدا لەگەڵ من بیت، گومانی باشم پێ بیە بۆ ئەوەی بە قسەکانم سوودمەند بیت، گومانی باش بە غەیری خۆت بیە و گومانی خراپ بە نەفسی خۆت بە. گەر ئەمەت ئەنجامدا سوود بە خۆت دەگەیەنیت و کەسانی تریش لە تۆ سوودمەند دەبن، هەتا لەگەڵ کەسان و شتانێکدا بیت جگە لە خودا(عزوجل) تۆ لە خەم و بەزارە و هاوەڵدانان و قورسیەدای، بە دڵ لە دروستکراو وەرە دەرەوە و بە حەقەوە(عزوجل) پەیوەست بە، ئەوکات شتانێک دەبینی نە چاو بینیویەتی، نە گوێ بیستوویەتی. نە وەک خاپلە و ختوورە بە دڵی مرۆڤدا گوزەری کردووە، ئەوەی تۆ لە تێیدای نادروستە و تەواو نابێت، چونکە بنچینەکەی نشەڵە و تونەوتوڵ و دامەزراو نییە. ئەوە بڕینییە لە سەرەنگوێلک و لەسەر کۆمابوون بیناکراوە، بۆ لای حەق(عزوجل) بگەڕێوە و تەوبە بکە و داوای گۆڕینی ئەوەی لێ بکە تۆی لەسەرە و تێکەوتووی، هەرکەس داوای دونیا بکات پشت لە دوارۆژ دەکات.

هاوار بە حاڵت، خودا(عزوجل) هەژاری بۆ تۆ هەڵبژاردووە، بەڵام تۆ دەوڵەمەندیت دەوێت، ئەوەت نەزانیوە خودا شتێکی بۆ تۆ هەڵبژاردووە و تۆ لات ناپەسەندە، تۆ

هەڵبژاردنی خودا(عزوجل) بە ناپەسەند دادەنێت، نەفس و ئارەزوو و سروشت و شەیتان و هاوەڵی خراپ، هەموو ئەمانە هەڵبژاردنی خودایان لا ناپەسەندە، بۆیە لەگەڵیان تەبا مەبە و لا بەلایاندا مەکەرەوە، لا مەکەرەوە بەلای پشتهەڵکردن و خۆخستنە بەر خەشم و تووڕەیی خودایان، گوێبگرە لەوەی دڵ و نهێنی فەرمانت پێ دەکات، ئەو دوانە فەرمان بە خێر دەکەن و نەهی لە شەڕ و خراپە دەکەن، بە هەژارییەکەت رازی بە، چونکە رازیبوونت پێی لە خودی خۆیدا دەوڵەمەندییە، لە خۆپارێزی ئەوەیە بڕیار بۆ خۆت نەدەی و خەملاندن نەکەی، چی دەکەی گەر خودا خەملاندنی پێدای و دەرکەوت بە یاخیبوون تیادەچی، چی دەڵێیت گەر خودا هەژار و دەستەوسانی کردی و دەرکەوت لە یاخیبوون دەتپارێزێت؟ گەر لەسەر هەڵبژاردنی خودا ئارامت گرت پاداشتێکت لەلای ئەو هەیە نە تۆ و نە ئەهلی زەوی ناتوانن هەژماری بکەن، تۆ پەلەکاری، پەلەکاریش هیچی بەردەست ناکەوێت لەوەی دەیەوێت، پەلەکردن لە شەیتانەوەیە و ئارامی و لەسەرخۆییش لە رەحمانەوە، گەر پەلەت کرد دەبیت بە یەکێك لە سەربازەکانی شەیتان و لەگەڵ ئەو دەبیت، راستەقینەی تەقوا ئەنجامدانی ئەوەیە خودا فەرمانی پێکردووە و وازهێنانە لەوەی نەهی لێکردووە و ئارامگرتن لەسەر کردارەکانی و بڕیارە بڕاوەکانی و هەموو بەڵا و ئافەتەکانی تر، هەموو بوونی ئێوە دروستکراوە، هەموو بوونی ئێوە نەفسە، سەراپاتان ئارەزووە، سەراپاتان غەیبەتە، هەموو بوونتان سروشتە، ئێوە لە خودا و عاریفان هیچ هەواڵێکتان نییە، ئێوە بەراورد بەوان شێتن و ئەوان ژیر و هۆشمەندن، هەرکات شێتێتی شێتی حەق(عزوجل) تێروتەواو بوو کاتی هاتنەدەرەوەی لە شێتێتی دێتە دەرەوە، جوولە لە سەرەتاوەیە و وەستان لە کۆتاییدا، ئەخۆشی کۆتایی پێ دێت و حیکمەتی خودا شوێنی دەکەوێت.

**ئەی گەنج**، تۆ لە داڕۆژ بەتاڵی و بە دونیا پڕبوویت، حاڵی تۆ خەمبارم دەکات، جیابوونەوەت لە صالحان و ئەولیا خەمبارم دەکات، وازهێنان لە مەجلیسی ئەوان و بێنیازبوونت بە را و بۆچوونی خۆتەوە خەمبارم دەکات، ئەی نازانی هەرکەس بە را و بۆچوونی خۆیەوە بێنیاز بێت گومڕا دەبێت، هەموو

زانایەك ئاتاجە بە زیادبوونی زانستەكەی، لەسەرو هەموو زانایەكەوە كەسێك هەیە لەو زاناترە، خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ۝٨٥﴾ الإسراء: ٨٥

رێگەی جمهوور بگرە بەر، رێگەی زۆرینە بگرە بەر، راستەشەقامی ئەوان بەرمەدە، دەست بە شوێنكەوتنەوە بگرە و لەسەر رێگەكە واز لە جیابوونەوە بهێنە.

((شوێنبكەون و بیدعە دامەهێنن ئەوكات كارتان تەواوە))[1].

ئەم رێگەیە لەگەڵ نەفس و ئارەزوو ناگیرێتە بەر، بەڵكو لەگەڵ حوكم و كاركردن بە حوكم و وازهێنان لە هەوڵ و هێز و زۆرانبازی دەگیرێتە بەر، هەروەها خۆرادەست كردن و كەوتن لەبەردەستیدا و وازهێنان لە پەلەكردن و دەستبردن بۆ ئارامی و لەسەرخۆیی، ئەم كارە بە پەلەكردنی تۆ بەدەست نایەت، بەڵكو پێویستی بە حەبل و پیاو و ئارامگرتن و ئازارچەشتن و تێكۆشان هەیە، پێویستی بە هاوەڵی كردنی مەلیكانی مەعریفە هەیە تاكو رێگەت نیشان بدەن و بتناسێنن و كۆڵەكەت لە كوڵ بكەنەوە و بۆت هەڵبگرن، لە قافڵەی ئەودا رێگە دەبڕیت، گەر ماندوو بووی فەرمان دەكات كۆڵەكەت بۆ هەڵبگرن و لە پاشكۆیەوە سوار ببیت، گەر موحیب بیت لە پاشكۆی خۆی سوارت دەكات، بەڵام گەر مەحبووب بیت تۆ لەسەر زینەكە سوار دەكات و خۆی لە پاشكۆوە سوار دەبێت، هەركەس ئەمەی چەشت ئەوی ناسیوە، دانیشتن لەگەڵ ئەهلی شایستەگی نیعمەتە، دانیشتن لەگەڵ ئەیاری درۆزنی دووڕوو نەقمەتە(سزایە)، چاودێری خوداییت هەبێت و لە نەفسی خۆت كار داوا بكە بەوەی لەسەری پێویستكراوە لە مافەكانی حق(عزوجل) و مافی دروستكراوانی، گەر خێری دونیا و دوارۆژت دەوێت لە خۆتدا چاودێری زانستی خودا بكە، داوای كردار لە نەفسی خۆت بكە، داوای جێبەجێ كردنی فەرمانەكانی خودای لێ بكە و لە نەهیلێكراوەكان و باخیبوونەكان رێگری لێ بكە و پابەندی بكە بە ئارامگرتنەوە لە كاتی هاتنی ئافەت و رازیبوون لەباری هاتنی قەزا و قەدەردا، پابەندی بكە بە شوكر لە باری هاتنی

[1] إسناده صحيح، رواه الدارمي في "السنن"، والطبراني في "الكبير" والبيهقي في "الشعب".

نیعمەتدا، گەر ئەمانەت ئەنجامدا ڕێگرەکان لەبەردەمت نامێنن و هاوەڵێت لەگەڵ خودا(عزوجل) بۆ دێتە راستە و بە هاوەڵی ڕێگە و کۆمەککار و یارمەتیدەر دەگەیت و گەنجینەیەك بەدەست دەهێنیت روو لە هەر کوێ بکەیت شوێنت دەکەوێت، گوێ بەوە نادەی لە کوێ بوویت و لە کوێ نیشتەجێ بوویت، چونکە روو لە هەر کوێ بکەی دەگەی بە حوکم و زانست و قەدەر، لە هەر کوێ بیت مرۆڤ و جین و فریشتە خزمەتت دەکەن، هەرچی شتە لە تۆ دەترسێت بەهۆی ترسانت لە خودا، هەرچی شتە گوێڕایەڵیت لێ دەکات بەهۆی گوێڕایەڵیت بۆ خودا(عزوجل)، هەرکەس لە خودا بترسێت هەرچی شتە لێی دەترسێت، هەرکەس لە خودا نەترسێت خودا لە هەرچی شتە دەیترسێنێت، هەرکەس خزمەتی خودا بکە خودا هەموو شتێکی بۆ دەکات بە خزمەتکار، چونکە گەردیلەیەك لە کاری بەندەکان لەلای ئەو بزر نابێت.

((وەك چۆن قەرز دەکەی قەرزت لێ داوادەکرێتەوە))[1]،

((ئێوە چۆن بن کەسانی لەو جۆرەتان بۆ دەکرێنە سەرپەرشتکار))[2].

خودایە بە بەخشندەیی و چاکە و لێبووردن و لوتفت بە ئێمە لە دونیا و دوارۆژدا مامەڵەمان لەگەڵ بکە.

﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾﴾

البقرة: ٢٠١



[1] تقدم تخريجه.

[2] تقدم تخريجه.

# مەجلیسی پەنجا و شەش

## گەیشتن بە مردن

بەیانی رۆژی یەکشەممە لە "الرباط" ١٩/رەمەزان،٥٤٥ھ

**ئەی گەنج،** من دەبینم هەڵسوکەوتەکانی تۆ جیایە لە هەڵسوکەوتی ئەوانەی چاودێری خودایان هەیە، ئەو کەسانەی لە خودا دەترسن، تێکەڵی ئەهلی خراپە و تێکدان دەکەی و لە ئەولیا و پاکان خۆت جیادەکەیەوە، دڵت لە حەق(عزوجل) خاڵی کردووەتەوە و بە دڵخۆشبوون بە دونیا و ئەهلی دونیا و شەکی دونیا پڕت کردووە، نازانیت ترس زیندەگییەکە لە دڵدا و رووناکییە بۆی و رۆشنی دەکاتەوە و لێکدانەوەی بۆ دەکات، گەر لەسەر ئەمە بەردەوام بووی ئەوا سەلامەت دەبیت لە دونیا و دوارۆژدا، گەر بیر لە مردن بکەیەوە دڵخۆشیت بە دونیا کەم دەبێتەوە و زوهدت تیایدا زۆر دەبێت، کەسێك کۆتاییەکەی مردن بێت چۆن بە شتێك دڵخۆش دەبێت؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((بۆ هەموو کۆششکەرێك سەرئەنجامێك هەیە، سەرئەنجامی هەموو زیندوویەك مردنە))[1].

کۆتایی هەموو دڵتەنگی و دڵخۆشی و دەوڵەمەندی و هەژاری و سیاساڵی و هەرزانی و نەخۆشی و ئێش و نازارێك بریتییە لە مردن، هەرکەس بمرێت قیامەتەکەی هەڵدەستێت و دوور بۆ ئەو نزیك دەبێتەوە، هەموو ئەوەی تۆی تێدای هەوەسبازییە، خۆت بەکلابکەرەوە بۆ ئەوەی لەناو دڵ و نهێنی و ناوەوەی تۆدایە، دونیا بۆ ماوەیەکی دیاریکراوە و دوارۆژ بۆ ماوەیەکی نادیار، بکۆشە بۆ ئەوەی هەموو بوونت ببێت بە گوێڕایەڵی، گەر ئەو کارەت ئەنجامدا هەموو بوونی تۆ بۆ پەروەردگار(عزوجل) ساغ

[1] ذكره السيوطي في "الجامع الصغير".

دەبێتەوە، یاخیبوون بریتییە لە بوونی نەفس و گوێڕایەڵیش بریتییە لە بزرکردنی نەفس، دەستبردن بۆ حەزەکان بوونی نەفسە و خۆگرتنەوە لە حەزەکان نەبوونی نەفسە، خۆت لە حەزەکان بگرەوە و تەنها بە دەستی تەبایی لەگەڵ قەدەری خودا(عزوجل) دەستیان بۆ ببە، نەك بە هەڵبژاردنی خۆت و حەزەکانت، دەست بۆ حەزەکان ببە بە دەستی زوهد لە دونیا ئەمەش بە زۆرلێکردن و ناچارکردنت، دەستی زوهد دەست بۆ حەز دەبات و دەیگەیەنێت بە نەفس، هەردەبێ-بەر لە زانست بە حاڵەتەکەت- زوهد بوونی هەبێت، چونکە پێی ئاتاجی، زوهد لە تاریکیدایە و دەستبردن و حەزیش لە ڕۆشناییدایە، کاتێك پەردەلادان لە خوداوە(عزوجل) هات و لەبەردەستی خودادا دامەزرا تاریکییەکە دەگۆڕێت بۆ ڕۆشنایی، گەر نووری مانگی مەعریفە هات تاریکی شەوی قەدەر رادەماڵێت، گەر خۆری زانست بە خودا(عزوجل) هەڵهات قەدەرەکان و تاریکییەکان بەگشتی دەسڕێتەوە، ئەوەی لە دەوروبەردایە بۆت ڕۆشن دەبنەوە، ئەوەش لە تۆوە دوور نییە، بۆت ڕۆشن دەکاتەوە و ئەوەی پێشتر لە تۆ ئاڵۆز و پڕ لە تەمومژ بوو دەردەوێتەوە، جیاکاریت بۆ دەکات لە نێوان پاك و پیسدا، لە نێوان ئەوەی مافی تۆیە و ئەوەی مافی کەسانی ترە، جیاکاری دەکات لە نێوان موراددی دروستکراوان و موردای خودا(عزوجل)، دەرگای دروستکراو و دەرگای حەق(عزوجل) دەبینی، لە دەرگای حەق شتێك دەبینی نە چاو بینیویەتی، نە گوێ بیستوویەتی، نە بە خایلە و ختوورەی دڵی مرۆڤدا گوزەری کردووە، دڵت لە خۆراکی موشاهەدە دەخوات و لە شەرابی هۆگری دەخواتەوە و پۆشاکی قبوولی دەکرێتە بەبەردا، پاشان بۆ بەرژەوەندی دروستکراوان و بۆ ناو مەردوومان ڕەوانەت دەکەن، بۆ ئەوەی لە گومڕایی و کۆچکردنیان لە پەروەردگار و یاخیبوونیان لێی بیانگێڕیەوە، ئەو دەیانگێڕێتەوە بۆ ناو قەڵای دامەزراو و پارێزگاری بەردەوام و سەلامەتی هەمیشەیی، ئەی ئەو کەسەی ئەم قسانە ناژنەوی و باوەڕت پێیان نییە، تۆ توێکڵی بەبێ کرۆك، تەختەیەکی ڕەق و بێگیانی، دارێکی رزاوی، بۆ ئاگر شیاوی، مەگەر تەوبە بکەی و باوەڕ بهێنی و قسەکان بەڕاست بزانی.

**هاوار بە حاڵت**، گەر تەوبەت کرد و باوەڕت هێنا و قسەکانت بەڕاست زانی ئەوا لە نییەتەکەتدا خێر و سەلامەتی و شیرینی دەبینییەوە، گەر ئەو کارە نەکەی شوشەیەکی

بۆیە دەرسییەوە زمان و قورگ و جگەرت دەبڕێت، قسەکانم قبووڵ بکە چونکە من لە داو و نوێژەکانی تۆ رزگارم بووە، وەرە بۆ لام و دوژمنایەتی من مەکە، لە نێوان من و تۆدا چ دوژمنایەتییەك بوونی هەیە، من سوژدەکانم بۆ نوێژەکانی تۆ و لابردنی پیسی و گڵاوی تۆدا ڕێگەت بۆ دەکەمەوە و لەسەر ڕێگە خواردن و خواردنەوەت بۆ دەستەبەر دەکەم، ئەوەت ئەگەڵ دەکەم لەگەڵ ئەوەش لەسەر ئەو کارە پاداشتێکم لە تۆ ناوێت، تەرێکەم لەلای کەسێکی ترە، کارم خزمەتکردنی داواکەرانی حەقە(عزوجل)، گەر داواکەت بۆ حەق(عزوجل) هاتە ڕاستە من بۆ خزمەتی تۆ ڕامدەکرێم، گەر مەبەستی بەندە تێر و تەواو بوو و داواکەی بۆ حەق بوو هەموو شتەکانی بۆ ڕامدەکرێت.

ئەی گەنج، ببە بە ئامۆژگاریکەری نەفسی خۆت و بەڵگە بۆ من و کەسانی تر مەهێنەرەوە، ئامۆژگاری من لەسەر دەرەوەی تۆیە و ئامۆژگاری خۆت لەسەر ناوەوەی تۆیە، بە یادی مردن و پچڕانی پەیوەندییەکان و هۆیەکان ئامۆژگاری نەفسی خۆت بکە، پەیوەست بە پەتی ڕەحمەتی "رب الأرباب الخلاق العظيم العليم-پەروەردگاری پەروەردەکاران، دروستکەری مەزن و زانا"وە پەیوەست بە، پەیوەست بە بە سۆز و بەزەیی خوداوە، بە شتێکەوە خەریك مەبە و خودات لەبیربچێتەوە، چونکە ئەو شتە پەردە دەخاتە نێوان تۆ و خوداوە، گەر یەکێك لە ئێوە لەسەر دەستی من سەرفرازی بەدەستهێنا پێی دڵخۆش دەبم، گەر قسەی بۆ بکەم و وەریبگرێت دڵتەنگی بۆ ئەو دامدەگرێتەوە، باوەڕدار لێم نزیکدەبێتەوە و دووڕوو لێم رادەکات، ئەی دووڕووان، من لە تووڕەبوونی خودا لە ئێوە لەگەڵ خودا تەبام، منی کردووە بە ئاگرێکی بڵێسەدار بۆ سەر ئێوە، گەر تەوبەتان کرد و ئەوەتان قبووڵ کرد من پێتان دەڵێم و لەسەر زبری قسەکانم نارامتان گرت ئەوا من دەبم بە فێنکی و سەلامەتی بۆ سەر ئێوە، هاوار بە حاڵتان، ئێوە شەرم ناکەن؟! گوێڕایەڵییەکەتان ئاشکرایە و لە دەرەوەیە و یاخیبوونەکەتان شاراوە و لە ناوەوەیە، ئێوە بەم نزیکانە دەستی مردن و نەخۆشی پێتان دەگات، پاشان لەناو بەندیخانەی ئاگری خودادا(عزوجل) بەند دەکرێن، ئێوەش ئەی ئەوانەی لە کاروکردەوەکانتان کەمتەرخەمن شەرم لە خۆتان ناکەن، ڕۆژان و شەوانتان دەستبەتاڵییە، بەو هەموو کەمتەرخەمییەوە داوای ئەوە دەکەن لەلای

خودایە، پەلاماری کار و کردەوە چاکەکان بدەن نەفستان لەسەریان رادێن، سەرەتای چوونەناوەوەی هەموو شتێك سەرسامییە، بەڵام لە کۆتاییدا پاڵفتە دەبن و لیلی و لیخنی دەسرێتەوە، گەر تەوبە بکەن هەردەبێت سەرەتا و کۆتایی هەبێت، ئەی ئەوانەی لە خزمەتی سەرداری خۆتان هەڵهاتوون، ئەی ئەوانەی بە را و بۆچوونی خۆتان لە را و بۆچوونی هەڵبژێراوان و پێغەمبەران و نێراوانی خودا و صالحان بێنیاز بوون، ئەی ئەوانەی متمانەتان بە دروستکراوان هەیە نەك بە حەق(عزوجل) ئایا گوێتان لێبووە پێغەمبەر چی دەفەرموێت؟

دەفەرموێت: ((نەفرەتلێکراوە، نەفرەتلێکراوە، هەرکەس متمانەی بە دروستکراوێکی هاوشێوەی خۆی بێت))[1].

داوای دونیا مەکە و بۆ شتێك لە دونیا توورە مەبە، چونکە ئەوە دڵت تێکدەدات وەك چۆن سرکە هەنگوین تێکدەدات.

**هاوار بە حاڵت،** خۆشەویستی دونیا و لوتبەرزیت لە خۆتدا کۆکردووەتەوە، ئەو خەسڵەتانەش لە هەرکەسێکدا کۆببنەوە-گەر تەوبەیان لێ نەکات- خاوەنەکەی سەرفراز ناکات، کەسێکی ژیرمەند بە تۆ کێی و تۆ چیت و لە چ شتێك دروستکراوی و بۆ چ مەبەستێك دروستکراوی؟ ئەو کەسەی لوتبەرزی دەنوێنێت نەزانە بە خودا و پێغەمبەران(علیهم السلام) و صالحان لە بەندەکانی خودا، ئەی کەمفام بە لوتبەرزی داوای پلە و پایەی بەرز دەکەی، پێچەوانەی بکەرەوە بەدەستی دەهێنیت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((هەرکەس بۆ خودا تەوازوع بنوێنێت خودا(عزوجل) بەرزی دەکاتەوە، هەرکەسیش لوتبەرزی بنوێنێت خودا نزمی دەکاتەوە))[2].

هەرکەس بە دواڕۆژ رازی بێت لە پێشەنگەکانە، هەرکەس بە کەم رازی بێت زۆرێکی بۆ دێت، هەرکەس بە زەلیای رازی بێت عیززەت رووی لێ دەکات، بە کەم رازی بە تا کارەکە لە پای تۆ پێچەوانە ببێتەوە، هەر کەس خۆی رادەستی قەدەر بکا

---

[1] تقدم تخريجه.

[2] رواه ابن ماجة وابن حبان وأحمد في المسند.

و پێی رازی بێت خودا(عزوجل) بە توانا و دەسەلاتی خۆی بەسەر هەموو شتەکاندا بەرزی دەکاتەوە، تەوازوع و ئەدەبی جوان نزیکت دەکەنەوە، لوتبەرزی و خراپی ئەدەب دوورت دەخەنەوە، گوێڕایەڵی چاکت دەکات و نزیکت دەکاتەوە، یاخیبوون خراپت دەکات و دوورت دەخاتەوە.

**ئەی گەنج**، ئایینت بە هەنجیر(خودات بە خورما) مەگۆڕەوە، ئایینەکەت بە هەنجیری سوڵتانەکان و مەلیکەکان و دەوڵەمەندان و حەراغۆزەکان مەگۆڕەوە، گەر بە دینەکەت خواردت دڵت رەش دەبێت، چۆن دڵت رەش هەڵناگەڕێت لە کاتێکدا تۆ دروستکراو دەپەرستی؟ ئەی شەرمەزار، گەر لە دڵی تۆدا نوورێك هەبوایە جیاکاریت دەکرد لە نێوان حەرام و شوبهە و موباحدا، جیاوازیت دەکرد لە نێوان ئەوەی دڵت رەشدەکاتەوە و ئەوەی دڵت رۆشن دەکاتەوە، لە نێوان ئەوەی دڵت لە خودا نزیکدەکاتەوە و ئەوەی دڵت دووردەخاتەوە، ئەی نەزان لە نێوان تۆ و خودادا تەنها کەسایەت و ئەوەکول لەسەر حەق(عزوجل) دەناسم، گەر لە حەقەوە(عزوجل) دڵ بەهێز بوو لەسەر دەستی خەڵك و بە فەرمانی حەق(عزوجل) وەردەگرێت، مانای قسەکەم لاداتی ناوەندەکانە، واتە لاداتی وەستانی دڵ لەگەڵ ناوەندەکان و هاوەڵدانان بۆ خودا بەو کەسەوە فەرمانی خودا(عزوجل) جێبەجێ دەکات، لەدەستی ئەوان وەردەگرێت و بێباکە لە مەدح و سەنا و زەمکردنیان، بێباکە لە قبوولکردن و رەدکردنەومیان، گەر پێیان ببەخشن کرداری خودا(عزوجل) دەبینن، گەر لێیان بگرنەوە بەهەمان شێوە، خوداناسان بەم جۆرە بوون، کەڕ و لاڵ و کوێربوون لە هەرچی شتە جگە لە خودا(عزوجل)، ئەوان تەنها سەرخەری خۆیان و زەنیلکەری خۆیان دەناسن، تەنها بەخشەری خۆیان و لێگرەوەی خۆیان و زیانبەخش و قازانجبەخشی خۆیان دەبینن، ئەوان کرۆکن بەبێ توێکڵ، پاڵفتەن لەسەر پاڵفتە، پاکن لەسەرپاکی، ئەوان ئەو کەسانەن هەرچی دروستکراوە لە دڵیان دەرکراون و تەنها حەق(عزوجل) لە دڵیاندا ماوەتەوە، یادی شاراوە بۆ خودا نەك بۆ کەسانی تر لە دڵیاندا ماوەتەوە، خودایە، زانستمان بە خۆت پێببەخشە.

**هاوار بە حاڵت**، تۆ وا گومان دەبەی دەتوانی نەفسی خۆت لەلای من جوان و رازاوە نیشان بدەی، ئەی کەسی دووڕوو گەر حوکم نەبوایە دادەبەزیمە مەیدان و رسوا و

شەرمەزارم دەکردی، بە سەری خۆت لەگەڵ من سەرکەشی مەکە، من تەنها شەرم لە خودا(عزوجل) و بەندە صالحەکانی دەکەم، کاتێك بەندە خودا دەناسێت دروستکراو لە دڵی بەردەبێتەوە و لێی دووردەکەونەوە و پەرشدەبنەوە وەك چۆن گەڵای وشك لە دار بەردەبنەوە و پەرشوبڵاو دەبن، بۆیە بەگشتی بەندەی خودا بەبێ دروستکراو دەمێنێتەوە، چاوی خۆی لە بینینی ئەوان کوێر دەکات و گوێی خۆی کەڕ دەکات، ئەمەش لەڕووی دڵ و نهێنییەوە، گەر نەفس گۆڕا بۆ نەفسی دڵنیا و ئارام پارێزگاری ئەندامەکانی رادەست دەکرێت، پاشان دڵ بەرەو لای حەق(عزوجل) سەفەر دەکات، ئەوەی لەلای ئەوە داوای دەکات، پاشان دونیا دێت و دەبێتە رامیاری نەفس و هەستاو بە بەرزەوەندییەکانی، ئەمە سوننەت و کاری خودایە لە پای ئەوانەی داوای خودا دەکەن: دونیا لە شێوەی پیرەژنێکی شڕ و شێواوی ناشیرین روویان لێ دەکات و بەشی تەواوی خۆیان پێ دەدات، دونیا دەبێت بە خزمەتکاریان نەك بە گەورەیان، ئەوەی بەشی ئەوانە لە دونیا وەریدەگرن و لا بەلای دونیادا ناکەنەوە.

ئەی گەنج، دڵت بۆ پەروەردگارت خاڵیبکەرەوە و ئەندامەکان و نەفست بە ماندووبوون بۆ ماڵ و منداڵ خەریك بکە، بە فەرمانی خودا کاربکە و بە کرداری خودا کەمایەتیان بۆ بکە، بێدەنگی لەبەردەستی خودادا(عزوجل) و وازهێنان لە پرسیار لێی لەگەڵ ئارامگرتن و رازیبوون لەپێشترە لە دوعا و داوا و پێداگری، زانستی خۆت لە زانستی ئەودا بسڕەوە، تەگبیری خۆت لە تەگبیری ئەودا وەلابنێ، ویستی خۆت لە ویستی ئەودا بزر بکە و ژێری خۆت لەباری هاتنی قەزا و قەدەرەکانیدا کەنارگیر بکە، ئەوەی لەگەڵ بکە گەر دەتەوێ ئەو پەروەردگار و یارمەتیدەر و سەلامەتکەری تۆ بێت، لەبەردەستیدا خامۆش بە گەر دەتەوێ بە ئەو بگەی، خابلە و خەتووره و خەم و بەژەی باوەڕدار یەکیانگرتووە، تەنها یەك خایلەی هەیە کە لە خوداوەیە(عزوجل) بۆ سەر دڵی لە کاتێکدا دڵ لەبەر دەرگای نزیکی لە خوداوە راوەستاوە، گەر مەعریفەی بە خودا دامەزرا دەرگاکە بەڕوویدا دەکرێتەوە و ئەوەی لەودیو دەرگاکەوەیە بەدەستی دەهێنێت، خایلە و خەتوورەی دڵ و ئاماژە قسەیەکی شاراوەیە بۆ نهێنییەکی فانی لە نەفس و ئارەزوو و ئەخلاقی ناپەسەند، ئەو لە تەواوی دروستکراوان لەناو عافییەت و

خۆشی و نیعمەتدا نوقم دەبێت، تەنها خودا وەریاندەگێڕێ و تاوتوێیان دەکات هەروەك یارانی ئەشکەوت کە خودا(عزوجل) دەربارەیان دەفەرموێت:

﴿وَنُقَلِّبُهُمْ ذَاتَ ٱلْيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِ﴾ الكهف: ١٨

ئەی گەنج، گوێ لەمە بگرە و باوەڕ بەمە بهێنە و بە درۆی مەزانە، نەفسی خۆت لە هەموو رووییەکەوە لە خێر بێبەش مەکە.



# مەجلیسی پەنجا و حەوت

## صدق

بەیانی ڕۆژی هەینی لە مەدرەسەکەی ٢٤/ڕەمەزان/٥٤٥هـ دوای هەندێک قسە فەرمووی:

**ئەی گەنجان**، بە گەردیلەیەک لە صدق خێرم پێ بکەن، ئازاد بن لە سامان و ئەوەی لە ماڵەکانی ئێوەدایە، من تەنها صدق و ئیخلاصم لە ئێوە دەوێت، ئەوەش قازانجەکەی بۆ خۆتان دەگەڕێتەوە، ئێوەم بۆ خۆتان دەوێت نەک بۆ خۆم، گوزارشتەکانی ناوەوە و دەرەوەتان کۆت و بەند بکەن، چونکە چاودێری فریشتەتان لەسەرە، ئاشکرای ئێوە چاودێری دەکەن، حەقیش(عزوجل) چاودێری ناوەوە و شاراوەی ئێوە دەکات، ئەی ئەو کەسەی کۆشک و تەلار و خانوو بینا دەکات و تەمەنی لە ئاوەدانکردنەوەی دونیادا بەسەر دەبات بەبێ نییەتی چاک و پاک هیچ شتێک بینا مەکە، بنچینەی بینا لە دونیادا نییەتی چاک و پاکە، با بیناکردنەکەت بە نەفس و ئارەزووەوە نەبێت، کەسی نەزان لە دونیادا بە نەفس و ئارەزوو و سروشت و نەریتی خۆیەوە لە دونیادا بینا دەکات بەبێ فەرمانی حوکم و تەبایی لەگەڵ قەزا و کاری خودا(عزوجل)، بۆیە گومانی تێدا نییە نیشانەی صالحبوونی بۆ نایەتە ڕاستە و خۆشی وەرناگرێت لەوەی بینای کردووە و کەسانی تر تیایدا نیشتەجێ دەبن و ڕۆژی دوایی پێی دەوترێت: بۆچی بینات کرد، لە کوێوە خەرجیت تێدا کرد، بۆچی خەرجیت تێدا کرد؟ لەسەر هەموو شتێک دادگایی دەکرێت، داوای ڕازیبوون و تەبایی بکە و بە بەشی خۆت ڕازی بە و داوای شتێک مەکە بۆت نەبڕابێتەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: ((توندترین سزای خودا(عزوجل) لە دونیادا بۆ بەندەکەی داواکردنی شتێکە بۆی نەبڕاوەتەوە))[1].

---

[1] تقدم الكلام عنه و التعليق فيه.

**هەروەها شێخ فەرمووی:**

**دێیت بۆ لام و گومانی باشم پێنابەی بۆیە، بە قسەکانم سەرفرازی بەدەست ناهێنیت.**

**هاوار بە حاڵت**، بانگەشەی ئەوە دەکەی تۆ موسڵمانی کەچی بەرهەڵستی خودا و بەندە صالحەکانی دەکەی، تۆ لە بانگەشەکەدا درۆ دەکەی، ئیسلام لە "إستسلام- خۆڕادەستکردن" داتاشراوە کە بریتییە لە خۆڕادەستکردن بە قەزا و قەدەری خودا و رازیبوون بە کردارەکانی لەگەڵ پارێزگاری لە سنووری قورئان و سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەوکات ئیسلامەکەت بۆ راست و دروست دەبێت، شوومی هیوا و ئاواتی درێژە دەتخاتە ناو یاخیبوون و سەرپێچییەوە، هەرکات هیوا و خۆزگەکانت کورتکردەوە خێر رووت لێ دەکات، بۆیە گەر سەرفرازیت دەوێت دەستی پێوە بگرە، هەر شتێك قەدەر هێناویەتی لە دەستی وەردەگرێتەوە ئەویش پێی رازی دەبێت لەگەڵ تەبایی شەرع و رازیبوون لێی، نە نەفسی هەیە و نە ئارەزوو و نە سروشت و نە شەیتان، مەبەستم ئەوەیە کۆمەکی کراوە بۆ ئەوەی زاڵ بێت بەسەر ئەوانەدا نەك ئەوانە لە هەموو روویەکەوە بەیەکجاری بوونیان نەمابێت، ئێمە مەعصوومان نییە لەدوای رۆیشتنی پێغەمبەران(علیهم السلام)، کەسەکە نەفسی گۆڕاوە بۆ نەفسێکی ئارام و دڵنیا و ئارەزووی ژێردەستە کراوە و سروشتی هەڵچووی خامۆشکراوە و شەیتانەکەی بەندکراوە، لە ئەوەوە شەیتان شتێکی بەرچنگ ناکەوێت، بە دەوریدا خول دەخوات، بەڵام هیچ نابینێتەوە، تەوەکول لەگەڵ هۆ وەستانی تێدا نییە، یەکتاپەرستیش بینینی زیان و قازانجی لە کەسێکەوە تێدا نییە، تۆ سەراپا نەفس و ئارەزوو و عادەتی، تۆ لە تەوەکول و یەکتاپەرستی هەواڵێکت نییە، تاڵی پاشان شیرینی، شکان پاشان گرتنەوە(گرتنەوەی شکستە)، ژیان پاشان مردن پاشان ژیانێکی هەمیشەیی، زەلیلی ئەوجا عیززەت، هەژاری ئەوجا دەوڵەمەندی، نەبوون و بزربوون ئەوجا هاتنەبوون بە خوداوە نەك بە خۆتەوە، گەر لەسەر ئەمە ئارامت گرت ئەوەی لە حەق(عزوجل) دەتەوێت بۆت دێتە راستە، ئەگەر نە هیچت بۆ نایەتە راستە، هەر شتێك لە خودا سەرقاڵت بکات ئەوە بۆ تۆ شوومییە با رۆژوو و نوێژیش بێت لەدوای جێبەجێ کردنی فەرزەکان و سوننەتەکان، گەر رۆژووی فەرزت جێبەجێ کرد پاشان

دوای ئەوە برسێتی و تینوێتی ڕۆژووی سوننەت سەرقاڵی کردی لـە ئامـادەبوونی دڵ و چاودێری بۆی و گوزەرانی خۆش بە ئەوەوە و لەگەڵ ئەو و سوڕان لەگەڵ هاوەڵی ئەو و نزیکی لە ئەوەوە ئەوا تۆ بەنـدەی پـەردەی ڕۆژووی سـوننەتی، بەنـدەی دروستکراوی، بەندەی نەفس و ئارەزوویت، کەسی عاریف لەگەڵ خودا(عزوجل) و لەژێر لیوای نزیکی خودا لەگەڵ زانست و نهێنی ڕاوەستاوە، لەگەڵ قەزا و قـەدەری خـودا سـوڕ دەخوات، گەر لە سوڕان بەبێ سوڕاندن لە ئەوەوە(مەبەست بەندەیە) و جووڵە بەبێ جووڵاندن لـە ئەوەوە و وەستان بەبێ وەستاندن لە ئـەوەوە دەستەوسـان بـوو دەچـێتە ڕیـزی ئەوانـەی خودا دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿وَنُقَلِّبُهُمْ ذَاتَ ٱلْيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِ﴾ الكهف: ١٨

کاتێـك دەستەوسـانی لـە ئەوانـەوە-لەگـەڵ بـوونی توانـا و قـودرەت- سـەریهەڵدا جووڵەیان پێکرا، سـوکنایی و ڕادەستکردنیان پێـدرا لەگـەڵ دەستەوسـانییان، جووڵـە لەگەڵ بوونی تۆدایە و وەستان لەگـەڵ نـەبوونت، جووڵـە لـە حوکمدایـە و وەسـتان لـە زانستدا، کاتێك نەفست ڕاست و دروست دەبێت کە لە نەفس و ئـارەزوو و سروشـت و دروستکراو بەگشتی دێیە دەرەوە، بە دروستکراوەوە کۆتوبەنـد مەبـە، چـونکە زیـان و قازانج و ڕۆزی تۆ تەنها بە دەستی پەروەردگارە(عزوجل)، هەمیشـە لـە گوێڕایـەڵی و فەرمان و نەهی ئەودا بە، هیچ شتێکت بە دەستەوە نامێنێت جگە لە خودا(عزوجل)، ئەوکات دەبیت بە دەوڵەمەندترین و عەزیزترین دروستکراوی خودا، وەك ئادەمـت(علیه السلام) لێ دێت، فەرمان بە شتەکان کرا سوژدەی بۆ ببەن، ئەمە لەودیو ژێری خەڵکی ڕەشۆکی و زۆرێك لە تایبەتانەوەیە، ئەو ئـەوەی ئادەمە(علیـه السـلام) و لـە کرۆکـی ئەوە، ئەی ئەو کەسەی زانستێکی کەمت هەیە فێری زانسـت بـبە ئـەوجا لـە خـەڵکی گۆشەگیر ببە، خوداناسان یەکەمجار فیقهیان وەرگرت ئـەوجا بـە دڵ گۆشـەگیربوون لـە دروستکراوان، ئاشکرا و ڕووالەتیان لەگەڵ دروستکراودایە بۆ چاککردنیان، ناوەوەشیان لەگەڵ حەقدایە(عزوجل) لە خزمەتکردن و هاوەڵی کردنـی ئـەودا، ئـەوان نووسـەرانن، تۆبەکارانن، لە حوکمدا لەگەڵ دروستکراوانن، بەڵام بە دڵیان لەوان دورکەوتوونەتـەوە، دڵیـان دوور و کـەنارگیرە لـە هـەموو شـتەکان، سـەرقاڵییان لـە دەرەوەدا دامـەزرانی حوکمەکانە، هەرکات پزشاکەکەیان پیس دەبێت دەیشۆرن و بـۆنی خۆشـی لێـدەدەن و

بوخوری پیادەکەن، هەرکات لە شوێنێکەوە پۆشاکەکەیان بدڕێت پینەی دەکەن و دەیدوورنەوە، ئەوان سەری دروستکراوانن، گەردیلەیەك لەوانەوە وەك چەندین چیای مەزنی دامەزرا وایە، دڵیان لەگەڵ پەروەردگاریانە(عزوجل)، لەبەردەستی راکشاون، چاودێری خوداییان هەیە و لە زانستی خودادا رۆچوون.

**خودایە**، خۆراکمان بکە بە یادی خۆت و بە نزیك کردنەوەمان بێنیازمان بکە. ئامین.

تۆ دڵت مردووە و هاوەڵیکردنەکەشت لەگەڵ دڵمردوواندایە، برۆ هاوەڵی زیندووانی نەجیب لە ئەبدال بکە، تۆ گۆڕێکی و روو لە گۆڕێکی هاوشێوەی خۆت دەکەی، مردوویت و روو لە مردوویەکی وەك خۆت دەکەی، تۆ چاوکز و پرمووشی و کەسێکی چاوکز و پرمووشی وەك خۆت رێنموونیت دەکات، کوێریت و کوێرێکی وەك خۆت پەلکێشت دەکات، هاوەڵی باوەڕدارانی یەقینداران لە صالحان بکە، لەسەر قسەکانیان ئارام بگرە و قبووڵی بکە و کاری پێ بکە سەرفرازی بەدەست دەهێنیت، گوێ لە قسەی گەورەپیاوان بگرە و کاری پێ بکە و ڕێزیان لێبگرە گەر سەرفرازیت دەوێت، شێخێکم هەبوو هەرکات شتێکم لێ ئاڵۆز بوایە و بە دڵمدا گوزەری بکردبایە بۆی باس دەکردم و پێویستم بە قسەکردن نەبوو، ئەوەش بەهۆی ڕێز و باشی ئەدەبم لە خزمەتیدا، هەمیشە بە ڕێز و ئەدەبی جوانەوە هاوەڵی گەورەپیاوانم کردووە، صۆفی کەسێکی چرووك و دەستنووقاو نییە، چونکە هیچ شتێکی بۆ نەماوەتەوە پێی دەستنووقاو بێت، ئەو بانگەشەی ئەوە دەکات وازی لە هەموو شتێك هێناوە، گەر شتێکی پێ بدرێت وەریدەگرێت ئەوەش بۆ کەسانی تر نەك بۆ خۆی، دڵی لە هەبووەکان و وێناکراوەکان پاڵفتە بووە، کەسێك چرووکی دەکات ماڵ و سامانی هەبێت، شتەکان لای صۆفی بۆ کەسانی ترە، ئیتر چۆن بە ماڵی کەسانی تر چرووکی دەکات؟ نە دوژمنی هەیە نە دۆست، نە لاکردنەوە بەلادا و نە گوێگرتن، نە مەدح و سەنا و نە زەمکردن، پێدان و لێگرتنەوە و زیان و قازانج لە هیچ کەسێکەوە نابینێت جگە لە خودا(عزوجل)، بە ژیان دڵخۆش نییە و بە مردن دڵتەنگ نابێت، مانای مردن لەلای ئەو خەشم و تووڕەیی خودایە و ژیانیش لەلای رازیبوونی ئەوە، ئامۆیی ئەو لە تێکەڵی

و ناشكرادايە و هۆگربوونی لە خەلوەت و تەنهاییدا، خۆراكی بریتییە لە یادی پەروەردگاری(عزوجل) چونكە لە شەرابی هۆگربوونەوەیە بە خوداوە، گومانی تێدا نییە كەسی صۆفی چرووك نابێت بە بەخشینی شمەكی دونیا و ئەوەی لە دونیادایە، ئەو شتێكی لەلایە لە هەرچی شتە بێنیازی كردووە.

﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾﴾

البقرة: ٢٠١



# مەجلیسی پەنجا و هەشت

## کارکردن بە ئیخلاصەوە

بەیانی رۆژی هەینی لە مەدرەسەکەی، ١/شەوال/٥٤٥ه دوای هەندێك لە قسە فەرمووی:

زۆر فێر دەبیت و کاری پێ ناکەی، دیوانی زانست بپێچەرەوە و پاشان بە بڵاوەپێکردنی دیوانی زانست و ئیخلاصەوە سەرقاڵ بە، ئەگینا سەرفرازی بەدەست ناهێنیت، تۆ تەنها فێری زانست دەبیت، تۆ بە کردارەکانت بەرانبەر بە حەق(عزوجل) بوێری دەدەیە بەرخۆت، پۆشاکی حەیات لە بەرچاوت فرێداوە و خودات کردووە بە ساناترین تەماشاکەر بۆت، تۆ بە ئارەزووەوە دەست بۆ شتەکان دەبەی و بە ئارەزووەوە لە خۆت و خەڵکی دەگریتەوە و بە ئارەزووەوە دەبزوێیت، بۆیە گومانی تێدا نییە ئەو ئارەزووە تۆ تیادەبات، لە هەموو بارێکدا لە خودا(عزوجل) شەرم بکە و کار بە حوکمی ئەو(سبحانه وتعالی) بکە، گەر بە ئاشکرای حوکم کارت کرد کارکردن نزیکت دەکاتەوە لە زانست بە خودا(عزوجل).

**خودایە، لە خەوی بێئاگایان بەئاگامان بهێنە. ئامین.**

گەر گوناهت ئەنجامدا ئافەت رووت لێ دەکات و بەسەر تۆدا دادەبارێت، گەر تەوبەت کرد و داوای لێخۆشبوونت لە پەروەردگار(عزوجل) کرد و داوای کۆمەکیت لێکرد ئەوا ئافەتت لێ دووردەکەوێتەوە و دوور لە تۆ دادەبارێت، هەردەبێ بەلات هەبێت، بۆیە داوا لە خودا(عزوجل) بکە لەگەڵ بەلا ئارامگرتن وتەبایت پێ ببەخشێت تا ئەوەی لە نێوان تۆ و ئەودایە سەلامەت بێت، ئەوکات رووشانەکە لە قاڵبدایە(جەستە) نەك لە قەلب(دڵ)دا، لە دەرەوەیە نەك لە ناوەوە، لە ماڵ و سامانداپە نەك لە ئاییندا، ئەوکات بەلاکە دەبێتە نیعمەت نەك نیقمەت(سزا)، ئەی

کەسی دووڕوو بەوەندە رازی بوویت بەناو -نەك بە مانا- شوێنی خودا و پێغەمبەر(ﷺ) بکەویت، ئەوەش درۆی دەرەوە و ناوەوەی تۆیە، بۆیە گومانی تێدا نییە تۆ لە دونیا و دوارۆژدا کەسێکی زەلیلی، کەسی یاخی لە نەفسی خۆیدا زەلیلە، کەسی درۆزن لە نەفسی خۆیدا زەلیلە، ئەی کەسی زانا زانستەکەت لەلای رۆڵەکانی دونیا پیس مەکە، عەزیز بە زەلیل مەفرۆشە، عەزیز بریتییە لە زانست و زەلیل ئەوەیە لە دەستی ئەواندایە لە دونیا، دروستکراوان ناتوانن شتێك بە تۆ ببەخشن بۆت نەبڕاوەتەوە، بەڵکو بەشی تۆ تەنها بەسەر دەستیاندا جاری دەبێت، گەر ئارامت گرت بەشەکەت لەسەر دەستی ئەوان رووت لێ دەکات و تۆش بە عەزیزی دەمێنیتەوە.

هاوار بە حاڵت، کەسێك کە خۆی رۆزی دەدرێت ناتوانێت رۆزی تۆ بدات، کەسێك پێیدەدرێت ناتوانێت پێتبدات، بە گوێڕایەڵی خوداوە(عزوجل) سەرقاڵ ببە و واز لە داواکردن بهێنە، چونکە خودا ئاتاج نییە بەوەی تۆ فێری بکەی و ئاگاداری بکەی بە بەرژەوەندییەکانت، خودا(عزوجل) لە هەندێ فەرموودەیدا دەفەرموێت:

((هەرکەس یادی من لە داواکردن لێم سەرقاڵی بکات باشترینی ئەوەی بە داواکارانی دەدەم بەوی دەدەم))[١].

یادی زمان بەبێ دڵ هیچ رێز و پلە و پایەیەکی پێ بەدەست نایەت، یاد بریتییە لە یادی دڵ و نهێنی، پاشان یادی زمان، گەر یادی حەق(عزوجل) هاتە راستە خودا یادت دەکات:

﴿ فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ وَاشْكُرُوا لِي وَلَا تَكْفُرُونِ ﴾ البقرة: ١٥٢

یادی خودا بکە بۆئەوەی یادت بکات، تاکو یادی خودا کۆڵی قورسی گوناهت لە کۆڵ بکاتەوە و بەبێ کۆڵی گوناه بمێنیتەوە، ئەوکات تۆ دەبیت بە گوێڕایەڵی نەك یاخیبوو لێی، ئەوکات لەناو ئەوانەدا یادت دەکات کە یادیان دەکات، بۆیە بە خوداوە سەرقاڵ دەبیت و لە دروستکراوان بێئاگا دەبیت و یادی خودا لە داواکردن لە خودا سەرقاڵت دەکات، هەموو مەبەستت دەبێت بە ئەو(سبحانه وتعالی) و لە هەموو

---

[١] رواه الترمذي بلفظ: من شغله القرآن وذكري عن مسألتي... ورواه الدارمي.

مەبەستەکانی ترت بێئاگا دەبیت، گەر ئەو(سبحانه وتعالى) بوو بە هەموو مەبەستی تۆ کلیلەکانی گەنجینەی مەلیك دەداتە دەستی دڵت، هەرکەس خودا(عزوجل) خۆشیبوێت جگە لە ئەو(سبحانه وتعالى) کەسێکی تری خۆشناوێت، خۆشەویستی هەرچی کەس و شتی ترە لە دڵت دەسڕێتەوە، گەر خۆشەویستی حەق(عزوجل) لە دڵی بەندەدا دامەزرا خۆشەویستی شتەکانی تر لە دڵی دەردەچێت، ئەندامەکانی خۆشەویستی ئەو ئەوش دەکەن و دەرەوە و ناوەوەی بە ئەوەوە خەریك دەبن، لە وێنە و مانادا بە خۆشەویستی خوداوە دەژی، بۆیە خودا ئامادەی دەکات و لە عادەت دەریدەهێنێت و لە ناوەدانی دووری دەخاتەوە، گەر ئەمەی بۆ تێر و تەواو بوو خودا(عزوجل) خۆشیدەوێت، ئەری تۆ ژیرییەکت نییە پێی تەماشا بکەی و پێی بژنەوی؟ ئایا هەرگیز لە جێگەیەك بە خوداوە ئامادە نەبوویت، سەرەی تۆش دێت و فریشتەی مەرگ کۆتایت پێ دەهێنێت، دێت بۆ سەر ژیانت و بە رەگ و ریشەکەوە هەڵتدەکێشێت و لە خانەوادە و خۆشەویستانت جیاتدەکاتەوە، هەوڵبدە و تێبکۆشە کاتێك گیانت دەربچێت لە لیقای خودا بێزار نەبیت، ئەوەی هەتە پێشکەشی بکە بە دوارۆژ، چاوەڕوانی مردن بکە، چونکە لەلای خودا(عزوجل) خێرێك دەبینییەوە کە لە دونیادا دەیبینیت.

﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي ٱلْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ۝٢٠١﴾

البقرة: ٢٠١



# مەجلیسی پەنجا و نۆ

## چەورەیی نەکردن( عدم مداهنه )[1]

ڕۆژی هەینی، ٩/ڕەجەب/٥٤٥ھ دوای هەندێك قسە فەرمووی:

قسەی مرۆڤی تەماعکار لە لەرزۆکی و نمایش خاڵی نییە و هێز و پێزی تێدا نییە، قسەکانی توێکڵێکی پووچەڵە و کرۆکی نییە، وێنەیە بەبێ مانا، تەماعکار وەك وشەی "طمع" خاڵییە چونکە سەراپا پیتەکانی ئەم وشەیە پووچەڵن "الطاء، الميم، العين"، ئەی بەندەکانی خودا ڕاستگۆ بن سەرفرازی بەدەست دەهێنن، کەسی ڕاستگۆ سووربوون و لێبڕانی بەرز و باڵایە و لە ئاسماندایە، ئەو قسەیە زیانی پێناگەیەنێت کە دەڵێت: خودا بەسەر کارەکانیدا زاڵ و بەدەسەڵاتە و گەر تۆی بۆ کارێك بوێت ئامادەت دەکات، قسەیەکە لە مرۆڤێکی ئەدەب خراپەوە و ئەمە وەڵامەکەیەتی: ڕاستگۆیی حاڵەکانی ئێوە دەمهێنێتە گۆ و درۆی حاڵتان بێدەنگم دەکات، ئێوە چەندە کڕیار بن ئەوەندەتان پێ دەفرۆشم.

ئەی گەنج، گەر بەر و فەڕی زانستت هەبێت ناچیت بۆ دەرگای سوڵتانەکان لەپێناو بەشی نەفس و حەزەکانیدا، زانا دوو پێی نییە پێی بچێت بۆ دەرگای دروستکراو، زاهیدیش دوو دەستی نییە ماڵی خەلکی پێ وەربگرێت، کەسی خوداویست دوو چاوی نییە تەماشای کەسان و شتانی تری پێ بکات، کەسی خوداویستی ڕاستگۆ لە خۆشەویستییەکەیدا گەر بە هەموو دروستکراوان بگات تەماشاکردنیان دڵخۆشی

---

[1] (ئەم ناونیشانە و ناونیشانەکانی تریش بۆ کتێبی ("الفتح الرباني-تقديم الدكتور ماجد عرسان الكيلاني-اعتنى به: الدكتور علي أبو الخير") دەگەڕێتەوە، ئەم ناونیشانە "عدم المداهنة" ڕیشەی وشەی "مداهنة" لە "دهن"ەوە هاتووە کە مانای چەوری تێدایە، بە زمانی کوردیدا بۆ مانای ئەم وشەیە گەڕام تەنها وشەی "چەورەیی"م بینیوە، هەرچەند وشەکە بازارییە، بەڵام بۆ کەسانێك ئەوە ڕەفتاریان بێت پڕ بە پێستیانە)

ناکات، تەنها تەماشای مەحبووبی خۆی دەکات، لەبەرچاوی سەری دونیا گەورە نابێت و لەبەر دووچاوی دڵی دواڕۆژ مەزن نابێت، تەنها مەولا(عزوجل) لەبەر دوو چاوی نهێنیدا مەزن و شکۆدارە، کەسانێکی ژیرمەند بن، ئێوە لەسەر هیچ نین، زۆرینەتان شوێنی قاڵە کەوتوون، زۆرینەی ئەهلی کەلام قسەکانیان لە زمانەوەیە نەك لە دڵیانەوە، قاڵەی کەسی دووڕوو لە زمان و سەرەوەیە، بەڵام قسەی کەسی راستگۆ لە دڵ و نهێنییەوەیە، دڵی لەبەر دەروازەی پەروەردگاریدایە(عزوجل) و نهێنییەکەی چووەتە ژوورەوە، بەردەوام لەبەر دەرگاکەدا هاوار دەکات و دەپاڕێتەوە تا دەچێتە ناو خانووەکە، سوێند بە خودا، لە هەموو حاڵەکانتدا تۆ کەسێکی درۆزنی، ڕێگەی چوون بۆ بەردەم دەرگای خودا(عزوجل) نازانیت، چۆن ڕێگەکە دەبینییەوە لە کاتێکدا تۆ کوێری؟ چۆن کەسێکی تر پەلتدەکێشێت؟ ئارەزوو و سروشت و شوێنکەوتنی نەفس و دونیا و دەسەڵات ویست و حەزەکانت کوێریان کردوویت، هەتا گوناهەکان لە رووالەتی تۆدان فریاکەوە و وەرە بۆ لام تا نەگەیشتوونەتە دڵت، ئەوکات لەسەر گوناهان پێداگر دەبیت، پاشان پێداگری دەگوێزێتەوە و دەبێت بە بێباوەڕی، هەرکەس گوێڕایەڵی و بەندایەتی بۆ خودا(عزوجل) هاتە دی دەتوانێت گوێی لە قسەی خودا بێت-(لێرەدا باسی ئەو حەفتا پیاوەی کرد موسا(علیه السلام) هەڵیبژاردن بۆ بیستنی کەلامی خودا) پاشان فەرمووی:- خودا(عزوجل) لەگەڵ ئەو حەفتا کەسە قسەی کرد، هەموویان بێهۆشبوون و تەنها موسا(علیه السلام) مایەوە، کاتێك خودا(عزوجل) زیندووی کردنەوە وتیان: ئێمە توانای بیستنی کەلامی خودامان نییە، بۆیە تۆ ببە بە نوێنەری نێوان ئێمە و خودا، خودا قسەی لەگەڵ موسا(علیه السلام) کرد و موساش قسەکانی دەبیست و بۆ ئەوانی دەگوێزایەوە، بەهۆی بەهێزی ئیمان و هاتنەدی گوێڕایەڵی و بەندایەتییەوە موسا(علیه السلام) توانی گوێ لە قسەی خودا(عزوجل) بگرێت، بەڵام ئەوان بەهۆی لاوازی ئیمانەوە نەیانتوانی گوێ لە قسەی خودا بگرن، گەر ئەوەی لە تەوراتدا هاتبوو قبووڵیان بکردبایە و لە فەرمان و نەهیدا گوێڕایەڵیان بکردبایە و خاوەنی ئەدەب بوونایە و بوێریان نەدایەتە بەر خۆیان بۆ وتنی ئەوەی وتیان دەیانتوانی گوێ لە قسەی خودا(عزوجل) بگرن)

پاشان فەرمووی:

من زاڵکراوم بەسەر هەرچی درۆزن و دووڕوو و دەجالـە، زاڵکـراوم بەسـەر هەرچی یاخییە لە خودا(عزوجل)، گەورەترینیان ئیبلیسە و بچووکترینیان فاسقە(لادەرە)، مـن لەگەڵ هەرچی گومڕای گومڕاکەری بانگکەر بۆ باتڵ دەجەنگم، لەوکارەشـدا کۆمـەکی لە هەوڵ و هێزێك وەردەگرم بـە خـودای مـەزن و شـکۆدارەوەیە(واتە کۆمـەکی لـە: لا حول ولا قوة إلا بالله العلي العظيم)، دووڕوویی لەسەر دڵت چۆکی داداوە، تۆ ئاتاجی بە ئیسلام و تەوبە و دابڕان لە ریا، گەر ئەوەی منی تێدام لە خوداوە بێت ئەوا گـەورە و زۆر و مەزن دەبێت، و لەسەر پێی خۆی دەوەستێت و بە باڵـەکانی بەسـەر خەڵکیـدا دەفڕێت و دەچێتە ماڵەکانیانەوە و بە چاو و دڵیان دەیبیـنن، بـەڵام گـەر لـە نـەفس و ئارەزوو و سروشت و شەیتان و باتڵی منەوە بێت ئەوا رسوا و شەرمەزاری بۆ من و بەم نزیکانە بچووك دەبێتەوە و دەتوێتەوە و وەردەگەڕێت و پەرش و بڵاو دەبێتەوە، چونکە حەق(عزوجل) پاڵپشتی درۆزن ناکات و کەسی دووڕوو سەرناخات و بەشێکی لەو جۆرە نادات بە بێباوەڕ و زیادە بـۆ کەسـێك نانێرێـت وازی لـە شـوکر هێنـاوە، هەرکەسـێك نەفسی شتێك لە دووڕوویی تێدا بێت هیچی لێوە بەرهەم نایەت بەڵکو دووڕووییەکەی خۆی سوتانی ئاپینەکەیەتی.

ئەی مووریدان من هاتم قسە بەڵام ئێوە رادەکەن و کاری پێ ناکەن، لە وڵاتانی تـر بە من دەڵـێن پیـاوە کەڕوڵاڵەکـە، چونکە خۆم کردبوو بـە شـێت و کـەڕوڵاڵ و وەك پیاوێکی عەجەم خۆم نیشان دەدا، بەڵام ئیشەکەم لێ تێکـدرا و قـەدەر مـنی بـۆ لای ئێوە راپێچ کرد، لە ژێرخانەکاندا بووم هێنامیانـە دەرەوە و لەسـەر کورسـی دایاننـام، درۆ مەکە تۆ دوو دڵت نییە، بەڵکو تەنها یەك دڵە بە هەر شتێك پڕ بـوو شـتێکی تـر ناگرێت، خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿ مَّا جَعَلَ اللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِي جَوْفِهِ ﴾الأحزاب: ٤

دڵێك دروستکەر و دروستکراوی خۆشبوێت نایەتە راسـتە، دڵێـك دونیـا و دوارۆژی تێدا بێت نایەتە راسـتە، گـەر دڵ بـۆ دروسـتکەر بێـت و رووت لـە دروسـتکراو بێـت دەکرێت لایەك بە لای دروستکراودا بکاتەوە وەك سـەرلەدان بـە بەرژەوەندییـەکانیان و

بەزەیی بە ئەوان، دەکرێت کەسی نەزان بە خودا ریا و دووڕوویی لێبوەشێتەوە، بەلاّم کەسی زانا بە خودا ئەوەی لیّ ناوەشێتەوە، کەسی گەمژە لە خودا یاخی دەبێت و کەسی ژیرمەند گوێڕایەڵی لیّ دەکات، کەسی هەڵپەدار بۆ کۆکردنەوەی دونیا ریابازی و دووڕوویی دەنوێنێت، بەلاّم کەسێك هیوا و ئاواتی کورتبێت لە دونیادا ئەو کارە ئەنجام نادات، باوەڕدار بە جێبەجیّ کردنی فەرزەکان لە خودا نزیك دەبێتەوە، پاشان بە نەوافل خۆی لای خودا(عزوجل) خۆشەویست دەکات، کۆمەڵێك بەندەش بۆ خودا هەن نەوافیلیان نییە، بەڵکو فەرزەکان جێبەجیّ دەکەن، پاشان دەچن بۆ لای نەوافل و دەڵێن ئەمە فەرزی سەر شانی ئێمەیە بەهۆی ئەوەی دەتوانین پێیانهەڵبستین، سەرقاڵیمان بە عیبادەتەوە لە هەموو کاتەکاندا لەسەرمان فەرزکراوە، ئەوان لەسەر نەفسیان نافیلەیان نییە، ئاگاکەرەوەیەك بۆ دۆستانی خودا هەیە بەئاگایان دەهێنێتەوە، مامۆستایەکیان هەیە فێریان دەکات، خودا(عزوجل) هۆکارەکانی فێرکردنی بۆ فەراهەم کردوون، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:

((گەر باوەڕدار لەسەر لوتکەی چیایەك بێت خودا(عزوجل) زانایەك رەوانە دەکات فێری بکات))[1].

لە وتەی صالحان روو وەرمەچەرخێنە، دواتر بۆخۆت ئەو قسانە بکەیەوە و بانگەشەی ئەوە بکەی قسەی خۆتن، خوازراو ئاشارێتەوە، لە ماڵەکەی خۆت قوربانی بکە نەك لە ماڵی خوازراو، پەمو بە دەستی خۆت بچێنە و بە دەستی خۆت ئاوی بدە و بە تێکۆشانی خۆت پەروەردەی بکە پاشان بیچنە و بیدوورە و لەبەری بکە، بە ماڵی کەسانی تر و پۆشاکی کەسانی تر دڵخۆش مەبە، گەر قسەی کەسانی تر وەربگری و بیگێڕیتەوە، و بانگەشەی ئەوە بکەی قسەی خۆتن دڵی صالحان رقت لیّ هەڵدەگرن، گەر کردارت نییە یا قسەشت نەبێت، هەموو کارەکە لەسەر کردار دامەزراوە، خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿ادْخُلُوا الْجَنَّةَ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٣٢﴾﴾ النحل: ٣٢

---

[1] لم اجد له اصلا.

بە بەدەستهێنانی مەعریفەی خودا(عزوجل) تێبکۆشن، ئەو مەعریفەیە بزربوونە لەگەڵ خودا و راستبوونەوەیە لەگەڵ قەدەر و قودرەت و زانستی خودا، ئەو مەعریفەیە فەنای تەواوە لە کردار و قەزای خودا، قسەکانت ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن لەناو دڵی تۆدایە، زمان وەرگێڕی دڵە، گەر دڵ تێکەڵ بوو جارێك قسە راست دەبێت و جارێکیش پووچ، ناتوانێت شتێك لە دۆخی خۆی دەربهێنێت و بیگۆڕێت، کاتێك تێکەڵییەکەی نەما زمان دێتە راستە، کاتێك هاوەڵدانان لە دڵدا سڕایەوە زمان راست دەبێتەوە، بەڵام گەر هاوەڵ و هاوبەش لە دڵدا بوو شوێنی دروستکراو دەکەوێت، گۆڕین و ئاڵوگۆڕ بەسەر خۆیدا دەهێنێت و خۆی رووبەرووی بەربوونەوە و درۆ دەکاتەوە، هەندێ لە ئەهلی کەلام هەن لە دڵەوە قسە دەکەن، هەندێکیان هەن لە نهێنییەوە قسە دەکەن، هەشیانە لە نەفس و ئارەزوو و شەیتان و عادەتەوە قسەکانی دەکەن.

**خودایە، بمانگێڕە لە ریزی باوەڕداران نەك لە ریزی دووڕووان.**

گەر خۆشەویستی کەسێك و رق لە کەسێك کەوتە ناو دڵتەوە ئەوا بە نەفس و میزاج ئەمەیانت خۆشنەوێت و رقت لەوەیان نەبێت، بەڵکو هەردوو خۆشەویستییەکە بگێڕەوە بۆ حوکمی قورئان و سوننەت، گەر قورئان و سوننەت لەگەڵ ئەوەیان کە خۆشتدەوێت تەبابوون بەردەوام بە لە خۆشەویستییەکەت، بەڵام گەر پێچەوانە بوون لەگەڵی لە خۆشەویستییەکەی پاشگەزببەرەوە، گەر قورئان و سوننەت لەگەڵ ئەو کەسەی رقت لێیەتی تەبا بوون ئەوا لە رقلێبوونەکەت پاشگەز ببەرەوە، بەڵام گەر لەگەڵی پێچەوانە بوون بەردەوام بە لە رقلێبوونی، گەر ئەمە سوودی پێنەگەیاندی و لەلات رۆشن نەبوویەوە ئەوا بگەڕێوە بۆ لای دڵی صادیقان و پرسیاری ئەو دوانەیان لێ بکە، بگەڕێوە بۆ لای دڵیان چونکە دڵی ئەوان راست و دروستە، گەر دڵێك راست وەستا دەبێتە نزیکترین شت لە خوداوە(عزوجل)، کاتێك دڵ کار بە کیتاب و سوننەت دەکات لە خودا نزیك دەبێتەوە، کاتێك نزیکبوویەوە دەزانێت، و ئەوەی بۆ ئەوە و لەسەر ئەوە و ئەوەی بۆ خودایە و ئەوەی بۆ کەسانی ترە و ئەوەی بۆ حەقە و ئەوەی بۆ باتڵە دەبینێت، گەر "باوەڕدار" نوورێکی هەبێت تەماشای پێ بکات چۆن بۆ صادیق و کەسی نزیك لە خوداوە نوور بوونی نییە؟ باوەڕدار نوورێکی هەیە تەماشای پێ

دەکات، بۆ ئەو مەبەستە پێغەمبەر(ﷺ) هۆشداری داوە و فەرموویەتی: ((خۆتـان لـە فیراسەتی باوەڕدار بپارێزن، چونکە ئەو بە نووری خودا(عزوجل) تەماشا دەکات))[1].

نوورێکیش بە کەسی عاریفی نزیك لە خـودا دەدرێـت، بەهۆیـەوە نزیکی خـۆی لـە خوداوە(عزوجل) دەبینێت، هەروەها نزیکی پەروەردگاری لـە دڵـەوە دەبینێـت، ڕۆحـی فریشـتەکان و پێغەمبـەران و دڵ و ڕۆحـی صـادیقان دەبینێـت، حـاڵ و مـەقامیان دەبینێت، هەموو ئەمانە لە کرۆکی دڵ و پاکێتی نهێنی ئەودایە، ئەو بـە هەمیشـەیی لەگەڵ پەروەردگاری لە خۆشی و ئاسوودەییدایە، ئەو ناوەندێکە لە خودا وەردەگرێـت و بەسەر دروستکراواندا پەرشی دەکاتەوە، هەیانە زمان زانا و دڵ ڕەوانن، هەیانە دڵ زانا و زمان ڕەوانن، بەڵام کەسـی دووڕوو زمـان زانـا و دڵکوڵـە، هـەموو زانستەکەی لـە زمانیدایە، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:

((ئەوەی زۆر لێی دەترسم لەسەر ئومەتەکەم کەسێکی دووڕووی زمانزانە))[2].

بە هیچ شتێك فریو مەخۆ، چونکە خودا کارایە بۆ ئەو شتەی دەیەوێت، لە یـەکێك لە صالحانەوە دەگێڕنەوە: سەردانی برایەکی ئیمانی خۆی کرد و پێی وت: وەرە برام با بگرین بۆ زانستی خودا بـە ئێمـە)[3]، چەندە جوانی وتـووە ئـەم پیـاوە صـالحە! ئـەو کەسێکی عاریف بووە بە خودا(عزوجل) و فەرموودەکـەی پێغەمبـەری(ﷺ) بیسـتبوو کە دەفەرموێت:

((یەکێك لە ئێوە بە کاری ئەهلی بەهەشت کار دەکات تـا باڵێـك یـان دوو بـاڵ لـە نێوان ئەو و بەهەشتدا دەمێنێتـەوە شـەقاوەتی پێدەگات و دەبێت بـە ئـەهلی ئـاگر، هەروەها یەکێك لە ئێوە بە کاری ئەهلی ئاگر کاردەکات تا باڵێك یان دوو باڵ لە نێوان ئەو و ئاگردا دەمێنێت سەعادەتی پێ دەگات و دەبێت بە ئەهلی بەهەشت))[4].

---

[1] تقدم تخريجه.

[2] تقدم تخريجه.

[3] (فوزەیلی کوڕی عەیاز بوو ئەو قسەی بە سوفیانی سەوری فەرموو).

[4] صحيح، رواه البخاري ومسلم.

**وتـرا بـه یـه‌کێك لـه صـالحان:** ئایا پـه‌روه‌ردگاری خۆتـت بینیـوه؟ وتـی: گـه‌ر نه‌مبینیبێت له‌م شوێنه‌ی خۆمدا پارچه پارچه بم، گه‌ر که‌سێك بڵێـت: چـۆن ده‌یبیـنی؟ منیش ده‌ڵێم: گه‌ر دروستکراو له دڵی به‌نده بچێته ده‌ره‌وه و ته‌نها خودا (سبحانه وتعالى) له دڵدا بمێنێته‌وه خودا نیشـانی ده‌دات و چـۆنی بوێـت نزیکـی ده‌کاتـه‌وه، لـه نـاوه‌وه نیشانی ده‌دات وه‌ك چۆن له ده‌ره‌وه شت و که‌سانی تـری پـێ نیشـان ده‌دات، نیشـانی ده‌دات وه‌ك چۆن له شه‌وی میعراجـدا خـۆی نیشـانی پێغه‌مبـه‌ر(ﷺ) دا، بـه هـه‌مان شێوه -له خه‌ونـدا- خۆی نیشانی ئه‌و به‌نده‌یه ده‌دات و نزیکی ده‌کاته‌وه و قسه‌ی له‌گـه‌ڵ ده‌کات، هه‌ندێ جار له ئاگاهیدا دڵی به‌نده قسه‌ی له‌گـه‌ڵ ده‌کـات، دوو چـاوی بـوونی خۆی خامۆش ده‌کات و به دوو چاوی دڵ ده‌یبینێت، هه‌روه‌ك چۆن لـه ده‌ره‌وه شـته‌کان ده‌بینێت، مانایه‌کی تری پێ ده‌به‌خشێت و به‌هۆیه‌وه خودای پێ ده‌بینێت، نزیکی ئـه‌و و سیفه‌ته‌کانی ئه‌و ده‌بینێت، به‌خشنده‌یی و فه‌زڵ و چاکه و لـوتفی ده‌بینێـت، هانـا و په‌نا و میهره‌بانی ئه‌و ده‌بینێت، هه‌رکه‌سێك به‌ندایه‌تی و مه‌عریفه‌ی هاتـه دی ناڵێـت پێم نیشان بده یان پێم نیشان مه‌ده، ناڵێت پێمببه‌خشه یان پێم مه‌به‌خشه، ئه‌و ده‌بێت به که‌سێکی فانی نوقم بوو، بۆ ئه‌و مه‌به‌سته یه‌کێك له‌وانه‌ی گه‌یشتووه‌ته ئه‌و مه‌قامه ده‌ڵێت: (چی له منه‌وه له‌سه‌ر منه؟)، چه‌نده جوانی وتووه کـه ده‌ڵێـت: (مـن به‌نـده‌ی ئه‌وم، به‌نده‌ش له‌گه‌ڵ سه‌رداره‌که‌ی هه‌ڵبژاردن و ویستی بۆ نییه).

پیاوێك به‌نده‌یه‌کی کڕی به‌نده‌که ئه‌هلی دین و چـاکه بـوو، پێـی وت: ئـه‌ی به‌نـده، ده‌ته‌وێ چی بخۆی؟ وتی: هه‌رشتێك تۆ ده‌رخواردم بده‌ی، پێی وت: ده‌ته‌وێ چی بپۆشی؟ وتی: ئه‌وه‌ی پێمده‌پۆشی، وتی: ده‌ته‌وێ له کوێی ماڵه‌که‌مدا نیشته‌جێ ببیت؟ وتی: له هه‌ر شوێنێك تۆ بۆم دیاری بکه‌ی، پێیوت: ده‌ته‌وێ چ جۆره کارێك ئه‌نجام بده‌ی؟ وتی: ئه‌وه‌ی تۆ فه‌رمانم پێده‌که‌ی، پیاوه‌که ده‌ستی به گریان کرد و وتی: نوخشـه‌ش بێـت لـه من گه‌ر له‌گه‌ڵ په‌روه‌ردگارم بـه‌و جۆره بم کـه تـۆ له‌گـه‌ڵ مـن هه‌ڵسـوکه‌وت ده‌کـه‌ی، به‌نده‌که وتی: گه‌وره‌م، بۆ به‌نده له‌گـه‌ڵ سـه‌رداره‌که‌ی خـۆی ویسـت و هه‌ڵبـژاردنی بـۆ هه‌یه؟! پیاوه‌که وتی: تۆ له پێناوی خودادا ئازادی، ده‌مه‌وێ له‌گه‌ڵم بمێنیتـه‌وه تـا بـه خۆم و ماڵه‌که‌مه‌وه خزمه‌تت بکه‌م.

هەرکەسێك خودای(عزوجل) ناسی ویست و هەڵبژاردنی بۆ نامێنێتەوە و دەڵێت: من چیم لەسەرە، لە خۆی و کەسانی تردا شانشانێن لەگەڵ بڕیارەکانی قەدەردا ناکات، دانە دانەیەك لە بەندەکانی خودا لە دروستکراوان زوهد دەکەن و بە خەڵوەتەوە هۆگری پەیدا دەکەن، هۆگری بە خوێندنەوەی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەرەوە(ﷺ) پەیدا دەکەن، گومانی تێدا نییە دەبن بە خاوەنی دڵێك کە بە خوداوە هۆگری هەیە و لێیەوە نزیکە، بەهۆی ئەو دڵەوە نەفسی خۆیان و نەفسی کەسانی تر دەبینن، دڵیان راست و دروست لێی دەوەستێ، شتێك لەوەی ئێوە لەسەرینی لە ئەوان شاراوە نابێت، لەسەر خایلە و خوتوورەی ناوەوەی ئێوە قسە دەکەن و هەواڵتان پێدەدەن لەمەڕ ئەوەی لە ماڵەکانی ئێوەدایە.

**هاوار بە حاڵت**، کەسێکی ناقڵ بە، بە نەزانی خۆت شانشانێن لەگەڵ خوداناسان مەکە، لە کتێب دێیە دەرەوە و سەردەکەویتە سەر مینبەر و قسە بۆ خەڵکی دەکەی، ئەمە کارێکە پێویستی بە ئەحکامی دەرەوە و ئەحکامی ناوەوە هەیە، پاشان بێنیازبوون لە هەموان، پاشان ئەو ئاتاجە بکەوێتە ناو دوو پێویستییەوە: یەکەمیان لە شارەکەتدا کەسێك بوونی نەبێت ئامۆژگاری خەڵکی بکات جگە لە تۆ، بۆیە وەك زەرورەت ئامۆژگاری خەڵکی دەکەی، دووەمیان ئەوەیە لە رووی دڵەوە فەرمانت پێبکرێت بە قسەکردن، ئەوکات سەردەکەوی بۆ ئەو مەقامە بۆ ئەوەی خەڵکی بگێڕیتەوە بۆ لای خودا(عزوجل).

**هاوار بە حاڵت**، تۆ بانگەشە ئەوە دەکەی کە صۆفیت(بە مانای پاڵفتە) کەچی تۆ لێڵ و لیخنی، سۆفی ئەو کەسەیە ناوەوە و دەرەوەی بە شوێنکەوتنی قورئان و سوننەت پاك و بێگەرد بووە، هەتا پاڵفتەبوونەکەی زیاتر بێت زۆرتر لە دەریای بوونی خۆی دێتە دەرەوە و ویست و هەڵبژاردن لە پاکی و بێگەردی دڵییەوە وازلێدەهێنێت، بنچینەی هەموو خێرێك شوێنکەوتنی پێغەمبەری خودایە(ﷺ) لە گوفتار و کرداریدا، هەتا دڵی بەندە پاك و بێگەرد بێت پێغەمبەر(ﷺ) لە خەوندا دەبینێت، فەرمانی پێ دەکات بە شتێك و رێگری لێدەکات لە شتێك، هەموو بوونی دەبێت بە دڵ و جەستەی باریك و لاواز دەبێت، دەبێت بە نهێنی بێ ئاشکرا و پاڵفتەی بێ لیخنی، تونکلی

دەرەوەی لێ دەبێتەوە و دەگۆڕێت بۆ کرۆکێکی بێ توێکڵ، لەڕووی ماناوە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دەبێت، دڵی لەگەڵی و لەبەردەستیدا پەروەردە دەبێت، دەستی دەخاتە ناو دەستی پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) لە جێگەی ئەو قسە دەکات و دەبێتە ئەو کەسەی بە خودای دەگەیەنێت، دەرکردنی هەموان لە دڵ وەك هەڵکەندنی چیایەکی دامەزراو وایە، پێویستی بە پاچ و بێڵی تێکۆشان و ئارامگرتنە لەسەر ئازار و مەینەتییەکان و دابارینی ئافەتەکان، داوای شتێك مەکەن بەردەستتان ناکەوێت، پیرۆزتان بێت گەر لەگەڵ زۆرینەی موسڵمانان‌اندا بوون و موسڵمان بوون، پیرۆزتان بێت لە رۆژی دواییدا لە ریزی موسڵمانانن و ناچنە ریزی بێباوەڕانەوە، پیرۆزتان بێت نیشتەجێبوون لە زەوی بەهەشت یان لە دەرگای بەهەشت و ناچنە ریزی ئەوانەی بەردەبنەوە بۆ شوێنە نزمەکانی دۆزەخ، تەوازوع بنوێنن و لوتبەرزی مەنوێنن، تەوازوع خاوەنەکەی بەرزدەکاتەوە و لوتبەرزی خاوەنەکەی نزم دەکاتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((هەر کەس تەوازوعی بۆ خودا بێت خودا بەرزی دەکاتەوە)) [1].

کاتێك دڵ لەسەر یادی خودا(عزوجل) بەردەوام دەبێت مەعریفە و زانست(زانستی ناوەوە) و یەکتاپەرستی و تەوەکول رووی لێ دەکات و پشتهەڵدەکات لە هەر شتێکی تر لەخوار خوداوە، بەردەوامی یادی خودا هۆیەکە بۆ بەردەوامی خێر لە دونیا و دوارۆژدا، گەر دڵ هاتە راستە یادی خودا لەناویدا بەردەوام دەبێت، لە پەڕەکانی دڵ و لە سەراپای دڵدا یادی خودای لەسەر دەنوسرێت، بۆیە چاوی دەنوێت و دڵی یادی پەروەردگاری(عزوجل) دەکات، ئەوەشی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) بە میرات بۆ بەجێماوە.

یەکێك لە صالحان لە هەندێ شەودا بۆ خەوتن زۆری دەکرد لە خۆی و جێگەکەی رادەخست بەبێ ئەوەی ئاتاج بێت بە جێگەی نووستن، لەو بارەیەوە پرسیاری لێکرا، وتی: (دڵم پەروەردگارم(عزوجل) دەبینێت)، لە قسەکەیدا راستی کردووە چونکە خەونی راست و دروست وەحییە لە خوداوە(عزوجل)، ئەو خەونەش لە خەوەکەیدا رۆشنایی چاوەکانی بووە.

---

[1] تقدم تخريجه.

## مەجلیسی شەستەم

# وازهێنان لەو شتەی پەیوەندی بە تۆوە نییە

شەوی سێشەممە ١٣/رەجەب/٥٤٥ﻫ لە مەدرەسەکەی، فەرمووی:

**لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی:** ((لە باشێتی موسڵمانێتی کەسێك ئەوەیە شتانێك وازلێبهێنێت پەیوەندیان بە ئەوەوە نییە))[1].

هەرکەس ئیسلامەتییەکەی باش بێت و هاتبێتە دی روو لەو شتانە دەکات پەیوەندیان بە ئەوەوە هەیە و پشت لەو شتانە دەکات پەیوەندیان بە ئەوەوە نییە، خەریکبوون بە شتێکەوە پەیوەندی بە تۆوە نییە کاری دەستبەتاڵ و هەوەسبازانە، بێبەش لە رازیبوونی مەولای خۆی ئەو کەسەیە کار نەکات بەوەی فەرمانی پێکراوە و خەریك بێت بەو شتانەوە فەرمانی پێنەکراوە، ئەوە لە خودی خۆیدا بێبەشبوون و دەرکردنە، خەریکبوونت بە دونیاوە پێویستی بە نییەتی چاك و پاکە، ئەگینا دەبێت بە بەندەیەکی خەشملێگیراو، یەکەمجار بە پاککردنەوەی دڵتەوە خۆت خەریك بکە، چونکە ئەوە فەرزە لەسەرت، پاشان دەست بۆ مەعریفە ببە، گەر ئەسڵ لەدەست بدەی خەریکبوونت بە لقەوە لێ قبوڵ ناکرێت، پاکێتی ئەندامەکان لەگەڵ پیسبوونی دڵ سوود و قازانجێکی نییە، ئەندامەکانت بە سوننەت و دڵت بە کارکردن بە قورئان پاك بکەرەوە، دڵت بپارێزە بۆئەوەی ئەندامەکانت پارێزراو بن، هەموو دەفرێك ئەوەی لێ دەچۆڕێت کە تێیدایە، هەر شتێك لە دڵی تۆدا بێت دەرژێتە سەر ئەندامەکانت، کەسێکی ژیرمەند بە ئەمە کاری کەسێك نییە باوەڕ و بەقینی بە مردن هەبێت، ئەمە کاری کەسێك نییە چاوەڕوانی لیقای خودا(عزوجل) دەکات و لە دادگایی کردن و پرسیارلێکردن و لێپێچانەوە دەترسێت، دڵی راست و دروست بە یەکتاپەرستی و

---

[1] حسن، رواه الترمذي.

تەوەکول و یەقین و کۆمەکی و زانست و ئیمان و نزیکی لە خوداوە پڕبووە، هەموو دروستکراوان بە چاوی دەستەوسانی و زەلیلی و هەژاری تەماشا دەکات، لەگەڵ ئەوەش بەسەر منداڵێکی بچووك لە ئەوان لوتبەرزی نانوێنێت، لە کاتی گەیشتن بە بێباوەڕان و دووڕووان و یاخیبووان لە پێناوی خودادا وەك دڕندە پەلامار دەدات، ئەوانە لەبەردەستیدا وەك پارچە گۆشتێکی کەوتوو وان، بۆ صالحان و تەقواداران و ئەهلی وەرع تەواززوع دەنوێنێت، خودا ئەو دەستەیەی ئەمە سیفەتیانە بەم جۆرە وەسف دەکات:

﴿أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ﴾ الفتح: ٢٩

**هاوار بە حاڵت**، ئەی بیدعەچی تەنها خودای پەروەردگار(عزوجل) دەتوانێت بڵێت: "إني أنا الله"، خودا قسەکەرە و کەڕ و لاڵ نییە، بۆ ئەو مەبەستە خودا پێداگری لە ئەمرەکە کردووە و دووپاتی کردووەتەوە و دەفەرموێت:

﴿وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا ﴿١٦٤﴾﴾ النساء: ١٦٤[1].

خودا کەلامی هەیە دەبیسترێت و لێی تێدەگەین، بە موسای(عليه السلام) فەرموو:

﴿يَا مُوسَىٰ إِنِّي أَنَا اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ ﴿٣٠﴾﴾ القصص: ٣٠

مەبەستی لە وتنی ئەو کەلامە ئەوەیە: من فریشتە و جنی و مرۆڤ نیم، من پەروەردگاری هەموو جیهانەکانم، واتە فیرعەون درۆ دەکات کە دەڵێت:

﴿أَنَا رَبُّكُمُ الْأَعْلَىٰ ﴿٢٤﴾﴾ النازعات: ٢٤

ئەو درۆ دەکات لە بانگەشەی خوایەتیدا، من خودام نەك فیرعەون و هیچ دروستکراوێکی تر، کاتێك موسا(عليه السلام) کەوتە ناو ئەو تەنگەژە و تەنگەلانییەوە ئیمان و یەقینەکەی دەرکەوت، کاتێك بەربوویەوە بۆ ناو تاریکی شەو و تاریکی خەم و پەژارە لەسەر ژنەکەی لەپێناو ئەو تەنگەلانییەی ئەو تێیکەوتبوو

[1] (فیعلی(کلم)ی بە مصدری(تکلیما) تەوکید کردووە، ئەمەش تەنها مانای راستەقینەی فرمانەکە دەگەیەنێت و هەڵنادرێتە سەر مەجاز).

خودا(عزوجل) نووری خۆی بۆ دەرخست، موساش(علیه السلام) بە خانەوادەکەی خۆی فەرموو:

﴿امْكُثُوا إِنِّي آنَسْتُ نَارًا﴾ طه: ١٠

من نوورێکم بینیوە، نهێنی و دڵ و مانا و کرۆکم نوورێکیان بینیوە، بڕیاری پێشینە و هیدایەتم بۆ هاتووە، بێنیازبوونم لە دروستکراوان بۆ هاتووە، ویلایەت و خەلافەتم بۆ هاتووە، ئەسڵم بۆ هاتووە و لق بارگە و بنەی خۆی پێچاوەتەوە، بووم بە مەلیك و بەندەبوونم بۆ خەڵکی کۆتایی هاتووە، ترسم لە فیرعەون نەماوە و ترسەکە گوازراوەتەوە بۆ سەر ئەو، ماڵئاوایی لە خانەوادەکەی کرد و رادەستی پەروەردگاری(عزوجل) کردن، خۆی رۆیشت و بێ بوونی هیچ گومانێك خودای لەناو خانەوادەکەیدا کرد بە جێنشینی خۆی، باوەڕداریش بەم جۆرەیە کاتێك خودا نزیکی دەکاتەوە و دەرگای نزیکی لە خۆی بانگی دەکات، دڵی تەماشای راست و چەپ و دواوە و پێشەوەی خۆی دەکات، دەبینێت هەموو ئاراستەکان داخراون جگە لە ئاراستەی حەق(عزوجل)، بۆیە لەگەڵ نەفس و ئارەزوو و ئەندامەکان و عادەت و خانەوادە و هەموو ئەوەی لەسەریەتی دەکەوێتە گفتوگۆ و پێیان دەڵێت: من هۆگریم بە نووری دڵەوە و لە پەروەردگارمەوە(عزوجل) پەیدا کردووە، من بۆ لای ئەو دەچم، گەر گەڕانەوەیەکم هەبوو دێمەوە بۆ لاتان، ماڵئاوایی دەکات لە دونیا و ئەوەی لە دونیادایە لە هۆکارەکان و حەزەکان، ماڵئاوایی لە هەموو دروستکراوان دەکات، ماڵئاوایی لە هەموو رووداو و دروستکراوێك دەکات، دەڕوات بۆ لای دروستکەر، گومانی تێدا نییە حەق(عزوجل) سەرپەرشتی خانەوادە و منداڵ و هەموو هۆیەکانی لە حەڵاڵ دەکات، خودا ئەو دەشارێتەوە لە دوورەکان نەك لە نزیکەکان، لە کەسە بێزراوەکان نەك لە خۆشەویستان، لە زۆرینە دەیشارێتەوە نەك لە کەمینەیەکی دەگمەن، ئەم دڵە گەر راست و دروست لێی وەستا و پاڵفتە بوو لە هەر شەش ئاراستەکەوە گوێی لە بانگی حەق(عزوجل) دەبێت، گوێی لە بانگی هەموو پێغەمبەر و صدیق و وەلییەك دەبێت، ئەوکات لە خودا نزیك دەبێتەوە و ژیانی دەبێت بە نزیکی لە خودا(عزوجل) و مردنی دەبێت بە دووری لە خودا، رازیبوونی لە موناجاتی خودادا(سبحانه وتعالی) دەبێت، بەوە لە هەرچی شتی ترە

بێنیاز دەبێت، گوێ نادات بە ڕۆیشتنی دونیا لە دەستی ئەو، گوێ نادات بە برسێتی و تینوێتی و رووت و رەجالی و تێکشکان، رازیبوونی موریـد لـە گوێڕایـەڵی کردنی خودادایە و رازیبوونی عاریفی موراد لە نزیکی خوداودیە، ئەی ئەو کەسەی زۆر لە خۆت دەکەی ئەمە ئەوە نییە تۆ لەسەری دەڕۆی، ئەم کـارە-بـە بـوونی نـەفس و ئـارەزوو و سروشت و نەزانی و بینینی دروستکراوان- بە رۆژووی رۆژ و بە شـەونوێژی شـەو و بـە زبری خواردن و پۆشاك بەدەست نایەت، بەوانەوە شتێك بەدەست ناهێنیـت، هـاوار بـە حاڵت، ئیخلاصت هەبێت و خۆت رزگـار بکـە، راسـتگۆ بـە دەگەیـە بـەرەوە و نزیـك دەکرێیەوە و لەسەر هەوڵ و لێبڕانت بەرزدەبییەوە، خۆت رادەست بکە سەلامەت دەبیت، لەگەڵ خودا تەبا بە کۆمەکی دەکرێیت، رازی بە خودا لێت رازی دەبێت، تۆ پەلە بکە خودا(عزوجل) بۆت تەواو دەکات.

**خودایە،** لە دونیا و دوارۆژدا سەرۆکاری کاروبارەکانمان بکە و ئێمە رادەستی نەفسی خۆمـان مەکـە و مەمانـدەرە دەسـت یـەکێك لـە دروسـتکراوانت، لـە پێغەمبـەری خوداوە(ﷺ) فەرموویی:

((خودا(عزوجل) بە جبریل دەفەرموێت: ئەی جبریل فلان کەس بخەوێنە و فلان کەس راستبکەرەوە(بەئاگا بهێنە)))[1].

**ئەمە دوو رووی هەیە:** فلان کەسی موجیـب راسـتبکەرەوە و فـلان کەسـی مـەحبووب بخەوێنە، ئەمەیان بانگەشەی خۆشەویستی من دەکات، بۆیە هەر دەبێت لەگەڵی تـاوتوێ بکەم و لە مەقامی خۆی راستی بکەمەوە تاکو گەلای بوونی خۆی لەگەڵ کەسانی تـر لـێ بەردەبێتەوە، راستیبکەرەوە تا بەڵگەی بانگەشەکەی رۆشن دەبێتەوە و خۆشەویـستییەکەی دێتە دی، فلان کەسیش بخەوێنـە چونکە مەحبووبە، زۆر مانـدوو بـووە و شـتێکی تێـدا نەماوە جگە لە من. مەحبەتەکەی بۆ من بوو، بانگەشەکەی هاتە دی و لـە بەڵگەکەیـدا راستی کرد و وەفای بە پەیمانی منەوە کرد، ئێستا سەری منـە و کـاتی ئەومیـە وەفـا بـە پەیمانەکەمەوە بکەم، ئەو میوانە لەلام، میوانیش لە ماڵی خانەخوێدا ئیشی بۆ ناکرێت و

[1] ذ احمد بهذا اللفظ

ماندوو ناگرێت، لە ئامێزی لوتفی خۆمدا دەینوێنم و لەسەر سفرەی فەزڵی خۆم دایدەنیشێنم و بە نزیکی خۆمەوە هۆگری دەکەم و لە هەرچی کەس و شتانی تره بێزر و بێئاگای دەکەم، ئەو لە خۆشەویستییەکەیدا راستی کرد، گەر خۆشەویستی راست و دروست بێت داوا بەردەبێتەوە و نامێنێت، ڕوویەکی تر: فلان کەس بخوێنە چونکە لە دەنگی بێزارم، فلان کەس راستبکەرەوە چونکە پێمخۆشە گوێم لە دەنگی بێت، کاتێك موحیب دەبێت بە مەحبووب گەر دڵی لە هەرچی شتی تره جگە لە مەولای پاك ببێتەوە، کاتێك یەکتاپەرستی و تەوەکول و ئیمان و یەقین و مەعریفەی تێر و تەواو بوون ئەو کەسە دەبێت بە مەحبووب، ماندووبوون و شەکەتی لێ دەبێتەوە و پشوو و ئاسوودەیی رووی لێ دەکات، کەسێك مەلیکێکی دونیایی خۆشبوێت با دووریەکی زۆریش لە نێوانیاندا هەبێت خۆشەویستی زاڵ دەبێت بەسەریدا و عەودالانە سەری خۆی هەڵدەگرێت و روو لەو شار و وڵاتە دەکات مەلیکەکەی لێ دەژی، لە ڕۆیشتنیدا رۆژ دەداتە دەم شەو و شاندەداتە ژێر هەرچی ماندووبوون و ترسە، خۆشی لە خواردن و خواردنەوە وەرناگرێت تا دەگاتە بەردەم دەرگاکەی، هەواڵ بە حاڵی کەسەکە دەدرێت بە مەلیك، خزمەتکارانی دێنە دەرەوە بۆ لای و خۆشهاتنی دەکەن و دەیبەن بۆ گەرماو و تەپوتۆز و پیسی لێدەکەنەوە و جوانترین و باشترین پۆشاکی دەکەن بەبەردا و خۆشترین بۆنی لێدەدەن و لەبەر دەستی مەلیکدا ئامادەی دەکەن، ئەویش هۆگری بۆ دەردەبڕێت و قسەی لەگەڵ دەکات و پرسیاری حاڵی دەکات و جوانترین کەنیزەکەکانی خۆی لێ ماردەبڕێت، لە موڵکی خۆی بەهرەداری دەکات و دەبێت بە مەحبووبی مەلیك، ئایا لەدوای ئەوە ترس و ماندووبوون دەمێنێتەوە یان خۆزگە دەخوازێت بگەڕێتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی، چۆن ئاوات دەخوازێت بگەڕێتەوە و لە مەلیك جیاببێتەوە لە کاتێکدا ئەو پلە و پایەی وەرگرتووە؟ ئەم دڵەش گەر بە خزمەتی حەق(عزوجل) گەیشت -لە نزیکی و موناجاتی ئەو(سبحانه وتعالى)- دەحەزراو و شکۆدار دەبێت، لەلای ئەو ئاسایشی خۆی وەردەگرێت و خۆزگە ناخوازێت بگەڕێتەوە لەلای حەقەوە(عزوجل) بۆ لای کەسانی تر، گەیشتنی دڵ بەم مەقامە بە جێبەجێ کردنی فەرزەکان و ئارامگرتن لەسەر دەستنەبردن بۆ حەرام و حەزەکان دەبێت، هەروەها دەستبردن بۆ موباح و حەڵاڵ نەك بە ئارەزوو و حەز و بوونی خۆتەوە، بە هەمان

شێوە بەکارهێنانی وەرعی تێر و تەواو و زوهدی کامڵ، ئەوەش بریتییە لە وازهێنان لە هەرچی شتە جگە لە خودا(عزوجل) و سەرپێچی لە نەفس و ئارەزوو و شەیتان، پاکێتی دڵ و خاڵیبوونەوەی لە دروستکراوان بەگشتی و یەکسانبوونی مەدح و زەم و پێدان و لێگرتنەوە و کۆچکردن و رووڵێکردن، یەکەم هەنگاوی ئەم کارە شایەتومانە(أشهد أن لا إله إلا الله) و کۆتاییەکەشی یەکسانبوونی بەرد و قوڕ لەلات، هەرکەس دڵی دروست بێت و پەیوەست بێت بە پەروەردگارییەوە(عزوجل) بەرد و قوڕی لا یەکسان دەبێت، هەر بەو جۆرە مەدح و زەم و نەخۆشی و لەشساغی و دەوڵەمەندی و هەژاری و رووتێکردنی دونیا و پشتتێکردنی دونیا، هەرکەسێك ئەمەی بۆ هاتە راستە نەفس و ئارەزووی دەمرێت و سروشتی هەڵچووی خامۆش دەبێت و شەیتانەکەی بۆ زەلیل دەبێت، دونیا و رۆڵەکانی دونیا بەکەم تەماشا دەکات و دوارۆژ و رۆڵەکانی دوارۆژ لەلای مەزن دەبن، پاشان پشت لەو دوانەش دەکات و روو لە مەولای خۆی دەکات، لەناو خەڵکیدا رارەوێك بۆ دڵی دەکرێتەوە کە لەرێیەوە بەرەو حەق(عزوجل) هەنگاو هەڵدەگرێت، دەکەون بەلای راست و چەپدا و کەناردەگرن و رێگەکەی بۆ چۆڵ دەکەن، لە ئاگری صدق و هەیبەتی نهێنی ئەو هەڵدێن، هەرکەس ئەمەی بۆ هاتە راستە هیچ کەسێك ناتوانێت بیگێڕێتەوە و کەسێك نییە بتوانێت -لە دەرگای خودا(عزوجل)- رێگەی پێبگرێت، ئالاکەی نەوی نابێت و سوپاکەی شکست ناخوات و باڵندەکەی بێدەنگ نابێت و شمشێری یەکتاپەرستییەکەی کول نابێت و هەنگاوەکانی ئیخلاصی شەکەت نابن و کارەکانی گران و دژوار نابن و هیچ دەرگایەکی کلۆم لە بەردەمیدا خۆی راناگرێت، بەسەر دەرگا داخراوەکاندا دەفرێت و ناراستەکانی بۆ والا دەبن، هیچ شتێك لەبەردەستیدا خۆی راناگرێت تا دەگاتە بەردەستی پەروەردگاری(عزوجل)، ئەو(سبحانه وتعالى) لوتفی پێ دەکات و لە باوەشی میهرەبانی خۆیدا دەیحەوێنێت و لە چاکەی خۆی دەرخوارد دەدات و هۆگری خۆی پێ نۆش دەکات، ئەوکات شتێك دەبینێت چاو نەیبینیوە و گوێ نەیبیستووە و بە خاپلە و ختوورەی دڵی مرۆڤدا گوزەری نەکردووە، گەڕانەوەی ئەم بەندەیە بۆ لای دروستکراوان هۆی هیدایەتیانە و بوون بە مەلیکیانە، ئەوان لە ئەو بەهرەدار دەبن و لەو بەهرەیەی کە بە گەیشتن بە خودا بەدەستی هێناوە بەسەر ئەواندا دابەش دەکات، ئەو بەندەیەی خودای بینی هەرچی شتی

تۆ جگە لە ئەو بە دروستکراو دەزانێت، ئەو دروستکراوان بەئاگا دەهێنێت و دەبێت بە کەسێکی ئازا و چاونەترس و نوێنەر و ڕێنیشاندەر بۆ دەرگای خودا(عزوجل)، ئەوکات لە مەڵەکوتدا بە "مەزن" ناودەهێنرێت، هەموو دروستکراوان لەبەرپێی دڵی ئەودا دەبن و خۆیان دەدەنە ژێر سێبەری ئەو، وریانە مەکە، تۆ بانگەشەی شتێك دەکەی مافی تۆ نییە و ئەلای تۆ نییە، نەفست زاڵ بووە بەسەر تۆدا و دروستکراوان و هەموو دونیا لە دڵی تۆدان، ئەو دوانە لە دڵی تۆدا لە خودا(عزوجل) مەزنترن، تۆ لە رادە و سنوور و دەستەی خوداناسان بەدەری، گەر دەتەوێ بگەیت بەوەی ئاماژەم پێکرد سەرقاڵی پاککردنەوەی دڵت بە لە هەموو شتەکان، فەرمانەکان بەجێبهێنە و خۆت لە نەهیکراوەکان بگرەوە، و لەگەڵ قەدەر ئارام بگرە و دونیا لە دڵت دەربکە، پاشان وەرە بۆ لام تا قسەت لەگەڵ بکەم و هەنگاوی دوای ئەوەت پێنیشان بدەم، گەر ئەمەت ئەنجامدا ئەوەی دەتەوێت بەدەستی دەهێنیت، بەر لەم هەنگاوە هەرچی قسەیە وڕێنەیە.

هاوار بە حاڵت، تۆ پێویستت بە پاروویەکە، دەنکە گەنمێکت لەدەست بچێت یان بەزێکت بشکێت قیامەتت لێ هەڵدەستێ و بەرهەڵستی خودا دەکەی و تووڕەبوونی خۆت بە لێدانی ژنەکەت و کوڕەکەت دەردەبڕی و جنێو بە ئایین و پێغەمبەرەکەت دەدەی، گەر تۆ کەسێکی ژیرمەند بیت و لە ریزی ئەهلی ئاگاهی بیت لەبەردەستی خودا کەڕ و لاڵ دەبویت و هەموو کردارەکانی خودات(عزوجل) لە پای خۆت بە نیعمەت و بەزەیی خودا دەزانی، گەر خۆڕاگر بیت و ململانێ نەکەی و شوکری خودا بکەی و کوفری نیعمەتەکانی نەکەی و رازی بیت و تووڕەیی و بێزاری دەرنەبڕی و بێدەنگ بیت و شك و گومان داتنەگرێتەوە پێت دەوترێت:

﴿ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُۥ ﴾الزمر: ٣٦

ئەی ئەو کەسەی پەلە دەکەی ئارام بگرە خۆراکی پاك و حەڵاڵت دەرخوارد دەدرێت، تۆ خودا(عزوجل) ناناسیت، گەر خودات بناسیبایە لای کەسانی تر سکاڵات نەدەکرد، گەر خودات بناسیبایە لەبەردەستیدا لاڵ دەبوویت و داوای هیچت لێ نەدەکرد، و بە دوعاکانت پێداگریت نەدەکرد، بەڵکو لەگەڵی ئەبادەبوویت و ئارامت دەگرت،

کەسێکی زێرمەندبە ئاتاج نابێت بە پاکژی، هەرچی کردار و بەرژەوەندییە تۆی پێ تاقیدەکاتەوە بۆ ئەوەی ئاشکرا بێت تۆ چی دەکەی، تاقیتدەکاتەوە تا ئاشکرابێت تۆ متمانەت بە بەڵێنی ئەو هەیە، بۆ ئەوەی ئاشکرا بێت ئایا تۆ دەزانی خودا تەماشان دەکات و زانایە بە تۆ؟ دەزانیت گەر کرێکار لە ماڵی مەلیکدا بێت و داوای بەخشش بکات گێلێتییە بۆ ئەو و چلێسی و هەڵپە نیشان دەدات، بۆیە راستەوخۆ دەکرێتە دەرەوەی کۆشکی مەلیک و پێی دەوترێت ئەمە ئاتاجە بە داواکردن.

ئیمانی باوەڕدار لە دڵیدا کامڵ نابێت گەر هەڵپە و چلێسی و داوا بوونی هەبێت، گەر لە دڵدا ترس لە دروستکراوان و رجا لە لایان بوونی هەبێت، ئەمە کاتێک بۆی دێتە راستە بەهەمیشەیی لە بیر و هۆشدا بێت و لا بەلای ئوسوڵ و لقدا بکاتەوە، ئەوەش بە تێڕامان لە حاڵی پێغەمبەران و نێراوان و صالحان، بیر لەوە بکاتەوە چۆن حەق(عزوجل) لەدەستی دوژمن قوتاری کردن و سەربخستن بەسەریاندا و دەروو و چارەسەری بۆ کاروبارەکانی ئەوان بینیوە، بە بیری دروست تەوەکول بەرهەم دێت و دونیا لە دڵ بزر دەبێت و مرۆڤ و جین و فریشتە و هەموو دروستکراوان لەبیر دەکات و یادی حەق(عزوجل) دەکات، خاوەنی ئەم دڵە حاڵی بە جۆرێکە وەك ئەوەی تەنها ئەو دروستکرابێت، بە جۆرێکی لێ دێت وەك ئەوەی تەنها ئەو فەرمانی پێکرابێت، وەك ئەوەی بەتەنها ئەو نەهیلێکراوە، وەك ئەوەی بەتەنها ئەو لەلای خوداوە نیعمەتی بەسەردا داباریوە، وەك ئەوەی هەموو داواکان لە گەردنی نهێنی و دڵی ئەودا بن، چیای داواکان-بە جۆراوجۆریان- بە پەیامێك لە خوداوە تەماشا دەکات، بۆیە شاندەداتە ژێری وەك هێنانەدی بەندایەتی و گوێڕایەڵی بۆ خودا(عزوجل)، ئەو کۆڵی دروستکراوان هەڵدەگرێت خوداش ئەو هەڵدەگرێت، ئەو دەبێت بە پزیشکیان و پەروەردگاریش دەبێت بە پزیشکی ئەو، دەبێت بە دەروازەی دروستکراوان بۆ لای حەق(عزوجل) و سەفیری نێوان ئەو و بەندەکانی، ئەو دەبێت بە خۆرێك لەبەر رۆشنایییەکەیدا رێگەی خۆیان بۆ لای خودا دەبیننەوە، دەبێت بە خۆراك و خواردنەوەی دروستکراوان و لە ئەوان بزر نابێت، هەموو نیعمەتەکانی دەبێت بە بەرژەوەندی ئەوان و بەرژەوەندی خۆی لەبیردەچێتەوە، وەك ئەوەی لێ دێت نەفسی و

سروشت و ئارەزووی نەمابێت، خواردن و خواردنەوە و پۆشاکی لەبیردەچێتەوە، نەفسی خۆی لەبیردەچێتەوە و هەمیشە دروستکراوانی خودای لەبیرە، بە دڵ لە نەفسی خۆی و دروستکراوان دەردەچێت و بە پەروەردگارییەوە دەمێنێتەوە، هەموو داوایەکی سوود و قازانجی دروستکراوانە، نەفسی خۆی رادەستی قەزای پەروەردگاری کردووە و بە هەموو بوونییەوە خۆی لێ کەنارگیر کردووە، ئەمە سیفەتی کەسێکە دەیەوێت خەڵکی بۆ لای دەرگای خودا(عزوجل) بگێڕێتەوە، تۆ هەوەسبازی، نەزانی بە خودا و پێغەمبەرانی و ئەولیا و خاسان لە دروستکراوانی، بانگەشەی زوهد دەکەی لە کاتێکدا تۆ پڕی لە حەز، زوهدەکەی تۆ پەککەوتەیە و لاقی رۆیشتنی نییە، هەموو حەزەکانی تۆ بریتین لە دونیا و دروستکراو، حەزێکت نییە لە پەروەردگار(عزوجل)، وەرە و لەبەردەستمدا بوەستە، گومانی باش و ئەدەب پێشکەش بکە تا رێنموونیت بکەم بۆ لای پەروەردگارت(عزوجل) و رێگەی بەرەو لای ئەوت پێ بناسێنم، پۆشاکی لوتبەرزی فڕێدە و پۆشاکی تەوازوع لەبەربکە، نەفسی خۆت زەلیل بکە تا عیززەت بەدەست بهێنیت، تەوازوع بنوێنە تا خودا بەرزت بکاتەوە، هەموو ئەوەی تۆی تێدای و تۆی لەسەرە هەوەسبازییە و خودا(عزوجل) تەماشای ناکات، ئەم کارە بە کاری جەستە بەدەست نایەت، بەڵکو کارەکە کاری دڵە ئەوجا کاری جەستەیە، پێغەمبەرمان(ﷺ) دەفەرموێت:

((زوهد لێرەدایە، تەقوا لێرەدایە، ئیخلاص لێرەدایە، ئاماژەی بۆ سینەی خۆی کرد))[1].

هەرکەس سەرفرازی دەوێت با ببێت بە خاکی ژێر پێی گەورەپیاوان، سیفەتی ئەو گەورەپیاوانە چۆنە؟ ئەوان دونیا و دروستکراویان وازلێهێناوە و ماڵئاواییان لەو دوانە کردووە، کۆچیان کردووە لە هەرچی شتە لە عەرشەوە بۆ فەرش، ئەوان کەسانێکن شتەکانیان وازلێهێناوە و ماڵئاواییان لێکردوون بە ماڵئاوایی کردنی کەسێک کە هەرگیز ناگەڕێتەوە بۆ لایان، لەگەڵ پەروەردگاریان هەموو دروستکراوان و نەفس و بوونی خۆیان لە هەموو حاڵ و بارێکدا وازلێهێناوە، هەرکەسێک داوای خۆشەویستی

---

[1] رواه مسلم والترمذي واحمد بلفظ مقارب.

خودا(عزوجل) بکات لەگەڵ بوونی نەفس ئەو کەسە لە هەوەسبازی و وڕێنەدایە، زۆرینەی بەناو زاهیدان و بەناو عابیدان بەندەی دروستکراوانن و بەوانەوە هاوەڵیان بۆ خودا داناوە، قسە لە "هۆ" مەکەن و بە هۆوە هاوەڵ بڕیار مەدەن و شان لەسەر هۆ دامەدەن، چونکە حەق(عزوجل) لێتان توورە دەبێت، ئەو(سبحانە وتعالی) هۆی هەموو هۆیەکانە، دروستەکەری هۆیەکان دەستێوەردان لە هۆیەکاندا دەکات، باوەڕی شوێنکەوتووانی قورئان و سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) بەم جۆرەیە: شمشێر بە سروشتی خۆی نابڕێت، بەڵکو خودا(عزوجل) پێی دەبڕێت، ئاگر بە سروشتی خۆی ناسووتێنێت، بەڵکو خودا(عزوجل) بە ئاگر دەسوتێنێت، خواردن بە سروشتی خۆی تێرناکات، بەڵکو خودا(عزوجل) مرۆڤی پێ تێر دەکات، ئاو بە سروشتی خۆی تینوێتی ناشکێنێت، بەڵکو خودا(عزوجل) تینوێتی پێدەشکێنێت، هەر بەو جۆرە هەموو هۆیەکانی تر بە جیاوازی رەگەزیانەوە تەنها خودایە دەستێوەردانیان تێدا دەکات و تاوتوێیان دەکات، هۆیەکان ئامرازن لەبەردەستی خودادا و چۆنی بوێت بەو جۆرە بەکاریان دەهێنێت، گەر خودا بکەری راستەقینە بێت بۆچی لە هەموو کاروبارەکاندا ناگەڕێنەوە بۆ لای و هەموو پێویستییەکانتان رادەستی ئەو ناکەن و لە هەموو کار و بارێکدا پابەند نابن بە یەکتاپەرستییەوە؟ کارەکە رۆشنە و لە هەموو کەسێکی ژیرمەند شاراوە نییە:

العبد يضرب بالعصا

والحر تكفيه الإشارة

(بەندە بە عەسا لێیدەدرێت و ئازاد تەنها ئاماژەیەکی بەسە)

گوێڕایەڵی لە خودا بکەن، چونکە هەر کەس گوێڕایەڵی لێ بکات عیززەتی پێ دەبەخشێت، لێی یاخی مەبن، چونکە هەرکەس لێی یاخی بێت زەلیل دەبێت، سەرکەوتن و شکست بە دەستی خودایە، بە سەرکەوتن کێی بوێت عیززەتداری دەکات، و بە شکست کێی بوێت سەرشۆڕ و شەرمەزاری دەکات، بە زانست کێی بوێت عیززەتداری دەکات و بە نەزانی کێی بوێت شەرمەزاری دەکات، بە نزیکی لە خۆیەوە کێی بوێت عیززەتی پێ دەبەخشێت و بە دوورخستنەوە کێی بوێت شەرمەزاری دەکات.

# مەجلیسی شەست و یەك

## خایلە و ختوورەی مرۆڤ

لە مەدرەسەکەی ٢٠/رەجەب/٥٤٥هـ دوای هەندێ قسە:

**-کەسێك پرسیاری خایلە و خوتوورەی شەیتانی لێ کرد- ئەویش فەرمووی:**

**تۆ چووزانی خایلە و خوتوورە چییە؟** خایلە و خوتوورەی تۆ لە شەیتان و سروشت و نارەزوو و دونیاوەیە، دونیا خایلە و خوتوورەی خۆی هەیە و دوارۆژیش بەهەمان شێوە، فریشتە خایلە و ختوورەی خۆی هەیە و نەفس بەهەمان شێوە، دڵ خایلە و خوتوورەی خۆی هەیە و حەقیش(عزوجل) خایلە و خوتوورەی خۆی هەیە، تۆ ئەی کەسی راستگۆ ناتاجیت بە لادانی هەموو ئەم خایلە و ختووراتە و سوکنایی و دڵنیایی بۆ لای خایلە و خوتوورەی حەق(عزوجل)، گەر پشتت کرد لە خایلەی نەفس و خایلەی نارەزوو و خایلەی شەیتان و خایلەی دونیا ئەوا خایلەی دوارۆژت بۆ دێت و پاشان خایلەی فریشتە رووت لێ دەکات و دواجاریش خایلەی حەق(عزوجل) رووت لێ دەکات کە بریتییە لە کۆتا ئامانج، گەر دڵت هاتە راستە لەپای خایلە و ختوورە دەوەستێت و پێی دەڵێت: تۆ کام خایلەیت و لە کێوە هاتووی؟ ئەویش پێی دەڵێت: من خایلەی ئەوە و ئەوەم، من خایلە و خوتوورەی حەقم لە حەقەوە(عزوجل) هاتووم، من ئامۆژگاریکەر و موحیبم، حەق(عزوجل) تۆی خۆشدەوێت، بۆیە منیش تۆم خۆشدەوێت، من نوێنەرم، من بەشی تۆم لە حاڵی پێغەمبەرایەتی.

**ئەی گەنج،** خۆت بخە ژێر مەعریفەی خودا و هەوڵی بۆ بدە، چونکە سەرچاوەی هەموو خێرێکە، گەر گوێڕایەڵی خودات زۆرکرد مەعریفەی خۆی بە تۆ دەبەخشێت، بۆ ئەو مەبەستە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((گەر بەندە گوێڕایەڵی پەروەردگاری

خۆی کرد مەعریفەی خۆی پێ دەدات، گەر وازی لە گوێڕایەڵی پەروەردگاری هێنا لێی وەرناگرێتەوە، بەڵکو لە دڵیدا دەیهێڵێتەوە بۆ ئەوەی لە ڕۆژی دواییدا بیکات بە بەڵگە لەسەری، پێی دەفەرموێت: تۆم بە مەعریفەی خۆم جیاکردەوە، و بەوە چاکەی خۆم لەگەڵ کردی، بۆ کارت نەکرد بەوەی زانیت؟))[1].

**ئەی گەنج**، بە دووڕوویی و زماندرێژی و ڕەوانبێژی و ڕووزەردی و پینەی سەرشان و شانکۆکردنەوە و خۆ سپاردن بە خەڵکی شتێك لە حەقەوە(عزوجل) بەدەست ناهێنیت، هەموو ئەوانە لە نەفس و شەیتانەوەیە و بە دروستکراوان هاوەڵت بۆ خودا داناوە و داوای دونیات لەوان کردووە.

لە قسەکردن خۆت بەدووربگرە و نەفست کەم تەماشا بکە و کاروبارت بشارەوە و لەسەر ئەوە بمێنەرەوە تا پێت دەوترێت: بە نیعمەتی پەروەردگار زمانت بپەژێنە و قسە بکە.

**ئیبن شەمعون(ڕەحمەتی خودای لێ بێت)** کاتێك کەرامەت ڕووی لێ دەکرد دەیوت ئەمە فێڵێکە، ئەمە لە شەیتانەوەیە، لەسەر ئەوە بەردەوام بوو تا پێی وترا: تۆ کێیت و باوکت کێیە؟ بە نیعمەتەکانی ئێمە لەسەر خۆت زمانت بپژێ و باسیان بکە.

موسا(علیه السلام) لە موناجاتیدا لەگەڵ پەروەردگاری دەیفەرموو: پەروەردگارم، ئامۆژگاریم بکە، ئەویش پێی فەرموو: "**أوصیك بي و بطلبي**-وەسیێتت بۆ دەکەم بە خۆم و داواکاریم" موسا(علیه السلام) چوار جار داواکەی دووبارە کردەوە، خودا(عزوجل) هەموو جارێك هەمان شتی وەڵام دەدایەوە، پێی نەفەرموو داوای دونیا و دواڕۆژ بکە، وەك ئەوەی خودا(عزوجل) پێی بفەرموێت ئامۆژگاریت دەکەم بە گوێڕایەڵی خۆم و وازهێنان لە گوناه و یاخیبوون، ئامۆژگاریت دەکەم هەوڵی نزیکبوونەوە لە من بدە، ئامۆژگاریت دەکەم بە یەکتاپەرستی من و کارکردن بۆ من، ئامۆژگاریت دەکەم بە پشتهەڵکردن لە هەرچی شتی ترە جگە لە من، گەر ئەمەی بۆ هاتە ڕاستە و حەقی(عزوجل) ناسی هەرچی شتی ترە ڕەد دەکاتەوە و بە خوداوە هۆگر

---

[1] لم اجد له اصلا، (بەڵام ماناکەی دروستە).

دەبێت و بە کەسان و شتانی ترەوە نامۆ، لەگەڵ خودا پشوو دەدات و ئارام دەبێتەوە و لەگەڵ کەسانی تر ماندوو و شەکەت دەبێت.

خودایە، تۆ شایەتیم بۆ بدە من پێداگری دەکەم لە ئامۆژگاری کردنی بەندەکانت، هەوڵی چاکبوونیان دەدەم، من کەنارگیرم لە هەموو ئەوەی منی تێدام، من لێی بەدەرم وەك دەرچوونی ئێوە لێی لەڕووی مانا و نهێنییەوە، بێ پلە و پایە و کەم ڕێزم گەر لەگەڵی بم لە شتێك لە تەگبیر و تاوتوێکردنەکانی، ئەی خاوەنی خەڵوەتگا و گۆشەنشینان وەرن لە قسەکانم چێژ ببینن گەر تەنها یەك پیتیش بێت، ڕۆژێك، هەفتەیەك هاوەڵیم بکەن بەڵکو شتێك فێربن سوودتان پێبگەیەنێت، هاوار بە حاڵتان، زۆرینەی ئێوە هەوەسبازییە لەناو هەوەسبازیدا، لە خەڵوەتدا خەلکی دەپەرستن، ئەم کارە تەنها بە دانیشتن لە خەڵوەتگا -لەگەڵ نەزانی- بەرهەم نایەت، هاوار بە حاڵت، بەرەو داوای زانست و زانایان و کارکەران هەنگاو هەڵبگرە، تا ڕۆیشتن نامێنێت، برۆ تا لاقەکانت بەگوێت ناکەن، گەر دەستەوسان بوویت دابنیشە، بە ئاشکرات(دەرەوەت) هەنگاو هەڵبگرە، پاشان بە دڵ و مانات، گەر لە دەرەوە و ناوەوە ماندووبوویت و وەستایت نزیکیت لە خوداوە بۆ دێت و دەگەیە بەرەوە، گەر هەنگاوەکانی دڵت پچڕا و هێزی ڕۆیشتنت بەرەو خودا لەدەستدا ئەوە نیشانەی نزیکی تۆیە لە خوداوە(عزوجل)، ئەوکات خۆت رادەستبکە و لەبەردەمیدا رابکشێ، یان خەڵوەتگایەکت لە دەشت و سارا بۆ دروست دەکات یان رووت پێ دەکاتە وێرانە یان دەتگێڕێتەوە بۆ ئاوەدانی و دونیا و دوارِۆژ و جن و مرۆڤ و فریشتە و رۆحەکان دەخاتە خزمەتی تۆوە، گەر نزیکی بۆ بەندەیەك راست و دروست بوو ویلایەت و نوێنەرایەتی بۆ دێت و هەموو ئەوەی لە گەنجینەدایە بۆی دەخرێتە روو و ئاسمان و زەوی و ئەوانەی لەناو ئەو دوانەدان تکاکاری بۆ دەکەن، ئەوەش بەهۆی پلە و پایەی لەلای مەلیك و پاکێتی ناوەوە و نهێنی و نووری دڵی، نابێت ئیسلام و ئیمان لەلای تۆ رووت و بێ پۆشاك بن، بەمە ترس و رۆژوو و نوێژ و شەونخونیت زیاد دەکات، بەمە خوداناسان سەری خۆیان هەلگرتووە و پەیوەندییان بە گیاندارانی دەشت و شاخەکانەوە کردووە و لەسەر گژوگیای زەوی و ئاوی سەرچاوەکان ئاشنایێتییان لەگەڵ ئەوان کردووە، تاریکییان بووە بە خۆر و چرایان

بووه بە مانگ و ئەستێرەکان، زۆری ورێنە و وتـی وتـی و بـەفیڕۆدانی مـاڵ و سامان وازلێبهێنە، لەگەڵ جیران و دۆسـتان و ناسـراوان بـەبێ هـیچ هۆیـەك زۆر دامەنیشە، چونکە ئەوە بریتییە لە هەوەسبازی، زۆربەی ئەوەی بە نێوان دوو کەسدا جاری دەبێت بریتییە لە درۆ و غەیبەت، گوناه و یاخیبوون لە نێوان دوو کەسدایە، هەر کەسێك لە ئێـوە لـە مـاڵ دەردەچـێت بـا دەرچـوونەکەی بـۆ پێویسـتی و بەرژەوەنـدی خـۆی و خانەوادەکەی بێت، هەوڵبدە لە قسەکردندا دەسپێکەر مەبە، بەڵکو قسەکانت وەڵامی پرسـیار بـن، گـەر یـەکێك پرسـیاری لـێ کـردی دەربـارەی شـتێك-گـەر وەڵامەکـەت بەرژەوەندی خـۆت و ئـەوی تێـدابوو- وەڵامـی بـدەرەوە، ئـەگینا وەڵامـی مـەدەرەوە، خوداناسان لە هەموو حاڵ و بارێکیاندا لە پەروەردگاریان دەترسن:

﴿ وَالَّذِينَ يُؤْتُونَ مَا آتَوا وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ ﴾ المؤمنون: ٦٠

ترسی ئەوەیان هەیە لە ناکاو بگیرێن، دەترسن ئیمان لەلای ئەوان رووت و بێ پۆشاك بێت، دانە دانەیەك لە خوداناسان منەت و نیعمەتی خودایان بۆ دێت و دڵیان دەچێتە ناو دەروازەی نزیکی لە خوداوە، مۆڵەتیان دەدرێت بچنە ژوورەوە بۆ لای خودا(عزوجل)، ئەو(سبحانە وتعالى) هەڵیاندەسوڕێنێت و سەرپەرشتکارییان دەکات، دەیانکات بە دۆستان و ئەبدال و پێغەمبەران و مەزنان لە دروستکراوانی، دەیانکات بە ریشسپی و سـوڵتان لەناو بەندەکانیدا، دەیانکات بە نوێنەری خۆی لەسەر زەوی، لەناو زەویدا جێنشینییان دەداتە دەست و ئەوان بۆ خۆی تەنهادەکاتەوە، لە زانستی خـۆی فێریـان دەکـات و بـە حوکمی خۆی دەیانهێنێتە قسە و لە ریزی خۆی ریزداریان دەکات و لە کۆمەکی خۆی بۆ ئەوان رەوانە دەکات، فێریان دەکات چی بۆ ئەوانە و چی لەسەر ئەوانە، پێی باوەڕ لـە دڵیاندا جێگیر دەکات و تاجی مەعریفەت لەسەر سەری باوەڕیـان دادەنێت، قـەدەر و مرۆڤ و جن و فریشتە خزمەتیان دەکەن و لەبەردەستیاندا راوەسـتاون، واژوو لـە دڵ و نهێنیانەوە دەردەچێت، هەریەك لەوانە لە نەفسی خۆیدا فریشتەیەکە و لەسەر جێگـەی دەسـەڵاتی مەملەکەتەکـەی دانیشـتووە و سـەربازەکانی بـۆ چـاککردنی خـەڵکی و هەڵوەشاندنەوەی کارەکانی ئیبلیس بە زەویدا بڵاوە پێ دەکات.

**خەڵکینە**، شوێنپێی خوداناسان هەڵبگرن، هەوڵ و خۆزگەتان خواردن و خواردنەوە و پۆشاك و هاوسەریکردن و کۆکردنەوەی دونیا نەبێت، چونکە هەوڵ و خەمی خوداناسان عیبادەت و وازهێنانە لە عادەت، داوای دەرگای خودا بکەن و لەبەر دەرگاکەیدا رەشماڵ هەڵبدەن، لەبەر ئافەت لە دەرگای حەق(عزوجل) رامەکەن، چونکە ئەو بە بەڵا و ئافەت و نەخۆشی و ئازار تاقیتان دەکاتەوە بۆ ئەوەی ئەو داوا بکەن و لە دەرگاکەی کۆچ نەکەن، لەوانە مەبن سەریان لێشێواوە و نازانن حەق(عزوجل) چی لەوان دەوێت، خودا بپەرستن و لە عیبادەت کردنی ئیخلاصتان هەبێت، گوێتان لێ بووە خودا(عزوجل) چی دەفەرموێت:

﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ۝٥٦﴾ الذاريات: ٥٦

ئێوە ئەمەتان بەدەستهێنا و فێری بوون ئێستا بۆچی واز لە عیبادەتی ئەو دەهێنن و لەسەر رێگەی بەرەو خوداچوون سەر لە خۆتان دەشێوێنن؟ هەر کەسێك عیبادەتی خودا نەکات لەو کەسانەیە کە نازانن بۆچی دروستکراون، ئەوانەی لەسەری پای بەدەستهێنان و حەقیقەتن دەزانن ئەوان بۆ عیبادەت دروستکراون، دەزانن ئەوان دەمرن و زیندوو دەکرێنەوە، ئەوان بەندایەتی بەدیدەهێنن.

**ئەی گەنج**، کۆمەڵێك شتی ناوەکی هەیە تەنها کاتێك پەردەیان لەسەر لادەدرێت کە بە حەق(عزوجل) بگەی، لەبەر دەرگاکەی بوەستی و بە لیقای مەزنان و نوێنەرانی وەستاو لەو شوێنەدا بگەی، هەرکات گەیشتییە دەرگای حەق(عزوجل) و بەردەوام بوویت لە وەستان-لەگەڵ ئەدەبی جوان و سەرداخستن- دەرگاکە بە رووی دڵی تۆدا دەکرێتەوە و راکێشان و نزیکی و نووستن و شەوی زاوایی و چاوڕشتن و دڵخۆشی و ئاسایش و رووداو و قسەکردنی تەنها لە خوداوە دەبێت، ئەی بێئاگایان لە خۆشییەکان، ئێوە لە کوێن؟ دڵی ئێوە چەندە دوورە لەوەی من ئاماژەم پێکرد، وا گومان دەبەن کارەکە ئاسان بێت تا بە زۆرلەخۆکردن و رووپامایی و دووڕوویی بەدەستی بهێنن، ئەم کارە ئاتاجە بە صدق و ئارامگرتن لەسەرچەکوشەکانی قەدەر، گەر کەسێکی دەوڵەمەندی لەشاغی سەرقاڵی بە پاخیبوونەوە لە حەق(عزوجل)

تەوبەت کرد لە هەموو یاخیبوون و هەڵە و تێکەوتنەکان، و ئەوەی ئاشکرایە و ئەوەی پەنهانە، و پاشان رووت کردە دەشت و بیابان و رووی پاکی خودات داوا کرد ئەوکاتە تاقیکردنەوە رووت لێ دەکات، بەڵا بەسەر تۆدا دادەبارێت، لەو بارەدا ئەفست داوای ئەوەت لێ دەکات کە پێشتر لەسەری بوویت لە دونیا و لەشساغی، لێی قبووڵ مەکە و ئەوەی پێ مەدە، گەر ئارامت گرت موڵکی دونیا و دوارۆژ بەدەست دەهێنی، گەر ئارامت نەگرت ئەو دوانەت لەدەست دەچێت، ئەی کەسی تەوبەکار خۆڕاگر بە و ئیخلاصت هەبێت و بە ئەفست بڵێ کاروبارەکان وەردەگەڕێن و بەڵا و ناخۆشییەکان دادەبارێن، پێی بڵێ حەق(عزوجل) رووبەڕووی شەونخونی کردوویتەوە و لە رۆژدا تینووی کردووی و ئەوی لە خانەوادە و جیران و دۆستان و ناسراوان دایبڕیوی، خودا(عزوجل) رق و تووڕەیی لە دڵی ئەوان بەرانبەر بە ئەو داناوە و هیچ کام لەوانە نزیك نابنەوە لە ئەو و پێی تێکەڵ نابن، گوێت لە چیرۆکەکەی ئەیوب(علیه السلام) بووە، کاتێك خودا ویستی خۆشەویستییەکەی بەڕاست بگێڕێت و هەڵیبژێرێت و لەناو ئەودا بەشی هیچ کەسێکی تر جگە لە خودا بوونی نەبێت لە ماڵ و سامان و خانەوادە و منداڵ و شوێنکەتووان تەنهای کردەوە، لە کوخێکدا و لەسەر سەرەنگوێلکێك ئەوی دانا دوور لە ئاوەدانی، تەنها ژنەکەی لەگەڵی مایەوە، خزمەتی خەڵکی دەکرد و خۆراکی بۆ ئەیوب دەهێنا، پاشان پێست و گۆشتی نەما و هێزی لەدەستدا، تەنها بیستن و بینین و دڵی بۆ هێڵایەوە، بۆ ئەوەی سەرسوڕهێنەکانی دەسەڵاتی خودایان پێ ببیستێت و ببینێت، بە زمان یادی خودای دەکرد و بە دڵ موناجاتی دەکرد و بە چاو سەرسوڕهێنەکانی قودرەتی خودای دەبینی، رۆحیشی لەناو جەستەیدا دەهات و دەچوو، فریشتەکان صەڵەواتیان لەسەر دەدا و سەردانیان دەکرد، لە مرۆڤەکان دابڕا و پەیوەست بوو بە فریشتەکانەوە، لە هێز و هەوڵ و هێز دابڕا و بوو بە یەخسیری خۆشەویستی و قەدەر و قودرەت و ویست و بڕیاری پێشینەی خودا، کارەکەی ئارامگرتن بوو، پاشان بوو بە ئاشکرایەکی دەقپێوەگیراو، سەرەتاکەی تاڵ بوو، بەڵام دواجار شیرین بوو، لەناو بەڵاکەیدا ژیانی خۆش و بەتام رووی لێکرد، وەك چۆن ژیانی ئیبراهیم(علیه السلام) لەناو ئاگرەکەدا خۆش و بەتام بوو، خوداناسان لەسەر بەڵا ئارام

دەگرن و وەك ئێوە بێزاری و نیگەرانی دەرنابڕن، شوێنی بەڵاکان جۆراوجۆرن، هەیانە لە دڵدایە، هەیانە لەگەڵ دروستکراواندایە، هەشیانە لەگەڵ دروستکەردایە، خێر نییە لە کەسێکدا ئازاری بەڵا هەنگاوێك لە حەق(عزوجل) نزیکی ناکاتەوە، هەڵپەی عابیدی زاهید لە دونیادا بریتییە لە کەرامات، لە دوارۆژیشدا بریتییە لە بەهەشت،بەڵام هەڵپەی کەسی عاریف لە دونیادا بریتییە لە مانەوەی ئیمان لەسەری و رزگاربوون لە ئاگری خودا (عزوجل) لەدوارۆژدا، بەردەوام هەڵپە و حەزی لەمەدایە تا بە دڵی دەوترێت: ئەمە چییە؟ ئارام بە و دڵنیابەرەوە و دامەزراو بە ئیمان لەلای تۆ و لە تۆوە دامەزراوە، باوەڕداران نوورێك بۆ ئیمانەکەیان بەدەست دەهێنن و تۆش سبەینێ شەفەعەتکاری و قسەت لێ وەردەگیرێت، تۆ دەبیتە هۆی رزگاربوونی خەڵکێکی زۆر لە ئاگر، تۆ لە خزمەتی پێغەمبەرەکەی خۆتدا دەبیت کە سەروەری هەموو تکاکارانە(ﷺ)، بە شتێکی ترەوە خەریك بە، ئەمە واژوویەکە بە مانەوەی ئیمان و مەعریفە و سەلامەتی لە سەرئەنجام و رۆیشتن لەگەڵ پێغەمبەران و نێراوان و صادیقان کە تایبەتانن لە دروستکراوان، هەرکات ئاسایشی سەرئەنجامی بۆ دووبارە دەکرێتەوە ترسی زیاتری لێ دەنیشێت و ئەدەبی جوانتر دەنوێنێ و شوکری زۆرتر دەکات، خوداناسان لە مانای ئەم ئایەتانە تێگەیشتوون:

﴿إِنَّ اللَّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ ﴿١٤﴾﴾ الحج: ١٤

﴿لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ ﴿٢٣﴾﴾ الأنبياء: ٢٣

﴿وَمَا تَشَاءُونَ إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ ﴿٢٩﴾﴾ التكوير: ٢٩

تێگەیشتوون خودا کارایە بەوەی دەیەوێت بیکات، نەك ئەوەی دروستکراوان دەیانەوێت، تێگەیشتوون خودا لە شان و شکۆی بەردەوامدایە، پێشدەخات و دوادەخات، بەرزدەکاتەوە و نزمدەکاتەوە، عیززەتدار دەکات و زەلیل دەکات، دەسەڵات بە کەسێك دەدات و کەسێکی تر کەنارگیر دەکات، کەسێك دەمرێنێ و کەسێك لەدایك دەبێت، کەسێك دەوڵەمەند دەکات و کەسێك هەژار دەخات، بە کەسێك دەبەخشێت و

لە کەسێك دەگرێتەوە، دڵی خوداناسان لەگەڵ خودادا(عزوجل) ئارامییان بۆ نییە، دەیانگۆڕێت و ئاڵوگۆڕیان بەسەردا دەهێنێت، نزیکیان دەکاتەوە و دووریان دەخاتەوە، راستیاندەکاتەوە و دایاندەنیشێنێت، عیززەتیان پێ دەبەخشێت و زەلیلیان دەکات، پێیان دەبەخشێت و لێیان دەگرێتەوە، حاڵ لەسەر خوداناسان گۆڕانی بەسەردا دێت و ئەوان لەسەر پای بەدەستهێنانی بەندایەتی و ئەدەبی جوان و گەردنکەچیدان.

خودایە، ئەدەبی جوانمان لەگەڵ خۆت و تایبەتان لە دروستکراوانت پێ ببەخشە، خودایە بە پەیوەستبوون بە هۆ و شاندادان لەسەری گرفتارمان مەکە، خودایە یەکتاپەرستییەکەمان بۆ خۆت و تەوەکولەکەمان لەسەر تۆ دامەزراو بکە و بە خۆتەوە دەوڵەمەند و بێنیازمان بکە، خودایە وامان لێ بکە پێویستییەکانمان بۆ لای تۆ بگێڕینەوە، خودایە بە گوفتار و کردارمان گرفتارمان مەکە و بەوانەش مەمانگرە، بە بەخشندەیی و لێخۆشبوون و لێبووردەیی خۆت مامەڵەمان لەگەڵ بکە. ئامین.

ڕێگەی حەق(عزوجل) دروستکراوی تێدا نییە، هۆی تێدا نییە، زانراوی تێدا نییە، ئاراستە و دەرگای تێدا نییە، بوونی دروستکراوی تێدا نییە، بونیاد لەگەڵ دونیایە و دڵ لەگەڵ دوارۆژە و نهێنی لەگەڵ مەولایە(عزوجل)، نهێنی حاکمی سەر دڵە و دڵ حاکمی سەر نەفسی دڵنیا و ئارامە، نەفسی دڵنیا و ئارامیش حاکمی سەر بونیاد و ئەندامەکانە، بونیاد و ئەندامەکانیش حاکمی سەر دروستکراوانن، گەر ئەمە هاتە راستە و بۆ بەندە تەواو بوو جین و مرۆڤ و فریشتە دەکەونە بەر دەستی، هەموویان بە پێوە دەوەستن و ئەو لە مەقامی دۆستایەتی نزیکی لە خوداوە دانیشتووە، ئەی کەسی دووڕوو بە دووڕوویی و زۆرلەخۆکردنەکەت ئەمە بەدەست نایەت، تۆ ناموس و قبوڵبوونی خۆت لە دڵی خەڵکاندا گەشە پێ دەدەی، تۆ دەتەوێ خەڵکی دەست ماچ بکەن، تۆ لە دونیا و دوارۆژدا شوومیت لەسەر نەفسی خۆت و ئەوانەی پەروەردەیان دەکەی و فەرمانیان پێ دەکەی شوێنت بکەون، تۆ ریابازی دەحاڵی تاڵانکەری ماڵ و سامانی خەڵکیت، بۆیە گومانی تێدا نییە بانگەکەت وەڵام نادرێتەوە و لە دڵی صادیقاندا جێگەت نابێتەوە، تۆ لەسەر زانست خودا گومڕایی

کردوویت، کاتێك تەمومژ ڕەوایەوە پیاوانی حەق(عزوجل) لەسەر ئەسپ و حوشتری بەهێز دەبینی، تۆش لەسەر گوێدرێژێکی پەککەوتوو لە دوایانەوە شەیتانەکان و ئیبلیسە سۆزانییەکان داگیرت دەکەن، تێبکۆشن بۆ ئەوەی دەروازەی نزیکی لە خوداوە بەڕووی دڵی ئێوەدا دانەخرێت، کەسانێکی ژیرمەند بن، ئێوە لەسەر هیچن، هاوەڵی شێخێکی زانا بە حوکمی خودا(عزوجل) بکەن، زانستەکەی ڕێگەی خوداتان پێ نیشان دەدات، هەرکەسێك سەرفراز نەبینێت سەرفرازی بەدەست ناهێنێت، هەرکەسێك هاوەڵی زانایانی کارکەر نەکات ئەوا وەك خاکە و ڕێنیشاندەر و دایکی بۆ نییە، هاوەڵی کەسێك بکەن هاوەڵی لەگەڵ خودا(عزوجل) کردووە، هەریەکێك لە ئێوە کاتێك شەو دادێت و خەڵکی دەخەون و دەنگەکان خامۆش دەبن با هەڵبستێت و دەستنوێژ بگرێت و دوو رکات نوێژ بکات و بڵێ: خودایە، بەندەیەکی صالحی نزیك بە خۆتم پێ نیشان بدات تاکو ڕێگەی تۆم پێ بناسێنێت و ڕێگەی تۆم پێ نیشان بدات، هەردەبێ هۆ بگریتە بەر، خودا(عزوجل) دەیتوانی بەبێ پێغەمبەران(علیهم السلام) خەڵکی هیدایەت بدات، خەڵکانی ژیرمەند بن، ئێوە لەسەر هیچن، لە بێئاگایتان بەئاگا بێن، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:

((هەرکەس بە رای خۆی بێنیاز ببێت گومرا دەبێت))[1].

بیشکنە و بزانە کێ دەبێتە ئاوێنەی رووی ئایینەکەت، وەك چۆن تەماشای ئاوێنە دەکەیت و رووی دەرەوە و مێزەرە و پرچت ڕێکدەخەی، کەسێکی ژیرمەند بە، ئەم هەوەسبازییەت لەچییە، دەڵێیت: ئاتاج نیم بە کەسێك فێرم بکات، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((باوەڕدار ئاوێنەی باوەڕدارە))[2].

گەر ئیمانی باوەڕدار ڕاست و دروست بوو دەبێت بە ئاوێنە بۆ هەموو خەڵکی، رووی ئایینەکەی خۆیان لە ئاوێنەی قسەکانی ئەودا دەبیننەوە کاتێك دەیبینن و لێی نزیك دەبنەوە.

---

[1] ذكره القرطبي في تفسير آل عمران.

[2] حسن، رواه ابو داود.

ئەم هەڕەسبازییە چییە؟ هەموو ساتێك داوا لە لە پەروەردگارتان دەکەن خواردن و خواردنەوە و پۆشاك و هاوسەر و ڕۆزیتان بۆ زیاد بکات، ئەوە شتێکە کەم و زیاد ناکات با هەموو ئەوانەش دوعا دەکەن دوعاگیراوبن و داوای زیادبوونی ڕۆزی بۆ ئێوە بکەن، بە قەدەر گەردیلەیەك ڕۆزیتان زیاد و کەم ناکات، ئەوە کارێکە لێبووەتەوە، بەوەوە سەرقاڵ بن فەرمانتان پێکراوە و خۆتان بگرنەوە لەوەی ئەهیتان لێکراوە، خەریك مەبن بە شتێکەوە هەر دەبێت ڕووتان لێ بکات، چونکە هاتنەکەی دەستەبەر کراوە، بەشەکان لە کاتە دیاریکراوەکانی خۆیاندا ڕووتان لێ دەکەن، هەیانە تاڵە و هەیانە شیرین و هەیانە خۆشتان دەوێ و هەشیانە لێیان بێزارن، خوداناسان دەگەنە حاڵەتێك لەگەڵیدا دوعا و داوا نامێنێتەوە، داوای ڕاکێشانی بەرژەوەندی و پاڵنانی زیانبەخشەکان ناکەن، دوعاکانیان لە دڵەوە فەرمانیان پێ دەکرێت، هەندێ جار لە پێناوی خۆیان و هەندێ جاریش لە پێناوی دروستکراوان، ئەوان زمانیان بە دوعا دەگرێتەوە بەبێ ئەوەی ئاگایان لە خۆیان بێت.

خودایە، لەگەڵ خۆت و لە هەموو حاڵ و بارێکدا ئەدەبی جوانمان پێ ببەخشە، ڕۆژوو و نوێژ و یادی خودا و هەموو عیبادەتەکان لەگەڵ هەویری بوونی تێکەڵ دەبن و ئاوێتەی گۆشت و خوێنی دەبن، پاشان لە هەموو حاڵ و بارێکیدا پارێزگاری لە خوداوە(عزوجل) بۆ دێت، بۆ تەنها چرکەیەکیش لە کۆت و بەندی حوکم جیانابێتەوە و لەدوای حوکمەوە هەنگاو هەڵدەگرێت، حوکم وەك کەشتی وایە، ئەو لەسەری سواربووە و لە دەریای قودرەتی پەروەردگاریدا(عزوجل) ڕێگە دەبڕێت، بەردەوام دەبێت لە ڕۆیشتن تا دەگاتە کەنارەکانی دوارۆژ، تا دەگاتە کەنارەکانی لوتف و دەستی نزیکی لە خوداوە، ئەو جارێك لەگەڵ دروستکراودایە و چەندین جاریش لەگەڵ خودا(سبحانه وتعالى)، خەریکبوون و ماندووبوونی لەگەڵ دروستکراوان و ناسوودەیی و پشووی لەگەڵ پەروەردگاری.

**هاوار بە حاڵت.** ئەی دووڕوو، تۆ لەمە هەواڵێکت نییە.

**هاوار بە حاڵت.** لە کاروبارەکانی تۆدا شتێك لەم بابەتە بوونی نییە، ئەی ئەوەی لە خەڵوەتدا دانیشتووی و دڵت بە خەڵکی پڕ بووە گوێتان لە هاواری من نییە بۆ سەر ئێوە و بۆ لای ئێوە، ئایا ئێوە کەڕ و لاڵن؟ هەستن وەرن بۆ لام، بە خراپی ئەدەب و

کردارتـان مامەڵـەتان لەگـەڵ ناکـەم و قسـەتان بـۆ ناکـەم، بـەڵکو بـە نـەرموونیانی خودا(عزوجل) و مۆڵەتی خودا لەگەڵتان نەرمونیان دەبم، لە ژێری قسەکانم رامەکـەن، چونکە ئەو قسانە لە منەوە نین، من بەوە هاتوومەتە گۆ کە دەیخەنە سەر زمانم.

**ئەی گەنج**، خوداناسان لە عیبادەتی خودادا(عزوجل) لە رۆژەوە بۆ شـەو خـەریکن، لەگەڵ ئەوەش ئەوان لەسەر پـای تـرس و ئاگـاهین، لـە سـەرئەنجامی خـراپ دەترسـن، نازانن زانستی خودا لە ئەواندا چییە و سەرئەنجامیان چی دەبێت، بۆیـە-بـە حـوزن و پەستی و گریانەوە- رۆشنایی لە تاریکی دەدەن لەگەڵ بەردەوامی نوێژ و رۆژوو و حەج و هەموو عیبادەتەکانی تر، بە دڵ و زمانیان یـادی خودایـان کـرد، کاتێـك گەیشـتنە دوارۆژ چوونە ناو بەهەشتەوە و رووی حەقیان(عزوجل) بینی و گەیشتن بەو رێز و پلە و پایەی بۆیان دانرابوو، لەسەر ئەوە حەمدی پەروەردگاریان کرد و وتیان:

﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَذۡهَبَ عَنَّا ٱلۡحَزَنَ﴾ فاطر: ٣٤

بۆ خودا کۆمەڵێك بەندە هەن کە مامۆستای خەڵکین، ئەوانە و مامۆستاکانیان و پێشەواکانیان و سەرکردەکانیان و مەلیکەکانیان دەڵێن: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَذۡهَبَ عَنَّا ٱلۡحَزَنَ﴾ لە دونیادا بەر لە هاتنی دوارۆژ، گەر دڵیان گەیشتە دەرگای پەروەردگاریان (عزوجل) و بینیان کراوەیە و پێشوازییەکی گەرمیان لە پێشوازیکەرانەوە لێ دەکرێت، ئەوان ریزیان بەستووە و چاوەڕوانی هاتنی ئەوانن، سەلامیان لێ دەکەن و لەبەردەمیاندا سەر ئەوی دەکەن، ئەوکات دەچنە ناو خانەی نزیکی لە خوداوە، لەوێ شتانێك دەبینن چاو نەیبینیوە و گوێ نەیبیستووە و وەك خایلە و ختوورە بە دڵی مرۆڤدا گوزەریان نەکردووە، دەڵێن: حەمد و سەنا بۆ ئەو خودایەی حوزنی دووری و حوزنی حیجابی لەسەر ئێمە لادا، حەمد و سەنا بۆ خودا کە بە دونیا و دوارۆژ و دروستکراوانە سەرقاڵی نەکردین، حەمد و سەنا بۆ خودا کە بۆ خۆی و نزیکی لەخۆیەوە هەڵیبژاردین و خەم و دڵتەنگی دابڕان لە خۆی و خەریکبوون بە دروستکراوانەوە لە ئێمە کردەوە، حەمد و سەنا بۆ خودا کە یەکلابوونەوەی بۆ خۆی پێبەخشین:

﴿إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٞ شَكُورٌ﴾ فاطر: ٣٤

ئەی گەنج، گەر ئیمانەکەت دامەزراند و بە خانەی مەعریفەت گەیشتیت پاشان گەیشتییە دۆڵی زانست، پاشان دۆڵی فەنا لە خۆت و خەڵکی، پاشان بوون بە خوداو، نەك بە خۆت و خەڵکییەوە ئەوکات حوزنەکەت نامێنێت، پارێزگاری خزمەتت دەکات و پاسەوانی ئابڵۆقەت دەدات و کۆمەکی لەبەردەستدا سەری ئەوی دەکات و فریشتەکان بە دەوروبەری تۆدا دەڕۆن و رۆحەکان دێن بۆ لات و سەلامت لێ دەکەن و خودا(عزوجل) لەناو دروستکراوەکانیدا شانازیت پێوە دەکات و سەرنجەکانی چاودێریت دەکەن و بەرەو خانەی موناجات و نزیکی و هۆگری بە خوداوە راتدەکێشن، ئەوانەی بەبێ پاسەوانێك دانیشتوون و نایەن بۆ لای من زیانۆمەندن، هاوار بە حاڵت، لەو مەقامەی تیایدا دامەزراوم شانشانێنم لەگەڵ دەکەی ناتوانی و بە شانشانێن شتێکت بەردەست ناکەوێت، ئەمە شتێکە لە ئاسمانەوە بۆ زەوی دادەبەزێت، خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا عِندَنَا خَزَائِنُهُ وَمَا نُنَزِّلُهُ إِلَّا بِقَدَرٍ مَّعْلُومٍ ۝٢١ ﴾ الحجر: ٢١

بارانی رەحمەت لە ئاسمانەوە بۆ سەر زەوی دادەبارێت پاشان گژوگیای لێوە سەوز دەبێت، ئەم کارە لە ئاسمانەوە بۆ سەر زەوی دڵان دادەبەزێت، دڵان دێنە لەرزە و هەژان و هەموو خێرێکیان تێدا دەڕوێت، نهێنی و حوکم و یەکتاپەرستی و تەوەکول و موناجات و نزیکی لە خوداوە(عزوجل) لەو دڵانەدا سەرهەڵدەدەن، ئەوکات ئەو دڵە سەوزی و درەخت و بەروبوومی تێدا پەیدا دەبێت، دەشت و چۆڵ و دەریا و رووبار و چیای تێدا سەرهەڵدەدەن، دەبێتە ئەو شوێنەی مرۆڤ و جین و فریشتە و رۆحەکان کۆدەکاتەوە، ئەمە شتێکە لەودیو ئەقڵەوەیە، قودرەتێکی رووت و ویست و زانستێکە تایبەت بە خودا و بۆ دانە دانەیەکە لە دروستکراوانی خودا، تێبکۆشن تا دەکەونە ناو تۆڕی قسەکانی من، دانیشتن و قسەم تۆڕێکە چاوەڕوان دەبم تا یەکێك لە ئێوەی تێدەکەوێت مەجلیسی من بۆ خودایە نەك بۆ خۆم، وەڵامم بدەنەوە خودا رەحمتان پێ بکات، شوێنم بکەون تا هەڵتانبگرم بۆ بەر دەرگای حەق(عزوجل)، راستگۆیی بانگکەری حەقە(عزوجل) و درۆزنی بانگکەری شەیتان، حەق شتێکە و باتڵیش شتێکی تر، هەردووکیان ئاشکران لەلای هەر باوەڕدارێك بە نووری ئیمانەکەی تەماشا بکات، ئێوە ئەی ئەهلی عێراق بانگەشەی زیرەکی دەکەن کەچی کەسی راستگۆ لە

درۆزن و حەق لە باتڵ جیاناکەنەوە، زیانی بەدرۆزانینەکەتان بەسەر خۆتاندا دەشکێتەوە و من باکێکم پێی نییە، موریدی حەق(عزوجل) بەهەشتی ئەوی ناوێت و لە ئاگرەکەی ناترسێت، بەڵکو تەنها رووی پاکی خودای دەوێت، هیوای نزیکییە لە خوداوە و ترسی دووری و دابڕانی هەیە، تۆ یەخسیری دەستی شەیتان و ئارەزوو و نەفس و دونیا و حەزەکانی و هیچ هەواڵێکت لە خۆت نییە، دڵت لە کۆت و بەندایە و هەواڵێکت لە خۆت نییە.

خودایە ئەو دڵە و ئێمەش لەو یەخسیربوونە رزگار بکە. ئامین.

دەست بە عەزیمەتەوە بگرن و پشتهەڵبکەن لە روخسەت، هەرکەسێك پەیوەست بوو بە روخسەتەوە و پشتیهەڵکرد لە عەزیمەت ئەوە ترسی تیاچوونی دینەکەی لەسەرە، عەزیمەت بۆ پیاوانە، چونکە سواربوونی هەڕەشە و ترسناکییە و ماندووکەر و تاڵاوە، روخسەتیش بۆ منداڵان و ژنانە، چونکە ئاسانترە.

ئەی گەنج، هەوڵی ریزی یەکەم بدە، چونکە ریزی پیاوانی ئازایە، لە ریزی دواوە مەوەستە، چونکە ریزی ترسنۆکەکانە، ئەم نەفسە بەکاربهێنە و لەسەر عەزیمەت رایبهێنە، چونکە چەندی لێ بنێیت شانی هەڵدەگرێت، گەر گۆچانی لێ بەرزنەکەیەوە دەخەوێت و کۆڵەکەی پشتی فڕێ دەدات، بە دەمیەوە خەندەیەك مەکە و چاوێکی بەزەیی پێ مەدە، چونکە ئەو بەندەیەکی لار و خراپە، ئەو تەنها بە گۆچان کار دەکات، تێری مەکە مەگەر بزانیت تێرکردن گومڕای ناکات و بەرانبەر بە تێرکردنەکەی کار دەکات.

سوفیانی سەوری(رەحمەتی خودای لێ بێت) عیبادەتی زۆر بوو، خواردنی زۆریشی دەخوارد، دەیوت گەر تێر بخۆم گوێدرێژەکەم بار دەبات، مەبەستی نەفسی خۆی بوو، پاشان هەڵدەستا بۆ عیبادەت و بەشێکی باشی لێ وەردەگرتەوە.

لە یەکێك لە خوداناسانەوە دەڵێت: سوفیانی سەوریم بینی ئەوەندەی خوارد تا لە ناوەوە لێی بێزار بووم، پاشان نوێژی دەستپێکرد و گریا تا بەزەییم بە حاڵیدا هاتەوە، لە زۆری خواردندا شوێنی "سوفیان" مەکەوە، بەڵکو لە زۆری عیبادەتدا شوێنی

بکەوە، چونکە تۆ سوفیان نیت، نەفست تێر مەکە وەك ئەو تێری دەکرد، چونکە تۆ وەك ئەو ناتوانی نەفسی خۆت بگریتە دەست، تێبکۆشە و هەوڵبدە لە حەرام خۆت بەدوور بگریت و حەڵاڵیش کەم بکەیەوە، لەباری بەهێزی ئیمان و یەقیندا لە هەموو شتێك زوهد بکە بۆ ئەوەی بچیتە ریزی بەندەکانی خوداوە(عزوجل).

گەر زوهدەکەت هاتە دی پێت دەبەخشێت و نیعمەتی خۆیت بەسەردا دادەبارێنێت، جا یان بە ناوەندێك(هۆیەك)ەوە یان پێکهێنان و سەرهەڵدان(تکوین) دەداتە دەستی دڵت، قسە نییە تا نەچیتە ریزی بەندەکانی خوداوە، نەك بەندەی خەڵکی و هۆیەکان، نەك بەندەی دونیا و بەشی دونیایی و حەز و شەیتان، نەك لە بەندەکانی خۆشەویستی پلە و پایە و کۆتوبەند بە رووتێکردن و پشتهەڵکردنی ئەوانەوە، بەخێر بە دەستی حەمد و سەنا و زەمی دەمی ئەوانەوە، ئەمە شتێکە چاك نابێت، دڵت هەنگاوێك بەرەو دەرگای حەق(عزوجل) هەنگاوهەڵناگرێت لە کاتێکدا تۆ لەناو خانەی نەفس و خانەی سروشت و ئارەزوودای، من دەبینم تۆ بەهەمیشەیی بە دروستکراوان و هۆیەکانەوە کۆتوبەندی، ئەمە تاکەی؟ لە منەوە فێربە چۆن خۆت لە کۆت و بەندی ئەوانە قوتار دەکەی، ئەی نەزان، چۆن دڵت حەق(عزوجل) دەبینێت لە کاتێکدا پڕیووە لە دروستکراو، چۆن دڵت دەرگای مزگەوت دەبینێت لە کاتێکدا تۆ لە ماڵەوە دانیشتووی؟ هەرکات هەموو شتێکت هەڵدایە پشتەوە ئەوانە دەبینی، هەتا لەگەڵ دروستکراوان بیت دروستکەر نابینیت، هەتا لەگەڵ دونیا بیت دوارۆژ نابینیت، هەتا لەگەڵ دوارۆژ بیت پەروەردگاری دونیا و دوارۆژ نابینیت، گەر لە هەموو ئەوانە هاتییە دەرەوە نهێنیت بە پەروەردگارت دەگات نەك لە شێوە و رووالەتدا بەڵکو لەرووی ماناوە، کارکردن بۆ دڵە و ماناش بۆ نهێنی، خوداناسان پشتیان کرد لە بینینی کردارەکانی خۆیان، هەموو چاکەکانی خۆیان لەیاد کرد و داوای پاداشتیان نەکرد لەسەر ئەو کارانە، بۆیە گومانی تێدا نییە خودا لە خانەی مانەوەی فەزڵی خۆیدا ئەوانی نیشتەجێ کرد، لەو شوێنە ماندووبوون و ژاوەژاو روویان لێ ناکات، هەر بەو جۆرە لە دابڕان و لاوازی دووردەکەونەوە، لەوێ کەسابەت و ماندووبوون و شەکەتی بوونی نییە.

هەندێ لە ئەهلی تەفسیر دەڵێن مانای ئایەتی: ﴿لَا يَمَسُّنَا فِيهَا نَصَبٌ﴾ فاطر: ٣٥ واتە: خەم و پەژارەی پەیداکردنی نان و بەدەستهێنانی و ئەرك و داوای ماڵ و منداڵ لە بەهەشت بوونیان نییە، بەهەشت فەزڵێکی گشتییە، خێرێکی گشتییە، ناسوودەییەکی گشتییە، پێدانێکە بەبێ بەرانبەر، هەموو ئەمانە لەسەر ئامادەبوونی دڵت وەستاوە، نەك وەستان بە هۆیەکەوە لە دونیا یان دوارۆژ یان دروستکراو، تۆ کاتێك ئامادەبوونی دڵت بۆ خودا دێتە راستە خۆت بڕێنیت و یادی خودا بەدەستبهێنیت، گەر تەماشا بکەی مردن ببینیت، گەر گوێگریت مردن ببیستیت، راستەقینەی یادی مردن بە ئاگاهی تەواوەوەیە، رقت لە حەزەکان ببێتەوە و بەڕووی خۆشییەکاندا رابوەستیت، بیر لە مردن بکەنەوە، چونکە لە دەستی قوتار نابن، گەر دڵ هاتە راستە هەرچی شتی ترە جگە لە خودا لەبیری خۆ دەباتەوە، خودای دێرینی هەربووی هەتاهەتایی، جگە لە ئەو(سبحانە وتعالى) هەرچی شتی ترە روودراوە، گەر دڵ راست و دروست بوو ئەو قسەیەی لە ئەوەوە دەردەچێت راست و دروست دەبێت، دەبێت بە دڵ و رەدکەرەوەیەك رەدی ناکاتەوە، دڵ لەگەڵ دڵ گفتوگۆ دەکات، نهێنی لەگەڵ نهێنی، ئاشکرا لەگەڵ ئاشکرا، مانا لەگەڵ مانا، کرۆك لەگەڵ کرۆك، راست و دروست لەگەڵ راست و دروست، ئەوکاتە قسە لە ئەوەوە بۆ دڵان وەك تۆوێك وایە لە زەوییەکی نەرمی بەپیتی ئاوهەڵگردا سەوز دەبێت، گەر دڵ راست و دروست بوو دەبێتە درەختێکی پەلوپۆداری خاوەن گەڵا و بەر، دەبێتە جێگەی سوود و قازانج بۆ دروستکراوان، گەر دڵ راست و دروست نەبێت وەك دڵی ئاژەڵانی لێ دێت رووالەت بەبێ مانا، دەفرێکی خاڵی، مرۆڤ و جن و فریشتە، درەختێك بەبێ بەر، قەفەسێك بەبێ باڵندە، ماڵێکی چۆڵی بێ خاوەنماڵ، گەنجینەیەك کە درهەم و دینار و موجەوهەراتی تێدا کۆکراوەتەوە و کەسێك نییە خەرجی بکات، جەستەیەك بەبێ رۆح وەك ئەو جەستانەی شێواون و بوون بە بەرد، وێنەیەك بەبێ مانا، دڵی پشتهەڵکەر لە خودا(عزوجل) و بێباوەڕ بە ئەو شێواوە، بۆیە خودا(عزوجل) بە بەردی شوبهاندووە و دەفەرموێت:

﴿ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّن بَعْدِ ذَٰلِكَ فَهِيَ كَالْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً﴾ البقرة: ٧٤

(نەفس لە دونیا دەرناچێت تا بەشی خۆی وەرنەگرێت، لە خودا بترسن و بە جوانی داوای بەشی خۆتان بکەن)، بەشەکەت لە حەقەوە(عزوجل) ببینە نەك لە دروستکراوەوە، هۆکارەکان پەردەن، دەرگاکانی مەلیك داخراون، گەر لە بەشی دونیا پشتت هەلکرد دەرگایەکت بۆ ناسینی مەلیك لێ دەکرێتەوە، دەرگای نهێنی داخراوە و بەبێ هەوڵ و هێزی تۆ دەکرێتەوە، باوەڕدار لە سروشتی خۆی دێتە دەرەوە و روو لە پەروەردگاری دەکات، لە کاتێکدا ئەو لەسەر رێگەیە لەناکاو دەکەوێتە دەستی ئافەت لە نەفس و ماڵ و سامانیدا، دەگەڕێتەوە بۆ گوناهەکانی، دەگەڕێتەوە بۆ ئەدەبی خراپی و شکاندنی سنووری شەرعی پەروەردگاری، خوداناس پەنا نابات بۆ دوعا، پەنا نابات بۆ هیچ کەسێك جگە لە پەروەردگاری، بەڵکو بیر لە گوناهەکانی خۆی دەکاتەوە و سەرزەنشتی نەفسی خۆی دەکات تا لەوە دەبێتەوە دەگەڕێتەوە بۆ قەدەر و خۆڕادەستکردن و سپاردن بە خودا لە دڵەوە، لە کاتێکدا ئەو لەو دۆخەدایە لەناکاو دەرگایەك دەکرێتەوە:

﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ۝٢﴾ الطلاق: ٢

تاقیاندەکاتەوە بۆ ئەوەی تەماشابکات چۆن کار دەکەن.

﴿وَبَلَوۡنَٰهُم بِٱلۡحَسَنَٰتِ وَٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ الأعراف: ١٦٨

دڵی رۆڵەی ئادەم بە خێر و شەڕ و عیززەت و زەلیلی و دەوڵەمەندی و هەژاری تاقیدەکرێتەوە تا داندەنێت بە نیعمەتەکانی خودادا(عزوجل) کە بریتییە لە شوکر، شوکریش عیبادەتێکە زمان و ئەندامەکان ئاجوڵێنێت، لە باری بەڵاشدا ئارامگرتنی دەوێت، دانەدنێت بە گوناه و تاوانەکانی خۆیدا تا هەنگاوی چاکە و هەنگاوی خراپ کۆتایی پێ دێت دەگاتە دەرگای مەلیك و هەنگاوی شوکر و هەنگاوی ئارامگرتن هەڵدەگرێت و پێشەوای ئەو بریتی دەبێت لە کۆمەکی و سەرکەوتن، دەرگای مەلیك دەبینێت، شتێك دەبینێت چاو نەیبینیوە و گوێ نەیبیستووە و بە خەیاڵ و خەتووڕەی دڵی مرۆڤدا گوزەری نەکردووە، نۆرەی چاکە و خراپە کۆتاییان پێدێت، گفتوگۆ و قسەکردن و دانیشتن لەگەڵی دێتە بەرەوە، ئایا ئەمە تێدەگەی ئەی بابای عێراقی، ئەی

حوشتری بەرداشی شاش، ئەی گەمژەی نەزان، تۆ لە هەستان و دانیشتنی بێ ئیخلاصدای و بۆ خەڵکی نوێژ دەکەی، ڕۆژوو دەگری و چاوت لە هاتنی سفرە و سینی خەلکە، چاوت لەو شتانەیە لە ماڵەکانی ئەواندایە، ئەی دەرچوو لە هەموو خەڵکی، ئەی ئەو کەسەی لە وەسفی صادیقان و ڕەبانییەکان بەدەری، تۆ نازانی من گەورەی ئێوەم، مامۆستای ئێوەم، شارەزاترینی ئێوەم، تێکۆشانی خۆت ئەنجام بدە، سفرە و خوانت لە من بگرەوە، شمشێرەکەت لە من رابکێشە، تۆ لەسەر هیچ شتێك نیت، ئەی گچکۆکەی نەزان من پەت و داوی پیلانی ئێوە دەپسێنم، ئامۆژگاریم بۆ تۆیە و بەزەییم بە تۆدا دێتەوە، من دەترسم تۆ وەك زەندیقێکی ریاکاری دەجار بمریت، لە گۆڕەکەتدا سزای دوورووان بدرێیت، بۆیە دەستبکێشەوە لەوەی تۆی تێدای، پۆشاکەکەت فرێ بدە و پۆشاکی تەقوا بپۆشە، تۆ بەم نزیکانە دەمریت، هیچ دوژمنایەتییەك لە نێوان من و تۆدا نییە، لە داهاتوودا بیر لەوە دەکەیەوە من پێت دەڵێم، بینینی کەسی صالح هەواڵ لە حاڵی دەدات، هەرکەس خودا بناسێت زمانی کۆڵ دەبێت، بە خوداوە قسە دەکات و بە خوداوە بێنیاز دەبێت و هەژاری بۆ ئەو دەردەبڕێت، کاتی خۆی لە وڵاتەکەی خۆم منداڵ بووم گوێم لێ بوو یەکێك پێی دەوتم: (ئەی موبارەك)، منیش لەو دەنگە هەڵدەهاتم، لە خەڵوەتدا گوێم لێ دەبوو یەکێك پێی دەوتم: (من دەبینم تۆ لە خێردا دەژیت)، گەر سەرفرازیت دەوێت بە منەوە پابەند بە، گەر یەکێکت بینی لە من رادەکات بزانە ئەو کەسە کەسێکی دووڕووە، باوەڕدار ئەو کەسەیە گەر دوو چاوی سەری داخات دوو چاوی دڵی دەکرێنەوە، لەو جێگەیە دەبینێت، گەر دوو چاوی دڵی داخات دوو چاوی نهێنی دەکرێنەوە، کاری خودا و ئاوتوێکردنەکانی لەناو دروستکراوانیدا دەبینێت، لەوەی خودا(عزوجل) لەگەڵ موسا(علیه السلام) گفتوگۆی پێکرد ئەم ئایەتە بوو:

﴿إِنِّي ٱصْطَفَيْتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ بِرِسَٰلَٰتِي وَبِكَلَٰمِي﴾ الأعراف: ١٤٤

تۆم لە خۆم نزیك کردەوە، ڕۆژێك مەڕی دەلەوەڕاند یەکێك لە مەڕەکان تاربوو(هەڵهات)، ئەویش شوێنی کەوت تا گرتی، ئەو زۆر ماندوو بوو، مەڕەکەش

بە هەمان شێوە، موسا(علیه السلام) مەڕەکەی بەخۆداگوشی و فەرمووی: (خۆت و منت ماندوو کرد)، داوای کەسی بێبەش وردبوونەوەیە لە هۆی بێبەشبوونەکەی و تەوبە لەو هۆیە و گەردنکەچبوون بۆ خودا، مەعصومان لە هەموو رووییەکەوە پارێزراون، سەرهەڵدانیان و پێکهێنان(تکوین) بۆ نییە، سەرهەڵدان و پێکهێنان لە رێگەدایە، قسە نییە تا دەشت و سارا و چۆڵ و بیابان و دوو وشکانی و دوو دەریا دەبڕێت، وشکانی دروستکراوان و وشکانی نەفس، دەریای حوکم و دەریای زانست و کەناراو، خوداناسان نە شەویان هەیە نە رۆژ، خواردنیان خواردنی نەخۆشانە و خەوتنیان خەوتنی کەسانێك کە نوقم بوون، قسەکردنیان لە پێویستییەوەیە، هەرکەس خودا بناسێت زمانی کۆڵ دەبێت، بەڵام گەر خودا بیەوێت ئەو دەناسێنێت، بەبێ ئامراز و ئامێر، بەبێ رێکخستن، بەبێ ماوە و بەبێ هۆ دێتە قسەکردن، جیاوازی نییە لە نێوان زمان و پەنجەکانی، کەوابوو نە پەردە، نە کۆتوبەند، نە دەرگا و نە دەرگاوان، نە مۆڵەت و نە وەرگرتنی مۆڵەت، نە کارپێدان و نە کەنارگیرکردن، نە شەیتان و نە سوڵتان، نە چەنان و نە بەنان(سەری پەنجە) بوونیان نییە، پاشان فەرمووی:

ئەوەی ئەمڕۆ بزر و نادیار بوو زیانۆمەند بوو، یەکەم هەنگاو هەڵنەگیرێت دووەم هەنگاو نایەت، یەکەم هەنگاو دەرچوونە لە ماڵ و بوونی خۆت و دووەم هەنگاو نیعمەتەکانی خودایە.

﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٢﴾ الفاتحة: ٢،

وەستان لەبەر دەرگکەی: ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ۝٥﴾ الفاتحة: ٥،

لەکاتی بینینیدا: ﴿كَلَّا لَا تُطِعۡهُ وَٱسۡجُدۡ ۝١٩﴾ العلق: ١٩

دوای بینینی خودا(عزوجل) نیعمەت نادرێتە پاڵ هیچ کەسێکی تر جگە لە ئەو، تۆ هاوەڵدانەری، تۆ نیعمەتەکانی خودا دەدەیە پاڵ کەسانی تر، نیعمەتەکان لە نەفسی خۆتەوە نەهاتوون، پشترینەکەت ببڕە و وەرە، پەند بە رووالەتت نییە تا ناوەوە تەوبە دەکات و نهێنی و پەنهانت بە پەروەردگارەوە پالّفتە دەبن.

ئەی گەنج، ئەی منداڵ، پێغەمبەر(ﷺ) چەندین ساڵ پێغەمبەر بوو دەیشاردەوە، هەندێکی هەندێکی تری خوارد تا پێی وترا: ﴿بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ﴾ المائدة: ٦٧

تۆ شتێك دەبینی ئاشکرای دەکەی و نایشاریتەوە، هەندێ شەك لە ماڵەکەتدا بەسەر تۆدا بەربوویەوە، دەرگاکەت کردەوە و وتت: لێم بگرن، لەوانەیە جیرانەکانت خاوەنی ئەو شتە بن، خوازراو بێت، دانراوێك بێت لەلای ئێوە، **چوار شت چاکبوونی دڵی پێوەیە:**

**یەکەم:** وردبوونەوە لە پارووەکەت، **دووەم:** خۆیەکلاکردنەوە بۆ گوێڕایەڵی و عیبادەت، **سێیەم:** پارێزگاری لە کەرامەت(ڕێز و شکۆ)، **چوارەم:** وازهێنان لەو شتانەی سەرقاڵت دەکەن و لەخودا بێئاگات دەکەن.

**وردبوونەوە لە پاروو:** تۆ هەواڵێکت لەبارەیەوە نییە، ئەم کارە بە وەرعی تێروتەواو و وەستان لەبەردەستیدا و داوای کۆمەکی لێی بۆ پارێزگاری ئاین دێتە دی، باوەڕدار لە خواردن و خواردنەوەیدا دەوەستێت، داوای مۆڵەت لە قورئان و فەرموودە دەکات، تا لە مەولای خۆی نزیك دەبێتەوە و فەرمانەکانی جێبەجێ دەکات و خۆی لە نەهیکراوەکانی دەگرێتەوە و بە زانستی ئەو زانستی دەبێت و بە سەرخستنی ئەو سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت بەر لە مردن پەیمانەکەی پێ نوێ دەکەنەوە، ئەی دەستبەتاڵان، ئەی نەزانان، ئەی بێئاگایان لە داهاتوودا دەبینن کاتێك تەپ و تۆز دەڕەوێتەوە:

﴿وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُ بَعْدَ حِينٍ ۝٨٨﴾ ص: ٨٨

**پرسیار:** چۆن باوەڕم بە فتوای نەفسی ناپاك هەبێت؟ وەڵامیدایەوە و فەرمووی: دژ بەو نەفسە تێبکۆشە تا دەمرێت، پاشان بە سەرهەڵدانێکی تر زیندووی بکەرەوە، بیگۆڕە بۆ نەفسێکی فەقیهی زانای دڵنیا، دەرگای حەزەکان و چێژەکانی لێ داخە، لە حەزەکان بەندی بکە تا لاواز دەبێت ئەوکات حەزەکانی دەگێڕێتەوە بۆ دەستی نەهێنێت.

کاتێك بەنوئیسرائیل کاریان بە تەورات نەکرد خودا دڵی ئەوانی شێواند و گۆڕی بە بەردێکی ڕەق، لە دەرگای خۆی ئەوانی دەرکرد، ئێوەش بەهەمان شێوە ئەی محەممەدییەکان، گەر کار نەکەن بە قورئان و حوکمەکانی جێبەجێ نەکەن دڵتان



Scanned by CamScanner

دەشێوێت و لە دەرگای خۆی دەرتاندەکات، لەوانە مەبن خودا لەسەر زانست گومڕای کردن، گەر بۆ دروستکراوان فێرببیت بۆ دروستکراوان کار دەکەی، بەڵام گەر بۆ خودا فێرببیت بۆ خودا کار دەکەی، گەر بۆ دونیا فێرببیت بۆ دونیا کاردەکەی، گەر بۆ دوارۆژ فێرببیت بۆ دوارۆژ کاردەکەی، لقەکان لەسەر ئەسڵەکان بینا دەکرێن((وەك چۆن قەرز دەکەی قەرزت لێ داوا دەکرێتەوە))[1]، هەموو دەفرێك ئەوەی لێ دەڕژێت کە تێیدایە، ئەوتت کردووەتە ناو دەفرەکەت و دەتەوێت ناوی گوڵی لێ بچۆڕێت، هیچ ڕێز و پلە و پایەیەکت نییە، لە دونیادا بۆ دونیا و ڕۆڵەکانی دونیا کار دەکەی کەچی دەتەوێت دوارۆژ بەدەستبهێنیت، سبەینێ ڕێزێك لەلای خودا بەدەستناهێنیت، بۆ دروستکراو کار دەکەی و دەتەوێ سبەینێ دروستکەر بەدەست بهێنیت و لێی نزیك ببیەوە و تەماشای بکەی، هیچ ڕێز و پلە و پایەیەکت نییە، ئەمە لە تۆدا ئاشکرا و زاڵ و زۆرینەیە، خۆ گەر ئەو(سبحانە وتعالى) بەبێ کردار و لە چاکەی خۆیەوە بە تۆی بەخشی ئەوە بۆ ئەو دەگەڕێتەوە و بڕیاری خۆیەتی، گوێڕایەڵی کاری بەهەشتە و یاخیبوون کاری ئاگرە، لەدوای ئەوە کارەکە لەدەستی خۆیدایە گەر بیەوێت پاداشتی یەکێك لە ئێمە دەداتەوە بەبێ کردار یان یەکێك لە ئێمە سزا دەدات بەبێ کرداری خراپە ئەوەش بۆ ئەو(سبحانە وتعالى) دەگەڕێتەوە.

﴿فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ١٦﴾ البروج: ١٦

﴿لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ ٢٣﴾ الأنبياء: ٢٣

گەر یەکێك لە پێغەمبەران و صالحان بخاتە ناو ئاگرەوە ئەو کارە بۆ ئەو(سبحانە وتعالى) ستەم نییە، بەڵکو دادپەروەرییە، ئەوەش ئەوپەڕی بەڵگەیە و پێویستە لەسەرمان بڵێین: ئەمیر ڕاستی فەرموو و نەڵێین: بۆچی و چۆن؟ ئەمە دەگونجێ ببێت، گەر بوویێت لە دادپەروەری و حەقەوە بووە، ئەوە شتێکە نابێت و شتێك لەوە ئەنجام نادات، لە منەوە ببیستن و تێبگەن لەوەی پێتان دەڵێم، من کاتی خۆی گەنجێکی بەردەست و خزمەتکاری ئەوانەی پێش خۆم بووم، ئێستا شەکەکانی ئەوان بڵاوە پێ دەکەم و بانگ

[1] تقدم تخريجه.

دەکەم بۆ سەری و ناپاکیان لێ ناکەم و هەرگیز بانگەشەی ئەوە ناکەم قسەکانی ئەوان مولکی من بێت، من لە ئەوانەوە هاتووم و بەرەکەت لە خوداوەیە(عزوجل)، خودا بەهۆی بەرەکەتی شوێنکەوتنم بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و چاکەم لەگەڵ دایك و باوکم(رەحمەتی خودایان لەسەر بێت) شایستەیی پێ بەخشیم، ئەو باوکەی زوهدی لە دونیا کرد لەگەڵ بوونی دەسەڵات بەسەر دونیادا، دایکیشم لەسەر ئەو کارەی لەگەڵی تەبا بوو و رازیبوو بە کارەکەی، هەردووکیان لە چاکان بوون، خاوەنی دیانەت و رەحم و سۆز بوون بەرانبەر بە دروستکراوان، ئەوەی لەسەر من دەیبینن لە ئەوانەوەیە نەك لە خەڵکی ترەوە، هاتم بۆ لای نێرراو(پێغەمبەر)و نێنەرەر(خودا)، بەو دوانە سەرکەوتن بەدەست دەهێنم، هەموو خێر و نیعمەتەکانم بەو دوانەوەیە و لەلای ئەو دوانەیە، لە هەموو دروستکراوان تەنها محەمەدم(ﷺ) دەوێت، لە ئەربابانیش تەنها پەروەردگاری خۆمم دەوێت، ئەی کەسی زانا قسەکانت لە زمانتەوەیە نەك لە دڵەوە، لە رووالەت و وێنەی تۆدایە نەك لە مانای تۆدا، دڵی راست و دروست لە قسەکردن رادەکات، ئەو قسانەی لە زمانەوە دەردەچن بەبێ ئەوەی دڵیان لەگەڵ بێت، بۆیە کاتی بیستنی وەك باڵندەی ناو قەفەس و دووڕووی ناو مزگەوتی لێ دێت، گەر زانایەکی دووڕوو لە مەجلیسێکدا کەسێکی صادقی بینی هەموو ئاواتی ئەوەیە لەو مەجلیسە بچێتە دەرەوە.

خوداناسان لە روخساری ریابازان و دووڕووان و دەجالەکان و بیدعەچییەکان و دوژمنانی خودا و پێغەمبەردا(ﷺ) نیشانەکان دەبیننەوە، نیشانەکانیان لە روخسار و قسەیاندا بەدەردەکەون، لە صادیقان رادەکەن وەك چۆن لە شمشێر هەڵدێن، ئەوان دەترسن بە ئاگری دڵی صادیقان بسوتێن، فریشتەکان لە صادیقان بەرزیاندەکەنەوە، یەکێك لە صالحان لای خەڵکی رەشۆکی مەزنە، بەڵام لای صادیقان نەرم و پەستە، لەلای خەڵکی رەشۆکی مرۆڤێکی گەورەیە و لەلای صادیقان باڵندەیەکی بچووکە و هیچ کێشێکی نییە، کەسی صدیق بە نووری خودا تەماشا دەکات نەك بە نووری چاوەکانی و نەك بە نووری خۆر و مانگ، ئەوانە نووری گشتی خودان(عزوجل)، نوورێکی تایبەتی، هەیە خودا بە بەندە تایبەتەکانی دەدات، ئەو نوورە دوای دامەزرانی حوکم و وردەکاری دێت، ئەوەش بریتییە لە نووری قورئان و سوننەت، کاری بەو دوانە کرد و نووری زانستی پێدرا.

خودایە، حیلم و نزیکی و زانستی خۆتمان پێ ببەخشە. ئامین.

خودا بەرەکەت نەخاتە ناوتانەوە و ژمارەتان زۆر نەکات ئەی دووڕووان، هەموو کار و خەریکبوونی ئێوە ئاوەدانکردنەوەی نێوان خۆتـان و خـەڵکی و وێرانکردنـی نێوان خۆتان و خودایە.

خودایە، زاڵم بکە بەسەریاندا تا زەویـان لـێ پـاك بکەمـەوە، نیشـانەی دووڕوویـی کەسی دووڕوو لەم سەردەمەدا ئەوەیە کە نایـەت بۆ لای مـن و گـەر بـە مـن بگـات سەلامم لـێ ناکـات، گـەر ئـەو کـارەش بکـات زۆرلەخۆکردنـە، ئـەم ئایینـە دیـوار و پەرژینەکانی دادەڕوخێن، خودایە کۆمەڵێك یاریدەدەرم پێ ببەخشە بـۆ ئـەوەی بینـای بکەمەوە، هیچ لەسەر دەستی ئێوە بینا نابێت ئەی دووڕووان، هیچ ڕێزێکتان نییـە تـا شتێك لەسەر دەستتان بینا دەبێت، چۆن بینا دەکەن لە کاتێکدا پیشـەی بیناسـازی و ئامێری بیناکردنتان بەدەستەوە نییە، ئەی نەزانان، بینای دیواری ئایینی خۆتان بکەن پاشان خۆتان بـۆ بینـای کەسـانی تـر یەکلابکەنـەوە، گـەر دەسـتدرێژی بکەنـە سـەرم لـەپێناوی خـودا و پێغەمبـەردا(ﷺ) دەسـتدرێژی دەکەمـە سـەرتان، چـونکە بـۆ سەرخستنی ئەو دوانـە بـەپێوە وەستاوم، دەسـتدرێژی مەکـەن، چـونکە خـودا بەسـەر کاروبارەکانی خۆیدا زاڵە، براکانی یوسف(علیه السلام) هەوڵیاندا یوسف بکوژن بـەڵام نەیانتوانی، چۆن دەتوانن بیکوژن لە کاتێکدا لەلای خودا ئەو مەلیکە و پێغەمبەرێکە لە پێغەمبـەرانی(علیهم السلام) و بـە صدیق نووسـراوە، دووڕووانـی ئـەم سـەردەمە دەیانەوێت من تیاببەن، ئێوە بێزێن و دەستکورتن بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە، گەر حوکم نەبوایە دانە دانە ناوم دەهێنان و سەرزەنشتم دەکردن، لەباری ڕاستبوونەوە لەگەڵ حوکم و ڕاستبوونەوە لەگەڵ زانست حوکم بنچینەی کارەکەیە، خوداناسان ترسـیان نییـە لـە دروستکراوان، ئەو لایەنە خودا بۆخۆی ئاسایشی پێداوە و سەرپەرشـتی و پارێزگـاری دەکات، گوێ بە دوژمنەکانیان نادەن، چونکە بەم نزیکانـە دەیـانبینن دەسـت و لاق و زمانیان براوە، زانیان و گەیشتنە ئەو ڕاستییەی دروستکراوان دەستەوسـان و نـەبوونن تا بە دەستی ئەوان تیابچن، دەزانن موڵـك و دەوڵەمەنـدی و هـەژاری و زیانگەیانـدن بەدەستی ئەوان نییە، موڵك و قـازانج تـەنها لـە دەسـتی خودادایـە نـەك لـە دەسـتی

ئەوانــدا، تــەنها خودایــە پێبەخشــەر و لێگــرەوە و زیانبــەخش و قازانجبــەخش و زیندووکــەرەوە و مرێنــەر نــەك كەســانی تــر، ئــەوان لــە کــۆڵی قورســی هاوەڵــدانان ئاسوودەبوون، ئەوان هەڵبژاردە و جیاکراوەی خودان و لـەناو هـۆگری و بەختەوەریـدان لەگەڵ خودا(عزوجل)، بە رۆح و لوتف و مناجاتی ئەو(سبحانه وتعالی) چێژ وەردەگـرن، گوێ بەوە نادەن دونیا هەبووە یان نـەبووە، دوارۆژ هـەبووە یـان نـەبووە، خێـر و شـەڕ هەبووە یـان نـەبووە، لـە سـەرەتاوە زۆریـان لـەخۆ دەکـرد بـۆ زوهـدکردن لـە دونیـا و دروستکراوان و حەزەکان، کاتێك بەردەوام بوون لەسەر ئەو حاڵـە خودا(علیـه السـلام) زۆرلەخۆکردنەکەی بۆ گۆڕین بە خەسڵەت و سروشت و بەهرە، زوهـد بـوو بـە زوهـد و سروشتیش بوو بە سروشت، لەوانـەوە فێـربن، زۆرلـەخۆتان بکـەن بـۆ عیبادەتـەکان و دەسـتبەرداری یـاخیبوون و کـارە ناپەسـەندەکان بـن زۆرلەخۆکردنەکـەتان دەبێـت بـە سروشت، لـە کـەلامی پـەروەردگارتان تێبگـەن و کـاری پـێ بکـەن و ئیحلاصـتان لـە کارەکاندا هەبێت.

**ئەی گەنج**، تۆ نەفس و سروشت و ئارەزوویت، لەگـەڵ ژنـان و بێگانـە و منداڵانـدا دادەنیشیت پاشان دەڵێیت من گوێ بەوانە نادەم، تۆ درۆ دەکەی، شەرع و ئەقڵ لەگەڵ تۆ تەبا نییە، ئاگر دەدەیە پاڵ ئاگر و دار دەدایە پاڵ داری گڕگرتوو بۆیە گومانی تێدا نییە خانەی ئاین و باوەڕت گڕدەگرێت، بە ناپەسـەندزانینی ئـەو کـارە لـە شـەرعەوە گشتییە و هیچ کەسـێکی جیانەکردووەتـەوە، بـاوەڕ و مەعریفـە بـە خودا(عزوجـل) و هێزی نزیکی لە ئـەوەوە بەدەسـتبهێنە پاشـان بیـە بـە پزیشـك بـۆ دروسـتکراوان وەك نوێنەری حەق(عزوجل).

**هاوار بە حاڵت**، چۆن دەست بۆ مار و دوویشك دەبەی و وەریانـدەگێڕی لەکاتێکدا تۆ پیشەی مـارەوانی نـازانی و دژەژەهـرت نـەخواردووە، چـۆن کـوێر دەرمـانی چـاوی خەلکی دەکات، لاڵ چۆن دەتوانێت خەلکی تێبگەیەنێت؟ نەزان چۆن دەتوانێـت ئـاین راسـتبکاتەوە؟ کەسێك لە دیوانی مەلیکدا نەبێت چۆن دەتوانێـت خـەلکی بـە مـەلیك پێشکەش بکات؟ تـۆ بـە خـودا و دەسـەڵاتی خـودا و نزیکـی و رامهێنـانی خـودا بـۆ دروسـتکراوانی بێئاگای، ئەوەی من ناتوانم بیژنەوم و ئەوەی ئێوە نایـزانن، ئـەوەی بـۆ

من بەرچنگ ناکەویّ و ئەوەی بۆ ئێوە بەرچنگ ناکەویّ تەنها تەنویلەکەی لەلای خودایە و هەر ئەو دەیزانێت، ببیستن و رووم تێبکەن، چونکە من بانگکەری مەلیکم و نوێنەری پێغەمبەری خودام(ﷺ) لەناو ئێوەدا، لەپێناوی ئاییندا دەمکوتی خەڵکی دەکەم لەپێناوی خودا و پێغەمبەردا(ﷺ) لە ئێوە شەرم ناکەم، من کرێکاری ئەوانم، خزمەتکاری بەردەستی ئەوانم و خۆم دەدەمە پاڵ ئەوان، ئەم دونیایە فانی و گوزەشتەیە، بریتییە لە خانەی نافەت و بەڵا، هیچ کەسێك ژیانێکی تێر و تەواوی تێدا بەسەر نابات بەتایبەت گەر کەسەکە حەکیم بێت، وەك وتراوە: چاوی حەکیم و چاوی ئەو کەسەی یادی مردن دەکات بە دونیا رۆشن نابنەوە، کەسێك درندە لەبەرپێیدا بێت و لە نزیکەوە دەمی کردبێتەوە چۆن ئارامی رووی لێ دەکات و خەو دەچێتە چاوەکانی؟! ئەی بێئاگایان، گۆڕ دەمی کردووەتەوە و درندەی مردن و مارەکانی دەمیان کردووەتەوە.

شمشێروەشێن دەسەڵاتداری قەدەرە و شمشێری لەدەستدایە، ئەو چاوەڕوانی فەرمانە، لە هەر هەزار یەك کەس لەسەر ئەم حیکمەتەیە و بەئاگایە و غەفڵەت داینەگرتووەتەوە، دەبێ لەسەرەتای کارەکەتەوە پیشەیەکت هەبێت نانی لێوە بەدەست بهێنیت و لێی بخۆیت تا نیمانەکەت بەهێز دەبێت، گەر بەردەوام بوویت لەسەر ئەوە و دامەزرایت خودا(عزوجل) دەرتدەهێنێت بەرەو تەوەکول و بەبێ هۆ خواردنت پێدەدات، ئەی ئەو کەسەی بە هۆوە هاوەڵت بۆ خودا داناوە گەر تامی خواردن بە تەوەکولەوە بکردبایە هاوەڵت دانەدەنا و لەبەر دەرگای ئەودا(سبحانە وتعالى) دادەنیشتی و پشتت بە ئەو دەبەست و متمانەت بە ئەو دەبوو، خواردن و خواردنەوە لە دوو شێوە دەناسم: یان بە کەسابەت لەگەڵ پابەندبوون بە شەرعەوە یان بە تەوەکول.

هاوار بە حاڵت، تۆ شەرم ناکەی لە خودا(عزوجل)، کەسابەتەکەت وازلێدەهێنیت و لە خەڵکی دەستپاندەکەیەوە، کەسابەت سەرەتایە و تەوەکول کۆتاییەکەیەتی، من نە سەرەتا و نە کۆتایی بۆ تۆ نابینم، من حەق بە تۆ دەڵێم و شەرمت لێ ناکەم، ببیستە و رووم لێبکە، ململانێی حەق مەکە، من زاهیدترین کەسم لەناو ئێوەدا، زاهیدترینم

لەوەی لەدەستی ئێوەدایە، زاهیدترینم لە حەمد و سەنا و زەمی ئێوە، مـن لـە ئێـوەم وەرگرتووە بۆ کەسانی ترم وەرگرتووە نەك بـۆ خـۆم، قسـەکانم لەسـەر ئێـوە لێدانێکی بێدەنگکەرە، فەرمانم پێکراوە بە وتنی بەو ڕێگەیەی کە دەیزانم، گومـانم لـە ڕاسـت و دروستییان نییە، حوکمی خودا نەسخکەرەوەی بۆ نییە تا نەسخی بکاتەوە و ڕێگرێکی بۆ نییە ڕێگەی لێ بگرێت.

هاوار بە حاڵت، قسەی خەڵکی فریوت نەدا، تۆ خۆت دەزانـی لـە چ دۆخێکدای و لەسەر چ کارێکی، خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿ بَلِ ٱلْإِنسَٰنُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ بَصِيرَةٌ ﴿١٤﴾ ﴾ القيامة: ١٤

چـەندە لای خـەڵکی ڕەشـۆکی کەسـێکی چـاك و پـاکی و چـەندە لای تایبـەتان ناشیرینی! ئەی ئەوانەی حەزتان لە دونیایە و بە دونیا دڵخۆشـن، ئەوانـەی خۆیـان بـە ناقـڵ دادەنـێن و لـە ئـەهلی نووسـین سـەرژمێر دەکرێن، ئایـا گوێتـان لـەم ئایەتـەی پەروەردگارتان بووە کە دەفەرموێت:

﴿ ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ ﴾ الحديد: ٢٠

یاری و لەهو و جوانی بۆ منداڵی نەفامە نەك بـۆ پیـاوی ژیرمەنـد، فێرتـان دەکـەم ئەوانە بۆ نەفامان و کەم هۆشانە، فێرتـان دەکـەم ئێـوە بـۆ یـاری و گاڵتـە و گـەپ و خەریکبوون بە دونیاوە دروستنەکراون، ئـەو کەسـەی بـە دونیـا ڕازی دەبێـت و دواڕۆژ پشـتگوێ دەخـات بـە شـتی پـووچ ڕازی بـووە، هـەموو ئـەوەی دونیـا بـە ئێـوەی دەبەخشێت مـار و دووپشـك و ژەهـرن گـەر بـە دەسـتی نـەفس و ئـارەزوو و حـەزەوە دەستی بۆ ببەن، بە دواڕۆژەوە خەریکبن و بـە دڵ بـۆ لای پـەروەردگارتان بگەڕێنـەوە و بە ئەوەوە(سبحانه وتعالى) سەرقاڵ بن، پاشان ئەوەی بۆتـان دەهێنێـت لەدەسـتی چـاکەی وەربیگرن، بیر لە دونیا و دواڕۆژ بکەنەوە و بەراورد لە نێوانیانـدا بکـەن و پارسـەنگی یەکێکیان بدە، هەرچییەکم بوێت فێری دەبم و زۆرتـر لەوەشم لەلایە، کشـتوکاڵەکەم هاتووەتەبـەر و قەشـەنگ لێـی وەسـتاوە، بـەڵام کشـتوکاڵەکەی تـۆ هـەرکات سەردەردەهێنێت دەسووتێت، کەسێکی هۆشمەند بـە و سـەرۆکایەتییەکەت وازلێبهێنـە

و وەرە و لێرەدا وەك یەكێك لەم دەستەیە دابنیشە تاكو قسەكانم لە زەوی دڵی تۆدا بڕوێن، گەر كەسێكی زیرمەند بێت بە هاوەڵێكردنی منەوە دادەنیشێ و هەموو رۆژێك بە پارووێەك لە منەوە رازی دەبوویت و لەسەر زیری قسەكانم ئارامت دەگرت، هەركەسێك ئیمانی هەبێت دامەزراو دەبێت و دەڕوێت، هەركەسێش ئیمانی نەبێت لە من رادەكات.



# مەجلیسی شەست و دوو

## یەکتا پەرستی

بەیانی رۆژی هەینی لە مەدرەسەکەی دوایین رۆژی مانگی رەجەب سالی ٥٤٥هـ، فەرمووی:

خودا(عزوجل) بە تاك و تەنها رابگرن تا لە دلدا بە ئەندازەی گەردیلەیەك دروستکراوی تێدا نامێنێت، نە خانە و نە زێد دەبینی، یەکتاپەرستی هەموو ئەوانە دەکوژێت، هەرچی دەوایە لە یەکتاپەرستیدایە بۆ حەق(عزوجل)، هەرچی دەوایە لە پشتهەلکردن لە دونیادایە، لەو مارە رابکە تا مارەوانێك دێت و ددانی هەلدەکێشێت و ژەهرەکەی دەچۆڕێنێ و نزیکت دەکاتەوە لێی و پیشەکەت فێر دەکات و رادەستی تۆی دەکات، ئەو زیانەش کە تیایدا دەمێنێتەوە دەتوانی مامەلەی لەگەل بکەی لە کاتێکدا ئەو ناتوانێت تۆ بگەزێت، گەر حەقت(عزوجل) خۆشویست و ئەویش تۆی خۆشویست شەڕی دونیا و حەز و چێژ و نەفس و ئارەزوو و شەیتانت لێدەکاتەوە، بۆیە بەشەکانت بەبێ زیان و تێکدان وەردەگریت، ئەی بانگەشەکەری بێ بەلگە، زۆر بانگەشەی یەکتاپەرستی دەکەی لە کاتێکدا تۆ هاوەلدانەری، دەتوانی ئەو لەگەلم بێیە دەرەوە و دەربچین بۆ کۆمەلە شوێنێکی ترسناك، من چەك لەگەل خۆم هەلناگرم و تۆ چەك لەگەل خۆت هەلبگرە، پاشان تەماشا بکە کێ دەترسێت، من یان تۆ؟ تەماشا بکە بزانە کێ دەچێتە ژێر پۆشاکی دوارۆژەوە من یان تۆ؟ تۆ لەناو دووروویدا پەروەردەکراوی، من لەناو ئیماندا پەروەردە کراوم.

**خەلکینە**، ئێوە بەدوای دونیادا هەلدێن تا پێتان ببەخشێت، لە کاتێکدا دونیا بەدوای دۆستانی خودادا هەلدێت تا پێیان ببەخشێت، لەبەر دەستیاندا رادەوەستێت و سەریان بۆ نەوی دەکات، بە شمشێری تیژی یەکتاپەرستی لە نەفسی خۆتان بدەن و خوودەی کۆمەکی لەسەر بکەن، نێزەی موجاهەدە و قەلغانی تەقوا و شمشێری یەقین

بگرن بە دەستەوە، جارێك تیرئەندازی و جارێکیش شمشێربازی، ئەو(ئەفست) بەردەوام دەجەنگێت تا بۆت زەلیل دەبێت و رەشۆی سواری ئەو دەگریتە دەست، بەهۆیەوە سەفەری وشکانی و دەریا دەکەی، ئەوکات پەروەردگارت(عزوجل) شانازیت پێوە دەکات، پاشان ئەوانەی لەگەڵ ئەفسی خۆیان مانەوە و لێی رزگار نەبوون بەرەو خودا هەنگاویان پێ هەڵبگرە، هەرکەس ئەفسی خۆی ناسی و زاڵ بوو بەسەریدا دەبێتە وڵاخی سواری بۆی، کۆڵە قورسەکانی بۆ هەڵدەگرێت و سەرپێچی بڕیارەکانی ئەو ناکات، خێر لە تۆدا نییە تا ئەفسی خۆت دەناسی و لە حەزەکانی بێبەشی دەکەی و مافی خۆی پێ دەبەخشی، ئەوکات ئەو ئەفسە پاڵدەداتەوە بە لای دڵدا و دڵیش پاڵدەداتەوە بە لای نهێنیدا و نهێنیش دڵنیادەبێتەوە و ئارامانە پاڵدەداتەوە بە لای حەقدا(عزوجل)، گۆپاڵی تێکۆشان لەسەر ئەفستان بەرزمەکەنەوە، بە فێڵ و تەمبەڵییەکانی فریو مەخۆن، بە خەوتنی دڕندە فریو مەخۆن، چونکە ئەو وا نیشان دەدات خەوتووە، بەڵام ئەو چاوەڕوانی نێچیرێکە راوی بکات، ئەم ئەفسە ئارامی و زەلیلی و تەوازوع و تەبایی لە خێردا نیشان دەدات، بەڵام لە ناوەوە پێچەوانەی ئەوانەی حەشارداوە.

**هەمیشە ئاگادار بە** لەوەی بەدوای ئەوانەدا دێت، خوداناسان سەرقاڵی خۆیان هەیە و لە دروستکراوان بێئاگابوون، بەڵام زۆر لە خۆیان دەکەن-لەپێناو فەرمانپێکردنیان و نەهیلێکردنیان- تەماشایان دەکەن و لەگەڵیان دادەنیشن ، نموونەی خوداناسان لەگەڵ خەلکیدا وەك دەستەیەك وان دەیانەوێت لە دەریایەك بپەڕنەوە و خۆیان بگەیەننە لای مەلیك، هەندێکیان رێگەیەك دەزانن و لێیدەپەڕنەوە، کاتێك گەیشتنە بەرەوە مەلیك بینی ئەوانی تر سەریانلێشێواوە و رێگەکە نابیننەوە و خەریکە دەخنکێن، ئەو رێگەیەی پێشینانی ئەوان گرتیانە بەر لێیان بزربووە، بۆیە فەرمانی کرد بەوانەی بە ئەو گەیشتوون بگەڕێنەوە بۆ لای ئەو دەستە سەرلێشێواوە بۆئەوەی ئەو رێگەیەی خۆیان گرتیانە بەر بەوانی نیشان بدەن، بۆیە هاتن و لەسەر پەڕینەوەمیەك(کەشتییەك) وەستان و هاواریان کرد رێگەکە لێرەوەیە، رێنموونیان کردن، کاتێك لێیان نزیکبوونەوە دەستیان گرتن، ئەسڵی ئەم نموونەیە ئەم ئایەتە پیرۆزەیە:

بۆیە کەسی ژیرمەند لە ئێوە بە دونیا و ماڵ و منداڵ و خانەوادە و خواردن و خواردنەوە و پۆشاك و وڵاخی سواری و هاوسەرگیری دڵخۆش نابێت، هەموو ئەوانە بریتین لە هەوەس، دڵخۆشی باوەڕدار بە هێزی ئیمان و یەقین و گەیشتنی دڵیەوەیە بە دەرگای پەروەردگاری(عزوجل)، دەزانن مەلیکانی دونیا و دوارۆژ ئەوانەن کە خودا دەناسن و کار بۆ ئەو دەکەن.

**ئەی گەنج**، چۆن دڵ و نهێنیت پاڵفتە و پاك و بێگەرد دەبن لە کاتێکدا تۆ بە دروستکراوان هاوەڵت بۆ خودا داناوە، چۆن سەرفراز دەبیت لە کاتێکدا تۆ هەر شەوێك لەلای یەکێ سکاڵا دەکەی و دەستی لێ پاندەکەیەوە، چۆن دڵت پاڵفتە دەبێت لە کاتێکدا خاڵییە لە یەکتاپەرستی و گەردیلەیەك یەکتاپەرستی تێدا نییە، یەکتاپەرستی نوورە و هاوەڵدانان بە دروستکراوان تاریکییە، چۆن سەرفراز دەبیت لە کاتێکدا دڵت لە تەقوا خاڵییە و گەردیلەیەك لەخوداترسانی تێدا نییە، چۆن بەهۆی دروستکراوانەوە لە دروستکەر بێبەش بوویت، بە هۆ جۆراوجۆرەکانەوە لە هۆکار(سەبەبکار) بێبەش بوویت، بە تەوەکول لەسەر خەلکی و متمانە بەوان بێبەش بوویت، تۆ تەنها بانگەشەی، دەستە پاقلەیەك بەبێ بەڵگەی ڕۆشن بە هیچ کەسێك نادرێت، **ئەم کارە تەنها بە دوو ڕێگە ڕاست و دروست دەبێت:**

**یەکەم**: تێکۆشان و نۆشکردنی ئازار و مەینەتی تێکۆشان لەگەڵ نەفسی خۆ و هەلگرتنی دژواترین و ماندووکەرترین، ئەمەش لەناو صالحاندا زاڵ و ناسراوە،
**دووەم**: بەهرەیەك بەبێ ماندووبوون، ئەمەش زۆر دەگمەنە و بۆ دانە دانەیەك لە خەلکییە، مەعریفە و مەحەبەت بە دانە دانەیەك لە خەلکی دەبەخشرێت، لەناو دەست و پێی خانەوادە و هاوپیشەکانیدا وەریدەگرێت و توانا و باڵابوونی خۆی تێدا نیشان دەدات، لە جەردە و ڕێگران ڕزگاری دەکات و بەرەو خەلوەتگا بەرزی دەکاتەوە و دروستکراوان لە دڵی دەردەهێنێت و دەرگای نزیکی خۆی بۆ دەکاتەوە و لە ورێنە ڕزگاری دەکات تا وای لێ دێت کەمترین شت بەشی ئەو دەکات، تێگەیشتن

و حیکمەت و عیززەتی پێ دەبەخشێت، هەرچی دەبینێت و دەبیستێت پەند و ئامۆژگاری لێ وەردەگرێت، تەنها کارێک ئەنجام دەدات لە خودای نزیک بکاتەوە، فەرمانی پێ دەکرێت بە هیدایەت و چاودێری دەکرێت و ئەوەی پێویستی بێت پێی دەبەخشرێت و هەموو ئەوانە لە ئەو جیانابنەوە، وەك یوسفی(علیه السلام) لێ دێت کە خودا(عزوجل) دەربارەی دەفەرموێت:

﴿كَذَٰلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلْفَحْشَآءَ ۚ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٢٤﴾﴾

یوسف: ٢٤

خراپە و بەدڕەفتاری لێ دووردەخاتەوە و سەرکەوتن و کۆمەك دەخاتە خزمەتییەوە، ئەو کەسەی خودای خۆشدەوێت و خودا دەناسێت بە هەموو هونەرێك ئامۆژگاری خەلکی دەکات، جارێك بە قسەکانی و جارێك بە کردار و جارێکیش بە هەوڵ و لێبڕانی، ئامۆژگاریان دەکات لەو ڕێگەیەی پەیی پێدەبەن و لەوەی پەیی پێ نابەن.

ئەی گەنج، ئاگات لە نەفسی خۆت بێت، لەباری لاوازی باوەڕدا تۆ ناتوانی خانەوادە و هاوسەر و جیران و خەلکی شار و هەرێمەکەت چاك بکەیت، کاتێك ئیمانەکەت بەهێز بوو روو لە خانەوادە و منداڵەکانت بکە و پاشان روو لە خەلکی بکە، هەتا زرێپۆشی تەقوا نەپۆشی و خوودەی ئیمان نەکەیە سەر سەری دڵت و شمشێری یەکتاپەرستی بەدەستەوە نەگری و لەناو تیردانەدا تیری قبووڵی دوعا هەڵنەگریت و سواری ئەسپی کۆمەك و یارمەتی نەبیت و فێری بڕۆ و بێ و لێدان و شەڕەشێر نەبیت روو مەکە خەلك و خانەوادەت، پاشان هێرش بکە سەر دوژمنانی حەق(عزوجل)، لەو بارەدا سەرکەوتن و کۆمەکیت لە هەر شەش ئاراستەکەوە بۆ دێت و خەلکی لەدەستی شەیتان قوتار دەکەی و دەیانبەیت بۆ دەرگای حەق(عزوجل)، بە کاری ئەهلی بەهەشت فەرمانیان پێ دەکەی و لە کاری ئەهلی ئاگر ئاگاداریان دەکەیەوە، چۆن بەو جۆرە نابیت لە کاتێکدا تۆ بەهەشت و دۆزەخ و کاری ئەو دوو جێیەت ناسیوە؟ هەرکەسێك بگاتە ئەم مەقامە پەردە لەسەر چاوی دڵی لادەدرێت، بۆ هەر لایەکی شەش ئاراستەکە ئاوڕبداتەوە سەرفی تاریکییەکان دەبڕێت و هیچ شتێك

نابێتە بەربەست بۆی، سەری دڵ بەرزدەکاتەوە عەرش و ئاسمانـەکان دەبینێت، کاتێـك سـەر دادەنـەوێنێت چینەکانی زەوی و شـوێنی جنـەکان دەبینێت، هـەموو ئەمانـە هۆیەکەیان بریتییە لە ئیمان و مەعریفە بە حەق(عزوجل) لەگەڵ زانست بە حوکم، گەر بەم مەقامە گەیشتی خەڵکی بانگ بکە بۆ دەرگانەی حەق(عزوجل)، بەر لەمە هیچت لێوە سەوز نابێت، گـەر خـەڵکت بـانگ کـرد و خۆت لەبەر دەرگـای حەقدا نـەبووی بانگکردنەکەت دەبێتە بارێکی قورس لەسەر شانت، هـەرکات دەتـەوێ بجـوڵێی چۆك دادەی، هەرکات دەتەوێ بەرز ببییەوە نەوی دەبیت، تۆ لە صالحان هـەواڵێکت نییـە، تۆ تەنها زمان بەیەکدا دەدەی، تۆ تەنها زمانی بەبێ ویژدان، تۆ تەنها رووالەتی بەبێ ناوەرۆك، تەنها ئاشـکرای بـەبێ پـەنهان، تـەنها گـەڕان و هاتووچووی بـێ ئـەنجامی، شمشێرەکەت لە دارە، تیرەکەت لە کەریتە، تۆ ترسـنۆکی و هـیچ ئازایەتییـەکت نییـە، بچووکترین تیر دەتکوژێت، مێشوولەیەك قیامەتت لێ هەڵدەستێنێت.

خودایە بە نزیکی لە خۆتەوە ئیمان و دینمان بەهێز بکەی.

﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾﴾

البقرة: ٢٠١

**هەروەها فەرمووی:**

گەر لەگەڵ کەسێك دانیشتبم پاشـان هەوڵمداوە لەگـەڵ دوان یـان سـیان لەوانـەی لەگەڵیان تەبام دابنیشم، هاوەڵی خوداناسان بکە، چونکە لە سیفەتەکانیان ئەوەیە گەر تەماشای کەسێك بکەن هەوڵ و لێبڕان دەخەنە سەری و خۆشیان دەوێت با ئەو کەسـەش یەهودی یان نەصرانی یان مەجووسی بێت، گەر کەسەکە موسڵمان بێت ئیمان و یەقین و دامەزرانی زیـاد دەکـات، گـەر دڵ راسـت و دروسـت سـەرنج و تێـڕوانینی راسـت و دروست دەبن، گەر دڵ راست و دروست بوو لە حـەق نزیـك دەبێتـەوە، گـەر بـە چـاوی نزیکی و مەعریفە وردبێتەوە وردبوونەوەکەی لە خـوداوە دەبێـت و نزیکـی لـە دڵیـدا دەبێت بە پەڵە هەورێك و سەرنجدانی دەبێت بە چەخماخە و ئامۆژگارییەکەی دەبێت بە

لێزمەی باران، زمانی گوزارشت لەوە دەدات لەناو دڵیدایە، زمانی دەبێت بە قەڵەمێك لە مەرەکەبی مەعریفە و دەریای زانست وەردەگرێت، قسەکانی و سەرنجەکانی دەبن بە چەخماخەی ئەوەی لە دڵیدایە، هەردووکیان لە نەسڵێکی بەهێزەوە لەلای خوداوە دەردەکەون، هەرکەسێك فەرمانەکانی جێبەجێ کرد و لە نەهیکراوەکان دەستی کێشایەوە و لە رەزامەندی خودا و پێغەمبەردا(ﷺ) بوو ئەوەی بۆ راست و دروست دەبێت، پاشماوەی دونیا لە دڵیدا دەمێنێت، بۆیە بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی خودا(عزوجل) سەری خۆی هەڵدەگرێت تا ئەو پاشماوەیە دەڕوات و زانست و نزیکی و صدقی زیاد دەبن، بەری داوای حەق(عزوجل) بریتییە لە کرداری چاکە، کرداری چاکە ئەوەیە بۆ خودا چاکبووە و هاوەڵی تێدا نییە، کرداری چاکە تۆ دەخاتە سەر راستە شەقامی موورادی ئەو لە تۆدا، بۆیە تیایدا بە هەنگاوەکانی دڵ و نهێنی و مانات هەنگاوهەڵدەگریت نە بۆ لای راست و نە بۆ لای چەپ، لە هەرچی شتە تەنهادەبیتەوە، نە لەگەڵ دروستکراوان و نە لەگەڵ دونیا و نە لەگەڵ دوارۆژ بوونت نامێنێت، دەبیت بە یەکێك لەوانەی رووی پاکی خودات دەوێت، وەك موسا(علیه السلام) فەرمووی:

﴿وَعَجِلْتُ إِلَيْكَ رَبِّ لِتَرْضَىٰ ﴿٨٤﴾﴾ طه: ٨٤

هەرکەسێك داوای رازیبوونی خودا(عزوجل) بکات وەك ئەوەی لێ دێت کە خودا(عزوجل) لە حەقی موسادا(علیه السلام) فەرمووی:

﴿وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ الْمَرَاضِعَ مِن قَبْلُ﴾ القصص: ١٢

لەسەر دڵی ئەم خۆشەویستە راستگۆ شیری هەرچی رووداو و دروستکراوە حەرام دەکات، دروستکراوگەلێك کە هەن لە پاش ئەوەی نەبوون، دوای ئەوەی شیری هەموو شیردەرەکان بە قوڕگیدا ناچێتە خوارەوە بەهۆی غیرەتی خودایییەوە لەسەر ئەو هەموو شیرەکانیان دەچزرێت خودا هەموان لە دڵی لادەبات تا پەیوەست نەبێت بە شتێك لەوانەوە و لە مەحبووبەکەی دانەبڕێت، بەردەوام باوەڕداری عاریف بە کارکردن لەگەڵی پێغەمبەر(ﷺ) رازی دەکات تا پێغەمبەر(ﷺ) لە پەروەردگار مۆڵەت بۆ دڵی

وەردەگرێت، ئەوکات لەبەردەستیدا وەك خزمەتکارێکی لێ دێت، گەر خزمەتەکەی درێژەی کێشا دەڵێت: مامۆستا، دەرگای مەلیکم پێ نیشان بدە، لە خزمەتی ئەودا خەریکم بکە، لەو شوێنەدا دامبنێی کە دەیبینم، دەستم بگەیەنە ئەڵقەی دەرگای نزیکی لە خوداوە(عزوجل)، ئەویش لەگەڵ خۆی دەیبات و لە دەرگاکە نزیکی دەکاتەوە، پێی دەوترێت: کێت لەگەڵە ئەی محەمەد؟ کێت لەگەڵە ئەی سەفیر، ئەی ڕێنیشاندەر، ئەی مامۆستا؟ ئەویش دەفەرموێت: تۆ دەزانی من بێچوویەکم پەروەردە کردووە و ڕازیم بەوەی خزمەتی ئەم دەرگایە بکات، پاشان بە دڵی بەندەکە دەفەرموێت: ئەوە تۆ و پەروەردگارت، وەك چۆن جبریل(علیە السلام) بە پێغەمبەری(ﷺ) فەرموو-کاتێك بەرزیکردەوە بۆ ئاسمان و لە پەروەردگاری نزیك کردەوە-: ئەوە تۆ و پەروەردگارت.

ئەی گەنج، کرداری چاکە ئەنجام بدە و لە پەروەردگاری جیهانان نزیکببەرەوە.

ئەی گەنج، هیوا و خۆزگەت کورتبکەرەوە و هەڵپەت کەمبکەرەوە، نوێژی ماڵئاوایی بکە، باوەڕدار نابێت بنوێت تا وەسێتە نووسراوەکەی لەژێر سەری دانەنێت، گەر حەق(عزوجل) لە عافییەتدا بەئاگای هێنا ئەوە کارێکی موبارەکە، ئەگەر نە، خانەوادەکەی وەسێتەکەی دەبیننەوە و لەدوای مردنی ئەو سوودی لێ دەبینن و ڕەحمەتی بۆ ڕەوانە دەکەن، با خواردنەکەت خواردنی کەسی ماڵئاواییکەر بێت و بوونت لەناو خانەوادەدا بوونی کەسی ماڵئاواییکەر بێت، بەیەکگەیشتنت لەگەڵ برایان و دۆستانت با بەیەکگەیشتنی کەسی ماڵئاواییکەر بێت، ئەوە لە دڵی خۆت دابنێ کە تۆ ماڵئاوایی دەکەی، چۆن باوەڕدار بەو جۆرە نییە لە کاتێکدا کاروبارەکانی لە دەستی کەسێکی تردایە، دانە دانەیەك لە دروستکراوان تەماشا دەکەن و دەبینن چییان بۆ ئامادە کراوە، هەشیانە دەزانن کەی دەمرن و لە دڵیاندا هەڵگیراوە، بەئاشکرا ئەوە دەبینن وەك چۆن ئێوە بە چاو خۆر دەبینن، بەڵام زمانیان گوزارشتی لێ نادات، یەکەمین شتێك ئاگاهی بەوە پەیدا دەکات بریتییە لە نهێنی، نهێنی دڵ ئاگادار دەکاتەوە، دڵیش نەفسی ئارام و دڵنیا ئاگادار دەکاتەوە، ئەوە دەشارێتەوە، لەدوای ئەدەب و خزمەتی دڵ و ڕاستبوونەوەی لەگەڵ خودا(عزوجل) ئاگاهی بەوە پەیدا دەکات، لەدوای تێکۆشان و

نۆشینی تاڵاو ئاگاهی بەوە پەیدا دەکات، هەرکەسێك گەیشتە ئەو مەقامە دەبێتە نوێنەری حەق(عزوجل) لە زەویدا و جێنشینی ئەو تیایدا، ئەو دەبێتە دەرگای نهێنی و کلیلی گەنجینەی دڵانی لەدەستدا دەبێت، ئەو دڵانەی گەنجینەی حەقن(عزوجل)، ئەمە شتێکە لەودیو ژێری مرۆڤەوە، هەموو ئەوەی تیایدا ئاشکرا دەبێت گەردیلەیەکە لە چیایەکی مەزن و دڵۆپێکە لە دەریایەکی بێپەی و چرایەکە لە خۆرەوە.

خودایە من داوای لێبوردنت لێ دەکەم لە قسەکردن دەربارەی ئەم نهێنیانە، تۆ دەزانی من حاڵم بەسەرمدا زاڵبووە، یەکێ لە خوداناسان دەڵێت: ئاگادار بە لەوەی بیانوو و پاساوی بۆ دەهێنیتەوە، بەڵام گەر گەیشتییە ئەو کورسییە لە ئێوە بزر دەبم و شتێك لە دڵمدا نامێنێتەوە بیانوو و پاساوی بۆ بهێنمەوە و خۆمی لێ بپارێزم لەسەر ئەو قسانەی لەسەر ئێوەیە، جارێك لە ئێوە هەڵهاتم کەچی بەربووەمەوە بۆ ناو ئێوە، بڕیارمدا هەر شەوێك لە شوێنێك بێنمەوە و شار بە شار و وڵات بە وڵات و دێ بە دێ بگەڕێم و ببم بە کەسێکی غەریب و شاراوە هەتا مردن، ئەمە ئەوە بوو من دەمویست، بەڵام خودا پێچەوانەی ئەوەی بۆ من دەویست، بۆیە کەوتمە ناوەڕاستی ئەوەی لێی هەڵهاتم، ئەم دڵە گەر بێتە راستە و لە دەروازەی حەقدا(عزوجل) پێیەکانی جێگیر بێن بەردەبێتەوە بۆ وێڵبوونی سەرهەڵدان(تکوین) و دۆڵ و دەریاکانی، جارێك بە قسەکانی و جارێك بە هەوڵ و لێبڕانی، و جارێکیش بە سەرنجدانی، ئەو دەبێت بە کرداری خودا و کەناگیر دەبێت، ئەو فەنا دەبێت و بەقا رووی لێ دەکاتەوە، کەمێکی زۆر کەم لە ئێوە ئیمان بەمە دەهێنێت، زۆرینەتان بە درۆی دەزانن، ئیمان بەم کردارە کۆتاییەکی پێوەیە، تەنها کەسی دووڕووی دەجالی سواربووی ئارەزوو حاڵی صالحان بەڕاست نازانێت، ئەم کارە لەسەر باوەڕی دروست و پاشان کردار دامەزراوە، هەرکەسێك بە ئاشکرای حوکم کار بکات ئەوا کارەکەی مەعریفەی بە خودا(عزوجل) بۆ بەرهەم دەهێنێت، حوکم دەکەوێتە نێوان ئەو و خەڵکی و زانستیش لە نێوان ئەو و پەروەردگاری(عزوجل)، کردارە ئاشکراکانی دەبن بە گەردیلەیەك بەراورد بە کردارە ناوەکییەکانی، ئەندامەکانی خامۆش دەبن، بەڵام دڵی خامۆش نابێت، دوو چاوی سەری دەخەون بەڵام دوو چاوی دڵی ناخەون، دڵی کاردەکات و یادی خودا دەکات لە کاتێکدا ئەو نوستووە.

لە یەکێك لە خوداناسانەوە دەگێڕنەوە تەسبیحێکی لەدەستدا بووە تەسبیحاتی پێکردووە، خەوی لێدەکەوێت و بەناگا دێت دەبینێت دەستی لە تەسبیحات بەردەوام بووە، ئەوان لە شێوانی دڵان دەترسن، دەترسن دڵیان بسڕێتەوە و خۆر و مانگی دڵیان بگیرێت و پێیەکانیان تووشی خلیسکان بن، بەهەمیشەیی خۆیان بە ئەڵقەی دەرگای نزیکی لە خوداوە هەڵواسیوە و دەستیان بە پەتی ڕەحمی خوداوە گرتووە، تکای لێ دەکەن و دەڵێن: پەروەردگار، ئێمە دونیا و دوارۆژمان ناوێت بەڵکو لێبووردن و عافییەتمان دەوێت لە ئایندا، مانەوەی ئیمان و مەعریفەمان دەوێت و ئەوەمان پێببەخشە، دەستمان بە پەتی ڕەحمەتی تۆوە گرتووە و لە خۆت بێهیوامان مەکە، خودایە ئەوەمان بۆ پێکبهێنە، چونکە گەر تۆ بتەوێت کارێك پێکبهێنیت بە "کن فیکون" دێتە دی.

خەڵکینە، شوێنی گوفتار و کرداری خوداناسان بکەون، خزمەتیان بکەن، بە خۆتان و ماڵ و سامانتان خۆتان لەوان نزیك بکەنەوە، هەموو ئەوەی بەوانی دەبەخشن بۆ خۆتانە و لەلای ئەوان هەڵگیراوە و سبەینێ ڕادەستی ئێوەی دەکەنەوە، ئاوات بۆ فراوانی ڕۆزی دەخوازی قەڵەمی چارەنووس لە بەرتەسکی ڕۆزی تۆ لە قەدەردا پێشکەوتووە، تۆ سزادراو و خەشملێگیراوی، چونکە داوای شتێك دەکەی بەشی تۆ نییە، زۆر هەوڵی دونیا دەدەی و هەڵپەی بۆ دەکەی، بەڵام هەر ئەوە بە دەستی تۆ دەگات بۆت دیاریکراوە، خوداناسان لەسەر پای گوێڕایەڵی وەستاون و دڵیان لە لەرزیندایە، بەڵام ئێوە لەسەر پای یاخیبوون وەستاون و دڵتان لە ئاسایشدایە، ئەمە بۆ خۆی گومڕابوون و فریوخواردنە، خۆتان بپارێزن خودا لەپڕ دەتانگرێت.

لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: ((لەسەر هەر پیشەیەك گزمەکی وەربگرن لە خەڵکانی باشی ئەو پیشەیە))[1].

ئەم عیبادەتە پیشەیەکە و خەڵکانی باشی ئەم پیشەیە بریتین لەوانەی لە کاروکردەوەکاندا ئیخلاصیان هەیە و زانان بە حوکم و کاری پێدەکەن، ئەوانەن لەدوای

---

[1] هدم کریمه.

ئاسیێنی خودا ماڵئاواییان لە دروستکراوان کرد، لە نەفس و ماڵ و سامان و منداڵ و هەموو شتێك جگە لە پەروەردگاریان(عزوجل) رادەکەن بە شکاندن و روخاندنی دڵ و نهێنییان، جەستەیان لە ناوەدانیدایە لەناو خەڵکیدا و دڵیان لە چۆڵ و بیاباندا، ئەوان بەردەوام دەبن لەسەر ئەو حاڵەیان تا دڵیان گەشە دەکات و باڵەکانیان بەهێزدەبن و بەرەو ئاسمان دەفڕن، هەوڵ و لێبڕانیان بەرز و بڵند و دڵیان فڕیو بۆ لای پەروەردگار(عزوجل)، گەیشتنە خزمەتی حەق(عزوجل) و چوونە ریزی ئەوانەی خودا(عزوجل) دەربارەیان دەفەرموێت:

﴿ وَإِنَّهُمْ عِندَنَا لَمِنَ ٱلْمُصْطَفَيْنَ ٱلْأَخْيَارِ ۝٤٧ ﴾ ص: ٤٧

کاتێك ئیمان دەبێت بە یەقین و یەقین دەبێت بە مەعریفە و مەعریفە دەبێت بە زانست ئەوکات دەبێت بە ئاوازە و شارەزای خودا(عزوجل)، تەسبیح بە دەستییەوە دەسوڕێتەوە و زمانی یادی خودا(عزوجل) دەکات، فەرمان بەو دڵە دەکرێت و کار دەکات، فەرمان بەو نهێنییە دەکرێت و کار دەکات، کاری ناوەوە.

﴿ وَلَهُمْ أَعْمَٰلٌ مِّن دُونِ ذَٰلِكَ هُمْ لَهَا عَٰمِلُونَ ۝٦٣ ﴾ المؤمنون: ٦٣

کارە ئاشکراکان بۆ بەندەکانە بەگشتی و ئەندامەکانی دەرەوە داگیر دەکەن، کارە ناوەکییەکانیش بۆ تایبەتانە و دڵ و نهێنی و نهێنی نهێنی داگیر دەکەن، نێوان ئەوان و خودا لەسەر پای ترسە لەگەڵ نزیکیان لە خوداوە، دەترسن لاپەڕەیان لێ وەربگیرێت و مەقامیان لێ وەربگیرێتەوە، بۆ خودا لە دەستی دەوڵەمەندان وەربگرە و بیگێڕەوە بۆ دەستی هەژاران، ئەوکات دەبیت بەو کەسەی لە چێشتخانە کاردەکەیت، رۆژی بەسەر دەستی دڵ و نهێنی تۆدا گوزەر دەکات، ریز و شکۆت نییە ئەی کەسی دووڕوو تا بەم جۆرە نەبێت، هاوار بە حاڵت، لەسەر دەستی شێخێکی خاوەن وەرعی زوهدی زانا بە هەرکەس خودا پەروەردە نەکراوی، هاوار بە حاڵت، شتێکت دەوێت بەبێ بەخشینی هیچ شتێك ئەوەش ناکات بەدەستت، گەر دونیا تەنها بە ماندووبوون بەدەست بێت ئیتر چۆن ئەوەی لەلای خودایە بەبێ ماندووبوون بەدەست دێت؟! تۆ نە گوێی ئەو سەی خودا(عزوجل) لە کتێبەکەیدا وەسفیان دەکات و دەربارەیان دەفەرموێت:

﴿ كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيۡلِ مَا يَهۡجَعُونَ ١٧ وَبِٱلۡأَسۡحَارِ هُمۡ يَسۡتَغۡفِرُونَ ١٨ ﴾

الذاريات: ١٧-١٨

کاتێك خودا راستگۆیی لە عیبادەتدا لەوان بینی شتێکی بۆ دابینکردن خەبەریان بکاتەوە و لەناو جێگەی نووستن راستیان بکاتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((خودا(عزوجل) دەفەرموێت: ئەی جبریل فلانکەس بەئاگابهێنە و فلانکەس بخەوێنە))[1].

**ئەمە دوو رووی هەیە:** فلان کەس بەئاگا بهێنە چونکە لە عیبادەتەکەیدا راستگۆیە و لە گوناهەکانی رادەکات، شەکەتی و خەوی لێ بەدووریگرە، فلان کەسیش بخەوێنە چونکە ئەو درۆزنە و پووچە لەناو پووچیدا و نەفرەتە لەناو نەفرەتدا، خەوی بدە بەسەردا تاکو رووی لەناو ئەوانەدا نەبینم شەو راستدەبنەوە، روویەکی تر: فلان کەس راستبکەرەوە، چونکە ئەو کەسێکی موحیب و داواکەرە و لە مەرجەکانی موحیبیش ماندووبوونە، فلان کەسیش بخەوێنە، چونکە مەحبوبە و لە مەرجەکانی مەحبوبیش ئاسوودەیی و پشووە، دەخەوێت و ئاسوودە دەبێت، چونکە رۆشنایی بە تاریکایی گەیاندووە تا وەفای بە پەیمانەکەی کردووە و مەحەبەتەکەی بەدەستهێناوە، کاتێك لەوەدا راستی کرد کاتی وەفای پەیمانی خودا(عزوجل) هاتە پێشەوە، چونکە بۆ هەموو کەسێکی ماندوو لە پێناوی ئەودا ئاسوودەیی و پشووی دەستەبەر کردووە، خوداناسان کاتێك حەزەکانی دڵیان بۆ لای پەروەردگاریان(عزوجل) گەشە دەکات لە خەوندا شتێك دەبینن کە لە ئاگاهیدا نایبینن، دڵ و نهێنییان شتێك دەبینن لە ئاگاهیدا نایبینن، بەرۆژووبوون و نوێژیان کرد و بە برسیکردن و شکاندنی نەفس دژ بە نەفسی خۆیان تێکۆشان و لە چەندین جۆری عیبادەتدا -لە هەڵهاتنی رۆشناییەوە تا داهاتنی تاریکی- ئەوان خەریکبوون تا بەهەشتیان بۆ بەدەست هات، کاتێك بەهەشتیان بۆ بەدەستهات پێیان وترا رێگەکە ئەمە نییە، رێگەکە بریتییە لە داواکردنی حەق(عزوجل)، ئەوکات کارەکانیان روو لە دڵ دەکات، کار دەگاتە دڵ و دامەزراو

---

[1] تقدم تخریجه.

دەبێت و ڕۆشن دەبێتەوە لە لای، هەرکەس بزانێت داوای چی دەکات ئەوەی دەیبەخشێ لە هەوڵ و کۆشان-لە گوێڕایەڵی خودادا- بە کەمی تەماشا دەکات، باوەڕدار بەردەوام لەناو ماندووبووندایە تا بە پەروەردگاری(عزوجل) دەگات.

هاوار بە حاڵت، بانگەشەی ئەوە دەکەی منت دەوێت، بەڵام ئەوەی هەتە لە منی دەشاریتەوە، تۆ لە بانگەشەکەتدا درۆت کرد، مورید لەبەردەم شێخەکەیدا نە کراس و نە مێزەرە و نە ئاڵتوون و نە ماڵ و سامانی هەیە، لەسەر خوانی ئەو خواردنە دەخوات فەرمانی پێ دەکرێت بە خواردنی، ئەو لەودا فانی بووە، چاوەڕوانی فەرمان و نەهیکردنی شێخەکەی دەکات، چونکە زانستی بەوە هەیە ئەوەی پێی دەوترێت لە خوداوەیە، بەرژەوەندییەکانی بە دەستی شێخەکەیەوەیە و کەوتووەتە ناو داوی ئەوەوە، گەر شێخەکەت تۆمەتبار دەکەی هاوەڵی مەکە، چونکە هاوەڵیکردن و هەوڵ و ویستەکەت ڕاست و دروست نابێت، نەخۆش گەر پزیشک تۆمەتبار بکات لە چارەسەرەکانی بەهرەمەند نابێت.

دوای هەندێ قسەی تر فەرمووی:

هەرکەس زوهدەکەی لە خەلکی ڕاست و دروست بێت خودا حەزی نزیکی لە ئەو دەخاتە دڵی خەلکییەوە و لە قسەکانی و تەماشاکردنی سوودمەند دەبن، گەر خەلکیت بە زانستی خودا فێرکرد و بە مەعریفەی ئەو مەعریفەت پێ بەخشین سیفەتەکانیان لە تۆ بزر دەبن، جن و مرۆڤ و فریشتە لەلات دەچنە خانەی نەبوونەوە، دڵت بە سیفەتێکی تر دەرازێتەوە، هەر بەو جۆرە نهێنیت تویکڵی بوونی خۆتی لێ دەبێتەوە، تویکڵی عادەتەکانی مرۆڤ، حوکم دێت و دەبێتە کراسی بەرت، ئەوکات لە زەویدا بە فەرمانی پەروەردگارت فەرمان بە نەفس و دروستکراوان دەکەی، زانستی ڕەببانی خودایی دێت و دەبێتە کراسی بەری دڵ و نهێنیت، پابەند بە بەوەی پێغەمبەر(ﷺ) هێناویەتی لە قورئان و سوننەت، هەرکەس ئەو دوانە وازلێبهێنێت دەبێتە زەندیق و ملوانکەی ئیسلام لە گەردنی دەکرێتەوە، ئەوکات ئاگر و سزا لە پاشەڕۆژدا دەبنە سەرئەنجامی، خەشم و تووڕەبوونی خوداییش لەم دونیایەدا

دایدەگرێتـەوە، دڵـی عـاریف لـەنێوان خۆی و خـودادا دەبێـت بـە شـتێکی تـر، دوای دامەزرانی حوکم و وەستان لەبەردەم دەرگای حەقدا(عزوجل) شایستە دەبێت بـەوەی قسـەکانی ببیسـترێن، بۆیـە ڕێگـە دەگیرێـت لـە شـوێنکەوتنی کەسـانێك حوکمیـان دانەمەزراندووە، چونکە ئەوە شتێکە هەر دەبێت ببێت و بنچینەی ئـەم کارەیـە، ئـەو کەسەی فەرمان دەکات بە کار و ئیخلاص و فێرکردنی خەڵکی لەلای خودا بـە مـەزن دەنوسرێت، بۆیە **پێغەمبەر**(ﷺ) **دەفەرموێت:** ((هەرکەس فێرببێت و کاری پێبکـات و خەڵکی پێ فێربکات لە مەلەکوت بە مەزن ناودەبرێت))[1].

**لە خەڵوەتگادا گۆشەنشین مەبە**، چونکە گۆشەنشینی لـە خـەڵکی بـە نەزانییـەوە فەسادێکی گەورەی گشتگیری لێوە پەیدا دەبێـت، بـۆ ئـەو مەبەسـتە پێغەمبـەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((تێبگە(فیقه وەربگرە) ئەوجا کەنارگیر ببە))[2].

نابێ لە خەڵوەتگادا دابنیشی و لەسەر گۆی زەوی کەسێك هـەبێت لێیبترسـیت یـان ڕجات پێی هەبێت، دەبێ تەنها یەك ترسێنەر و ڕجابەخش لەلات بوونی هەبێت ئەویش بریتییە لە خودا(عزوجل)، من تەنها خودا و هەستان بە ئایینی خودا دەناسم، ئەوەش وەك نزیکبوونەوە لە ئەو(سبحانه وتعالى)، ئایینەکەی جێبەجێ بکە و بـۆ خـودا نـەك بـۆ شتێکی تر سەرییخە، کەسی صدیق گوێی لە هاواری دینە بانگ لە دڵ و نهێنی ئـەو دەکات، گەر کەسی ڕەشۆکی سنووری خودای بەزاند و نـەهیلێکراوەکانیان ئەنجامـدا و وازیان لە فەرمانەکان هێنا و هەڵیاندایە پشتیانەوە گوێی لێیە چۆن ئاین هاوار دەکات و هانا و پەنا بۆ خودا(عزوجل) دەبات، لەو بارەدا کەسی صدیق خۆی لێ هەڵدەکات و بەرووی ئەو فەسادەدا دەوەستێت و بە فەرمان بە چاکە و ڕێگری لـە خراپـە کۆمـەکی ئاین دەکـات، ئامۆژگـاری دەکـات و بـەرگری لـە ئـاین دەکـات، ئـەو کـارە بـەهێزی پەروەردگاری ئەنجام دەدات نەك بە هێزی نەفس و ئارەزوو و سروشت و لادان و نەزانی و دووڕوویی، عیبـادەت بریتییـە لـە وازهێنـان لـە عـادەت، نـەك عـادەت جێگـەی

[1] هو من قول عيسى(عليه السلام) كما في "عون المعبود".

[2] تقدم تخريجه.

وازلێبهێنن، بە عیبادەت بگرێتەوە، پەیوەستبوون بە دونیا و دواڕۆژ و خەڵکەوە وازلێبهێنن، بە خوداوە(عزوجل) پەیوەستبن، زرق و برق نمایش مەکەن، چونکە ئەو کەسەی لێتان وردەبێتەوە کەسێکی بینایە و شتی ساختەتان لێ وەرناگرێت، ئەو دراوە ساختەیەی بە نێوەیە لە سەنگی مەحەك دەدات و لێتان وەرناگرێت، بۆیە فرێی بدەن، چونکە هیچ نرخێکی نییە، ئەوەی نەخرێتە کورەی ئاگرەوە و لە خەوش و خاڵ پاکنەبێتەوە وەرناگیرێت، بۆیە پێتان وانەبێت کارەکە ئاسانە، زۆرینەی ئێوە بانگەشەی ئیخلاص دەکەن و هێشتا کەسانێکی دووڕوون، گەر تاقیکردنەوە نەبوایە بانگەشەکەران زۆردەبوون، هەرکەس بانگەشەی حیلم دەکات بە تووڕەکردن تاقیدەکەینەوە، هەرکەس بانگەشەی بەخشندەیی دەکات بە داواکردن لێی تاقیدەکەینەوە، هەر بەو جۆرە هەرکەس بانگەشەی شتێك بکات بە دژەکەی تاقیدەکەینەوە، واز لە هەوەسبازی بهێنن و لە هەموو حاڵ و بارێکدا پابەندبن بە تەقواوە، تەقواداران پەروەردگاریان بۆ هەیە، واز لە هاوەڵدانان بهێنن لە ئەسڵدا و یاخیبوون لە لقدا پاشان دەستبگرن بە پەتی قورئان و سوننەتەوە، ئەو دوانە لە دەستی خۆتان دەرمەکەن، خودا(عزوجل) بەخشندەیە و دوو ترس لەسەر بەندەکەی کۆناکاتەوە، ترسی خوداناسان لە خواردن و خواردنەوە و پۆشین و هاوسەریکردن و هەموو هەڵسوکەوتەکانیان لە دونیادا پێشکەوت، حەرام و شوبهە و زۆرێك لە حەڵاڵیان وازلێهێنا ئەوەش وەك ترسان لە دادگای پەروەردگاریان و خراپی سزایان، لە خواردن و خواردنەوە و هەموو حاڵ و بارێکیاندا خاوەنی وەرع بوون، وەك زوهد تیایاندا شتەکانیان وازلێهێنا، کاتێك زوهد دامەزرا بوو بە مەعریفە، کاتێك مەعریفە دامەزرا زانست بە خودایان بۆ هات و بوو بە تاجێك لەسەر سەریان، بۆیە گومانی تێدا نییە حەرام و شوبهە و موباح کەمترگەبوون و حەڵاڵی رەها لەلایان مایەوە کە بریتییە لە حەڵاڵی صادیقان، ئەو حەڵاڵەی صادیقان گرنگی پێ نادەن و لا بەلایدا ناکەنەوە، گەر بەندە دونیا و دواڕۆژی وازلێهێنا و لە هەرچی شتی ترە جگە لە خودا(عزوجل) هاتە دەرەوە و دڵی لە خانەی نزیکی و منەت و لوتفی خودا نیشتەجێ بوو ئەوکات خودا داوای بەدەستهێنانی خواردن و خواردنەوە و پۆشاك و هەر شتێکی تر لە بەرژەوەندییەکانی لێ ناکات، دڵی

لە خەریکبوون بە ئەوەوە پاك رادەگرێت، دڵی نزیکان لە خوداوە بەردەوام لە نووسراوی نزیکی و زانستی تایبەتدا دەمێنێتەوە، دڵ و نهێنییان فێر دەکات چۆن فەنا بکەن لە ویست و لەبەردەستی خودادا خۆیان رابکێشن، ئەوکات خودا سەرپەرشتییان دەکات و نایاندات‌ە دەست کەسانی تر لەودیو تێگەیشتنی خەڵکەوە لەودیوی ئەم ئاشکراوە فەنایان دەکات، پاشان گەر بیەوێت دەیانناسێنێت و بە زانستی یەکەمجار و زانستی دووەمجار پشتیوانییان دەکات، نەزان بوو، پاشان زانستی وەرگرت، پاشان کاری پێکرد، پاشان ئیخلاصی نواند، پاشان زانستی دووەم فێربوو و کاری پێکرد و بێدەنگی تێدا ئەنجامدا پاشان زمانی هاتە قسە، یەکەمجار فەنا لە خۆت و پاشان بوون(وجود) بە خوداوە، ئەی دڵمردووان بۆچی لەلام دانیشتوون، ئەی بەندەکانی دونیا و سوڵتانان، ئەی بەندەکانی دەوڵەمەندان، ئەی بەندەکانی گرانی و هەرزانی، هاوار بە حاڵتان، گەر نرخی دەنکە گەنمێك بگاتە دینارێك کەسی باوەڕدار باکێکی نییە و لەلای گرنگ نییە، ئەوەش بەهۆی هێزی یەقینەکەی و پشتبەستنی بە خودا(عزوجل)، ئەفسی خۆت لە باوەڕداران سەرژمێر مەکە، خۆت لەوان جیابکەرەوە، هەرچی شتە سەرباز و قامچی خودان، پشتهەڵکردن لە خەڵکی حەقە و خەریکبوون بە خوداوە حەقترە، وانابینم ئەوەی دەیڵێم حاڵی بن، دەست بە ئاماژەکانی یەکتاپەرستییەوە بگرن و گوێبگرن بۆ قسەی صادیقان و ئەولیا، قسەکانیان-لە خوداوە(عزوجل)- وەك وەحی وایە، لە خوداوە قسە دەکەن و بە فەرمانی ئەو قسە دەکەن، تۆ هەوەسبازیت، قسەکانت لە کتێبەوە ئامادە دەکەی و پاشان دەیانبێژی، گەر کتێبەکەت بزر بوو چی دەکەی، گەر کتێبەکەت سووتا چی دەکەی؟ یان ئەو چرایەی لەبەریدا دەنووسیتەوە کوژایەوە، گەر گۆزەکەت شکا و ئەو ئاوەی تێیدابوو رژا چی دەکەی؟ کوا پیفوو و چەخماخ[1] و مۆم و کبریت و پارەتیدەرت؟ هەرکەسێك زانستێك فێربێت و کاری پێبکات و ئیخلاصی هەبێت پیفوو و چەخماخ لە دڵیدا دەبێت بە نوورێك لە نووری خودا(عزوجل) و خۆی و

[1] (پیفوو و چەخماخ رێگەیەك بوو بۆ کردنەوەی ئاگر، پیفوو مادەیەکی داری وشك بوو لە دار یان لە دەرهاویشتەی وڵاخ ئامادە دەکرا، چەخماخیش: دوو بەرد بوو، پیفووەکە دەخرا سەر یەکێك لە بەردەکان و بە بەردەکەی تر لێی دەدرا تا دوو بەردەکە پریسکیان لێوە پەیدا دەبوو و پیفووەکە گڕی دەگرت)

کەسانی تر رووناك دەكاتەوە، كەناربگرن، ئەی رۆڵەكانی زمانبازی، ئەی رۆڵەكانی لاپەڕە نووسراوەكانی دەستی نەفس و ئارەزوو، هاوار بۆ ئێوە شانشانێن لەگەڵ تایبەتاندا دەكەن، ئێوە بەو كارەتان پشتتان دەشكێت و تیادەچن و ناگەنە مەرامە و بەشی خۆتان، چۆن پێشینە و زانستی خودا بە هەوڵی ئێوە گۆڕانی بەسەردا دێت، باوەڕدار و موسڵمان بن، گوێتان لەم ئایەتە بووە كە دەفەرموێت:

﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِـَٔايَـٰتِنَا وَكَانُواْ مُسْلِمِينَ ﴿٦٩﴾ ﴾ الزخرف: ٦٩

**حەقیقەتی ئیسلام بریتییە لە "إستسلام-خۆڕادەستكردن"**، خوداناسان لەبەردەستی خودادا(عزوجل) راكشان، بۆچی و چۆن و بكە و مەكەیان لەبیرچوویەوە، بە چەندین جۆر عیبادەت گوێڕایەڵی خودا دەكەن، ئەوان لەسەر پای ترس وەستاون، بۆیە حەق(عزوجل) وەسفیان دەكات و دەفەرموێت:

﴿ يُؤْتُونَ مَآ ءَاتَواْ وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ أَنَّهُمْ إِلَىٰ رَبِّهِمْ رَٰجِعُونَ ﴿٦٠﴾ ﴾ المؤمنون: ٦٠

فەرمانەكانی خودا جێبەجێ دەكەن و لە نەهیلێكراوەكانی خۆیان دەگرنەوە و لەسەر بەڵاكان ئارام دەگرن و شوكری نیعمەتەكان دەكەن و نەفس و ماڵ و منداڵ و ناموسیان رادەستی بڕیاری پێشینەی خودا دەكەن لەگەڵ ئەوەش دڵیان دەلەرزێ و لەبەر خودا دەترسێت، كەسی عاریف كە لە دواڕۆژ زوهدی كرد پێی دەڵێت: لێم كەنارگیر ببە، چونكە دەرگای حەقم(عزوجل) دەوێت، تۆ و دونیا لەلای من یەكێكن، دونیا لە تۆ بێبەشی دەكردم و تۆش دەبیت بە پەردەی نێوان من و مەولام(عزوجل)، هەرشتێك لە ئەو(سبحانە وتعالى) بێبەشم بكات لەلام رێز و بەهای نییە، گوێ لەم قسەیە بگرن، چونكە ئەمە كرۆكی زانستی خودایە(عزوجل)، كرۆكی ویستی خودایە لە دروستكراوانی و لەناو دروستكراوانی، ئەوەش حاڵی پێغەمبەران و نێراوان و ئەولیا و صالحان بووە.

**ئەی بەندەكانی دونیا**، و ئەی بەندەكانی دواڕۆژ، ئێوە نەزانن بە خودای خۆتان و بە دونیا و دواڕۆژ، ئایا ئێوە دیوارن، تۆ بتەكەت بریتییە لە دونیا و تۆش بتەكەت بریتییە لە دواڕۆژ، ئەتۆش بتەكەت بریتییە لە دروستكراوانی خودا، تۆش بتەكەت بریتییە لە حەزەكان و چێژەكان، هەروەها تۆش بتەكەت بریتییە لە حەمد و سەنا و

قبوڵی خەڵکی بۆت، هەرچی شت و کەسە لە خوار خوداوە بتە، خوداناسان رووی دونیا و دوارۆژ هەڵدەدەنە بەردەرگای خودا(عزوجل)، هەڵیاندەدەنە ناو خانەی پزیشك ئەوەی دەیەوێت لێی وەردەگرێت و دەرخواردی نەخۆشەکەی دەدات، ئەی دووڕووان، ئێوە هەواڵێکتان لەم بارەوە نییە، کەسی دووڕوو ناتوانێت پێێك لەم باسە ببیستێت، ئەو قیامەتی لێ هەڵدەستێت، چونکە ناتوانێت گوێ بۆ حەق بگرێت، قسەکانم حەقن و من لەسەر حەقم، قسەکانم لە خوداوەن، نەك لە منەوە، لە شەرعەوەن نەك لە هەوەسبازییەوە، بەڵام ئافەتەکە تێگەیشتنی چەوت و خواری تۆیە.

**هاوار بە حاڵت**، زانست فێربوویت و کارت پێ نەکرد، ئیتر چۆن زانستەکەت سوودت پێدەگەیەنێت، لە کاتی لاوێتیدا خزمەتی گەورەپیاوانت نەکرد ئیتر چۆن لە پیریدا خزمەتیان دەکەیت؟ هەموو باوەڕدارێك لە کاتی مردندا پەردە لەسەر چاوانی لادەدرێت و شوێنەکەی خۆی لە بەهەشتدا دەبینێت، حۆرلعەین و منداڵانی کۆشك و تەلارەکەی ئاماژەی بۆ دەکەن، دەگات بە خۆشییەکانی بەهەشت و مردن و سەرەمەرگی بۆ خۆشدەبێت، خودا چی لەگەڵ ئاسیە(علیها السلام) کرد هەمان کار بۆ ئەوانیش دەکات، هەیانە بەر لە مردن لە شوێنی خۆی ئاگادار دەکرێتەوە، ئەوانە بڕیتین لە نزیکان و موورادان و تاك و تەنهاکان، هاوار بە حاڵت، ئەی ئەو کەسەی بەرهەڵستکاری خودا دەکەیت، وڕێنەی پووچ و بێمانا مەکە، قەزای خودایی هیچ بەرهەڵستکار و رەدکەرەوەیەکی بۆ نییە، خۆت رادەست بکە ئاسوودە و ئارام دەبیت، دەتوانی ڕێگری بکەیت لەم شەوە و لەم ڕۆژە، گەر شەو هات و تۆ هاتنەکەیت پێناخۆش بوو یان رۆژ هات و تۆ هاتنەکەیت پێناخۆش بوو ئایا رەد دەکرێتەوە؟ هەر بەو جۆرە خێر و شەڕ پێتخۆش بێت و پێتناخۆش بێت رووت لێ دەکات، خودا بەم جۆرە قەزا و قەدەری خۆی بەسەر تۆدا تێدەپەڕێنێت، گەر شەوی هەژاری رووی لێکردی خۆت رادەست بکە و ماڵئاوایی لە رۆژی دەوڵەمەندی بکە، گەر شەوی نەخۆشی رووی لێکردی خۆت رادەست بکە و ماڵئاوایی لە رۆژی عافییەت بکە، هەر بەو جۆرە گەر شەوی ئەو شتانەی لات گران و ناخۆشن رووی لێکردی خۆت رادەست بکە و ماڵئاوایی لە رۆژی ئەو شتانە بکە خۆشتدەویستن، پێشوازی لە شەوی دەرد و نەخۆشی و هەژاری و گەدایی بکە بە دڵێکی

ئاسوودەوە، شتێك لە قەزا و قەدەری خودا ڕەد مەكەرەوە چونكە تیادەچیت و ئیمانەكەت بارگە و بنە دەپێچێتەوە و دڵت لیخن دەبێت و نهێنیت دەمرێت، خودا(عزوجل) لە هەندێ لە كتێبەكانیدا فەرموویەتی:

((من ئەو خودایەم كە تاك و تەنهام و هیچ خودایەكی تر بوونی نییە جگە لە من، هەركەس خۆی ڕادەستی قەزای من كرد و لەسەر بەڵا ئارامی گرت و شوكری نیعمەتەكانی منی كرد لەلای خۆم بە صدیق دەینووسم، هەركەسیش خۆی ڕادەستی قەزای من نەكرد و لەسەر بەڵای من ئارامی نەگرت و شوكری نیعمەتەكانی منی نەكرد با بچێت پەروەردگارێكی تر جگە لە من بۆ خۆی داوا بكات))[1].

گەر ڕازی نەبیت بە قەزا و لەسەر بەڵا ئارام نەگریت و شوكری نیعمەتەكان نەكەیت ئەوا پەروەردگار بۆ تۆ نییە و بڕۆ پەروەردگارێكی تر بۆ خۆت ببینەوە و هیچ پەروەردگارێكیش جگە لە ئەو(سبحانه وتعالى) بوونی نییە، گەر دەتەوێت ئەوا ڕازی بە بە قەزا و باوەڕ بهێنە بە خێر و شەڕ و تاڵ و شیرینی قەدەر، ئەوەی بڕیاردراوە تووشت بێت بە خۆپارێزی لێت دوورناكەوێتەوە، ئەوەش بڕیاردراوە تووشت نەبێت بە هەوڵ و داوا بەدەستی ناهێنیت، گەر ئیمانت بۆ بەدەستهات بەرەو دەرگای ویلایەت پێشدەخرێیت، ئەوكات دەبیت بە یەكێك لە بەندە ڕاستگۆكانی خودا، ئەوانەی بەندایەتییان بۆ خودا بووە، نیشانەی وەلی ئەوەیە لە هەموو حاڵ و بارێكیدا لەگەڵ پەروەردگاری(عزوجل) تەبا بێت، هەموو بوونی بەبێ بۆچی و چۆن لەگەڵ خودا و جێبەجێ كردنی فەرمانەكان و خۆگرتنەوە لە نەهیلێكراوەكان تەبا دەبێت، گومانی تێدا نییە هاوەڵی خودا بۆ ئەو كەسە درێژە دەكێشێت، دەبێتە هاوەڵی نزیك لە خوداوە، نە بۆ لای ڕاست و نە بۆ لای چەپ و نە بۆ دواوە لانادات، بەڵكو تەنها بۆ پێشەوە، ئەو دەبێت بە سینەیەكی بێ پشت، نزیكێكی بێ دووری، پاڵفتەیەكی بێ لێڵی و لیخنی، خێرێكی بێ شەڕ، تۆ ڕجات بریتییە لە دروستكراوان و ترست لە ئەوانە، ئەوەش بریتییە لە هاوەڵدانان بۆ پەروەردگارت(عزوجل)، لەباری پێبەخشیندا

[1] رواه القرطبي في تفسيره.

حەمد و سەنای دروستکراوان دەکەی و لەباری لێگرتنەوەیان لە تۆ زەمیان دەکەی، ئەمەش دیسان هاوەڵدانانی تۆیە بۆ پەروەردگارت(عزوجل).

هاوار بە حاڵت، شتێك لەوانە بە دەستی خەلکی نییە، تۆ خێرێکت تێدا نییە، تۆ یەکتاپەرستیت نییە، هەموو شتەکان لە خوداوە دەبینرێنەوە و وەردەگیرێن، نەك لە دروستکراوانی، بە گەڕانەوە بۆ دەرگای خودا و دوای بڕینی ڕێگە بۆ لای ئەو شتەکان وەردەگیرێن، هۆ لە سەرەتاوەیە و هۆکار(سەبەبکار) لە کۆتاییدا، کەسی سەرەتا لە هۆوە داوا دەکات وەك ئەو بێچووەی داوا لە باوانی دەکات تاکو ڕۆزی پێ بدەن، کاتێك گەورە بوو و فێری فڕین بوو لە دایك و باوکی بێنیاز دەبێت، لەباری بەهێزبوونی باڵەکانیدا بۆ خۆی هەوڵی ڕۆزی دەدات، ئایا هەرگیز یەکێك لە ئێوە بووە-بەبێ هەوڵ و هێزی خۆی و بەبێ دروستکراوان و شانداندان لەسەریان- پاروویەك لە دەستی تەوەکول بە پەروەردگاری(عزوجل) بخوات؟ هاوار بە حاڵتان بانگەشەی شتێك دەکەن لە ئێوەدا بوونی نییە، چۆن بانگەشەی ئیسلام و ئیمان و یەقین و یەکتاپەرستی دەکەیت لە کاتێکدا شانت لەسەر هەوڵ و هێز و هۆ داداوە؟ کەسێکی ژیرمەند بە ئەم کارە بە بانگەشە نایەتە دی.

هاوار بە حاڵت، لەم مەقامەدا دادەنیشی و ئامۆژگاری خەلکی دەکەی پاشان لەناویاندا پێدەکەنی و حکایەتی پێکەنیناوی دەگێڕییەوە، گومانی تێدا نییە نە خۆت و نە ئەوان سەرفرازی بەدەست ناهێنن، ئامۆژگاریکەر مامۆستا و نەدەبدادەرە و گوێگران وەك مندالان وان، منداڵیش تەنها بە زبری و پابەندبوون بە سووربوون و لێبڕان و ڕووگرژییەوە فێر دەبێت، دانە دانەیەك هەیە بە ڕێگەی تر فێربێت ئەوەش وەك بەهرەیەك لە خوداوە(عزوجل)، زۆرێك لەوانەی لە ئاشکرادا بانگەشەی ئیسلام دەکەن ئەوە دەڵێن کە بێباوەڕان دەیانوت:

﴿مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَا إِلَّا الدَّهْرُ﴾ الجاثية: ٢٤

ئەوان ئەمەیان وت و زۆرینەی ئێوەش هەمان شت دەڵێن، کردارەکانتان هەمان ئەو مانا و مەرامەیان تێدایە، بۆیە لەلای من کێشی باڵە مێشوولەیەك ڕێز و بەهایان

نییە، لای خودا(عزوجل) هەموو ئەوانە دیار و بێ پەردەن، ئەوان نە ژێرییان هەیە و نە جیاکردنەوە، تاکو بتوانن زیانبەخش و قازانجبەخش جیابکەنەوە.

ئەو ئایەتە لە چیرۆکی یوسفدا(علیه السلام) کە دەفەرموێت:

﴿قَالَ مَعَاذَ اللَّهِ أَن نَّأْخُذَ إِلَّا مَن وَجَدْنَا مَتَاعَنَا عِندَهُ﴾ یوسف: ٧٩

هەرکەسێك شەکی ویلایەت و یەکتاپەرستی و ئیمانی لەلا بینرایەوە -گەر دڵ هاتە راستە- لە پای هۆ و دروستکراو وازیان لێ ناهێنێت، لەپای کڕین و فرۆشتن و وەرگرتن و بەخشیندا وازیان لێ ناهێنێت، خودا بە هۆیەکان ئەو جیادەکاتەوە و پاڵفتەی دەکات، لە بەربوونەوە راستیدەکاتەوە و لەبەر دەرگاکەی دایدەنیشێنێت و لە ئامێزی لوتفیدا دەیحەوێنێت.

هاوار بە حاڵت، کراسی ئیسلامەکەت دڕاوە، پۆشاکی ئیمانەکەت پیسبووە، تۆ رووتی و دڵت نەفامە، و نهێنیت لیخنە، سینەت بە ئیسلام واڵا نەبووە، ناوەوەت وێرانە و دەرەوەت ئاوەدان، لاپەڕەکانت رەش و ئەو دونیایەی خۆشتدەوێت کۆچ و بار لە تۆ دەکات و گۆڕ و دوارۆژ روو لە تۆ دەکەن، لە کاروباری خۆت و ئەوەی بەم نزیکانە رووی لێ دەکەیت بەئاگابە، لەوانەیە ئەمڕۆ یان لەم کاتەدا بمریت، پەردە بکەوێتە نێوان تۆ و ئاواتەکانت، ئەوەی لە دونیا ئاواتی بۆ دەخوازی نایبینیتەوە و پێی ناگەی، ئەوەش لە دوارۆژ لەبیری خۆت بردووەتەوە بە تۆ دەگات، سەرقاڵبوون بە شتانێکەوە جگە لە خودا هەوەسبازییە، ترس و رجا لە شتان و کەسانێك جگە لە خودا هەوەسبازییە، هیچ کەسێك جگە لە خودا ناتوانێت زیان و قازانج بە ئێمە بگەیەنێت، ئەوە خودایە(عزوجل) بۆ هەموو شتێك هۆیەکی داناوە، حوکم بەسەر هۆیەکەدا دێت، گەر بە خوداوە کارت بە حوکم کرد کارکردنت بە خوداوە ئەنجامداوە، ئەوکات هۆیەکان لە تۆ هەڵدەوەرێن وەك چۆن گەڵا لە دار بەردەبێتەوە، هۆکار(سەبەبکار) دەردەکەوێت و هۆ نامێنێت، کرۆك دەردەکەوێت و توێکڵ دەڕوات، کرۆك بریتییە لە پەیوەستبوون بە سەبەبکارەوە(خوداوە)، هەر ئەوەش بریتییە لە ئەسڵ و بناغە، ئەوە وەك بەرێك وایە لە داری یەکتاپەرستییەوە، کەسی یەکتاپەرست

له حاڵێکەوە بۆ حاڵێکی تر دەگوێزێتەوە، لە کوپەی ناوەکەوە بۆ ناوگێڕەکە و لە ناوگێڕەکەوە بۆ رووبارەکە و لە رووبارەکەوە بۆ دەریاکە، بەم جۆرە لە لقەوە بۆ ئەسڵ دەگوێزێتەوە، لە رۆڵەوە بۆ باوك و لە بەندەوە بۆ مەعبوود، لە بەدیهاتوودەوە بۆ بەدیهێنەرەکە، لە دەستەوسانەوە بۆ خاوەن توانا و دەسەڵات، لە هەژارییەوە بۆ دەوڵەمەندی، لە لاوازییەوە بۆ هێز و توانین، لە کەمییەوە بۆ زۆری، لەسەر من زماندرێژی مەکەن، زۆرینەتان دڵتان لە ئیمان خاڵییە، هەرکەسێك لە ئێوە پێویستییەکی لە نەفسی خۆیدا هەیە با بە لەغاوی بێدەنگی و ئەدەبی جوان لغاوی بکات و بە زرێپۆشی تەقوا زرێپۆشی بکات، چونکە ئەوە هۆی دڵنیایی و ئارامی و گەیشتنی ئەوە بە پەروەردگاری(عزوجل)، گەیشتن دوو گەیشتنە: تایبەت و گشتی، گشتی بریتییە لە گەیشتن بە خودا لەدوای مردن، تایبەتیش بریتییە لە گەیشتنی دڵی دانە دانەیەك لە خەڵکی بە خودا(عزوجل) بەر لە مردن، ئەوانەش بریتین لەو کەسانەی دژ بە نەفسی خۆیان تێکۆشان دەکەن و سەرپێچی لە داواکانی دەکەن و لە دروستکراوان-لەو شتانەی پەیوەندی بە زیان و قازانجەوەیە- دێنە دەرەوە، گەر لەسەر ئەمە بەردەوام بوو ئەوا گەیشتنی بە خودا وەك گەیشتن بە خودای خەڵکی رەشۆکی لێ دێت لەدوای مردنیان[1]، هەرکەسێك ئەمەی بۆ هاتە راستە دامەزران و کرانەوە و ئاخافتن و هۆگری بۆ دێت، ئەوکات ئەو کەسە گەیشتووە دەڵێت:

﴿وَأْتُونِي بِأَهْلِكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٣﴾﴾ یوسف: ٩٣

یوسف(علیه السلام) کاتێك لە بیر و بەندیخانە هاتە دەرەوە و لەسەر ئەو ناخۆشییانە ئارامی گرت خودا دامەزرانی لەسەر زەوی پێبەخشی و هەمووان کەوتنە ژێر باڵی سەرۆکاری ئەوەوە و بە براکانی خۆی فەرموو:

﴿وَأْتُونِي بِأَهْلِكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٣﴾﴾ یوسف: ٩٣

---

[1] (واتە چۆن کەسی رەشۆکی لەدوای مردن حەقیقەتەکان دەبینێت کەسی عاریف بەهەمان شێوە لە دونیادا و لە ژیاندا حەقیقەتەکان دەبینێت).

کاتێك دەوڵەمەندی و موڵکی کەوتە دەست و گرژی و تەنگەلانی نەما و کرانەوە رووی لێکرد، بەر لەوە لە چاڵەکە و لە بەندیخانەکەدا زمان لاڵ بوو، کاتێك هاتە دەرەوە زمانڕەوانی رووی لێکرد.

خەڵکینە، هەموو شتێك لە دروستکەری هەموو شتەکان داوا بکەن، هەموو بوونتان بۆ گەیشتن بە ئەو ببەخشن، خوداناسان رۆحیان بەخشی لەپێناو داوای نزیکی لە پەروەردگارەوە(عزوجل)، زانیان داواکەیان چەندە مەزنە بۆیە رۆحیان لەو پێناوەدا بەخشی، هەرکەسێك بزانێت چی داوا دەکات ئەوەی لەو پێناوەدا دەیبەخشێت لەسەری ئاسان دەبێت.

دەگێڕنەوە پیاوێك بە پاڵ کۆیلەفرۆشێکدا گوزەری کرد و جاریەیەکی جوانی لەلای بینی، دڵی بەو جاریەوە پەیوەست بوو و نەیتوانی ئەو شوێنە بەجێبهێڵێت، ئەسپێکی لەژێردا بوو نرخەکەی سەد دینار بوو، پۆشاکی زۆر جوانی پۆشی بوو، شمشێرێکی پێ بوو بە زێڕ رازابوویەوە، لەبەردەستیدا بەندەیەکی رەشپێست هەبوو هەموو شتەکانی پێدا و بردی بۆ خاوەنی جاریەکە و داوای لێکرد پێی بفرۆشێت، ئەویش پێی وت: گومانی تێدا نییە تۆ جاریەکەی منت خۆشویستووە، کەسی موحیب دەبێت بۆ گەیشتن بە مەحبوویەکەی هەرچی شت هەیە بیبەخشێت، من نایفرۆشم هەتا هەموو شتەکانی بەردەستت لەم کاتەدا بە من نەبەخشی، ئەویش لە ئەسپەکەی دابەزی و هەموو پۆشاکە گرانبەهاکانی لەبەر خۆ کردەوە و لە بابای کۆیلەفرۆش کراسێکی خواست و هەموو شتەکانی-لەگەڵ بەندە رەشپێستەکەش کە لە بەردەستیدا بوو- رادەستی ئەو کرد و جاریەکەی وەرگرت و بەپێی پەتی و سەری رووت گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، کاتێك نرخەکەی پێدا کڕاوەکەی خۆی وەرگرت، زانی داوای چی دەکات بۆیە بەخشینی هەموو شتەکان لەلای ئاسان بوو، کەسی راستگۆ لە خۆشەویستیدا لەپێناوی مەحبوویەکەیدا لەپای هیچ شتێك ناوەستێت، گەر یەکێك بڵێت هەواڵی بەهەشتم بیستووە و دەزانم چ نیعمەتێکی تێدایە بە ئایەتی:

﴿وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ الْأَنفُسُ وَتَلَذُّ الْأَعْيُنُ﴾ الزخرف: ٧١،

ئایا نرخەکەی چەندە؟ پێی دەڵێین: خودا(عزوجل) بۆخۆی فەرموویەتی:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱشْتَرَىٰ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلْجَنَّةَ﴾ التوبة: ١١١

نەفس و ماڵەکەت رادەست بکە بەهەشت بەدەست دەهێنیت، یەکێکی تر دەڵێت: من دەمەوێت لە ریزی ئەوانە بم رووی پاکی خودایان دەوێت، دڵم سەرنجی داوە لە دەرگای نزیکی لە خوداوە و موحیبانی بینیوە لێیەوە دەچوونە ژوورەوە و لێیەوە دەهاتنە دەرەوە و پۆشاکی بەخشراوی مەلیکیان پۆشی بوو، ئایا نرخەکەی چەندە؟ پێی دەڵێین: هەموو بوونت ببەخشە و واز لە حەزەکان و چێژەکانت بهێنە و تیایدا لە خۆت فانی ببە و دەستبەرداری بەهەشت و ئەوەی لە بەهەشتدایە ببە و وازی لێبهێنە، هەر بەو جۆرە دەستبەرداری نەفس و ئارەزوو و سروشت ببە، پشتهەڵبکە لە حەزە دونیایی و دوارۆژییەکان، هەموو ئەوانە وازلێبهێنە و هەڵیانبدە پشتەوە و دڵت پاکبکەرەوە و پاشان برۆ ژوورەوە، لەوێ شتێك دەبینی چاو نەیبینیوە و گوێ نەیبیستووە و بە خایلە و ختووره بە دڵی مرۆڤدا گوزەری نەکردووە، هەرکەسێك ئەمەی بۆ تێر و تەواو بوو و پێیەکانی دڵی تیایدا دامەزرا دەبێتە خاوەنی دونیا و دوارۆژ، ئەو دوانە-بەبێ تالآو-بۆی دەبن بە نیعمەتێکی پاك و بێگەرد، دونیا دەبێت بە میوانخانەی ئەو و دوارۆژیش خانەی نزیکی لە خوداوە و شوێنی تەماشا کردنی خودا(سبحانه وتعالى)، تەماشاکردنی خودا لە دونیادا بە دڵە، بەڵام لە رۆژی دواییدا بە چاوە.

ئەی گەنج،

﴿قُلِ ٱللَّهُ ثُمَّ ذَرْهُمْ﴾ الأنعام: ٩١

بڵێ:

﴿ٱلَّذِى خَلَقَنِى فَهُوَ يَهْدِينِ ۝٧٨﴾ الشعراء: ٧٨

ئەی کەسی زاهید لە دونیا گەر دڵت لە دونیا بێتە دەرەوە و داوای دوارۆژ بکات

بڵێ:

﴿ٱلَّذِى خَلَقَنِى فَهُوَ يَهْدِينِ ۝٧٨﴾ الشعراء: ٧٨

تۆش ئەی موریدی حەق(عزوجل)، ئەی ئەو کەسەی حەز و خۆشەویستیت لە ئەودایە و لە هەرچی شتی ترە جگە لە مەولا(عزوجل) زوهدت کردووە، گەر دڵت لە دەرگای بەهەشت هاتە دەرەوە و داوای مەولای کرد بڵێ:

﴿ ٱلَّذِي خَلَقَنِي فَهُوَ يَهۡدِينِ ۝٧٨ ﴾ الشعراء: ٧٨

بە هیدایەتی خوداوە خۆت سەرقاڵ بکە و لە چاڵوچۆڵەکانی ڕێگە خۆت بپارێزە، هەرکەس دەیەوێت لەم دوو ڕێگەیەوە سلوك بگرێتە بەر با شوێنی ئەوانە بکەوێت پێشتر ڕێگەیان گرتووەتە بەر و جێگە ترسناکەکان دەزانن، ئەوانەش بریتین لە گەورەپیاوانی کارکەر بە زانست و خاوەن ئیخلاص لە کارەکانیاندا.

ئەی گەنج، ببە بە خزمەتکاری ڕێنیشاندەر و شوێنی بکەوە، وڵاخی سواریەکەت لەبەردەستی ئەودا وازلێبهێنە، لەگەڵی بڕۆ جارێك لەلای ڕاستەوە و جارێك لەلای چەپەوە و جارێك لە دواوە و جارێك لە پێشەوە، لە ڕای ئەو دەرمەچۆ و سەرپێچی لە قسەکانی مەکە، چونکە بەو کارە بە مەبەستی خۆت دەگەیت و لە جادەکە لانادەیت، پەروەردگارت بە تاك و تەنها رابگرە کارەکانت دێنە ڕاستە و تەنگەژەکانت لێ دەبنەوە، کاتێك ئیبراهیم(علیه السلام) لەناو مەنجەنیقدا بوو بۆ ئەوەی هەڵیبدەنە ناو ئاگرەکەوە، هەرچی هۆکارە لە ئەو بڕا و لای بە لای هیچ شتێکدا نەکردەوە جگە لە پەروەردگاری(عزوجل)، بۆیە گومانی تێدا نییە بە ئاگر دەوترێت:

﴿ قُلۡنَا يَٰنَارُ كُونِي بَرۡدٗا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ ۝٦٩ ﴾ الأنبياء: ٦٩

ئەی ئاگر کەنارگیر ببە و گۆڕانت بەسەردا بێت و ئاڵوگۆڕ بەسەر گەرمی و تینی خۆتدا بهێنە، تیر و کەوانت بکشێنەرەوە، گەرمی و تووڕەیی خۆت وەلانێ و لەو سیفەتە رووتبەرەوە، ببە بە ساردییەکی بێ زیان، هەموو ئەمە بە بەرەکەتی یەکتاپەرستی و ئیخلاص تیایدا، کاتێك بەندە پەروەردگاری بە تاك و تەنها رادەگرێت و ئیخلاصی بۆی دەبێت، جارێك بۆ ئەو دەبێت و دەچنە ناو پێکهاتن(تکوین)ییەوە، جارێکیش پێکهاتنی رادەست دەکات و ئەو بۆ نەفسی دەبێت، ئەمەیان بۆ تایبەتانە لە دروستکراوان، هەرکەسێك بچێتە بەهەشتەوە بە شتەکان دەڵێت "کن-ببە" ڕاستەوخۆ "فیکون-

دەبێت" گرنگی لە پێکهاتنی ئەمڕۆدایە نەك سبەینێ[1]، ئیبراهیم(علیه السلام) بەردەوام لەسەر پای تەوەکول بوو لە منداڵییەوە تا گەورەیی، گەر خەڵکی لە جیران و خەڵکانی تر دووردەکەوتنەوە و ماڵ و منداڵ زیادی کرد لەگەڵ بوونی هەژاری و تەنگەلانی لە گوزەراندا و گرانی نرخ و داخستنی دەرگا بە رووی ئێوەدا لەلایەن براکانەوە ئەوکات بیر لەوە دەکەنەوە من بە ئێوەم وتووە، بیرتان دەکەوێتەوە و پەشیمان دەبنەوە، گوێم لێبگرن من نوێنەری پێغەمبەری خودا(ﷺ) و هەموو ئەوانەم رەوانەی کردوون.

**خودایە**، داوای لێبووردن و عافییەتت لێ دەکەم لەم نوێنەرایەتییەدا، لەم کارەی منی تێکەوتووە یارمەتیم بدە، پێغەمبەران و نێراوانت برد بۆ لای خۆت، منت لە ریزی یەکەم راوەستان تاڵاوی دروستکراوانت دەچێژم، خودایە داوای لێبووردن و عافییەتت لێ دەکەم، شەڕی شەیتانەکانی ئینس و جین و هەموو دروستکراوانم لێبکەرەوە. ئامین.

**هەروەها فەرمووی:**

ئەی زاهیدان و ئەی عابیدان ئیخلاصتان هەبێت ئەگینا شوێنم مەکەون، خۆشیتان لە رۆژ و نوێژ و زبری خواردن و زبری پۆشاك وەرگرت بەبێ بوونی نییەت و ئیخلاص، بەڵکو لەگەڵ ئامادەبوونی نەفس و چوونە ناو ئارەزوو، هاوار بە حاڵتان، خوداناسان لەسەر ئاستی دڵ کارەکانیان لەو دیو کارەکانی ئێوەیە، ئەوان بە هاوەڵی حوکم و پارێزگاری لە سنوورەکان لە دەرەوە و ناوەوە و لە نهێنی و ئاشکرا و لەگەڵ خودا و خەڵك و قەدەر دەسوڕێنەوە، فەزڵ بۆ هەموو خاوەن فەزڵێك دەگێڕنەوە و مافی هەموو خاوەن مافێك دەدەن، مافی کتێبەکەی خودا و سوننەتی پێغەمبەرەکەی دەدەن، مافی ئەو خودایەی لە دڵیاندا جێبەجێ دەکەن، بە مافی خانەوادە و مافی نەفسی خۆیان و مافی دڵ و مافی دروستکراوان هەڵدەستن، ئەوان لە سپاردن و دامەزران و بەندبوون و بەربوون و وەرگرتن و بەخشیندان، سنوورەکان بەسەر دڵ و نهێنیدا جێبەجێ دەکەن، لەگەڵ دروستکراوان چاکە دەکەن، ئەمە کارێکە لەو دیو کاروبارەکان و زانراوەکانی ئێوەوە، کەسی باوەڕدار گەر

[1] (واتە گرنگە لە دونیادا ئەم سیفەتە بەدەست بهێنی و بتوانی بە شتێك بڵێیت "ببە" و "ببێت" نەك لە بەهەشتدا).

ئامۆژگاری براکەی کرد و لێیوەرنەگرت پێی دەڵێت: پاشان بیر لەم قسانەی من دەکەیەوە، من کاروبارەکانم بە خودا دەسپێرم[1]، کەسی عاریف دژ بە نەفسی دروستکراوان دەکۆشێت بەهۆی شمشێری یەکتاپەرستی و مەعریفەکەیەوە، هەرکەسێك لە نهێنییەکانی ئەو بەدەستبهێنێت هەڵیدەگرێت بۆ دەرگای مەلیك، ئەو(سبحانه وتعالی) بینایە(بصیر) بە بەندەکانی خۆی، خۆشترین شت لەلای باوەڕدار عیبادەتە، خۆشترین شت لەلای ئەو نوێژە، ئەو لە ماڵەوە دانیشتووە و دڵی چاوەڕوانی بانگوێژ دەکات کە بانگەری حەقە(عزوجل)، گوێی لە بانگ دەبێت خۆشی دەچێتە ناو دڵییەوە و بەرەو مزگەوت دەفڕێت، بە هاتنی سواڵکەرێك دڵخۆش دەبێت گەر شتێکی لەلا بێت و بیەوێت بیبەخشێت، چونکە گوێی لە پێغەمبەر(ﷺ) بووە فەرموویەتی: ((سواڵکەر هەدیەی خودایە(عزوجل) بۆ لای بەندەکەی خۆی))[2].

چۆن دڵخۆش نابێت لە کاتێکدا فەرمانی پەروەردگاری جێبەجێ کردووە، خودا لەسەر دەستی کەسی هەژار داوای قەرز لە ئەو دەکات، ئەمە بریتییە لە ئادابی باوەڕدارێکی عابید، بەڵام کەسی عاریف سنووری شەرع رادەگرێت، دڵی دەپارێزێت لە هاتنەژوورەوەی هەر شتێك جگە لە پەروەردگاری، دڵی دەپارێزێت و ناهێڵێت ترسی هیچ کەسێکی تری تێدا بێت، نایەوێت شان لەسەر هیچ کەسێکی تر جگە لە خودا دابدات، دڵی لە پەیوەبوون بە دروستکراو و هۆ دەپارێزێت، لیقای خەڵکی پێناخۆشە و هەردەبێت لیقای لەگەڵیان هەبێت، چونکە ئەوان نەخۆشن و کەسی عاریف پزیشکەکەیانە، ژیانی ناو دونیا و ژیانی ناو دوارۆژی لا ناخۆشە، ئەوەش لە خۆشەویستی بۆ نزیکی لە خوداوە کە هەموو ئاوات و هەڵبژاردنێکی ئەوە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: ((خودا لە رۆژی دواییدا بە بەندە باوەڕدارەکانی دەفەرموێت: دوارۆژتان بەسەر دونیادا هەڵبژارد، عیبادەتتان بەسەر حەزەکاندا هەڵبژارد، سوێند بە عیززەت و جەلالی خۆم بەهەشتم تەنها بۆ ئێوە دروستکردووە))[3].

---

[1] (ئاماژەیە بە ئایەتی: ﴿ فَسَتَذْكُرُونَ مَا أَقُولُ لَكُمْ وَأُفَوِّضُ أَمْرِي إِلَى اللَّهِ ﴾ غافر: ٤٤).

[2] في زوائد السيوطي على الجامع الصغير بلفظ قريب منه، وانظر كشف الخفاء(١٩٦).

[3] لم اجد له أصلا.

ئەمە فەرموودەی خودایە لەگەڵ ئەوانە.

بەڵام قسەی خودا(عزوجل) لەگەڵ موحیبانی خۆی ئەوەیە کە پێیان دەفەرموێت: ئێوە بەسەر هەموو دروستکراوانی دونیا و دوارۆژدا منتان هەڵبژارد، دروستکراوتان لە دڵی خۆتان کەنارگیر کرد و لە نهێنیدا وەلاتاننان، ئەوە رووی پاکی من و نزیکی لە منەوە بۆ ئێوە، ئێوە بەڕاستی بەندەی منن، هەندێ لە ئەولیا لە رۆژدا لە خۆراکی بەهەشت دەخوات و لە خواردنەوەی بەهەشت دەخواتەوە و هەموو ئەو شتانەی لە بەهەشتدایە دەیبینێت، هەیانە لە خواردن و خواردنەوە فەنا دەبێت و لە دروستکراوان کەنارگیر دەبێت و خۆی دەشارێتەوە و لە زەویدا تەمەندرێژ دەبێت بەبێ مردن وەك "ئیلیاس و خدری زیندە"، ژمارەیەکی زۆر هەن لەوانە، لەسەر زەوی شاراونەتەوە، ئەوان خەڵکی دەبینن و خەڵکی ئەوان نابینن، زۆرینەیان ئەولیای خودان، و کەمێکیان سەروەرانن و دانە دانەیەکیان ناوازەکانن، هەمووان دێن بۆ لای ئەو دانە دانانە و لێیان نزیك دەبنەوە، ئەوان ئەو کەسانەن زەوی بەوانەوە سەوز دەبێت و ئاسمان بەوانەوە باران دەبارێنێت و بەوانەوە بەلا لە خەڵکی دەبێتەوە، خواردن و خواردنەوەی فریشتەکان بریتییە لە یادی حەق و تەسبیحات و تەهلیلات(سبحان الله، لا إله إلا الله)، دانە دانەیەك لە ئەولیا خۆراکیان دەبێت بەوە، ئێوە چیتانە لە بیستنی ئەمانە، زۆرینەتان بیلبیلەی چاوی ئیبلیس و بەندەی ئەون، رێز و بەها بۆ ئێوە و ئەو بوونی نییە، ئەی ئەو کەسەی خۆت خزاندووەتە دێرێك[1] واز لە خزمەتی ئەو بهێنە و لێی جیابیەرەوە، بە پای دڵەوە بچنە ژوورەوە بۆ لای حەق(عزوجل) و داوای لێ بکەن کەسێکتان پێی نیشان بدات رێنماییتان بکات بۆ ئەو کارەی خودا لێی رازییە و پێی رازییە، داوای لێ بکەن بەکارتان بهێنێت، داوای لێ بکەن گەنجینەیەکتان پێ نیشان بدات بۆ هەتاهەتایە کۆتایی پێ نەیەت، سەرچاوەیەکتان پێ نیشان بدات هەرگیز وشك نەکات، داوای لێ بکەن دونیاتان لەبەرچاو ناشیرین بکات و دوارۆژتان لەلا شیرین بکات، گەر ئەوەی پێ بەخشین داوای لێ بکەن دوارۆژتان لەبەر چاو بخات و کارکردن بۆ ئەو(سبحانە وتعالی) و خۆشەویستی بۆ ئەو و کۆچکردن لە هەرچی شتە جگە لە ئەو بکات بە بەشتان.

---

[1] (شوێنی عیبادەتی روهبانەکان).

تۆ بەندەی دروستکراوانی، بەندەی هۆی، گەر تۆ بەندەی حەق(عزوجل) بیت هەموو کارەکانت بە ئەو دەسپێریت و پێویستییەکانت بۆ لای ئەو دەگێڕییەوە، بۆ شتێك دەڵێن و کارەکانتان قسەکان بەدرۆ دەخاتەوە، گوێتان لە پەروەردگارتان نەبووە دەفەرموێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ۝٢ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ۝٣ ﴾ الصف: ٢- ٣

فریشتەکانی سەرشانتان لە بەدڕەفتاری ئێوە سەریان سوڕدەمێنێت، لە زۆری درۆی ئێوە لە حاڵدا ئەوان سەرسامن، سەریان سوڕدەمێنێت لە درۆی ئێوە لە یەکتاپەرستیدا، هەموو قسەکانتان دەربارەی هەرزانی و گرانی و کاروباری سوڵتانەکان و دەوڵەمەندانە، فلان کەس خواردی و فلان کەس پۆشی و فلان کەس هاوسەرگیری کرد، فلان دەوڵەمەند بوو و فلان هەژار کەوت، هەموو ئەمانە هەوەسبازی و خەشم و تووڕەیی خودایی و سزایە بۆ ئێوە، تەوبە بکەن و واز لە گوناهەکانتان بهێنن و تەنها بۆ لای پەروەردگارتان بگەڕێنەوە، یادی گوناهەکانتان بکەن و هەرچی شتی تر جگە لە خودا لەبیری خۆتانی ببەنەوە، دامەزران لەسەر قسەکانم نیشانەی بوونی ئیمانە و راکردن لێیان نیشانەی دووڕوویییە، ئەی ئەو کەسەی تانەم لێ دەدەی، وەرە حاڵی من و حاڵی تۆ بدەین لە سەنگی مەحەکی شەرع، هەرکامێکمان حاڵی لە شەرع بەدەربوو، شك و گومان کەوتە سەر حاڵی شایستە دەبێت بە تانەلێدان و کۆچلێکردن، ئەوکات بە ناوی خودا(عزوجل) مردن دەرگای پێ دەگرێت، خۆت دەربخە و خۆت مەشارەوە و رامەکە وەك نێرەمووك، ئەوە نیشانەی پووچی و هەوەسبازی و سووکی تۆیە.

**هاوار بە حاڵت،** بەم نزیکانە هەواڵی تۆش ڕۆشن دەبێتەوە، خودایە تەوبەمان لێ قبووڵ بکە و لە دونیا و دوارۆژدا شەرمەزارمان مەکە.

**ئەی گەنج،** کارەکەی تۆ لەسەر بنچینەیەکی پتەو دانەمەزراوە، گومانی تێدا نییە دیوارەکەت دەڕمێت، بینای تۆ بیدعە و گومڕاییە، بینای تۆ ریا و دووڕوویییە، ئیتر چۆن بیناکەی تۆ دامەزراو دەبێت، ئەوە ئارەزوو و سروشتە، دەخۆیت و دەخۆیتەوە و هاوسەری دەکەیت و بە ئارەزوو و سروشت کۆدەکەیەوە، نییەتی چاکت نییە لە هیچ کام

لەوانەدا، باوەڕدار لە هەموو کار و حاڵ و بارێکیدا نییەتی باشی هەیە، بە فەرمانی خودا(عزوجل) دەخوات و دەخواتەوە و دەپۆشێت و هاوسەری دەکات، ئەو لە دونیا و دواڕۆژدا بەم جۆرەیە، لە دونیادا بە هۆی شەرعەکەیەوە فەرمانی پێ دەکرێت و لە دواڕۆژدا بەبێ بوونی ناوەند، دونیا و خێرایی تیاچوونەکەی دەبینێت، بۆیە زوهدی لێ دەکات و بیر لە هاتنی بەشەکانی خۆی دەکاتەوە، ئەو بەشانە بە شاهیدی شەرع و دڵ وەردەگرێن و دەستیان بۆ دەبات، بۆیە دەڵێت: هیچ پێویستییەکم بەمانە نییە و دڵی بۆ لای راست و چەپ لەو بەشانە هەڵدێت، بەڵام پابەند و ناچار دەکرێت لەسەر وەرگرتنیان، ئەمە حاڵی ئەوە لە دونیادا، حاڵی لە دواڕۆژدا چاوی بە رووی بەهەشتدا ناکاتەوە تا بە پەروەردگاری(عزوجل) شاد دەبێت، گەر دەستی بۆ شتێك لە بەهەشت برد تەنها بە فەرمانێکی پێداگر و پێشکەوتنی ئاماژە دەستی بۆ دەبات، ئەو کات وەك برپارێکی قەزا فەرمانەکە دەربارەی بەهەشت قبووڵ دەکات، مافی حورلعەین و خزمەتکارانی بەهەشت دەدات، پێغەمبەران(علیهم السلام) و نێراوان و شوهدا و صالحان لەو حەزانەدا -لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر- تەبابوون، ئەگینا زۆرینەی کاتەکانیان لای پەروەردگار بووە، گەر لە هەموو حاڵ و بارێکدا تەقوای پەروەردگارت کرد لە ئەوەوە دەرووت لێدەکرێتەوە، ئەم ئایەتەت بیستووە کە دەفەرموێت:

﴿وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا ۝ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ﴾ الطلاق: ٢ - ٣

ئەم ئایەتە دەروازەی شانداداني لەسەر هۆیەکان داخستووە، دەرگای دەوڵەمەندان و مەلیکانی داخستووە و دەرگای تەوەکولی کردووەتەوە، هەرکەسێك تەقوای ئەو بکات پاداشتی دەداتەوە بەوەی دەروو و چارەسەر بۆ ئەو تەنگەلانی و تەنگەژەی ئەو بدۆزێتەوە کە خەڵکی تەنگاتاو کردووە، من نازانم چی لە ئێوە بکەم؟ چەند جار پێمتوون:

لقد أسمعت لو ناديت حيا

ولكن لا حياة لمن تنادي

(دەنگت دەبیسترێت گەر بانگ لە زیندوویەك بکەیت، بەڵام گیان لەبەری ئەو کەسەدا نییە تۆ بانگی لێ دەکەی)

دڵت لە ئیسلام و ئیمان و یەقین خاڵییە، نە مەعریفەتت هەیە نە زانست، تۆ بریتیت لە هەوەسبازی، قسەکردن لەگەڵت تەمەن بەفیڕۆدانە، ئەی دوورڕووان بێ لەوەڕگا و تەوەکول بە زمان و هاوەڵدانان بە دڵ قەناعەتتان کرد، دڵم پڕە لە ڕق بەرانبەرتان ئەوەش وەك غیرەتێك بۆ خودا(عزوجل)، گەر بێدەنگ بن و شانشانێ وازلێبهێنن بۆ ئێوە باشە، ئەگەر نە، ماڵەکانتان بەسەردا دەسووتێنم، ئەی ناپاکان ئاوی سوێر و ئاوی ڕەوان کەوتووەتە نێوان من و ئێوە، کەوتووەتە نێوانمان بەهۆی ناڕازیبوونەکانت لە خودا و ململانێکانتان بەرانبەر بە قەدەر، گوناه و یاخیبوونەکانت ئێمەی لە تۆ جیاکردووەتەوە، خودایە بە ڕەحمەتی خۆت ئاسوودەی بکەی. ئامین.

ئەی گەنج، گەر تەقوادار بیت بۆ پەروەردگارت، یادی ئەو بکەی و یەکتاپەرست بیت بۆی، و بەر لە هاتنی بەڵا ئاماژەی دڵت بۆ لای ئەو بێت ئەوا کاتێك بۆ ناو دەروازەی بەڵا بەردەبییەوە بە بەڵاکە دەفەرموێت:

﴿ يَٰنَارُ كُونِي بَرۡدٗا وَسَلَٰمًا ﴾ الأنبياء: ٦٩

خودایە، بەو جۆرەمان لەگەڵ بکە هەرچەند شایستە نین، بە بەخشندەیی خۆت مامەڵەمان لەگەڵ بکە، خودایە، پشتمان تێمەکە و دەستمان لێ بەرمەدە. ئامین.

ئەدەب بۆ کەسی عاریف فەرزە، وەك تەوبە وایە بۆ کەسی سەرەتای گوناهکار، چۆن نابێت خاوەنی ئەدەب بێت لە کاتێکدا ئەو نزیکترین دروستکراوی خودایە لە دروستکەرەوە(سبحانه وتعالى)، هەرکەس بە نەزانی مامەڵە لەگەڵ مەلیکان بکات نەزانینەکەی سەردەکێشێت بۆ کوشتنی، هەرکەسێك ئەدەبی نەبێت لەلای دروستکەر و دروستکراوان کەسێکی خەشڵێگیراوە، هەرکاتێك ئەدەبی تێدا نەبێت کەسەکە خەشڵێگیراوە، هەردەبێت ئەدەبی جوانت لەگەڵ خودا(عزوجل) هەبێت، با ئەدەبتان جوان بێت و ڕوو لە دوارۆژی خۆتان بکەن، پشت لە دونیاکەتان بکەن و وەك پێنباوەڕان ڕوو لە دونیا مەکەن، چونکە ئەوان بەهۆی کەمی هەواڵیان لەم دونیا ڕووی لێدەکەن و خۆشییان دەوێت، بەندە لە یاخیبوون و هەڵخلیسکان و گوناهەکانی تەوبە دەکات و بە ڕۆژووی ڕۆژ و نوێژی شەوانەوە سەرقاڵ دەبێت و لە کەسابەتی دەستی خۆی دەخوات

کە بریتییە لە حەلاڵی شەرع، پاشان بەرزدەبێتەوە و دەبێت بە کەسێکی خاوەن وەرع پاشان بەرزدەبێتەوە و دەبێت بە کەسێکی زاهید، پاشان بەرزدەبێتەوە دەبێت بە کەسێکی عاریفی دڵ هەژار بۆ لای خودا(عزوجل)، لە خزمەتی خودا دادەنیشێت و ناخافتنی لەگەڵ دەکات، دڵی لە دروستکراوان خاڵیدەکاتەوە، لێیان بێنیاز دەبێت و هەژاری خۆی بۆ خودا(عزوجل) نیشان دەدات، لەگەڵ ڕۆحی پێغەمبەران(علیهم السلام) و هەڵبژاردەکانی خودا لە خزمەتی خودا دادەنیشێت، هۆگری بە خوداوە پەیدا دەکات و لێی نزیکدەبێتەوە، ئەمە دوای چەندێك و چەندێك لە کۆشان و ماندووبوون.

**هاوار بە حاڵت**، تۆ نازانیت حاڵ چییە بۆ قسە لە حاڵ دەکەیت، حەق(عزوجل) ناناسیت بۆچی بانگ دەکەیت بۆ لای ئەو(سبحانه وتعالی)؟ تۆ تەنها ئەم دەوڵەمەند و ئەو سوڵتان دەناسیت، نە پەیامهێنێکت هەیە نە پەیامنێرێك، بە وەرع ناخۆیت، بەڵکو بە حەرام دەخۆیت، دونیا بە دین دەخۆی، ئەوە حەرامە تۆ کەسێکی دووڕووی دەجالی، منیش تۆ دەبوغزێنم و تەخت و تاراجی دووڕووان وێران دەکەم، نەقڵیان کون دەکەم، پاچ و نوێڵم ماڵی ئەو کەسە دووڕووە وێران دەکات و ئەو ئیمانەی بانگەشەی دەکات نامێنێت، کەسی دووڕوو چەکێکی پێ نییە پێی بجەنگێت، ئەسپێکی پێ نییە سواری بێت و هێرشی پێ بکات و بەهۆیەوە لە نێوان دروستکراو و دروستکەر و ئاشکرا و پەنهان و هۆ و هۆکار و حوکم و زانستدا غاربکات، لە کاتی هاتنی نافەتدا کاریگەری ئیمان و کاری یەقین و هێزی یەکتاپەرستی و تەوەکول و متمانە بە خودا(عزوجل) ڕۆشن دەبنەوە، ئیمان بەڵگەیە لەسەر بانگەشە، باوەڕداران بە دڵ لە خودا(عزوجل) دەترسن و ڕجایان لەلای ئەوە نەك لای کەسانی تر، پێویستییەکانیان دەبەن بۆ لای خودا نەك بۆ لای کەسانی تر، دەگەڕێنەوە بۆ لای دەرگای ئەو نەك دەرگای کەسانی تر و ئاساری دروستکراوی دەستی خودا، چۆن پەروەردگارتان ناناسن؟ هەرکەس دونیا بناسێت وازلێدەهێنێت، هەرکەس دواڕۆژ بناسێت دەبینێت دروستکراوە و سەریهەڵداوە دوای ئەوەی کە نەبووە، بۆیە ئەوەش وازلێدەهێنێت و بە دروستکەری بەهەشت دەکات، دونیا و دواڕۆژ لەبەر چاوی دڵی بچووك دەبنەوە و خودا لەبەر چاوی نهێنی ئەو مەزن رادەگرێت، داوای خودا دەکات و هەرچی شتی ترە لە

خوار خوداوە وەك گەردیلەیەكی لێ دێت بەراورد بە ئەو(سبحانه وتعالی)، وەك منداڵان ئەوانی دێتە پێش چاو كاتێك یاری بە بەرد و خۆڵ دەكەن، مەلیكان دەبینێت دەسەڵات دەگرنە دەست، دەیانبینێت لە دەسەڵات كەناگیر دەكرێن، دەوڵەمەندە فریوخواردووەكان دەبینێت بە شتێكەوە سەرقاڵن لە پەروەردگار بێبەشیان دەكات، من دەبینم ئێوە بە كتێبەكەی خودا و سوننەتی پێغەمبەرەكەی و قسەی صالحان یاری دەكەن، بە نەزانی خۆتان گاڵتە بەوانە دەكەن، گەر شوێنی قورئان و فەرموودە بكەوتبانایە شتی سەروسورهێنتان دەبینی، بەردەوام لەگەڵ خودا لەسەر ئەوەی دەیەوێت ئارامتان دەگرت تا ئەوەی پێدەدان كە دەتانەوێت، هەژاری و بەڵا لەگەڵ نەبوونی ئارامگرتن سزایە، لەگەڵ بوونی ئارامگرتن ڕێز و پێبەخشینە، باوەڕدار لەناو بەڵاكەیدا -لە پەنای نزیكی لە پەروەردگار و موناجات لەگەڵی- لە نیعمەتدایە، حەز ناكات لە شوێنەكەی خۆی دەربچێت، بازاڕی قسەكانم زۆر بێ ڕەواجە، چونكە خەرجی بۆ نەفسەكان و ئارەزووەكان ناكات، ئەم سەردەمە ئاخر زەمانە، بازاڕی دووڕوویی گەرمە و منیش تێدەكۆشم ئایینی خودا بگەیەنم، ئەو ئایینەی پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵان و شوێنكەوتووان لەسەری بوو، ئاخر زەمان هاتووە، پەرستراوی زۆرینەتان دینار و درهەمە، وەك هۆزەكەی موساتان(علیه السلام) بەسەرهاتووە، ئەوانەی خۆشەویستی گوێرەكە چۆرایە ناو دڵیان، ئەم سەردەمە سەردەمی دینار و درهەمە.

هاوار بە حاڵت، چۆن داوای پلە و پایە و ماڵ و سامان دەكەی لەو مەلیكە دونیاییە، لە كارەكانیدا شانی لەسەر دادەنێت لە كاتێكدا ئەو بەم نزیكانە یان لە كار لادەبرێت یان دەمرێت، ئەوەی هەیەتی لە موڵك و ماڵ و پلە و پایە لەدەستی دەدات و جەستەی دەگوێزرێتەوە بۆ ناو گۆڕەكەی كە بریتییە لە خانەی تاریكی و وەحشەت و تەنهایی و خەم و پەژارە و كرم و مار، لە موڵكەوە بۆ تیاچوون دەگوێزرێتەوە، مەگەر كاری چاكە و نیەتی چاكەی هەبووبێت، ئەوكات خودا دەیباتە ناو ڕەحمەتی خۆیەوە و دادگایی كردنی لەسەر ئاسان دەكات، پشت مەبەستە بە كەسێك كەنارگیر دەكرێت یان دەمرێت، چونكە بێهیوا دەبێت و كۆمەكیت لێ دەبڕێت، باوەڕدار هەموو لێبڕانی لە زەوی و دونیا و ڕۆڵەكانی دونیا و دوارۆژ و ڕۆڵەكانی دوارۆژ بەرزبووەتەوە، ئەوەی زانیوە باڵابوون لە

هەوڵ و لێبڕانیان لەلای پەروەردگاریان خۆشەویستن، بۆیە کەسی خوداناس هەوڵ و لێبڕانی باڵا کرد تا گەیشتە خزمەتی خودا و لەبەردەستیدا سوژدەی برد، مۆڵەتی نەدرا سەر لە سوژدە بەرزبکاتەوە تا دڵ و نهێنی ئەو هێنران و نوێنەرایەتی و سەرۆکایەتی و ئەمارەت و دامەزرانیان لەسەر خەڵکی درایە دەست، لە دونیادا وەك سەرۆك ژیا و لە دوارۆژدا وەك سەرۆك، لە دونیادا مەلیك و لە دوارۆژدا مەلیك.

**خەڵکینە**، لەسەر نیعمەتەکان شوکری پەروەردگارتان(عزوجل) بکەن و مەیدەنە پاڵ کەسانی تر، گوێتان لەم ئایەتە بووە کە دەفەرموێت:

﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ﴾النحل: ٥٣؟

لە هەژاران بگەڕێ و پێیان ببەخشە، بە فێڵی دووڕوویەکی درۆزن فریو مەخۆ و تێبکۆشە بۆ ناسینەوەی کەسی هەژار، ئەو خۆی گۆڕیوە و وانیشان دەدات هەژارە کەچی دەوڵەمەندە و دەیەوێت لە نمایشکردنەکانی و گریانە درۆینەکانی و نیشاندانی زەلیلییەکەیدا شانشانێێ لەگەڵ هەژاران بکە، گەر یەکێك لەو جۆرانە داوای لێکردی ماوەیەك بوەستە و پرسیار لە دڵت بکە لەوانەیە ئەو کەسە دەوڵەمەند بێت و خۆی بە هەژار نیشان بدات، لە دڵت وردببەرەوە و بزانە چی بە دڵدا گوزەر دەکات، پرسیار لە نەفسی خۆت بکە با موفتییەکانیش فتوات بۆ بدەن.

باوەڕدار هەستێك(سیفەتێك)ی هەیە بە هۆیەوە دووڕووان لەناو هەژاراندا دەناسێتەوە، دڵی هەستیارە و تیایدا نیشەجێ بووە و بە نووری خودا(عزوجل) تەماشای شتەکان دەکات.

**هاوار بە حاڵت**، تۆ تەمبەڵی، بۆیە گومانی تێدا نییە شتێکت بەرچنگ ناکەوێت، جیران و برا و خزمەکانت سەفەریان کردووە، ئەوان گەڕان و چاڵیان هەڵکەند و کەوتن بەسەر گەنجینەکەدا، لە یەك درهەم دە و بیست درهەمیان قازانج کرد و بە قازانجێکی زۆرەوە گەڕانەوە، بەڵام تۆ لە شوێنی خۆت دانیشتووی، بەم نزیکانە ئەو بڕە پارە کەمەی بە دەستی تۆوەیە نامێنێت و دەکەویتە سواڵکردن لە خەڵکی.

هـاوار بـۆ تـۆ، لـەپێناو ڕێگـەی حەقـدا(عزوجل) تێبکۆشـە و شـاندامەدە لەسەر
قەدەری، ئەم ئایەتەت بیستووە کە دەفەرموێت:

﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَا ﴾ العنكبوت: ٦٩

تۆ دەست پێبکە و کەسانی تـر دێـن و کارەکـەی تـۆ تـەواو دەکـەن، هەرچی شت
بەدەستی خودایە(عزوجل) بۆیە داوای هیچ شـتێك لـە کەسـی تـر مەکـە، گوێت لەم
ئایەتە بووە:

﴿ وَإِن مِّن شَيۡءٍ إِلَّا عِندَنَا خَزَآئِنُهُۥ وَمَا نُنَزِّلُهُۥٓ إِلَّا بِقَدَرٖ مَّعۡلُومٖ ۝٢١ ﴾ الحجر: ٢١

لەدوای ئەم ئایەتە قسە نەماوەتەوە، ئەی ئەو کەسەی بەدوای دینار و درهەمەوەی،
ئەو دوانە(دینار و درهەم) دوو شتن بەدەستی خودان(عزوجل)، بۆیە داوای ئەو دوانە لە
خەڵکی مەکە، بە زمانی هاوەڵدانان و شان دادانت لەسەر هۆیەکان هەوڵی ئەو دوانە
مەدە.

داوات لێ دەکەم ئەی دروستکەری هەموو دروستکراوان و ئەی سەبەبکاری هەموو
هۆیەکان لە کۆتوبەندی هاوەڵدانان بە دروستکراوان و هۆیەکان ڕزگارمان بکە.

﴿ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ حَسَنَةٗ وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ۝٢٠١ ﴾
البقرة: ٢٠١

هەروەها فەرمووی:

ئەی بەندەکانی خودا، ئێوە لە خانەی حیکمەتدان هەردەبێ ناوەند و هۆ بگیرێتە
بەر، داوا لـە پەرسـتراوەکەتان بکـەن پزیشـکێکتان بـۆ ڕەوانـە بکـات نەخۆشـییەکانی
دەروونتـان چارەسـەر بکـات، داوای لـێ بکـەن ڕێنموونیکـەرێکتان بـۆ ڕەوانـە بکـات
ڕێگـەتان پـێ نیشـان بـدات و دەسـتی ئێـوە بگرێـت، خۆتـان لـە نزیکـانی خـودا و
نەدەبدادەران و دەرگاوانانی دەرگاکانی نزیك بکەنەوە، ئێوە بە خزمەتی نەفسی خۆتان
و شوێنکەوتنی ئارەزوو و سروشتان ڕازی بوون، من لە پێناوی دینی خودادا ئەخلاقتان
جوان دەکەم و دەمەوکوتتان دەکەم، گوێ لەوانە مەگرن نەفستان دڵخۆش دەکەن، بۆ

مەلیکان زەلیل دەبن و لەبەردەمیاندا دەبن بە مێرووڵەیەکی بچووك، بە فەرمانی خودا فەرمانیان پێ ناکەن و لە نەهیلێکراوەکان نەهیان لێ ناکەن، گەر ئەو کارەش ئەنجام بدەن بە دووڕوویی و زۆرلەخۆکردنەوە ئەنجامی دەدەن، خودا زەوی لەوانە و لە هەموو دووڕوویەك پاکبکاتەوە یان تەوبەیان پێ بکات و هیدایەتیان بدات بۆ بەر دەرگای خۆی(سبحانه وتعالى)، من دەجۆشێم کاتێك کەسێك دەڵێت "الله ، الله" و کەسانی تر دەبینێت، ئەی یادکەر بە زمان و بە دڵ یادی خودا(عزوجل) بکە و لەلای ئامادە بە، یادی خودا مەکە و دڵت لای کەسانی تر بێت، ئەو کەسەی دەستدرێژی دەکاتە سەرم و ئەو کەسەی منی خۆشەوێت لەلام یەکسانن، لەسەر رووی زەوی دۆست و دوژمنم نەماوە، ئەمە ئەو حاڵەیە کە دێت بەدوای یەکتاپەرستی راستەقینە و سەرنجدانی دروستکراوان بە چاوی دەستەوسانی، بەڵام ئەو کەسەی تەقوای خودای(عزوجل) هەیە ئەو کەسە دۆستمە، ئەو کەسەش لێی یاخی دەبێت دوژمنی منە، ئەوەیان دۆستی ئیمانمە و ئەمەیان دوژمنی ئیمانمە.

**خودایە**، ئەو حاڵەم بۆ بهێنە دی و رۆشنی بکەرەوە و دامەزراوم بکە لەسەری، خودایە بیکە بە پێدان و بەخشش بۆم نەك خواستن، ئەمە شتێکە بە بانگەشە و زرق و برق و خۆزگە و ناوی زل و نازناوی جۆراوجۆر و زمانبازی بەدینایەت، بەڵکو بە صدق و ئیخلاص و وازهێنان لە ریا، و دوژمنایەتی کردنی نەفس و ئارەزوو و شەیتان بەدەست دێت، خەڵکانێکی ژیرمەند بن، نابینم ئێوە خاوەنی دڵ بن و مەعریفەشتان بە وەرگێڕانی دڵان(خودا) نییە، نەفستان رامنەهێناوە و فێرتان نەکردووە، پڕە لە لوتبەرزی و خۆبەزلزانی، رێگەی حەق(عزوجل) "من" و "بۆ من" و "لەگەڵ من"ی تێدا نییە، هەموو ئەم رێگەیە سڕانەوە و فەنایە، لە سەرەتاوە و لەباری لاوازی ئیماندا "لا إله إلا الله"یە، بەڵام لە کۆتایی و لەباری هێزی ئیماندا "لا إله إلا أنت"یە[1]، چونکە گفتوگۆ دەکات و ئامادەیە و دەبینێت، هەرکەسێك لە دروستکراوان داوا بکات لە دەرگای دروستکەر(سبحانه وتعالى) کوێر دەبێت، ئەو کەسە خزمەتی

---

[1] (واتە سەرەتا لێی دووری و لات نادیارە، بەڵام دواتر لێی نزیك دەبییەوە و ئامادەیی پەیدا دەکات).

دروستکەری(عزوجل) نەکردووە و هاوەڵی لەگەڵ ئەو نەبووە، گەر لە سەردەمی گەنجێتیدا خزمەتی بکردبایە لە کاتی پیریدا بێنیازی دەکرد، ئەو(سبحانە وتعالی) بەو کەسانە دەبەخشێت کە خزمەتی ناکەن ئیتر چۆن بەو کەسە نابەخشێت خزمەتی دەکات؟! باوەڕدار هەتا پیرتر بێت ئیمانی بەهێزتر دەبێت و لە خەڵکی بێنیازتر دەبێت بەهۆی نزیکی ئەو لە حەقەوە(عزوجل)، لێیان بێنیاز دەبێت هەرچەند لە دونیادا خاوەنی پارووییەك، گەردیلەیەك، خەرقەیەك نییە، بەئاگابن لەوەی دەیڵێم و رەدی مەکەنەوە و هەڵیمەدەنە پشت سەرتانەوە، من حەق جێگیر دەکەم لەپێناوی حەقدا(عزوجل)، لە ئەزموونەوە ئەو قسانە دەکەم، من دەبینم زۆرینەتان بێبەشن، بانگەشەی ئیسلام دەکەن و شتێك لە حەقیقەتی ئیسلامتان لەلا نییە، هاوار بە حاڵت، تەنها ناوی ئیسلام سوودێك بە ئێوە ناگەیەنێت، لە دەرەوە کار بە مەرجەکانی ئیسلام دەکەن نەك لە ناوەوە، کارەکانتان نرخێکی نییە، شەوی لەیلەتوقەدر لەلای بەندە صالحەکانی خودا نیشانەی خۆی هەیە، ئەوان پەردە لەسەر بینینیان لادراوە، بۆیە نووری ئەوەڵی کە بە دەستی فریشتەکانە دەبینن، هەر بەو جۆرە بینینی نووری دەرگای ئاسمانەکان و نووری رووی پاکی حەق(سبحانە وتعالی)، چونکە لەو شەوەدا خودا بۆ ئەهلی زەوی تەجەلا دەکات، بەندە گەر حەقی(عزوجل) ناسی بەتەواوی ئەو لە خۆی نزیك دەکاتەوە و هەموو شتێکی پێدەبەخشێت و هەموو هۆگرییەکی پێدەدات و تەواوی عیززەتی خەلات دەکات، گەر بەلای خەڵکیدا لایکاتەوە هەموو ئەوانەی لێوەردەگرێتەوە، دەستی هەژار دەکات و دەیگێڕێتەوە بۆ لای نەفسی و پەردەیەك دەخاتە نێوان ئەو و خۆیەوە، تاقیدەکاتەوە بۆ ئەوەی دەربکەوێت چی دەکات، هەڵدێت یان خۆی رادەگرێت، گەر دامەزراو بوو پەردەکەی نێوان ئەو و خودا(عزوجل) هەڵدەگرێت و دەیگێڕێتەوە بۆ ئەوەی پێشتر لەسەری بوو.

جونەید(رەحمەتی خودای لێ بێت) زۆربەی کاتەکانی دەیفەرموو: چ شتێکم لەسەرە و چ شتێك پێویستە لەسەر من؟ بەندە و ئەوەی هەیەتی بەشی خاوەنەکەیەتی (مەولاکەی)، بەندە نەفسی خۆی بە پەروەردگار سپاردووە و هەڵبژاردن و شانشانێنی لێ

لابردووە و رازیبووە بە سەرپەرشتی قەدەری مەولا(عزوجل)، دڵی هاتووەتە راستە و نەفسی دڵنیا و ئارامبووەتەوە و بەم ئایەتە کاری کردووە کە دەفەرموێت:

﴿إِنَّ وَلِـِّۧىَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْكِتَٰبَ ۖ وَهُوَ يَتَوَلَّى ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٩٦﴾﴾ الأعراف: ١٩٦

**فوزەیلی کوڕی عەیاز(رەحمەتی خودای لێ بێت) گەر بە سوفیانی سەوری(رەحمەتی خودای لێ بێت) بگەیشتبایە پێی دەوت:** وەرە با بگرین بۆ زانستی پێشینەی خودا لەسەر ئێمە، ئەم قسەیە چەند جوان و شیرینە! ئەمە قسەی کەسێکی عاریفە بە خودا(عزوجل)، زانایە بە خودا و کاروبارەکانی لە دروستکراواندا، ئەو زانستەی خودا کە فوزەیل ئاماژەی پێ دەکات کامەیە؟ ئەوە بریتییە لەو فەرموودەی خودا(عزوجل) کە دەفەرموێت: ((ئەمانە بۆ بەهەشت و باکێکم نییە، ئەوانەش بۆ ئاگر و باکێکم نییە))[1]. هەمووانی لە یەك شوێندا داناوە و بەندە نازانێت لە کام دوو دەستەیە، خوداناسان بەو کار و کردەوە چاکانەی ئەنجامیان دەدا فریویان نەخوارد، چونکە کاروکردەوەکان بە سەرئەنجامە، بۆ زۆرێك لە خەڵکی مەلیکەکان بوون بە خاوەند، دونیا و دەوڵەمەندی و عافییەت و هەوڵ و هێز بووە بە خاوەند، هاوار بە حاڵتان، لێتان کردووە بە ئەسڵ و رۆزیدراوتان کردووە بە رۆزیدەر و بەندەکانتان کردووە بە مەلیك و هەژارانتان کردووە بە دەوڵەمەند و دەستەوسانتان کردووە بە خاوەن هێز، مردووتان کردووە بە زیندوو، رێز و پایەتان بۆ نییە، ئێمە شوێنی ئێوە ناکەوین و مەزهەبی ئێوە ناگرینە بەر، بەڵکو لە ئێوە کەنارگیر دەبین و دەچینە سەر گردی سەلامەتی، گردی سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) و وازهێنان لە بیدعە، دەچینە سەر گردی یەکتاپەرستی و ئیخلاص و وازهێنان لە ریا و دووڕوویی و وردبوونەوە لە دروستکراوان بە چاوی دەستەوسانی و لاوازی و ژێردەستەیی، گەر ملهوڕانی دونیا و فیرعەونەکان و مەلیکەکان و دەوڵەمەندانت بە مەزن راگرت و خودات(عزوجل) لەبیرکرد و بە مەزن رانەگرت ئەوا حوکمت وەك حوکمی ئەو کەسە وایە کە بەندەی بتێکە، دەبێت بە یەکێك لەوانەی بت بە مەزن رادەگرن.

---

[1] صحيح أخرجه أحمد وابن حبان، وقال الهيثمي في "المجمع": ورجاله ثقات.

**هاوار بـه حالـت**، دروستکەری بتـەکان بپەرستـە بتـەکانت بـۆ زەلیـل دەبـن، لـە خودا(عزوجـل) نزیکببـەرەوە دروستـکراوان لـە تـۆ نزیـك دەبنـەوە، بـە ئەنـدازەی بـە مـەزنراگرتنی خـودا دروستـکراوانی خـودا مـەزن تەماشـات دەکـەن، بـە ئەنـدازەی خۆشەویستیت بۆ خودا(عزوجل) دروستکراوانی تۆیان خۆشدەوێت، بە ئەندازەی ترست لە خودا ترسیان لە تۆ دەبێت، بە ئەندازەی ڕێز و بە گەورەزانینی تۆ بۆ فەرمانەکان و نەهییەکانی دروستکراوان ڕێز لە تۆ دەگرن، بە ئەندازەی نزیکبوونەوەت لە ئەو(سبحانە وتعالی) دروستـکراوان لـە تـۆ نزیکدەبنـەوە، بـە ئەنـدازەی خزمـەتکردنت بـۆ خـودا دروستـکراوان خزمـەتت دەکـەن، یـادی مـردن دەوایـە بـۆ نەخۆشـییەکانی نـەفس و قەلاچۆیان دەکات، چەندین ساڵ شەو و ڕۆژ بیرم لە مردن دەکـردەوە، بـە یـادی مـردن سەرفرازیم بەدەستهێنا و بە یادی مردن نەفسی خۆمم ژێردەستە کرد.

هەندێ لە شەوان یادی مردنم دەکرد و لە سەرەتای شەوەوە تا بەرەبەیان من دەگریام، لەو شەوەدا دەگریام و دەموت: خودایە، داوات لێ دەکەم فریشتەی گیانکێشـان ڕۆحـم لێوەرنەگرێتەوە و خۆت ڕۆحکێشانەکەم بگرێتـە دەسـت، چـاوەکانم لێکنـا و پیـاوێکی خاوەن هەیبەتی جوانخاسم بینی، لە دەرگاکەوە هاتە ژوورەوە، پێم وت: تۆ کێی؟ وتی: من فریشتەی گیانکێشانم، پێم وت: من داوام لە خودا(عزوجل) کردووە بۆخۆی گیـانم بکێشێت نەك تۆ گیانم بکێشیت، ئەویش وتی: بۆچی ئـەو داوایـەت کـردووە؟ مـن چ گوناهێکم هەیە، مـن تـەنها بەندەیـەکم فـەرمانم پێکـراوە، فـەرمانم پێکـراوە لەگـەڵ دەستەیەك نەرمونیان بم و لەگەڵ دەستەیەکی تر زبر و ڕەق مامەڵە بکەم، پاشان دەستی کردە گەردنم و گریا، منیش لەگەڵی گریام، بەناگا هاتم و بینیم دەگریام.

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل(ڕەحمەتی خـودای لـێ بێـت) دەیفـەرموو: دڵانێـك هـەن جێگەی بەزەیی منن، بە خۆشـەویستی دونیا هەلکزاون، زۆرتـر لـە بـرا صـالحەکانیان سینەیان قورئانی تێدایە، ئەوانەی بەپێوە دەوەستن و ڕکوع و سـوژدە دەبـەن و فـەرمان بە چاکە دەکەن و ڕێگری لە خراپە دەکـەن، ئەوانـەی وەرع دەسـتەکانی لـە کەسـابەت کۆتوبەند کردوون و هەوڵ و لێبڕانیان بۆ پەروەردگارە(عزوجل)، ماڵەکانتان بـۆ ئەوانـە خەرج بکەن، چونکە ئەوانە سبەینێ لەلای خودا دەوڵەتیان هەیە.

یەکێك پرسیاری لە شێخی گەیلانی کرد و وتی: کامیان توندترە ئاگری ترس یان ئاگری شەوق؟

فەرمووی: ئاگری ترس بۆ موریدانە و ئاگری شەوق بۆ مورادانە، ئەمەیان شتێکە و ئەوەشیان شتێکی تر، کام ئاگریان لەلای تۆیە ئەی ئەو کەسەی پرسیارەکەت کرد؟ ئەی ئەو کەسانەی شانتان لەسەر هۆیەکان داداوە، ئەو کەسەی سوود بە ئێوە دەگەیەنێت یەك کەسە، ئەو کەسەی زیان بە ئێوە دەگەیەنێت یەك کەسە، ئەو کەسەی مەلیکی ئێوەیە یەك کەسە، ئەو کەسەی دەسەڵاتداری ئێوەیە یەك کەسە، خودای ئێوە یەکە، گوێتان لێبووە چی دەفەرموێت:

﴿فَمَن كَانَ يَرْجُوا لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا ﴿١١٠﴾﴾ الكهف: ١١٠

لە نێوان تۆ و ئەودا (سبحانه وتعالى) تۆ(نەفسی تۆ) هەیە، لە "خۆت" جیاببەرەوە خودا دەبینیت، وتی: چۆن لە خۆم جیاببمەوە؟ پێم وت: بە سەرپێچی کردن و کۆشان و خۆکەڕکردن لە وەڵامدانەوەی نەفس لە نەفست جیاببەرەوە، حەزەکان و ئارەزووەکان و مەیلەکانی دەرخوارد مەدە، ئەو کات نەفست زەلیل دەبێت و لەبەردەم رووی دڵدا دەچەمێتەوە، وەك پارچە گۆشتێکی هەڵدراوی لێ دێت بەبێ جووڵە، رۆحی دڵنیایی و ئارامی دەچێتە ناویەوە و رۆحی بوونی خۆی لێدەردەچێت، رۆحی دڵنیایی دەچێتە ناو، ئەو کات نەفس و دڵ پەروەردگار دەبینن، گەر نەفس خامۆش و ئارام بوو و کۆمەکی دڵی دەکرد رۆحێکی تری-جیا لە رۆحی یەکەم- بە بەردا دەکرێت، رۆحی پەروەردگاری، رۆحی ئەقڵ، رۆحی زوهد لە دروستکراوان، رۆحی بوون بە حەقەوە(عزوجل)، رۆحی دڵنیایی بەلای خوداوە و هەڵهاتن و دوورکەوتنەوە لە کەسان و شتانی تر، کەسی صادق لە کارەکەیدا مالئاوایی لە شێخەکانی دەکات و بەجێیان دەهێڵێت، ئاماژەیان پێ دەکات و دەڵێت ئێوە لە جێگەی خۆتان دانیشن تا بگەمە ئەو شوێنەی ئێوە نیشانتاندام، گەورەپیاوان(شێخان) دەرگای تێگەیشتنی تۆن، باشە پابەندبیت بە دەرگاوە و نەچیتە ژوورەوە:

﴿وَيَضْرِبُ اللَّهُ الْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ﴾ إبراهيم: ٢٥

باوەڕ بە خودا و پێغەمبەرەکەی(ﷺ) بهێنن لەوەی هەواڵیان پێداوە، بنچینەی گەیشتن بە خودا(عزوجل) بریتییە لە ئیمان، بنچینەی هەموو خێرێکە، ئیمان و ئیخلاص بنچینەی پێغەمبەرایەتین، پێغەمبەرایەتی بنچینەی ریسالەتە، ریسالەتیش بنچینەی ویلایەت و بەدەلی و غەیبییەت و قوتبییەتە[1].

**کاتێك عەلی کوڕی فوزەیلی کوڕی عەیاز مرد باوکی لە خەوندا بینی و پێی وت: خودا چی لەگەڵ کردی؟** ئەویش وتی: بابە گیان، هیچ شتێك بۆ بەندە لە پەروەردگاری باشتر نییە، بابە گیان تەنها بە خوداوە خەریك بە و بە شتێکی ترەوە خەریك مەبە، ماڵەکە ماڵی ئەوە و رۆزییەکە دروستکراوی دەستی ئەوە ﴿وَقَدَّرَ فِيهَآ أَقْوَٰتَهَا﴾، فریشتەکان بەرپرسن لە رۆزی تۆ، خێر لە خوداوەیە و شەڕیش لە خوداوەیە، بە تیری ئافەت بەندە دادەگرێتەوە تا بەندە دوو چاوی خۆی لە تیرەکان دادەخات پزیشکی نزیکی لە خوداوە دێت و برینەکانی تیمار دەکات، پزیشکی خێریش بەرزی دەکاتەوە و دواجار پزیشکی شەوقیش لەئامێزی دەگرێت، سەرەتاکە پڕ لە ناخۆشییە، گەر بەهەشت بە ناخۆشی دەورەدرابێت[2] ئەی دەبێ نزیکی لە حەقەوە(عزوجل) چۆن بێت؟! باوەڕدار کرێکاری مەلیکە لە کارە چاکەکانی دونیادا، گەر نهێنی ببێت بە ئاسمان و دڵ بە زەوی دڵ لە شوراکانی ئاسمانی نهێنی خۆراك وەردەگرێت، گەر بیەوێت هەردووکیان کۆدەکاتەوە، پاشان بەزوویی بەزەیی خودا لەسەر خۆی دەبینێت و دەستی درێژ دەکات وەك ئەوەی دەستلەملانی شتێك بێت.

**پاشان فەرمووی:**

ئەی ئەهلی مەجلیس عوزرێکمان بۆ دابنێن من لە کۆت و بەندی حاڵدام، لە کۆت و بەندی رۆژێکدام من لاڵ بم و من کەڕ بم.

**بارکە ئادەمم(علیه السلام) بینی فەرمووی:** (ئەی کوڕی خۆم، راست و دروست بە، وەحشەتێك کە هەردەبێ ببێت لەبیردەکەی)، گەر مردن بەسەر تۆدا داباری هەموو

---

[1] (ئەمانە چەند پلەو پایەیەکی باوەڕن کە شێخی گەیلانی لە چەند جێگەیەکی ئەم کتێبەدا ئاماژەیان پێ دەکات).

[2] إشارة الى الحديث الذي رواه مسلم: "حفت الجنة بالمكاره وحفت النار بالشهوات".

شتێك لە تۆ دەگیرێتەوە، هەموو نزیكان كۆچت لێ دەكەن، بەرلەوەی كۆچت لێ بكەن كۆچیان لێ بكە، بەرلەوەی پەیوەندیت لەگەڵ بچڕن پەیوەندییان لەگەڵ بپچڕە، ئەوكات گۆڕ دەبێتە ڕێگە و توناوتونێك بۆ لای حەق(عزوجل)، بەر لەوەی بمرێت خۆت(نەفسی خۆت) بمرێنە، لە نەفسی خۆت و لەوان بمرە بە خوداوە زیندوو دەبییەوە، وەك مردووت لێ دێت و دەستی بڕیاری پێشینەی خودا لوقمەت دەرخوارد دەدات و نازناوت پێ دەبەخشێت و بەشەكەی خۆت بەبێ هەوڵ و كۆشان وەردەگریت، گەر ئەمەت بۆ تێر و تەواو بوو ژیانی نزیكی لە خوداوە و زانست بە خودا رووت لێ دەكات، ئەو شوومییە دەڕەوێتەوە، گوێنادات قیامەت هەستاوە یان نە، مردن دروستبووە یان نە، یەك كاری هەیە ئەویش گەیشتنە بە حەق(عزوجل)، حوكمەكانی خوداش پارێزراو و پاسەوانیكراون، پاكێتی بۆ ئەو خودایەی بە حوكم دەتانبزوێنێت و بە زانست زمانتان رەوان دەكات، یەكێك لە ئێوە پۆشاكی صالحانی بە زرق و برق و خوری بەری پۆشیوە، بەڵام ئەو لەلای ئێمە بێباوەڕە، هەندێ جار بەندە لە كەسابەتی خۆی دەخوات، كاتێك ئیمانەكەی بەهێز دەبێت حەرام دەكرێت لەسەری لەبەری كەسابەتی خۆی بخوات، پێی دەوترێت: گەنجینەی سەرهەڵدان بكەرەوە، لە گەنجینەی زانست وەربگرە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:

((هەتا دەتوانن لە خەم و پەژارەی دونیا یەكلابنەوە))[1].

زۆر یادی مردن بكەن، هەروەها یادی دوای مردن و دوای پردی سیرات، یادی دوارۆژ بكەن بە نیعمەتەكان و سزاكانییەوە، دەست لە دونیا بكێشنەوە بە سەرقاڵبوون لەگەڵ خودا و پاكێتی دڵ و نهێنی و تێكۆشان دژ بە نەفس و جەنگان دژ بە شەیتان، بۆ خودا لە هەموو شتێك ئازاد بن و خۆتان بۆ ئەو یەكلابكەنەوە، یەكتاپەرستی بزركردن و ونكردنی دروستكراوانە و دەرچوونە لە وەرگەڕانی سروشتی خۆت بۆ سروشتی فریشتە، پاشان فەنابوونت لە سروشتی فریشتە و گەیشتنت بە پەروەردگارت(عزوجل)، چەندی بوێت دەرخواردت دەدات، بە كۆمەڵێك كار تایبەت

[1] تقدم تخریجه.

دەکرێیت کە زیادەن لەسەر کاری ئاشکرا و دیار، ئیسلام ئاشکرایە و ئیمان هێزەکەیەتی، پاشان مەعریفە بە خودا(عزوجل)، پاشان بوون(وجود) بە خوداوە(عزوجل)، گەر بوونت بە خوداوە بێت بۆ ئەو دەبیت، باوەڕدار لەبەری هێز و کەسابەتی خۆی دەخوات و دەشزانێت ئەوە لە خوداوەیە، گەر بەهێز بوو لە تەوەکولەکەی دەخوات و لە خودای دەبینێت، لەسەر سەرنجی یەکەم گۆڕانی بەسەردا نایەت، گەر لە رووباری دیجلەدا هەزار ساڵ دابنیشێت ئەو دڵی پەیوەستە بە خوداوە(عزوجل)، رەحمەتی خودات لێ بێت لە هەر روویەکەوە رووت لێ دەکات ئامۆژگاری وەربگرە، تۆ بەرهەڵستی قەزا و قەدەری خودا دەکەی، بەرهەڵستی مەکە و دەمەقاڵێ وازلێبهێنە، عوزەیر(علیه السلام) لە دروستکراوانی خودادا بەرهەڵستی پەروەردگاری خۆی کرد، دروستکراوێك دروست دەکات و پاشان سزای دروستکراوەکە دەدات، خودا ئەوی لە دیوانی پێغەمبەرایەتی سڕییەوە، سەد ساڵ بەتەنها مراندی، پاشان زیندووی کردەوە و پێغەمبەرایەتی بۆ گێڕایەوە، "إستغفار" بکە بە ویردی سەر زمانت و داننان بە هەڵە و گوناهەکاندا بکە بە رەفتاری دڵت، خامۆشیش بکە بە کاڵای باڵای نهێنیت، یادی خودا یەکەمجار بە زمانە و پاشان تێدەپەڕێت بۆ ناو دڵ، ئەوجا خۆشەویستی و شەوق دێن و سەردەکەن(جاری دەبن) بۆ سەر زمان، هاوەڵی چەندین شێخم کرد ددانیانم نەبینی(واتە پێنەدەکەنین)، لە خواردنی حەڵاڵ دەیانخوارد و چاریان نەدەبڕییە پارووییەك، خاوەنی ئەدەب بن، رێگە بدە کەسانی تر تێر بن و تۆ برسی بیت، خەڵکانی تر خاوەنی عیززەت بن و تۆ زەلیل بیت، خەڵکانی تر بێنیاز بن و تۆ هەژار بیت، من پەروەردەتان دەکەم و لە سیفەتە دزێوەکان پاکتان دەکەمەوە و فێرتان دەکەم بۆ ئەو رۆژە، یەکلابووەمەتەوە بەوەی ئێوە قازانج و زیان بە من ناگەیەنن و بە ئەندازەی گەردیلەیەك رۆزی من زیاد و کەم ناکەن، لەدوای ئەوە هاتم و قسەم بۆ کردن، ئەو باوەڕەم لە خۆمدا دامەزراند لە کاتێکدا لە دەشت و سارا و چۆڵەوانیدابووم، خواردنی حەزەکان دڵ رەق دەکات و نهێنی کۆتوبەند دەکات و زیری و حیکمەت دەسڕێتەوە و خەو و بێئاگایی زیاد دەکات و هەڵپە بەهێز دەکات و هیوا و خۆزگە درێژ دەکاتەوە، ئەی ئەو کەسەی لە بەندیخانەی ئارەزوودا بەندکراویت، ئەی

بەندەی دروستکراوان، ئەی ئەو کەسەی نەزانی بە سەرئەنجامی کاروبارەکانت، ئەی نەزان بە دروستکراوان و دروستکەر(عزوجل)، نەزان بەوەی لەسەرتە ئەنجامی بدەی و ئەوەی مافی تۆیە، گەر ئاقڵ نابیت پەند و ئامۆژگاری لە یادی مردن وەربگرە، چونکە یادی مردن کلیلی هەموو خێر و سەلامەتییەکە، گەر یادی مردنت کرد زیادەڕەویت لێدەبێتەوە، گەر هەڵپەت لاواز بوو و هیوا و خۆزگەت کەمبوویەوە بۆ لای خودا دەگەڕێیەوە و هەموو کاروبارەکانت بە ئەو(سبحانه وتعالى) دەسپێریت.

**ئەی گەنج**، سەرفرازیت بۆ نییە تا دان بە نیعمەتەکانیدا دەنێیت، نیعمەتەکانی خودا لە یەکتاپەرستی ئەودا تۆ نوقم دەکەن، پاشان لە یەکتاپەرستی ئەودا فەنا دەبیت و هیچ کەس و شتێکی تر جگە لە ئەو(سبحانه وتعالى) نابینی، چۆن کەسێك دەگاتە خۆشەویستی سکاڵای لەدەست بکات و بەرانبەر بە خودا بوەستێ و چەنەبازی بکات، خۆشەویستی و شەوق و نزیکی لە خوداوە لەگەڵ ئەو دۆخەدا پێکنایەنەوە و دانامەزرێن، گەر خۆشەویستی راست و دروست بێت-لە کاتی هاتنی قەدەرە ناخۆشەکاندا - ئازار بوونی نییە، کاتێك خۆشەویستی دادەمەزرێت بەرهەڵستکاری و تۆمەت هەڵدەگیرێت، هەموو هەنگاوێك هەڵیدەگریت بۆ لای گۆڕەکەتە، تۆ لە سەفەرێکدای بەرەو لای گۆڕەکەت.

**یەکێك لە خوداناسان دەڵێت:** کەسی عاریف مەعروفەکەی(خودا) لە قبوولکردن و رەدکردنەوە و مەدح و سەنا و زەمکردن سەرقاڵی دەکات، گەر نەفس سڕایەوە جێگەکەی بە ئەمری خودا(عزوجل) دەگیرێتەوە، گەر دونیا سڕایەوە جێگەکەی بە دوارۆژ دەگیرێتەوە، گەر دوارۆژ سڕایەوە جێگەکەی بە نزیکی لە خوداوە دەگیرێتەوە، بە نزیکی لە ئەوەوە هۆگری پەیدا دەکات و لەگەڵی ئاسوودە دەبێت، نوێژ نیوەی رێگەکەت پێ دەبڕێت و رۆژووش لەبەر دەرگاکەدا راوەستاوت دەکات و صەدەقەش لە دەرگاکە دەتباتە ژوورەوە بۆ ناو ماڵەکە، هەندێ لە گەورەپیاوان بەم جۆرەیان فەرمووە، بۆ بڕینی رێگەکە-بۆ لای خودا- کۆمەکی لە ئارامگرتن و نوێژکردن وەربگرن، کەسی سالیك هاواری -هاوار بۆ تەنهایی، هاوار بۆ غوربەت- لێ

بەرزنابێتەوە، گەر پارێزگاری لە حوکم نەبوایە "مەن"ەکەی یوسف(علیه السلام)[1] لە نهێنی و کردەوەکانتان دەهاتە دەنگ، بەڵام حوکم پەنادەگرێت بە پەتی زانست بۆ ئەوەی دەرنەکەوێت، هەندێ کەس خۆی سەرقاڵ دەکات بە زوهدکردن لە نیعمەتێك و سەرقاڵبوونەکە لە خاوەن نیعمەتەکە(خودا) بێئاگای دەکات، لەو بارەدا نیعمەتەکەی لێدەگیرێتەوە بۆ ئەوەی پێیەوە سەرقاڵ نەبێت، گەر بەردەوام بوو لە خەریکبوون بە خوداوە(سبحانه وتعالی) خودا لە خۆی نزیکی دەکاتەوە و هێزی سەرهەڵدان(تکوین) دەداتە دەستی، قسەکانم لەودیوی ئێوەوەیە، لەدوای ئەوەی ئێوەم نەبینی، بۆیە دونیای ئێوەم بەجێهێڵا و دوارۆژم تێپەڕاند، تەماشای ئێوەم کرد بینیم نە زیان و نە قازانج و نە پێدان و نە لێگرتنەوە بەدەستی ئێوە نییە، خودا ئەو کەسەیە ئێوە هەڵدەسوڕێنێت، ئێوە ناتوانن زیانێك بگەیەنن هەتا خودا بڕیاری زیانەکەی نەدابێت، بۆیە گەڕامەوە بۆ لای خودا(عزوجل)، دونیاشم تەماشا کرد و بینیم فانی و کاتی و گوزەرکردە و فریودەر و تیابەرە، بۆیە ئەمویست پاڵ بدەم بە لایەوە و لەپای بوەستم، ئەمەش بەهۆی خێرایی ڕۆیشتنی دونیاوە، ساتێك لەپای دوارۆژیش وەستام و لە کاروباری وردبوومەوە ئەنگی ئەویشم بۆ دەرکەوت، ئەو ئەنگییەش بریتییە لە ڕووداو(واتە نەبووە و دواتر هێنراوەتە بوونەوە)، هەروەها بینیم خودا(سبحانه وتعالی) حەزی نەفس و چێژی چاوی تێدا داناوە، ئەوەش لەم ئایەتەدا ئاماژەی پێ دەکرێت:

﴿وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ الْأَنفُسُ وَتَلَذُّ الْأَعْيُنُ﴾الزخرف: ٧١

بە خۆمم وت: ئەی گوا حەزی دڵ لە بەهەشتدا، بۆیە پشتم لە دوارۆژ کرد و ڕوومکردە مەولا و بەدیهێنەر و دروستکەر و سەرپێهەڵدەری بەهەشت، گەر بەندە تەقوای خودای هەبێت لە نەزانی زانستی پێ دەبەخشێت، هەر بەو جۆرە لە دووری نزیکی و لە بێدەنگی یاد و لە نامۆیی هۆگری و لە تاریکی نوور، ئەی نەفس، ئەی ئارەزوو، ئەی سروشت، ئەی ویست، گەر قەناعەتتان کرد بە یەکتاپەرستی و بڕینی پەتی

---

[1](مەن: دەغڵێك بوو بۆ پێوانەی گەنم و جۆ).

دروستکراوان، و سوکنایی و خامۆشی بۆ لای خودا(عزوجل)، هەروەها وازهێنان لە بینینی دروستکراوان کە پارووپەکیان لێ وەرنەگرم تا حەق(عزوجل) نەبینم باشە و لەگەڵتان تەبام، ئەگینا سوێند دەخۆم نە بخۆم و نە بخۆمەوە، گەر مردم بە نهێنیمەوە باڵدەگرمەوە بۆ لای حەق(عزوجل)، دیوارەکانی ئاینی پێغەمبەرەکەمان رماوە، پەنا بۆ کەسێك دەبات بینای بکاتەوە، رووبارەکەی وشك بووە، پەروەردگار ناپەرستێت گەر بەندەیەك بە ریا و دووڕوویی خودا بپەرستێت، کێ کۆمەکیم دەکات بۆ راستکردنەوەی دیوارەکانی و هێنانەوەی رووبارەکە و تێکشکاندنی ئەهلی دووڕوویی، قسە لە زانستێك دەکەم کە نابێت قسەی لێ بکەین و دەربیبڕین و هیچ مەلیکێکی پێ فێر بکەین و لەلای کەسێك باسی لێوە بکەین، "طور"[1] کەمە، شەیتان نابینێت تێکی بدات و دەسەڵاتدار نابینێت ژێردەستەی بکات، خودا(سبحانه وتعالى) سوێندی بە "الطور" خواردووە بەهۆی موناجاتی خۆشەویست و کەلیمی خۆی و تەجەللی ئەو(سبحانه وتعالى) لەسەر کێوەکە، گەر دڵ خودای(عزوجل) ناسی فراوانی دەکات تا جین و مرۆڤ و فریشتەش دەگرێتەوە، تا شتێك نامێنێت ببێتە لەمپەر لەبەردەمیدا و دوور و نزیك تەماشای ناکەن، بیستووتە چۆن عەساکەی موسا(علیه السلام) ئەوەندە و ئەوەندەی کێشی خۆی-لە پەتی جۆراوجۆر- هەڵدەلووشی و هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەدەهات؟!

**پرسیار: کامل الملاح پێی وت:** حەسەنی بەصری دەڵێت: گەر زانا زاهید نەبێت دەبێتە سزا بۆ ئەهلی سەردەمی خۆی، بۆچی دەبێتە سزا بۆ ئەهلی سەردەمی خۆی؟ شێخ فەرمووی: چونکە بەبێ ئیخلاص و کردار قسە دەکات و قسەکانی ناگەنە دڵی گوێگرانی و لە دڵدا دامەزراو نابن، بۆیە ئەوانیش گوێدەگرن و کار ناکەن، گەر دڵ راست و دروست بوو و بە زانست نوورانی بوو بەو نووورەی ئاگری گوناه و یاخیبوون دەکوژێنێتەوە وەك چۆن نووری باوەڕدار ئاگری دۆزەخ دەکوژێنێتەوە کاتێك بەسەریدا گوزەر دەکات[2]، وتراوە گۆشەنشینی سەربڕینجیکردنە لە نەفس و حەزەکان، ئەخلاق و

---

[1] (ئەو چیایەی موسا(علیه السلام) لەسەری لەگەڵ پەروەردگاری گفتوگۆی دەکرد).

[2] رواه الطبراني في الكبير.

بەدەستهێنانی هاوەڵ و پاشان گۆشەنشینی، خەڵوەتت ڕێگەی دوارۆژە، نەفس چاڵ نابێت گەر لەو ڕێگەیەدا هاوەڵت بێت، هەر بەو جۆرە ئارەزوو، بۆیە کەسەکە گومڕا دەبێت بە هاوەڵی کردنی ئەوانە، بەهەمان شێوە شەیتان دوژمنە و بەکاری هاوەڵیکردن نایەت، حەزەکان کۆمەڵێك ئافەتن-لە ڕێگەدا چاوی ژیری و حیکمەتت لە ڕێگەدا کوێر دەکەنەوە، دروستکراوان جەردە و ڕێگرن، ئارەزووەکەت لەبەر دەرگای خەڵوەتگاکەدا دابنێ پاشان بەتەنها بچۆ ژوورەوە، لەوێ هۆگرەکەی خۆت دەبینییەوە، حەوارییەکانی عیسا(علیه السلام) فەرموویان: زانستی مەزنمان فێر بکە، فەرمووی: ((ترسان لە خودا(عزوجل) و ڕازیبوون بە بڕیارەکانی و خۆشەویستی بۆ خودا))، تۆ زەندیقی یاخیبوونەکانت دەشاریتەوە و پشان عیبادەت و زوهد دەخەیە دەرەوە، و لە سەرئەنجام ناترسیت.

**هاوار بە حاڵت**، بەشەکان لەگەڵ خودا وەك ئەو پیاوە وایە لە خۆراسان مردووە و کەسێکی نزیکی لە عێراق هەیە، پیاوە خوراسانییەکە ماڵێکی زۆری هەیە و میراتگری نییە جگە لەو کەسەی لە عێراقە، ئایا ئەوەی مولکی ئەو پیاوەیە ناگاتە دەست ئەو پیاوەی لە عێراقە؟ لە کاتێکدا میراتگرەکە ئاگای لێ نییە، ئێوە خەڵکانێکی ڕەشۆکین قسەکردن لە خواردن و خواردنەوە و پۆشین بۆ ئێوە باشە، بەڵام هەندێ جار حاڵ زاڵ دەبێت بەسەرماندا و قسانێك دەکەین جیاواز لەوانە، دڵ سادیبوونی نەفس ئەرێ دەکات بۆئەوەی بە ڕێگەی ئەودا بگەڕێتەوە بۆ لای خودا(عزوجل)، گەر خۆشەویستی پیاوێك و ڕق لە پیاوێکی تر کەوتە ناو دڵتەوە چی دەکەی؟ ئایا بە سروشت و میزاجی خۆت ئەوەت خۆشدەوێت و ئەوەت ڕق لێدەبێت؟ ڕێز و بایەت بۆ نییە گەر بەو جۆرە بیت، کیتاب و سوننەت بکە بە سەنگی مەحەك و خۆتی لێ بگێرەوە، گەر لەگەڵ کیتاب و سوننەت تەبا بوو خۆشتبوێت، ئەگەر نە، ئەو درانەی پێ بپێوە، گەر ئەو دڕانە فتوای دروستییان بۆ دای بگەڕێوە بۆ لای دڵت، گەر دڵ کار بە کیتاب و سوننەت بکات لە خودا نزیك دەبێتەوە، گەر نزیکبوویەوە زانست فێر دەبێت، گەر زانست فێربوو ئەوەی بۆ ئەوە و ئەوەی لەسەر ئەوە دەبینێت، هەر بەو جۆرە ئەوەی بۆ حەقە و ئەوەی بۆ باتڵە و ئەوەی بۆ شەیتانە و ئەوەی بۆ ڕەحمانە،

نزیکی خۆی لە پەروەردگاریەوە دەبینێت، هەر بەو جۆرە نزیکی پەروەردگاری لە خۆیەوە، بە هەمیشەیی لەگەڵ رەحمان لە دڵخۆشی و ئاسوودەییدایە، دەبێت بە کڕیاری مەلیك، دەکڕێت و بەسەر دروستکراواندا پەخشدەکاتەوە، گەر لێرەوە چوویتە ژوورەوە زانستەکەت فرێبدە و بەڕووتی بچۆرە ژوورەوە، هەر بەو جۆرە زوهد و وەرع و حاڵت لە خۆت بکەرەوە، چونکە گەر هاتی بۆ لای من بە یەکێك لەوانەوە لەوانەیە ببێتە بێبەشبوونت لە من، ئەوانە لەبەری خۆت بکەرەوە و وەرە ژوورەوە، ئەوەی لەلای منە وەربیگرە، ئەوەشت لەدەست دەرناچێت.

چوومە ژوورەوە بۆ لای یەکێك لە گەورە پیاوان دەربارەی خایلە و ختوورە قسەی دەکرد و وتی: ئەوەی من لەسەریم خۆشتدەوێت؟ وتم: بەڵێ، وتی: من بە هەمیشەیی بەڕۆژووم و پارشێوان رۆژوو دەشکێنم، خواردنی ئەم شارە پاك و بێگەرد نییە وەرعی لێ بکە.

"سري السقطي" هانی جونەیدی دەدا قسە بۆ خەلکی بکات، جونەید پێغەمبەری خودای(ﷺ) بینی بەو کارە فەرمانی پێکرد، کاتێك گەیشتەوە پێی "سري السقطي" پێی وت: لە ئێمە قبوولت نەکرد تا فەرمانت پێکرا.

**هاوار بە حاڵت،** تۆ قسە بۆ خەلکی دەکەی، لەدوای کارەکەتەوە دونیایەك لە گوناهی رەش بوونی هەیە، لەسەر رووی زەوی و لە ئاسمان و لە دونیا و لە دوارۆژدا کەسێك بوونی نییە لێی بترسم یان رجام لەلای بێت، جگە لە خودا(عزوجل).

**بە یەکێك لە صالحان وترا: ئایا پەروەردگارت دەبینی؟** وتی: گەر نەیبینم لە جێگەمدا پارچە پارچە ببم، وتی: چۆن دەیبینی؟ وتی: چاوی بوون(وجود)م خامۆش دەکەم، ئەویش پەروەردگاری خۆی دەبینێت، هەر بەو جۆرە چەندی بوێت نەفسی خۆی لە بەهەشتدا دەبینێت، بەهەمان شێوە دڵی خۆی دەبینێت، سیفەتەکانی خودا و لوتف و چاکەی خودا و پەنا و دالدەی دەبینێت.

**ئەبو قاسم جونەید (خوا لێی رازی بێت) دەیوت: من چیم لەسەرە؟** صۆفی کەسێکە بوونی پاڵفتە بووە، دڵی دەبێتە سەفیر لە نێوان ئەو و پەروەردگاری(عزوجل)، تا پێغەمبەر(ﷺ) لە خەونتدا نەبینێت مۆڵەتی بدات نابێت بە صۆفی، پێغەمبەر(ﷺ)

فەرمانی پێ بکات و نەهی لێبکات، لەبەر دەرگای مەلیکدا و دەستی لە دەستی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دڵی بەرزدەبێتەوە و نهێنی پاڵفتە دەبێت و رۆشن دەبێتەوە.

یەکەمین زمانێك ئادەم قسەی پێکرد سریانی بوو[1]، لە رۆژی دواییدا بە زمانی سریانی دادگایی خەڵکی دەکرێت، کاتێك چوونە بەهەشتەوە بە زمانی عەرەبی محەمەد(ﷺ) قسە دەکەن.

**یەکێك لە خوداناسان دەڵێت:** گەر بەندە گوێڕایەڵی خودای کرد مەعریفەی پێ دەبەخشێت، کاتێك یاخی دەبێت مەعریفەکەی لێ وەرناگرێتەوە بۆ ئەوەی لە رۆژی دواییدا بیکاتە بەڵگە لەسەری، خایلە(ختوورە)ی فریشتە دێت و لە پەنای دڵی باوەڕداردا دەوەستێت، ئەویش پێی دەڵێت: تۆ کێی و لە کوێوە هاتووی؟ خایلە وەڵامدەداتەوە و دەڵێت: من بەشی پێغەمبەرایەتی تۆم لە حەقەوە، من حەقم، من خۆشەویستم، من لە چاودێرەوە(الرقیب) هاتووم، ئەو خایلە و ختوورەیە ناوەوە و بیستن و بینینی کەسەکە پڕ دەکات، دەیبینێت و خەڵوەتی لا خۆشەویست دەبێت و لە نیشتمانی خۆی کۆچدەکات، پاشان فەرمانێکی تر رووی لێدەکات و بە هەندێ وەڕسی بێزاری دەکات، پاشان فەرمانێکی تر کە دیسان بێزار و وەڕسی دەکات، تا بێدەنگی بۆ دێت، کاتێك بێدەنگی بۆ هات ئاخافتن بەردەوام دەبێت، دەیبینێت وەك ئەوەی بە گوێیەکانی گوێی بۆ کەسێك گرتبێت کە لە تەنیشتەوە دانیشتووە و قسە بۆ یەکتری دەکەن.

پیاوێك هەستایە سەرپێی و داوای شتێك لە دونیای دەکرد، ئەویش دایبنیشاندەوە و پێی فەرموو:

من فەرمانت پێ دەکەم بە زوهد لە دونیا پاشان زوهد لە دوارۆژ، ئەوجا داوا لە خودا بکە، زوهد بکە تا حق(عزوجل) پێتدەبەخشێت و وەریناگرێت.

خودا(عزوجل) وەحی بۆ عیسا(علیه السلام) رەوانەکرد و پێی فەرموو: ئەی عیسا، وریابە منت لەدەست نەچێت، موسا(علیه السلام) فەرمووی بە پەروەردگاری: ئەی

---

[1] ذكره السيوطي في "الدر المنثور" عن ابن عباس.

پەروەردگار ئامۆژگاریم بکە، فەرمووی: ئامۆژگاریت دەکەم بە خۆم، پاشان فەرمووی: ئامۆژگاریم بکە، فەرمووی: ئامۆژگاریت دەکەم بە خۆم، هەر بەو جۆرە چوار جار، هەر جارێك دەیفەرموو: ئامۆژگاریت دەکەم بە خۆم(واتە بزانە چۆن مامەڵە لەگەڵ خودا دەکەی)، تا هێلکەی بوونت هەڵنەیەت و باڵەکانی شەرع نەخاتە ژێر خۆی قسەکردن نییە، خوێندنت بۆ دروست دەبێت و دەنکی فەزڵی خودا هەڵدەگریتەوە و دەبیەی بۆ خۆت، مەبەست ئەوەیە واز لە قسەکردن بۆ خەڵکی و بانگکردنیان بۆ لای خودا بهێنە تا لەلای خودا راکێشێك تۆ کێش دەکات و شایستەیی قسەکردن بۆ خەڵکی و بانگکردن بۆ لای خودات پێ دەبەخشێت، ئەم حوکمە ئاشکرا بە کارکردن توندوتۆڵ بکە پاشان تەماشا بکەن لە خۆشی و پاکی نزیکی ئەو چی دەبینن، موناجاتی خودا لەگەڵ عاشقان خۆراکە، من قسە دەکەم و تۆ و ئاسمان و زەوی لەلام نەبوونن، تەنها خودایە(عزوجل) قازانج و زیانم پێدەگەیەنێت.

مانای قسەی ئەو گەورە پیاوە چییە کە دەڵێت: مورید وەردەگرێت بەر لەوەی فێری ژێری و حیکمەت ببێت؟

ئەویش(خوای لێ رازی بێت) فەرمووی:

واتە مورید ببە ناو عیبادەت و تێکۆشان لە نوێژ و رۆژوو بەر لەوەی پەیبیات بە نزیکی و لوتفی خودا، کاتێك نزیکی کردەوە و لوتفی پێکرد لە زانستەکەی سارد دەبێتەوە بەر لە پەیبردن بە هاوەڵی و مورادبوونی، تۆ ئەو رێگەیە داوا دەکەی و ئێمەش وازت لێ دەهێنین، هەریەك لە ئەهلی دونیا خەریك و سەرقاڵی کاری خۆیەتی، ئەمە بەندەی پلە و پایە و درهەمە، ئەوە بەندەی دەسەڵاتە، ئەوەش بەندەی نەفس و پۆشاکە، هەریەك لە رۆڵەکانی دوارۆژیش سەرقاڵی کاری خۆیەتی، ئەمەیان بە رۆژووەوە، ئەوەیان بە نوێژەوە، ئەویتریان بە ریوایەتەوە، ئەمەیان بە ترسان لە ئاگر و ئەوەش بە خۆشەویستی بەهەشتەوە.

کەسێك هەستا کە دڵی بۆ خودا(عزوجل) و لەگەڵ خودا و پەیوەست بە خودا و زاهید لە دروستکراوان بوو، ئەو بۆ سەرخستنی ئاییەنەکەی هەستایە سەرپێ، زەوی بۆ

بپشكنن، گەر ئەو پیاوەتان بینییەوە پێیەوە پەیوەست بن، مژدەی باوەڕدار لە روخساریدایە و دڵتەنگییەكەی لە دڵیدا، پاشان ئەوە پێچەوانە دەبێتەوە، دڵتەنگییەكەی لە روخساریدا دەبێت و دڵخۆشییەكەی لە دڵیدا، پێكەنینی هەیە بۆ لای قەزا و قەدەر و مژدە بە هاتنیان وەردەگرێت.

((دونیا بەندیخانەی باوەڕدارە))[1].

هەتا باوەڕدار بێت دونیا بەندیخانەی ئەوە، گەر تەقواكەی بەردەوام بوو لە دونیا دێتە دەرەوە و لە بەندیخانە و لە تەنگەلانی بەندیخانە دێتە دەرەوە.

﴿ وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا ۝٢ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ﴾ الطلاق: ٢-٣

هێلكەی بوونی هەڵدێت، دەنكی حوكم هەڵدەگرێتەوە، باڵی نزیكی لە خوداوە لە ئامێزی دەگرێت، ئەو خاوەنی سفرە و خوان و مەجلیسی خۆیەتی، ئەی گەمژە، چەخماخەیەكت لەلایە جێگیربوونی بۆ نییە، والأبوونێكت لەلایە وەك چۆن دێت هەرواش دەڕوات، تۆ ئاتاجی بەوەی هەزار جار فەنابیت و بمریت، كۆتاجار جێگیر ببیت وەك چۆن شەو و رۆژ دێن و دەچن، بەردەوامبە و لامەدە، گەشە دەكەی و رێگە بە سێبەرت دەدرێت لەدوای ئەوەی دەبیت بە كۆڵەكە بۆ حەوت زەوییەكە نەك ئەم زەوییە، بانگەشە مەكە، تۆ مێشوولەیەك گازت لێدەگرێت قیامەتت لێهەڵدەستێت، گەر لە ژەمی ئێوارەدا پاروویەكت كەم بێت قیامەتت لێهەڵدەستێت، واز لە حاڵەتەكە بهێنە بچێتە ناوتەوە و لەگەڵ دڵت یەكانگیر بن(هاوسەری بكەن)، ئەوكات بێچوو لەدایك دەبێت و بەسەر جیهانی نهێنی تۆدا بەرەو رۆژهەڵات و رۆژئاوا و دەریا و وشكانی دەفڕێت لەبارێكدا چاوەكانی تۆ لە خەودایە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((خەڵكی نوستوون كاتێك مردن بەئاگا دێن))[2].

خراپترین پیاو ئەو پیاوەیە لەدوای مردن بەئاگا دێت، پێویستە كەسی هەژار پۆشاكی قەناعەت و عیففەت لەبەربكات تا بگاتە حەق(عزوجل)، بە پای صدقەوە

---

[1] تقدم تخريجه.

[2] قال الملا علي القاري في "المصنوع" والعجلوني في "الكشف": هو من قول علي -كرم الله وجهه-.

هەوڵبدات و داوای دەرگای نزیکی لە خوداوە بکات، لە دونیا و دوارۆژ هەڵبێت، لە دروستکراوان و بوونی خۆی هەڵبێت، چاوەدێر و سۆز و بەزەیی حەق پێشوازی لێ بکات، شەوق و راکێشان و سەرنجدان و شانازی پێوەکردن رووی لێ بکات، کاروانی رۆحی پێغەمبەران(علیهم السلام) و فریشتەکان پێشوازی لێ بکەن، فریشتە و رۆحی پێغەمبەران و نێراوانی خودا بە کەژاوەیەکی شکۆدار ببیەن بۆ لای حەق(عزوجل)، ئەی دڵمردووان، داواتان بۆ بەهەشت لە گەیشتن بە حەق(عزوجل) کۆتوبەندی کردن، بێزار بن، بێزار بن، بگەڕێنەوە، بگەڕێنەوە، با هیوا و ئاواتەکانت کەم و کورت بن تا دڵت نزیك بکرێتەوە و نهێنیت لە دروستکراوان پاکببێتەوە و لە حەق(عزوجل) نزیك ببێتەوە، پێشینەی خۆت بخوێنییەوە و دێڕ بە دێڕ و وشە بە وشە و پیت بە پیت بوەستی لەسەر کاتەکان و سەردەمەکان و ساتەکان و چرکەکانی تەمەنت، ئەوکات بۆت روونببێتەوە چیت تێدا ئەنجامداون، هەرکات ترس بۆ لای ئەو راتدەکێشێت نزیکی لە خوداوە دامەزرانت پێ دەبەخشێت، گوێ بەوە مەدە تەمەنت درێژ بێت یان کورت بێت، قیامەت هەستابێت یان هەڵنەستابێت، خەڵکی تۆیان خۆشبوێت یان رقیان لێت ببێتەوە، پێت ببەخشن یان بێبەشت بکەن.

لێرەدا هەستایە سەرپێ و هاوارێکی لێ بەرزبوویەوە و رووی خۆی داپۆشی و پاشان رووی خۆی دەرخستەوە و فەرمووی:

﴿ قُلْنَا يَٰنَارُ كُونِى بَرْدًا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ ﴾ الأنبياء: ٦٩.

خودایە هەواڵەکانمان دەرمەخە.

پاشان دانیشتەوە و فەرمووی:

سوفیانی سەوری بە فوزەیلی کوڕی عەیازی وت: وەرە با بۆ زانستی پێشینەی خودا(عزوجل) لە ئێمەدا بگرین، ئەوان دەترسان و خۆیان دەپاراست.

﴿ وَٱلَّذِينَ يُؤْتُونَ مَآ ءَاتَوا۟ وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ ﴾ المؤمنون: ٦٠

دەترسان لەوەی کردارەکانیان قبووڵ نەکرێن، دەترسان لە سەرئەنجامی خراپ.

ئیمام ئەحمەد (خودا لێی رازی بێت) دەیفەرموو: تەنها پۆشاکێکە جیا لە پۆشاکێکی تر و خواردنێك جیا لە خواردنێکی تر و چەند رۆژێکی کەم و کورت[1].

ئەی گەنج، دەرگای مننەتی خەڵك دابخە دەرگای مننەتی خودات بەڕوودا دەکرێتەوە.

پاشان هەستایە سەرپێ و جارێك بۆ لای راست لاردەبوویەوە و جارێك بۆ لای چەپ، دەستی لەسەر سینەی دانابوو ، توند مەمکەکانی خۆی گرتبوو، پاشان دانیشتەوە و فەرمووی:

ئەی کوێر، لەو دەرگا کراوەوە بچۆ ژوورەوە، ئەوە دوو دەرگایە: داخراو و کراوە، لەو کراوەوە بچۆ ژوورەوە، هاوەڵی "هۆ" بکە بە سوننەت لەبەر شەرم و حەیا لە شەرعی پێغەمبەر(ﷺ)، پاشان لە هۆکار(سەبەبکار)-بە شوێنکەوتنی پێغەمبەر(ﷺ) لە حاڵێدا- بچۆ بەرەوە، کەسابەت سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، ئەوەکولیش حاڵی بوو، پاشان گەر توانیت لە خۆت فەنابیت ئەنجامی بدە، نە لەگەڵ هۆ و نە لەگەڵ حاڵ، هەردوو بە حەق(عزوجل) بسپێرە، ئەو بەسە بۆ تۆ، بەرزتدەکاتەوە و نزیکت دەکاتەوە، بەڵکو شتێکت پێ دەبەخشێت کە تۆ نایزانیت:

﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ٢١٦﴾ البقرة: ٢١٦

ئەو خۆی رادەستی شەپۆلەکانی قەدەر کردووە، لە هەرکوێ بەرببێتەوە رووبەڕووی فەزڵی خودا دەبێتەوە، روو لە هەرکوێ بکات رووی خودا(عزوجل) لەوێ ئامادەیە، نزیکی و هۆگری و سۆز و بەزەیی ئەو(سبحانه وتعالى) دەبینێتەوە، نموونەی کەسی دەوڵەمەند وەك پیاوێکی کوێر وایە کە خواردنەکەی لەسەر سینییەك بۆ دەهێنن، خواردنەکەی بۆ دێت و نازانێت لە کوێوە بۆی هاتووە، کە دواجار سەرچاوەکەی زانی رۆیشت بەدوای نارِاستەکەیدا و هەموو نارِاستەکانی تری داخست، ئەم بەندەش بەهەمان شێوەیە گەر زانی خودا(عزوجل) کارئاسانکەر و پێبەخشەرە رووی لێ دەکات و دڵی بە خوداوە پەیوەست دەبێت، نەفست بووە بە مەعشوقت، گەر بتزانیبایە دوژمن و بکوژی تۆیە سەرپێچیت لێ دەکرد، خواردن و خواردنەوەت لێ قەدەغە دەکرد،

---

[1] (رەحمەتی رازیکردنی خودا ساوەیەکی کەم و کورتە).

مەگەر ئەوەندەی کە هەردەبێت پێی بدرێت، ئەوەش بریتییە لە مافی خۆی، گۆشەنشینی بۆ تۆ باش نییە، بەڵکو بازاڕ بۆ تۆ باشە، بۆ ئەوە شیاو نیت سەربکێشیتە ناو نهێنییەکانی خودا(سبحانه وتعالى)، کەسێك دەتوانێت سەربکێشێتە ناو نهێنییەکانی خودا لاڵ بێت، هەرکەس نەتوانێت دەست بەسەر نهێنی خۆیدا بگرێت با لە خەڵکی دووربکەوێتەوە و روو لە ئەشکەوتەکان و کەناردەریاکان و دەشت و چۆڵ و بیابان بکات، هەرکەسێك نەتوانێت حوکم(شەریعەت) و زانست(زانستی دڵ) پێکەوە کۆبکاتەوە گرانی و تەنگەلانی دەبێتە قامچی مەلیك و ئەدەبی دادەدات، ئەم قسەیە لە کاتی سیاسالی و گرانیدا وتراوە.

**هاوار بە حاڵت**، داوای دونیا و دوارۆژ دەکەی و بانگەشەی خۆشەویستیش دەکەی، ئەی گەمژە، بانگەشەی خۆشەویستی ئەو دەکەی و داوای لێ دەکەی زیانت لەسەر لابدات و سوود و قازانجت بۆ بهێنێت، کەنارگیر بە تۆ یەکێك نیت لە خوداناسان، تۆ بەندەی دروستکراوانی، بەندەی نەفس و ئارەزوو و حەزەکانی، لەلای ئێمە سەنگی مەحەکی هەڵسەنگاندنی ئێوە بوونی هەیە، لەلای ئێمە ئاڵوگۆڕکاری پارە(سکەناس) بوونی هەیە، لەلای ئێمە سکەلێدەر بوونی هەیە، ئەی بانگەشەکەر، ئەمە چییە؟ شت لە جێگەی خۆی نالێیت، دوعا شوێنی خۆی هەیە، کاتی قسەکردن حاڵی خۆی هەیە، کاتی بێدەنگی بەهەمان شێوە، سەرنجدان حاڵی خۆی هەیە و چاوداخستن بەهەمان شێوە، کوا کەسێکی کارکەر تا هاوەڵی بکەین؟ صادیقان لە هەموو سەردەمێکدا هەن، هەموو دەمێك بەندایەتی پێویستیان لەسەرە، ئەوەش وەك شوکرێك بۆ خاوەنی نیعمەتەکە، نیعمەت کە بە گوێڕایەڵی و شوکر پێشوازی لێ دەکەن، فەرمانت پێ دەکات بە کەمێك لە حەڵاڵ لەو حەڵاڵەش دەستت کورتبکەرەوە، گەر لە حەڵاڵدا پێتڕاکێشا و زۆرت کرد سەردەکێشێت بۆ دەستبردن بۆ موباح کە لە نێوان موسڵماناندا هاوبەشە، گەر لە موباحدا پێتڕاکێشا سەردەکێشێت بۆ شوبهە، شوبهەش بۆ حەرام، حەرامیش بۆ ناو ئاگر، زاهید ئەو کەسەیە زوهدی لە حەڵاڵ کردووە، بەڵام زوهد کردن لە حەرام واجبە، لەوانەیە هاتوویەك روو لە دڵ بکات و نەتوانێت شانبداتە ژێری و هەڵیبگرێت، وەك دایك کاتێك هەواڵی مەرگی کوڕەکەی پێ دەدرێت هاوار دەکات و

پۆشاکەکانی لەبەر خۆی دەدڕێت، ئەقڵ ناتوانێت شانبداتە ژێر هەواڵەکە، واتە بیستن و وەجدی پێوەیە، بە دوعا تێکەڵ بە خەڵکی دەبین و بە دوعا لەگەڵیان تەبادەبن و تێکەڵیان دەبین، بەڵام دڵمان فێنکە و تەماشاکەرە بۆ بەڵێنی خودا(عزوجل)، تەماشاکەرە بۆ خواردن لە فەزڵ و چاکەی ئەوەوە تا دڵ دامەزراو و جێگیر دەبێت، لە ویستی خۆت زوهد بکە بۆ ئەوەی ویستی خودا(عزوجل) بۆ خۆت دەستەبەر بکەیت، لە مەرجەکانی خۆشەویستی ئەوەیە ویست وازلێبهێنیت، لە کاتێکدا تۆ لەو دۆخەدای زمانت دێتە گۆ و گرێیەکانت دەکەونە بیستن و چاوەکانت دەکرێنەوە، لوتف و بەخشندەیی رووت لێ دەکات، پاکی و بێگەردی نهێنی-وەك بەر و گەنجینەی ئەو حاڵە- دێتە بەرەوە، خزمەتکاران رووت لێ دەکەن، هەموان دەبنە خزمەتکار و هەموان مەدح و سەنات دەکەن، خودا(عزوجل) بەسەر هەمواندا شانازیت پێوە دەکات، ئەو(سبحانه وتعالى) دەفەرموێت:

﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟﴾ الحشر: ٧

فەرمانەکانی خودا(عزوجل) و فەرمانەکانی پێغەمبەر(ﷺ) جێبەجێ بکەن و کاریان پێ بکەن، لەم رێگەیەدا "من" و "ئێمە"-جگە لە "تۆ، تۆ" بوونیان نییە:

﴿هُوَ ٱلْأَوَّلُ وَٱلْـَٔاخِرُ وَٱلظَّـٰهِرُ وَٱلْبَاطِنُ﴾ الحديد: ٣

لەسەر ئایەتی: ﴿وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ ۝١﴾ الطارق: ١ فەرمووی:

خودا سوێندی بە ئاسمان و رێگەکانی خواردووە، رێگەکەی بریتییە لە محەمەد(ﷺ)، هەوڵ و لێبڕانی ئەو(ﷺ) تەقەی دا لە ئاسمانەکان و پاشان جەستەی موبارەکی بەرزکرایەوە و تەقەی لێدا، پێغەمبەرمان(ﷺ) بۆ ئاسمانی حەوتەم بەرزکرایەوە و پەروەردگاری قسەی لەگەڵ کرد و بە چاوی سەری خودای(سبحانه وتعالى) بینی، پاشان بە چاوی دڵ تەماشای کرد، هەر بەوجۆرە هەرکەسێك دڵی راست بکات پەروەردگار دەبینێت و پەردەکانی نێوان ئەو و ئاسمان دەبڕێت و نهێنی و هەوڵ و لێبڕان تەقە لێدەدەن و نهێنییەکان هەنگار هەڵدەگرن، سینەی سادیقان بە نووری نهێنی پەروەردگاری جیهانانەوەیە، کۆمەڵێك سینەی نوورانی((لە فیراسەتی باوەڕدار

بترسن))، دڵ کە نزیکدەبێتەوە وەك ئاسمانێکی لێ دێت، ئەستێرەی زانست و خۆری مەعریفەی تێدایە، فریشتەکان لەم نوورانە رۆشنایی وەردەگرن، هەموو نەفسێك لە خوداوە پارێزەرێکی لەسەرە دەیپارێزێت لەوەی شەیتانەکان بیرفێنن، دانە دانەیەکیش هەن پارێزەرانیان ریزێك پێکدەهێنن و دەیانپارێزن:

﴿وَٱللَّهُ مِن وَرَآئِهِم مُّحِيطُۢ ٢٠﴾ البروج: ٢٠

زمانپاراوی و رەوانبێژی لە کوێیە؟ ماڵەکەت وێران بوو لە شوێنی خۆت دەسوڕێیەوە و دەسوڕێیەوە، دووری نابڕێت، وەك حوشتری ئاعوورەت لێهاتووە و لە بازنەیەکی داخراودا خول دەخۆیت، لەوانەیە هەندێ لە دۆستانی خودا دوعایان لێکردبێت و دوو چاوی بەصیرەتی تۆیان کوێرکردبێتەوە، تۆ خودات لەدەستدا خوداش تۆی لەبیر خۆی بردەوە، لە رێگە لاتدا و تووڵەرێگەکان روویان لێکردی، خەم و پەژارەت زۆربوو و باڵی مەبەست و مەرامی شکاندی، بوویت بە پارچە گۆشتێك لە نێوان دونیا و دوارۆژدا، ئاتاجی بە دۆستێك دوعات بۆ بکات لەدوای ئەوەی دان بە ئیفلاسی خۆتدا دەنێیت، خوداناسان یەکەمجار هۆگرییان بە خوداوە(عزوجل) پەیدا کرد پاشان بە فریشتەکانەوە، گەر بەوانەوە هۆگری پەیدا بکەی دەرگایەکی ترت بۆ دەکرێتەوە، گەر بەدروستکراوانەوە لە مرۆۆ هۆگریت پەیدا کرد پاشان ئەوەت داخست دەرگای هۆگری جینت بۆ دەکرێتەوە، گەر ئەو دەرگایەشت داخست دەرگای هۆگری بە فریشتەوە والا دەبێت، شتەکان بۆخۆیان کارناکەن، ئاگر بە سروشتی خۆی ئاسوتێنێت، ئاو بە سروشتی خۆی پاراو ناکات، ئاگرەکەی ئەمروود ئیبراهیمی(علیه السلام) ئەسوتاند، کاتێك ئەبو موسلمی خەولانی(رەحمەتی خودای لێ بێت) خرایە ناو ئاگرەوە ئەسووتا، گیانداری"سمندل"[1] ئاگر نایسووتێنێت، گەر لە کارەکاندا ئیخلاصت هەبێت لە دروستکراوان رزگارت دەبێت، لەناو ئەواندا دێیە دەرەوە، بە دەرچوون لەناو خەڵکی بە پەروەردگار(عزوجل) دەگەی، دەبێ وەك پیاوێکی غەریب کە چووەتە شارێکەوە و

---

[1] (را یاوە باڵندەیەك بێت لە هندستان بە ئاگر ئەسوتێ(معجم المعاني)، وترایشە کاتێك پیر دەبێت خۆی هەڵدەداتە ناو ئاگرەوە و گەنج دەبێتەوە).

بەدوای دۆستەکەی خۆیدا دەگەڕێت تۆش بۆ خودا بگەڕێیت، ئەو پیاوە غەریبە دەگاتە ئەوپەڕی شار و دەرگای ماڵەکەی ئەو نازانێت، بەڵام دۆستەکەی تەماشای دەکات، کاتێك سەرسامی و سەرلێشێوانی ئەوی بینی خۆشەویستی زۆری بۆ دەهێنێت و دەچێتە دەرەوە بۆ لای و دەست لە گەردنی دەکات و بەخۆیدا دەگوشێت، وەك چۆن یوسف لەگەڵ "بەنیامین"ی برای ئەنجامیدا و پێیفەرموو:

﴿أَنَا أَخُوكَ﴾ یوسف: ٦٩

خودا زەوی دڵی کردووە بە نشینگەی مەعریفە و زانست، لە شەو و رۆژێکدا سێسەد و شەست خودا(عزوجل) سەرنجی دڵ دەدات، گەر دڵ نەبوایەتە نشینگە پارچە پارچە دەبوو، کاتێك دڵ دێتە راستە و بەهۆی نزیکی لە خوداوە دادەمەزرێت- بۆ سوود گەیاندن بە دروستکراوان- روباری حیکمەتی پیادا گوزەر دەکات، ئەوان بۆ نابین دەبن بە چیای دامەزراو، مەزنەکانیان لە جێی پێغەمبەر(ﷺ) دادەنیشێت(واتە میراتگری ئەون)، بچووکەکانیشیان لە جێی هاوەڵان(خوایان لێ رازی بێت) دادەنیشن، ئەوانەی خوار ئەوان لە جێی شوێنکەتووان(تابعین) دادەنیشن، کار بەوە دەکەن کە وتوویانە، ئەوەش وەك جێبەجێکردن و هاتنەڕاستەی قسە و کردار و نهێنی و ئاشکرا، چاوی پێغەمبەرانیان(علیهم السلام) پێ رۆشن دەبێتەوە و خودا- بەسەر فریشتەکاندا- شانازیان پێوە دەکات، خۆشبەخت ئەو کەسەی شوێنیان دەکەوێت و کۆڵی دونیا و ماڵ و منداڵیان لە کۆڵ دەکاتەوە، خوداناسان کارێکی مەزنیان هەیە و بۆ هەستان بە بەرژەوەندی دروستکراوان لە کەسابەت-بۆ خۆیان- بێئاگا بوون، دروستکراوان لەلایان وەك رۆڵە وان، پەیوەست نابن بە دونیاوە، دونیا خۆی بۆ ئەوان دەخاتە روو، بەڵام ئەوان پشتی لێ دەکەن، ئەوەی لە دەستی تۆدایە بەشی تۆ نییە، بەڵکو هاوبەشە لەگەڵ جیرانەکانت، کەسابەت ئەو بەشەی خستووەتە ناو دەستی تۆ بۆ وەرگرتن و ئاڵوگۆڕ.

﴿وَأَنفِقُوا۟ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسْتَخْلَفِينَ فِيهِ﴾ الحدید: ٧،

﴿لِنَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ ⑭﴾ یونس: ١٤

دڵنەوایی جیرانەکانت بکە و خواردن بە هەژاران بدە، دەرگای خانەی کەسی صدیق تەنگەلانە و ناوەوەی بەرینە، ئەوانە لە کوێن دەرگای دروستکراوان دادەخەن و لەبەر دەرگای حەقدا دەوەستن و پێویستییەکانیان بۆ لای پەروەردگار بەرزدەکەنەوە، هۆیەکان ببڕە و ئەربابەکان لە کۆڵبکەرەوە پاشان تەماشا بکە و بزانە چی دەبینی، لەبەردەرگاکەی بوەستە و ئارامگرتن لەسەر ئازاری قەدەر و قەزای رابخە ئازارەکە کۆتایی پێدێت و ئازار ناچێژی، ئەوکات شتی سەرسوڕهێن دەبینی، سەرهەڵدان(تکوین) دەبینی چۆن دەبێتە حاڵی تۆ و چۆن رەحمەت پەروەردەت دەکات، چۆن مەحەبەت بەرزت دەکاتەوە، هەموو کارەکان لەسەر بێدەنگی بەندن لەدوای پێویستی، ئەوەش حاڵەتێکە، شانازی خودا بە بەندەکەیەوە شیرپێدانی خەڵکی و هۆیەکانی لێ حەرام دەکات و دەیگێڕێتەوە بۆ ئامێزی نزیکی خۆی[1]، کاتێک ئازار سەرهەڵدەدات حەق بۆ ئەو بەسە و بە بەزەیی خۆی ئازارەکەی لە کۆڵ دەکاتەوە.

﴿ أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ ﴾ النمل: ٦٢

خودا(عزوجل) پێویستی و بێچارەیت بۆ دروست دەکات تاکو بانگی لێ بکەی، پێداگری لە دوعادا پێخۆشە، هەموو دەرگاکان بەڕووی تۆدا دادەخات تاکو لەبەر دەرگای ئەودا بوەستی، خۆشەویستان بینییان دەرگای نزیکی کراوەیە، وەك چۆن دایکێك دەرگاکە بەڕووی رۆڵەکەیدا دادەخات و داوا لە جیرانەکان دەکات دەرگای بۆ نەکەنەوە ئەوەش لەبەر مەرامێك کە دایکەکە دەیزانێت و دەیەوێت، منداڵەکە دەچێتە دەرەوە و لە شوێنێك دادەنیشێت و دەگری و پەشیمانی دەردەبڕێت، روو لە هەر دەرگایەك دەکات دەبینێت داخراوە، دەگەڕێتەوە بۆ بەردەم دەرگاکەی دایکی، حەق(سبحانە وتعالى) تەنگەلانی بۆ بەندەکەی دروست دەکات بۆئەوەی بیگێڕێتەوە بۆ لای خۆی و دڵی بە دروستکراوەنەوە پەیوەست نەبێت، پێویستە هەژاری راستگۆ داوای نەرم و نیانی نەکات بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ نەفسی خۆی، ئەگەر هەر دەبێت داوایەك

---

[1] (لە ئاماژەی چیرۆکەکەی موسا(علیە السلام) وەریگرتووە کاتێك خودا شیری هەموو ژنێکی لەسەر حەرام کرد، بۆ ئەوەی بیگێڕێتەوە بۆ ئامێزی دایکی).

بکات یا داوای قەدەری بێنیازبوون بکات، گەر تۆی نزیك کردەوە و تاقیکردییەوە لە بەلاکەی خۆشی وەریگرە، ئەگینا بە بەلاکەوە سەرقاڵت دەکات، حەز لە شتەکان نزیکی لە خودا و ئارامگرتن لەگەڵ خودات لێ دەشێوێنێت، هەرکەس لە خودا نەترسێت ئەقڵی نییە، شاری بێ دەشتە خوێ وێرانەیە، رانەمەڕی بێ شوان گورگ دەیخوات، ئاین بریتییە لە ترسان لە خودا، هەرکەس بترسێت بەشەو دەست بە سەفەرەکەی دەکات، لە یەك شوێندا ناوەستێت بەڵکو دەڕوات، ئامانجی سەفەری خوداناسان نزیکییە لە حەقەوە، رۆیشتن رۆیشتنی دڵانە، کاتێك دەگەنە دەرگاکە نهێنی مۆڵەت وەردەگرێت و مۆڵەتی دەدرێت لەدوای هۆگری دڵ لەگەڵ خودا، ئەستێرەی دڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو بە مانگ، مانگ بوو بە خۆر، خەڵوەت بوو بە ئاشکرابوون و هاتنە ناو خەڵکی، ناوەوە کەوتە دەرەوە، بەندە لە دوو حاڵەتی هەڵچوون و داچووندایە، سەری بەتەواوی دەخاتەوە ناو لانەکەی خۆی و رەشماڵی نهێنی خۆی، ئەو موجەوهەراتانەی لەژێر دەریادایە دەیانبینێت و دەستیان بۆ درێژ ناکات، ئاماژە بە ئامادەبووانی لای خۆی دەکات و پێیان دەڵێت ئەی فلان تۆ ئەوە وەریگرە و ئەی فلان تۆش ئەوە وەریگرە، ئەوانە مەلیکن، ئەوانە -لەرووی نوێنەرایەتی و جێنشینییەوە- مەلیکی ئاسمان و زەوین لەبەردەستی حەقدا(عزوجل)، من لەبەر دەرگای مەلیکدام، چاوەڕوانی ئێوە دەکەم، تەماشاتان دەکەم لە ئاگایی و لە خەودا، بۆ ئێوە ئازارەکانی ئەم شارە دەچێژم، لەژێر ئافەتەکانیاندا ئارام دەگرم، لە هەڵهاتنی خەریکم، هەرکات هەنگاوێك هەڵدەگرم دەمگێڕنەوە، ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم لە خۆرەوە تا داهاتنی تاریکی بە خەم و پەژارە و بیرکردنەوە و ئەنجامدانی دوایین بڕیارەوە دوعاکانیدا سەرسامی رووی لێکرد و چاوەکانی داخست و گوێی لێ بوو(عزوجل) پێی دەفەرموو: (ئەی ئیبراهیم، بڵێ: خودایە، بە قەزای خۆت رازیم بکە و لەسەر بەلاکانت ئارامیم پێببەخشە و توانای شوکری نیعمەتەکانم پێبدە)، خودایە داوای تەواوی نیعمەت و بەردەوامی عافییەت و دامەزران لەسەر خۆشەویستیت لێدەکەم)، پێغەمبەر(ﷺ) زرنگانەوەیەك کەوتە سەر دڵی، دڵی دەربارەی خانەوادەکەی هەواڵیدا، رۆیشت بۆ "حەرا" کە پارچەیەکە لە "طور سیناء"، لەوێ ئەسیمی بۆنی وەحی

هەڵیکرد، ئەشکەوتێکی لێبوو پێشتر عابیدێکی تێدا بوو پێی دەوترا "أبو کبشة"، پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ شوێنەکەی و لەو جێگەیە پەروەردگاری خۆی دەپەرست، لە کاتێکدا ئەو لەو بارەدا بوو خەونی دەبینی و وەك بەرەبەیان دەهاتە دی، بانگی لێکرا: ئەی محەمەد، ئەی محەمەد، ئەویش لە دەنگەکە هەڵدەهات و گەڕایەوە بۆ ناو خانەوادەکەی و دەیفەرموو: دامپۆشن، دامپۆشن، من دەنگێك دەبیستم، وترا: ئەی محەمەد: ئەی محەمەد، بە خۆداپۆشین لەم دەنگە تێناگەی.

﴿ وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمۡرِهِۦ ﴾ یوسف: ٢١

ئەمە بریتییە لە دڵ، نموونەی ئەو دڵە وەك ناوکە خورما وایە لەناو خانوویەکدا کە سەقفی نییە و تەنها چواردیوارێکە و بەپێوە وەستاوە، بارانی لێزمەی زستان و خۆری هاوین بەسەریدا دادەبارێن، دەڕوێت و کەس نایبینێت، کاتێك پەلوپۆ لێدەدات و گەبەڵ دەبێت و دەکەوێتە بەر و بەری پێدەگات لەو بەرە دەکەنەوە و ڕێگەیەکیش نییە بۆ ئەوەی دەستیان بە ئەو درەختە بگات، دڵیش بەم جۆرەیە.

﴿ ثُمَّ إِذَا شَآءَ أَنشَرَهُۥ ﴿٢٢﴾ ﴾ عبس: ٢٢

ویلایەت لە ناوەوەیە و شاراوەتەوە، نموونەکەی وەك پێخەفی ڕاخراوی مەلیك وایە و هەمیشە لەگەڵیدایە، مەگەر سواری ئەسپ ببێت لێی جیاببێتەوە، تەنها ناسایشی خواردن و خواردنەوە و پۆشاك لە خودا داوا بکە، لە خودا ڕامەکە، بۆ داوای ئەو شتانە مەپەرستە، چی دەکەیت لە ڕەحمەت؟

پاشان فەرمووی:

خودایە بە خۆت لە کەسانی تر بێنیازمان بکە و بە کەسانی ترەوە خەریکمان مەکە، ئەوە چییە؟

ئەم قسەیەی بە ڕوویەکی توورە و گرژەوە کرد و پاشان ڕوخساری خۆی داپۆشی و بە هاوارەوە هەستایە سەرپێی و پاشان دانیشتەوە و ئەوجا هەستایەوە و فەرمووی:

﴿ وَلَتَعۡلَمُنَّ نَبَأَهُۥ بَعۡدَ حِينِۭ ﴿٨٨﴾ ﴾ ص: ٨٨

دەستەیەك داواكردن لە خودا(عزوجل) بە ناپەسەند دەبینن، بۆ ئەوەی شەڕ و وازهێنان لە سپاردن و ڕادەستكردن نەدرێتە پاڵیان، شەوق هەنگاوەكانیان خێرا دەكات، گەر زوهدت لە دونیا كرد بەخشینی دونیات لا ئاسان دەبێت، كۆمەڵە حاڵێك بۆ دۆستانی خودا هەیە، "بەدەل" نابێت بە بەدەل تا كۆڵی قورسی خەڵكی لەسەر پشتی هەڵنەگرێت، پەروەردگاریش كۆڵەكە بۆ ئەو هەڵدەگرێت، چونكە لەبەردەستیدایە و لە جووڵە كەوتووە، ئاشكرای كۆڵەكە لەسەر بەندەیە، بەڵام ناوەوەی لەسەر دەستی بەزەیی خودایە، بەڕاستزانینتان هەبێت و تۆمەت لە دڵتان دەربكەن.

هەروەها لەسەر ئایەتی: ﴿ إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيۡلِ هِيَ أَشَدُّ وَطۡـࣰٔا وَأَقۡوَمُ قِيلًا ۝٦ ﴾ المزمل: ٦

**فەرمووی:**

ئەوە لەدوای خەوتنە، خەوی جەستە و نەفس و سروشت و ئارەزوو و ویست، موناجات بۆ خودا و ڕكوع و سوژدە لەبەردەستی خودا دەبێت بە خواردنەوە و خواردنەوەی دڵی، ئەوانە دەبینی -لە داواكردن و گەڕان بەدوای حەقدا- زوهدیان لە دونیا كردووە بۆ ئەوەی سەرقاڵ نەبن پێیەوە؟ هەر بەو جۆرە ئەو كەسە لە دوارِۆژ زوهد دەكات بۆ ئەوەی لە خودا سەرقاڵ نەبێت، ئاوات دەخوازێت دوارِۆژ نەبوایە، چونكە شیرین و ئاشكرا و ڕەحمەتە، دڵ و نهێنی دەبن بە ڕوویەك لەسەر ئاشكرای ئەوەی لە دڵدایە دەردەكەوێت، بەردەوامی دونیای پێخۆشە، چونكە بەنهێنی خودا دەپەرستێت و بەنهێنی مامەڵەی دەكات، تۆ لەگەڵ حەق لە وەحشەتدای، كەی دڵت لە دروستكراوان وەحشەتی بۆ دروست دەبێت و لەگەڵ حەق(عزوجل) هۆگری بۆ پەیدا دەبێت؟ لە دەرگایەكەوە بۆ دەرگایەكی تر، تا دەرگایەك نامێنێتەوە، لەم شارەوە بۆ ئەو شار تا شارێك نامێنێتەوە، لەم ئاسمانەوە بۆ ئەو ئاسمان تا ئاسمانێك نامێنێتەوە، قیامەت لە نەفسی خۆی هەڵدەستێنێت، لەبەردەستی حەقدا(عزوجل) ڕاستدەبێتەوە، لاپەڕەی چاكە و خراپەكانی خۆی دەخوێنێتەوە، بەردەبێتەوە بۆ ناو ئاگر لە كاتێكدا ئەو لە نێوان ترس و ڕەجادایە، لە نێوان بەربوونەوە بۆ ناو ئاگر و پەڕینەوە و فریاكەوتنی خودایدایە بۆ ئەو، خودا بە لوتفی خۆی و بە ئاوی ڕەحمەتی ئاگرەكە دەكوژێنێتەوە، ئاگرەكە بانگ دەكات و دەڵێت: ((بپەڕیوە ئەی باوەڕدار نوورەكەی

تـۆ كلّپەكـەی كـرێ مـنی كوژاندووەتـەوە))[1]. مـاوەی سـێ هـەزار سـاڵ دووری بـۆ چركەیەك نزیك دەبێتەوە، كاتێك لە خانـەی مـەلیك نزیـك دەبێتـەوە دەگەڕێتـەوە بـۆ هۆش و ویست و خۆشەویستی و شەوقی خـۆی بـۆ مـەولا(عزوجل)، دەڵێت: تـەنها لەگـەڵ مـەحبووبم دەچـمە ژوورەوە، نـابینی منـداڵی لەبارچـوو لەبـەردەم دەرگـای بەهەشتدا دەوەستێت و دەڵێت: بەبێ بـاوك و دایكـم ناچـمە ژوورەوە، كـوا جیرانەكـە، كوا شاهیدەكە؟ ناچێتە ژوورەوە تـا دەسـتی پێغەمبـەر(ﷺ) دەنرێتـە نـاو دەسـتی و دەچێتە ژوورەوە بۆ لای مەحبووبی، كاتێك ئەمەی بۆ تەواو بوو دەیگێڕنەوە بـۆ دونیـا بۆ ئەوەی بەشەكان تێر و تەواو بكـات تـاكو زانسـت ئـاڵوگۆڕ نـەبێت و نەسڕێتەوە و مەحونەكرێتەوە، خودا لەو كارە بووەتەوە، خوداناسان ئـاواتی هـاتنی شـەو دەخـوازن، كاتێك ماڵ و منداڵ خامۆش دەبـن و دەخـەون، ئـەوان داوالێكـراون و كـۆڵی قورسـی مـاڵ و منـداڵ و "هۆ"یـان هـەلگرتووە لەگـەڵ خامۆشـی و سـوكنایی دڵیـان بـۆ لای پەروەردگار(عزوجل)، ئەندامەكانیان لەناو هۆیەكانـدا دەبـزوێن، گـەر بـەر لـە هـاتنی بەڵا خۆپارێز بیت لە كاتی بەڵادا تەنها بۆ لای ئەو(سبحانه وتعالی) دەگەڕێتـەوە، تـەنها خودا بـە لابـەری ئـەو بەڵایـە دەزانیـت، خێـر و شـەڕ و زیـان و قـازانج و عیـززەت و زەلیلی و دەوڵەمەندی و هەژاری تەنها لە خودا دەناسیت.

**پرسیارێك:** مانای ئەو قسەیە چییە هەندێ لە خوداناسان دەیڵێن: "گەر سەرنجدانی سوودت پێ نەگەیەنێت ئامۆژگارییەكەی سوودت پێ ناگەیەنێت"؟

ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی:

دەستەیەك دونیا و دوارۆژ لەبەر چاویان و لەبەر دڵیـان بـزر بـووە و پـەروەردگاری خۆیان بینیوە، ئەوانە گەر سەرنجت بدەن سوودت پێ دەگەیەنن، كاتێك وەلـی سـەرنجی زەوی وشك دەدات خودا زیندووی دەكاتەوە و رووەك و گژوگیای لـێ دەروێنێـت، گـەر سـەرنجی یەهودی یان نەصرانی بـدە خـودا هیدایـەتیان دەدات، یـەكێك پرسـی: بۆچـی دەتبینین دەستت لە گەردنی ئەو دارە كردووە كە بریتییە گۆمبەزی كورسییەكە؟

---

[1] تقدم تخریجه.

فەرمووی:

چونکە لێم نزیکە، کۆمەڵێك شت دەبینێت و هەواڵی لەبارەیەنەوە نادات و ناشخەوێت، بۆیە دەست لە ملانی دەبم، پێی وت: ئێمە لە دڵی تۆوە نزیکترین؟!

فەرمووی:

کوڕەکەی دایتی، ئێوە کاتێك لە دڵی منەوە نزیکن گەر تەقوای خوداتان هەبێت، چاودێری خوداییتان هەبێت و لێی بترسن و داوای بکەن، ئەوکات من بۆ ئێوە دەبم بە خزمەتکارێکی موحیب، گەر بەندە زوهدی کرد و گەڕایەوە و پیر بوو لەسەری خودا دەرگای بۆ دەکاتەوە و نزیکی دەکاتەوە و لەپەنای خۆی دەیژییەنێت و چاوی لە ئاگاداربوون بۆ سەر زانست دادەخات، زانستی پێ نیشان دەدات و فێری خامۆشی و کزی دەکات و پیری و ئەدەبی جوان دەبێت بە کاڵای باڵای، خوداناسان بە ئەندامەکان و دڵ و نهێنی و تەنهایی و پەنهانیان لەژێر زەحمەت و ئەرکی پەروەردگاریانەوە قسە دەکەن، لەلای خودا بوون بە تەقواداران و خاوەن رێز و پلە و پایە، پەرستراوی یەکێك لە ئێوە درهەم و دینارەکانییەتی، گەر ئەو درهەم و دینارانەی لێ بگیرێتەوە قیامەتی لێ هەڵدەستێت و نوێژی جومعە یان نوێژی جەماعەتی لەدەست دەچێت و گوێی پێ نادات، بەڵام کاتێك کوڕێکی فاسقی بەدرەفتاری دەمرێت نیگەرانی و پەرێشانی رووی لێ دەکات، دەگەڕێت بۆ یەکێك هۆگری لەگەڵ پەیدا بکات، کەچی فریشتەکانی لەگەڵە و هۆگری لەگەڵیان پەیدا ناکات، کاتێك دڵی بەندە ساز و رەوان و پاڵفتە دەبێت هۆگری بە فریشتەکانەوە پەیدا دەکات، هەندێ جار لە تەنهاییدا قسەیان لەگەڵ دەکات، ئەی ئەو کەسەی لە حەق بزر و نادیاری، ئەی ئەو کەسەی لە شەرع و دین بزر و نادیاری، ئەی ئەو کەسەی لەگەڵ دونیا و نەفس و سروشتدا راوەستاوی، ئەو کەسەی بەندەی دروستکراوانی، ئەی ئەو کەسەی حەقت(عزوجل) لەبیرکردووە هەردەبێت بە لیقای خودا بگەی، ئێستا ئەوانە لە خۆت بکەرەوە، دروستکراوان و نەفس وازلێبهێنە حەق دەستەبەر دەکەیت، جگە لە یادی خودا هەرچی شتی ترە باتڵە، جگە لە زانست بە خودا شتەکانی تر باتڵن، هەرچی مامەڵەیە بۆ کەسێکی تر جگە لە خودا زیانۆمەندییە، داواکارانی دونیا زۆرن و داواکارانی دواڕۆژ کەمن، و داواکارانی

حەق(عزوجل) کەمێکی زۆر کەمن، تۆ شەو و ڕۆژ لەگەڵ دونیای خۆتی، دونیا بەکارت دەهێنێ و پارچە پارچەت دەکات و لە ڕێگە دادەبڕێت، ئێمە دونیا و ئەوەی لە دونیادایە بەکاردەهێنین، ئەی حاڵی تۆ چۆنە؟ ئەی ئەو کەسەی خەریکی تەگبیر کردنیت هەردەبێت دەستی شەرع و زانست لە دونیاکەدا بوونی هەبێت، فتوای هەر شتێکیان بۆ دای وەریبگرە، ئەوەش کە فتوات بۆ نادەن خۆتی لێ بگرەوە، چەندە باش دەکەی دەچی بەدەم بانگی موناجاتی پەروەرگارەوە، لە کڕین و فرۆشتن و پارووی ژیان و وەرگرتن و پێدان و وتن بوەستە، ئەوەی بۆ خودایە وەك فورسەتێك بەدەستی بهێنە و ئەوەش بۆ کەسێکی ترە جگە لە خودا کۆتایی پێبهێنە و دەستی لێ بکێشەوە، کاتێك خۆشەویستی زاڵ دەبێت جیاکاری نێوان دونیا و دوارۆژ نامێنێت، هەر بەو جۆرە جیاکاری نێوان پێبەخشین و لێگرتنەوە، جیاکاری نێوان قبوولکردن و ڕەدکردنەوە، دڵی بە خۆشەویستی ئەو(سبحانە وتعالی) پڕ دەبێت، خێر و شەڕی مەحبووبەکەی لەلای ئەو یەکدەگرن، دەرگاکان و ئاراستەکانی یەکانگیر دەبن، خۆشەویستی هەموو ئەواتەی کۆکردووەتەوە، هەواڵ و بینراو و زیان و قازانج لەلای ئەو یەکیانگرتووە، بەهەمیشەیی دڵی لە وەجدایە، جارێك بە یادی خودا و مەزنی و شکۆمەندی خودا(عزوجل)(واتە جەلالی خودا) وەجد دەیگرێت و جارێکیش بە یادی خودا و جوانی خودا(واتە جەمالی خودا)، لە ڕۆژدا سەرسامە، هەتا لێی نزیکدەبێتەوە دوور دەکەوێتەوە، وەك ئاگرەکەی موسا(علیه السلام) کە هەتا لێی نزیکدەبوویەوە دوور دەکەوتەوە، تا لە کۆتاییدا گەیشتە:

﴿إِنِّي أَنَا اللَّهُ﴾ القصص: ٣٠

هەر بەو جۆرە دڵ نووری نزیکی دەبینێت، هەتا دەچێتە پێشەوە دووردەکەوێتەوە:

﴿حَتَّىٰ يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ﴾ البقرة: ٢٣٥

لە کۆتا هەنگاوەکانی ڕادەی خۆیدا کارەکە وەردەچەرخێت و داواکەر دەبێت بە داواکراو و خاوەن مەبەست دەبێت بە مەبەستگیراو و مورید بە موراد، ڕاکێشانی لە ڕاکێشانەکانی حەقەوە(عزوجل) لە کاروکردەوەی ئینس و جن چاکترە، خودا بەندەکەی

خۆی دەبینێت لە سروشت و حەزی خۆی هاتووەتە دەرەوە و ماڵئاوایی لە دروستکراوان کردووە و حەزەکانی وازلێهێناوە و تەنها داوای خودا دەکات و بۆ ئەو بەتەواوی گۆڕاوە، هەڵدەستێ و دادەنیشێ، نە توێشوو و نە ئاسوودەیی و نە هاوەڵ، لە هەڵهاتنی خۆرەوە بۆ داهاتنی تاریکی ڕۆژوو و نوێژوو و تێکۆشانی بەردەوام، لە کاتێکدا ئەو لەو بارەدایە لەبەر دەرگای نزیکی خودا خۆی دەبینێتەوە، لە ئامێزی لوتفی خودا و لەسەر سفرەی چاکەی خودا، خوداش(عزوجل) تەماشای پێشینەی ئەو دەکات، تۆ شوێنی بەرزت گەرەکە و لە زەلکاودا چەقیوی، بەهەشتت خۆشدەوێت و کاری بۆ ناکەی.

**یەکێک لە خوداناسان دەڵێت:** نەفست لە دەقپێوەگیراوەکان(مألوفات) بەند بکە، بە سروشت خواردن مەخۆ، با خواردنی پاروویەك لەلای تۆوە بە واژووی خودا(عزوجل) بێت، دەوا تەنها بە فەرمانی ئەو دەستبۆببە، میزاجی پشتدەکات لەوەی لە کتێبە پزیشکییەکان و فتواکانیانەوە دێنە دەرەوە.

﴿وَهُوَ يَتَوَلَّى الصَّالِحِينَ ﴿١٩٦﴾﴾ الأعراف: ١٩٦

پزیشکە خۆشەویستەکەی لە ماڵەکەیدایە، ئەو سەرپەرشتی خواردن و خواردنەوەکەی دەکات.

پاشان هاوارێکی مەزنی لێ بەرزبوویەوە، هەستایە سەرپێی و جارێك بەلای ڕاستدا و جارێك بەلای چەپدا لار دەبوویەوە، دەستی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و ئاماژەی بە خۆڕادەستکردن کرد، هەر بەو جۆرە تا کۆتایی دانیشتنەکەی.

**پاشان فەرمووی:**

هاوار بۆ ئەم سووتانە، هاوار بۆ ئەم موسیبەتە لەسەر ئێوە.

پاشان دەستی بەرزکردەوە بۆ دوعا و دانیشت بۆ دوعا و قسەی نەکرد، پاشان گەڕایەوە و هەستایە سەرپێ و جارێك ڕەنگی ڕوخساری بە زەرد دەگۆڕا و جارێکیش بە سوور.

**پاشان فەرمووی:**

کاتێك دڵ لە دونیا بەرز دەبێتەوە و دەبێت بە میوانی نزیکی لە حەقەوە(عزوجل)- لە عەرشەوە بۆ فەرش- عیصمەتی لە دروستکراوان ناوێت، وەك ئەوەی دروستکراوان دروستنەکرابن، وەك ئەوەی خودا هیچی بەدینەهێنابێت، وەك ئەوەی ئەو تەنها دروستکراوێك بێت، واتە خاوەنی ئەم دڵە رازاوە بە یەکتایی خودا و یەکتاپەرستی، یەك بۆ یەك: موحیب و مەحبووب، داواکەر و داواکراو، یادکەر و یادکراو، نەك شتێکی تر جگە لە خودا(سبحانه وتعالى).

**هەروەها فەرمووی:**

هەواڵێکم بۆ هاتووە بەڵایەك روو لەم شارە دەکات.

پاشان دوعای بۆ ئەهلی شار کرد بەوەی خودا ئەو بەڵایان لەسەر لابدات، پاشان وەك کەسێکی گەردنکەچ فەرمووی:

سوێند بە خودا لەمەدا کەسانێك هەن شایستەی کوشتن و لەداردانن، بەڵام بۆ چاوێك رێز لە هەزار چاو دەگیرێت، خودایە، ئێمە بە ئەوانەوە تیادەبەی، ئێمە بە هۆی ئەوانەوە دەگریت، ئێمە چیمان کردووە؟!

ئەو قسانەی بە تووڕەییەوە دەکرد.

دۆست و دوژمنت خستە ناو کورەی قەدەرەوە، هەموویان توانەوە و بوون بە دارشتەیەك، داوای کەرامات و موعجیزە مەکە، تۆ لە موعجیزەدا لەگەڵ پێغەمبەران و لە کەراماتدا لەگەڵ ئەولیا شانشانێنت پێ ناکرێت، گەر دەتەوێت لە حەق نزیك ببەرەوە و هاوەڵی بکە، گەر هاوەڵییەکە بەردەوام بوو ئەو شتەی دەبێ بیخۆیت دەرخواردت دەدرێت، ئەوەی دەبێ بیپۆشیت پێت دەپۆشرێت، ئاواتخواستن بۆ ئەم شتانە پەردەیە، رەدکردنەوەیان لەدوای هاتنیان-لە خوداوە- بۆ ئەولیا پەردەیە، گەر رێگەی حەقیان گرتە بەر ئینس و جین و فریشتە خزمەتیان دەکەن، لە هەر کوێیەك بەردەبنەوە بەرز دەکرێنەوە تا بیگەیەننە جێگەی خۆی، تاکو کڵپەی دونیا و بوونیان لێ دووردەخەنەوە، لەو جێگەیە لوتف و رێنیشاندان خزمەتیان دەکەن، کاتێك مژڵەتی

چوونەژوورەوەیان بۆ دەرگای نزیکی پێ دەدرێت رووبەڕووی ئافەت دەبنەوە، ئافەتی حەلال بۆ ئەوەی نەفس و پاشماوەی بوونیان بتوێنێتەوە، گرانەوەی ئاشکرا و خواردنی ئاشکرا و پۆشاك و سەرئەنجامی لێ دەگیرێتەوە، دڵ بەڕووتی لەگەڵ نهێنی پالفتەدا دەمێنێتەوە، خۆراکی فەزڵ و خواردنەوەی هۆگرییان پێشکەش دەکرێت، هەر بەو جۆرە تاجی رێز و شکۆ و پۆشاکی منەتی خودایی، زانستی لەدونی(العلم اللدني) و حیکمەتی پێدەدرێت، پاشان مەلیك ناوەکانیان پێ دەناسێنێت، نیعمەتی پێشینە و پاشینەیان پێ دەناسێنێت، لە هەموو ئەمانەدا نیشتەجێیان دەکات و دەیانگێڕێتەوە بۆ بوون(بۆ ناو خەلکی) لەپێناو چاککردن و هیدایەتدان و رێنموونی کردن و نوێنەرایەتی کردنیان، پاشان دڵیان لە سەرپێهەڵدان(تکوین) و زمانیان لە داوا و دوعا لەگەڵ وەڵامدانەوە دادەمەزرێت.

ئەم سەردەمە سەردەمی کۆتاهاتنی رۆژگارە، سەردەمی دووڕوویی و خۆپەسەندی هەمیشەیی و بێباوەڕی هەمیشەیی و پەردەی سەر دڵانە، خۆپەسەندی لەبەر چاوی پەروەردگار(عزوجل) بەرتدەداتەوە، دووڕوویی و خۆپەسەندی دوو دڕن و پەردەن بۆ گرتنەبەری رێگەی حەق، گەر یەکێك بڵێت: دووڕوویی چییە بۆ ئەوەی خۆمانی لێبەدوور بگرین؟ پێی بڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:

((کەسی دووڕوو کاتێك بەڵێن دەدات نایباتە سەر، کاتێك قسە دەکات درۆ دەکات، کاتێك ئەمانەتی لا دادەنرێت ناپاکی لێ دەکات))[1].

باوەڕدار پۆشاك و خواردن و هاوسەری و خۆشی و سروور و ئاسایش و سرەوتنی بۆ نییە تا شوێنەکەی خۆی دەبینێت و گوێ بۆ دڵی دەگرێت، تا پێشینە و ناوی خۆی لە خەڵوەتەکەیدا دەبینێت، لە سارا و دەشت و بیاباندا لەسەر قەدەر دەخەوێت، فریشتەکان حاڵی ئەو دەبینن و گوێ بۆ دڵی دەگرن، فریشتەکان دەڵێن: ئەم کەسە کێیە، هەندێکیان بە هەندێکیان دەڵێن: ئەمە فلانی مەحبووبی دۆستە، یەکێکە لە چل کەسەکە یان یەکێکە لە حەوت کەسەکە، یان یەکێکە لە سێ کەسەکە، ئەوە و

[1] صحيح، تقدم تخريجه

ئەوەی بۆ هەیە، بە لای راست و چەپدا قەدەر وەریدەگێرێ و هەڵیدەلوشێت و تاوتوێی دەکات.

﴿وَٱللَّهُ مُحِيطُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ ١٩﴾ البقرة: ١٩

لەلای دڵەوە گفتوگۆی بۆ دێت، پێی دەوترێت: بگەڕێوە بۆ ماڵەکەت، گەنجینەکەت پارێزگاری لێ بکە و نەفسی خۆت بشارەوە، وای لێ بکە وەك ئەوەی خەونێك بێت دڵ و نهێنیت بۆ لای بەرزببنەوە، لە نووسراوی حوکمدا دابنیشە، پاشان لە نووسراوی زانستدا بخەوە تا بالغ دەبیت و منداڵییەکەت نامێنێت، ئەوکات پۆشتەت دەکاتەوە و خۆراکت پێ دەدات، تۆ ئەمەت دەوێت کەچی لێوانلێوی بە سروشت و حەز و ئارەزوو، تۆ کاتێك هەڵدەستیت بۆ نوێژ بە دڵ و وەسوەسە فرۆشتن و خواردن و خواردنەوە و هاوسەری دەکەی.

پێی وترا: دەوای ئەوە چییە؟

فەرمووی:

پارووەکەت پاڵفتە بکە لە حەرام و شوبهە، دەوای دووەم سەرپێچیکردنە لە نەفس لەوەی فەرمانت پێ دەکات لە کارە خراپەکان، گەر بەندە لە وشەیەك بێزار بوو هەڵبدرێت بۆ ناو دڵی و نیگەرانی دایبگرێتەوە ئەوا وشەیەکی تری بۆ هەڵدەدرێت، بەرە بەرە نیگەرانی و بێزارییەکەی کەم دەبێتەوە و شتی تری دەدرێتە پاڵ، سوکنایی و خامۆشی رووی لێ دەکات و نیگەرانییەکەی نامێنێت، لەسەر رێگە دار و بەرد قسەی لەگەڵ دەکەن ئەوەش وەك دامەزران و دڵنیاکردنەوە و ئارامی بۆ ئەو، پێی دەوترێت: ئەی وەلی خودا، ئەی مورادی خودا، ئەی خۆشەویستی خودا، ئەی کەسی نزیك لە خودا، پیاوێك پێی وت: دوعام بۆ بکە، ئەویش فەرمووی: خودایە بۆ خۆت لە دروستکراوانم بێنیاز بکە و ئەویش بە یادی خۆت لە داواکردن بێنیاز بکە، کاتێك لە دروستکراوان بێنیاز دەبێت پابەند دەبێت بە دەرگای خوداوە(عزوجل) ئەویش بە نزیکی خۆی بێنیازی دەکات، کاتێك بە نزیکی لە خۆی بێنیازی کرد بە یاد و شوکری خوداوە سەرقاڵ دەبێت و بێنیاز دەبێت لە داواکردن لێی، گەر لە دەشت و چۆڵ و

بیاباندا خواردن و خواردنەوەت دەست نەکەوت کانییەك لە خانووەکەتدا هەڵدەقوڵێت، بەهێزترین چەکی شەیتان بۆ سەر تۆ دروستکراوانە، سەرەتا دڵت چاك بکە و پاشان دەرەوەت، هەموو کارەکە و دامەزران لەسەری لە خانەی دروستکراودایە، کەسێکی خۆشەویستی چاکەکار بەدوای مەحبووبەکەیدا لە ماڵ چووە دەرەوە، یوسف(علیه السلام) بۆ داوای یەعقووب رۆیشتە دەرەوە، ئەوەی بینی خۆشیویست و عاشقی بوو، رووپۆش درا بە روویدا و بەند کرا، مەبەستەکەی یاقووب بوو نەك نەیاران.

ولیت الذي بيني وبينك عامر

وبيني و بين العالمين خراب

(خۆزگە ئەوەی لە نێوان من و تۆدایە ئاوەدان بوایە، با نێوانی من و هەموو خەڵکی وێران بوایە)

بانگەری حەق هات، بینای دروستکراوان لە خۆتان بکەنەوە.

﴿حَتَّىٰ يَبْلُغَ ٱلْكِتَٰبُ أَجَلَهُۥ﴾البقرة: ٢٣٥

قسە کردن نییە تا ئاو لە بۆقەکەت نەبڕێت، تا وشکانی لا شیرین دەبێت بۆ عیبادەت کردنی خودا، نهێنی تۆ لە کەشتی توانا و دەسەڵاتی ئەودایە، لە دەریای زانستدا رایبهێنە لەسەر وتنی:

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ مَجْر۪ىٰهَا وَمُرْسَىٰهَآ﴾هود: ٤١

هاوەڵی بەندەکانی خودا وەك هاوەڵیکردنی شێر وایە لەگەڵ بوونی ترس و لەرز، ئەو کەسەی بە کەسانی تر جگە لە تۆ تێربووە بە تۆوە خەریك نابێت بەهۆی سەرقاڵی بە دەتکاتە نێچیری خۆی، هاوەڵی کردنی کەسی صدیقیش بەهەمان شێوەیە، چونکە لە کاتێك لایەك بە لای تۆدا بکاتەوە -دوای گەڕانەوەی بۆ لای تۆ- هاوەڵی مەلیکدان.

(پیاوێك لە هاوەڵانی جونەید بە زانینی خایلـە و ختـووورەی دڵ و دەروون تۆمـەتبار دەکرا، جونەید لەو کارە ئاگادار کرایەوە، پێی فەرموو: چییە پێت دەڵێن تۆ کەسێکی گەمژەی؟ پیاوەکە وتی: بەڵێ وایە، ئێستا تۆ بـە دڵ قسـە بکە(واتـە شتێك بخە نـاو دڵتەوە)، جونەید وتی: باشە، ئەوا بە دڵ قسەم کرد، ئـەو قسـەیە چی بـوو؟ پیاوەکـە وتی: قسەت دەربارەی ئەوە و ئەوە کرد، جونەید وتی: نەخێر، پاشان بە دڵ قسـەیەکی تری کرد و پیاوەکە پێی وت قسەکەت ئەوەیە و جونەید وتی: نەخێر، بۆ جاری سـێیەم جونەید بە دڵ قسەی کرد و پیاوەکە هەواڵی پێدا و جونەید وتی: نەخێر، لـە کۆتاییـدا پیاوەکە وتی: گەورەم، ئەوەی لەلای منە حەقە، تۆش وردبـەرەوە بزانـە چیت لەلایـە، جونەید وتی: لە هەر سێکیاندا راستت کرد، تـەنها ویستم پـاکێتی و رۆشـنی دڵـت و دامـەزرانی تاقیبکەمـەوە)، دڵـی خوداناسـان جۆگەڵـەی ویسـتی خـودان و گەنجینـەی زانستی خودا و سینەی نهێنی ئەون، گەنجینەکانی قەدەرن لە دۆڵی قەدەردا، هـەرکات نهێنییەکانیان بەرەو لایەکی قەدەر دەسورێنەوە زانست و نهـێنی وەردەگـرن، چـی لـە دارێکی رەق و بێگیان بکرێت، چی لە دیوارێکی بێمانا بکرێت.

﴿صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لَا يَعْقِلُونَ﴾ البقرة: ١٧١

کەسێك سێسەد و شەست چیرۆکی نووسی، هەر رۆژێك چیرۆکێکی بۆ ئـەمیری شـار رەوانە دەکرد، لەو کارەدا شەکەت و مانـدوو نـەبوو، تـا لـە کۆتاییـدا لـەلای مـەلیك وازووی مەبەستەکەی بۆ کرا، تۆش چەند شەو و رۆژێکـی کـەموکورت داوا لـە خـودا دەکەی و شەکەت و بێزار دەبیت و دەگەڕێیەوە بۆ لای دروستکراوان، بۆ بیر لە خاوەنی ئەو چیرۆکانە ناکەیەوە؟ هەتا لەگەڵ دروستکراوان بیت سەرفرازی بەدەست ناهێنیـت، لە دروستکراوان تەوبە بکە و بۆ لای حەق(عزوجل) بگەڕێوە، وەستانت لەبەر دەرگـای نزیکی ئـەودا(سـبحانه وتعالی) دەبێتـە هـۆی راکێشـان و نزیـك کردنـەوەت بـە دەسـتی خۆشەویستی، دەبیت بە نیشتەجێی ئەو ماڵە، کاتێك ئەو شوێن و جێگـە دەبینی لـە هەموو لایەکەوە کرانەوە رووت لێ دەکات، باڵەکانت بەهێز دەبن دەفڕیت بۆ سەر بانی ئەو خانەیە، ئەو سەر بانە دەکەوێتە ژێر لاقەکانت، گەر بەر بیبیتـەوە بـۆ سـەر بانەکـە بەردەبییەوە، لەبەردەم خاوەن ماڵدا ئەمدیو ئەودیو دەکەی، دەبیت بـە بانگکـەرێك

کە وەڵامی دەدرێتەوە، گەر سوود و قازانجی دروستکراوانت دەوێت بەم جۆرە بکە و وریتەی بێمانا مەکە.

شێخ عبدالقادر(خوا لێی رازی بێت) مەبەستی بە وریتە ئەو قسانە بوو ئامۆژگاریکەران بەسەر خەڵکیدا دەیانخوێندەوە.

نوێژ پەیوەندیکردنە بە خوداوە پاش دابڕان لە کەسان و شتانی تر جگە لە خودا، جەستە بۆ دوو شوێن دابەش نابێت، دابڕان لە دروستکراوان و پەیوەستبوون بە خوداوە، ئەمە بریتییە لە نوێژی خودناسان، بەڵام نوێژی عابیدان بەهەشت لەلای راستی دڵەوە دادەنێن و ئاگر لەلای چەپەوە و پردی سیرات لەبەردەمدا و پەروەردگاریش ئاگادار و چاودێر بەسەرەوە، نوێژی موحیبانیش بریتییە لە دابڕان لە دروستکراوان و پەیوەستبوون بە خوداوە(عزوجل)، نیشانەی صدق ئەوەیە نەفست داوای خواردن بکات و گوێت لە هاواری ناو سکت بێت وەك جیکە و هاواری بێچووی باڵندە، لەو کاتەدا ئەوەی پێویستە بۆ تێرکردنی بێچووەکە پێی بگەیەنە، خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا ﴿٨﴾ ﴾ الشمس: ٨،

هەروەها دەفەرموێت:

﴿ أَضْحَكَ وَأَبْكَىٰ ﴿٤٣﴾ ﴾ النجم: ٤٣

کار بەم دوو ئایەتە مەکە تا دڵ نەچێتە ناو مولکەکەیەوە، لەو بارەدا کردار و ئیلهام دێن، بەر لە چوونەژوورەوە جیاوازی دەکرێت لە نێوان واریدێك کە لە ناوەوە رووت لێ دەکات لەگەڵ ئیلهامی شەیتان و ئیلهامی سروشت و ئیلهامی نەفس و ئیلهامی فریشتە، گەر ویستت لەبەر خودا(عزوجل) هاوەڵی کەسێك بکەی لەکاتێکدا دونیا خامۆش دەبێت و چاوەکان دەچنە خەو دەستنوێژێك بگرە و روو لە نوێژکردن بکە، دەرگای نوێژ بە دەستنوێژەکەت و دەرگای پەروەردگارت بە نوێژەکە بکەرەوە، پاش تەواوبوونی نوێژەکە داوای لێ بکە و لێی بپرسە: بۆ رێنموونی کردنم هاوەڵی کێ بکەم، ئەو کەسە کێیە لە تۆوە هەواڵم پێدەگەیەنێت، ئەو کەسە تەنها و ئاوازەیە

کێیە، جێنشین کێیە، نوێنەر بریتییە لە کێ؟ ئەو(سبحانه وتعالى) کەریمە و بێهیوات ناکات و گومانی تێدا نییە ئیلهام بۆ سەر دڵت ڕەوانە دەکات و وەحی بۆ نهێنییت دەنێرێت، بۆ تۆی ڕوون دەکاتەوە، دەرگاکان دەکاتەوە و ڕێگەکەت بۆ ڕۆشن دەکاتەوە، هەرکەسێك داوا بکات و سوور و لێبڕاو بێت دەیبینێتەوە:

﴿وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا﴾ العنكبوت: ٦٩

عیللەت لە تۆدایە نەك لە قسەی ئەودا، گەر ئاراستەکان لە دڵدا یەکیانگرت و دیاریکردنی کەسێك لە خوار خۆتەوە بەسەر دڵدا زاڵ بوو، هاوەڵیکردنەکەت بۆ ئەو وەك هاوەڵیکردنی دڕندە و مار و دووپشك وایە، تەماشای هەژاری و ناتەواویی و ڕەچەڵەکەکەی و ناتەواوی حاڵی و شپرزی باری و نەنگی دەربڕینی مەکە، چونکە مانا لە ناوەوەیدایە نەك لە دەرەوەی، نەك لە بونیاد و ڕوخسار و قسە و حاڵیدا، چاوەڕوانی سوودبینین لە ئەو لە پەروەردگارت بکە، ئەو نووسەر و فەرمانکەرە بە کەسانی تر، ئەو سەفیر و ئاماژەبۆکراوە و جێبەجێ کردن بە کەسانی تر، ئەو گوزارشتدەرە و قسەکردن بە کەسێکی تر، ئەوەی خودا لەسەر زمانی ئەو بۆ تۆی دەکاتەوە قبوڵی بکە، لە سەرنجەکانی خۆت بەدوور مەگرە، سنوورەکانی مەبەزێنە، بەهەمیشەیی سەرت نەوی بکە و لە ترس و لەرزدا بە، لە حاڵ و گوفتار و کرداریدا تۆمەتباری مەکە، فەزڵی ئەو بدە بەسەر هەموو کەسێکدا، با دڵت لەلای ئەوەوە بۆ لای پەروەردگار بێت نەك بۆ لای کەسانی تر، ئەو میوەخۆرە و خۆراکی پێ نادەی، قسەزانی و وەڵامی نادەیەوە، سروشتی ئێمە لەسەر ئەوە بارهاتووە ئاژەڵان لەسەری بارهاتوون، بەڵام ئەقڵ و شەرع و زانست و نزیکی و مەعریفە و گوێڕایەڵی جیاکردنەوەیان بۆ هەیە و بنەڕەتەکەش یەك بنەڕەتە، کاتێك کار بە زانست دەکەن بە باڵ مردوویەکدا گوزەر بکەن زیندووی دەکەنەوە یا بە باڵ باخییەکدا گوزەر بکەن خودای بیر دەخەنەوە، لە ماڵەکەی خۆیەوە سینی خواردنی بۆ دێت بەڵام بۆ کەسانی تر، هەوڵی بەدەستهێنانی خەراج دەدات، کاتێك بەدەستی دەهێنێت ڕادەستی مەلیکی دەکات، حەقدەستێك وەردەگرێت لە خەڵکی، بەڵام بۆ خۆی نییە، گەر خودا

خێری بۆ تۆ بوێت ئاگادارت دەکاتەوە و بە نەنگییەکانی نەفست ئاشنات دەکات، زاناکانی ئێوە نەزانن و نەزانەکانتان درۆهەڵبەستن، زاهیدەکانی ئێوە دونیاویستن، بە دینەکەت دونیا مەخۆ، بە دین دوارۆژ دەخورێت نەك دونیا.

هەروەها لەسەر ئەم ئایەتە:

﴿ادْعُوا رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ ﴿٥٥﴾﴾ الأعراف: ٥٥،

(لێکدانەوەکەی هەڵدایە سەر ئاشکرایە ئایەتەکە) فەرمووی:

کەسی دەستدرێژکار ئەو کەسەیە داواکەرە لە کەسانی تر جگە لە خودا و دەستپانکەرەوەیە لە کەسانی تر جگە لە خودا، عەبدوڵای کوڕی مەسعوود(خودا لێی رازی بێت) بە هاوەڵانی خۆی فەرموو: ئێوە پاککەرەوەی دڵی منن، هەرکەس بۆ خودا گوێدەگرێت و سوود لە قسەکانی من دەبینێت دەبێتە پاککەرەوە، ئەگینا با لە مەجلیسی مندا ئامادە نەبێت، چونکە دەبێتە لیخنکەری دڵم.

کاتێك ئیبراهیم(علیه السلام) لە ئاگرەکە هاتە دەرەوە و مەڕ و ماڵات و شوان و کارکەری زۆربوون، لە شام خانوویەکی دروست کرد دەرگای زۆری هەبوو لەوێ کەنارگیر بوو، دوای لێبوونەوە لە نرخەکەی و دەوای هۆزەکەی بەخێوکردنی مەڕ و ماڵات-لەلایەن خەلکەکەوە- زیادی کرد، "خلـة" چییە؟ بریتییە لە هاوەڵی کردن و خۆشەویستی و پەیوەندی بەردەوام.

پرسیارێك: ئایا شوێنی گوفتار بکەوین یان شوێنی حاڵ؟

ئەویش فەرمووی:

خەلکی رەشۆکی شوێنی گوفتار دەکەون، تایبەتانیش شوێنی حاڵ دەکەون، "أهـل" کێن؟ تۆ کێی؟ لێدانی دڵی خۆتم پێ نیشان بدە لەسەر حاڵی خۆت دائەدەنێم و توندی نەخۆشییەکەت پێ نیشان دەدەم و چارەسەری دەکەم.

شێخ عبدالقادر(خودا لێی رازی بێت) سەردانی نەخۆشی دەکرد، ئێمە لەو کارە رێگریمان لێکرا، بەڵام بە هەوڵ و لێبڕانی خۆمان سەردانی ساغەکانمان دەکرد.

پێیەکانمان لە ڕۆیشتن بەریانلێگیراوە و دەستمان لە دەستبردن بۆ ماڵ و سامانتان بەستراوە، لەڕووی حاڵ و قەدەرەوە فەرمانمان پێکراوە.

هەروەها فەرمووی:

دەگونجێ پیاوێك بمرێت و دە منداڵ بەجێبهێڵێت، هەموویان بە یەك ئاست و پلە لەگەڵی چاك بن و بەیەکسانی میراتەکەی دابەش بکەن، بەڵام باوکەکە دڵی لای یەکێك لە منداڵەکان بوو، ئاواتی دەخواست هەموو میراتەکە بۆ ئەو بێت، قەدەر وای هێنا یەك بە یەکیان مردن و ئەو دانەیان مایەوە و هەموو میراتەکەی پێگەیشت و قەزا و قەدەر بەو جۆرەی هێنا، ئایا لەمەدا تەنگییەك بوونی هەیە؟ تا ئێرە و سەلام.

خودایە، بێنیازمان بکە لە خەڵکی و نەفس و ئارەزوو و سروشتمان لێبکەرەوە، وتت: لەم دەریا دەترسم کەچی تۆ مەلەی تێدا دەکەی، ترس پێچەوانەی ئەوەیە.

﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَٰٓؤُا﴾ فاطر: ٢٨

کاتێك زانییان ترسان، زیانی شتم بۆ دەرکەوتووە خۆتانی لێ بپارێزن و لێی دووربکەونەوە، مردن هەر دەبێت رووت لێ بکات بۆیە کاری بۆ بکە، ئەی ئەو کەسەی خانووەکەی سەقفی نییە و ماڵ و منداڵەکەی بێ ئاردن و گەنم و جۆ لە ماڵیدا نییە، ئەوا زستان هات خۆت ئامادە بکە، ئەوا ئەمیر هات خۆت بۆ کاروان ئامادە بکە، درندە هات خۆت بۆ درندەی مردن ئامادە بکە، مانای ئەم ئایەتە چییە لە نوێژەکەتدا دەیخوێنی:

﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ۝﴾ الفاتحة: ٥

تەنها گوێڕایەڵی تۆ دەکەین و یەکتاپەرستیمان تەنها بۆ تۆیە، کەی حەقت(عزوجل) بە تاك و تەنها ڕاگرتووە، کەی لە کارەکاندا ئیخلاصت ئەنجامداوە، کەی لە خەڵکی و ریا و دووڕوویی و هاوەڵیکردن زوهدت کردووە، کەی بۆ حەق زەلیل و گەردنکەچ بوویت؟ زەلیلی لە دڵ و تەنهاییدایە، گەر حەزی نەفس و بینینی حەق کەوتنە ململانێ شەرم و حەیا لە بینینی خودا بکەی و حەزەکەی نەفس وازلێبهێنیت، کەی لە توندی حەزی سەرجێیی و تەنهاییدا بەعقووبەت بینی پەنجەکانی خۆی دەگەزی؟ ئەوە

پاریزگاری غیرەتی خودایە، کاتێك یوسف(علیە السلام) لەگەڵ ئەو ئافرەتە کۆبووەوە، غیرەت هات و یوسف(علیە السلام) پشتی لە ئافرەتەکە کرد و هەڵهات لەدەستی:

﴿ كَذَٰلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ السُّوءَ وَالْفَحْشَاءَ ۚ إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُخْلَصِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾ یوسف: ٢٤

هەرکات حاڵەت بۆ حاڵی یوسف(علیە السلام) وەرگەڕا، کاتێك یوسف(علیە السلام) لە ماڵی خودادا و لە ئامێزی ئەودا خۆپارێزی و عیصمەتی هەبوو و لە بەندیخانەکەشدا لەگەڵ پەروەردگاری تەبا بوو خودا عیصمەتی لە تەنهاییدا پێ بەخشی، ئێوەش بەو جۆرە بن ئەی بەندەکانی خودا، ئەی موریدان حاڵەتی صدیق بخوازن و لە خودا داوای بکەن، تەوەکول بڕینی هۆیەکان و وازهێنانە لە هەمووان، کاتێك دڵ وەردەگەڕێت دەبێت بە فریشتە، ئەوەی فریشتە دەیبیستێ ئەویش دەیبیستێ، ئەوەی فریشتە دەیزانێ دڵیش دەیزانێ، پاشان مەعریفەکەی زیاد دەکات و بەسەر فریشتەکانەوە دەبێت بە مەلیك.

هەروەها لەسەر چیرۆکەکەی موسا(علیە السلام) فەرمووی:

نهێنی نهێنی نهێنییە، خانەوادەکەی بەجێهێلا کاتێك لە لای کێوی "طور"ەوە هۆگری ئاگرێك بوو، چی بینی؟ چاوی سەر ئاگرێکی بینی و چاوی دڵ نوورێکی بینی، چاوی سەر دروستکراوێکی بینی و چاوی دڵ حەقی(عزوجل) بینی.

﴿ قَالَ لِأَهْلِهِ امْكُثُوا إِنِّي آنَسْتُ نَارًا ﴾ القصص: ٢٩

ئاگرەکە بە دڵ کەمەنکێشی بۆ زوهد کرد، لە دەستی لە ژنەکەی و کوڕەکەی زوهدی کرد، وتی بە خانەوادەکەی ئێوە لێرە بێننەوە، ئەو بانگی ئاگری بۆ هات. قولاپەکانی قەدەر هاتن و خوداناسانی لە خانەوادە و منداڵەکانیان جیاکردەوە، ئەو حوکم دامەزراو بە و ئەی زانست بە نهێنی خودا پێشکەوە، ئەی نەفس دامەزرێ و بە و ئەی دڵ و نهێنی وەڵام بدەنەوە، هاوار بۆ ئەو زیانۆمەندەی پەی بەمە نابات و ئەمەی خۆشناوێت و باوەڕی بەمە نییە، هاوار بۆ زیانۆمەندی، هاوار بۆ زیانۆمەندی. هاوار بۆ پەردەی نێوان بەندە و خودا و خەشم و تووڕەبوونی!

﴿لَّعَلِّىٓ ءَاتِيكُم مِّنْهَا بِقَبَسٍ﴾ طه: ١٠

لە شوێنی خۆتان جێگیر بن تا هەواڵێکی ڕێگەتان بۆ دەهێنم، چونکە لە ڕێگەکە بزر بووبوو، ڕێنموونییەکانی لێ بزر بووبوو، نەقیبی هەموو نەقیبان لەلای ئامادە بوو، بەڵام ئەوە هەرگیز لەلای ئامادە نەبووبوو.

ئاماژەی بۆ کرد و وتی:

خۆزگە دروستنەکرابای، وەك دروستکرای بتزانیبایە بۆچی دروستکراوی، ئەی کەسی خەوتوو بەناگایی، چونکە لافاوەکە چواردەوری گرتووی، ئیمامی تۆ لە ڕۆژی دوایـیدا کێیە و بانگەشەی چ ئیمامێك دەکەی؟ کتێبەکەت چ کتێبێکە؟ کێ مامۆستا و بانگەر و پێغەمبەری تۆیە؟ تۆ ڕەچەڵەکت نییە، ڕەچەڵەکی دروست لەلای خودا و لەلای پێغەمبەر(ﷺ) ئەهلی تەقوایە، وترا: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئالی تۆ کێیە؟

فەرمووی: ((هەموو تەقوادارێك ئالی محەمەدە))[1].

تۆ بێدەنگ بە ئەقڵت نییە، ماڵەکەت لەسەر دیجلەیە و لە تینوێتیدا دەمریت، تەنها دوو هەنگاوە(نەفس و دروستکراوان) و بە "ڕەحمان" دەگەیت، تۆش ئەی موریـد دوو هەنگاوە و گەیشتووی بە دونیا و دواڕۆژ، گەر سەرفرازیت دەوێت لەسەر چەکوشی قسەکانم ئارام بگرە، من کاتێك شێتگیر دەبم تۆ نابینم، گەر سروشتی نهێنی و سروشتی ئیخلاصم هەڵچوو ڕووی تۆ نابینم، من چاکەی تۆ و سڕینەوەی پیسیم دەوێت لە دڵت، ئاگر لە ماڵەکەت دەکوژێنمەوە و ژن و ماڵ و منداڵت دەپارێزم، دوو چاوت بکەرەوە و تەماشا بکە چی لە پێشەوەیە، سەربازانی سزا و گرتنت بۆ داباریوە، هاوار بە حاڵت، ئەی گەمژە، تۆ پاش کەمێکی تـر دەمریت، هەموو ئەوەی تـۆی تێـدای تیاچووە و لێدابڕاوە، ئەمە لە ژنەکەی و کوڕەکەی و خانووەکەی جیادەبێتەوە و دەبێت بە هاوەڵی خۆڵ و گۆڕ و زەبانی(دەرگاوانی دۆزەخ) یان فریشتەی ڕەحمەت، ئەی گوزەرکەردە، ئەی تیاچوو ئەی ڕەوەند، ئەی مرۆڤی ڕووتی دەست بەتاڵ، پاکێتی بۆ ئەو خودایەی منەتی بەسەر ئێوەدا کـردووە، ئـەی بێئاگایـان کـە هـیچ نـابینن، ئـەی ئـەو کەسـەی پشـتت

---

[1] رواه الطبراني في "الأوسط".

هەڵنەکردووە لە ساڵێکدا جارێك یان لە مانگێکدا جارێك یان لە هەفتەیەکدا جارێك بێ گەردیلە و دەنکێك دانەوێلە روو لە من مەکە، شتێك وەربگرە بە هیچ شتێك و سبەینێ هەزار هەزار شت وەربگرە، من هەڵگری کۆڵەکەی تۆم، دەترسی کۆڵی قورسی خۆمت پێهەڵبگرم، خودا ئەو کۆڵە قورسەم بۆ هەڵدەگرێت، هەزار ساڵ سەفەر بکە بۆ ئەوەی وشەیەکم لێ ببیستی، ئەی بۆ نایبیستی لە کاتێکدا نێوانی من و تۆ چەند هەنگاوێکە؟ تۆ تەمبەڵی، تۆ نەزانێکی گچکەی، کاسەلیسێکی منداڵی، پێتوایە شتێکت بەخشیوە، هاوشێوەکانی تۆ زۆرن کە بۆ دونیا قەڵەو بوون، بەڵام قەڵەوییەکەی خواردی، بە پلە و پایە و زۆری ماڵ و سامان قەڵەو بوو پاشان قەڵەوییەکەی ئەوی تیابرد، گەر خێرمان لە دونیا ببینیبایە تۆ پێشی ئێمە نەدەکەوتی:

﴿أَلَآ إِلَى ٱللَّهِ تَصِيرُ ٱلۡأُمُورُ ۝٥٣﴾ الشوری: ٥٣

ئەوەی ئێمە تێیداین هەمووی بۆ خودایە و لە خوداوەیە.

(کاتێك لە کورسییەکەی دابەزی هەندێ لە قوتابییەکانی پێیان وت: لە ئامۆژگاری کردنمان تێتپەڕاند و لە قسەکردنت بۆ ئەو کەسە زۆر زبر و رەق بوویت؟)

ئەویش فەرمووی:

گەر قسەکانم کاری تێکردبێت دەگەڕێتەوە.

(لەدوای ئەوە ئەو کەسە بەردەوام ئامادەی دانیشتنەکانی دەبوو و لە کاتەکانی تریشدا دەهات بۆ لای و لەبەر دەستی بە تەواوزوع و خۆگچکەکردنەوە دادەنیشت، رەحمەتی خودای لێ بێت).

خودایە، داوای ئارامگرتن و لێبووردنت لێ دەکەم، خودایە کۆمەکیمان بکە، گەر بۆ داوای شتێك لەبەر دەستی یەکێك لە دروستکراوان وەستای -کە لەلایەتی- خودا خەشم و تووڕەییت بەسەردا دادەبارێنێت.

((هەرکەسێك بۆ دەوڵەمەندێك و لەپێناو ئەوەی لەلایەتی خۆی سووك و رسوا بکات دوو سێیەکی ئاینەکەی دەڕوات))[1].

[1] تقدم تخريجه

تۆ راهاتووی لەسەر داواکردن لە دروستکراوان، بە خودا(عزوجل) دەگەی و لەسەر ئەمان حاڵی، لە مەدینە پیاوێکم بینی داوای لە خەڵکی دەکرد، عەبایەکی دیباجەداری بە بیست و پێنج دینار فرۆشت، منیش شوێنی کەوتم، لەسەر پیاوێك وەستا هەریسەی دەخوارد، لەو شوێنە نەڕۆیشت تا هەریسەخۆرەکە پارووپەکی پێدا، پێموت: تۆ عەبایەکت بەوەندە فرۆشت؟ وتی: دەتەوێ لەپێناوی تۆدا واز لە پیشەکەم بهێنم؟!

هەرکەس بگاتە لوتکەی ویلایەت دەبێتە قوتب، کۆڵی قورسی هەموو دروستکراوان هەڵدەگرێت، بەڵام بەقەدەر هەموو ئیمانی دروستکراوانی پێ دەبەخشرێت، بۆئەوەی پێی بەهێز ببێت و بتوانێت کۆڵی قورسی ئەوان هەڵبگرێت، تەماشای کراس و ژێرەخەرەکەم مەکە، ئەمە پۆشاکی دوای مردنە، ئەمە کفنە، کفنی مردووش جوان دەکرێت، ئەمە لەدوای ئەوەی خوریم پۆشی بوو، لەدوای ئەوەی خواردنی زبرم دەخوارد و خۆم برسی دەکرد، من کارێکی گەورەم هەیە لەگەڵ کەسانی تر جگە لە ئێوە، ئەی ئەهلی بەغدا خەڵکانێکی ژیرمەند بن، ئەی ئەهلی ئاسمان و ئەی ئەهلی زەوی.

﴿وَيَخۡلُقُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ۝٨﴾ النحل: ٨

بە خۆجوانکردن نییە، ئەمە ئاشکرایەکە پەنهانێك لەگەڵ راستگۆییەکەیدایە، پەنهانێك راستگۆییەك لەگەڵ ئاشکراکەیدایە، قسەکردن نییە تا هەموو خواوەندەکانت دەبێت بە یەك خودا، ئاراستەکانت یەك ئاراستە دەبێت و خۆشەویستەکەت یەك خۆشەویست، دڵت یەکبگرێت و یەکتاپەرست بێت، کەی دەتەوێ لە نزیکی حەقەوە(عزوجل) رەشماڵ هەڵبدەی و دڵت کەمەندکێش بێت و نهێنیت نزیککراوە و لە دروستکراوان دەربچی و دڵت بە پەروەردگار(عزوجل) بگات؟ پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:

((هەرکەس بۆ لای خودا یەکلاببێتەوە و لێبڕاو بێت خودا پێویستییەکانی بۆ جێبەجێ دەکات، هەرکەسیش بۆ دونیا یەکلاببێتەوە خودا دەیداتە دەست دونیا))[1].

---

[1] أخرجه الطبراني في "الصغير" والحكيم الترمذي في "نوادر الأصول".

دەقپێوەگیراوەکان(مألوفات) لە ئەودا دەشکێن، ئەوەی لەلای خودایە بەدەستی ناهێنێت تا بەیەکجاری و بە هەموو دڵەوە خۆی بۆ ئەو(سبحانه وتعالى) یەکلاندەکاتەوە، خودا(سبحانه وتعالى) دەفەرموێت: ((هەرکەس کارێك بکات مەبەستی کەسێکی تر بێت جگە لە من، من بێنیازترینی دوو شەریکەکەم، ئەو بۆ شەریکەکەمە نەك بۆ من))[1].

ئیخلاص زەمینەی باوەڕدارە، کردەوە چاکەکان دیوار و پەرژینی ئەو زەوییەیە، دیوار دەگۆڕێت و ئاڵوگۆڕ دەکرێت، بەڵام زەوییەکە نەخێر، دامەزرانی بینا لەسەر تەقوایە، گەر بوترێت خۆم بۆ خودا یەکلاکردەوە و پێویستییەکانی جێبەجێ نەکردم، وەڵامەکەی ئەوەیە ناتەواوییەکە لە تۆوەیە نەك لە پێغەمبەری خودادا(ﷺ):

﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ ۝٣ ﴾ النجم: ٣

ئایا ئێوە هەواڵێکتان لە خوداوە پێگەیشتووە، نە، سوێند بە خودا، بەڵکو ئێوە عاشقانی دونیا و جوانییەکانی دونیان، گەر لەوەی بانگەشەی بۆ دەکەی راستگۆ بیت لە داواکردنی گەردیلەیەك گیرناخۆیت، نەفست هەڵبدە بۆ ناو دۆڵی قەدەر، کاتێك گەیشت بە کاری خۆی سەری پلە و پایەت پەیوەست دەبێت بە دەرگای نزیکی لە خوداوە، ڕوویەکی جوانتر لە دونیا و دوارۆژ پێشوازیت لێ دەکات، خۆشەویستی لە نێوان تۆ و خودا تێر و تەواو دەبێت، پەردە و ناوەند نامێنن، گوێت لە بڕیاری داڵدە و پەنادانی دەبێت لە دۆڵی قەدەریدا، سپاردەکانت بسپێرە، خزمەتی من بۆت وەربگرە، من لەوێ لەسەر تۆ بەندکراوم، بۆ تۆ شفاعەت دەکەم، وەڵامدانەوەی دوعاکەت نزیکی تۆیە لە ئەوەوە، ئەوکات دەستی زانستی بۆ درێژ دەبێت و دەستی حوکم کۆمەکی دەکات، بەڵام ڕۆچوونت تیایدا لە سەرەتای کارەکەتەوە و بەر لە سەرپێچی سروشت و ئارەزوو و ویستت لەگەڵ بانگەشەی ئەوەی تۆ لە نزیکان و مەحبووبانی ئەوە پەشیمانییەکی لەگەڵ دەبێت و بێبەشییەکە فریوت دەدات، گەر بتزانیبایە دونیا دوابڕاوە داوات نەدەکرد، گەر ناوەوەت بۆ خودا پاڵفتە بوو دونیات بۆ پاڵفتە دەبێت،

[1] صحيح رواه مسلم.

خواردنەوەی دونیا ژەهرە بەڵام شیرین دەردەکەوێت و تاڵییەکەی دەشارێتەوە تا دەگاتە دڵ و ژێر باڵەکانت ئەوکات وەردەگەرێت بۆ ژەهر و سەرتدەبڕێت، ئەوانەی پێش ئێمە کەوتن جیاکارییان دەکرد لە نێوان خایلە و خوتوورەکان بەر لەوەی گۆشەنشین بن، ئەی ئەو کەسەی ناتوانی جیاکاری بکەی لە نێوان خایلەی نەفس و شەیتان و دڵ، چۆن خایلەی شەیتان بە یاخیبوون و هەڵە و بیرکردنەوە لە نەسڵ و یاخیبوون لە لق کۆتایی دێت؟ جیاکاری ناکات لە نێوان ئەو خایلانە و خایلەی فریشتە بە گوێڕایەڵی و کرداری چاکە، بەو کەسە وترا کە لە داردرا(واتە حەلاج) ئامۆژگاریم بکە، وتی: (بریتییە لە نەفست، گەر سواری بوویت باشە، ئەگینا ئەو سوارت دەبێت)، گەر دەتەوێ لەگەڵ مەلیکان بخۆیەوە روو لە وێرانە و چۆڵ و بیابان بکە تا بەئاگاهاتنەوە لەم مەستییە رووت لێ دەکات بۆ ئەوەی نهێنییەکانی ئەوان بڵاوە پێ نەکەی، چونکە ئەوان تۆ تیادەبەن، بۆ ئەو مەبەستە کۆچ و سەفەریان لە مانەوە و نیشتەجێبوون لا باشترە، ئەم دونیایە کراوە بە وڵاخی سواری، گەر دەتەوێ بە پەروەردگارت بگەی بچۆ خەڵوەتەوە لەدوای ئەحکامی شەرع(دەرگای خودا(عزوجل))، هەردەبێ کۆمەکی وەرگرتن و لێبڕان لەسەر شتێك-وەك هۆ-بوونیان هەبێت، لە رێگەی حوکمەوە دەگەیە دەروازەی زانست، حوکم بریتییە لە فەرمانەکان و نەهییەکان، ئەوەی حوکم فەرمانمان پێ دەکات قبوولی دەکەین و گوێی بۆ دەگرین و گوێڕایەڵی دەبین، ئەوکات ئافەت رووەمان لێ دەکات، لێرەدا پێویستە بەندە زانا بێت، یەکێك لە ئێمە دەڵێت بۆچی من تووشی بەڵا دەبم لەگەڵ مانەوەم لەناو گوێڕایەڵییەکاندا؟! پێی دەوترێت: تۆ ئاتاجی بە کەمێك لە زانست، خاوەنی حوکم پاشەکەوت دەکات و خاوەنی زانست لە هەموو شتێك دێتە دەرەوە، حوکم بۆ زاهیدانە و زانست بۆ صدیقان و مەحبوبان و هۆگرانە بە خوداوە، زوهد لەگەڵ حوکمدایە و خۆشەویستی لەگەڵ زانست، ئەمەیان هاوکاریەتی و ئەوەیان وەزیریەتی، زۆرلەخۆکەر لە زوهدا پەسەندە، زاهیدیش دەرداوییە و عاریفیش لەدوای مردن زیندووە، ئەو زۆرلەخۆکەرە لە زوهدا حەزەکانی وازلێهێناوە و بەرۆژوو بووە و پاسەوانی نەفسی خۆی کردووە، زاهیدیش وازهێنانەکەی بەردەوام بووە و ئەوەش تووشی دەردی کردووە، دونیا بەراورد بە ئەو نەخۆشییەکەی بەردەوام بووە،

مردووە، لە کاتێکدا ئەو لەسەر جێگەی لوتفی خودا بەو جۆرەیە، گەر لەبەردەم دەروازەی زوهدەکەی خواردنی دانا تووشی فیتنە بووە، پۆشاک لەبەر ئەوانەی ئەوتاد(کۆڵەکە)ن گۆڕانی بەسەر هاتووە، لە دونیا دەرناچێت تا بێباوەڕان و یاخیبوان ماڵەکەی دەبەن، لە داواکردندا باشیان ئەنجام نەدا، حەرامیان بەدەستهێنا، خودا ئەو بەندەیەی زیندوو کردەوە و دروستکردنێکی تری پێ بەخشی، گۆشت نامێنێت و ئێسقان لاواز دەبێت و پێست وشک دەبێتەوە و شیرینییەکەی نەفس دەتوێتەوە و ئارەزوو کەنارگیر دەبێت و سروشت ژێرچەپۆکە دەبێت و دڵ ڕۆح و مانا و مەعریفە و یەکتاپەرستی تێدایە، هیچ شتێکی تر لەو جێگە نییە جگە لە دڵ، حەق سەرپەرشتی دەکات و زیندووی دەکاتەوە لەدوای مردنی ئارەزوو، چێژەکانی مردوون بە مردنێکی مەعنەوی، مردنی زانستەکەم لەلام مردنی دۆستێکمە، خودا زیندووی دەکاتەوە دوای ئەوەی لەو شوێنە ئەوەی نیشاندا، هەرکەس لەبەر دەرگاکەی بە مردووی بکەوێت زۆری حوکم و نهێنی و زۆری سەربازان و چاودێری دەبینێت، کاتێک خودا مولکی خۆی پێبینی و نهێنی خۆی پێ نیشاندا ڕۆح و جەستە و ئاشکرا و ناوەوەی کۆکردەوە بۆ وەرگرتنی بەشەکانی بەر لەوە، گەر بەشی خۆرهەڵات و خۆرئاوای بۆ بخرێتە ڕوو دەست بۆ گەردیلەیەکی نابات، قودرەتێکی شاراوە و ویستێکی ناوەکی لە خوداوە(عزوجل)، پێغەمبەران و ئەولیا و تایبەتان لە دروستکراوان لە حەزەکانیان دووردەخرێنەوە، گەردیلەیەك حەز و ویستیان تێدا نامێنێت بۆ ئەوەی ناوەوەیان بۆ ئەو پاڵفتە ببێت، گەر ویستی بەشەکانیان پێ بدات ژیانی بوونیان-بۆ وەرگرتنی ئەو بەشانە- تێدا دروست دەکاتەوە، عیسا(علیه السلام) خاوەنی هیچ نەبوو و هاوسەری نەبوو، لە ئاخرزەمانیدا خودا دایدەبەزێنێت بۆ سەر زەوی و جاریەیەکی قورەیشی لێ مارە دەکات، لەو جاریەیە کوڕێکی دەبێت، کەسی عاریف دوای دامەزرانی زانست و زوهد دەست بۆ شتەکان دەبات، بەشەکانی خۆی لەگەڵ ئێوە دەست بۆ دەبات، دەست بۆ حەزەکان دەبات لەدوای ئەوەی-لەباری بوونی شکدا- زوهدی لێکردن، کاتێك زانی حەزەکانی بۆ پاکبوویەوە، ئاوی سارد و خواردنی گۆشت پاك لەلای زاهیدان وەك خواردنەوەی ئارەق و خواردنی گۆشتی بەراز وایە، زۆرن ئەو زاهیدانەی بە زوهدەکەیان

له حەق بێبەش بوون، زۆرن ئەو عاریفانەی بە سەرنجدانیان لە مەعریفەکەیان پەردەیان بۆ دروست بووە، ئەم دوو حاڵەتە زۆر دەگمەنن، و زاڵ ئەوەیە ئەو دوو کەسە سەلامەت بن، بەگشتی نزیکیت لە ڕۆڵەکانی دونیاوە لە خودا(عزوجل) دوورت دەخاتەوە، دروست بۆ تۆ ئەوەیە ڕوو لە دوارۆژ و گوێڕایەڵی بکەی، بەڵکو ڕزگارت ببێت و بەشەکانت بۆت بێن و نەفست لێیان بێزار بێت، فەرمانت پێ دەکات لە سروشتی خۆت بچییە دەرەوە و لە جێگەی ئەوە ڕوخسەتەکانی شەرع دابنێیت، پاشان فەرمانت پێ دەکات هەنگاو بە هەنگاو ڕوخسەتەکان وازلێبهێنی، تا هەموو کردارەکانت دەبن بە عەزیمەت، گەر لەسەر عەزیمەت ئارامت گرت خۆشەویستی بۆ خودا(عزوجل) دێتە ناو دڵتەوە، گەر ئەو خۆشەویستییە جێگیر بوو ویلایەت لە خوداوە(عزوجل) ڕووت لێ دەکات، گەر کەسێکی ژێرمەندی نەفسی خۆت لە ئەهلی ئاگر دابنێ بۆ ئەوەی ئەو حاڵە بەرەو کرداری چاکە هەڵتبنێ، گەر لە ئەهلی بەهەشت بووی شوکری خودات جێبەجێ کردووە، کاتێك لە ماڵەوە دەردەچیت وەك ئەوەی بۆ جەنگ دەردەچیت، وەك ئەوەی ناگەڕێیەوە بۆ ماڵەکەت، بزانە تۆ بە کەسابەتەکەت تاقیدەکرێیەوە، یەقینت هەبێت خودا(عزوجل) دەتوانێ ڕۆزیت بدات بەبێ هەوڵ و کۆشانی تۆ، باوەڕدار جارێك وەك چیایە و جارێك وەك پەڕی بەر با، لە کاتی هاتنی بەڵا و ناخۆشییەکاندا بارەشی قەدەری خودا وەریدەگێڕێت، باوەڕدار لە کاتی هاتنی بەڵا و ناخۆشییەکاندا جارێك وەك چیایەکی مەزن وایە، و جارێکیش وەك پەڕێکی بەربا، بارەشی قەدەرەکانی خودا وەریدەگێڕن، ئەی هۆزەکەمان پەیامداری و پێغەمبەرایەتیتان لەدەستچوو با ویلایەتتان لەدەست نەچێت، هاوەڵی کردنی مەلیك بوونی نییە لەگەڵ بوونی خۆتدا، وەك ئەوەی کوێر بیت و نەبینی، وەك ئەوەی پاراو بیت و پێویستت بە ناو نەبێت، وەك ئەوەی مردوو بیت و جووڵە و بزوانت نەبێت، هاوار بۆ بێبەشان، ئەوانەی نازانن پەردە کەوتووەتە نێوان ئەوان و خوداوە، نە خۆت خێر ئەنجام دەدەی نە یارمەتی ئەهلی خێر دەدەی لەسەر خێر، تۆ شەڕێکی و دونیات بەبێ دوارۆژ خۆشدەوێت، دەرەوەی بەبێ ناوەوە، ویلایەتی دونیایی و دەوڵەمەندی و هاوەڵەکەت سوود و قازانجێکت پێ ناگەیەنن، بەم نزیکانە دەمریت و دەپێچرێیەوە.

## ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ الْعِزَّةَ فَلِلَّهِ الْعِزَّةُ جَمِيعًا ﴾

فاطر: ١٠

بۆ ئەولیا و صدیقان دەریاکە دونیایە و کەشتییەکە شەرعە و دەریاوانەکە ئوتفی خودایە(عزوجل)، هەرکەسێك لە شوێنکەوتنی شەرع شارەزووبووبێت لە دونیادا ئوتق دەبێت، هەرکەسێك ڕووی لە کەشتی شەرع کرد و لەوێ مایەوە نوێنەرایەتی دەریاوانەکە دەکات و کەشتییەکە و ئەوەی تێیدایە دەداتە دەستی و نێوانی لەگەڵ دروست دەکات. ئەو کەسەی واز لە دونیا دەهێنێت و بە زانستەوە خەریك دەبێت و لەسەر شارەزایی ڕێ دەگرێت دەبێتە خۆشەویستی شەرع، لە کاتێکدا ئەو بەو جۆرەیە خودا(عزوجل) ئوتفی خۆی بۆ ڕەوانە دەکات، مەعریفەت و پۆشاکی ویلایەتی بۆ ڕەوانە دەکات، ویلایەت لەسەر ویلایەت تایبەت دەبێت بە ئەو، خودا قەرەبووی هەموو شتێکت بۆ دەکاتەوە. گەر شتێکت لەدەستچوو بۆی دڵتەنگ مەبە، چونکە مەلیك کاتێك مەنیکە نە ماڵەکەی خۆیدا دەستتێوەردانی هەبێت، بەندە و ئەوەی هەیەتی بۆ مەولای خۆیەتی. ئەوەی لێت وەردەگیرێتەوە سبەینێ دەیبینیتەوە، ئاگر پێی دەڵێت: ((ئەی باوەڕدار بپەڕێوە نوورەکەت بڵێسەکەمی کوژاندووەتەوە))[1] دونیاش بەهەمان شێوەیە، گەر ئیمان بەهێز بوو و ناوەوە پەیوەست بوو بە نزیکی لە حەقەوە(عزوجل) ئاگری ئافەت ڕووی تێ دەکات و دەکەوێتە سەر ڕێگەی دڵان، ئاگری تێکۆشانەکان دێت و لەسەر ڕێگەی مورید دەوەستێت، هەتا مورید پاشماوەی دونیا و بینینی دروستکراوانی تێدا مابێت ئاگر دەیگرێتەوە، بەڵام ئاگر بە کەسی ئیمان تەواو دەڵێت: ((ئەی باوەڕدار بپەڕێوە نوورەکەت بڵێسەکەمی کوژاندووەتەوە))[2]. ئەو تیرانەی لە دونیادا دەگیرێنە دیوارەکەلاکە زیانێکیان پێ ناگەیەنێت، کارێك ئەنجام بدەن ئاگری دونیا و دواڕۆژ نەتانگرێتەوە، بۆ خودا کۆمەڵێك بەندە هەیە پێیان دەوترێت پزیشکان، ئەوانە لە عافییەتدا دەژین و لە عافییەتدا دەمرن و لە عافییەتدا دەچنە بەهەشتەوە. هەرکەس

---

[1] تقدم تخريجه.

[2] تقدم تخريجه

خودا بناسێت لە حەزەکان و چێژەکان دوور دەکەوێتەوە، بەڵکو لەسەر دەستبردن بۆ بەشەکان ناچار دەکرێت، جیران بەر لە خانوو، جیرانی بەدەستهێناوە بۆیە ئەو کەسە موبارەکە خانووی بەدەستهێناوە لە مەلیکەوە، مەلیك دەفەرموێت:

﴿ إِنَّكَ ٱلۡيَوۡمَ لَدَيۡنَا مَكِينٌ أَمِينٌ ﴾ یوسف: ٥٤

هەرکەس خودا بناسێت و بۆ لای بکرێتە ژوورەوە چاو نابڕێتە شتێك لە مولکی خودا و دەست نابات بۆ شتێك لە دونیا، مەلیك خواردن و خواردنەوەی بۆ ڕەوانە دەکات و نزیکی دەکاتەوە، هەموو حەزەکانی لە نزیکی خوداوەن، کاتێك نەفس گوێڕایەڵ بوو و لەگەڵ دڵ تواییەوە و دڵ بوو بە پاسەوانی ئەوا دڵ لە بەندیخانە دێتە دەرەوە:

﴿ وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ ٱئۡتُونِي بِهِۦ ﴾ یوسف: ٥٤

دوای دەرکەوتنی نەجابەت و پێکەوتوویی ئەو و ئەخلاقی جوان و ئەدەبی دەیهێنن، مەلیك بە ڕێز و شکۆوە پێشوازی لێ دەکات و لە خۆی نزیك دەکاتەوە و چاکەی لەگەڵ دەکات و پۆشاکی گەورەیی پێ لەبەر دەکات و بەبێ ناوەند لەگەڵی دەکەوێتە گفتوگۆ:

﴿ إِنَّكَ ٱلۡيَوۡمَ لَدَيۡنَا مَكِينٌ أَمِينٌ ﴾ یوسف: ٥٤

بە شتێکی ترەوە جگە لە خۆی خەریکی ناکات.

پاشان هاوارێکی لێ بەرزبوویەوە و وتی:

یا الله، یا الله، یا الله، خۆشەویستێکی بزربووی نادیار دێتە پێشەوە، خەریك دەکرێت تا خەریك نەبێت بە شتێکی ترەوە، گەر هاوەڵی کردنەکەی درێژەی کێشا و ماندووبوونی سەفەری لێبوویەوە گۆشتەکەی دەڕوێتەوە و نیسکەکانی بەهێز دەبنەوە و زیندەگی خۆشدەبێت و ترس و لەرزی دەڕەوێتەوە و دەبێتە ئەهلی مەجلیسی مەلیك، ئەوکات خودا ویلایەتی پێ دەدات و دەیکات بە ئەمیری سەر ڕەعییەتەکانی و دەبێتە هاوەڵ و هاوکاری مەلیك، ڕەوانەی دەکات بۆ دەریا بۆ ئەوەی نوقمبووەکان قوتار بکات، ڕەوانەی دەکات بۆ وشکانی بۆ ئەوەی پیاوان و منداڵان لە دەمی دڕندەکان قوتار بکات، کاتێك

لە خانەی سروشتی خۆی هاتە دەرەوە شایستە بوو بە نوێنەری و ئەمانەت، پۆشاك دەكرێتە بەر دڵیان وەك چۆن پۆشاك كرا بە دڵی پێغەمبەران و نێراوان، نازناوەكانیان بریتییە لە ئەولیا و ئەبدال، ئەی كەسی بازاڕی، تا لەو جێگە ئەهلی مەجلیسی مەلیك و هاوەڵانی هەڵبژاردە بوونیان هەیە(ئاماژەی بۆ ئەوە دەكرد لە مەجلیسەكەیدا ئەولیا و فریشتە ئامادەبوون) ئەوانە شاراوەن و ئەو كەسانەی لێرە ئامادەن نایانبینن.

**پرسیارێك: كەی كرانەوە دەبێت بە گرژبوون و كەی گاڵتە دەبێتە راستی؟**

**فەرمووی:**

گەر كرانەوە رووی لێكردی بكرێوە، بۆ عەزیمەت و وەحشەت وەردەگەڕێت، كاتێك هەموو بوونت بوو بە عەزیمەت دەتباتە ناو خانەی فەزڵ و هۆگری خۆیەوە، ئەوكات بەبێ روخسەت و عەزیمەت دەمێنییەوە و دەبێتە كردارێكی رووت، نموونەی تۆ وەك نموونەی ئەو كەسە وایە سینییەك خواردنی لەبەردەستدایە، هەندێكی لێ خواردووە، پێی دەوترێت بڕۆ لە ماڵێكی تر هەرچیت حەز لێیە بیخۆ، روخسەت بۆ هەڵوەشێنەرانی ئەجەلە و عەزیمەت بۆ ئیمان تەواوەكان و مولكیش بۆ فانییەكانە، پێشتر لە خەڵوەتدا لەسەر زەوی دادەنیشتم، ئێستا بەپێچەوانەی ئەوەوە، من لەوانەم لە باسكردنی حاڵی خۆ شەرم ناكەم، چونكە كەس نابینم، ئەدەبی جوان لە دوو شوێندایە: وازهێنان لە دونیا و دەستبردن بۆ دونیا، خەڵوەت بەدینایەت گەر ئەزانیت لەگەڵ بێت، مەچۆ خەڵوەتەوە تا پاڵفتە دەبیت، ببە بە خاوەنی فیقهـ ئەوجا كەنارگیر ببە، لە زۆر دانیشتندا ئامادە دەبیت و كار بە وشەیەك ناكەی، زۆرن ئەوانەی وەلییەك دەبینن و وەسێتی خێریان بۆ دەكات و كار بە وەسێتەكەی دەكەن و دەبێت بە توێشووی دوارۆژیان، بەلام تۆ هەواڵەكان بەدەست دەهێنیت و لە ئاسارەكان وردەبییەوە و لە مەجلیسی زیكردا ئامادە دەبیت كەچی هەنگاوێك هەڵناگریت، خۆزگە لاقت لە شوێنی خۆی جێگیربووایە[1]، بەڵكو هەركاتێك بۆ پێشەوە دێیت بۆ دواوە دەگەڕێیەوە، هەركەس دوو رۆژی یەكسان بێت زیانۆمەندە، بەئاگا بێ، خودا

[1] (واته وەك ناتوانی بۆ پێشەوە بچۆ بۆ دواوەش نەگەڕابایەوە).

ڕەحمت پێ بکات، دونیا ساتێکە و پاڵ مەدە بەلایەوە، دەستەیەک لە خوداناسان هەیبەت لاوازی کردوون و ئەندامەکانی بەستوونەتەوە، سەرسامی لە خەڵك دەستی بەسەر دڵیاندا گرتووە، بۆیە دانیشتن و هەستانەوە لە حاڵیاندا بوونی نییە، کاتێك کاتی وەرگرتنی بەشەکان دێتە بەرەوە خودا کەسێك دەنێرێت پاروو بکات بە دەمیانەوە، ئەوانەی پێشکەوتن و ئەوانەی دواکەوتن بەرهەڵستیان لەسەر ئەم بەندەیە نییە(مەبەستی خودی خۆیەتی)، سەرمایەی ئایینەکەت پارێزگاری لێ بکە، ئەگەر نە، خۆدانەپاڵ و ڕێگەی من وازلێبهێنە، کەسێکی نەزان مەبە، لە ماڵەوە دادەنیشێت و ورێنە دەکەی، ئەو دەوایەی ئێمە خواردمانەوە و سوودمان لێ بینی پێت دەرخوارد دەدەین، شتێکی ئەزموونکراوت پێ نیشان دەدەین، لە ڕۆژێك بترسن نە ماڵ و نە منداڵ سوودێکیان نییە، چ شتێك ماڵە؟ ماڵێك لە حەڵاڵەوە کۆکراوەتەوە و بە کەسابەت بەدەستت هێناوە، ئەو ماڵە لە خێردا ئاراستە بکە، بانگەشەی ئەوە دەکەی سبەینێ ماڵەکەت و منداڵەکانت سوود و قازانجت پێدەگەیەنن وەك عەرەبانی پێشوو بانگەشەیان دەکرد، خودا(عزوجل) دەفەرموێت:

﴿يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ۝٨٨ إِلَّا مَنْ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ۝٨٩﴾ الشعراء: ٨٨-٨٩

بەدڵ تەماشای ماڵ و منداڵی ناکات و سوکنایی دڵی بۆ لای ئەوان نییە، بەڵکو وادەبینێت لەو دوانەدا(ماڵ و منداڵ) کراوە بە بریکار، بەتەبایی لەگەڵ خودا هاوڕێی ئەو دوانە دەکات، ئەوکات دڵ لە ئافەتی ماڵ و منداڵ سەلامەت دەبێت، وەك پێ‌وتنێ کە مەلیك رایدەگەیەنێت دەیەوێت جاریەیەك بکاتە هاوسەری ئەو و لەسەر دەستی ئەو جاریەیە بمرێت، لە نەفسی خۆیدا دەڵێت گەر هەڵبێم سەربازەکانی دەمگرن. گەر سەرپێچی لێ بکەم دەسەڵاتەکەی مەلیك من تیادەبات، گەر لەگەڵیشی ئەبێ بە جاریەکەی ڕووبەڕووی تیاچوونم دەکاتەوە، مەلیك بڕیاری هاوسەرگیری لەگەڵ بەکێك لە جاریەکانی دەردەکات، فەرمانیش دەکات بە جاریەکە ژەهرخواردی بکات بێ گەر خەوی لێکەوت سەریببڕێت، (زیانۆمەند ئەو کەسەیە ئەمرۆ لە من دواکەوتووە، زیانۆمەندی بۆ ئەو)، بەڵام ئەدەبی جوان و دەرخستنی تەبایی بۆ بڕیارەکەی مەلیك-

لەگەڵ ناگاهی دڵ- لەپێشترە، پیاوەکە وتی: گوێ بۆ فەرمانەکەت دەگرم و گوێڕایەڵ دەبم، ڕۆیشتە ژوورەوە و هاوسەرییەکە و هەدیەکەی قبووڵ کرد، شەوی زاوایی هات، زرنیۆشی خۆپارێزی لەبەرکرد، دوو چاوی دڵی خۆی ڕشت، شەوخونی چەشت بۆئەوەی سەرنجی جوجووڵ و هەڵسوکەوت و کارەکانی بدات، خۆشی شەوی زاوایی وەرگەڕا بە ناخۆشی و شەوخونی، پیاوانی دیوان و خزمەتکاران وایانەزانی ئەو پیاوە ماڵوێران بووە بەوەی تێیکەوتووە، بەیانی هات و ژەهری دەستی جاریەکە نەیکوشتبوو:

﴿ إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٩﴾ ﴾ الشعراء: ٨٩

دونیا بریتییە لەو هاوسەرە(جاریەکە) خەوتن نییە لەگەڵی و لە تەمەندا نایێت لەگەڵی تەنهابکەوێت، دونیا لاواز لێ دەهێنێت و روو لە دوارۆژ دەکات، ئەمیش تەقواکەی لێ داگیر ناکات و ئاییینەکەی ناگۆڕێت، ئەوە بریتییە لە سەلامەتی، گەر پەیامهێنی زانست-لەباری پاڵفتەبوونی نهێنیدا- هات بۆ لای کەسی عاریف بە خودا و زاهید لە دونیا و حەزکەر لە دوارۆژ بەوەی بەشێك لە دونیا بداتە پاڵی بۆ ئەوەی ببێتە زیندەگی بۆ دڵی صدیقان، ئەوەش دیسان جۆرێکی سەرقاڵکەر و ماندووکەر و تێخەکەر و لاکردنەوەیە بە لای دونیادا، بۆیە سەرنج بدە و بزانە چی دەکەی؟ دڵ و نهێنیت-بەو بەشە لە دونیا- رادەست دەکەی؟ بەڵام نهێنی لەو کارە بەئاگا دێت، نهێنی و دڵ راستدەبنەوە، دەبن بە هاوەڵی یەکتر بۆ دەرگای مەلیك، دەڵێن: ئەی مەلیك دەتەوێ چی لە ئێمە بکەی؟ دەتەوێ لە خۆت ئێمە دابیڕیت، لە دەرگای خۆت دوورمان خەیەوە، ژیانمان لێ تاڵ بکەی؟! لێرە ناڕۆین تا بەڵگەنامە و پەیماننامەمان پێ ببەخشیت، ئەو دوانە دەرگاکە بەرنادەن تا پێیان دەوترێت:

﴿ لَا تَخَافَا إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَى ﴿٤٦﴾ ﴾ طه ٤٦

بۆیە دەگەڕێنەوە بۆ دونیا لەگەڵ پاسەوان و پارێزگاریلێکەر:

﴿ إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٩﴾ ﴾

الشعراء ٨٩

دڵێکی سەلامەت لە ئافەت و ریا و دووڕوویی و بینینی خەڵك، ئەی موریدی لایەنگر، ئەی ئەو کەسەی لە توناوتوونەکانی قەدەردا سەرگەردان بوویت، ئاتاجی بەوەی جێگەکەت پاکبکەیەوە، درهەم و دیناری تێدا دامەنێ، با تەنها گەوهەر بێت و کلیلەکە لە گیرفان دابنێ، تۆ ئاتاجی بەوەی دڵت لە دونیا و حەزەکان و چێژەکان و هەموو تووڕەهات خاڵی بکەیەوە، یادی خودا و بیرکردنەوەی تێدا بەجێبهێڵە، هەروەها بیرکردنەوە و یادی مردن و یادی ئەوەی بەدوای مردندا دێت، کیمیای هیوا و ئاواتی کورت کاری تێدا بکات، دەڵێیت: من ئێستا مردووم، چونکە کارەکان بە کورتکردنەوەی هیوا و ئاوات پاڵفتە دەبن، بەڵام گەر هیوا و ئاوات درێژەی کێشا ئەمە لە کارەکاندا دەبینی و بۆ ئەوەش دووڕوویی ئەنجام دەدەی، کەسی خاوەن هیوا و ئاواتی کورت کۆچلێکراوە، هەرچی شتە رێگەت لێدەبڕێت، هەموان پۆشاکی زوهد دەپۆشن، پاشان پۆشاکی فەنا، پاشان پۆشاکی مەعریفە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:

((شەش شتم بۆ دەستەبەر بکەن بەهەشتتان بۆ دەستەبەر دەکەم: گەر یەکێك لە ئێوە قسەی کرد با درۆ نەکات، گەر ئەمانەتی درایە دەست ناپاکی لێ نەکات، گەر بەڵێنی دا بەڵێنشکێنی نەکات، دەستتان لە ئازاردانی دەوروبەر بکێشنەوە، چاوەکانتان داخەن و داوێنتان بپارێزن))[1].

گەر نهێنیت پاڵفتە بوو و یەکانگیر بوو گوێت لە بانگی پەروەردگارت دەبێت بەبێ ناوەند، گەر ترس و رجات یەکیانگرت گوتاری پەروەردگارت(مەولات) رووت لێ دەکات، کوڕی خۆم لەبەردەستم رابکشێ، جێبێلی ئەسپی قەدەری ئەو(سبحانه وتعالى) یان وردوخاشت دەکات یان باز دەدات بەسەر تۆدا، ((هەرکەس تیاچوونەکەی بۆ خودا بێت جێگرەوەکەی لەسەر خودا دەبێت))[2]، گەر بەسەر تۆدا گوزەری کرد پێیەوە پەیوەست بە و ببە بە ئامانجی تیری قەدەری، گەر بووی بە ئامانجی تیری قەدەری بەرکەوتنی تیرەکە روشان دەبێت نەك کوشتن، ئەی ئەو کەسەی لە هەموو ئەمانە

[1] صحيح، رواه ابن حبان واحمد، واخرجه الحاكم في مستدركه وصححه.

[2] ينسب هذا القول الى احمد بن محمد الغزالي اخي الإمام الغزالي(طبقات الأولياء).

ڕووتی پاڵفته ببه و وەره پێشەوه و دەست به کار بکەرەوه، به هەموانـدا بکێشـه، لـه دانیشتن له ماڵەوه تەوبه بکه کاتێك من بۆ قسه دادەنیشم، لێره ویلایەت هەیه، لێره پله و پایه هەیه، ئەی ئەو کەسەی به ماڵ و منداڵەوه گیرۆده بوویت بـا کەسابەتەی بۆ منداڵەکان بێت و دڵت بۆ فەزڵ و چاکەی پـەروەردگارت، دەسـتەیەك حـەڵاڵیان لـه کەسابەتەکەیاندایه، دەستەیەکیش حەڵاڵیان لەوەدایـه بـه دوعاکانیـان بۆیـان دێـت، دەسـتەکی تـر حـەڵاڵیان لەوەدایـه لـه کەسـانی تـرەوه بۆیـان دێـت بـەبێ داواکـردن، دەستەیەکی تر حەڵاڵیان لەوەدایه له دەستی خـەڵکی داوای دەکـەن، ئـەوەش حاڵـەتی وەرزش و ڕامێنانه و بەردەوام نابێت: یەکەمیان که بریتییه لـه کەسـابەت سـوننەته، دووەمیان که بریتییه له دوعاکردن لاوازییه، سێیەمیان عەزیـمەت لەگـەڵ جۆرێـك لـه سواڵی و ڕوخسەت له نێوان ئەو دوانەدا، هەندێ جـار کەسـێك سـواڵ دەکـات و خـۆی نایخوات و دەبێته فیتنەیەك بۆ داوالێکراوەکه و تاقیکردنەوه بۆی، داوای ئەو بەندەیـه وەك داوای شـەو وایـه، پێغەمبـەر(ﷺ) دەفـەرموێت: ((داوای شـەو ڕەد مـەکەنـەوه، هەندێ جار کەسێك دێت بۆ لای ئێوه نه جینییـه نـه مـرۆڤ بۆئـەوەی ببینێـت-لـەوەی خودا به ئێوەی بەخشیوه و ئێوەی تێدا سەرپشك کردووه- چی دەکەن))[1].

هەر بەو جۆره ئەم بەندەیه فەرمانی پێکراوه به داوا(سواڵکردن) بۆئەوەی-لەوەی به تۆی بەخشیوه له نیعمەت- خـودا ببینێـت، لـه مەجلیسـی زانایانـدا ئامـاده ببـه و سەردانی گۆڕستان و صاڵحان بکه، بەڵکو دڵت زیندوو ببێتـەوه، گـەر فەرمانـەکانیان جێبـەجێ کـرد و خۆیـان لـه نـەهیکراوەکان کێشـایەوه قـەدەرەکان کۆمـەکیان دەبـن، عەبدوڵای کوڕی زوبەیر له هەفتەیەکدا یەك جار خواردنی دەخوارد، حاڵـی تـۆ نایەتـه ڕاسته تا وەك دەفرێکی کون کونت لـێ دێـت، شـلەی تێـدا ناوەسـتێت، وەك کەشـتی هەزارەکان کـه "خضـر"ی تێـدا بـوو و عەیبـداری کـرد، پاشـان حاڵـت حاڵێکـه کـه کۆکردنـەوه و جیابوونـەوەی تێدایـه، حاڵێـك کـەمی تێدایـه و حاڵێـك زۆری تێدایـه، هەرکەسـێك لەبەردەستم دەربچێت بەرەو ئاگر خودا ڕەحمی پێ نەکات.

---

[1] أخرجه القرطبي في تفسيره عن عمر(رضي الله عنه) بلفظ مقارب.

خودایه، داوای لێبوردن و داپۆشینت لێ دەکەم، خودایە داوای دامەزرانت لێ دەکەم، خودایە داوای رازیبوونت لێ دەکەم، گەر بە خودا گەیشتی بە جێبەجێ کردنی فەرزەکان لێت رازی دەبێت، چێشتلێنەری مەلیک پیربوو و ئەقڵی لەدەستدا و بینین و بیستن و ئاماژەی کۆتاییان پێهات، ئەوەی بەسەردا هێنا کە بۆی هەبوو لە حاڵەتی زانستدا، سوێندت دەدەم بە خودا ئەی موریدی صادق، بەپێی بانگەشەی خۆت کەی جیرانەکەت-لە خۆراکدا- بەسەر خۆتدا پێشخستووە؟ کەی بە کراس و مێزەرە و بەرماڵت پێشتخستووە؟ کەی بە ماڵەکەت پێشتخستووە؟ خوداناسان نەفس و سروشت و ئارەزوو خواردنەوەی خۆیان تووانەوە تا ئەوانە مردن، مانای فەنابوون واتە دەستی قودرەت سەرۆکارییان دەکات، قەدەری مردووشۆر بۆ راست و بۆ چەپ وەریاندەگێڕێت.

﴿وَكَلْبُهُم بَٰسِطٌ ذِرَاعَيْهِ بِٱلْوَصِيدِ﴾ الكهف: ١٨

پاشماوەی نەفس لەژێر دەرگای قەدەردا دەستەکانی راکێشاوە، دەوای ئەندامەکان دەستگرتنەوەیە لە گوناه، دەستگرتنەوە لە ئەنجامدانی خراپە و تاوان و یاخیبوون و هەڵە و تێکەوتن، دەستت لە دزی و لێدان بکێشەرەوە، لاقەکانت لە رۆیشتن بۆ گوناه و رۆیشتن بۆ لای سوڵتان یان یەکێك لە رۆڵەکانی ئادەم بوەستێنە، ئەم چاوە لە جوانییەکان بگرەوە، حیکمەت نەفسی خەواند، دڵ بە هاوەڵیکردنی مەحبوویەوە فڕی، گەر وەلی خودا(عزوجل) ئەدەبی جوان بوو بە سیفەتی پێغەمبەرایەتی دەڕازێتەوە، کەسی حەکیم لە نێوان سروشت و زانستدا سەرگەردان دەبێت، جارێك سروشت دێت و جارێك زانست و دەڵێت:

﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ﴾ الحشر: ٧

حەکیم بە دڵ دەڵێت: ئەوەندەت بەس نییە من راوەستاوم وەك خزمەتکارێك بۆت و چاودێری تۆ دەکەم و تۆش لەگەڵ مەلیکی؟ شمو جێخەوی مولکی ئەوانە، خەڵوەت تەختی زاوایانە، رۆژ بۆ شتێك لە هۆیەکان هانیان دەدات، موسیبەتەکان دەشارنەوە:

﴿يَٰبُنَيَّ لَا تَقْصُصْ رُءْيَاكَ عَلَىٰٓ إِخْوَتِكَ﴾ يوسف: ٥

لە نێوانیان خاوەن عیززەت بە، پاسەوانی یەکتر بکەن و یارمەتی یەکتر بدەن تا نووسراوەکە دەگاتە وادە و رادەی خۆی، دەربارەی من پرسیار بکە لە کاتی هاتنی مونکەر و نەکیر بۆ گۆڕەکەت، ئەو دوانە دەربارەی من هەواڵت پێ دەدەن[1]، لێرە ناوت گوناهکارە، سبەینێ ناوت دادگاییکراو و رەخنەلێگیراوە، تۆ لە گۆڕدا کەسێکی ناپەسەند و بێزراوی، نازانیت ئایا لە ئەهلی ئاگریت یان لە ئەهلی بەهەشت، سەرئەنجامەکەت نادیارە بۆیە بە پاکێتی حاڵت فریومەخۆ، نازانیت سبەینێ ناوت چییە، کوڕی خۆم، گەر رۆژت لێبوویەوە با نەفست بیر لە ئێوارە نەکاتەوە، گەر ئێوارەت بەسەردا هات با نەفست بیر لە بەیانی نەکاتەوە، دوێنێ و ئەوەی تێیدا بوو رۆیشت، بوو بە شاهید بۆت و لەسەرت، نازانی بە سبەینێ دەگەی یان نە، تۆ تەنها رۆڵەی ئەو رۆژەی خۆتی[2]، تۆ چەندە بێئاگای! نیشانەی بێئاگاییت ئەوەیە هاوەڵی بێئاگایان دەکەی، ئەی گەمژە، کەسێك نیشانەی حەقی لەسەر دەرناکەوێت بۆچی هاوەڵی دەکەی؟ بۆچی هاوەڵی کەسێك دەکەی بنچینەکەی لاواز و رماوە، ئاشکراکەی نەفسە و ناوەوەی یاخیبوون و بێنەدەبییە بەرانبەر بە حەق(عزوجل)، ئەمە بەروبومێکە بە شانداچەکاوی رووالەتی ناکرێتەوە، رشتنی چاو بە کلەیە نەك بە شەومانەوە، هەموو بوونی پڕە لە دروستکراوان و پەندی پێوە نییە، هەموو بوونی بریتییە لە زۆرلەخۆکردن و پەندی پێوە نییە، ئەی گەمژە، روو لە دەرگای ئەم و ئەو دەکەی تا زۆرتر کۆبکەیەوە، چۆن هیوای سەرکەوتن و سەرفرازیت بۆ دەکرێت؟ بۆ ناچیت بۆ دەرگای مەلیك وەك دەرگاوان، هەرکەسێك هات-دەربارەی پلە و پایەی-هەواڵ بە مەلیك بدە، سەربوردەکانی وەربگرە و بە هۆگری تەنهاییەکەی بڕەوێنەوە، بۆ دروستکراوان ناکەی بە ماڵ و منداڵی خۆت و لێیان کەنارگیر ببیت؟ لە ماڵەکەتدا بە پیشەکەی خۆتەوە خەریك بە، تا دێن بۆ دەرگاکەی تۆ و شتێکت لەلا دەبیننەوە دەبێتە هۆی چاککردنی ئەوان، ماڵەکەت بووە بە خەلوەتت، دڵت بریتییە لە

[1] (مەبەستی ئەوەیە مونکەر و نەکیر پرسیارت لێ دەکەن و پێت دەڵێن: ئیمامەکەت کێ بوو؟).

[2] (ئەمە ئەو نهێنییە گەورەیە پێویستە کەسی سالیك لای بەلاوا بکاتەوە، ئەو نهێنییەش بریتییە لە ژیان لە "ئێستا"دا، بە رابردوو و بە داهاتوو)

ماڵەکەت، نهێنیت بریتییە لە ماڵەکەت، ناوەوەت هاوەڵێت دەکات بۆ لای پەروەردگارت بە جێبەجێ کردنی فەرمانەکان و کۆتاهێنان بە نەهێڵێکراوەکان و تەبایی لەگەڵ ئەو لە قەدەرەکانیدا، ڕۆژی دروستکراوان لە دوعا و لێبڕانی تۆدایە، لەپێناوی چاوێك لە هەزار چاو ڕێز دەگیرێت، گەر ڕێزت لە فریشتە بەڕێزەکان گرت لە تەنهاییدا گوێڕایەڵی مەولای خۆت دەکەی و لێی یاخی نابیت، گەر ڕێزی خوداناسان بگری و خۆت لەلای ئەوان شەرمەزار نەکەی بە "کریم" ناودەبرێت، گەر بوویت بە "کریم" لەپێناوی تۆدا ڕێز لە هەزار چاو دەنرێت، بەڵا لە خانەوادە و جیران و ئەهلی شارەکەت دووردەخرێتەوە، بەهەمیشەیی سواڵ دەکەی و تەقە لە دەرگاکان دەدەی، کەی سواڵ لە تۆ دەکرێت، کەی خواردنت لێ داوا دەکرێت، کەی دێن بۆ دەرگاکەت، کەی ئەجابەت و شایستەگی و دەسەڵاتت بەهۆی نزیکی لە مەلیکەوە دەردەکەوێت، کەی نازناوەکانت دێنە دەرەوە و شانازییەکانت دەردەکەون و دەبیت بە ئەجیبتر و ئەجیبتر لە ڕۆڵەکانی محمد(ﷺ) و بەرەکەتی ئەوت ڕادەست دەکرێت؟[1]

((زانایان میراتگرانی پێغەمبەرانن))[2] بە گوفتار و کردار و حاڵ نەك ناو و نازناو، پێغەمبەرایەتی ناوە، پەیامەکە نازناوە، ئەی ئەزان گەر پێغەمبەرایەتی و پەیامت لەدەست چووە بۆ ویلایەتی شاراوەی ئەبدال لەدەست خۆت دەدەی:

﴿أَرَضِيتُم بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا مِنَ ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ التوبة: ٣٨

ژیانی دونیا واتە نەفس و ئارەزوو و سروشت، لەم ژیانی دونیا ئەوەی ناسرێتەوە لە حەزەکان بەشی خۆتە، ئەوەی بە لێبڕان و ئەندامەکانت بەدەستی دەهێنی لە دونیا

---

[1] (وەك ئەوەی لەگەڵ من قسە بکات بەم ئامۆژگاریانە، ئەمەش کەراماتێکی تری شێخی گەیلانییە کە لە قسەکانیەوە بۆ کەسی خوێنەر جیلوە دەکات، کاتی خۆی مامۆستا ئەورەسی ڕووداوێکی لەم جۆرەی بەسەر هاتبوو کاتێك خەریکی خوێندنەوەی ئەم کتێبە بووە، مامۆستا ئەورەسی لە خانەی حیکمەت(دار الحکمة) دەبێت لە ئەستەنبوڵ، شێخی گەیلانی لەم کتێبەدا پێی دەفەرموێت: "چۆن دەتوانی بەبێ مامۆستا شتێك فێربیت، تۆ لە خانەی حیکمەتدای، داوای زانست بکە، چونکە داواکردنەکەی فەرزە").

[2] تقدم تخریجه.

بەشی تۆیە، ئەوەی مەلیك بە تۆوە پەیوەستی دەكات و هەر دەبێت لە دونیادا دەستی بۆ ببەی بەشی تۆیە، بوونی خانوویەك لە ئامێزت بگرێت و پۆشاكێك داتبپۆشێت و نانێك تێرت بكات و ژنێك سوكناییت هەبێت لەلای پێی ناوترێت دونیا، ژیانی دونیا بریتییە لە رووكردن لە خەلكی و پشتهەلكردن لە حەق(عزوجل)، ئارەزوو دژی عیبادەتە، هۆ دژی هۆكارە، ئاشكرا دژی ناوەوەیە، گەر دەرەوەت دامەزراند فەرمانت پێ دەكرێت بە دامەزراندنی ناوەوە، گەر حوكمت-بە كاركردن پێی- دامەزراند دەبیتە بەردەست و شوێنكەوتە و هاوەڵی ئەو، دەبیتە كەسێك بونیاد(جەستە)ی لە سروشتی خۆی فانی دەبیت، زانست لغاوت دەكات و عاشقت دەبێت، وەك رۆحێكت لێ دێت لە نێوان دوو رۆحدا، وەك دەرگاوانی نێوان مەلیك و وەزیرت لێدێت، لە دونیا و دوارۆژ و لەلای دروستكراوان و خودا(عزوجل) و فریشتە دەبیت بە كەسێكی خۆشەویست، ئاسوودەیی و دڵخۆشی بۆ دڵان، حاڵەتێكمان هەیە لە ئامادەبوونی نێوە نادیارە.

داود بە كورەكەی خۆی(سولەیمان) وت(عليهما السلام و على جميع الأنبياء والمرسلين والملائكة المقربين والأولياء الصالحين):

((كوری خۆم، چەندە گوناه و هەڵە ناشیرینە دوای خامۆشبوون و سوكنایی بۆ لای خودا، ناشیرینتر لەوە ئەوەیە پیاوێك كەسێكی عابید بوو عیبادەتی پەروەردگاری وازلێهێنا))

﴿أَرَضِيتُم بِالْحَيَوٰةِ الدُّنْيَا مِنَ الْأٓخِرَةِ﴾التوبة: ٣٨

ژیانی دونیا بوونی تۆیە و ژیانی دوارۆژیش فەناكردنت، هەوڵ و لێبڕان گۆڕانی بۆ هەیە، نهێنی گۆڕانی بۆ هەیە، خەلكی رەشۆكی گۆڕانیان بۆ هەیە، تایبەتان گۆڕانیان بۆ هەیە، دونیا ئەوەیە دەیبینی، دوارۆژیش ئەوەیە بۆت والا دەبێت، شتێكت بۆ دێ ئەقڵ نایگرێت بۆیە سەرسام دەبیت و ئەوجا بۆت رۆشن دەبێتەوە، ئەوەی بە ژێری هاوبەش بۆت دێت لە دونیایە، ئەوەش لەرووی ژێری پاڵفتەوە بۆت دێت-كە بریتییە لە ژێری ژێرییەكان- لە دوارۆژەوەیە، نهێنیت دوارۆژە و دەرەوەت دونیایە، حاڵەتەكانی دونیا بریتیین لە هەرچی شتە جگە لە حەق(عزوجل)، دوارۆژیش بریتییە

لە پەیوەستبوون بە  بە مەولاوە(عزوجل) و پشتهەڵکردن لە وتی وتی و مەدح و زەم، و ڕۆیشتن و بەردەوامبوون لەگەڵ هەوڵ و لێبڕان و سووربوون، با خەم و پەژارەت بۆ ئەوە بێت بۆ تۆ گرنگە، گەر لە ویستدا ڕاستگۆ بیت حەق(عزوجل) دەستت دەگرێت، بە هاوەڵی قەدەری خۆی ڕێگەت پێدەبڕێت، دووری نێوان دوو هەنگاوت لە هەنگاوەکانی ئادەم(علیه السلام) بەرینتر دەبێت ئەوەش بەهۆی ڕاستگۆیی لە ویستدا و ئەدەبی جوان و کەڕبوونت لە قسەی جیرانەکانت، دەستت بە بڕین بچێت ئەی ئەو کەسەی نەزانی بە حەق(عزوجل) و ئەو چاکانەی بەسەر تۆوە هەیەتی، بەندەکانی گوێیان گرت و گوێڕایەڵیان کرد، بەندە بەشەکانی خۆی لە لەوحلمەحفوزدا دەبینێت، پاشان سەردەکێشێت بۆ بەشی خانەوادەکەی و منداڵەکانی تا سەریسوڕدەمێنێت لە ناوەوەی بانگی لێ دەکرێت:

﴿إِنْ هُوَ إِلَّا عَبْدٌ أَنْعَمْنَا عَلَيْهِ﴾ الزخرف: ٥

﴿وَإِنَّهُمْ عِندَنَا لَمِنَ الْمُصْطَفَيْنَ الْأَخْيَارِ ﴿٤٧﴾﴾ ص: ٤٧

ئەم شتێکە بە پێشینە دێت پاشان بە شوێنکەوتنی جێپێی گەورەپیاوان پاڵفتە دەبێت.

شێخ(خودا لێی ڕازی بێت) لە بیستن و وەجدیدا پارچە وەرەقەیەکی بۆ هات کە پرسیارێکی فیقهی تێدا بوو.

بۆیە فەرمووی:

با داوای مۆڵەت بکەم بۆ قسەکردن و ئیلهامی دڵم بکرێت.

پاشان وتی:

ئایا هاوسەرگیری واجبە یان نە؟ ئەم بابەتە جیاوازی تێدایە، هەیانە فەرموویانە سوننەتە، هەیانە وتوویانە سەرقاڵبوون بە عیبادەتەوە باشترە گەر لە نەفسی نەترسا، لەلای شافیعی و ئەحمەد و ئەبی حەنیفە خەریکبوون بە هاوسەرگیرییەوە چاکترە، تۆ ئەو کاتانەی موریدی خەریکبوونت بە عیبادەتەوە لەپێشترە، بەڵام گەر موراد بوویت لە نەفسی خۆتدا تەگبیرت نییە گەر خودا(عزوجل) بیەوێت هاوسەرگیریت پێ دەکات،

گەر نەیەوێت بە کاری ترەوە سەرقاڵت دەکات، گەر بەشێک هەبوو پێی بگەیت بەشەکی شوێنی تۆ دەکەوێت و بە حەق(عزوجل) دەڵێت مافم لەم کەسە بۆ وەرگرە، ئەو لە من زادەکات، تۆش منت کردووە بە بەشی ئەو، دەڵێت: مـن چی بکـەم؟ هـەتا تـۆ لای پێنەکەیەوە بەلای منداڵ لام بەلادا ناکاتەوە، بـەڵام موریـد ژنهێنـان لەسـەری حەرامە ئەرووی ئەوەوە بێ کراسێکی زیادەی هەبێت یان چوار پەنجە زەوی هەبێت، ئـەو کەسـە گەڕۆکە نیشتەجێبوون و پۆشاک و کەلوپەلی ناوماڵی نییە، بەڵکو لە هەموو کەلوپەل و پۆشـکێند رووتبووەتەوە، کاتێک بە مەرامی خۆی گەیشـت و گەڕانەکـەی وازلێهێنا گەر خودا بیەوێت هاوسەرگیری پێ دەکات و لە بوونی خۆی بـزری دەکـات، هەرکـەس هـەوڵی کەسـێکی گەمـژە بکـات گەمژەیە، گەمـژە ئـەو کەسـەیە خودای(عزوجـل) ئەناسیوە و رازیبووە بە ژیانی دونیا و دوارۆژی وازلێهێناوە.

ئەی گەنج، بەشی تۆ کەس نایخوات، بە سروشت و ئـارەزوو لـە دەسـتی شـەیتانەوە مەخۆ بەڵکو پێشبینی هاتنی دوارۆژ بکە تا دەگەیە خانەی بەهەشت یـان نزیکـی لـە پەروەردگارەوە(عزوجل).

پـەرێت پێیوت لە منداڵییەوە تا ئێسـتا وێـردێکم هـەبووە هەڵدەسـتم و دوو رکـات نوێژ دەکەم، پاشان لە کتەکەم دەچمە دەرەوە؟

شێخ خودا لێی رازی بێت) فەرمووی:

سەرجێکی کورتی بڕیاری پێشینە لە تۆ گیراوە، چاوی کەسێکی صـدیقت تێگیراوە کە تێبت بەرەو حەق(عزوجل) بە پێ تۆدا گوزەری کردووە، ئـەو کەسـە صـدیقە تـۆی لا بەش حووە، بۆیە بە برکەتی وتووە لەگەڵ خۆتـان بیبەن.

((لـە رۆژەکـی رۆژگاری تێیوەدا هەڵاو(هەناسـە)ی رەحمەت بوونی هەیە، بۆیە خۆتـان مە بەر ئەو هەڵاو(هەناسـە)ی رەحمەتەی خودا))[١].

١. [illegible]

دڵت پیر نابێت ئەگەر مەلیك لەبەر دەرگای نزیکی خۆی نیشتەجێی بکات، نابێت دەرەوە لاواز بێت و ناوەوە بەهێز، نابێت لاوازی گەورە لە دڵی تۆدا بوونی هەبێت، پێستی نەرمبووەتەوە و غیرەت و منەت نهێنی ئەوی فڕاندووە، دڵت دەرگای پەروەردگارت دەبینێت، هەیبەتی نزیکی دایدەگرێتەوە و دەیهێنێت بە چۆکدا، پارێزگاری لە دڵ کارێکی گەورەیە، گەردیلەیەك لە کاری دڵ چاکتر و باشترە لە هەزار گەردیلەی کاری دەرەوە، هەتا لەسەر فەرز و سوننەت بەردەوام بیت گرفتێك نییە.

(وترا بە جونەید: "الحضري" لەسەر دەستهارێك دادەنیشێت دەستهارەکە بۆخۆی دەسوڕێتەوە و خواردن و خواردنەوە ناخوات، جونەید فەرمووی: سەرنجی حاڵی بدەن لە کاتی نوێژەکاندا، پێی وترا: کاتێك بانگوێژ بانگ دەدات خامۆش دەبێت، فەرمووی: گرفتێکیان نییە، کێ دەتوانێت لە منداڵییەوە تا گەورەیی بەردەوام بێت لەسەر کاروکردەوە باشەکان؟! هەشیانە بەردەوام دەبێت تا لاوازی رووی لێ دەکات)، گەر لە نزیکی و لە زانست و لە موشاهەدەوە بێت گرفتێکی نییە، لە شتێکی ترەوە بێت شەیتانە و فریوت دەدات و نەفسە و ئازارت دەدات، هاوەڵی کردنی حوکم زانست بەرهەم دەهێنێت، نهێنییان بۆ بەرهەم دەهێنێت، ئایا هەواڵێکت لەمە هەیە؟ دابڕێ، پاشان پەیوەست ببە، پەیوەست ببە پاشان پێی بگە، زیانۆمەندی بۆ ئەوانەی لەسەر دوکانی هەڵپە و هیوا و ئاوات و لوتبەرزی دانیشتوون، گومانی تێدا نییە نهێنیت دەمرێت و دڵت رەش دەبێت.

**پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:**

((دڵان ژەنگ دەگرن، مسگەریی ئەو دڵانە بریتییە لە قورئان))[1].

خودایە، ئێمە هیدایەت بدە و خەڵکیش بە ئێمە هیدایەت بدە، رەحمان پێ بکە، خۆتمان پێ بناسێنە و بمانگێڕە لەوانەی تۆ بە خەڵکی دەناسێنن، خودایە، رووم لە هەر شوێنێك کرد بمکە بە کەسێکی موبارەك.

[1] تقدم تخریجه.

پەیوەست ببە پاشان دابڕێ و پاشان گەیشتن بەدەست بهێنە، فیقە وەربگرە و پاشان کەنارگیر ببە، هەرکەس بە نەزانی خودا بپەرستێت ئەوەی تێکی دەدات زۆرترە لەوەی چاکی دەدات[1]، چرای شەرعی خودا لەگەڵ خۆت ببە، بە حوکم دەچییە ناو زانستەوە، هۆیەکان ببڕە و لە برا و جیران جیاببەرەوە، زوهد لە بەشەکاندا دروست نییە، پشتت بدە بە هاوسەرەکەت، پشت هەڵبکە لە بەشەکان، هەوڵی زوهد بدە و پاشان زۆر لە خۆت بکە لەسەر زوهد، زۆر لە خۆت بکە لەسەر پشتهەڵکردن، چڵێسییەکەت وازلێبهێنە، ئەدەبی خۆت جوان بکە، لە هەرچی شتی ترە دابڕێ، لە نەیاران و هۆیەکان جیاببەرەوە، بترسە لە کوژانەوەی چراکەت بەهۆی بەردەوامی تاریکییەوە، لە کاتێکدا ئەو لەو دۆخەدایە حەق(علیه السلام) ڕۆن(نەوت)ی کۆمەکی دەگەیەنێتە چراکەی، نوورەکەت لە کردارەکانی تۆدایە.

((هەرکەس کار بکات بەوەی دەیزانێت خودا زانستێکی بۆ دەکات بە میرات کە نەیزانیوە))[2].

((هەرکەس چل بەیانی بۆ خودا ئیخلاصی هەبێت کانیاوی حیکمەت لە دڵییەوە بۆ سەر زمانی دەتەقێت))[3]. لە کاتێکدا ئەو لەو دۆخەدایە لەناکاو ئاگری حەق(عزوجل) دەبینێت وەك موسا(علیه السلام) کاتێك ئاگرێکی بینی،

﴿ فَقَالَ لِأَهْلِهِ امْكُثُوا إِنِّي آنَسْتُ نَارًا ﴾ طه: ١٠

حەق(سبحانه وتعالى) بە ڕێگەی ئاگرەکە بانگی لێکرد، ئاگرەکەی کرد بە نزیکی لەخۆی، بینینی ئاگرەکە لەلایەن موساوە بوو بە ڕێنومایی بۆی، لە درەختی دڵییەوە ئاگرێکی بینی بۆ نەفس و ئارەزوو و هۆ و بوونی خۆی.

﴿ امْكُثُوا ﴾ طه: ١٠ لە شوێنی خۆتان بێننەوە ﴿ إِنِّي آنَسْتُ نَارًا ﴾ طه: ١٠، نهێنی دڵ بانگی کرد ﴿ إِنِّي أَنَا رَبُّكَ ﴾ طه: ١٢ ﴿ إِنَّنِي أَنَا اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدْنِي ﴾ طه: ١٤

---

[1] (ئاماژەیە بە فەرموودەیەك پێشتر دەرهێنراوە(تخریج كراوە).

[2] تقدم تخریجه.

[3] رواه ابن أبي شيبة والديلمي في "مسند الفردوس" وأبو نعيم في "الحلية".

بۆ هیچ کەسێکی تر جگە لە من گەردنکەچ مەبە، من بناسە و لە کەسانی تر خۆت بێئاگا بکە، پەیوەست بە بە منەوە و لە کەسانی تر خۆت دابڕە، داوای من بکە و پشت لە کەسانی تر بکە، وەرە بۆ لای زانست و نزیکی و موڵك و سوڵتانی من، کاتێك ئەمەت بۆ تێر و تەواو دەبێت ئەو لیقایە کە هەموو شتێکی تێدا بوو تێر و تەواو دەبێت.

﴿ فَأَوْحَىٰٓ إِلَىٰ عَبْدِهِۦ مَآ أَوْحَىٰ ﴿١٠﴾ ﴾ النجم: ١٠

پەردەکان نامێنن، لیخنی و لێڵی نامێنێت، نەفس سوکنایی بۆ دێت و ئارامی و خامۆشی رووی لێ دەکات، لوتفی خودایی دادەبارێت.

﴿ ٱذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ ﴾ طە: ٢٤

ئەی دڵ بگەڕێوە بۆ لای حەز و نەفس و ئارەزوو، رێگەی ئەوان گەڕانەوەیە بۆ لای من، هیدایەتیان بدە، پێیان بڵێ:

﴿ يَٰقَوْمِ ٱتَّبِعُونِ أَهْدِكُمْ سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٣٨﴾ ﴾ غافر: ٣٨

ئەوەی دابڕاوە پێیەوە پەیوەست ببەرەوە، پاشان پەیوەست ببەرەوە، پاشان خەڵکانی تر بە من بگەیەنە، تۆ ئەی گەدا، لە داهاتوودا هێزت لێدەبڕێت و ناپاکیت لێدەکات و خۆشەویستانت کۆچت لێدەکەن، هەژاری و دونیا و سزای دوارۆژت بۆ کۆدەبێتەوە، گۆڕ دێت و لێت بەرتەسك دەبێتەوە، تا پەراسووەکانت دەچنە ناو یەکتر، لاڵ دەبیت لە وەڵامدانەوەی مونکیر و نەکیر، لە گۆڕەکەتدا سزا دەدرێت و دەروازەیەك لە ئاگرت بۆ دەکرێتەوە، سزا و ئازار و ژەهری ئەو ئاگرە رووت لێدەکات، ئەی هۆزەکەی نێمە، لەم خانەی دونیادا با ئەدەبتان جوان بێت، ئاپین و ئاشکرا و پەنهانتان سەلامەت دەبن، تا لەبەردەستی ئەو(سبحانە وتعالی) راستدەبییەوە، ئەوکات پەردە نامێنێت لەسەر چاو و زمان و گوێت، پاروت دەرخوارد دەدات و هێز لە پاڵ هێز بۆت زیاد دەکات، بەرچاوڕۆشنیت بۆ دەخاتە پاڵ بەرچاوڕۆشنی، تەمەنت بۆ دەخاتە پاڵ تەمەن، مانەوە لەپاڵ مانەوە، رۆزی لەپاڵ رۆزی، شوکری هەوڵ و کۆشانت دەکرێت و مەدحی ئەدەبی جوانت دەکرێت، بە شوکرکەر ناوت دەبرێت، دوای ئەوەی ناوی ئارامگر و ژیرمەند و دیینداری لێنایت، گۆڕانت بەسەردا دەهێنێت:

ئەخلاقی خراپ بە شوێنکەوتنی شەرع دەگۆڕن، پاشان زانست پاشان قەدەر، وەلا ئەوەی رزگاریان بێت لە برینی دەست و پێ و برینی ئەندامە پیسەکان، خۆرەی تێدا دادەنرێت، نە جوولە و نە بۆچی و نە چۆن؟ ژێرییەکان رۆیشتن، ژێری مرۆیی، رۆژگاری بێهۆشی گوزەری کرد و ژێری گەڕایەوە بۆ لایان، لوتفی خودایان بۆ هات بە گۆڕین، گۆڕین بریتییە لە خۆراك لەدوای برسێتی، خواردنەوە دوای تینوێتی، پۆشاك لەدوای رووتی، هەتا لە رێگە بیت فەرمانت پێ دەکات بە کەمخوازی، تا حەزەکانت خامۆش دەبن، مافی ئەم حەکیمە بدە، بە فەرمانی شەرع وەربگرە و لە نەهییەکانی خۆت بکێشەرەوە، ئەم چەند رۆژەی تەمەن گوزەر دەکات و لەگەڵ رۆیشتنی شەو و هاتنی رۆژ هەنگاوەکانت لە حەق(عزوجل) نزیکدەبنەوە.

سلێکان و موریدان چەند بەشێکن:

هەیانە لە رۆژێك و لە مانگێك و لە چەند ساڵێکدا کۆتایی پێ دێت، با تەمەنت بە "بۆچی و چۆن و دواتر" بەفیڕۆ نەچێت، پشتوێنت ببەستە، کار بکە، بەڵکو گەر لە خانەکەیدا کارت کرد بتکات بە مەیگێڕ، بەڵکو جاریەیە لە جاریەکانی عاشقت بێت و مارەی بکەی، وێنەکەت دەگۆڕێت و زەمبیلە و تەورەکەت دەفرۆشرێت، دەبیت بە سەرکردە یان مەلیك یان وەزیر، هەرکەس خودا بناسێت لەپێناوی ئەودا زۆر داوا ناکات، ئەمە کاتێك ئەگەر تۆ بە ئەو گەیشتبیت، بەر لە مەعریفە حەزت پێ بەیدا دەکات لە زوهد و وازهێنان، بەر لەوەی بگەی بە مەلیك، بەر لەوەی خۆی دەکات، ماڵئاوایی لە پۆشاك و قوماش و خانوو و خانەوادە و منداڵ و جیران و ژن و دۆستانی، لاقێکی بۆ پێشەوە و لاقێکی بۆ دواوە، بە دوو هەنگاوی ترس و رجا هەڵدەستێت، تۆ لەسەر چی هەنگاو هەڵدەگرێت؟ ئەو نەزانە بە هەموو شتێك، بۆیە هەموو شتێك بە نەزان دەبینێت لەوەی بۆ ئەوە و لەسەر ئەوە، گەر هەموانی وازلێهێنا دێت بۆ دەرگای مەلیك، لەگەڵ خزمەتکاران و ئەسپ و وڵاخەکانی

دەوەستێنێت، دەترسێت و رجای هەیە، نازانێت چی بۆ بڕیار دراوە، مەلیك تەماشای دەكات و ئاگای لێیەتی، دەڵێ بە خزمەتكاران: بەسەر هەمواندا پێشی بخەن، پاشان بەردەوام لە كارێكەوە بۆ كارێكی تر وەردەگەڕێت تا لەبەردەستیدا دەبێت بە دەرگاوان، تا لەگەڵ مەلیك تەنهادەكەوێتەوە، ئاگاهی بە نهێنییەكانی مەلیك پەیدا دەكات، ئاگاهی بە پۆشاك و تاج و شتەكانی بەردەست مەلیك پەیدا دەكات، مەلیك پێی دەڵێت:

﴿وَأْتُونِي بِأَهْلِكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٣﴾﴾ یوسف: ٩٣

لەدوای ئەوەی مەلیك شایەتی لەسەر نەفسی خۆیدا كە بەرانبەرت ناگۆڕێم، واژووی هاوەڵی هەمیشەیی و ویلایەتی بۆ دەكات، چونكە زوهد لەگەڵ مەعریفەدا نامێنێتەوە، ئەمە لە هەر هەزار كەسێك یەك دانەیە، ئەمە شتێكە قەدەر و بڕیاری پێشینە و زانست بەرهەمی دەهێنێت، تۆ لەوانە مەبە خودا(سبحانه وتعالی) دەربارەیان دەفەرموێت:

﴿لَا أُقْسِمُ بِيَوْمِ الْقِيَامَةِ ﴿١﴾ وَلَا أُقْسِمُ بِالنَّفْسِ اللَّوَّامَةِ ﴿٢﴾﴾ القيامة: ١-٢

**باوەڕدار پرسیار لە خۆی دەكات و دەڵێت:** مەبەستم چی بوو بە وتنی ئەو وشەیە، مەبەستم چی بوو لەو هەنگاوە، مەبەستم چی بوو لەو خواردنە، ئەو دادگایی نەفسی خۆی دەكات و ئەدەبی دادەدات و لێی دەپرسێت: بۆ ئەو كارەت كرد؟ بۆ ئەو نیشەت ئەنجامدا؟ ئایا ئەو كارە لەگەڵ قورئان و فەرموودەدا تەبایە؟

دەست بە یەقینەوە بگرن لەدوای دادگاییكردنی خۆ، چونكە ئەوە كرۆكی ئیمانە، فەرزەكان تەنها بە یەقینەوە جێبەجێ دەكرێن، بە یەقین لە دونیا زوهد دەكات، لەباری وەڵامدانەوەی دوعادا سوكنایی و ئارامی رووت لێ دەكات، گەر دوعاكەت وەڵام نەدرێتەوە پشت هەڵدەكەی، لە نیشانەكانی صدیقان گەڕانەوەیە بۆ لای خودا لە هەموو شتێكدا، گەر ویستیان حاڵی خۆیان بشارنەوە -لە وەرگرتن و پێدان- دەگەڕێنەوە بۆ لای خەڵك، دڵیان لەگەڵ خودایە و جەستەیان لەگەڵ دروستكراوانی خودا، رۆڵەی ئادەم ئاتاجە بەوەی لە دونیادا كار بكات تا سروشت و نەفس و شەیتان

و ئـارەزووی خـۆی بگۆڕێـت، تـا لـە سـیفەتە ناژەڵییەکانـەوە بـۆ ئـەخلاقی مرۆیی بگوێزێتەوە: ئایا بێباوەڕی بەم پەروەردگارە دەنوێنیت؟

کە ﴿خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلًا ﴿٣٧﴾﴾ الكهف: ٣٧

ئایا پاداشتی ئەم پەروەردگارە ئەمە بوو بێباوەڕی بۆ بنوێنی و نیعمەتەکانی شوکر نەکەی و لە چاوی خەڵکی شەرم بکەی لەوەی لـە خراپـەدا بتبینـن و لـە خـودا شـەرم نەکەی کە بە هەمیشـەیی دەتبینێت؟ ئـەی بانگەشـەکەری ویلایـەت لـە رووالەتدا و سەرپێچیکەر لە حەق بە گوناە و تاوان، ئایا شـەرم لـە خـودا ناکـەی؟! ئـەو بەئاگایـە لەسەر نهێنی و پەنهانەکانی تـۆ، تـۆش ئـەی ئـەو کەسـەی هـەژاری نیشـان دەدەی و دەوڵەمەندی دەشارییەوە ئایا شەرم ناکەی دینەکەت بە دونیا دەفرۆشیت؟

﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ﴾النحل: ٥٣، کوا شوکرکردنت؟

ئەی گەنج، کەس تۆمەتبار مەکە لە دروستکەری خۆتدا، لەوانەیە هەڵە یان راست بکەی، تا کاری خۆت چاك و باش نەبێت کاری کەسانی تر بە ناشیرین تەماشا مەکە، باش و خراپ بۆ لای شەرعە نەك بۆ لای ئەقڵ، ئەمە لەرووی دەرەوە و ئاشکراوە، بەڵام لەسەرو حاڵەوە باش و خراپ بۆ ناوەوە دەگەڕێنەوە، فتوای دڵ فتوای فەقیهەکە کۆتایی پێ دەهێنێت، چونکە فەقیە بە جۆری ئیجتیهادەکەی فتوا دەدات، بـەڵام دڵ تـەنها بـە عەزیمەت فتوا دەدات[1]، ئەوەی خودا رازی دەکات و لەگەڵی تەبایە بریتییە لە قەزاوەتی زانست لەسەر حوکم، بن بە بەندەی حوکم پاشان بن بە بەندەی زانست لەگەڵ بەندایەتی حوکمدا، واتە لەگەڵ خودا(سبحانه وتعالى) تەبابن و بۆی گەردنکەچ بن، لەگـەڵ زانسـت بچنە ناو هاوەڵی کردنی حوکمەوە، هـەر حەقیقـەتێك شـەریعەت شـایەتی بـۆ نـەدات بریتییە لە زەندەقە، گەر بچیتە ناو ئەهلی حەقەوە(عزوجل) دامـەزراو دەبیـت لـەوەی ئەوان تێیدا دامەزراون و ئەوە دەخۆی ئەوان دەیخۆن، شوکری خودا بکەن لەسەر نهێنی و تەنهایی، ئەی خەڵکی ئەم شارە، هـەموو ئـەوەی ئێـوەی تێدان لای مـن ناپەسـەندە،

---

[1] (مەبەست بەو دڵە دڵی کەسی عاریفە، نەك دڵێکی نەزان و دوور لە پەروەردگاری).

هەموو ئەوەی من تێیدام لای ئێوەش ناپەسەندە، ئێمە دوو دژین و کۆنابینەوە، بەهێزی خاوەنی ئاسمانەکان لەناو ئێوەدا دەژین، خۆشی دڵمان لای ئێوە نایەتە دی.

گەنجێتییەکەت لە خەشم و تووڕەیی خودادا(عزوجل) بەسەربرد، ژنەکەت و کوڕەکەت و جیرانەکەت و سوڵتانەکەت رازی دەکەی، بەڵام فریشتە و خودا(عزوجل) لە خۆت تووڕە دەکەی، لە کاتێکدا گەڕانەوەی تۆ بۆ لای ئەوە، هەردەبێ وەڵامی مردن بدەیەوە، باوك و دایك و برا و هاوەڵان و سوڵتانەکان بەجێدەهێڵیت، یەکێك لە ئێوە نەڵێت کەی قیامەت هەڵدەستێت، چونکە گەر مرد قیامەتی ئەو هەستاوە، سەرەتا دۆستانی خودا، ئەوجا ژیان لە نزیکی حەقەوە(عزوجل) و بە خۆدانەپاڵ حەق، بە چەندین مردن مردن، یەکەمجار لە حەرام مردن، دووەمجار لە شوبوهات، و سێیەمجار لە موباح، و چوارەمجار لە حەڵاڵی رەها و پێنجەمجار لە هەرچی شتە جگە لە حەق(عزوجل)، مردووان لەم شتانە داوا ناکەن و نزیکی دونیا ناکەون و هەوڵی بۆ نادەن، وەك ئەوەی سڕابنەوەو شێوابن، مانابن بەبێ وێنە، پاشان خودا زیندووی کردنەوە:

﴿بِسْمِ اللَّهِ مَجْرَاهَا وَمُرْسَاهَا إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٌ رَحِيمٌ ﴿٤١﴾﴾ هود: ٤١

گەر دڵ لەسەر دەریای قەدەر جاری بوو لەنگەرگرتنی لە بەندەری زانست و نزیکی خودایە، ئاگاهیی خزمەتە و خەوتن گەیشتنە، کاتێك بەندە لە نوێژەکەیدا خەوی لێ دەکەوێت خودا لای فریشتەکانی شانازی پێوە دەکات.

جەستە قەفەسێکە و رۆح بریتییە لە باڵندەکەی ناوی، دروستکراوان لای ئەهلی مەعریفە وەك مێش و زەردەواڵە و کرمی ئاورشم وان، حاڵیان بۆ ئێوە نایەتە بەر باس، خەڵکانێکی ژیرمەند بن، تەنها گەمژەکان لەلای خودا تیادەچن، تەنها تیاچووان تیادەچن، ئەو کەسەی فەرمانت پێ دەکات بە بەخشین و پێدان دۆستی تۆیە، هەرکەس بۆ هەژاران لە ماڵ و سامان بێنیاز بێت خودا نزیکی دەکاتەوە، تەنها بە ئیسلام خودا لێت رازی نابێت[1]، کەی حەق دەکەی بە کردار و حەق ئەنجام دەدەی، گەر ئەندامەکانم

[1] (واتە دەبێت لە پاڵ ئیسلامدا بەرەو ئیمان و ئیحسان بەرزببیتەوە).

بزواند بزانە دڵم گرێگرتووە ((ئەی دونیا بەسەر دۆستانمدا گوزەر بکە با لەسەرەتاوە تۆیان خۆشنەوێت، لە کۆتاییشدا خزمەتیان بکە بۆ ئەوەی بە تۆوە سەرقاڵ نەبن))[1].

کاتێك لای عیسای کوڕی مەریەم(علیه السلام) باسی قیامەت دەکرا هاواری لێ بەرز دەبوویەوە وەك چۆن جگەرسووتاوێك هاواری لێ بەرزدەبوویەوە، و دەیوت: نابێت رۆڵەی ئادەم کاتێك باسی قیامەتی لەگەڵ دەکرێت خامۆش و ئارام بێت، تۆ نەبوونێت و هەستت تێدا نییە، نە عاشق بوویت و نە عاشقت بوون، بە هۆی درێژەکێشانی مانەوەی لە دونیا دڵتەنگی رووی لێ دەکات، چونکە ترسی لە وەرگەڕانی حاڵی خۆی و پێویستییە بۆ لای دروستکراوان و سەرهەڵدانی پەردەیە لە نێوان خۆی و رەحماندا(عزوجل) ئەمەش بەهۆی زاڵبوونی ئارەزوو و نەفس و سروشت و شەیتانەوە، هەرکەسێك لەم دونیایەدا خۆی لە ئاسایشدا ببینێت نەزان بووە بە نەزانینێکی مەزن.

**ئەی گەنج، هەتا ئاسایشت زۆرتر بێت ترست زۆرترە،** سوێند بە خودا نزیکت دەکاتەوە و رووبەڕوو داتدەنیشێنێ و گفتوگۆت لەگەڵ دەکات و پاروووت دەرخوارد دەدات و دەتبینێت و دەرگاکانت بۆ دەکاتەوە و لەسەر سفرە و خوانی فەزڵ و نزیکی خۆی دادەنیشێنێ و لەگەڵت دەکرێتەوە، بەڵام داوای حوزنت لێ دەکات.

**پیاوێك هەستا بۆئەوەی پرسیاری لێ بکات بەڵام لێی نەبیست و فەرمووی:**

ئەمە شوێنی دڵتەنگییە، بروسکە چەخماخەیە، هەورەکان خۆیان لە باران خاڵی دەکەنەوە، بەندە لە حەق(عزوجل) نزیك دەبێتەوە، نزیکی لە خوداوە لەدوای دامەزران و جێگیرکردنی حوکمی شەرعی دێت، لەدوای دانەدەستی نووسراوی یەقین و ئاگاهی لە نهێنییەکانی و ئەوەی لێیەوە سەرهەڵدەدات، برای "ابن عقیل" خاوەنی خوێندنەوەی زۆری قورئان و زانستی فیقە بوو، دواتر بوو بە مەسیحی و لە وڵاتی بێباوەڕاندا بینرابوو کە خاچی لە مل کردبوو، پێیوترابوو: چیت کرد لەو خوێندنەوە و ئاینداری و بەندایەتییەی جارانت؟ ئەویش لە وەڵامدا وتبووی: لە قورئان تەنها یەك ئایەتم لەبیر ماوە:

---

[1] رواه البیهقی فی "الشعب" والطبرانی فی "الکبیر" بلفظ مقارب



Scanned by CamScanner

﴿ وَقَدِمْنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُوا۟ مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَٰهُ هَبَآءً مَّنثُورًا ﴿٢٣﴾ ﴾ الفرقان: ٢٣

یەکەمین شت گەرەکە کاری لەسەر بکرێت بریتییە لە نهێنی، ئەوجا دڵ، پاشان نەفس، دواجاریش ئەندامەکان، گەر نهێنی وەرگەڕا هەردەبێت دەربکەوێت، کەسی دووڕوو لە مزگەوتدا وەك باڵندە وایە لە قەفەسدا، ئاشکرای شەرع قەفەسی ئەوە، گەر واز لە ئاشکرای زانست بهێنین گوناهەکانت بۆ دەردەخەین و پێت دەڵێین: ئەی بێباوەڕ، ئەی فاسق، بەڵام شەرع دەستی لەو کارە گرتووین، خزمەتی حوکم بکەن و داوای زانست(زانستی دڵ) بکەن، چونکە زانست پەردە لەسەر نهێنییەکان لادەدات، فێری شەرع ببە ئەوجا کەنارگیر ببە، گەر لە تایبەتانی خودا بیت ئاگاهیت بە زانستەکەی پێ پەیدا دەکات، گەر نەفس بە مەولای خۆی گەیشت لە دەرگاکە دەوەستێت و وەك مەلیکان دەچێتە ژوورەوە، گەر بینیت دەرگاکە کراوە بوو پێت دەوترێت: بەم جۆرە مەچۆرە ژوورەوە، خانەوادەکەت مافیان لەسەر تۆیە:

﴿ وَأْتُونِى بِأَهْلِكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٣﴾ ﴾ یوسف: ٩٣

ئەی نهێنی -لەگەڵ دڵ و ئەندامان و هەموو بوونت- جێگیر ببە، ئەوکاتە کڕین و فرۆشتن و بەرهەڵستکاری بوونیان نییە، بجۆ ئەی ئەو کەسەی نەخواردووە، بخۆرەوە ئەی ئەو کەسەی پاراو نەبوویت، کاتێك "بیر"(بیری ئاو) لەسەر هەڵکەندن و پاچ و بێڵ ئارامی گرت سەرچاوەکەی لێ دەرکەوت و بوو بە ماوای هەڵهاتووان و کاروانیان، گەر لەسەر ئازاری تێکۆشان و بەلا ئارام نەگریت کەی دەبیت بە عاریف؟ ئەی هەژاری ئارامگر بەم نزیکانە حەق(عزوجل) تەماشات دەکات، بۆیە بەرزت دەکاتەوە و تاجت لەسەر دادەنێت و پۆشاکی مەزنی و موڵك و شکۆمەندیت لەبەردەکات، خودایە لە دروستکراوان دوورم بخەرەوە و لە خۆت نزیکم بکەرەوە، خودایە لەوان بێنیازم بکە و هەژاریم بۆ لای تۆ بێت، گەر دڵت بە دەرگای نزیکی لە خوداوە پەیوەست بوو لە تاریکی بووندا بەرەبەیانی زانستی لێ دەبێتەوە و چاوی دڵت بە کلەی نهێنی دەڕژێت، ئاوەڕۆکی قەدەرەکان دەخوێنێتەوە، ئەوکات خواردن و خواردنەوە -دوای چوونە ژوورەوە- دەست پێ بکە، خودا بەهەشتی بۆ کۆمەڵە

مرۆڤێك لە دروستكراوانی دروستی كردووە كە وەك مەلیك وان، هەروەها بۆ نەجیبان و دۆستانی خۆی.

تۆ دەخۆی و دەخۆیەوە و بەدووروودرێژی دەخەوی و بەنهێنی كاری منداڵانە ئەنجام دەدەی و دەڵێی: من لە دۆستانی خودام، من لە ئەبدالم، ئەم كارە بە هیوا و خۆزگە نییە، نەجیبان لە دروستكراوانی خودا تەماشای مورادی خودا دەكەن، ئایا ئێوە هەواڵێكتان لەمە هەیە ئەی ئەهلی مەجلیس؟ ئەی رۆڵەكانی وتی وتی.

فووی بە دەستیدا كرد و رووی بە هەموو ئاراستەكاندا گێڕا پاشان فەرمووی:

هەركەسێك بەبێ وەرع لە تەنهاییەكەیدا بانگەشەی خۆشەویستی خودای كرد ئەو كەسە درۆزنە، هەركەسێك بانگەشەی خۆشەویستی بەهەشت بكات بەبێ بەخشینی ماڵ و موڵك ئەو كەسە درۆزنە، هەركەسێك بانگەشەی خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) بكات بەبێ خۆشەویستی هەژاران ئەو كەسە درۆزنە، بە چاوی سەر دونیا ببینە و بە چاوی دڵ دوارۆژ ببینە و بە چاوی نهێنی مەولا(عزوجل) ببینە، لەگەڵ دروستكراوان خاوەنی ئەدەب بە بەجۆرێك دەنگ بەرزمەكەرەوە بەسەر دەنگی كەسێك لەوان، ئەوەش وەك پارێزگاری لە ئەدەبی خۆت، بە گوناهەكانت زۆرانبازی دەكەیت لەگەڵ حەق(عزوجل) و لە كردارەكانیدا بەرهەڵستی دەكەی، چەندە كارێكی ناشیرینە، خۆر تەنها لەسەر ئەزان هەڵدێت، تەنها لەسەر ئەو كەسانەی ئارەزوو و سروشت و نەفسیان بەسەر خودادا پێشخستووە، ئەمە شتێكە لەودیو ژێریەوە، رۆح بە تەبایی و نێوانخۆشی دەگیرێت، بەڵام بە زۆرلێكردن نەخێر.

﴿إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالْإِيمَانِ﴾ النحل: ١٠٦

هەر هاتوویەك(وارد) روو لە موریدی راستگۆ دەكات كارە ئاشكراكانی لەسەر ئاوێنەی حوكم نمایش دەكات و كارە ناوەكییەكانی لەسەر ئاوێنەی زانست دەخاتەڕوو[1]، گەر كارەكانی لەگەڵ ئەو دوو ئاوێنە تەبابوون دەبیەن بۆ خزمەتی مەلیك(عزوجل)،

---

[1] (حوكم بریتییە لە حوكمی شەرعی و زانستیش بریتییە لە زانستی دڵ).

گەر لەگەڵ ئاوێنەیەکیان تەبا بوو نەك لەگەڵ ئەویتریان ئەوا ئاگات بە ئەنجام[1]، لە دەرگاکەدا دادەنیشێت و پێی دەوترێت حوکم دامەزراو بکە تا هەوڵەکەت جێگەی شوکر بێت و کارەکەت جێگەی مەدح و سەنا، چونکە ئەمە دەرگایەکە تەنها لە دەرگای حوکم و زانستەوە لێی دەچییە ژوورەوە، گەر بەو جۆرە بوو کۆمەڵێك کارت بەروودا دەکرێنەوە، جیاکردنەوەی ئەو کارانە ئەوەیە لەنێوان خۆت و پەروەردگاردایە، هیچ کەس ئاگاهی بەو کردارانە نییە، نە فریشتەیەکی نزیك لە خودا و نە پێغەمبەرێکی رەوانەکراو، ئەقڵی شەرعییان لێ رۆیشتووە و ئەقڵی نەقڵەکانیان پێدراوە، کاتێك رۆژگاری بێهۆشییان لێبوویەوە گەڕانەوە بۆ خواردن لەدوای برسێتی و خواردنەوە لەدوای تینوێتی و خەوتن لەدوای شەوخوونی و ئاسوودەیی و پشوو لەدوای ماندبوون، پاشان روو دەکات لەو کارەی کە مەزنترین کارە، چونکە بەئاگایە لە گەنجینەی نهێنییەکان، پاشان ئەو بەندەیە بەئاگا دەبێت لەوەی دەیەوێت لە ئەهلی شار و وڵات، گەر کەسەکە قوتب بوو لە کاروکردەوە و بەش و سەرئەنجامی کاری ئەهلی دونیا ئاگادار دەبێت، سەردەکێشێتە ناو گەنجینەی نهێنییەکان و شتێك لە دونیا لە خێر یان لە شەڕ لە ئەو شاراوە نییە، چونکە تاقانەی مەلیکە و نهێنییپارێزی ئەوە و جێگری پێغەمبەران و رەوانەکراوی خودا و ئەمینی مەملەکەتە، ئەمە بریتییە لە سەرچاوەی قوتبوون لە سەردەمی خۆیدا، دڵ جێگەی هاتوو(وارد)ەکانی فریشتەیە، نهێنیش جێگەی هاتووەکانی حەقە(عزوجل)، گەر خودا ویستی بەندەیەك بۆ ئەو دابڕێت و یەکلابێتەوە یەکەمجار لە رۆڵەکانی ئادەم وەحشەتی بۆ دروست دەکات، پاشان لەگەڵ دڕندە و وەحشی و جیندا هۆگری بۆ پەیدا دەکات، تا ئامۆیی ئادەمی دەڕەوێتەوە بە هۆگربوون بە جین و دڕندەوە دواتر هۆگری بە فریشتەوە-بە جۆراوجۆری وێنەیان- بۆ پەیدا دەبێت، لە دەشت و چۆڵ و سارا و دەریادا قسەیان دەبیستێ، ئەی ئەو کەسەی خۆت یەکلاکردووەتەوە بۆ دابڕان، گرێیگرە، ئەی ئەو کەسەی داوای حەق(عزوجل) دەکەیت، سەرەتا قسەیە و پاشان بینینە[2]، کاتێك هۆگری بە قسەیانەوە

---

[1] بۆ نموونە: گەر تەنها سەرقاڵی دڵ بێت و حوکمە شەرعییەکان پشتگوێ خات، یان بەپێچەوانەوە.

[2] واتە سەرەتا قسەیان دەبیستی پاشان دەیانبینی.

پەیدا دەکات و بۆ بینینی وێنەکانیان ئامەزرۆ دەبێت پەردە لە نێوان ئەو و ئەوانیدا هەڵدەگیرێت، خۆشترین گفتوگۆ لەگەڵ دروستکراوانی خودا گفتوگۆیە لەگەڵ فریشتە، لە هەرچی دروستکراوە وێنەیان جوانترە و کەلامیان شیرینترە، پاشان پەردە دادڕێتەوە و بەرەو دەرگای خودا پاڵدەنرێت، پاشان کەسەکە هۆگری نزیکی خودا دەبێت، دواتر ئەوە دەبێت کە دەبێت، لەدوای بێدەنگی بۆ دڵ وەحی رەوانە دەکرێت وەك چۆن وەحی بۆ دایکی موسا(علیه السلام) کرا کاتێك ترسا منداڵەکەی تیابچێت، ئەی دڵ گەر لە تیاچوونی ئەو نهێنییە ترسای لەناو تۆدایە جەستە هەڵبدە ناو دەریای دەشت و بیابان و چۆڵەوانی و لە خانەوادە و هاوەڵان جیاببەرەوە، ئافرەتێك لە تۆ ئازاتر و چاکترە منداڵەکەی هەڵدایە ناو دەریاوە، کەچی تۆ دوو هەنگاو-لە خۆت و دونیا- دەردەچیت دەترسیت، ئەوەش بەهۆی ناتەواوی باوەڕتەوە:

﴿لَوْلَآ أَن رَّبَطْنَا عَلَىٰ قَلْبِهَا﴾ القصص: ١٠

هەر بەو جۆرە گەر لە دەشت و چۆڵەوانیدا ترسایت-لەباری بڕانی مەرام و ئامراز و دەقیپێوەگیراو- تا پێ لە دۆخێك دەنێیت دەتەوێ بگەڕێیەوە بۆ ناو هۆز و خەڵکی، لەو کاتەدا دڵت دادەمەزرێنێت.

ئەی ئەو کەسەی یەکتاپەرستی و زانست و تەقوات ناتەواوە-لە هەموو حاڵەتێکی تەگبیربۆکراودا - نێوە و تەوبەکردن لە کوێن؟ خواردن بە دین دووڕوویییە، خواردن لە ڕێگەی پیشەوە سوننەتە، لەگەڵ ئەم سوننەتە دابنیشە تا ئیمان دێت و پیشەکە لە دەستت وەردەگرێت و دەرگاکانی خەڵکی لە تۆ دادەخات، ئەوکات بەدڵ دەرچۆ یان دابنیشە لە خانەی زانستی ئەودا(سبحانه وتعالی)، کەڕ و کوێر تەنها حەق دەبیستی و تەنها فەزڵ و چاکەی خودا دەبینی، پاشان گەشت و گەڕان بە ناو زەویدا دەست پێدەکات لەگەڵ تۆرنیشوو.

ئەی ئەزان، گەر یەکێکتان بە شتێك گەیشت نابێت هەڵیبگرێت و بڕوا و لە چاوان خۆی بزر بکات، باری وەرگرتن لە دروستکراوان و باری وەرگرتن لە حەق(عزوجل) ڕاستەقینەیە، بەڵام گەر پلە و پایەی بەرزبوویەوە و ویلایەتەکەی هاتە دی بەدڵ گوێ

بە وەرگرتن یان وەرنەگرتن نادات، شتەکان دێن بۆ لای و ئەو لێیان بەرزە و دەستبۆبردنی دەبێتە بەش بۆی، ئەی دایکی موسا(علیه السلام)، گەر لێی ترسای بیخە ناو ئاوی رووبارەکەوە، تۆش گەر لە دینەکەت ترسای دڵت هەڵبدە بۆ لای خودا، دڵت رادەستی ئەو بکە، بڵێ: ((أنت الصاحب في السفر والخليفة في الأهل والولد-تۆ هاوەڵی ڕێگەمی و تۆ لەناو خانەوادە و منداڵەکانمدا جێنشینی منی))[1]، مەعریفەت بە خودا و خۆشەویستیت بۆی وەك حەمەیاڵ[2] وایە لە ناوقەدی تۆدا روو لە هەر کوێ بکەی لەگەڵ تۆیە، بۆیە لەگەڵ قەدەردا دەنویت، لە دەسەڵات و خاوەن دەسەڵاتەوە دەبیستی، سوێند بە خودا، پاشان سوێند بە خودا، حاڵی ئەولیا وەك حاڵی پێغەمبەران(علیهم السلام) وایە، بەڵام نازناوی پێغەمبەران(علیهم السلام) جیایە لە نازناوی ئەولیا، پێغەمبەران و نێراوان(علیهم السلام) مونکەر و نەکیر دانابەزێت بۆ سەریان، چونکە ئەوان تکاکاری خەڵکین، هەر بەو جۆرە ئەولیا دادگایی ناکرێن، چونکە تایبەتانی دروستکراوانن، ئەی بەندەی ئارەزوو و سروشت، ئەی بەندەی مەدح و سەنا، ئەوەی مەرەکەبی نووکی قەڵەمی پێ وشکبوویەوە[3] و ئەوەی زانستی پێشینە پیایدا گوزەری کرد لە بەشەکان هەردەبێت بەدەستی بهێنیت، بەڵام قسەکە ئەوەیە ئایا بە خۆتەوە وەریدەگریت یان بە خوداوە، دەتبینێتەوە و داتدەنیشێنێت لەگەڵ یەکتاپەرستی، نهێنییەك لە نهێنیەکانی حق(عزوجل) لە دڵی بەندەکەیدا نە شەیتان ئاگاداری پێی هەیە، نە ئەقڵ و نە فریشتە، لە دەرگای فەناوە داوای نزیکی بکە، گەر رازی بیت خۆشیدەویت، گەر خۆشیویستی نیشانت دەدات، گەر عاریف هاوەڵیت بکات بە هەمیشەیی -لەگەڵ زانستەکەت- لە هاوەڵی ئەودا دەبیت، کەسی عابیدیش بە عیبادەتەکەی هاوەڵی دەکات، ئەمە تەنها کەسی عاریف دەیزانێت، تۆ بۆ ئەو رامهاتووی، گەر لەوەدا لەگەڵ خودا(سبحانه وتعالى) تەبابوویت کارەکەت تەواوە، ئەگەر

---

[1] هو قطعة من حديث رواه مسلم وابو داود والنسائي.

[2] (پشتوێنێکە لە ناوقەد دەبەسترێ و پارەی تێدا هەڵدەگیرێت، بەزۆری حاجیان دەیبەستن).

[3] (ئاماژەیە بەو فەرموودەی ئیبن عباس دەیگێڕێتەوە لە بەشێکیدا هاتووە: "رفعت الأقلام و جفت الصحف"، رواه الترمذي وقال حديث حسن صحيح.

نە، تۆ دەرکراویت، ئێمە لەدوای عاریفانەوە دەڕۆیشتین و وەك گەردیلەیەك خۆمان لا بچووك دەبوویەوە بۆ ئەوەی وشەی چوونەژووردوەیان لێ ببیستین، هەرکەس بە رای خۆیەوە بێنیاز بوو گومڕا بووە.

دوای هەندێ قسە فەرمووی:

لە شوێنکەوتندا دەبێتە جێگری پێغەمبەر(ﷺ)، وازلێدەهێنرێت پاشان وازلێدەهێنرێت، وەردەگیرێت، پاشان وەردەگیرێت، واز لە وازلێهێنراو دەهێنرێت و وەرگیراو وەردەگیرێت، وەك بەرەبەیان کارەکەت بۆ رۆشن دەکاتەوە، لەسەر بەندە دوو پۆشاك: جارێك پۆشاکی بوون و جارێکیش پۆشاکی نەبوون نەبوون نوێدەبنەوە، جارێك بزردەبێت و حەق رووی لێ دەکات و جارێکیش بوون پەیدادەکاتەوە و لە حەقەوە(عزوجل) هەواڵ دەدات، دڵم لە پەروەردگارەوە دەگێڕێتەوە[1]، یا خەڵوەتەکەت دوو دەرگای هەبێت، دەرگایەك بۆ لای دروستکراوان و دەرگایەك بۆ لای حەق(عزوجل) کە مافی حەقی(عزوجل) تێدا بەجێبهێنیت، بۆ حەق هاوەڵی دروستکراوان بکە، ئەوکات لە شەڕی دروستکراوان رزگارت دەبێت و نزیکی حەقت(عزوجل) بۆ بەردەوام دەبێت، دەرستکراوان بریتین لە هەرچی شتە جگە لە حەق(عزوجل)، ئەمەش مانایەکە هەموو حاڵەکان دەگرێتەوە، مانای هاوەڵیت لەگەڵ دروستکراوان واتە ئامۆژگاری کردنیان لەدوای هاوەڵی کردنی حەق(عزوجل)، ئەوکات تۆ لەگەڵ حەق(عزوجل) دەبیت نەك

[1] (ئەم قسەیە کراوە بە جێ تانە لەسەر ئەهلی تەصەوف لەلایەن ئەهلی فەرموودەوە و فەقیهەکانەوە، گوایە سۆفییەکان فەرموودەیان وازلێهێناوە و شوێنی خەو و خەیاڵی خۆیان کەوتوون و پێیانوایە لە پەروەردگارەوە، هەندێك لە توندڕەوان زیاتر لەمەش دەدەنە پاڵیان و دەڵێن لە شەیتانەوە شت وەردەگرن نەك لە پەروەردگارەوە، لەڕاستیدا ئەم رەخنەیە بێبنەمایە، چونکە گەورە عاریفان-لەوانە شێخی گەیلانی- بۆخۆیان چوون بە گژ هەموو ئەوانەدا ئەزانانە کەوتوونەتە ناو تەصەوف و وازیان لە ئەحکام و زانستە شەرعییەکان هێناوە و وڕێنە و قسەی بێبنەما لەسەر ئیمان و ئیسلام دەکەم، ئەو کەسانەی دڵیان لە پەروەردگارەوە ئیلهام دەکرێت زانای عاریفە، نەك نەزانێکی بێ مەعریفە، ئیلهام کردنی دڵی باوەڕدار لە چەندین ئایەت و فەرموودەی پێغەمبەردا(صلی الله علیه وسلم) هاتووە، تەنها بۆ نموونە ئەو ئیلهام(وەحی)ەی بۆ دڵی دایکی موسا و بۆ هەوارییەکانی عیسا و بۆ یارانی ئەشکەوت هات).

لەگەڵ دروستکراوان، نیشانەی هاوەڵێت لەگەڵ دروستکراوان ئەوەیە قازانج و زیان لەلای دروستکراوانەوە تەماشا نەکەیت، بەڵکو هەمووان لەلای تۆ ئامراز و رامهێنراون، کۆمەڵێك دڵ هەن لە خۆراکی فەزڵی خودا دەخۆن و گوێیان لە فەرموودەی ئەو گرتووە و ئاسوودەیی نزیکی ئەویان بینیوە، خودا لە دونیادا بەر لە مردن و بەر لە قسەکردن لەگەڵیان لە دوارۆژدا قسەیان لەگەڵ دەکات، دانە دانیەك لە بەندەکان لە دونیادا قسەیان لەگەڵ دەکرێت، ئەبو قاسم جونەید دەفەرموێت: (قسەم بۆ خەڵکی نەکرد تا چل کەس لە ئەبدال شایەتییان بۆ دام، لەوانە "السري السقطي"، کارم نەکرد بە قسەکەیان تا گەیشتمە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) و فەرمووی: ئەی جونەید قسە بکە بۆ خەڵکی، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە قسە بۆ خەڵکی بکەیت)، گەر حەق و زیادە و داخەزراتت گەرەکە ئەوە ئەنجام بدە کە دەیڵێیت ئەگینا هاوار بە حاڵت، لە کاتی نوێژدا روو لە قیبلە دەکەی، رووکردنە قیبلە ئەوەیە رووی دڵت لە حەق(عزوجل) بکەی، وەك چۆن رووی خۆت لە کەعبە کردووە، بە هەمان شێوە رووی دڵت لە حەق(عزوجل) بکە، گەر لە کاتی ئاڤەتدا رووت لە دروستکراوان کرد ئیمانەکەت دەبێتە باتڵ، چونکە بەڵا لە بوونی ئیماندا دەشکێت، شکانەوەی دڵان تیایدا گەورەیە، بەڵام شکانەوەی دڵی خەڵکی رەشۆکی بۆ دونیایە، و شکانەوەی دڵی تایبەتان بۆ دوارۆژە و شکانەوەی دڵی تایبەتانی تایبەت بۆ لەدەستچوونی مەولایە(عزوجل) یان بۆ پەردەیەکە کەوتووەتە نێوان بەندە و خوداوە، بۆ هەریەکێك لەمانە شکانەوەیەکی تایبەت بە خۆی بوونی هەیە، مەگەر دانە دانەیەك کە شکانەوەیان لە پێناوی حەقدایە(عزوجل).

**پرسیاری لێکرا دەربارەی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) کە دەفەرموێت:**
**((خودا دوعای ئاوازدار(ملحون) قبوڵ ناکات))**[1].

**فەرمووی:** خودا دوعایەك قبوڵ ناکات زۆرلەخۆکردنی تێدا بێت و سەجعی تێدا بەکارهێنابێت.

---

[1] اثبت وروده التقي السبكي: وقال: الأظهر ان المراد بـ"الملحون" الخطأ في الإعراب والبناء، وقيل المراد به الدعاء بغير حق، كذا قال العجلوني في "الكشف".

((من و تەقواداران لە ئومەتەکەم بەرین لە زۆرلەخۆکردن))[1].

هەندێ جار باوەڕدار رجا داوا دەکات، تەماشای دیوانی گوناه و یاخیبوونەکانی دەکرێت گوناهێك نابینرێتەوە، هەر لە منداڵییەوە خودا روشدی پێبەخشیوە، لە نووسینەوە بۆ خوێندنەوە و بۆ میحراب[2] گوناهێکی نەکردووە و یاخیبوونێکی لەسەر تۆمارنەکراوە، لە دیوانی فەرمانەکاندا کارێکی بەجێنەهێلاوە، ئەوکات بڕیاری ئەنجامدانی گوناهێکی بۆ دەدرێت بۆ ئەوەی تیانەچێت، پاشان فریای خۆی دەکەوێت و تەوبە دەکات، ئەو گوناهە و پێشینەکەی دەبێتە پەتێك لە گەردنی، ئەم گوناهە لە پای ئەم بەندە باوەڕدارە صادیقە وەك گوناهەکەی ئادەم(علیه السلام) وایە، ئەمە زۆر دەگمەن و شازە، لا بەلایدا ناکرێتەوە و گرنگی پێنادرێت، ویست لە نەفسدا دوو ویستە و هەردووکیان دژ بەیەکن، ویستی هەرچی شتە جگە لە حەق(عزوجل)، لەگەڵ ویستی حەق(عزوجل)، ئەم دوانە بۆ ماوەی چل ساڵ بە یەکتردا دەکێشن و لەگەڵ یەکتر دەجەنگن، ئەوەش مانای فەرموودەکەی پێغەمبەرە(ﷺ) کە دەفەرموێت:

((هەرکەس تەمەنی بگاتە چل ساڵ و خێری بەسەر شەڕیدا زاڵ نەبێت با خۆی بۆ ئاگر ئامادە بکات))[3].

ئاماژەیە بۆ ئەم ئەسڵە، ئەی هەڵهاتوو بە رۆشنکردنەوەی رێگە، بۆ ئاشکرا بفڕە، ئاوەوەت لە شەڕپێدان بگرەوە، تا -جگە لە خودا- کەسان و شتانی تر بناسیت و ئەوانیش تۆ بناسن تۆ لە هەوەسبازیدای، جارێك شوێنیان دەکەویت و جارێکیش بۆیان زەلیل دەبیت، ئەم خانەیە دوو رێگەی بۆ هەیە، نیشانەی وەلی بێنیازبوونە بە خوداوە(عزوجل) لە هەموو شتێك و قەناعەت بە خوداوە لە هەرچی شتە و گەڕانەوەی بۆ لای ئەو لە هەموو شتێکدا، گەر نەفست بەردەوام بوو لە بانگەشەی ویلایەت بەم خەسڵەتانە سنوورێکی بۆ دابنێ، گەر نەفست رانەوەستێت تۆ وەلی نیت، لە دوای

[1] تقدم تخريجه.

[2] (قزناغەکانی خوێندنی ئەوکاتە بوون).

[3] أورده السخاوي في المقاصد، وقال أورده الأزدي بسنده عن ابن عباس مرفوعا.

یەقین لە ئیمان و هێزی زانست بە خودا و زوهد لە دونیا و دامەزران لە مەعریفە و هۆگری بە خوداوە زانا سەردانی مەلیکان بکات، ئەوکاتە بە هێزەوە دەچنە لایان و بە هێزەوە لایان دێنە دەرەوە.

هاوەڵی کەسانێکم کرد هەموو ئەوەی جاری دەبوو بەسەر مندا و لە داهاتوودا روویان لێ دەکردم ئاماژەیان پێ دەدا و قسەیان لەبارەوە دەکرد، منداڵێکی جوان لەگەڵی دەڕۆیشت و دەچوو بۆ لای سوڵتانەکان، لەوەدا شتێك بە دڵمدا گوزەری کرد، ئەویش وتی: کوڕی خۆم، ئەم منداڵە لە خانەی سۆفییە هەژارەکاندایە(الربـاط)، دەترسم لەوێ بەجێیبهێڵم سووکایەتی پێ بکرێت، چوونیشم بۆ لای سوڵتانەکان بۆ پێویستییەکی خۆم نییە بە ئەوان، بەڵکو دەچمە لایان ئامۆژگارییان دەکەم و ڕێگەی دادپەروەرییان بۆ ڕۆشن دەکەمەوە، ئێوە ئاتەواوی لە هاوەڵی کردنتان بوونی هەیە، بەڵام ئێمە بە ئەدەبەوە هاوەڵییان دەکەین.

**کەسێك پرسیاری کرد: گەر خواردن تێکەڵ بوو(لە حەڵاڵ و حەرام) چۆن نوێژ و ڕۆژوو دروست دەبن؟**

فەرمووی:

((حەڵاڵ روون و ئاشکرایە و حەرامیش روون و ئاشکرایە))[1]، شەرع ڕۆشنی کردووەتەوە، بەهەمان شێوە جێگەکانی وەستان(بێدەنگبوونی شەرع)، گەر دڵت پێی وتی "نەخێر" ئەوە-بۆ تۆ- حەرامە، گەر پێی وتی "بەڵێ" ئەوە-بۆ تۆ- حەڵاڵە، گەر بێدەنگ بوو، نە نەخێر و نە بەڵێ ئەوە بریتییە لە شوبهە، گەر وازت لە دەقپێوەگیراوەکان هێنا و ئارامیت بە نەفست گرت ئەوە بریتییە لە قەناعەت، نازانیت چەندە گوێڕایەڵی و ڕۆژوو و نوێژی لەلایە، گرنگ ئەوە نییە، بەڵکو مەبەستی خودا لەو کارانە دڵێکی پاك و بێگەردە لە ئەقدار و ئەبار، کەسی زاهیدی دووڕوو ئاشکرای پاك و بێگەردە و ناوەوەی لیخنە، گۆناکانی زەردهەڵگەڕاون و خشوع لە دەستەکانیدا دیارە و پۆشاکی خوری پۆشیوە، و زوهدەکەی بریتییە لە دەستگرتنەوە، بەڵام ناوەوەی

[1] (ئیمامی بوخاری ومسلم ریوایەتیان کردووە).

لە نەفسی خۆی سواڵ دەکات و حەزی لە مەدح و سەنایە و رقی لە زەم دەبێتەوە، چاوی بڕیوەتە ئەوەی لەدەستی خەڵکیدایە، بەڵام کەسی عاریف ئاشکرای بە شتێك لە بەشەکانی دونیا چڵکن بووە، بەشەکانی نەفس و ئەو بەشانەی تر پێیەوە پەیوەستن، کەسێکی بێزێنە و مەلیك، وەك ئەوەی مامۆستای خانەی خۆی بێت، سوپاکەی ئامادەکردووە لەگەڵ سەلامەتی نهێنی و پاکێتی دڵ و بینینی خودا(سبحانه وتعالى)، شەپۆلەکانی زانست ئەمدیوئەودیوی دەکەن، دەریاکانی دونیا دڵی پڕ ناکەن، هەموو ئەوەی لە حەوت ئاسمانەکان و زەوییەکان و هەموو بوونەوەراندایە لەبەر دڵی ئەو بوونیان نییە و بەسەرچوون، ئەمە وێنەی عاریفە و ئەوەش وێنەی زاهیدە، تۆ هەواڵێکت لەمە نییە، بۆچی زمانت لە گومان بردن بە دروستکراوان ناپڕێ؟ ئەی ئەوانەیە بە ڕێگەی دوارۆژ( بە دین) دونیا لە ئەهلی دونیا داگیر دەکەن، ئەی نەزانان بە حەق(عزوجل) ئێوە لەپێشترن بە تەوبەکردن لەو خەڵکە ڕەشۆکییە، ئێوە لەپێشترن لە دانتان بە گوناهدا لەو خەڵکانە، خێرتان لا نییە، قازانج و ڕۆح و ڕزگاری و نوور و دینتان لا نییە، دونیاکەشتان بە سروشت و ئارەزووەوە دەست بۆ دەبەن، دونیا بۆ دونیا دەست بۆ دەبەن، نەك بۆ دوارۆژ، کارم لەگەڵتان و قسەم بۆتان ئاماژە بەوە دەکات، هەمووی روو بە واعیزەکانی سەردەم و شارەکەیەتی، گوێی خۆیان کەڕکرد و خۆیان بێئاگا کرد، کەسیان قسە ناکەن، وەك ئەوەی قسەکە بۆ کەسانی تر بێت جگە لە ئێوە، ئەمڕۆ زمانم کلپەی سەندووە و جەستەم گڕیگرتووە، ئەمڕۆ هۆگری بە غوربەتەوە، و خەڵوەت کلیلی نزیکین، ئەی ئەو کەسەی لە خەڵوەتەکەیدا بێدەنگ بووە، شکۆ و گەورەیی لە بێدەنگبوونداییە لە کاتی دەرکەوتندا، ئەی کوڕی خۆم، خەڵوەت، ئەوجا خۆ ئاشکراکردن، لاڵبوون پاشان قسەکردن، رووکردنە مەلیك پاشان رووکردن لە بەندەکان، یەکێك لە صدیقان دەڵێت: حەڵاڵی بەروالا(رەها) لە رۆحانییەکاندایە، دەتەوێ یەکێك بیت لە رۆحانییەکان دەبێت حاڵت حاڵی رۆحانییەکان بێت، جیاکاری بکەیت لە نێوان پیس و پاك، چرای نهێنیت خۆری مەعریفەی تۆیە، مانگی نزیکیت لە پەروەردگارتەوەیە، حەرام لەباری بوونی نەفسدایە، شوبهەش لەباری بوونی دڵدا، حەڵاڵی ئاوەلا(رەها)ش لەباری پاکی و پاڵفتەیی نهێنیدا، ئەمە

لەودیو ژێرییەوەیە، هەتا نەفس لێرەدا بوونی هەبێت تۆ حەرام دەخۆیت، هەتا دڵ بوونی هەبێت تۆ شوبهە دەخۆی، گەر پاکی و بێگەردی نهێنی هاتە بەرەوە تۆ حەڵاڵی ئاوەڵا (رەها) دەخۆیت، پرسی: بۆچی؟ وترا:

﴿إِنَّ ٱلنَّفْسَ لَأَمَّارَةٌۢ بِٱلسُّوٓءِ﴾ یوسف:٥٣

گوێ نادەی بەوەی لە کوێوە خواردووتە، وەك ژنێکی بەدکار کە بە مێردەکەی دەڵێت:بدزە و خواردنم بۆ بهێنەوە، ئەو جیاکاری ناکات لەنێوان حەڵاڵ و حەرامدا، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((ئافرەتی خاوەن ئایین بهێنە دەستت بە خێردا دەچێت)) [1].

ئافرەتی خاوەن ئایین بۆ کاروباری دوارۆژت کۆمەکت دەبێت، نەفس وەك ئەو ژنە وایە لە ناوەوە، دەیەوێت جیاکاری بکەیت لە نێوان حەڵاڵ و حەرامدا، تەنانەت گەر حەڵاڵی رەهاش بێت و لەبەردەستت ئامادە بێت-با لە کەسابەتی دەستی خۆیشت بێت- لەسەری دەوەستێت، وردبیەرەوە لەوەی دەکرێت بە نان و ئەوەی لێ دەنرێت، با دڵت تکا لە نهێنیت بکات، با نهێنیت پەنا و هانا بۆ خودا(عزوجل) ببات، خودا فریشتەیەك ئاراستەی سەر دڵت دەکات و گەر حەڵاڵ بێت پێت دەڵێت:

﴿كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ﴾البقرة:٥٧،

ئەم ئایەتە بەسەر دڵی تۆدا دەخوێنێتەوە، لەو بارەدا بخۆ، بەڵام گەر حەرام و شوبهە بوو پێت دەڵێت:

﴿وَلَا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ﴾ الأنعام:١٢١،

ئەوە حەرامە و نزیکی مەکەوە، خودا بە خێرتر و باشتر لەوە باربووت بۆ دەکاتەوە، لەبەر دەستی قەزا و قەدەری خودادا(عزوجل) دابنیشە، خۆت رادەست بکە، تا دەستی فەزڵی ئەو رووت لێ دەکات و دەستت درێژ دەبێت بۆ وەرگرتنی بەشی خۆت، زوهد

[1] تقدم تخريجه.

کاری ساتێکە و وەرع کاری دوو سات، مەعریفەش کاری هەمیشەیی و هەتاهەتایی، گەر حاڵی تۆمان بە حاڵی ئەوانەی پێش تۆ بەراورد کرد شتێك لە حاڵ لە تۆدا نابینینەوە، گوێڕایەڵی نەفسی خۆتت کرد و ئەویش زاڵ بوو بەسەرتدا، لە حەزەکان تێرت کرد و لەسەرت پێڕاکێشا، گەر سەرچاوەکانت بڕیبایە بە شکاندنییەوە خەریك دەبووی، بەڵکو لە حەزەکان تێرت کرد و دەرگایەکت لە شەیتانەکەت کردەوە، چونکە لەسەر هیوا و ئاوات رایدەهێنێت، زمانی نییە، بەڵام شەیتانی جێن بۆی هەڵدەدات، تەنها شەیتانی مرۆڤ دەسەڵاتی بەسەر تۆدا هەیە، گەر حەزی جووتبوون لە تۆدا گڕی سەند و زیادەڕەوی کرد و پێڕاکێشا، گەر رەشۆت توندکردەوە و خۆت لەو حەزە گرتەوە و لە دەستبردن بۆ حەرام و شوبوهات داتبڕی هەڵچوونەکەی دادەمرکێتەوە، گەر موباحت کەم کردەوە چەك و تەقەمەنی زیادەڕەوییەکەی دەتوێتەوە و حەزەکانی لێ هەڵدەکەنرێن، درەختی ترس و رجا تیایدا دەڕوێت، تاریکی ناوەوەی رۆشن دەبێتەوە، بەلای دڵەوە دڵنیا دەبێت و بانگی لێ دەکرێت:

﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً ﴿٢٨﴾ ﴾ الفجر: ٢٧-٢٨

کەسی رەشۆکی لە کاتی مردندا بانگی لێ دەکرێت، تۆ لە کوێ و ئەوانە لە کوێ لە خوداوە نزیکن لەسەر دۆشەکی مەجلیسی خودا دانیشتوون:

﴿ وَإِنَّهُمْ عِندَنَا لَمِنَ ٱلْمُصْطَفَيْنَ ٱلْأَخْيَارِ ﴿٤٧﴾ ﴾ ص: ٤٧

دڵت پاك و پالفتە نابێت تا وەك سەگەکەی یارانی ئەشکەوتی لێ نەیەت، شوێنیان کەوت و لەبەر دەرگای ئەشکەوتەکە پاڵکەوت، بەهۆی نزیکی دڵ لە ئامادەبوون هەمیشە چاوەڕوانی هاتنەدەرەوەی ئەوە(سبحانه وتعالی) بۆ لای، بە ئاشکرای شەرعیش لەباری لاوازی ئیماندا روخسەت لە کیتاب و سوننەت وەردەگریت تا ئیمانت بەهێز دەبێت ئەوکات سواری سووربوون و لێبڕان و کارە مەزن و سەختەکان دەبیت، گەر سواری نەفست بوویت لەگەڵ قەدەر و تەبایی قەدەردا دەڕۆیت.

لە کاتی لەداردانی حەلاجدا پێیوترا: ئامۆژگاریم بکە، وتی: نەفست، گەر سەرقاڵی نەکەی سەرقاڵت دەکات.

لە سەرەتای رێگەوە کراسێکم هەبوو نەرم بوو، چەندین جار بردم بۆ بازاڕ کەس لێی نەکڕیم، بردم بۆ لای کەسێك وەك بارمتە(رەهن) لە بری دینارێك لەلای دامنا، تا رۆژی جەژن هات پیاوەکە کراسەکەی هێنایەوە و وتی: ها بیگرە و لەبەری بکە و لە دینارەکەش گەردنت ئازاد بێت، من لێم وەرنەگرت، وتی: وەریبگرە ئەگینا دەیسوتێنم، ناچاری کردم لەبەری بکەم، بۆم دەرکەوت ئەوەی بەشی منە و ناتوانم زوهدی لێ بکەم.

**پرسیاری لێکرا دەربارەی قسەی زانایەك کە دەفەرموێت: ویستمان زانست بۆ شتێکی تر جگە لە خودا فێربین، بەڵام خودا ویستی فێربوونەکەمان تەنها بۆ خۆی بێت.**

**ئەویش فەرمووی:**

ئەم قسە بۆ دۆستانی خودا تیاچوونە، چونکە فێربوون بۆ شتێکی تر جگە لە خودا هاوەڵدانانە، بۆیە دەبێ هەڵبدرێتە سەر رووبەکی تر ئەوەش ئەوەیە مانای ئەو بەشەی قسەکەی "بۆ شتێکی تر" هەڵبدرێتە سەر مانایەکی تر کە بریتییە لە "دوارۆژ"، ئەمەش دیسان ناتەواوییە، ئەوان بەردەوام کاریان بە زانستەکەیان دەکرد تا ئەو زانستە ئەوانی هێنا بۆ لای خودا و نزیکی کردنەوە، ئاشکرایان لە پەنهان و لقیان لە ئەسڵەوە وەرگرت، لەسەر سفرەی خەڵکی رەشۆکی دانیشتن پاشان بە خۆراکی زیادە تایبەت بوونەوە، لە یەك حاڵەتدا دوو خۆراکیان خوارد، بەشداری ئەوەیان کرد بە خەڵکی رەشۆکی دراوە و خواردنی تایبەتیشیان پێدرا، گەر خودا تۆی بۆ کارێك بوێت ئامادەت دەکات، هەرکەس سەرەتای کارم بزانێت و دابنیشێت و نەیەت بۆ لام ئەو کەسە لەڕاستیدا گوناهبارە، گەر یەکێك کەراماتێکی لە خوداناسێك ببینیبایە دەیوت من ئەوەم لە تۆ بینیوە ئەویش پێی دەوت: دەستی خۆتم بدەرێ خودا بکەم بە شایەت بەسەرتەوە تا مردن لای کەس باسی نەکەی، پیاوێکی گەدا چەندین رۆژ بۆ خودا کار دەکات تا لە شەودا نهێنییەك لە خوداوە رووی لێ دەکات کەچی رۆژی لێبوویەوە باسی دەکات، لێوەرگرتنەوەی خودایی لەو پیاوە شتێکی ترە و زانست و کەرامەتیش

شتێکی تر، فەرمان بە خاوەنی زانست و کەرامەت دەکرێت بە شارینەوەیان تا قەزا و قەدەر دێن و فەرمانی پێ دەکەن بە دەرخستنیان لەگەڵ پارێزگاری لە دڵی لەگەڵ حەق(عزوجل)، گەر جوانی و رازاوەیی دونیا کەوتە ناو دڵتەوە لێی رابکە، گومانی تێدا نییە شوێنت دەکەوێت.

**پرسیاری لێکرا و پێی وترا: لە شیرگرتنەوەی نەفس سەخت و دژوارە.**

**فەرمووی:**

لەسەر تۆ سەخت و دژوارە، چونکە لەشیرگرتنەوە، لەشیرگرتنەوە لەسەر منداڵێك سەخت و دژوارە کە تەنها دایکی دەناسێت، بەڵام ئەو کەسەی ژیرە و دەزانێت خواردن و خواردنەوە بخوات لەو شیرە پشتهەڵدەکات کە لە مەمکی دایکییەوە دێتە دەرەوە و وەك چزانی دەرزی تەماشای دەکات، بە خوداوە هەڵبێ و روو لە دەرگاکەی بکە، بەڵکو ببیت بە یەکێك لە دۆستان و هەڵبژێراوانی و دونیات لێبگرێتەوە تا دڵت پاك و پاڵفتە دەبێت لە دونیا و یادی دونیا لە دڵت دەسڕێتەوە و کەنارگیر دەبێت و حەسرەت و پەشیمانی بۆ لەدەستدانی دونیا کۆتایی پێ دێت، و خۆشەویستیت بۆ مەلیك راستدەبێتەوە و جێگەی خۆشەویستی دونیا دەگرێتەوە، تا دڵت بە خۆشەویستی پەروەردگار و هۆگری بە ئەوەوە پڕ دەبێت و هۆکار و ئامرازەکان دەبڕێن ئەوکات دونیا وەك خزمەتکارێك دەهێنن لەگەڵ بوونی زرێپۆشێك لەسەرت و بوونی پاسەوان لەگەڵ پارێزەران، ئەوکات دونیا ژەهرەکەی دەرهێنراوە و بە زمانی موحیبێك دێت و دەڵێت بەشەکەت لە فلان شوێنە، فلان شوێن کچی فلان کەسی لێیە و بەشی تۆیە، هەموو چرکەکانی تەمەنتان لە زیادکردنی دونیادا بەخت دەکەن، شەکەت نەبوون ئەی ئەهلی عێراق؟ ئەی ئەهلی مەملەکەتی دونیا و مەلیك و پۆشاك و والییەکانی دونیا، پۆشاکێکم هەیە لە ماڵێك هەڵواسراوە، کامەم ئەوێت بە سەلامەتی لەبەری دەکەم، روو لە من بکەن، یان سەربازگەلێکتان بۆ دەهێنم سەرەتا و کۆتاییان دیار نییە، والسلام.

وازهێنان زوهدە و وەرگرتن مەعریفە، واز لە قسەی ئەوانە بهێنە پێش ئێوە کەوتن، هەریەکەیان شێخی سەردەمی خۆیان بوون، زاهید خزمەتکاری بەردەستی عاریفە،

هەتا جۆر بوونی هەبێت، پاشەڕۆژ چاکترە لەوەی لە دونیادایە، جۆرێک لە پاشماوەی نەفس و ئارەزوو، ئایا ئەو جۆرە لە وازهێنانت هەیە؟ گەر دڵی ئەوەی وەرگرت کە وەریدەگرێت تا هەمووان لە دڵ ڕۆشتنە دەرەوە و ڕەگ و ڕیشەیان بنبڕ کرا زوهد کۆتایی پێ دێت و مەعریفە دێتە بەرەوە، پاکی و بێگەردی دێتە دەرەوە و لێڵی و لیخنی دەڕوات، نزیکی دێتە بەرەوە و دووری دەڕوات، حەق(عزوجل) دێت و دروستکراوان دەڕۆن، سەبەبکار دێت و هۆ(سەبەب) دەڕوات، ئەوکات دامەزران و جێگیربوونی بۆ دەگەڕێتەوە و لەبەر دەرگای خانەکەیدا دادەنیشێت، فەرمان بە خەڵکی دەکات و نەهییان لێ دەکات، گوناه و یاخیبوونەکانت پێتەوە پەیوەستن، دوژمنان دەست بە ڕیشیاندا دەهێنن، گەر دەتەوێ لوتی دوژمنان لە خۆڵەوە بدەی ئێستا تەوبە بکە و بە دوارۆژتەوە خەریک بە، خودا لەسەر تۆ شایەتە و ڕوو لە هەر کوێ بکەیت ئەو لەگەڵ تۆدایە.

**ئیبن عەتا دەپاڕایەوە و دەیوت:** خودایە، ڕەحم بە غەریبی و نامۆییم بکە لە دونیادا، مردن دوو مردنە: مردنی خەڵکی ڕەشۆکی کە بریتییە لە مردنی ئاسایی زانراو، لەگەڵ مردنی تایبەتان کە بریتییە لە مردنی ئارەزوو و نەفس و سروشت و عادەت، ئەوکات دڵ زیندوو دەبێتەوە، گەر دڵ زیندوو بوویەوە نزیکی دێتە بەرەوە، گەر نزیکی هاتە بەرەوە زیندەگی هەمیشەیی سەرهەڵدەدات، ئەوکات پەردە دەکەوێتە نێوان ئەو و یادی مردنەوە، لە ناوەوەی شتێك هەیە تایبەتە بە ئەو، ئاشکراشی مردن یادی خەڵکی دەخاتەوە، ئەویش لەگەڵیان یادی حوکمی ئاشکرا دەکات، من دەبینم دەروەوتان شایەتی دەدات لەسەر یەکتاپەرستی و ناوەوەتان پێچەوانەی ئەو شایەتیدانەیە، دەبینم ڕووتان لە کەعبە کردووە و دڵتان ڕووی لە درهەم و دینارە، ((هەرکەس بترسێت بە شەو گەشت دەکات)) کوا ترسی ئێوە، خودایە، داوای ڕزگاریت لێ دەکەم، شەیتان ڕوو لە دڵی تاقانەیەکی خودا دەکات لە زەوی خودادا، گوێڕایەڵی بەندەکە دەبێت و دەستەوسانی خۆی رادەگەیەنێت، هەرکات یادی خودا دەکەی تۆ موحیبی، کاتێك یادی خودات بیست بۆ خۆت تۆ دەبیت بە مەحبوب، هەرکات بە زمان یادت کرد تۆ جێگری، کاتێك بە دڵ یادت کرد تۆ سالیکی، بەڵام گەر بە نهێنی

خۆت یادت کرد تۆ عـاریفی، هـەتا ئـەخلاقت پالْفتـە نەکـەی لـە سیفەتە خراپەکان پێویستە لەسەرت هاوەڵی صالْحان نەکەی، گەر پاروویەك یان پۆشاکێك تـۆ بگۆڕێت هاوەڵی صالْحان مەکە، چونکە تێکچوونت لـە هـاوەڵی کردنیـان زاڵ دەبێت بەسەر چاکبوونت، ئەم بێباکییە واز لێ بهێنە و خۆشەویستی بـە هـیچ کـەس و شتێکی تر مەدە جگە لە خودا، هاوەڵی هیچ کەسێك مـەکە جگـە لـە خودا(عزوجـل)، لـە ڕیزی هیچ کەسێکدا مەوەستە جگە لە ڕیزی خودا، هەموو شتێکت لە خۆت تێکەڵ کردووە، ئەی پیستر لە پیسی، ئەی گەمژەی نەزان، یەهودی یان نەصـرانی لـەلای مـن لـە تۆ خۆشەویستترن، دەجال لە خوراسانەوە دێتەدەرەوەی خۆی پاکدەکاتەوە و خۆی بـە فەقیە بۆ تۆ نیشان دەدات، دەجال لـەلات لـە مـن خۆشەویسـتترە، ئـەی بەنـدەکانی خـودا، هەڵبێن بۆ ژیانێکی هەتاهەتایی، هەڵبێن بۆ سەرچاوەیەکی هەمیشـەیی کـە هـەرگیز وشك ناکات، هەڵبێن بۆ بەر دەرگاکەیەك بەهەمیشەیی کراوەیە و داناخرێت، هـەڵبێن بۆ ژێر سێبەرێك کۆتایی پێ نایەت، بۆ لای بەروبوومێك کەم ناکات.

﴿وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلَّا اللَّهُ﴾ آل عمران: ٧

ئەی پەروەردەکاری حەزەکان و چێژەکان، ئەی پەروەردەکاری هەوەس و ئارەزوو، خێر لەودیوی تۆوەیە، بە ئاگری صدق بسووتێ، ویستی ئێمـە پـەردەکان و دەرگاکـان کـون دەکات، بۆیە پەردە لە نێوان ئێمە و تۆدا نامێنێتەوە، تۆش دەبیینی وەك چۆن ئێمە دەبینی، ئەوکات دەچیتە نـاو بەشـەکانەوە، ئـەی بانگەشـەکەری ویلایـەت بانگەشـە مـەکە، چونکە زانستێکە بانگکەرێك لەسەر سەرت ڕادەوەسـتێ و بـلاوی دەکاتـەوە و بـانگی ویلایـەتی تـۆ ڕادەگەیـەنێت، کـردار نـەك گوفتـار، بینـاکردنی نـاوەوە و ئاوەدانکردنەوەی پەیوەستبوونی دڵە بە خوداوە، کلیلی ئەو پەیوەستبوونە بریتییـە لـە نیمان و حەقیقەتی ئیمان، تۆ لەوە هەواڵێکت نییە، دەست بگرە بە پشـتوێنی هەنـدێ لە تاقانەکانی خوداوە، هەندێ لەو بەندانەی نەفسیان کەیشتووەتە خامۆشی و ئارامی. داوای پارووبـەکیان لـێ مـەکـە، بۆئـەوەی واتلیبکـەن پۆشـاکی ئـەوان بپۆشـیت و لەبەردەستیان ڕابوەستی، گەر لەسەر ئەمە بەردەوام بوویت لەوانەیە نزیکت بکاتەوە و هەندێ لە کەلیماتی پوواوی خۆیت پێ بپۆشێت و لـە هـەندێ حالی خـۆی ئاگادارت

بکـات و توانـا و لێبڕانـت دامـەزراو بکـات و مـەقامت پـاك و خـۆش بکـات، تـا هاتووەکانی حەق(عزوجل) بۆ سەر دڵت دەبینی چاوت دابخە و دڵت تەخت بکە، نهێنی ئـەو کەسـە لـەلای کەسـانی تـر بـاس مەکـە، بـەپێی جۆراوجـۆری حـاڵ و مـەقامیان هـاتوو(وارد)ی حـەق روو لـە دڵیـان دەکـات، دەرەوەیـان بـەهۆی گـۆڕانی ناوەوەیـان دەگۆڕێت، پێویستە موریدی ئاگادار بە نهێنی ئەوان خۆی کوێر و کەڕ بکات، خۆی بە مەست و سەرخۆش نیشان بدات، تا ئـەجیبی ئـەو دەردەکـەوێت و ئـەدەبی دێتـە دی، نهێنی ئەو دەشارێتەوە بەڵکو هەندێك لە پۆشـاکی خۆی بکـات بـە بەر دڵیـدا و بـە ئاشکرای داوا لە خودا بکات، دڵی وەك "یوشعی کـوڕی نون"(علیـه السـلام) دەبێت لەگەڵ موسا(علیه السلام).

ئەی گەنج، ئەوەی لەبەر دەسەڵاتی تۆدا نەبێت لە دەرەوەی مەملەکەتی تۆوەیە، جا یان بۆ تۆیە یان بۆ کەسانی تر، ماناکەی ئەوەیە یان بەشی تۆیـە یـان بەشـی کەسـانی تر، گەر بەشی تۆ بوو لە داهاتوودا رووت لێ دەکات لە کاتێکـدا تـۆ خـەوتووی، ئـەم ماندووبوونە کە دینەکەتی تێدا کەم دەکـات لـەپێناوی چییە؟! گـەر لەسـەر بیستنی زانست بەردەوام بیت و لەوەی کە دێت هاوەڵی ئـەهلی دیـن و مەعریفـە و بیر بکـەی ئەوا وازهێنان لە هۆ و ئەرباب لەسەرت ئاسان دەبێت، لەدوای ئیخلاص وازهێنـان لـە کار لەپێناوی دروستکراواندا ریایە، بەڵام گەر بینینی دروستکراوانی وازلێهێنا لەپێناو بەدەستهێنانی ئیخلاص ئەوە جێگەی رجایە، گەر تۆ موریدی پێویستە پابەند بیت بەم حوکمەوە، بەڵکو کردارەکەت بـە زانسـتت بگەیـەنێت و دڵت بخاتـە گـەڕ، و زانسـت فەرمان بە ئەندامەکان و نهێنیت بکات و رێگرییان لێ بکات.

خودایە. هەریەك لە ئێمە تۆمان دەوێت، بەڵام نافەت رێگرییمان لێ دەکات بە تـۆ بگەین.

فەرمانەکانی خودا لەسەر تۆ قەرزن، گەر لەگەڵ توانات هەڵتبژارد ستەمت کردووە، گەر وازیان لێ بهێنیت بێباوەڕ بوویت، بە ئەندازەی پێویستی خۆت لە دونیا وەربگرە، نەك بۆ یاری و زۆرکردن، گەر ئیسلامەکەت بە خۆڕادەست کـردن هاتـە دی و ئەفسی خۆتت رادەستی قەدەری ئەو کـرد دڵت پۆشـتە دەکاتـەوە، پاشـان دەرەوە و نـاوەوەت

پۆشتە دەکاتەوە و لە فلان رۆژدا دەمریت، پاشان زیندووت دەکاتەوە، پاشان پیسی و
پیخێیت لێ دەکاتەوە، هەتا دروستکراوان ببینێت مردووە، هەتا حەق(عزوجل)
ببینێت لە زیندەگیدایە، کاتێک دروستکراوان دەبینێت هەژاری و زەلیلی رووی
تێدەکات و سووک و رسوا دەبێت و عادەت هەلّیدەلوشێت، کاتێک حەق(عزوجل)
دەبینێت دەژی و زیندەگی دەکات و زیندوودەبێتەوە و بەرز و بلّند لێیدەوەستێت، لە
دروستکراوان و نەفس و بوون(وجود) بزر بووە، لەگەلّ حەقدا(عزوجل) دەژی و لە
خەلّکی مردووە، هەرکات موریدێک دێت بۆ لای نووسەری موریدانی راستگۆ فەرمانی
پێ دەکات بە سڕینەوە(محو)، بە سڕینەوەی دروستکراوان و نەفس، پاشان سڕینەوەی
دونیا و دوارۆژ، کاتێک ئەمە تێر و تەواو بوو حەق(عزوجل) وەریدەگێڕێت، ئەو(سبحانه
وتعالی) وەرگێرانی بۆ دەکات بەو جۆرەی خۆی دەیەوێت، گەر بەرزبوونەوە بگاتە ئەم
مەقامە ئەمرت پێویستە واز لە حەرام و شوبهە بهێنیت، کاتێک ئەمەت بۆ تێر و
تەواو بوو واز لە حەلاّلی هاویەش بهێنیت، پاشان وازهێنان لە موباح، پاشان حەلاّلی
رەها کە بریتییە لە کۆکردنەوەی حوکم و زانست، کۆکردنەوەی پەنهان و ئاشکرا[1]،
ئەویش ئەوەیە ناچێتە ژێر دەسەلاّتی بەموڵککردنەوە، وەک ئەو شتانەی لە دەشت و
... و چۆل و بیاباندا دەڕوێن و سەرهەلّدەدەن، ئەو بەشەت بۆ دێت و دەرخواردت
دەدرێت لە کاتێکدا تۆ لە چاوەڕوانی کردن و گرنگی پێدانی ئادیاری، رووت لێ دەکات
و تۆ حەوتویت، دوو چاوی دلّت بکەرەوە فریشتە و رۆحی پێغەمبەران لە دەوری خۆت
دەبینی، زانست فتوایش دەست بۆبردنی دەدات و سەلامەتی نزیکیت لە خوداوە بۆ
دەستەبەر دەکات، راستبەرەوە و خۆت لە دروستکراوان خالّیبکەرەوە، نە رجای ئەوان
و نە مەدح و نە زەم و نە رووالەت و نە مانایان، منەتی خودایت بۆ دێت بە بوژانەوە،
پشت نزیکی و دەولّەمەندی و بەردەوامی هاوەلّیکردن و دووری لە دروستکراو و فەنا
لە بوونت بۆ دێت، لەدوای جێگیرکردن داوای سڕینەوە و لەدوای نەبوون داوای بوون و
لەدوای دووری داوای نزیکی و لەدوای لیخنی داوای پاکی و بێگەردی و لەدوای دابڕان

---

[1] واتە حەلاّلێک حوکمی شەرعی لەگەلّدا(هەندێ جاریش حوکمی بە شەرعی بە "ئاشکرا" ناو دەبات) و زانستی دڵیش(هەندێ جار زانستی دلّ بە "پەنهان" ناو دەبات) فەرمانی پێ دەکات.

داوای گەیشتن و لەدوای بزربوون داوای لیقا لە خودا بکە، تەندروستی دڵ بەبێ زمانە، تەندروستی نهێنی بەبێ دڵە، تەندروستی نهێنی بەبێ بوونە:

﴿ هُنَالِكَ ٱلْوَلَـٰيَةُ لِلَّهِ ٱلْحَقِّ ﴾ الكهف: ٤٤

﴿ ثُمَّ إِذَا شَآءَ أَنشَرَهُۥ ﴿٢٢﴾ ﴾ عبس: ٢٢

گەر بیەوێت بۆ خەڵکی ئاشکرای دەکات، بەهۆی ئەوەوە بەندەکان چاك دەبن و لە خودا نزیك دەبنەوە.

**ئەی پووچ**، ئەی هەوەسباز، هۆیەکان ببڕە و شەرباب لە خۆت بکەرەوە دەگمیە بەرەوە، ئەوەی وازیلێدێنی لەو شوێنە پێشوازیت لێدەکات، هەموو خواردنێك لەسەر سینییە، پزیشکەکە لە خانەی مەحبوب و خانەی نزیکیدایە.

پیاوێك هەستا بابەتێکی لێ بپرسێت پێیفەرموو:

**خۆتبگرە**، دەبینم پرسیارەکەت لە سروشت و ئارەزووەوە دێتە دەرەوە، لەگەڵ من خۆت مەخەرە بەر هەڕەشە، من شمشێربازم، من جەنگاوەرم.

﴿ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفْسَهُۥ ﴾ آل عمران: ٢٨

تۆش ئەی کەسی ڕەشۆکی، خودا بە سزای خۆی تۆ دەترسێنێت، تۆ ئەی کەسی تایبەت خودا لە بە نەفسی خۆی تۆ دەترسێنێ، ئەتۆش ئەی تایبەتی تایبەت خودا بە وەرگێڕانەکان(تقلیبات) تۆ دەترسێنێت، ئەی کەسی ڕەشۆکی دەترسێنێت لەوەی بیستن و بینین و هێز و ماڵ و خانەوادەت ببات و پاشان بتگوێزێتەوە بۆ دوارۆژ و لەوێش بگیرێیت و گیرۆدە ببیت، ئەی تایبەتی تایبەتان دەترسێنێت لە خۆی، بۆیە هەمیشە لەسەر پای ترس بوەستە، بۆئەوەی بێئاگا نەبیت، حق(عزوجل) دڵت خۆش دەکات و پێی دەڵێت: من خودای تۆم، مەترسە و مەلەرزە، گەر ئەمە تێر و تەواو بوو کاتێك لە ترس دەچییە بەرەوە ڕێگریت لێ دەکات، هەرکات لێخن دەبیت ئاسایشت پێ دەبەخشێت، بە ترس ئەو دڵەی پاڵفتە کردووە، گەر دروستی و تەندروستی دڵ تێر و تەواو بوو هەموو ئەوەی لە نێوان ئاسمان و زەویدایە موڵکی ئەو بێت زیانی پێ

ناگەیەنن، ئەمە بە رووالەتکاری و ئاواتخواستن و زۆرلەخۆکردن بەدینایەت، ئەمە بە شایستەگی دێتە دی کە لە ئاسمانەوە دادەبەزێت، کردار بەرزت دەکاتەوە لەگەڵ راستبوونەوەی زوهد لە دڵدا، رەحمەت دادەبەزێت بۆ سەر تۆ و مەجلیسی تۆ، شانازیکردن و زیادەبەخشین پێت بەدوای یەکتردا دێن.

**موریدێك هات بۆ لای حەکیمێك لەبەردەستی دانیشت و پێی وت:** (من ئاوات بۆ شوێنێك لە بەهەشت دەخوازم و داوای هیچ شتێکی تر ناکەم، حەکیمەکە پێی وت: خۆزگە وەك چۆن لە دوارۆژدا بەوەندە قەناعەتت کردووە لە دونیاشدا بەوەندە قەناعەتت بکردبایە)، گەر مردن حەق بێت هەردەبێت ببێت، ئێستا بمرە، مردوو تێکەڵی نییە، مردوو بەخشین و لێگرتنەوەی نییە، مردوو رجا و نەیاری و بەراستزانین و خامۆشی و بێدەنگی بۆ نییە، لە راکێشانی قازانج و پاڵنانی زیاندا وەك ئەو مردووە وابە، مردوو قسە ناکات، پاشان گەر خودا بیەوێت تۆ دەهێنێتە گۆ و لە کاتێکدا تۆ مردووی، گەر لە دروستکراوان و لە خۆت بمریت بە زمانێك قسە دەکەی پاراو بە صدق و حەق، چونکە مردوو تەنها بە حەق و صدق هەواڵ دەدات.

**پیاوێکی صۆفی شتێکی بۆ نووسی، ئەویش فەرمووی:**

ئەمە پووچە، صۆفی لە دروستکراو پاڵفتە دەبێت و نایانبینێت، صۆفی داوادەکرێت نەك داوا بکات.

پیاوێك پێی وت:

گەر خەرقە[1] بۆ پینەکەر بەرین بوو چی بکات؟

فەرمووی:

بە خامۆشی دادەنیشێت و تەبا دەبێت لەگەڵ قەدەر تا قەدەر دێت خەرقەیەك بە ئەندازەی شوێنەکە دەداتە دەستی یان ئەویتری لێوەردەگرێتەوە، گەر کلیلەکەت لێ بزر بوو لەبەردەرگاکە و لەسەر چوارچێوەی دەرگاکە بخەوە، تۆ بەندەی دروستکراوانی

[1] (ئەو پۆشاکەی لە شێخەوە بە مورید دەگات، وەك هێمای پێگەیشتن و مۆڵەت پێدانی).

ئەڵەوییت لە رووتێکردنی ئەواندایە، لاتی و لاوازیت لە پشتتێکردنی ئەواندا، تۆ تیاچوو و هاوەڵدانەری، دڵت لە یەکتاپەرستی خاڵییە، تۆ بەندەی دروستکراوانی و لە خێر خاڵی بوویتەوە، تۆ لە سەرژمێرراوان بەدەری[1]، لە ریزی زانایان و موریدان و مورادان و صالحان بەدەری، گەر شەرم و حەیام لە خودا نەبوایە دەهاتم بۆ بەر دەرگای یەك بە یەکی ئێوە و داوای میوانداریم لێ دەکردن، گوێم رادەکێشا و ئەدەبم دادا، ئەی خۆشەویستی ئەمە ئەو کەسە رسوایە تەماشای دەکات و پۆشاکی ئەوی پۆشیوە.

**هاوار بە حاڵت**، داوای دونیام لێ دەکەی لە کاتێکدا دونیا لە رۆژهەڵاتە و من لە رۆژئاوام، بە یەکتاپەرستی بەشی خۆم لە دونیا وەردەگرم، داوای دوارۆژ و نزیکیم لە حەقەوە(عزوجل) لێ بکە، ئایینی محەمەد(ﷺ) وا دیوارەکانی دەرمێن و بنچینەکانی لەبەریەکتر هەڵدەوەشێن، وەرن ئەی ئەهلی زەوی ئەوەی دەرِوخێ بینای بکەینەوە و ئەوەی دارِماوە راستی بکەینەوە، ئەمە ئەو کارەیە دەبێت ئەنجام بدرێت، ئەی خۆر، ئەی مانگ، ئەی رۆژ، وتیان: بەڵێ، هەندێ لە حەڵاڵ هەیە دەشارێتەوە، بە هاتنی قەدەر بە "بسم الله" دەستی بۆ دەبرێت.

پاشان پاڵی بە کورسییەکەوە دا و دەستی خستە ژێر سەری و چاوەکانی لێکنا و بۆ ماوەیەك لەوێ مایەوە، پاشان دانیشت و فەرمووی:

ئێوە گەمژە و شێتن، داواکەوتنتان لە من زیانۆمەندییە لە سەرمایەدا، بوونی عوزرێك بۆ نەهاتنتان شتێکی ترە، نەك بە هەوەسبازی، با شەرِی شەرِەنگێزان و ملهورِان زاڵ نەبێت بەسەر تۆدا، تۆ بەم نزیکانە دەمریت.

---

[1] (واتە چاکانی خودا، ئەوانەی لە دیوانی پیاواندا تۆمارکراون، کە دەڵێن دیوانی پیاوان ئافرەتانیش دەگرێتەوە چونکە قورئان بە مەریەم(علیها السلام) دەفەرموێت:﴿ يَـٰمَرْيَمُ ٱقْنُتِى لِرَبِّكِ وَٱسْجُدِى وَٱرْكَعِى مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴿٤٣﴾ ﴾ آل عمران: ٤٣، هەروەها دەربارەی دەفەرموێت:﴿ وَمَرْيَمَ ٱبْنَتَ عِمْرَٰنَ ٱلَّتِىٓ أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا وَصَدَّقَتْ بِكَلِمَـٰتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِۦ وَكَانَتْ مِنَ ٱلْقَـٰنِتِينَ ﴿١٢﴾ ﴾ التحريم: ١٢، دیارە وشەی "الراكعين" و "القانتين" بۆ کۆی نێر(جمع مذكر) بەکاردەهێنرێن کە مەریەم بوو بە یەکێك لەوان، واتە دیوانەکە پەیوەست نییە بە رەگەزی نێر و مێوە بەڵکو پەیوەستە بە ئیمان و ئیحسانەوە).

مامۆستای "دار الإمام عزالدين"-کە کوڕی سەرۆکی سەرکردەکان بوو- لە مەجلیسەکەدا ئامادە بوو، خزمەتکاران و شوێنکەوتوانی زۆری لەگەڵ بوو، بەر لەوە لە مەجلیسی شێخدا ئامادە نەبووبوو و لەگەڵ ئەودا کۆبوونەوەی نەبوو، لە کاتی هاتنە ژوورەوەی ناوبراودا شێخ فەرمووی:

هەمووتان خزمەتی یەکتر دەکەن، کێ هەیە خزمەتی خودا بکات؟ هەمووتان دروستکراوی دەستی ئەو بوونەن، ئەی مردوو، ئەی خاك و خۆڵ، دەبێت بە خاك و گۆڕەکەت پێی لێ دەنرێت، لە خاکەوە بۆ خاك، لە لانکەوە بۆ گۆڕ، تۆ حاڵ و هەواڵێکت لەمە نییە، هۆیەکەی ئەوەیە تۆ کەری، گێلێتیت تێدایە، شێتێتیت تێدایە، بەئاگا بێ بەر لەوەی مردن بەئاگات بهێنێت، ببە بە ئامۆژگاریکەری نەفسی خۆت، ماڵەکەت دابەش بکە، تۆ موسافیری بەبێ ئەوەی بتەوێت:

﴿ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴾ الأعراف:٣٤

هەموو ئەوەی تۆ خاوەنیتی دژ بە تۆیە، هەموو ئەوانەی تۆ بە مەزن دەزانن دژ بە تۆن، هەموو ئەوانەی مەزنی و شکۆت دەدەنە پاڵ دژ بە تۆن، دۆستەکەت ئەو کەسەیە ئاگادارت دەکاتەوە، دوژمنەکەت ئەو کەسەیە فریوت دەدات.

خودایە، لە خەوی بێئاگایان بەئاگامان بهێنە، وامان لێ بکە هەندێکمان سوود بە هەندێکمان بگەیەنین، خودایە بە خۆمان و بە تۆوە خەریکمان بکە، تا نەفسمان بێتە راستە، خودایە بۆ خۆت هیدایەتمان بدە و ئەم تەمەنەی کە ماوە لە چاکەدا بەکاری بهێنین.

مەرجی ئامۆژگاری کردنت بۆ خەڵکی ئەوەیە باوەڕدار بیت، نابێت بەندە خەڵکی بۆ لای حەق(عزوجل) بانگ بکات هەتا خۆی بە خودا دەگات نەك چاولێکەری بێت، هاوار بە حاڵی کەسی ناپاك، ناپاکی لە خۆی و پەروەردگار و پێغەمبەرەکەی کرد، فەرمان دەکات و خۆی جێبەجێی ناکات، نەهی دەکات و خۆی لە نەهیلێکراو ناگرێتەوە، دەڵێت و کاری پێ ناکات، چەند لەوەدا نییە دوو شانی خۆت کۆبکەیەوە و

سمێڵت کورتبکەیەوە و روخسارت زەردهەڵبگەڕێت، ئیمان لێرەدایە، (ئاماژەی کرد بۆ ئەوانەی دەوری مامۆستای "دار الإمام عزالدین"یان دابوو)، ئەمە سیفەتی ئەوانە، هەموو ئەهلی خودا لەوانن، لەسەر دڵی کۆڵێك هەیە، دژ بە نەفس و ئارەزوو و ڕێگرانی ڕێگەی خودا دەجەنگن، پێغەمبەرمان محەمەد(ﷺ) دەفەرموێت:

((کۆمەڵێکم بینی لێویان بە گاز(مقەستی ئاسن) دەبڕین، وتم: ئەمانە کێن؟ وتیان: زانایانی ئومەتەکەت))[1].

**خودایە**، هەموان چاك بکە، خودایە بمانگێڕە لە صالحان و خەلکی بە ئێمە ئیصلاح بکە، پێویستییەکانمان تەنها لەلای تۆ بێت و ڕووکردنمان تەنها بۆ لای تۆ بێت.

هەستە دەستت بخە ناو دەستم، بەوە ئاماژەی بۆ مامۆستای "دار الإمام عزالدین" کرد تا هەڵبێین بۆ لای پەروەردگارمان، تا لەم خانە وێرانەوە، لە ماڵ و منداڵ هەڵبێین و کارەکانمان بۆ خودا بێت، بەم نزیکانە دەگەڕێیەوە بۆ لای حەق، پرسیارت لێ دەکات لە کاروکردەوەکانت، ئەو(سبحانه وتعالى) تۆی بۆ یەکتاپەرستی خۆی دروستکردووە، تۆی بۆ دونیا و بۆ دوارۆژ دروستنەکردووە، دونیا تێر و پاراوت ناکات، دونیا فریودەر و فێڵبازە، زیرەکییەکەت بینینی نەفسی خۆتە، ڕوانیت بۆ ڕووی دونیا لە تەگبیری نەفسی خۆتەوەیە و تۆی کردووە بە وەزیری دونیا، باوەڕدار تەگبیربۆکراوە نەك تەگبیرکەر، گەر لە نەفسی خۆت خاڵی بوویەوە دڵت قسەت لەگەڵ دەکات، پاشان نهێنی گفتوگۆتان لەگەڵ دەکات، پاشان حەق سەرۆکاریتان دەکات، ئەوکات دەبێت بە توێشووی بەندەکان و وڵاتان، بەچی ئەم نەفسە کەنارگیر بکەم؟ گەر پیرێك ببینم دەڵێم ئەمە بەدڵ خودای پەرستووە، پێشتر بەندەیەکی صالح بووە، بەرلەوەش کەسێکی فاسق، پێشتریش لاوێك بووە، سەرەتاکەشی منداڵێك بووە، بەمە نەفس کەنارگیر دەبێت و دونیا لەبەر دڵت ناشیرین دەبێت، چاوی دڵت چاودەبڕێتە دوارۆژ و هەڵتدەداتە بەردەرگای نزیکی لە ئەو، دەرگای سوڵتانی ئەو، دەرگای مەزنی و شکۆمەندی و جەلالی ئەو، دوارۆژ لەبەر دووچاوی دڵت بچووك دەبێتەوە، تامەزرۆی دەبیت و لیقای

[1] رواه أحمد والطبراني في "الأوسط".

ئەوت پێخۆش دەبێت، تەماشای دونیا دەکەی و بە ئامۆترین دروستکراوی خودا تەماشای دەکەی، بۆیە دونیا لە دڵت دەچێتە دەرەوە و وەك تەلاقدراوی لێ دێت لەدوای دەرکەوتنی ئەنگی و ناتەواوی، ئەفس خۆی لە دونیا دەگرێتەوە، پاشان دوارۆژ خۆی جوان دەکات و دێتە بەرەوە، پێشینە بۆ ئەنگییەکانی ئاشکرا دەبێت، دەبینێت دوارۆژیش رووداو و دروستکراوە و یەهود و ئەصاراش گەر موسڵمان بن تیایدا بەشدارن، نیعمەتی گەورە و پاڵفتەی بەهەشت نزیکی و هۆگری و گەیشتنە بە خودا(عزوجل)، بەو هەوەسبازانەوە خۆت سەرقاڵ مەکە، دونیایان ئەناسی و داوایان کرد، دوارۆژیان ئەناسی و داوایان کرد، دروستکراوانیان ئەناسی و ئارامی و دڵنییان لەلایان بوو، ئەی خەڵکینە بەئاگا وەرنەوە.

خودا وەحی بۆ یەکێك لە پێغەمبەرانی رەوانە کرد و پێی فەرموو: ئاگاداربە لەپڕ و لەناکاو نەتگرم، لەسەرەتاوە یەعقوب(علیه السلام) بۆ یوسف (علیه السلام) دەگریا، پاشان گەڕایەوە بەسەر ئەفسی خۆیدا دەگریا، ئەو فیراسەتی لە یوسفدا(علیه السلام) کردبوو دەیزانی دەبێتە پێغەمبەر، لە عیصمەتی یوسف دەترسا بەهۆی ئەو جوانی و کەماڵەوە کە تیایدا دەبینرا، (کەڕ و لاڵ و کوێر)، بانگی سەر بۆ ئێوەیە، بەڵام بانگ بە دڵ بوونی نییە، ئەی سووتەمەنی ئاگر، ئەی خەڵکی رەشۆکی، ئەی گەمژینە، ئێوە لە هەوەسبازیدان.

﴿ أَلَآ إِلَى ٱللَّهِ تَصِيرُ ٱلْأُمُورُ ۝٥٣ ﴾ الشوری:٥٣

دەزانن من شوانی ئێوەم، ئێوە لێ دەخورم، من باخەوانی ئێوەم، بۆ ئەم جێگەیە بەرزنەدەبوومەوە گەر زیان و قازانجم لە ئێوەوە تەماشا بکردبایە، لەدوای ئەوەی بە شمشێری یەکتاپەرستی هەمووانم بڕی بەم جێگەیەوە پەیوەستبووم، مەدح و زەم و رووتێکردن و پشتێکردنی ئێوە لەلای من یەکسانە، لام یەکسانە کەسێك زۆر زەمم بکات و پاشان وەربگەڕێ و زۆر مەدحم بکات، هەردووکیان لە خوداوە تەماشا دەکەم نەك لە ئەوەوە، رووتێکردنی من بۆ ئێوە بۆ خودایە، وەرگرتن لە ئێوە بۆ خودایە، گەر بتوانم لەگەڵ یەك بە یەکی ئێوە دەچوومە گۆڕەوە و وەڵامی مونکەر و

ئەکیەم دەدایەوە، ئەوەش وەك سۆز و بەزەیی بۆ ئێوە، گەر خودا بەندەیەك لە بەندەکانی خۆشویست وەجد و شەوقێك بۆ لای خودا هەڵدەداتە ناو دڵییەوە.

حەوت جار قسەی سەرسوڕهێن لە ئەبو یەزیدەوە بیستراوە، قسەگەلێك دەرگای نزیکی لە خوداوە بەڕووی دڵی گوێگراندا دەکردەوە، ئەوانە تەنها پێنج نوێژەکە لەگەڵ مرۆڤ کۆدەبنەوە و نازناویان ئادەمی مرۆییە، وێنەیان وێنەی مرۆڤ و دڵیان لەگەڵ قەدەر و نهێنییان لەگەڵ مەلیك، بەڵام تۆ گوێڕایەڵییەکانت لە روخسار و پۆشاك و دەرەوەت دەبینرێت، کەچی زەندیقییەکەت لە تەنهاییدایە و بێباوەڕییەکەت لە ناوەوە، دڵت پڕە لە دووڕوویی و خۆپەسەندی و گومانی خراپ بەرانبەر خەڵکی، تەنها لە ترسی شمشێر ئەوە نیشان دەدەی، مەگەر تەوبە بکەی و بۆ لای خودا بگەڕێیەوە، شەرع فەرمانی پێکردووین بە بێدەنگی و داپۆشین و شاردنەوە و نهێنی، ئەگینا ئاماژەم پێ دەکردی تاکو بتگرن، پشتوێنم دەگرتی و دەرمدەکردییە دەرەوە، قسەکانمان لە ئاشکرا و دەرەوەی ئێوەدا کار دەکات و دڵمان لە ناوەوەی ئێوە کاردەکات، هەرکەس تۆمەتبارم دەکات و بەدرۆم دەخاتەوە خودا بەدرۆی دەخاتەوە، ئەو لە ماڵ و منداڵ و خانەوادە و شار و وڵاتی جیادەکاتەوە مەگەر تەوبە بکات، هەر نوێژێك دێت دەمەوێت یەکێك لە جێگەی خۆم دابنێم بۆئەوەی نوێژ بە خەڵکەکە بکات، بەڵام کە کاتی هاتنەبەرەوەی نوێژەکە دێت دەگەڕێمەوە بۆ نوێژەکە، هەر بەو جۆرە لە کاتی هاتنی هەر مەجلیسێکدا[1].

خودایە: ﴿وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِ﴾ البقرة: ٢٨٦

دڵخۆش مەبە لەگەڵ ئەوانەی دڵخۆش دەبن، بەڵکو دڵتەنگ بە لەگەڵ ئەوانەی دڵتەنگ دەبن، پێمەکەنە لەگەڵ ئەوانەی پێدەکەنن، بەڵکو بگری لەگەڵ ئەوانەی دەگرین، لەگەڵ خاوەن لێبڕانە باڵاکان بڕۆن، لە دەرگای خودا و لەسەر چوارچێوەی نزیکی لە خوداوە بەشەکانتان بخۆن، تۆ ژیریت نییە، پشت لە دونیا بکە لەوەی بەدەستدێت، گەر ماڵ و منداڵ لە گەردنت بوو بۆ ئەوان لە دونیا وەربگرە نەك بۆ خۆت.

---

[1] (واتە دەمەوێ ئێوە و ئەم شارە بەجێبهێڵم بەڵام خودا سوێندتم بادات ئەو کارە ئەنجام بدەم).

پێغەمبەر(ﷺ) صەدەقەکانی وەردەگرت و بەسەر هەژاران و گەدایان و تێکۆشەراندا دابەشی دەکرد، پاشان دەهات بۆ ژووری ژنەکانی و دەیفەرموو: ((ئایا دەرگایەکمان لێکراوەتەوە؟ شتێکمان بۆ هاتووە؟ گەر بوترایە: نەخێر، دەیفەرموو: کەوابوو من ئەمڕۆ بەڕۆژووم))[1].

بە نەبوونی خواردن رایدەگەیاند ئەو دەیەوێ بەڕۆژوو بێت، ئەولیاش بە هەمان شێوەن، ئەو هەندێ جار لە گەرمای بەتینندا سەردەکەوێت بۆ سەربانی ماڵەکەی بۆ ئەوەی لەوێ بخەوێت، لەسەر پێپلەکانەکە دەرگایەک دەبینێت دەزانێ مەبەست پێی نووستنە لە ماڵەکەیدا، یان دەبینێت دەرگای ماڵەکەی کراوەیە دەزانێت مەبەست پێی دەرچوونە بۆ دەشت و سارا و چۆڵەوانی، بۆیە دەچێتە دەرەوە، ئەم پێغەمبەرایەتییە لەناو دروستکراواندا بەردەوامە، ئاسار و سوودەکان و ماناکەی بەسەر دڵی ئەولیادا دابەشبوون، پێغەمبەرایەتی وەك خواردن و خواردنەوە بوو ئێستا بەرماوەی ئەوان بۆ ئێمە ماوەتەوە[2]، لەلام بچنە دەرەوە ئەی حەرامخۆران و سووخۆران، من قازی نین، من پەروەردەکەری یەکتاپەرستی و ئیخلاصم، من چی بکەم لە زۆری ئێوە، سوودێکتان تێدا نییە، کارەکانتان لە روخسارتاندا بانگ بەسەر ئێوەدا هەڵدەدات خێرین یان شەڕ بن، بێدەنگی خێرە، چاوەڕوانی دەکرێت بەڵکو ئەوە بسڕێتەوە لە روخسارت، بەڵکو خەڵوەتەکەت گۆڕانی بەسەردا بێت و رەشێتی روخسارت بسڕێتەوە.

**پیاوێکی ئەهلی شار لە حەج گەڕایەوە و هات بۆ لام و پێیم وت:** تەوبە بکە و بۆ لای خودا بگەڕێوە، ئەویش وتی: من لە حەج بووم! پێیم وت: دەزانم، بەڵام زینا و فیسق و فجور بوونی هەیە و تەوبەی لێ نەکراوە، کاتێك مرد لە کاتی نوێژەکەیدا بینیم لە تابوتەکەی هاتە دەرەوە و دەستی بە پشتوێنەکەمەوە گرت، پێیم وت: من لەمە ئاگادارم کردی، لەوەی بانگەشەی دەکەن درۆ و بوختانتان بێ سنوورە، شێخێکت

---

[1] صحیح، رواه النسائي في "الكبرى" والحميدي في مسنده.

[2] (ئەم قسانە لە ئەوپەڕی گرنگی و ئەوپەڕی ترسناکیدایە و تەنها گەورەیەکی وەك شێخی گەیلانی دەتوانێت بیانکات).

هەیە و ئەو بۆ تۆ دەبێت، با ئەوە بۆ ئەو بێت، تا نووسراوێکت پێ دەدات کارە بچووکەکانت قورس دەکات، بۆئەوەی لە کاری چاکە و خێر لاواز نەبیت، ئەوە لە کاتی مردندا دەخوێنرێتەوە، لە کاتی خوێندنەوەی نووسراوەکەتدا دەبینرێت، لەو ڕۆژەدا رجای شفاعەتی ئێوە دەکەم، ئەوە هاوەڵدانانە، یەکتاپەرستی کە لە منداڵییەوە پەروەردەم کردووە لەو ڕۆژەدا لەدەستی دەدەم، دەرگایەکی کراوە داخستنی لەسەر من پێویستە، من ئێوەم لەبیرکردووە، نە خۆشەویستی و نە ڕێز.

**لە مەجلیسەکەدا پیاوێك هاواری لێ بەرزبوویەوە و وتی: الله.**

ئەویش پێی فەرموو:

لە داهاتوودا پرسیاری ئەوەت لێ دەکرێت، لەسەری دادگایی دەکرێت، پێت دەوترێت: بۆ ئەوەت وت؟ ئایا بە ریا و دووڕوویی وتت یان بە ئیخلاصەوە یان بە هاوەڵدانانەوە؟ ئەمڕۆ ڕۆژی چەکوشکارییە، کێ دەیەوێ با بڕواتە دەرەوە و کێش دەیەوێت با بمێنێتەوە.

پاشان هاوارێکی لێ بەرزبوویەوە و هەستایە سەرپێ و خەڵکێکی زۆر هەستانە سەرپێ بۆ لای، تەوبەیان دەکرد و هاواریان دەکرد و دەگریان، لەناکاو چۆلەکەیەك هات، لەسەر سەری شێخ نیشتەوە، ئەویش سەری خۆی نەوی کرد، بەو جۆرە لەسەر سەری مایەوە، خەڵکی لەسەر پلەکانی کورسییەکە بوون و هاوار لە دەوروبەری بەرزدەبوویەوە، کەچی چۆلەکەکە شوێنەکەی خۆی بەجێنەدەهێلا، تا یەکێك لە هاوەڵانی شێخ دەستی بۆ درێژ کرد و چۆلەکەکە فڕی، خەڵکی بە گریان و دوعا و تەوبەکردن و وەجد و پۆشاک فڕێدانەوە هاواریان لێ بەرزبوویەوە، پاشان شێخ فەرمووی: ئەم سەردەمە ئاخر زەمانە.

خودایە، ئێمە پەنات پێدەگرین لە شەڕی ئاخر زەمان، شتێك لە ئاسۆوە خۆی نمایش دەکات هیواخوازم لێی هەڵبێم، بەڵام لەگەڵ قەزا و قەدەردا تەبایە.

با دونیا دینت لەدەست نەدات، ئاوی ڕوخسارت بپارێزە، کەسابەت بکە بۆ کۆکردنەوەی خەم و پەژارەکانت، ئەوە دەرگای وەرگرتنە لە خوداوە، بەوە لە

دروستکراوان بێنیاز ببه، هۆ لەگەڵ هۆکاردا قسە دەکات، دەرەوە قسە لەگەڵ ناوەوە دەکات، ماندووبوون کۆتایی پێهاتووە یان لە شتێك لە تێهەڵچوونەوە و دەستپێکردنەوە، هەستە با بچین بۆ لای سەبەبکار، بچین بۆ سەرچاوەکە، بچین بۆ لای ئەسڵەکە، تەقە بدەین لە دەرگاکانی قەزا و قەدەر، لەسەر دەرگای زانست بوەستین، لەسەر دۆڵی فەزڵ بوەستین، لەسەر روباری پاراوکەر بڕۆین، بچین بۆ سەرچاوەی روبارەکە، خوداناسان هەڵقوڵانی ئاوەکەیان بینی کە لەژێر شاخێکەوە هەڵدەقوڵا، لەو شوێنە دانیشتن و رەشماڵیان هەڵدا، بەش و چاودێرییان بۆ هات، هیدایەت و مەعریفەتیان بۆ هات، زانستەکانیان بۆ هات، دەرگای جۆراوجۆرمان هەیە، بەوە دەچینە ژوورەوە، تۆ پێویستە ئەدەب بپارێزی.

**ئیبراهیمی خەواص(رەحمەتی خودای لێ بێت) فەرمووی:** چەندین رۆژ لە دەشت و سارا مامەوە، لەو ماوەدا هیچ کەسم نەبینی، گەڕان و رۆیشتن بردمی بۆ شوێنێك کە تیایدا نامۆیی دایگرتمەوە، لەناکاو لەو جێگە گەنجێکم بینی بەپێوە وەستابوو، پێی سەرسام بووم و پێم وت: تۆ لە کوێوە هاتووی؟ وتی: ئەو، پرسیم: بۆ کوێ دەچیت؟ وتی: ئەو، پێم وت: گەر راست دەکەیت نەفسی خۆت بکە بە فیدای، هاوارێکی لێ بەرزبوویەوە و بەربوویەوە بۆ سەر زەوی، چوومە پێشەوە بۆ لای بینیم گەنجەکە مردبوو، پشتم لێهەڵکرد بۆ ئەوەی هەندێ بەرد بهێنمەوە بەهۆیەوە جەستەکەی بشارمەوە، کاتێك گەڕامەوە بۆ لای جەستەکەم نەبینییەوە، بەهەشتی بۆ گەڕام نەمبینییەوە، دۆزەخی بۆ گەڕام نەمبینییەوە، وتم: ئەمە دەبێ لە کوێ بێت؟! گوێم لە بانگکەرێك بوو دەیوت:

﴿ إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَنَهَرٍ ﴿٥٤﴾ فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ عِندَ مَلِيكٍ مُّقْتَدِرٍ ﴿٥٥﴾ ﴾ القمر: ٥٤-٥٥

ئەی هەوەسباز بێئاگا مەبە، لە دەرگای خۆیەوە بچۆ ژوورەوە، لە دەرگای گەورەپیاوانی خاوەن فەناوە بچۆ ژوورەوە، ئەو گەورەپیاوانەی لە گوێڕایەڵی خودا و عیبادەتدا فەنا بوون، بوون بە مانا، بوون بە هامنشینی خانەی نزیکی لە خوداوە(عزوجل)، بوون بە میوانی مەلیك(عزوجل)، بەیانیان جۆرە خوان و سفرەیەك و

نیواران جۆرە خوان و سفرەیەکیان بۆ رەوانە دەکرێت، چەندین جۆری پۆشاکیان لەبەر دەکرێت، بە مەملەکەتی مەلیکدا گەشتیان پێ دەکرێت، بە زەوی و ئاسمانەکانی خودادا گەشت دەکەن، لەناو نهێنی و مەعریفەی خودایدا سەفەر دەکەن، تۆ لەودیو دیوارەکەوە، فەرسەخێك[1] پانتاییەکەیەتی، تۆ دەرزییەکی چۆن دەتوانی ئەو دیوارە کون بکەی، خوداناسان کاتێك گەیشتن بە دیوارەکە هەزار دەرگایان بۆ دەکرێتەوە، هەریەکێك لەو دەرگانە بانگیان لێ دەکات بۆ ئەوەی لەوێوە بچنە ژوورەوە، نیعمەت وەربگرە هەڵبێ بۆ لای خاوەن نیعمەت، با نیعمەتەکە کۆت و بەندت نەکات، واز لەو نیعمەتە و ئەوانەش بهێنە کە نیعمەت کۆت وبەندی کردوون، تەماشای رووی نیعمەتەکە بکە، بزانە ئایا نیعمەتە یان نەقمەت(سزا) یان رەحمەت؟ بە رواڵەت فریو مەخۆ، خاوەن نیعمەتی تێدا لە یاد مەکە، تەماشای راست و چەپ مەکە، چاوت لە خاوەن نیعمەت لامەدە، لەدەستی دونیا وەرمەگرە و مەخۆ، لەوانەیە ژەهراوی بێت، گەر خواردنێکیان بۆ هێنای تەماشای دوو وەزیرەکەت بکە، قورئان و سوننەت، با موفتییەکانیش فتوات بۆ بدەن، گەر دژ بە نەفست تێکۆشای و سەرپێچیت لێکرد لادەکات بە لای دڵەوە و دەچۆڕێتە تێی، هەردووکیان دەبن بە یەك شت، قسەی لەگەڵ دەکرێت و بانگی لێ دەکرێت:

﴿ يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ (٢٧) ﴾ الفجر: ٢٧

ئەوکات نەفس هەواڵێکی لە دڵ دەبێت، دڵیش هەواڵێکی لە نهێنی دەبێت، نهێنیش هەواڵێکی لە حەق(عزوجل) دەبێت، مافی وەرع بدە و پاشان بخۆ و گوێ مەدە بە هیچ شتێك، مافی تەقوا بدە و پاشان بخۆ و گوێ بە هیچ شتێك مەدە، هەروەها فەرمووی: خودایە، ئێمە تۆمان بە مەرام و مەبەست گرتووە، ئێمە مورید و شاگرد و موحیب و داواکەری تۆین، دێین بۆ لای تۆ و ماڵ و منداڵ و خانەوادە و وڵاتمان بەجێهێلاوە، خودایە، شەرمەزارمان مەکە، خەریکبوون بە غەیری خوداوە یارییە، خەریکبوون بە نەفسەوە یاخیبوونە، خەریکبوون بە دروستکراوانەوە خواربوونەوەیە لە دەرگای

---

[1] (فەرسەخێك نزیکەی سێ میلە لە دووری).

ئەو(سبحانە وتعالى)، هەندێ ئەولیا هەن فریشتە سوژدەیان بۆ دەبات و دەستیان دەبەن دواوە بۆ ڕێزلێنانی، هەندێك ئەولیا هەن فریشتە دەبینن، (ئەو پیاوە صالحە کە لە مزگەوتی شام دانیشتووە بە برسێتی لە نەفسی خۆیدا وتی: خۆزگە ناوی مەزنی خودام بزانیبایە، بینی دوو کەس دابەزین و لە تەنیشتییەوە وەستان، یەکێکیان بەویتریانی وت: دەتەوێ ناوی مەزنی خودا بزانیت؟ وتی: بەڵێ، پێی وت بڵێ: "الله"، پیاوەکە دەڵێت: لە نەفسی خۆمدا وتم: منیش ئەوە دەڵێم، یەکێك لە دوو کەسەکە پێی وتم: ئەوە بەو جۆرە نییە، ئێمە دەمانەوێت بڵێیت "الله" و لە دڵی تۆدا هیچ کەس و شتێك جگە لە خودا بوونی نەبێت، پاشان لە تەنیشتمەوە بەرزبوونەوە بۆ ئاسمان)[1]، با ئاشکرات لەناو دروستکراواندا بێت و دڵت لە دوارۆژ و نهێنیت لەگەڵ حق(عزوجل)، گەر دەتوانی لە دونیا و دوارۆژ وەرە دەرەوە، ئەگینا بە سەلامەت پێچ ناکەیەوە، بەرەو چۆڵ و دەشت و بیابان هەڵبێ، لە خەڵوەت و بیابان و چۆڵەوانیدا ئیمان بەدەست بهێنە، پاشان بچۆ ژوورەوە بۆ لای دروستکراوان، لە خەڵوەتدا و بەر لە ڕێگەی چوونە ناو خەڵك داوای هاوەڵێك بکە، لەدوای قسەکردن وەردەگرن، بەسەر کەسانی تردا پەرش و بڵاو و دابەشی دەکەن، ئەوان لەگەڵ مانادا ڕاستبوونەتەوە، بە وەرگرتن لە تۆ خێر و صەدەقەت پێ دەکەن، مورید لە خوداوە(عزوجل) وەردەگرێت، عاریفیش لە دروستکراوانەوە، عاریف لە دروستکراوان وەردەگرێت چونکە کارکەر و زانا و زیرەکە و نوێنەری مەلیکە، لە دروستکراوان وەردەگرێت بۆ کەسانی تر جگە لە خۆی، خواردن و خوانی ئەو لەگەڵ مەلیکە و لەبەردەستی ئەودایە، لەو دیو دەرگا و پەردەکانەوەیە، حەزەکانی لەژێر پێ داناوە، دروستکراوانی لەژێر پێ داناوە، عەساکەی موسا(علیه السلام) هەموو شتێکی هەڵدەلوشی کەچی گۆڕان و ئاڵوگۆڕی بەسەردا نەدەهات، گەر لەسەر دەستی من سەرفرازی بەدەست نەهێنیت هەرگیز سەرفرازی بەدەست ناهێنیت، فێرت ناکەم بۆ سفرە و خوان و سینی خواردن، لە ترسی سوڵتان و دەسەڵاتت عەسات لەسەر هەڵناگرم، کارێك هەیە لە من سەرقاڵی کردووی، ئەو کارە بووە بە شوومی لەسەر خۆت و ماڵ و منداڵت، بەم نزیکانە شوومی تۆ بەوانیش دەگات و دەکەونە سواڵ کردن، کەسی صالح

---

[1] (ئاماژە بە پیاو چاکێك دەکات لە مزگەوتی شام نیشتەجێ بووە و ئەو ڕووداوەی بەسەرهاتووە).

ماڵ و منداڵی رادەستی خودا دەکات و تەوەکول بەو دەبەستێت، بەڵام کەسی دووڕووی بەدکار ماڵ و منداڵی دەداتە دەست درهەم و دینار و ئەوەی بەجێیهێڵاوە لە خانووبەرە و پیشە، گومانی تێدا نییە سەرئەنجامەکەیان بۆ لای هەژارییە، تۆ کەسێکی نەزان و خەمڵێگیراو و نەفرەتلێکراوی، خۆشەویستی گوێرەکەی دونیا چڕاوەتە ناو دڵتەوە.

خودایە، ئەوەی داوای دونیای کردووە بۆ یارمەتیدانی لەسەر دین رۆزی بدە، هەروەها رۆزی ئەو کەسە بدە دوارۆژی بۆ رووی پاکی تۆ داواکردووە، خودایە هەرکەس دوارۆژی بە ریا داواکردووە رۆزی مەدە، خودایە ئەو کەسەی دونیای بۆ دونیا داوا کردووە رۆزی تەدەی، چونکە ریا و دونیا پەردەن لە نێوان تۆ و بەندەکانت، خۆزگە یەکێك لە ئێوە سەرفرازی بەدەستبهێنابایە، ئێمەش دەستمان بە پشتێنەکەیەوە دەگرت، سبەینێ گەر پیاوێکی صالح هات بۆ لام پێی دەڵێم: گەر سبەینێ شتێکت هەبوو هاوەڵیمان بکە و لە بانگهێشکردنەکەت ئێمەش بێبەش مەکە، خۆ گەر ئێمە شتێکمان هەبوو تۆش بەشێکت لێیەوە دەست دەکەوێت، قسەکانم بە پوختی و پاڵفتە وەربگرن، ئەك بۆ مانایەك، ئەوکات سەرفرازی بەدەست دەهێنن، گەر ئەمە راست بوو ئێوە و منیش سەرکەوتن بەدەست دەهێنین، گەر بە دژی ئەوە بووم ئێوە سەرکەوتن بەدەست دەهێنن و من زیانۆمەند دەبم، دروستکراوان سیانن: فریشتە، شەیتان، مرۆڤ، فریشتە هەموو بوونی خێر و چاکەیە، شەیتان هەموو بوونی شەڕ و خراپەیە، مرۆڤ تێکەڵەیەکە لە خێر و شەڕ، گەر خێر زاڵ بوو بەسەریدا دەچێتە خانەی فریشتەکانەوە، گەر شەڕ زاڵ بوو بەسەریدا دەچێتە خانەی شەیتانەوە.

خەڵکینە، ئیسلام دەگری و دەستی لەسەر سەر داناوە و پەنا و داڵدە داوا دەکات لەدەستی بەدکاران، لەدەستی لادەران، لەدەستی ئەهلی بیدعە و گومڕایی، لە دەستی ستەمکاران، ئەوانەی پۆشاکی درۆ و ناپاکییان پۆشیوە، ئەو بانگەشەکەرانەی خاڵین لە بانگەشەکەیان، تەماشای ئەوانە بکە پێش تۆ کەوتن، تەماشای ئەوانە بکە لەگەڵ تۆ بوون، فەرمانیان دەکرد و نەهییان دەکرد و دەیانخوارد و دەیانخواردەوە، بەڵام ئێستا وەك ئەوەی بوونیان نەبووبێت، چەندە دڵی تۆ رەقە! سەگ لە راوکردن و پاسەوانی کشتوکاڵ و مەڕوماڵاتدا گوێڕایەڵی

خاوەنەکەی دەبێت، کاتێک خاوەنەکەی دەبینێت کلکەلەقێی بۆ دەکات، شێوان پاروویەک یان دوو پاروو یان چەند پاروویەک هەڵدەداتە بەردەمی، خواردنێکی زۆر کەمی پێ دەدات، تۆ نیعمەتەکانی خودا دەخۆی و لێیان تێر دەبیت، بەڵام ئەوەی لێت داواکراوە پێی نادەی، مافی خۆی پێ نابەخشی، فەرمانەکانی ڕەد دەکەیەوە و سنوورەکانی ناپارێزیت.

**ئەی گەنج**، لە هەژاری و ئارامگرتن و سەلامەتی لامەدە، لە هەژارییەکەتدا کۆمەکی لە خودا(عزوجل) داوا بکە، دەوڵەمەندی گومڕاکەر و لەبیربەرەوەی پەروەردگارە(عزوجل)، ژیانی دونیای هەڵبژارد، ئارەزووی خۆی بەسەر خودادا هەڵبژارد، نەفس و سروشتی بەسەر فەرمانی خودادا(عزوجل) هەڵبژارد، ڕۆژووشکاندنی بەسەر ڕۆژووگرتندا هەڵبژارد، حەرامی بەسەر حەڵاڵدا هەڵبژارد، بێئاگایی بەسەر ئاگاهیدا هەڵبژارد، یاخیبوونی بەسەر تەوبەدا هەڵبژارد..

**هاوار بە حاڵت**، عەورەت و تەنگییەکانت بەدەرکەوتوون شەرم لە خۆت بکە، لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی:

((گەر بە پیاوێک ببیستی باشترە لەوەی بێیت بۆ لای، گەر بێیت بۆ لای باشترە لەوەی هەواڵی پێ بدەی، گەر هەواڵت پێدا خۆی و کارەکەیت بێزراو و قێزەون کردووە))[1].

ئەم سەردەمە کاریگەرە، زۆرینەی خەڵق کەوتوونەتە ناو ئولفەتەوە، پێویستە لەسەرت بەرەو پەنهان و ناوەوە ئاشکرا و رووالەت ببریت، ویرانە کلیل بدە، دارێکی پواوی ڕەق و تەق تەنها بۆ سووتان باشە، باوەڕدار لە دونیادا مەلیکە و لە دوارۆژدا مەلیک، بە گوێڕایەڵی خودا(عزوجل) کاری کردووە و وازی لە یاخیبوونەکان هێناوە، ئەو لە خەڵوەت و تێکەڵبوونیدا تەنهایە، ڕقی لە دونیایە و تەڵاقیداوە، دونیا بەدوایدا هەڵدێت و تکای لێ دەکات، پێی دەڵێت: کوڕی خۆم خواردن و خواردنەوەکەت بخۆ، ئەویش دەڵێت: ناخۆم تا نەگەمە دەرگای دوارۆژ، لەوانەیە خواردن و خواردنەوەی تۆ ژەهراوی بن، دایکی من ئەوەی لاتە لێمی بەدووربگرە تا دەگەمە خزمەتی قارەمانی

[1] لم اجد له اصلا.

دوارۆژ[1] ، گەر دوارۆژ هات و خواردنەکەی دەستی تۆی پشکنی قبووڵی دەکەم و بۆنی دەکەم، ئەوکات لە دەستی دونیا دەخۆم، دوارۆژ تۆ دەبات بۆ لای، لە خواردنەکەی دەرخواردت دەدات و لە خواردنەوەکەی پێت نۆش دەکات، لە نێوان تۆ و دونیادا دەرگا دادەخات، لە کاتێکدا تۆ بەو جۆرەی دەستی غیرەت لە تەسبیحی دەستی عیززەت لە تۆدا دەتگرێت، پێت دەڵێت: ئەم دڵنیایی و سوکنایییە چییە بۆ لای کەسانی تر جگە لە من، ئایا ئەوانە دروستکراون نین؟ ئایا ئەوانە بەدیهێنراو نین؟ بۆ بەر لە خانەکە نەهاتی بۆ لامان، فێرمدەکردی و پۆشتەم دەکردییەوە و هۆگریم پێدەبەخشی و خۆراکی دژەژەهرم پێ دەدایت و زرێپۆشی سەرکەوتن و وەرع و پارێزگاریم پێ دەپۆشیت، ئەوکات بە هاوەڵی خوداوە دەچوویە دەرەوە بۆ ناو دونیا، ئەوکات سەکۆیەکی بۆ دروست دەکردی لەسەری قسەت لەگەڵ ئەهلی دونیا و دوارۆژدا بکردبایە، چی بە ماڵەکەت دەکەی، "تا"ی ساتێکت لە کۆڵ دەکاتەوە مردنت بۆ دێت و لە کۆڵی تۆی دەکاتەوە، لەوانەیە ئەوە دوای ساتێك بێت، پەیوەست بە پیاوانی حەقەوە، ئەوان کۆمەڵێك شێتیان هەیە لە دەریای دونیادا نوقم بوون، چارەسەری نەخۆشەکان دەکەن و نوقمبووەکان ڕزگار دەکەن و بەزەییان بە ئەهلی سزادا دێتەوە، گەر ناسیوتە لەلای ئەو بە، گەر نەتناسیوە گوناهەکە لە نەفسەوەیە، قەدەر بەڕووی ڕازیبوواندا بە قەزا پێدەکەنێت و دەستیان دەگرێت و دەیانبات بۆ لای مەلیك و تەقە دەدات لە دەرگا و نزیکیان دەکاتەوە لە مەلیك، ئەوکات ئەوان دەبن بە حیزبی خودا، ئەم هەوەسبازییەت لە چییە، بنەڕەتی ئەمە کەماڵە، لەگەڵ قەدەر تەبا بن، کێبەرکێ و ململانێی لەگەڵ مەکەن و هەوڵمەدەن زاڵ بن بەسەریدا، تەبایی، تەبایی.

**یەحیای کوڕی مەعاز دەڵێت:** قسەی صدیقانی ڕاوەستاو لە مەقامی پێغەمبەراندایە، ئەوان ئەبدالن بۆ پێغەمبەران و پارێزگاری نهێنییان وەك پارێزگاری پێغەمبەران وایە لە وەحی، قسەکانیان دەربارەی خودا و بە خوداوە و لە پێناوی خودادایە، لە گۆڕستانێك دابنیشە و قسە لەگەڵ مردووان بکە: چیتان بەدەست هێنا؟

[1] (وشەی قارەمان ساتای ئەمینداری مەلیکیش دەگەیەنێت).

بۆ کوێ چوون؟ خانەوادە و ماڵ و خانوو و سەروەت و سامان و گەنجێتی و هێز و فەرمانکردن و نەهی کردن و وەرگرتن و پێدان و خۆشەویستیتان و حەزەکانتان چی لێ هات و لەکوێیە؟وەك ئەوەی وەڵامت بدەنەوە و پێت بڵێن: پەشیمانین لەوەی ئەنجامماندا و لەدوای خۆمان بەجێمانهێڵان و خۆشحاڵبووین بەوەی پێشی خۆمان خست، کاتێك دەتەوێت زیارەتی گۆڕستان بکەی خاڵی بە لە دۆست و هاوەڵ، گۆڕستانەکەش خاڵی بێت لە ژنان و پیاوان، خەڵکانێکی ژیرمەند بن ئێوە بەم نزیکانە دەمرن.

**رۆژێك جەنازەیەك هێنرا ژوورەوە بۆ مەجلیسەکەی فەرمووی:**

ئایا ئێوە ئەم مردووە دەبینن، کاتێك مەرگ دەرگای پێگرت و سەرسامی کرد و هۆش و ژیری لێسەندەوە تا وای لێهات یەکێك لە کەس و خزمە نزیکەکانی خۆی نەناسییەوە، مەعریفەش بەهەمان شێوەیە، کاتێك روو لە دڵ دەکات سەرسامی دەکات تا وای لێ دێت تەنها خودا (عزوجل) دەناسێت.





# باسی مردنەکەی ( خودا لێی رازی بێت )

لە نەخۆشی مردنەکەیدا عبدالوهاب داوای وەسێت و ئامۆژگاری لە باوکی کرد، ئەویش فەرمووی:

دەست بە تەقوای خودا و گوێڕایەڵی خوداوە بگرە، لە کەس مەترسە و رجات لای کەس نەبێت، هەموو پێویستییەکان رادەستی خودا(عزوجل) بکە، لەوی داوا بکە، تەنها متمانەت بە خودا بێت، تەنها شان لەسەر خودا دابدە، یەکتاپەرستی، یەکتاپەرستی، یەکتاپەرستی، سەری هەموو شتەکان و کۆکەرەوەی هەوان بریتییە لە یەکتاپەرستی.

**هەروەها لە نەخۆشی مردنەکەیدا فەرمووی:** کاتێك دڵ لەگەڵ خودا(عزوجل) راست و دروست بوو لە هیچ شتێك خاڵی نابێت و لە هیچ خاڵی نابێتەوە، من کرۆکم نەك توێکڵ.

**هەروەها بە منداڵەکانی خۆی فەرموو:**

لێم دووربکەونەوە، من بە دەرەوە لەگەڵ ێوەم و بە ناوەوە لەگەڵ کەسانی ترم، نێوان من و ێوە و هەموو دروستکراوان وەك دووری نێوان ئاسمان و زەوی وایە، من پێوانە مەکەن بۆ سەر کەس و کەس پێوانە مەکەن بۆ سەر من.

**هەروەها فەرمووی:**

کەسانی تر جگە لە ێوە لەلای من ئامادەبوون، جێگەیان بۆ بکەنەوە و لەگەڵیان بەئەدەب بن، لێرەدا بەزمییەکی مەزن بوونی هەیە، جێگەکەیان لێ بەرتەسك مەکەنەوە.

**هەندێ لە کورەکانی هەواڵیان پێدام کە شێخ فەرموویەتی:**

**وعلیکم السلام ورحمة الله وبرکاته، غفر الله لي ولکم**، خودا تەوبە لە من و لە ێوەش قبووڵ بکات، "**بسم الله غیر مودعین**" شەو و رۆژێك ئەوەی فەرموو، هاوار بۆ

ئێوە من گوێم لە هیچ شتێك نییە، نە بە فریشتە و نە فریشتەی گیانكێشان، ئەی فریشتەی گیانكێشان كەناگیر بە لە ئێمە، كێ جگە لە تۆ سەرپەرشتیمان دەكات؟ هاوارێكی زۆر گەورەی لێ بەرزبوویەوە، ئەوەش ئەو رۆژە بوو كە تیایدا لە شێواندا كۆچی دوایی كرد.

یەكێك لە كوڕەكانی پرسیاری ئەو حاڵەی لێكرد كە تێیدا بوو، ئەویش فەرمووی: كەس دەربارەی هیچ شتێك پرسیارم لێ نەكات، من ئا ئەوەم، لە زانستی خودادا(عزوجل) هاتووچۆ دەكەم.

بە عبدالجباری كوڕی فەرموو:

تۆ خەوتووی یان بەئاگا، لە مندا بڕن بەئاگادێنەوە.

بۆ لای چوومە ژوورەوە دەستەیەك لە كوڕەكانی لەلای بوون و عبدالعزیزی كوڕی شتی بۆ دەنووسی، فەرمووی: بیدە بە "عفیف" با ئەو بینووسێت، منیش لێمگرت و نوسیم:

﴿سَيَجْعَلُ اللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا ۝﴾ الطلاق: ٧

فەرمان بكەن بە هەواڵەكانی سیفات بەو جۆرەی هاتوون، حوكم دەگۆڕێت و زانست ناگۆڕێت، حوكم نەسخ دەبێتەوە و زانست نەسخ نابێتەوە، زانستی خودا بە حوكمی خودا(عزوجل) هەڵناوەشێتەوە.

عبدالرزاق و موسای كوڕی هەواڵیان پێدام شێخ(خودا لێی رازی بێت) دەستی بەرزدەكردەوە و درێژی دەكرد و دەیفەرموو: **وعليكم السلام ورحمة الله وبركاته**، تەوبە بكەن و بچنە ریزەكەوە، ئەو كاتێك هێنرا بۆ لاتان.

**هەروەها دەیفەرموو:**

نەرمونیان بن، نەرمونیان بن، پاشان حەقی بۆ هات و كەوتە ناو سەرەمەرگەوە، دەیفەرموو: پەنادەگرم بە "**لا إله إلا الله الحي القيوم الذي لا يموت ولا يخشى الموت**" پاكێتی بۆ ئەو خودایەی بە قودرەت خاوەنی عیززەتە(تعزز) و بەندەكانی بە مردن ژێردەستە كردووە، "**لا إله إلا الله محمد رسول الله**".

موسای کوڕی هەواڵی پێدام و وتی:

کاتێك دەیویست بڵێ "تعزز" زمانی بە دروستی بۆی نەدەهات، بەردەوام دووبارەی دەکردەوە تا بە تەواوی وتی "تعزز" و دەنگی پێ درێژکردەوە و پێداگری لەسەر کرد تا زمانی بە تەواوی بۆی هات، پاشان فەرمووی: الله، الله، الله، پاشان دەنگی کزبوو و زمانی نووسا بە سەرەوەی مەڵاشووی، پاشان مرد(خودا لێی رازی بێت)، و ئێمە لەگەڵ ئەو کۆبکاتەوە لە "مقعد صدق عند مليك مقتدر".

والحمد لله رب العالمين، وصلوات الله على سيد المرسلين ومقدم الشفعاء محمد خير البرية، صلى الله عليه وعلى آله وأصحابه أجمعين.



له شەوی هەینی١ لەسەر٢/١٢/٢٠١٦ له وەرگێڕان و پیاداچوونەوەی ئەم کتێبە بوومەوە، حەمد و سەنا بۆ خودای موتەعال و درووود و سەلامیش بۆ سەر گیانی پاکی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، خودا لـه خاوەنەکـەی قبوولّ بفەرمویّ و ئێمەش له خێری وەرگێڕانی بێبـەش نـەکات، چاوەڕوانی دوعای خێری ئێوەم.

عبدالکریم فتاح.
سلێمانی

# ناوەرۆك



## مەجلیسەکان

